# تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز

## بەرگی یازدەیەم

## تەفسیری سوورەتی الكهف و مريم



عەلی باپیر

# تەفسیری سوورەتی

# الإسراء

نووسینی: عـــەلی بـــاپیر
دیزاینی ناوەوە : زەردەشت کاوانی
چاپـــی یەکـەم ١٤٤١ز - ٢٠٢٠ك
٥٤٣ لاپـــــەڕە
١٧* ٢٤ ســـم
بابـەت : ئـاینی

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان - هەرێمی کوردستان
ژمارە سپاردنی ( ٧ ) ی ساڵی ٢٠١٢ پێدراوە

# پێشەکی ئەم تەفسیرە بەگشتی

إنَّ الحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ، وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ باللَّهِ مِنْ شرُورِ أَنْفُسِنَا، وَمِنْ سَيئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْده اللَّهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَن لاَ إلَهَ إلاّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسولُهُ.

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٠٢﴾﴾ آل عمران.

﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَاءً وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴿١﴾﴾ النساء.

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾﴾ الأحزاب .

أمَّا بَعْدُ: فإنَّ أَصْدَقَ الحَديث كَلامُ اللَّه، وَخَيْرَ الْهَدِي هدْيُ مُحَمَّد ﷺ وَشرَّ الأُمُورِ مُحْدَثاتُها، وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَة، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلاَلَةٌ، وَكُلَّ ضَلاَلَةٍ فِي النَّار[1] .

**خوێنەرە بەڕێزو خۆشەویستەکان!**

هیچ گومانی تێدانیە - بۆ مرۆڤی بڕوادار - کە ئەو تەمەنەی لە خزمەت دوایین کتێبی خوا (قورئان)دا بەسەردەبرێ، جا بە هەر شێوەیەك لە شێوەکانی لە خزمەتدابووندا بێ؛ خوێندنەوە، تێفکرین و ڕامان، فێرکردن، کارپێکردن ... هتد، بە باشترین جێگرتن جێگا دەگرێ و ، خاوەنەکەی لە دنیاو دواڕۆژدا لێی بەهرەمەندە.

منیش کە - وەك باسکردنی چاکەی خوا (التحدّث بنعمة اللّه) دەیخەمەڕوو- لەوەتی فامم کردۆتەوە، خوای بەبەزەیی و بەخشەر چاکەی لەگەڵ کردووم و، بە فەرمایشتی بەرزو بێ وێنەی خۆیەوە سەرگەرمی کردوومو، بەر لە تەمەنی بیست ساڵیی یەوە هیدایەتی داوم،

---

(١) ئەوە پێی دەگوترێ: (خطبة الحاجة) کە پێغەمبەر ﷺ هاوەڵانی بەرێزی فێردەکرد، پێش هەر قسەیەکی گرنگ ، بیڵێن، وەك وتاری جومعەو داخوازییکردن (خِطْبة)و... هتدو، ئەم وتارە ، هەرکام لە: الترمذي: (١١٠٥)، النسائي: (١١٠٤)، ابن ماجه: (١٨٩٢) أحمد: (٣٧٢٠)، طبراني: (٢٤١٤) هێناویانەو (مسلم)یش بەشێکی هێناوە.

کە قورئانی بەرێزو پێز لەبەر بکەم و، سەرقاڵی خوێندنەوەی تەفسیرەکانی قورئان و تێوەرامانی ئایەتە پڕ بەرەکەتەکانی و، لێوردبوونەوەیان بم.

هەر بۆیەش تێکرای کتێب و نامیلکەو وتارو دەرسەکانم، کەم و زۆر لەبەر ڕۆشنایی قورئان دابوون، کە دیارە هەر ئەمەش شتێکی سروشتییە؛ ئاخر ئایا ئیسلام بێجگە لە قورئان پاشان سوننەتی پێغەمبەر ﷺ، کە ئەویش هەر ڕوونکردنەوەی قورئان و چۆنیەتی جێبەجێکردن و کارپێکردنیەتی، شتێکی دیکەیە؟! بێگومان نەخێر.

ئنجا لەمێژ ساڵیش بوو، کە براو خوشکانێکی دڵسۆزی نزیك و ئاشنام، داوایان لێدەکردم کە دەست بکەم بە دانانی تەفسیرو لێکدانەوەیەکی قورئان، هەتا لە ڕەمەزانی ساڵی (١٤٢٨)دا هاتە دڵمەوە، کە ناوی خوای لێبهێنم و دەست بەو کارە گەورەو گرنگە بکەم، بەڵکو وردە وردە بەپێی بوارو دەرفەت، هەرساڵە هەندێکی لێ ئەنجام بدەم، لەگەڵ سەرقاڵیی زۆرو جۆراو جۆریشدا، هەتا دەرفەتێکی وام بۆ دەڕەخسێ کە بتوانم خێرایی تێدا بکەم و خۆمی بۆ یەکلایی (**متفرِّغ**) بکەمەوەو، خوا پشتیوان بێ تەواوی بکەم، ئەگەر تەمەن بەبەریەوە مابێ.

سەرچاوەی دانانی ئەم تەفسیرو لێکدانەوەیەشم ، وێڕای سەرنجدانی زۆربەی ئەو تەفسیرانەی کە باون و ، دەستم پێیان گەیشتوە، بریتیە لە وردبوونەوەو تێوەرامانی خۆم لە خودی قورئان، چونکە بێگومان قورئان: هەندێکی هەندێکی ڕوون دەکاتەوە: (**القرآن يُفَسِّر بَعضُهُ بَعْضاً**)، پاشان سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، چونکە پێغەمبەری خواش ڕوونکەرەوە (**مُبَيِّن**)ی قورئانە، وەك خوا ﷻ فەرموویەتی:

﴿ ...وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾ النحل.

واتە: زیکرمان بۆ لای تۆ ناردۆتە خوار ، تاکو ئەوەی بۆ خەڵکی نێرراوەتە خوار، بۆیان ڕوون بکەیەوەو بەڵکو خۆشیان بیربکەنەوە.

ئومێدیشم وایە - بە یارمەتی خوای بەخشەر ﷻ - شایستەیی ئەوەم هەبێ تەفسیرو لێکدانەوەیەکی وا بۆ قورئان پێشکەش بە مسوڵمانانی کوردستان بکەم، کە لە قورئان بوەشێتەوەو ، مایەی بەهرەو سوودی خوێنەران بێ، بەتایبەتیش کە زیاتر لە سی (٣٠) ساڵە لەگەڵ قورئانی بەرزو مەزن و تەفسیرەکانی و کتێبەکانی سوننەتدا خەریکم و ، دەیان کتێب و بەرهەمی جۆراوجۆرم لە زۆربەی بوارەکانی زانستەکانی شەریعەتدا پێشکەش کردوون.

شایانی باسیشە کە ئەو بیست و دوو مانگ زیندانیی کرانەم لەلایەن ئەمریکاوە- لە (٢٠٠٣/٧/١٠ تاکو: ٢٠٠٥/٤/٢٨) - دەرفەتێکی گەورەو گرنگ بوو، بۆ زیاتر پێدا قووڵبوونەوەی کتێبی خوا (تبارك و تعالی)، وە بۆ پەیدابوونی تێگەیشتنی تایبەت لەبارەی زۆرێك لە ئایەتەکانی یەوە، ئەم ڕاستییەش لە مەوسووعەی : (**الإسلام كما يتجلّى في كتاب اللّه تعالى**)دا زۆر چاك دەرەوشاوەتەوە[1]، بەڵام هەڵبەتە ناڵێم و هیچکەسیش بۆی نیە بڵێ: کە ئەم تەفسیرەی من تێروتەواوە، چونکە وێڕای سنووردارbوونی توانا و بڕستم، لە بەرانبەر کتێبی لە هەموو ڕووێکەوە ڕەها (مطلق)و بێسنوور (لا محدود)ی خوادا، نەشمویستوە کە زۆر بەملاولادا بچم و بچمە نێو هەندێك وردەکارییەوە، کە یان من تێیدا پسپۆڕو شارەزا نیم، یان خوێنەر پێویستی پێی نیە، لە کاتێکدا دەیەوێ لە قورئان تێبگات و، بزانێ خوا (تبارك وتعالی) ڕاستەوخۆ چی پێ فەرمووە ؟!

ئنجا هەر لێرەشەوە بە پێویستی دەزانم پڕ بە دڵ سوپاسی ئەو برا گەنجە ڕووح سووك و گورج و گۆڵ و دڵسۆزە بکەم (حەزی نەکرد ناوی بهێنم)، کە هەڵسا بە نووسینەوەو هێنانە سەر کاغەزو، پاشان تایپکردن و دوایی پێداچوونەوەو هەڵەگیریی، سەرجەم ئەم زنجیرە دەرسە، کە لە ئەسڵدا لە شێوەی وتار (محاضرة)دا پێشکەش کراون، هەروەها هەڵسا بە (تخريج)ی سەرجەم دەقەکانی سوننەت، لە سەرچاوە متمانە پێکراوەکانەوەو، زەحمەت و ماندووبوونێکی زۆری بە سەرجەم بەرگەکانی ئەم تەفسیرە کێشاوە، خوا بە باشترین شێوە پاداشتی بداتەوەو، هەر ساڵح و ساغ و سەلامەت و سەربەرزبێ[2] لە خوای بەرزو بێهاوتاش داواکارم ئەو جۆرە گەنج و لاوانە لە کوڕان و کچان، لەنێو گەلەکەماندا، زۆر بکات .

---

(١) ئەو مەوسووعەیە کە ئێستا چاپ کراوەو ، کەوتۆتە بەردەستی خوێنەران و، سەرجەم هەشت بەرگ و دەوری سێ هەزارو پێنج سەد (٣٥٠٠) لاپەڕەیەو، هەوڵمداوە بەگشتی تێیدا باسی سەرجەم لایەنەکانی ئیسلام بکەم و، تاکە سەرچاوەشم قورئان بووە، وێڕای دەقەکانی سوننەت، کە لە هۆش (ذاكرة)دا بووون.

شایانی باسە ئەو مەوسووعەیە لە چاپی دووەمی دا ، کراوە بە دوازدە (١٢) کتێبی سەربەخۆ ، بە مەبەستی ئاسانتر سوود لێ بینرانی .

(٢) ئەو برا دڵسۆزە ئێستاش شێلگیرانە لەسەر کارەکەی خۆی بەردەوامە و، عەزمیشی جەزم کردوە، کە ئەگەر تەمەنمان بەردەوام بێ، هەتا کۆتایی ئەم تەفسیرە سەرگەرمی کارەکەی بێ .

شایانی باسیشە کە ئێمە لەم تەفسیرەماندا باسی بەش (جزء)ەکانی قورئان و دابەشکردنەکانی دیکەی وەك: - (حزب) - ناکەین، چونکە هەر سوورەتێك بۆخۆی شتێکی سەربەخۆیەو، سەرجەم ئایەتەکانی وەك ئاڵقەکانی زنجیرێك پێکەوە پەیوەستن و، ئاشکراشە کە دابەشکرانی سەرجەم قورئان بۆ سی (٣٠) بەش (جزء) و شەست (٦٠) (حزب)، شتێکە لەلایەن زانایانەوە کراوە، بۆ ئاسانکاریی خوێندنی قورئان، دیارە ئێمە لە دابەشکردنی بەرگەکانی ئەم تەفسیرەشدا، دیسان حیساب بۆ بەشەکان (أجزاء)ی ناکەین و، بە گوێرەی سوورەتەکان، بەرگەکانی دیاریی دەکەین.

دوا قسەشم ئەوەیە کە:

ئەم تەفسیرە - وەك پێشتر گوتمان - لە ئەسڵدا بەشێوەی دەرس و وتار پێشکەش کراوە، بەڵام دواتر خۆم دووجار بە وردیی پێیدا چوومەوەو، بەپێی پێویست دەستکاریيم کردوە، دیارە هەموو دەرسێکیش بەناوی خواو ستایشی خوا ﷻ دەستی پێکردوە، بەڵام ئێمە لە سەرەتای دەرسەکانەوە ، ئەوانەمان لابردوە، بۆ زۆر دووبارە نەبوونەوەو، ئەو (خطبة الحاجة)یەی لە سەرەتای ئەم پێشەکییەوە هاتوە، لەجیاتی سەرەتای سەرجەم دەرسەکانە.

سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ ،

وَسَلامٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ .

دووشەممە ٢٥ رجب ١٤٣٢

٢٠١١/٦/٢٧

هەولێر

# بەرچاو ڕوونییەکی گرنگ
# لەبارەی ئەم تەفسیرەوە

**خوێنەری بەڕێز !**

هەرچەندە لە (پێشەکی گشتیی) ئەم تەفسیرەدا باسمان کردوە، کە بۆ نووسینی ئەم تەفسیرە لە هەموو ئەو تەفسیرە باوانەی دەستم پێیان گەیشتوە، بەهرەمەندبووم، هەروەها لە کۆتایی هەر بەرگێکی ئەم تەفسیرەدا، سەرجەم ئەو تەفسیرانەی کەم و زۆر لێیان سوودمەند بووم، ناوەکانیانمان بە ڕیز نووسیوە، بەڵام لێرەش وەك جەختکردنەوەی زیاترو بەرچاوڕوونیی باشتر بۆ ئێوەی بەڕێز دەڵێم :

مادام ناوی تەفسیرەکانمان نووسیوە، نە پێویست دەکات و نەدەشگونجێ، بۆ هەر تێگەیشتن و بیرۆکەیەك، کە زۆربەی تەفسیرەکان لەبارەی ئایەتێکەوە، یان ڕستەو برگەیەکی ئایەتێکەوە، دەیهێنین، ئێمە هەموو جارێ ناوی ئەو تەفسیرانە بێنین، بەڵام بێگومان هەر کات بیرۆکەو تێگەیشتنێکی تایبەتی یەکێك لە تەفسیرەکان هەبێ و بکەوێتە بەرچاوم، ئنجا چ پەسەندی بکەم، چ ڕەفزی بکەم، هەر کات بە پێویستی بزانم، بە تایبەت ئاماژەی پێدەکەم، ئەگەرنا بە ئاماژەی گشتیی و بە نووسینی ناوی تەفسیرەکان لە کۆتایی هەر بەرگێك دا، ئیکتیفا دەکەم و، زۆریش لە ئەمانەتی زانستیی (الأمانة العلمیة) دەخەفتێم و مەبەستمە ڕەچاوی بکەم، چونکە ئەمینیی و ئەمانەت پارێزیی، ڕەوشتێکی گەورەو بەرزی مسوڵمانەتییە .

شایانی باسیشە جاری وا هەیە بیرۆکەو تێگەیشتنێکی تایبەتیی خۆمم دەربارەی کۆمەڵە ئایەتێك یان ئایەتێك یان ڕستەو برگەیەکی ئایەتێك، بۆ دروست دەبێ، وەك تێگەیشتن و بۆچوونی خۆم دەینووسم، کەچی ڕەنگە لە تەفسیرەکانی دیکەش - یەکێکیان یان زیاتر - دا هەبێ، ئەویش بەهۆی ئەوەوەیە کە من ئەو تەفسیرەم نەکەوتۆتە بەر دیدە، یان دیتوومەو لەیادم نەماوە.

پێویستە ئەوەش بگوترێ کە بۆ شیکردنەوەی وشەکان، بە پلەی یەکەم پشتم بە کتێبە ناودارەکەی (راغب الأصفهاني) (مفردات ألفاظ القرآن) بەستوە، بەڵام هەندێك

جاریـش دەگەڕێمـەوە بـۆ هەندێـك سـەرچاوەی دیکـە بەتایبـەت: (مختار الصِّحـاح)ی (الـرازي) و (المعجـم الوسـيط) و (صفـوة البيـان لمعـاني القـرآن)ی (حسـنين محمـد مخلـوف).

## ڕوونکردنەوەیەک لە بارەی سی (٣٠) بەش (جزْء)ەکەی قورئانەوە

قورئـان هەمـووی لـە لایـەن زانایانـەوە دابـەش کـراوە، بـۆ سی (٣٠) بـەش (جـزء) هەڵبەتـە لـە دابەشـکردنی قورئانـدا بـۆ (٣٠) بـەش، ڕەچـاوی قەبـارەی بەشـەکان کـراوە و هەوڵـدراوە یەکسـان بـن، لـە ڕووی قەبارەیانـەوە، هەڵبەتـە، جـاری وایـە بەشـێك قەبـارەی لـە بەشـێکی دیکـە زیاتـرە، بـەڵام هەوڵیـان داوە قەبارەیـان لـە یەکـدی نیزیـك بـێ.

شـایانی باسـە: ئێمـە لـەم تەفسـیرەماندا نەمانکـردوە بـە عـادەت کـە بـاسی سـەرەتاو کۆتایـی بەشـەکان (**أجـزاء**)ی قورئـان بکەیـن، کـە وەك گوتمـان: هەمـوو قورئـان بـۆ سی (٣٠) بـەش، دابەشـکراوە، هـەر بەشـێکیش بـۆ دوو حیـزب، {حیزبیـش هـەر واتـە: بـەش} دابـەش کـراوە، کـە ئەمـە زانایـان وایـان کـردوە، بـۆ چۆنیـەتی خوێنـدنی قورئـان، تاکـو بۆیـان ئاسـان بێ، لـە کوێـوە تـا کـوێ، بخوێنـن، کـە زۆرێـك لـە زانایـان هەوڵیـان داوە بـەلای کەمـەوە مانگـی جارێـك هەمـوو قورئـان بخوێنـن، ئنجـا کردوویانـە بـە سی (٣٠) بـەش و هـەر ڕۆژە، یـان هـەر شـەوە، یـان هـەر شـەوو ڕۆژە، بەشـێکیان خوێنـدوە، بـەڵام کەسـێك نەیتـوانی بێـت شـەوو ڕۆژ جوزئێـك بخوێنـێ، لـە دوو مانگـدا خۆێندوویـەتی و ئـەو کاتـە هـەر شـەوو ڕۆژە، نیـو بـەش واتـە: یـەك حیـزبی خوێنـدوە، یـانی: ئـەو دابەشـکردنەی قورئـان، هیـچ پەیوەندیـی بـە خـوای پـەروەردگارو، بـە پێغەمبەریشـەوە ﷺ نیـە، بـەو واتایـە کـە ئـەوان دایاننابـێ، واتـە: شـتێکی (**توقیفـي**)ی نیـە، بەڵکـو شـتێکی ئیجتیهادیـی و (**توفیقي**)یـەو زانایـان کردوویانـە، ئەویـش بـۆ چۆنیـەتی مامەڵەکـردن لەگـەڵ قورئانـدا، لـە بـواری خوێنـدنی و دابـەش کردنیـدا بەسـەر شـەوو ڕۆژەکانی مانـگ و سـاڵدا.

بۆیـە ئێمـە لـەم تەفسـیرەماندا خۆمـان پەیوەسـت نەکـردوە بـە بەشـەکانەوەو، ئـەو ڕوون کردنەوەیەشـم بـۆ ئەوەبـوو کـە چەنـد جارێـك گـوێ بیسـتبوومەوە، گوتـراوە: بۆچـی بـاسی سـەرەتاو کۆتایـی بەشـەکانی قورئـان ناکـرێ؟! لەبـەر ئـەو هـۆکارەی باسـم کـرد، مـن دەمـەوێ لـەم تەفسـیرەدا بـاسی نێوەڕۆکـی قورئـان و مانـاو مەبەسـتەکانی ئایەتـەکان بکـەم، ئنجـا ئـەوە

کە زانایان بەو شێوەیە دابەشیان کردوە، باسکردنی هیچ تیشك ناخاتە سەر نێوەڕۆکی واتاو چەمکی ئایەت و سوورەتەکان.

هەڵبەتە بۆ هەر کەسێکیش تۆزێك شارەزای قورئان بێ هەر دیارە و، دەزانێ: هەرکام لە بەشەکان دەسپێك و کۆتایی کوێیە؟ بەڵام ئەوەی گرنگە بزانرێ ئەوەیە: کە هەر سوورەتێك بۆ خۆی یەکەیەکی بابەتیی (**وَحدَةُ مَوضُوعیة**)ی هەیە، هەر سوورەتێك ئایەتەکانی وەك ئاڵقەکانی زنجیرێك پێکەوە پەیوەستن، ئنجا هەندێك لە زانایان کە تەفسیرەکانیان بەپێی جوزئەکان دابەشکردوە، کە زۆربەیان وایانکردوە، لەبەر قەبارەی بەرگی تەفسیرەکان بووە، ئەگەرنا لە ڕووی نێوەڕۆکەوە: جاری وا هەیە کە دوو بەش (جزء) لە نێوەڕاستی سوورەتێکدا دێن و، سەرەنجام بابەتێك کە لەو سوورەتەدا هاتوە، دەبێتە دوو بەشەوە و بەشێکی دەکەوێتە ئەو بەرگە و، بەشێکیشی دەکەوێتە ئەو بەرگەوە، بۆیە من وام نەکردوە، بەڵکو من هەتا ئێستا و لە داهاتووشدا ئەگەر خوا تەمەنمان بدات، هیچ سوورەتێك ناکەمە دوو بەشەوە بەپێی بەشەکان، بەڵکو وەك عادەتی خۆمان کە تا ئێستا هێناومانە ئەو سوورەتانەی کە گەورەن و، قەبارەی تەفسیرەکەیان گەورە دەبێ، دەیانکەینە بەرگێك، ئەوانەی دیکەش دوو دوو، سێ سێ، یاخود زیاتر، دەکەینە بەرگێك.

# پێشەكی ئەم بەرگە

خوێنەرە بەڕێز و خۆشەویستەكانم!

ئـەم بەرگـی چواردەیەمەمـان تەرخانكـردوە بـۆ تەفسـیركردنی ئایەتە بەپێزەكانی سـووڕەتی (الإسراء)، كـە وێـڕای تەفسـیر كردنـی ئایەتەكانـی و شـیكردنەوەی واتـا و مەبەسـتەكانیان، بـە حـەوت هەنـگاو و قۆنـاغ، وەك عادەتـی خۆمـان لـەم تەفسـیرەدا و هـەر لەسـەرەتاوە، پـازدە (١٥) كورتـە باسـی گـەورەو گرنگیشـمان تێـدا كـردوون:

١- كورتە و باسێك دەربارەی شەو و ڕۆو بەرزبوونەوە (الإسراء والمعراج)ەوە.

٢- كورتە باسێك دەربارەی دوو كەڕەت خراپەكاریی بەنو ئیسرائیل و سزادانی خوا بۆیان.

٣- كورتە باسێك دەربارەی شەوگار و ڕۆژگارو، پەیوەندی نێوان زەوی و مانگ.

٤- كورتە باسێك دەربارەی چوار ڕاستی گەورە و گرنگ.

٥- كورتە باسێك دەربارەی دەستبڵاویی (تبذیر) و زێدەڕۆیی (إسراف).

٦- كورتە باسێك دەربارەی بەپاككرتن و ستایشكردنی خواوە، لەلایەن سەرجەم دروستكراوەكانیەوە.

٧- كورتە باسێك دەربارەی ڕێزگرتنی خوا بۆ مرۆڤ.

٨- كورتە باسێك لە پێنج سەرنجدا دەربارەی ئایەتەكانی ٧٣ و ٧٤ و ٧٥ .

٩- كورتە باسێك دەربارەی گرنگیی و پێویستی خوا پەرستیی بۆ خۆڕاگریی لە بەردەم ئاستەنگ و كێشە و گرفتەكاندا.

١٠- كورتە باسێك دەربارەی دیارییكردنی كاتی پێنج نوێژە فەرزەكان.

١١- كورتە باسێك دەربارەی گرنگیی و گەورەیی نوێژی بەیانی و شەونوێژ.

١٢- كورتە باسێك دەربارەی پێگەی ستایشكراو (المقام المحمود).

١٣- كورتە باسێك دەربارەی شیفابوونی قورئانەوە.

١٤- كورتە باسێك دەربارەی ڕووح.

**١٥-** کورتە باسێك دەربارەی مرۆڤبوونی پێغەمبەران.

بۆیــە دەتوانیــن بڵێیــن: ئــەم بەرگــی چواردەیەمــە یەکێکــە لــەو بەرگانــەی زۆرتریــن کورتەباسـیان گرتوونەتـە خۆیـان و، کورتەباسـەکانیش، زۆر جـۆراو جـۆرن و گەلێـك بواریـان گرتوونــەوە.

شـایانی باسیشـە - خـوا پشـتیوان بـێ – بڕیارمـان داوەو عەزمـمان جـەزم کـردوە، کـە لەمەو دوا زیاتـر دەسـت لـەم تەفسـیرە بجووڵێنیـن، هـەم لـە تۆمـار کـردن و نووسـینەوە و ئامادەکردنـی بـۆ چـاپ و، هـەم لـە چاپکردنیشـی و، شـایانی باسـە لـە تۆمارکردنـی دا، گەیشـتووینە جوزئـی بیسـت و هەشـت (٢٨).

٢٢ / شەعبان /١٤٤١ ك

١٥ / نیسان /٢٠٢٠ ز

هــەولێر

# دەستپێک

بەڕێـــــزان!

خـوا ﷻ پشـتیوان بـێ، ئەمـڕۆ کـە (٧)ی مانگـی شـەووالی سـاڵی (١٤٣٨)ی کۆچیـی، بەرانبـەر: (٧)ی تەممـوزی (٢٠١٧)ی زایینییـە، دەسـت دەکەیـن بـە تەفسـیر کـردنی سـوورەتی (الإسراء)، ئنجـا ئێمـە ئـەم دەرسـەمان تەرخـان دەکەیـن بـۆ پێناسـەکردن و، خسـتنە ڕووی نێوەڕۆکـی سـوورەتی (الإسراء)، ئەویـش لـە حـەوت (٧) بڕگـەدا.

## پێناسە و نێوەڕۆکی ئەم سوورەتە

### یەکەم: شوێنی دابەزینی:

ئـەم سـوورەتە لـەلای زۆربـەی زانایـان سـوورەتێکی مەککەییـە و، ژمـارەی ئایەتـەکانی بەپێـی سـەرژمێری ژمـاردنی (أهـل الكوفـة) بریتیـە لـە (١١١) ئایـەت، بـەڵام (أهـل المدينـة، وأهل الشـام، وأهـل البـصرة، وأهـل مكـة) ژمـارەی ئایەتەکانیـان بـە (١١٠) ئایـەت دانـاوە، بـەڵام هەنـدێ لـە زانایـان ڕایـان وایـە کـە (٢) یـان (٤) یـان (٥) یـان (٨) ئایـەتی ئـەم سـوورەتە، مەدینەییـن.

ئنجـا هەندێکیـان دەڵێـن: ئـەو ئایەتانـەش، ئنجـا (٢) یـان (٤) یـان (٥) یـان (٨) ن، لێـرەوە دەسـت پێدەکـەن، (واتـە: لـە دوای ئـەم ئایەتـەوە، ئایەتـە مەدینەییـەکان دەسـت پێدەکـەن): ﴿ وَإِن كَادُوا لَيَفْتِنُونَكَ عَنِ الَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ لِتَفْتَرِيَ عَلَيْنَا غَيْرَهُ... ﴿٧٣﴾ ﴾الإسراء، لەوێـوە تاکـو (٨) ئایـەت، یاخـود تاکـو (٢) یـان (٤)، یـان (٥) بژمێـرە.

هەندێکیشـیان ڕایـان وایـە کـە نەخێـر ئایەتـە مەدینەییـەکان لێـرەوە دەسـت پێدەکـەن: ﴿ وَلَا تَقْتُلُوا النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ... ﴿٣٣﴾ ﴾الإسراء، لەوێـوە تاکـو ئەوەنـدە ئایەتـە، بەپێـی جیاوازیـی بۆچوونـەکان، ( ٢، ٤، ٥، ٨ ) .

بـەڵام ئـەوەی کـە مـن لێـی حاڵیـی بـووم، دوای ئـەوەی ورد سـەرەنجی سروشـتی سـوورەتەکەم داوە، هەروەهـا پێکـەوە پەیوەسـت بـوونی ئایەتـەکان، ئەوەیـە کـە سـوورەتەکە

هەمووی مەککەییە، هەڵبەتە دەشگونجێ - وەك ئەوە هەیە لە هەندێ سوورەتەکاندا - ئایەتێك لە مەدینەدا هاتبێتە خوار، دوایی خرابێتە نێو سوورەتێك کە پێشتر لە مەککەدا هاتۆتە خوار، واتە: دەگونجێ هەندێك سوورەتی مەککەیی، بە چەند ئایەتێك کە لە مەدینەدا هاتوونەتە خوارێ، تەواو کرابن، بەڵام بە سەرەنجدانی من ئەم سوورەتە وا پێناچێ هیچ ئایەتێکی وای تێدا بێ، کە ناچارمان بکات بڵێین: ئەوە لە مەدینەدا هاتۆتە خوار و هیچ بەڵگەیەکی دڵنیاکەرەوەش لەوبارەوە نیە.

### چەند دەقێك لەبارەی ئەم سوورەتە موبارەکەوە:

**{أَخْرَجَ النَّحَّاسُ وَابْنُ مُردَوَيه عَنِ ابنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا، قَالَ: نَزَلَتْ سُورَةُ بَنِي إِسرَائِيل فِي مَكَّة، وَأَخْرَجَ ابنُ مُردَوَيه عَن ابنِ الزُّبَير، (عَبدُ اللَّهِ ابنُ الزُّبَير) مِثلَهُ}.**

واتە: نەححاس و ئیبنو موردەوەیهـ، لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ) گێڕاویانەتەوە کە گوتوویەتی: سوورەتی بەنی ئیسرائیل لە مەککە هاتۆتە خوار، هەروەها (**إبنُ مُردَوَيه**) لە عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیریشەوە هەمان دەقی هێناوە.

ئەمە لە زۆربەی تەفسیرەکاندا هاتوە، بۆ وێنە:

١- (فتح القدير)ی (الشوكاني)،

٢- (التحرير والتنوير)ی (محمد الطاهر بن عاشور)،

٣- (جامع البيان)ی (الطبري).

### دووەم: ناوی ئەم سوورەتە:

ئەم سوورەتە دوو ناوی سەرەکیی هەن:

١)- (**سُورَةُ الإسراء**)، لەبەر ئەوەی سەرەتاکەی ئاوا دەست پێدەکات: ﴿ سُبْحَٰنَ ٱلَّذِىٓ أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِۦ لَيْلًا مِّنَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ إِلَى ٱلْمَسْجِدِ ٱلْأَقْصَا ٱلَّذِى بَٰرَكْنَا حَوْلَهُۥ ﴾، کە لە زۆربەی موصحەفەکاندا هەروا نووسراوە: (**سُورَةُ الإسراء**).

٢)- (**سُورَةُ بَنِي إِسرَائِيل**)، کە لە سەردەمی هاوەڵاندا (خوا لێیان ڕازی بێ)، هەر زیاتر ئەو ناوە باو بووە، واتە: (**سُورَةُ بَنِي إِسرَائِيل**) باو بووە بۆ ئەم سوورەتە، با تەماشای ئەم دەقە بکەین:

١- **{عَن عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنهَا، قَالَت: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقْرَأُ كُلَّ لَيْلَةٍ بَنِي إِسْرَائِيلَ وَالزُّمَرِ} (أَخرَجَهُ الترمذي: ٢٩٢٠، قَالَ أبو عيسى: هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غريب، وَالنَّسَائِيُّ فِي الكُبرى: ١١٤٤٤، وصَحَّحَهُ الأَلبَانِي).**

واتـە: دایكـمان عائیشـە (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ عـادەتی وابـوو هەمـوو شـەوێك سـوورەتی بـەنی ئیسـرائیل و سـوورەتی (الزُّمَـر)ی دەخوێنـد.

دیـارە کـە فەرموویـەتی: هەمـوو شـەوێك، مەرجیـش نیـە، هیـچ شـەوی نەبواردیـن! بـەڵام واپێدەچـێ ئـەو کاتـە دایكـمان عائیشـە زۆرجـار پێغەمبـەری خـوای بینیبـێ ﷺ کـە ئـەو دوو سـوورەتەی خوێنـدوون، ئنجـا ئایـا هـەر لەبـەر خۆیـەوە خوێنـدوونی، بەبـێ نوێـژ؟ یـان لـە نوێـژدا خوێنـدوونی؟ ئـەوەی ڕوون نەکردۆتـەوە، بـەڵام هـەردوو ئەگەرەکـە، هـەن:

أ- وەك ویردێك خوێندبنی.

ب- یاخود لە شەو نوێژدا خوێندبنی، یان لە نوێژی بەیانی، یان لە خەوتناندا.

٢- دەقێكی دیكە لەو بارەوە كە ئەم سوورەتی (**الإسراء**) لە سەردەمی هاوەڵاندا سوورەتی بەنی ئیسرائیلیان پێ گوتوە: {**عَنِ ابنِ مَسعُودٍ** رضي الله عنه **قَالَ: فِي بَنِي إِسرَائِيلَ والكَهْفَ ومَرْيَم، إِنَّ هُنَّ مِنَ العِتَاقِ الأولِ، وَهُنَّ مِنْ تِلادِي**}[1].

واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی مەسـعوود (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، دەربـارەی سـوورەتی بـەنی ئیسـرائیل و کەهـف و مەریـەم گوتوویـەتی: ئـەم سـێ سـوورەتە لـە ماڵـە زۆر بـە نرخەکـەی سـەرەتان و، لـەو سـوورەتانەن کـە لـە سـەرەتاوە مـن لـە بـەرم کـردوون.

وشـەی: (**العِتَـاقِ**) دەڵـێ: (**عِتَـاقِ: عَتِـقَ الـشَّيءُ يَعْتِـقُ عِتْقَـاً وَعَتْقَـاً: قَـدُمَ فَهُـوَ عَاتِـقٌ وعَتِيـق، والعِتَـاقُ مِـنَ الطَّـيرِ الجَـوَارِح، ومِـنَ الخَيْـلِ: النَجَائِـب، والعَتِيـقُ: الكَرِيـمُ، وثَـوْبٌ عَتِيـقٌ: جَيِّـد الحِيَاكَـة، وَالبَيْـتُ العَتيـق: الكَعْبَـة، والجَمْـعُ: عُتُـق وَعِتَـاق**)[2].

واتـە: (**عِتَـاقِ: عَتِـقَ الـشَّيءُ يَعْتِـقُ عِتْقَـاً وَعَتْقَـاً: قَـدُمَ**)، واتـە: ئـەو شـتە لـە مێژینەیـە، دێرینـە، ئنجـا ناوەکـەی (**عَاتِـق، وعَتِيـق**)ی بـۆ بەکاردێـن و، (**عِتَـاق**) لـە باڵـندان، واتـە: ئـەو باڵندانـەی کـە گۆشـت خـۆرن و، لـە وڵاخـە بـەرزان (**عِتَـاق**) واتـە: وڵاخـی نەجیـب {(**النَّجَائِـب**)، کە کـۆی (**نَجِيبَة**) یـە، واتـە: ئەسـپی ڕەسـەن}، هەروەهـا (**عَتِيـق**)، واتـە: بەڕێـز، (**ثَـوبٌ عَتِيـق**) واتـە: پۆشـاكێك بـاش چنرابـێ، (**البَيـتُ العَتِيـق**) کەعبەیـە، کـۆی (**عَتِيـق**) یـش بریتیـە لـە: (**عُتُـقٌ وعِتَـاق**)، کەواتـە: کـە گوتوویـەتی: {**إِنَّ هُـنَّ مِـنَ العِتَـاقِ الأول**}، واتـە: لـەو سـوورەتە دێریـن و زۆر بـە پێـز و بـە هێزانەن، کـە لـە سـەرەتاوە عەبدوڵـڵای کـوڕی مەسـعوود لەبـەری کـردوون.

---

(١) فَتحُ القَدِير للشوكَانِي: ج٣، ص٢٤٧

(٢) المُعجَمُ الوَسِيط، ص٥٨٢.

وشـەی (تِـلاد): دەڵـێ: (تَلَـدَ: الـشَّيء يَتلُـدُ ويَتْلِـدُ: قَـدُمَ، والتِّـلادُ: المَـالُ الأَصـلِيُّ القَدِيـم)، (وَهُـنَّ مِـن تِـلادِي: أَي: مِـن أَوَّلِ مَـا تَعَلَّـمَ مِـن القُـرآنِ وكَسَـبَهُنَّ عِلْـمَاً)[1].

(تَلَـدَ يَتْلُـدُ، وتَلَـدَ يَتْلِـدُ: قَـدُمَ)، ئـەو شـتە قەدیـم بـوو، دێریـن بـوو، (تِـلاد): ماڵێـكی ڕەسـەنی دێرینـە، كـە ئینسـان هەیبـێ و زۆر خۆشـیبوێ، كـە عەبدوڵـڵای كـوڕی مەسـعوود (خـوا لێـی ڕازی بـێ) دەڵـێ: (وَهُـنَّ مِـنْ تِـلادِي)، لـەو سـوورەتانەن كـە لـە سـەرەتاوە مـن لەبـەرم كـردوون و، دەسـتم هێنـاون وەك گەنجینەیـەك (گەنجینەیـەكی مەعنەویـی).

٣- لەوبارەوە ئەم دەقەش هەیە: كە سوورەتی (الإسراء) لە سەردەمی هـاوەڵاندا سوورەتی بەنی ئیسرائیلی پێ گوتراوە: (أَخرَجَ بْن أَبِي شَيبَةَ عَن أَبِي عَمرِو الشَّيبَانِي، قَال: صَلَّى بِنَا عَبدُاللَّهِ الفَجرَ، فَقَرَأَ السُّورَتَينِ الأَخِرَةُ مِنْهُمَا: بَنُو إِسرَائِيل).

واتـە: ئیبنـو ئەبـی شـەیبە لـە باوكـی عەمـڕی شـەیبانییەوە هێناویـەتی، دەڵـێ: عەبدوڵـڵا (عەبدوڵـڵای كـوڕی مەسـعوود) نوێـژی بەیـانی پێكردیـن، دوو سـوورەتی خوێنـدن، هـی دووەمییـان سـوورەتی بەنـو ئیسـرائیل بـوو.

## سێیەم: ڕیزبەندیی ئەم سوورەتە:

بـە نسـبەت ڕیزبەندیـی ئـەم سـوورەتە موبارەكـەوە، لـە (مصحـف)دا، ژمـارە: (١٧)یـەو، لـە ڕیزبەندیـی دابەزیـن (تَرتِيـب النُّـزُول)دا زۆربـەی زانایـان بـە ژمـارە (٥٠)یـان دانـاوە و، گوتوویانـە: پێـش سـوورەتی (یونـس) و لـە دوایـی سـوورەتی (القَصَـص) هاتۆتـە خـوارێ، بـەڵام بەشێكیشـیان بـە كەمـتر لـە (٥٠)شـیان دانـاوە، بـۆ وێنـە گوتوویانـە: ڕیزبەندیـی دابەزینـی، بریتیـە لـە (٤٧) یـان (٤٨) یـان (٤٩)، ئنجـا بەپێـی ئـەو ڕیزبەندییـە دەبـێ ئـەم سـوورەتە لـە نیوەڕاسـتی قۆناغـی مەككـە، یـان زووتریـش دابەزیبـێ، كـە ئـەوەش لەگـەڵ ئـەو ڕایـەدا گونجـاوە كـە دەڵـێ: سـەفەری شـەوڕۆیی و بەرزبوونـەوە (الإسراء والمعـراج) لـە كۆتایـی قۆناغـی مەككـە ( سـاڵانی: ١٠ - ١٢ )دا نەبـووە، بەڵكـو زۆر زووتـر بـووە، یـان پێغەمبـەری خوا ﷺ زیاتـر لـە سـەفەرێكی لـەو جـۆرەی بـووە، وەك خـوا پشـتیوان بـێ لـە كاتـی تەفسیركردنی سـەرەتای سـوورەتی (النجـم)دا پێیدەگەیـن.

---

(١) المُعجَمُ الوَسِيط، ص٨٦.

(الأَصَحُّ أَنَّهُ كَانَ قَبْلَ الهِجرَةِ بِنَحوِ سَنَةٍ وخَمسَةِ أَشهُرٍ)[١]، واتە: قسەی ڕای ڕاستتر ئەوەیە کە شەوڕۆی پێغەمبەر ﷺ لە مەککەوە بۆ فەڵەستین (بۆ قودس)، پێش کۆچکردنی بووە بۆ شاری یەثریب، بە دەوری ساڵێك وپێنج مانگ، یانی: ساڵ و نیوێك، یان ئەو دەوروبەرە.

## چوارەم: نێوەڕۆکی ئەم سوورەتە:

نێوەڕۆکیی ئەم سوورەتەش وەك هی سەرجەم قورئانی مەککەیی دەچێ، کە ئێمە لە سەرەتای تەفسیری سوورەتی (الأنعام)دا بە درێژیی لەو بارەوە قسەمان کردوە، دەربارەی سروشتی قورئانی مەککەیی، لەبەر ئەوە کە یەکەم سوورەتی مەککەیی بوو، ئێمە لە ڕیزبەندیی موصحەفدا لە تەفسیرکردنماندا پێی بگەین، بەو قەبارەیە، ئەگەرنا سوورەتی (الفاتحة)ەش زۆرێك لە زانایان هەر بە سوورەتێکی مەککەییان داناوە، ئنجا ئەو بابەتانەی کە لە قورئانی مەککەیی دا جەختیان لەسەر کراوەتەوە - کە ئەم سوورەتی (الإسراء)ەش یەکێکە لەوان - بابەتی بووناسیی، ئیمان و عەقیدە، خواپەرستیی، ڕەوشت و ئاکار، بەسەرهاتی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)، ئنجا کە دەشڵێین: ئیمان و عەقیدە، واتە: باسی خوا ﷻ: سیفەتەکانی و، ناوەکانی و، بەدیهێنەرایەتیی خواو، پەروەردگارێتیی خواو، تەنیا پەرستراوێتیی خوا، پاشان باسی فریشتەکان، ئنجا باسی ڕۆژی دوایی: ئاخیر زەمان، قیامەت، بەهەشت، دۆزەخ، هەروەها باسی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) و، کتێبەکان کە خوا بۆ پێغەمبەرانی ناردوون، ئەو بابەتانە نێوەڕۆکیی قورئانی مەککەیی پێك دێنن، کە وەك گوتمان: ئەم سوورەتی (الإسراء)یش، هەر یەکێکە لەوان، بەڵام لەم سوورەتەدا بە شێوەیەکی تایبەت جەخت لەسەر هەردوو بابەتی: سەلماندنی پێغەمبەرایەتیی موحەممەد ﷺو، سەلماندنی ئەوە کە قورئان وەحیی خوایە: (إِثبَاتُ نُبُوَّةِ مُحَمَّدٍ، وَإِثْبَاتُ أَنَّ القُرآنَ وَحْيٌ مِنَ اللّه)، ئەم دوو بابەتە زۆر جەختیان لەسەر کراوەتەوەو، پانتاییەکی زۆر لەم سوورەتەدا، بۆ ئەو دوو بابەتە تەرخانکراوە.

هەروەها ئەم سوورەتە تاکە سوورەتێکی مەککەییە، کە پانتایی هەژدە (١٨) ئایەت بەسەریەکەوە تێیدا تەرخانکراون، بۆ باسی ڕەوشت و ئاکار، هەم ڕەوشتە پەسند و جوانەکان، هەم خوو خدە خراپ و پەستەکان، کە ئەوانیش ئایەتەکانی (٢٢ - ٣٩)ن، کە ئێمە لە دەرسی سێیەمی ئەم تەفسیرەماندا شییان دەکەینەوە.

---

(١) ج١٥، ص٦.

## پێنجەم: تایبەتمەندییەکانی ئەم سوورەتە:

ئەم سوورەتە چەند شتێکی تایبەتی تێدا هاتوون، کە پێم وایە تایبەتن بەم سوورەتەوە، ئەوانیش:

١- باسی شەوڕۆیی (سەفەری شەوی) پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەککەوە بۆ شام، تەنیا لەم سوورەتەدا باسکراوە، بەڵێ لە سوورەتی (النجم)دا لە ئایەتی: (١٢ - ١٨)، لەوێدا باسکراوە، بەڵام هێ ئەوێ باسی بەرزبوونەوەی پێغەمبەرە ﷺ و باسی شەوڕۆ، تەنیا لەم سوورەتەدا هاتوە.

٢- تەنیا لەم سوورەتەدا باسی دووجار تێکدان و خراپەکاریی جوولەکەو، سزادرانیشیان کراوە.

٣- تەنیا لەم سوورەتەدا بەسەریەکەوە، خوا باسی بیست وچوار (٢٤) ڕەوشت و ئاکار دەکات، کە (١٨) ئایەتیان بۆ تەرخان دەکات، ئایەتەکانی: (٢٢ - ٣٩)، کە (١٢)یان ڕەوشت و ئاکاریی پەسندن و (١٢)شیان ڕەوشت و ئاکاری ناپەسندن، کە لە تەفسیرەکاندا نەمبینیوە بەو شێوەیە دابەشکرابن، بەڵام من بە زۆر لێوردبوونەوەو سەرنجاندان بۆم دەرکەوتوە، کە ژمارەیان (٢٤)ە و (١٢) بە (١٢)ەن، بە پەسند و ناپەسندەوە، ئنجا ئەو ڕەوشت و ئاکارە پەسندانە و خۆ پێ ڕازاندنەوەیان و، ڕەوشتە ناپەسندو خراپەکان و، خۆ لێ دوورخستنیان و، خۆ لێبژار کردنیان، بە حیکمەت ناوهێنراوە.

٤- باسی ئەوە کە هیچ شتێك نیە تەسبیح و تەحمیدی خوا نەکات، (واتە: خوا بە پاك نەگرێ وستایشی نەکات)، بەڵام ئێمە تێی ناگەین، ئەویش تەنیا لەم سوورەتەدا هاتوە، لە ئایەتی ژمارە (٤٤)دا هاتوە: ﴿ تُسَبِّحُ لَهُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ ٱلسَّبۡعُ وَٱلۡأَرۡضُ وَمَن فِيهِنَّۚ وَإِن مِّن شَيۡءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمۡدِهِۦ وَلَٰكِن لَّا تَفۡقَهُونَ تَسۡبِيحَهُمۡۚ ... ﴿٤٤﴾ ﴾الإسراء، ئەگەرنا لە زۆر سوورەتاندا خوا ﷻ باسی ئەوەی کردوە کە ئاسمانەکان و زەوی خوا بە پاك دەگرن و ستایشی دەکەن، بەڵام ئەوە کە هەموو شتێك خوا بە پاك بگرێ وستایشی بکات و ئێمەش تێی نەگەین، تەنیا لەم سوورەتەدا هاتوە.

٥- تەنیا لەم سوورەتەدا باسی ڕێزگرتنی خوا لە مرۆڤ کراوە، بە بێژەی (تكريم) کە لە ئایەتی ژمارە (٧٠)دا هاتوە: ﴿ وَلَقَدۡ كَرَّمۡنَا بَنِيٓ ءَادَمَ ... ﴿٧٠﴾ ﴾الإسراء، بەو بێژەیە تەنیا لێرەدا هاتوە، ئەگەرنا لە سوورەتی (**التين**)دا: ﴿ لَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ فِيٓ أَحۡسَنِ تَقۡوِيمٖ ﴿٤﴾ ﴾التين، واتە: بە دڵنیایی مرۆڤمان لە باشترین شێوەدا دروستکردوە.. هەروەها لە کۆتایی سوورەتی (**الأحزاب**)دا: ﴿ إِنَّا عَرَضۡنَا ٱلۡأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَٱلۡجِبَالِ فَأَبَيۡنَ أَن يَحۡمِلۡنَهَا وَأَشۡفَقۡنَ مِنۡهَا وَحَمَلَهَا ٱلۡإِنسَٰنُۖ إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومٗا جَهُولٗا ﴿٧٢﴾ ﴾ الأحزاب، واتە: ئەمانەتمان ڕانواند لەسەر ئاسمانەکان و زەوی و چیاکان، نەیانتوانی هەڵی بگرن و لێی ترسان، بەڵام ئینسان هەڵی گرت، هەروەها لە سوورەتی (**البقرة**)و لە

چەند شوێنێکی دیکەدا، باسی ئەوە کراوە کە مرۆڤ جێنشینی خوایە، بەڵام وشەی ڕێزمان لێگرتوە (**كرَّمنا**) تەنیا لەم ئایەتی ژمارە (٧٠)ی سوورەتی (**الإسراء**)دا هاتوە.

٦- تەنیا لەم سوورەتەدا باسی پایەی ستایشکراو (**المَقَامُ المَحمُود**)ی پێغەمبەر ﷺ کراوە: ﴿ وَمِنَ ٱلَّيۡلِ فَتَهَجَّدۡ بِهِۦ نَافِلَةٗ لَّكَ عَسَىٰٓ أَن يَبۡعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامٗا مَّحۡمُودٗا ﴿٧٩﴾ ﴾الإسراء، واتە: لە شەویدا بێداربە وشەونوێژ بکە ئەوە زێدەیە (لە فەرزەکان) بۆ تۆ، نیزیکە کە پەروەردگارت تۆ زیندوو بکاتەوە و پایەی ستایشکراوت پێبدا.

٧- تایبەتمەندییەکی دیکەی ئەم سوورەتە ئەوەیە، کە تەنیا لەم سوورەتەدا باسی ڕووح کراوە، هەڵبەتە وشەی ڕووح لە قورئاندا زۆر جار هاتوە، بەڵام ڕووح کە لە بارەیەوە پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ کرابێ و مەبەستیش پێی گیان (**روح**)ی مرۆڤ بێ و، خوای پەروەردگار وەڵامەکەی فێر بکات، تەنیا لەم سوورەتەدا هاتوە، کە دەفەرموێ: ﴿ وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنۡ أَمۡرِ رَبِّي وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلۡعِلۡمِ إِلَّا قَلِيلٗا ﴿٨٥﴾ ﴾الإسراء، واتە: لە بارەی ڕووحەوە پرسیارت لێدەکەن، بڵێ: ڕووح لە کاری پەروەردگارمە و، ئەندازەیەکی کەمیش نەبێ زانیارییتان پێنەدراوە {یانی: بەو ئەندازە کەمە زانیارییەش دەرکی چییەتی ڕووح ناکەن}.

٨- لەم سوورەتەدا لە بیانووەکانی کافرەکان بەسەر یەکەوە نۆ (٩) بیانوو هاتوون، ئەوانەیان کردۆتە پاساو و بیانوو کە ئەوە داواکارییانەیان بۆ جێبەجێ بکات، ئنجا ئیمان بە پێغەمبەر ﷺ بێنن و بڕوا بە قورئان بێنن، لە ئایەتەکانی: (٨٩ - ٩٤)دا.

٩- تایبەتمەندییەکی دیکەی ئەم سوورەتە ئەوەیە، کە تەنیا لەم سوورەتەدا باسی چۆنیەتی نوێژ و پاڕانەوە کراوە، لە ڕووی دەنگ هەڵهێنان و دەنگ کپ کردنەوەوە، خوا ﷻ ئامۆژگاریی پێغەمبەر ﷺ دەکات: ﴿ وَلَا تَجۡهَرۡ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتۡ بِهَا وَٱبۡتَغِ بَيۡنَ ذَٰلِكَ سَبِيلٗا ﴿١١٠﴾ ﴾الإسراء، (صلاة) دەگونجێ مەبەست پێی نوێژ بێت و، دەشگونجێ مەبەست پێی موتڵەقی پاڕانەوەو ڕاز و نیاز بێ لەگەڵ خوادا، دەفەرموێ: نە دەنگت بە (صلاة) بەرز بکەوەو، نە دەنگیش کپ و نزم بکەوە، ﴿ وَٱبۡتَغِ بَيۡنَ ذَٰلِكَ سَبِيلٗا ﴾، لەو نێوانەدا {لە نێوان دەنگهەڵێنان و دەنگ کپ کردن دا} ڕێیەکی میانجیی بگرە، واتە: حاڵەتێکی میانجیی بەخۆوە بگرە.

ئەمە پێناسەو خستنەڕووی بابەت و نێوەڕۆکیی سوورەتی موبارەکی (الإسراء) بوو، خوا پشتیوان بێ لە داهاتوودا دەچینە سەر دەرسی یەکەم و، ڕوونکردنەوەو شیکردنەوەی ماناو نێوەڕۆکی هەشت (٨) ئایەتی سەرەتای ئەم سوورەتە موبارەکە، کە وەك گوتم: وەك پێشەکیی وان بۆ کۆی بابەتەکانی.

## شەشەم: دابەشكردنی بابەتەكانی ئەم سوورەتە بۆ یازدە دەرس:

وەك عادەتی خۆم لە تەفسیر كردنی هەموو سوورەتەكاندا، پێشێ باش باش سەرنجی ئایەتەكان دەدەم و تێیانەوە ڕادەمێنم: داخۆ چەند ئایەت زیاتر پێكەوە پەیوەستن، ئەگەرنا وەك لە سەرەتای تەفسیری سوورەتی (**الأنعام**)دا باسم كردوە، بە تایبەت سوورەتە مەككەییەكان، (**ماشاءالله**) وەك دەریا چۆن شەپۆل دەدات، شەپۆل لە دوای شەپۆل دێ و بۆت لە یەك جیا ناكرێتەوە و هەمووی پێكەوە پەیوەستە، زۆر جار سوورەتە مەككەییەكانیش بەو شێوەیەن، سوورەتە مەدینەییەكان جار جار بەپێی باس و بابەتەكان، دەتوانی لێكیان جیا بكەیەوە.

بەڵام بەهەر حاڵ، پێموایە سوورەتە مەككەییەكانیش خوای كارزان و زاناو شارەزا و میهرەبان، وای داناون {وەك تاكو ئێستا هەروام هێناوە} كە هەر كۆمەڵە ئایەت، كۆمەڵە ئایەت، جۆرێك لە پەیوەستیی تایبەتییان پێكەوە هەیە، كە دەتوانی بیانكەی بە دەرسێك، لە كۆڕێكدا، لە وتارێكدا، ئەوانە بەیەكەوە تەفسیر بكەی، ئەوەش یەكێكی دیكەیە لە ڕووەكانی ئیعجازی قورئان! ئنجا من ئەم سوورەتە موبارەكە كە ئایەتەكانی: سەدو یازدە (١١١)ن، كردوومن بە یازدە (١١) دەرس:

**دەرسی یەكەم:** ئایەتەكانی: (١ - ٨)، واتە: (٨) ئایەت، كە وەك پێشەكیی وایە، بۆ سەرجەم بابەتەكانی دیكەو، باسی شەوڕۆی پێغەمبەری خوا ﷺ دەكات، لە مزگەوتی حەڕامەوە لە مەككە بۆ مزگەوتی ئەقصا لە شام، هەروەها باسی ڕووداوێكی گرنگی گەلی جوولەكە دەكات، كە بریتیە لەوەی دوو جاران خراپەكاریی و تێكدان دەكەن لە زەوییداو، هەردووك جارەكەش خوا ﷻ كەسانێكیان بۆ دەرەخسێنێ كە سزایان بدەن و، لەسەر ئەوە تەمبێیان بكەن.

**دەرسی دووەم:** ئایەتەكانی: (٩ - ٢١)، واتە: (١٣) ئایەت، كە لەو (١٣) ئایەتەدا خوا ﷻ وێڕای پێناسەیەكی ناوازەی قورئان، كە باشترین ڕێنماییە، باسی چەند مەسەلەیەكی دیكەی جۆراو جۆریشی كردوە، كە هەموویان لە بازنەی خستنە ڕووی یاساكانی خوا (**سُنَنُ اللَّه**)دا خۆیان دەبیننەوە، كە وەك دواتر قسەیان لەسەر دەكەین، خوا ﷻ لەو چەند ئایەتەدا، كۆمەڵێك یاسای خۆی (یاسای گەردوونی) كە لە ژیانی بەشەردا دایناون، خستوونیە ڕوو.

**دەرسی سێیەم:** ئایەتەكانی: (٢٩ - ٣٩)، واتە: (١٨) ئایەت، كە باسی بیست و چوار (٢٤) ڕەوشت و ئاكاریان تێدا كراوە، دەشگونجێ بڵێین: (٢٥) یان زیاتریش، (١٢)ی پەسندو، (١٢)ی ناپەسند، كە

(١٢) پەسندەکان بە بە تەنیا پەرستنی خوا (**التوحید**) دەستیان پێکراوەو، هەر بەویش کۆتاییان پێ هێنراوە، ئنجا تێکهەڵکێش لەگەڵ تەنیا پەرستنی خوا، وەك ئاکارێکی زۆر ناپەسندیش باسی هاوبەش بۆ خوا دانان کراوە، هەم لە سەرەتاوە هەم لە کۆتاییەوە، هەروەها پێناسەی حیکمەت کراوە بە: وەدەستهێنانی خۆ ڕازاندنەوە بە سیفەتە بەرزو پەسندەکان و، لە خۆ داڕنین و خۆ پاککردنەوە لە سیفەتە نزم و پەستەکان، واتە: (**التحلِیَةُ بِالفَضَائِلِ، والتَّخلِیَةُ مِنَ الرَّذَائِلِ**).

**دەرسی چوارەم:** ئایەتەکانی: (٤٠ - ٥٢)، واتە: (١٣) ئایەت دەگرنەوە، کە تێیاندا کۆمەڵێك ڕاستیی گەورەو گرنگ لە بارەی: خوا بەیەکگرتن و، ڕۆژی دوایی و قورئانەوە، خراونە ڕوو، لە میانی ئەوەشدا ئاماژە بە ژمارەیەك بیرۆکەو هەڵوێستی پووچ و نەفامانەی بێبڕوایان کراوە و ئەگەر بە پێویست زانرابێ، ئەو بیرۆکانە بەرپەرچیش دراونەوە، جاری واش هەیە بیرۆکەیەك کە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان (کافرەکان) خستوویانەتە ڕوو، خوا ﷻ باسی دەکات، هەر بە باس کردنی ئیکتیفا دەکات، چونکە هێندە پووچە! پێویستیی بە دەرخستنی پووچەڵییەکەی ناکات.

**دەرسی پێنجەم:** ئایەتەکانی: (٥٣ - ٦٠)، واتە: (٨) ئایەت، لەم (٨) ئایەتەشدا چەند ڕێنماییەکی گرنگ ئاڕاستەی پێغەمبەر ﷺ و مسوڵمانان کراون، لە بواری هەڵسوکەوت لەگەڵ نەیارانیان دا، هەروەها باسی پایەی بەرزو بێ وێنەی خوا کراوە، کە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) و بەندە بۆ خوا صوڵحاوەکان، چۆن مامەڵەی لەگەڵدا دەکەن و، چۆن هەموو هەوڵ و کۆششیان ئەوەیە کە زیاتر لە خوا نیزیك ببنەوە، هەروەها باسی چەند یاسایەکی خوای کارزان کراوە، لە ژیانی بەشەردا.

**دەرسی شەشەم:** ئایەتەکانی: (٦١ - ٦٥)، واتە: (٥) ئایەت، تێیاندا باسی بەسەرهاتی ئادەم عليه السلام، و ئیبلیسی نەفرین لێکراو، کراوە، کە چۆن لەبەر حەسەد و خۆ بەزلگریی، کڕنووشی ڕێزگرتنی بۆ ئادەم نەبردوە و، هەڕەشەی سەختیشی لەوەچەکەی کردوە، کە هەموویان گومڕا بکات، خوای باڵا دەستیش بێ منەتی کردوە و، پێشی ڕاگەیاندوە: کە ناتوانێ بەندە چاك و ساغەکانی خوا، بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە.

**دەرسی حەوتەم:** ئایەتەکانی: (٦٦ - ٧٢)، واتە: (٧) ئایەت دەگرێتەوە، کە لەم حەوت ئایەتەشدا خوا ﷻ باسی بەخشش و کەرەمی بێ سنووری خۆی لەگەڵ بەندەکانیدا دەکات، هەم لە بواری نیعمەتەکانیدا، وەك ملکەچکردنی دەریاو وشکانیی، بۆیان، هەم لە بواری دەرباز کردنی مرۆڤەکاندا لە کارەسات و بەڵایەکان، پاشان باسی ڕێزگرتنی خوا لە مرۆڤەکان و، دابینکردنی پێداویستییەکانی ژیان و گوزەرانیان کراوە، لە کۆتاییشدا باسی سەرەنجامی پڕ خێر و فەڕی بڕواداراني بەرچاو ڕۆشن کراوە، بە پێچەوانەشەوە: سەرەنجامی شووم و نەگبەتی بێبڕوایانی دڵ کوێر لە قیامەتدا، خراوەتە ڕوو.

**دەرسی هەشتەم:** ئایەتەکانی: (٧٣ - ٨١)، واتە: (٨) ئایەت دەگرێتەوە، لەم دەرسەدا تەوەری سەرەکیی بریتیە لە ئامۆژگاریی و ڕێنمایی کردنی خوا بۆ پێغەمبەر ﷺ و لە پشت ئەویشەوە

بۆ ئۆممەتەکەی و شوێنکەوتووانی، کە وریای فرت و فێڵ و پیلان و گوشاری بێبڕوایان بن: لە ڕاستەڕێ لایان نەدەن، هەروەها باسی هەوڵی کافرەکان کراوە بۆ دەربەدەرکردن و شار بەدەرکردنی پێغەمبەر ﷺ لە مەککە کراوە، پاشان خوا ڕێنمایی پێغەمبەرەکەی خۆی کردوە، کە نوێژە فەرزەکان و شەو نوێژیش بکات و، لە خواش بپاڕێتەوە کە چونە ژوور و چونە دەری، باش و ڕاست و ڕێك بێ و ڕاییبگەیەنێ: کە هەق هات و باتیڵ پووچەڵ بۆوە.

**دەرسی نۆیەم:** ئایەتەکانی: (٨٢ - ٩٦)، واتە: (١٥) ئایەت دەگرێتەوە، کە تەوەری سەرەکیی ئەم پازدە ئایەتەش دوو بابەتن:

بابەتی یەکەم: باسی قورئانە، هەرچەندە هەندێك مەسەلەی دیکەشی لەگەڵ تێواخن کراون، بەڵام چەقەکە هەر باسی قورئانە.

بابەتی دووەم: کە تەوەری دووەم پێکدێنێ، باسی بیانوو گرتنی کافرەکانە، کە پێشنیاری سەیرو سەمەرەیان بۆ پێغەمبەری خوا کردوە ﷺ تاکو بڕوای پێبێنن، خواش وەڵامی ددانشکێنی قسەکانیانی فێری پێغەمبەرەکەی کردوە ﷺو، ئێرە تاکە شوێنێکە کە کۆمەڵێك بیانوو بەسەر یەکەوە لە لایەن کافرەکانەوە بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ خراونە ڕوو، کە ئەو شتانەمان بۆ جێبەجێ بکە، ئنجا ئێمە بڕوات پێ دێنین.

**دەرسی دەیەم:** ئایەتەکانی: (٩٧ - ١٠٤)، واتە: (٨) ئایەت، لەم (٨) ئایەتەشدا، سەرەتا لە چوار ئایەتی یەکەمدا چەند مەسەلەیەکی جۆراوجۆر خراونە ڕوو، کە تەوەری سەرەکییان بەرپەرچدانەوەی قسەو قاڵی کافرەکان و دەرخستنی سەرەنجامی شوومیانە لە ڕۆژی دوایی دا، هەروەها باسی توانایی خوا ﷻ بەسەر زیندووووکردنەوەی مردوواندا و، باسی چرووکیی کافرەکان و دەوڵەمەندیی و بێ نیازیی خوا کراوە،

پاشان لە چوار ئایەتی دووەم دا، پێکەوە باسی ڕووبەڕووبوونەوەی مووسا عليه السلامو، فیرعەون کراوەو هەرکام لە: وتووێژی نێوانیان و، سەرەنجام و ئاکامی بێ مرادانەی فیرعەون و شوێنکەوتووانی و، ئاکامی بەختەوەرانەی مووسا و گەلەکەی (بنو إسرائیل)، خراوەتە ڕوو.

**دەرسی یازدەیەم و کۆتایی:** ئایەتەکانی: (١٠٥ - ١١١)، واتە: (٧) ئایەت دەگرێتە خۆی، تەوەری سەرەکیی ئەم حەوت ئایەتەش، هەر باسی قورئان و پێغەمبەری کۆتاییە ﷺ، پاشان باسی یەکتایی خوا لە هەر سێ بوارەکانی: (ناوو سیفەتەکان، پەروەردگارێتیی، پەرستراوێتیی)دا، هەروەها ئامۆژگاریی خوا ﷻ بۆ پێغەمبەر ﷺ لە بواری چۆنیەتی نوێژ و پاڕانەوەی دا، بە نسبەت دەنگ بەرز و نزم کردنەوە، ئەوەش خراوەتە ڕوو، کە هەوڵبدات بە شێوەیەکی میانجیی نزاو پاڕانەوەکان، یاخود نوێژ و تاعەتەکەی ئەنجام بدات، واتە: نە دەنگ زۆر هەڵێنێ، نەدەنگ زۆریش کپ بکات.

## پێناسەی ئەم دەرسە

لەم دەرسەماندا هەشت (٨) ئایەتی سەرەتای سوورەتی (الإسراء) شی دەکەینەوە، ئایەتی: (١ - ٨)، کە وەك پێشتر باسمان کرد: ئەم (٨) ئایەتە بۆ کۆی باس و بابەتەکانی ئەم سوورەتە، وەك پێشەکیی وان و، دوو بابەتی گەورەو گرنگیان تێدا خراونە ڕوو:

**یەکەم:** سەفەری شەو، شەوڕۆیی کردنی خوای بەرز و مەزن بە پێغەمبەر ﷺ لە مزگەوتی حەرامەوە لە مەککە، بۆ مزگەوتی ئەقصا لە شام (فەڵەستین) لە بەشێکی شەوێکدا، کە ئەوە بە بڕوای من، پاش پێغەمبەرایەتیی و وەحیی بۆ ناردنی خوا بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ گەورەترین و گرنگترین ڕێز لێنانی خوای کارزانە، بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ.

**دووەم:** هەواڵدان بە: دوو جار هەڵسانی جوولەکە بە تێکدان و خراپەکاریی و، ستەم و دەستدرێژیی لە زەویدا، لەو شوێنەی کە خۆیان دەسەڵاتیان تێیدا دەبێ لە شام، دوایی ڕەخساندنی کەسانێك لە لایەن خواوە (ڕەخساندنی کۆمەڵە بەندەیەك)، بۆ تەمبێ کردنی جوولەکەکان و لووت شکاندنیان، بابەتی یەکەم لە ئایەتی یەکەمدا، خراوەتە ڕووو، بابەتی دووەمیش لە ئایەتەکانی: (٤ - ٨)دا خراوەتە ڕووو، لە ئایەتی: (٢ و ٣)شدا بابەتێکی دیکە نێواخن کراوە، کە باسی نووحە عليه السلام و باسی ئەوەیە کە خوا ﷻ کتێبی بە مووسا داوە، ببێتە ڕێنمایی بۆ گەلی ئیسرائیل.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿سُبْحَٰنَ ٱلَّذِىٓ أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِۦ لَيْلًا مِّنَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ إِلَى ٱلْمَسْجِدِ ٱلْأَقْصَا ٱلَّذِى بَٰرَكْنَا حَوْلَهُۥ لِنُرِيَهُۥ مِنْ ءَايَٰتِنَآ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١﴾ وَءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ وَجَعَلْنَٰهُ هُدًى لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَلَّا تَتَّخِذُوا۟ مِن دُونِى وَكِيلًا ﴿٢﴾ ذُرِّيَّةَ مَنْ حَمَلْنَا مَعَ نُوحٍ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ عَبْدًا شَكُورًا ﴿٣﴾ وَقَضَيْنَآ إِلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ فِى ٱلْكِتَٰبِ لَتُفْسِدُنَّ فِى ٱلْأَرْضِ مَرَّتَيْنِ وَلَتَعْلُنَّ عُلُوًّا كَبِيرًا ﴿٤﴾ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ أُولَىٰهُمَا بَعَثْنَا عَلَيْكُمْ عِبَادًا لَّنَآ أُو۟لِى بَأْسٍ شَدِيدٍ فَجَاسُوا۟ خِلَٰلَ ٱلدِّيَارِ ۚ وَكَانَ وَعْدًا مَّفْعُولًا ﴿٥﴾ ثُمَّ رَدَدْنَا لَكُمُ ٱلْكَرَّةَ عَلَيْهِمْ وَأَمْدَدْنَٰكُم

بِأَمْوَٰلٍ وَبَنِينَ وَجَعَلْنَٰكُمْ أَكْثَرَ نَفِيرًا ﴿٦﴾ إِنْ أَحْسَنتُمْ أَحْسَنتُمْ لِأَنفُسِكُمْ وَإِنْ أَسَأْتُمْ فَلَهَا فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ ٱلْءَاخِرَةِ لِيَسُـۥٓـُٔوا۟ وُجُوهَكُمْ وَلِيَدْخُلُوا۟ ٱلْمَسْجِدَ كَمَا دَخَلُوهُ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَلِيُتَبِّرُوا۟ مَا عَلَوْا۟ تَتْبِيرًا ﴿٧﴾ عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يَرْحَمَكُمْ وَإِنْ عُدتُّمْ عُدْنَا وَجَعَلْنَا جَهَنَّمَ لِلْكَٰفِرِينَ حَصِيرًا ﴿٨﴾

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

{بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە . ئەو کەسە (ئەو زاتە) پاك و بێ خەوشە کە (لە بەشێکی) شەوێکدا شەورۆیی بە بەندەکەی خۆی کرد، لە مزگەوتی حەرامەوە (لە شاری مەککە) بۆ مزگەوتی دوورتر {ئەقصا، لە شاری قودس}، کە پیت و پێزمان خستۆتە دەور وبەری، (بۆیەش ئەو سەفەر و شەورۆییەمان پێکرد)، تاکو لە نیشانەکانی خۆمانی پێشان بدەین، بێگومان ئەو (خوا) بیسەری بینەرە ﴿١﴾ هەروەها کتێبیشمان بە مووسا داو، کردمانە ڕێنمایی بۆ بەنی ئیسرائیل (پێشمان گوتن:) کە جگە لە من سەرپەرشتیارێکی دیکە مەگرن ﴿٢﴾ ئەی وەچەی ئەوانەی کە لەگەڵ نووح دا (لە کەشتییەکەیدا) هەڵمانگرتن! بە دڵنیایی ئەو بەندەیەکی سوپاسگوزار بوو (بۆ خوا) ﴿٣﴾ لە کتێبی (تەورات)یشدا بڕیارمان لەسەر بەنی ئیسرائیل داو، پێمان ڕاگەیاندن کە: بە دڵنیایی ئێوە دوو کەڕەتان خراپەکاریی و تێکدان لە زەویدا دەکەن و، بە ستەم و خۆ سەپاندنێکی گەورە باڵادەست دەبن ﴿٤﴾ ئنجا کە (کاتی) بەڵێنی کەڕەتی یەکەمیان هات (و خراپەکارییتان کرد)، چەند بەندەیەکی جەنگاوەری زەبر دەستی خۆمانمان دەنێرینە سەرتان، کە کەلێن و کونی خانووەکان (لێتان) دەپشکنن، (بۆ سۆراغ کردنتان و گرتن و کوشتنتان)، ئەوەش گفتێکە ئەنجام دراوە (بڕیاری کۆتایی لە بارەوە دراوە) ﴿٥﴾ دوایی نۆرەی زاڵبوون بۆ ئێوە دەگێڕینەوەو، سامان و کوڕانتان بۆ دەڕەخسێنین و ژمارەی کەسەکانی ئێوە (کەسە جەنگاوەرەکان) زیاتر دەکەین (لەوان) ﴿٦﴾ ئەگەر چاکە بکەن! چاکە لەگەڵ خۆتان دەکەن و، ئەگەر خراپەش بکەن! هەر بە خۆتانی دەکەن، ئنجا کە (کاتی) بەڵێنی ئەوی دیکە (دووەم) هات، (ستەم و خراپەکارییتان کردەوە لە زەویدا، ئێمە دووبارە بەندە جەنگاوەرە زەبر دەستەکانمانتان دەنێرینەوە سەرتان)، تاکو ڕووەکانتان (بە هۆی مەینەتیی و گرفتارییەوە) خەمبار بن، هەروەها تاکو (دوژمنەکانتان) بچنەوە نێو

مزگەوتەکەوە، وەك چۆن یەکەمجار چوون و، بۆ ئەوەی هەرچی ملهووڕیی و خۆسەپێنیی کردوویانە، بە وێرانکردن وێرانی بکەن ﴿٧﴾ نیزیکە پەروەردگارتان بەزەییتان لەگەڵدا بنوێنێ، (ئەگەر بگەڕێنەوە سەر ڕاستە ڕێ)، ئەگەر بشگەڕێنەوە (سەر ستەم و خراپەکاریی)، ئێمەش دەگەڕێینەوە سەر سزادانتان، دۆزەخیشمان کردۆتە سجنی بێبڕوایان ﴿٨﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(سُبْحَٰنَ): (السَّبحُ: المَرُّ السَّرِيعُ فِي المَاءِ أَو فِي الهَوَاءِ، والتَّسبِيحُ تَنزِيهُ اللَّهِ تَعَالى، وسُبْحَانَ أَصْلُهُ مَصدَرٌ نَحُو غُفرَانَ).

وشەی (سَبْحانَ) لە (سَبْح)ەوە هاتوە، کە بە ڕۆیشتنی خێرا دەگوترێ: لە ئاو، یاخود لە هەوادا، [مەلەکردن]، (تَسبِيح)یش بریتیە لە بە پاکگرتنی خوای بەرز، (سُبْحَانَ) ئەصڵەکەی چاوگە، یانی: (أُسَبِّحُ: سُبْحَانَ)، یان: (سَبَّحْتُ اللَّهَ تَسبِيحاً) أي (نَزَّهْتُ اللَّهَ تَنْزِيهاً) یانی: خوام بە پاکگرت بە پاکگرتن.

(أَسْرَىٰ): (السُّرَى: سَيْرُ اللَّيْلِ يُقَالُ: أَسْرَى يُسرِي، وَسَرَى يَسرِي)، (سُرى): بریتیە لە شەوڕۆیی (سەفەری شەو)، ئنجا بە دوو شێوە هاتوە: ١- (أَسْرَى يُسْرِي)، ٢- (سَرى يَسرِي)، هەردووکیان بە مانای: سەفەری شەوی کرد، دێن.

(وَكِيلًا): (التَّوْكِيلُ: أَنْ تَعْتَمِدَ عَلَى غَيرِكَ، وَتَجْعَلَهُ نَائِبَاً عَنْكَ، وَالوَكِيلُ فَعِيلٌ بِمَعنَى المَفعُول: ﴿وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴿٨١﴾﴾النساء، أَي: إِكْتَفِ بِهِ أَن يَتَوَلَّى أَمْرَك)، وشەی (تَوکِیل) ئەوەیە کە تۆ پشت بە غەیری خۆت ببەستی و، بیکەیە بریکاری خۆت، وشەی (وَكِيل) (فَعِيل)ە، بەڵام بە مانای (مَفعُول)ە، (وَكِيل)، واتە: (مَوكُول)، یانی: (مَوكُولُ إِلَيهِ)، کار پێ سپێردراو، کە دەفەرموێ: ﴿وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴿٨١﴾﴾النساء، واتە: ئیکتیفا بکە بەوەی خوا کاروبارت بۆ بەڕێوەبەرێ.

(وَقَضَيْنَآ إِلَىٰ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ فِي ٱلْكِتَٰبِ): (القَضَاءُ: فَصْلُ الأَمْرِ قَولاً كَانَ أَو فِعلاً)، (قَضَاء): بریتیە لە یەکلایی کردنەوەی کارێك، ئنجا بە قسە، یان بە کردەوە، ئەگەر بە قسە بێ، واتە: بڕیاری کۆتایی، ئەگەر بە کردەوە بێ، واتە: بە کردەوە ئەو شتە لێك جیا

بکەیـەوە، (وَقَضَيْنَآ إِلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ فِى ٱلْكِتَٰبِ)، واتـە: لـە کتێبـدا کـە مەبەسـت پێـی تەوراتـە، یاخـود کتێبـەکانی دیکـە، وەك دوایـی بـاسی دەکەیـن، ئـەو بڕیارەمـان بـۆ بـەنی ئیسـرائیل داو، پێشـمان ڕاگەیانـدن.

(وَلَتَعْلُنَّ عُلُوًّا كَبِيرًا): هەروەهـا خۆتـان بـەرز دەکەنـەوە و باڵا دەسـت دەبن بە باڵا دەسـت بوونێـکی گـەورە، (عَـلاَ يَعْلُـو عُلُـوّاً وَهُـوَ عَـالٍ، وَعَـلِيَ يَعْـلَى عَـلاَءً فَهُـوَ عَـلِيٌّ، والعُلُـوُّ: الإرتِفَـاع)، (عَـلاَ، يَعْلُـو، عُلُـوَّاً، وهُـوَ عَـالٍ)، واتـە: بـەرز بـوو، بـەرز دەبێتـەوە، بـەرز بوونـەوە، ئـەو بـەرزە، هەروەهـا (عَـلِيَ، يَعْـلَى، عَـلاءً فَهُـوَ عَـلِيٌّ)، ئەویـش بـە هەمـان شـێوە، بـەرز بـۆوە، بـەرز دەبێتـەوە، بـەرز بوونـەوە، ئـەو بـەرزە، کەواتـە: (عَـالٍ) و (عَـلِيّ)، هەردووکیـان بـە مانـای بـەرز دێـن، ئنجـا یەکیـان لە (عَـلاء)وە هاتـوە، یەکیـان لـە (عَلِيّ)یـەوە هاتـوە، (عُلُوّ)یـش، واتـە: بـەرز بوونـەوە، کـە بـە تەئکیـد مەبەسـت پێـی بـاڵا دەسـتیی و دەسـەڵات ڕانـان و خەڵـك خسـتنە ژێـر ڕکێفـی خۆیـە.

(أُوْلِى بَأْسٍ شَدِيدٍ): (البَـأْسُ والبَأْسَـاءُ: الشِّـدَّةُ فِي النِّكَايَـة)، وشـەی (بَـأسُ) و (بَأسَـاء)، ئەوەیـە کـە ئینسـان لـە جەنگـدا سـەخت بـێ و تونـد و بەهێـز بـێ، (أُوْلِى): یـانی (أصحـاب)، (أُوْلِى بَأْسٍ شَدِيدٍ): یـانی: خاوەنـانی هێزێـکی زۆر لـە جەنگـدا، (أَي ذوِي قُـوَّةٍ شَـدِيدَة)، یـانی: خاوەنـانی هێزێـکی زۆر، واتـە: زەبـر دەسـت و، زەبروەشێن.

(فَجَاسُوا۟ خِلَٰلَ ٱلدِّيَارِ)، (أَي: تَوَسَّـطُوهَا وتَـرَدَّدُوا بَيْنَهَـا، وَقِيْـلَ: الجَـوْسُ: طَلَـبُ ذَلِـكَ الـشَيء بِاسـتقصَاء)، (فَجَاسُوا۟ خِلَٰلَ ٱلدِّيَارِ)، واتـە: ئـەو دوژمنانـە کـە بەسـەرتاندا دەدەن، بـە نێـو کـۆڵان و کووچەکانـدا دەگەڕێـن، واتـە: پێیـدا دێـن و دەچـن، یـانی: هەمـووی دەخەنـە ژێـر ڕکێفـی خۆیـان، هەندێکیـش گوتوویانـە: وشـەی (جَـوْس)، بریتیـە لـە داوا کـردنی شـتێك بـە پشـکنین و سـۆراغ کـردن و لێگـەڕانی، واتـە: هەمـوو کـون و قوژبنانتـان لـێ دەگەڕێـن.

(ٱلْكَرَّةَ): (الكَـرُّ: العَطْـفُ عَـلَى الـشَّيء بِالـذَّاتِ أَوِ بالفِعْـلِ)، (کَـرّ) بریتیـە لـەوەی شـتێك بگێڕدرێتـەوە بـۆ شـتێك، بابدرێتـەوە بـۆ لای، ئنجـا خـودی شـتەکە بگێڕدرێتـەوە، یاخـود، کردەوەکـەی بـۆ بگێڕدرێتـەوە، (الكَـرَّةُ: الرَّجعَـةُ وزنـاً وَمَعْنَـىً)، (کَـرَّة) بـە مانـای (رجعـة) دێ، واتـە: یـەك جـار گەڕانـەوە، ڕەنگـە (کـەڕەت)ی کوردیـش هـەر لـەوەوە هاتبـێ.

(نَفِـيرًا): (نَفَـرُوا إِلَى الـشَّيء: أَسرَعُـوا إِلَيـهِ، وَيُقَـالُ لِلقَـومِ النَّافِرِيـن لِحَـربٍ، أَو غَيرِهَـا: نَفِير، تَسـمِيَةً بِالمَصـدَرِ)، (نَفَـرَ)، واتـە: بـۆ شـوێنەکە چـوو بـە خێرایـی، (نَفَـرُوا)، واتـە: بەخێرایـی بـۆی چـوون،

خەڵكێك كە بۆ جەنگ، یان بۆ شوێنێك دەچن بە خێرایی، پێیان دەگوترێ: (نَفِير)، واتە: كەسانێك كە بە خێرایی بەرەو ئەو شوێنە دەچن، بە تایبەتی بۆ جەنگ، كە دیارە (نَفِير) چاوگە، بەڵام وەك ناویش بەكار هاتوە بۆ كۆمەڵە كەسێك كە بە خێرایی بەرەو جەنگ، یان بەرەو مەترسییەك، یان بەرەو شوێنێك دەچن.

(لِيَسُـٔوا۟ وُجُوهَكُمْ): بۆ ئەوەی ڕووتان خراپ بكەن، (**السَّيءُ: خِلَافُ الحَسَنِ، وهُوَ اسْمُ فَاعِلٍ، مِن سَاءَ يَسُوءُ: إِذَا قَبُحَ...**)، (**سَيِّئ**) پێچەوانەی (**حَسَن**)ە، (**حَسَن**) یانی: باش، بەڵام (**سَيِّئ**) یانی خراپ، ئنجا (**سَيِّئ**) (**إسمِ الفَاعِل**)ە، لە (**سَاءَ يَسُوءُ فَهُوَ سَيِّئ**)، (**سَاءَ**) خراپ بوو، (**يَسُوءُ**) خراپ دەبێ، (**سَيِّئ**) یانی: خراپ، هەڵبەتە (لِيَسُـٔوا۟ وُجُوهَكُمْ): بۆ ئەوەی ڕووتان ناشیرین بكەن، ڕووتان تاڵ و دزێو بكەن، ئینسان كە گرفت و مەینەتییەكی بوو، بە ڕووی، بە دەم و چاویدا دەردەكەوێ، خەفەتبار دەبێ، دەم و چاوی ڕەش و تاڵ دەبێ.

(وَلِيُتَبِّرُوا۟ مَا عَلَوْا۟ تَتْبِيرًا): (**تَبِرَ يَتبَرُ ويَتْبَرُ: هَلَكَ، ويَتَعَدَّى بِالتَّضعِيفِ: تَبَّرَهُ وَالإِسْمُ التَّبَار**)، (**تَبِرَ يَتبَرُ ويَتْبَرُ**)، (**تَبِرَ: هلك**) فەوتا. (**تبِر**)، (**لازم**)ەو پێویستیی بە (**مَفعُولُ بِهِ**) ناكات، (**تَبِرَ زَيدٌ**) واتە: لەبەین چوو، بەڵام ئەگەر بتەوێ پێویستی بە (**مَفعُول**) بكات، دەڵێی: (**تَبَّرَ**)، وەك: (**تَبَّرَ زَيدٌ فُلاناً**) یانی: لەبەینی برد، (**تَبَّرَهُ**) یانی: لە بەینی بردو فەوتاندی، ناوی فەوتاندنیش بریتیە لە (**تَبَار**)، ﴿وَلَا تَزِدِ ٱلظَّـٰلِمِينَ إِلَّا تَبَارًۢا ﴿٢٨﴾﴾نووح، واتە: ستەمكارەكان تەنیا فەوتانیان بۆ زیاد بكە، وەك نووح ؈ لە سوورەتی نووح دا فەرموویەتی.

(حَصِيرًا): (**الحَصِيرُ: الحَبسُ**)، (**حَصِير**) بەمانای سجن (**زیندان**) دێ، (**الحَصْرُ: التَضيِيقُ، حَصِيراً حَابِساً وَمِهَاداً**)، دیارە (**حَصر**) بە مانای تەنگ پێهەڵچنینی شتێك دێ، (**حَصِير**) بە مانای (حەپسكەر) و (سجنكەر) دێ، شتێك كە هێڵی بڕوات، هەروەك (**حَصِير**) بە مانای ڕایەخ و شتێكیش دێ كە ڕادەخرێ، بۆ ئەوەی خەڵك لەسەری دابنیشێ.

## مانای گشتی ئایەتەکان

لەبەر ئەوەی ئێمە دواتر باسێکی تایبەت دەکەین، دەربارەی شەوڕۆیی پێغەمبەر ﷺ لە مەککەوە بۆ شام، پاشان باسێکی تایبەتیش دەکەین، دەربارەی ئەو دوو تێکدانەی جوولەکەکان، ئەو دوو ئاژاوەگێڕیی و تێکدان و خراپەکارییەی کە دەیانکەن. هەروەها ئەو دوو جۆرە سزادانەی کە بەسەریاندا سەپێنراون، ئنجا ئەم (٨) ئایەتەش زیاتر باسی ئەو دوو بابەتەن، بۆیە ئێمە لە مانا گشتییەکەدا بە خێرایی بەسەریاندا دەڕۆین، چونکە دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا، دوو باسی تایبەت لەو بارەوە دەکەین.

خوا ﷻ سەرەتا دەفەرموێ: ﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾، بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، واتە: بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە ئەم کارە دەست پێدەکەم، دەست پێکردنی ئەم کارەم بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندەیە، کە ئەویش وەك زۆر جاری دیکە گوتوومانە واتە:

ئەم کارە بەناوی خواوە دەکەم.

ئەم کارە بۆ خوا دەکەم.

ئەم کارە بەپێی شەریعەت و بەرنامەی خوا دەکەم.

ئەم کارە بە پشتیوانیی و هێزو پێزێك کە خوا پێم دەدات، ئەنجامی دەدەم.

هەموو ئەو واتایانە دەبێ لە دڵ بگری، کە دەڵێی: ﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾.

دەفەرموێ: ﴿سُبْحَٰنَ ٱلَّذِىٓ أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِۦ لَيْلًا﴾، پاکیی بۆ ئەو کەسەی، پاکیی بۆ ئەو زاتەی، بێ خەوشیی بۆ ئەو زاتەی، کە شەوڕۆی بە بەندەکەی کرد، ﴿سُبْحَٰنَ﴾، چاوگە، هەندێکیش دەڵێن: ناوە، بەڵام ئەوە زیاتر پێدەچێ کە چاوگ(**مصدر**) بێ، واتە: (**أُسَبِّحُ تَسبِيحاً**)، یان (**سَبَّحْتُ تَسبِيحاً**)، بە پاکم گرت بە بە پاکگرتن، یانی: خوا ﷻ، خوام بە پاك گرت، بە بە پاکگرتن واتە: دوورخستنەوەی خوا لە هەڵەو کەم و کوڕیی و عەیب و ناتەواویی، خواش بۆ خۆی هەر دوورە لە هەڵەو کەم و کوڕیی و عەیب و ناتەواویی، بەڵام واتە: تۆ لە قەناعەت و مێشکی خۆتدا، خوا دوور دەخەیەوە، ئەگەرنا خوا لە واقیعدا هیچ هەڵەو کەم و کوڕیی و ناتەواوییەکی نیە، بەڵام گرنگ ئەوەیە تۆ

قەناعەتەکەت وای لێبێ، ئنجا ئەوە بە نسبەت ستایشی خواوە هەروایە، بە نسبەت بە گەورە گرتنی خواوە هەروایە، بە نسبەت بە بەرز گرتنی خواوە هەروایە، خوا هەر بەرزەو هەر گەورەیەو هەموو گەورەیی و بەرزیی و مەزنیی و پاکیی و چاکیی و ستایشێك هەر هی خوایە، ئەگەر هیچ کەسیش ستایشی نەکات، وکەسیش بەگەورە و بە بەرزی نەگرێ، خوا هەروایە، بەڵام لێرەدا مەبەست ئەوەیە کە ئەو کەسە دەڵێ: من خۆم قەناعەتەکەم وا لێ دەکەم، گرنگ ئەوەیە تۆ خۆت وابی، ئەگەرنا خوای بەرز و مەزن بۆ خۆی هەروایە، ﴿أَسۡرَىٰ بِعَبۡدِهِۦ لَيۡلٗا﴾، شەورۆی بە بەندەکەی خۆی کرد، بە دڵنیایی مەبەست لە بەندەکەی (**محمد**) پێغەمبەرە ﷺ ﴿لَيۡلٗا﴾.

ئنجا هەڵبەتە: خودی ﴿أَسۡرَىٰ﴾، یانی: شەورۆی پێکرد و سەفەری شەوی پێکرد، بەڵام ئەمە لێرەدا بۆ زیاتر جەختکردنەوەیە کە سەفەرەکە بەشەو بووە، یاخود بۆ ئەوەیە کە هەموو شەوەکەشی دانەگرتوە، بەڵکو لە بەشێك لە شەوێکدا ئەو شەورۆیی و سەفەرەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنجام دراوە، ﴿مِّنَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ إِلَى ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡأَقۡصَا ٱلَّذِي بَٰرَكۡنَا حَوۡلَهُۥ﴾، لە مزگەوتی حەرامەوە، ئەو مزگەوتەی کە قەدەغە کراوە، لەو شتانەی کە شایستەی نین، تێیدا ئەنجام بدرێن، یان لە کەسانێك کە شایستەی نین توخنی بکەون، یان قەدەغە کراوە لەوە کە دوژمنان زەفەری پێبەرن، ﴿إِلَى ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡأَقۡصَا﴾، بەرەو مزگەوتی دوورتر، (مزگەوتی دوورتر) بە نسبەت مەککەوە، دیارە ئەو کاتە مزگەوتێك کە لە قودس بووە، دوورتر بووە، ئنجا مزگەوتی ئەقصا بەوە پێناسە دەکات: ﴿ٱلَّذِي بَٰرَكۡنَا حَوۡلَهُۥ﴾، کە پیت و پێزمان خستبووە دەوروبەرەکەی، ئنجا پیت و پێزمان خستبووە دەوروبەرەکەی، وەك دواتر باسی دەکەین، دەگونجێ مەبەست پێی پیت و پێزی مەعنەویی بێ و، دەشگونجێ مەبەست پێی پیت و پێزی ماددیی بێ، یاخود هەردووکیان بێت پێکەوە، هەم بەرەکەتی ماددیی، هەم بەرەکەتی مەعنەویی، ﴿حَوۡلَهُۥ﴾، یانی: نەك هەر شارەکە، بەڵکو کۆی شام، شام لە چەند شوێنێکدا خوا لە قورئاندا بە: ﴿إِلَى ٱلۡأَرۡضِ ٱلَّتِي بَٰرَكۡنَا فِيهَا ...﴿٧١﴾﴾الأنبياء، بەو ناوە پێناسەی کردوە، لەبەر ئەوەی شام:

**١- لە ڕووی مەعنەوییەوە:** شوێنی پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) بووە، بە لای کەمەوە جگە لە پێغەمبەری خۆمان کە سەفەری پێدا کردوە بۆ ئاسمانەکان، جگە لەو، هەر کام لە ئیبراهیم عليه السلام و ئیسحاق و یەعقووب و یوسووف و کوڕەکانیشی کەم و زۆر پەیوەندییان بەوێوە هەبووە، پاشان مووسا عليه السلام و پێغەمبەرانی دیکە، داوود و سولەیمان، ئنجا زەکەریا و یەحیا و عیسا، ئەوانە هەموویان لە شام بوون.

٢- **لە ڕووی ماددییشەوە:** ئەو شوێنە شوێنێکی بەبەرەکەت و بە پێزە، لە ڕووی کشتوکاڵ و، ئاژەڵداریی دەرامەت و، لە ڕووی کەش و هەواو، لە ڕووی ئاوی سازگار و،... هتدەوە، ﴿لِنُرِيَهُۥ مِنْ ءَايَٰتِنَآ﴾، خوا دەفەرموێ: بۆیە ئەو شەوڕۆیەمان بە پێغەمبەر کرد ﷺ، بەو بەندەیەی خۆمان کە موحەممەدە، تاکو لە نیشانەکانی خۆمانی پیشان بدەین، چ لە شام دا، چ لە کاتی بەرزبوونەوەی دا بۆ ئاسمانەکان، ﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ﴾، بەدڵنیایی ئەو بیسەری بینەرە، واتە: خوا ﷻ هەموو شتێك دەبیستێ و هەموو شتێك دەبینێ.

﴿وَءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ وَجَعَلْنَٰهُ هُدًى لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾، هەروەها کتێبمان بە مووسا داو، گێڕامان بە ڕێنمایی بۆ بەنی ئیسرائیل، (**بني**) واتە: وەچە، کوڕان، یاخود: ڕۆڵەکان، (**إسرائيل**)یش نازناوی یەعقووبە ﷺ، لەبەر ئەوەی ئەو هۆزە هەموویان لە یەعقووبەوە پەیدا بوون، یەعقووبیش کوڕی ئیسحاقە، ئیسحاقیش کوڕی ئیبراهیم (**خَلِيلُ الله**)یە، صەڵات و سەلامی خوا لەسەر هەموویان بێ، ﴿أَلَّا تَتَّخِذُوا۟ مِن دُونِى وَكِيلًا﴾، پێشمان ڕاگەیاندن کە جگە لە من بریکارێکی دیکە، کار پێ سپێردراوێکی دیکە، مەگرن، واتە: تەنیا کارەکانی خۆتان بە من بسپێرن، تەنیا پشت بە من ببەستن، تەنیا بەندایەتیی بۆ من بکەن، تەنیا چاوەڕوانییتان لە من هەبێ، بۆ ئەو شتانەی کە تەنیا بە خوا دەکرێن.

﴿ذُرِّيَّةَ مَنْ حَمَلْنَا مَعَ نُوحٍ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ عَبْدًا شَكُورًا﴾، ئەی وەچەی ئەوانەی کە لەگەڵ نووحدا هەڵمانگرتن! (لە کەشتییەکەی نووحدا)، بێگومان ئەو بەندەیەکی سوپاسگوزار بوو، واتە: ئێوە ئەی بەنی ئیسرائیل! وەچەی ئەوانەن کە لە کەشتییەکەی نووحدا هەڵمانگرتن و دەربازمان کردن، کە نووحیش بەندەیەکی سوپاسگوزار بوو بۆ خوا، کەواتە: ئێوەش:

**أ** - هەم لەبەر ئەو نیعمەتەی کە خوا ئێوەی دەرباز کردو، لە فەوتاوەکانی گەلی نووح نەبوون، بەڵکو لە دەربازکراوەکان بوون، ئەگەرنا ئێوە پەیدا نەدەبوون.

**ب** - هەم لەبەر ئەو هەموو چاکەو نیعمەتانەش کە پێمداون، ئێوەش وەك باپیرەتان نووح ﷺ بەندەی سوپاسگوزاری خوا بن.

ئنجا دێتە سەر بابەتی دووەم: ﴿وَقَضَيْنَآ إِلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ فِى ٱلْكِتَٰبِ﴾، هەروەها لە کتێبدا بڕیارمان بۆ بەنی ئیسرائیل داو، پێشمان ڕاگەیاندن، چونکە: (**قضى**) واتە: بڕیارماندا، یان ئەنجامماندا، (**القَضَاءُ: الفَصلُ قَولاً وَفِعلاً**)، کە لێرەدا مەبەست پێی بڕیاردانە، بڕیاری

(**تكوينـی**)ی و (**قـدري**) خـوا، بـەڵام بۆچـی بـە ﴿ إِلَىٰ ﴾، تەعـەدداى كـردوە؟ دەیتـوانی بفەرمـوێ: (**قـضَى**)، بەبـێ پیتـی (الی) وەك: ﴿ فَقَضَىٰهُنَّ سَبْعَ سَمَٰوَاتٍ...(١٢) ﴾فصلـت، بـەڵام بۆچـی دەفەرمـوێ: ﴿ إِلَىٰ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴾؟ ئەمـە یـانی: بڕیارمـان بـۆ دان و پێشـمان ڕاگەیانـدن: (**قَضَينَـا عَـلَى بَنِـي إسرَاءِيـلَ وأَبلَغنَـاهُ إلَيهِـم**).

کـە دەفەرمـوێ: (**فـي الكتـاب**) لـە کتێبـدا، کتێـب، یـان مەبەسـتی پـێ تەوراتـە، یاخـود کتێبـەکانی دیکەیانـە، ﴿ لَتُفْسِدُنَّ فِى ٱلْأَرْضِ مَرَّتَيْنِ ﴾، کـە بـە دڵنیایـی ئێـوە دوو کەڕەتـان لـە زەویـدا خراپەکاریـی دەکـەن، ﴿ وَلَتَعْلُنَّ عُلُوًّا كَبِيرًا ﴾، بـە خـۆ بـە زلگرتـن و خـۆ سـەپاندنێکی گـەورەش خۆتـان دەسـەپێنن، واتـە: دەسـتەڵات پەیـدا دەکەن و باڵادەسـت دەبن.

﴿ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ أُولَىٰهُمَا ﴾، ئنجـا هـەرکات بەڵێنـی یەکەمیـان هـات، واتـە: کاتی تێکـدانی یەکەمیـان هـات، لـەو دووجـارە کـە خراپەکاریـی دەکـەن، (**إذَا جَـاءَ وَعـدُ الإفسَـادَةِ الأُولى**)، یەکەمجـار هەڵسـان بەتێکـدان و خراپەکاریـی و خـۆ فەڕزکـردن، ﴿ بَعَثْنَا عَلَيْكُمْ عِبَادًا لَّنَآ أُو۟لِى بَأْسٍ شَدِيدٍ ﴾، چەنـد بەندەیـەکی خۆمـان کـە خـاوەن هێـز و توانایـەکی زۆری جەنگییـن، بۆتـان دەنێریـن و دەنێرینـە سـەرتان، ﴿ فَجَاسُوا۟ خِلَٰلَ ٱلدِّيَارِ ﴾، هەمـوو کـون و قوژبنـی ماڵەکانتـان لـێ دەپشـکنن، بـە دواتانـدا دەگەڕێـن، لێتـان دەخەفتێـن، سـۆراغتان دەکـەن، بـۆ گرتـن و کوشـتنتان، ﴿ وَكَانَ وَعْدًا مَّفْعُولًا ﴾، ئـەوەش بەڵێنێـکی جێبەجـێ کـراوە، واتـە: هیـچ گومانتـان تێیـدا نەبـێ، تـا ئـەو هەواڵـە کـە خـوا پێتـان دەدات، ئـەوە بڕیارێـکی قەدەریـی هەڵـبراو (**محسـوم**)ی خوایـە ﷻ، ئەگـەر ئێـوە خراپەکاریـی بکـەن! دوای یەکـەم خراپەکارییتـان، خـوا کۆمەڵێـك لـە مرۆڤـەکان کـە بەنـدەی خۆینـی، دەنێرێتـە سـەرتان، کـە خـاوەن هێزێـکی زۆرن و، هەمـوو کـون و کەلێنانتـان لـێ دەپشـکنن و، سـۆراغتان دەکـەن، بـۆ گرتـن و کوشـتنتان.

﴿ ثُمَّ رَدَدْنَا لَكُمُ ٱلْكَرَّةَ عَلَيْهِمْ ﴾، دوایـی ئەوجـار نـۆرەی باڵادەسـتیی بـۆ ئێـوە دەگێڕینـەوە بەسـەر ئەوانـدا، ﴿ وَأَمْدَدْنَٰكُم بِأَمْوَٰلٍ وَبَنِينَ ﴾، هەروەهـا هاوکارییتان دەکەین بـە سـامان و بـە کـوڕان، واتـە: وەچەتـان زۆر دەکەیـن، ﴿ وَجَعَلْنَٰكُمْ أَكْثَرَ نَفِيرًا ﴾، کەسـە جەنـگاوەرەکانی ئێـوەش زیاتـر دەکەیـن، کـە دەڵـێ: زیاتـر دەکەیـن، واتـە: زیاتریـان دەکەیـن لـە جـاری پێشـێتان، یاخـود زیاتریـان دەکەیـن لـە بەرانبەرەکانتـان، هـەردوو واتاکـەی هـەن.

ئنجـا پێـش ئـەوەی بـاسی تێکـدان و خراپەکاریـی جـاری دووەم بـکات، دەفەرمـوێ: ﴿ إِنْ أَحْسَنتُمْ أَحْسَنتُمْ لِأَنفُسِكُمْ ﴾، ئەگـەر چاکـە بکـەن، بـۆ خۆتـان چاکـە دەکـەن، ﴿ وَإِنْ

﴿ أَسَأْتُمْ فَلَهَا ﴾، ئەگەر خراپەش بکەن، هەر بۆ خۆتانی دەکەن، واتە: ئەگەر چاکە بکەن بە قازانجی خۆتانەو، ئەگەر خراپەش بکەن، هەر بە زیانی خۆتانە، چاکەو خراپەکە، هەر ئەستۆی خۆتان دەگرێتەوەو، دەچێتە گیرفانی خۆتانەوە.

﴿ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ ٱلْآخِرَةِ ﴾، ئنجا کاتێك بەڵێنی کەڕەتی تێکدانی دووەمیان هات، بەڵێنی دواجاریان هات (دواجار لە دووەکان)، ﴿ لِيَسُـۥٓـُٔواْ وُجُوهَكُمْ ﴾، واتە: هەرکات بۆ جاری دووەم ئێوە خراپەکارییتان کردو، خۆتان فەڕزکرد بەسەر خەڵکدا، ستەمکارییتان کرد و خۆ سەپاندنتان کرد، ئێمەش لەسەر بەڵێنی خۆمان: کۆمەڵێك لە بەندەکانی خۆمان دەنێرین بۆ سزادانتان، ئنجا کە سزایان دان و دەستیان کرد بە گرتن و کوشتنتان، ﴿ لِيَسُـۥٓـُٔواْ وُجُوهَكُمْ ﴾، سەرەنجام دەم و چاوتان خراپ دەبێ، واتە: دەم و چاوتان خەفەتبار دەبێ، ڕووتان تەمی خەمی لێ دەنیشێ، چونکە ئینسان کە تووشی گرفتاریی و مەینەتیی و ناڕەحەتییەك بێ، لە دەم و چاویدا دەردەکەوێ، ﴿ وَلِيَدْخُلُواْ ٱلْمَسْجِدَ ﴾، هەروەها بۆ ئەوەی {وێڕای سزادانێك کە هۆکاری ئەوە بێ ڕووتان ڕەشهەڵگەڕێ و باری خەمی لێ بنیشێ} بچنەوە نێو مزگەوتەکەشەوە، ﴿ كَمَا دَخَلُوهُ أَوَّلَ مَرَّةٍ ﴾، وەك چۆن جاری یەکەمیش چوبوونە نێوی، چوبوونە نێو مزگەوتەکە، کە بە تەئکید مەبەست: (مزگەوتی ئەقصا)یە، چونکە ئەو مزگەوتەی کە خوا ﷻ لێرەدا باسی کردوە، مزگەوتی ئەقصا بووە، کە پەرستگای جوولەکەکان بووە، کە وەك دوایی باسی دەکەین: پێشێ ئیبراهیم ﷺ بنیاتی ناوە، دوایی داوود چادرەکەی لەو شوێنە هەڵداوە، دوایی سولەیمان لەسەر وەصیەتی بابی لەوێ ئەو پەرستگایەی دروستکردوە، کە ناوی لێنراوە: (**هَيكَلُ سُلَيمَان**)، پەرستگاکانیش بە پێی ژینگەو بارودۆخەکان و بە پێی لەهجەو زمانەکان، ناوەکەیان گۆڕاوە، لە سەردەمی ئیبراهیم دا، لە پەیمانی کۆندا بە سەربڕگە (**مَذبَح**) ناوی هاتوە، لەبەر ئەوەی قوربانییان لەوێ سەر بڕیون، دوایی بە هەیکەل ناوی هاتوە، بەڵام لە ئیسلامدا بە (**مَسجِد**) شوێنی کڕنووش بۆ خوا بردن، ناوی هاتوە: ﴿ وَلِيُتَبِّرُواْ مَا عَلَوْاْ تَتْبِيرًا ﴾، ئەوەیان بەسەردێ، تاکو: هەرچی خۆ فەڕز کردن و خۆ سەپاندنی کە ئەنجامیان داوە، هەمووی تەخت بکەن، واتە: ئەو دەسەڵات و خۆ بەرزکردنەوەیە کە جوولەکەکان کردوویانە، لەبەینی بەرن، ئەوە واتایەك، یاخود: ﴿ وَلِيُتَبِّرُواْ مَا عَلَوْاْ تَتْبِيرًا ﴾، هەتا ئەو کاتەی ئەو جەنگاوەرانە دەسەڵاتیان هەیە، هەموو ئەوەی کە جوولەکەکان وەسەریێکیان ناوە لە سەڵتەنەت و دەستەڵات و دەستەڵاتڕانان، هەمووی تەخت بکەن و لەبەینی بەرن.

لە کۆتایی دا: خوا ﷻ هەر ڕوو بە جوولەکەکان (بەنی ئیسرائیل) و لە پشت ئەوانیشەوە ڕوو لە هەموو مرۆڤەکان و بەندەکانی دیکەی دەکات و، دەفەرموێ: ﴿ عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يَرْحَمَكُمْ ﴾، نزیکە پەروەردگارتان بەزەیی پێتاندا بێت، ئەگەر ئێوە خۆتان وا لێ بکەن، کە شایستەی بەزەیی خوا بن، بێگومان بەزەیی خوا لێتانەوە نزیکە، ﴿ وَإِنْ عُدتُّمْ عُدْنَا ﴾، ئەگەر ئێوە بگەڕێنەوە، ئێمەش دەگەڕێینەوە، واتە: ئەگەر ئێوە بگەڕێنەوە بۆ تێکدان و خراپەکاریی، ئێمەش دەگەڕێینەوە بۆ سزادانتان، ﴿ وَجَعَلْنَا جَهَنَّمَ لِلْكَافِرِينَ حَصِيرًا ﴾، دۆزەخیشمان کردوە بە سجن بۆ بێبڕوایان، یاخود بۆمان کردوون بە ڕایەخ و، لە دۆزەخدا ئەگەر شوێنێك هەبێ ببێتە نشینگەو شوێنی نیشتەجێ بوون و، تێدا پشوودانیان، دۆزەخ و ئاگری دۆزەخە، خوا پەنامانبدات، بەڵام زیاتر ئەو مانایە بەهێزترە کە ﴿ حَصِيرًا ﴾، واتە: (**حَاصِراً أَي: حَابِساً**)، واتە: ئابڵووقەدەرەو سجنکەرەو زیندانتان دەکات و ناهێڵێ بەولاو لادا بچن، بەڵکو حەصرتان دەکات و تەنگتان پێ هەڵدەچنێ.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**پاکیی و بێ خەوشیی بۆ خوایەك، کە لە بەشێکی شەوێکدا، شەوڕۆیی بە بەندەکەی خۆی (موحەممەد) کرد، لە مزگەوتی حەرامەوە بۆ مزگەوتی ئەقصا، کە پیت و پێزی خستۆتە دەوروبەری، تاکو لە نیشانەکانی خۆی پێشانی بدات:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ سُبْحَٰنَ ٱلَّذِىٓ أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِۦ لَيْلًا مِّنَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ إِلَى ٱلْمَسْجِدِ ٱلْأَقْصَا ٱلَّذِى بَٰرَكْنَا حَوْلَهُۥ لِنُرِيَهُۥ مِنْ ءَايَٰتِنَآ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿ سُبْحَٰنَ ٱلَّذِىٓ أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِۦ لَيْلًا ﴾، پاك و بێ خەوشیی بۆ ئەو زاتەی کە شەوڕۆیی بە بەندەکەی خۆی کرد.

وشەی: ﴿ سُبْحَٰنَ ﴾، زانایان دەڵێن: بە پاك گرتنی خوا کاتێك دەبێتە دەستپێکی قسە، ئەوە دەگەیەنێ کە لە دوای ئەوەوە هەواڵێکی سەیر و سەرسوڕهێنەردێ، چونکە: (**سُبحَانَ اللَّه**) زیاتر بۆ حاڵەتی سەرسوڕمان بەکاردێ، وەك هەر لەم سووڕەتی (**الإسراء**) دا هاتووە: ﴿ قُلْ سُبْحَانَ رَبِّي هَلْ كُنتُ إِلَّا بَشَرًا رَّسُولًا ﴿٩٣﴾ ﴾، واتە: بڵێ: پاکیی بۆ پەروەردگارم، ئایا من جگە لە مرۆڤێکی ڕەوانەکراو، چی دیکەم؟

وشەی ﴿ سُبْحَٰنَ ﴾، لێرەدا (**إِسمُ مَصدَرٍ لِـ (سَبَّحَ) مَنصُوبٌ بِفِعلٍ مُضمَرٍ تَقدِيرُهُ: سَبَّحتُ اللَّهَ سُبْحَاناً، أَي: تَسبِيحاً بِمَعْنَى: نَزَّهتُهُ تَنزِيهَاً وبَاعَدتُهُ تَبعِيدَاً مِن كُلِّ سُوءٍ، وفِيهِ: مَعنَى التَّعَجُّبِ مِن بَاهِرِ قُدرَتِهِ فِي إِسرَائِهِ بِعَبدِهِ**).

﴿ سُبْحَٰنَ ﴾ لێرەدا: وەك چۆن بە کەسێك دەڵێی: (**شُكراً**)، (**شُكْرَاً نَابَ مَنَابَ فِعلِ: أَشكُرُكَ**)، لە جیاتی بڵێی: (**أَشكُرُكَ**) سوپاست دەکەم، دەڵێی: (**شُكراً**)، سوپاس، ﴿ سُبْحَٰنَ ﴾ەش، ناوی چاوگە بۆ (**سَبَّحَ**) یانی: بە پاکی گرت، مەنصووب بووە بە کردارێکی شێردراوە، بە مجۆرە: (**سَبَّحتُ اللَّهَ سُبحَاناً أَي: تَسبِيحاً**)، خوام بە پاك گرت

بـە بـە پاکگرتـن، واتـە: دوورمخسـتەوە و بـە پاکـم گـرت و بەبـێ خەوشـم تەماشـا کـرد لـە هـەر شـتێکی خـراپ کـە شایسـتەی خـوا نیـە، هەروەهـا مانـای سەرسـووڕمانیشی تێدایـە کـە خـوا ﷻ بـە دەسـتەڵاتی بـێ سـنووری خـۆی ئـەو سـەفەرە سەرسـووڕهێنەرەی شـەوی بـە بەندەکـەی خـۆی کـردوە، {کـە موحەممـەدە ﷺ و هیـچ گومـان لـەوەدا نیـە کـە مەبەسـت لـە (عَبـدِهِ) موحەممـەدە ﷺ} خـوا ﷻ نازنـاوی عەبـدی بـۆ پێغەمبـەر ﷺ بەکارهێنـاوە، لـەو مەقامـە بـەرزەدا کـە مەقامێـکی زۆر موشـەرریفە، ئەمـەش ئـەوەی لێوەردەگیـرێ کـە بەنـدەی خـوا بـوونی مـرۆڤ، باشـترین حاڵـەتی مرۆڤـەو، بەرزتریـن پێگـەو مەقامـە کـە مـرۆڤ پێـی بـگات، چونکـە ئەوەتـا خـوا ﷻ لـە کاتێکـدا بـاسی شـەوڕۆی پێغەمبـەر دەکات ﷺ، بـاسی ئـەو سـەفەرە سەرسـوڕهێنەرەی دەکات، بـە (عَبـدِهِ) نـاوی دێنـێ، نـا فەرمـوێ: (بِنَبِیِّـهِ)، یـان (بِرَسُـولِهِ)، چونکـە لـە ڕاسـتییدا: بـاش بەنـدەی خـوا بـوونی پێغەمبـەرە ﷺ، وای کـردوە شایسـتەی ئـەوە بـێ خـوا بیکاتـە پێغەمبـەر و ڕەوانەکـراوی خـۆی، (أَسْرَى بِـهِ)، واتـە: سـەفەری شـەوی پێکـرد، بـەڵام ﴿لَيْلًا﴾، بۆیـە بـە (نکـرة) هاتـوە (أَي: فِي جُـزءٍ قَلِيـلٍ مِـنَ اللَّيـل)، لـە ماوەیـەکی کەمـی شـەودا، یـانی: هەمـوو شـەوەکەشی نەگرتۆتـەوە.

ئنجـا ﴿أَسْرَىٰ﴾ و (سَرَى): (أَي: سَـارَ لَيـلاً، مِثـلُ: بَـانَ وأَبَـانَ)، واتـە: ئەگـەر خـوا فەرموو‌باشی: (سَرَى بِعَبـدِهِ لَيـلاً)، هـەروەك: ﴿أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِۦ لَيْلًا﴾ە، وەك چـۆن (بـان) و (أبـان) هەردووکیان یـانی: دەرکـەوت، بـەڵام (أبـان) وێـڕای مانـای (لازم) مانـای (متعـدِّي) یـشی هەیـە یـانی: دەریخسـت، ئنجـا لێـرەدا: (أَسرَى وسَرَى)، وەك: (بـان و أبـان) هەردووکیـان حاڵـەتی لازیمیـان هەیـە، واتـە: سـەفەری شـەوی کـرد، بـەڵام بـە هـۆی (ب)ەیەکـەوە، ﴿أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِۦ﴾، مانـای حاڵـەتی (متعـدِّي) یـان پەیـدا دەبـێ، واتـە: خـوا سـەفەری شـەوی پێکـرد، ئەگەرنـا: ﴿أَسْرَىٰ﴾، واتـە: سـەفەری شـەوی کـرد و (سَرَى)، یـانی: سـەفەری شـەوی کـرد.

دوایی خوا ﷻ باسی سەرەتاو کۆتایی شوێنی سەفەرەکە دەکات و دەفەرموێ.

٢)- ﴿مِّنَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ إِلَى ٱلْمَسْجِدِ ٱلْأَقْصَا﴾، لە مزگەوتی حەرامەوە بەرەو مزگەوتی ئەقصا، مزگەوتی حەرام، دەڵێ: (هُوَ الكَعبَةُ والفَضَاءُ المُحِيطُ بِهَا المُتَّخَذ لِلعِبَادَةِ المُتَعَلِّقَةِ بِالكَعبَةِ، مِن طَوَافٍ بِهَا واعتِكَافٍ عِندَهَا، وصَلَاةٍ قُربَهَا، (وَالمَسجِدُ): مَكَانُ السُجُودِ، والحَرَامَ: الأَمرُ المَمنُوعُ مُشتَقٌّ مِنَ الحَرْمِ وهُوَ المَنعُ).

واتــە: مەبەســت لــە مزگــەوتی حــەڕام: کەعبەیــەو، ئــەو حەوشــەی کــە دەوری داوە، کــە بــۆ خواپەرستیی دانـراوە، ئـەو خـوا پەرستییانەی کـە پەیوەسـتن بـە کەعبـەوە، وەك طـەواف کـردن بـە دەوری کەعبـەدا (سـووڕانەوە) و مانـەوە لـەلای کەعبـەو نوێـژ کـردن لـەوێ.

مەبەست لە (مَسجِد)یش، واتە: شوێنی کڕنووش لێ بردن.

(حَرَام)یـش، واتـە: شـتێکی قەدەغەکـراو لـە (حَرْم)ەوە هاتـوە، یـانی: (منع)، ئنجـا مزگـەوتی کەعبــە بۆیــە پێــی گوتــراوە: مزگــەوتی حــەڕام (کەعبــەو دەوروبــەری)، لەبەرئــەوەی خــوا نەیهێشـتوە ئەهـلی زوڵـم و کوفـر دەسـتیان بیگاتـێ، یاخـود لەبـەر ئـەوە کـە ئـەو شـتانەی لـە شـوێنەکانی دیکـە ڕەوان، لـەوێ قەدەغـەن.

**(فَالمَسـجِدُ الحَـرَامَ: هُـوَ المَـكَان المُعَـدُّ لِلسُّـجُودِ أَي: لِلصَّـلاةِ وهُـوَ الكَعبَـةُ والفَنَـاءُ المَجعُـولُ حَرَمـاً لَهَـا، وهُـوَ يَختَلِـفُ سَـعَةً وضِيقـاً بِاختِـلافِ العُصُـورِ مِـن كَثرَةِ النَّـاسِ فِيـهِ لِلطَّـوَافِ والإِعتِـكَافِ والصَّـلاةِ، وأَوَّلُ مَـن جَعَـلَ لِلمَسجِـدِ الحَـرَامِ جِـدَاراً يُحفَـظُ بِـهِ، هُـوَ عُمَـرُ ابـنُ خَطَّـاب ﷺ سَـنَة سَـبعَ عَـشَرَةَ (١٧) لِلهِجـرَة)**[1].

واتـە: مزگـەوتی حـەڕام ئـەو شـوێنەیە کـە دانـراوە بـۆ کڕنـووش تێدابـردن، یـانی: نوێـژ تێـدا کـردن، کـە بریتیـە لـە کەعبـەو ئـەو حەوشـەیەی بـە دەوریەوەیـەتی، کـە بـۆی کـراوە بـە حـەرەم، کـە ئەویـش فراوانیـی و تەسـکییەکەی بـە پێـی جیاوازیـی چـاخ و سـەردەمەکان گـۆڕاوە، ئەگـەر خەڵـك زیاتـر بووبـێ بۆ طـەواف و ئیعتیـکاف و نوێـژ، ئەوەش کـە بەدەوری کەعبەوەیـە بازنـە و شـوێنەکەی فراوانـتر بـووەو، ئەگـەر خەڵکەکـە کەمـتر بووبـێ، ئەویـش تەسـکتر بۆتـەوە، یەکـەم کەسـیش کـە دیـواری کـرد بـۆ ئـەو مزگەوتـە، (کـە بـە دەوری کەعبەوەیـە) عومـەری کـوڕی خەتتـاب بـوو لـە سـاڵی (١٧)ی کۆچییـدا.

ئەگەرنـا پێشـێ دیوارێـکی نەبـوو، یەکسـەر دوای کەعبـە بەتاڵایـی و بۆشـایی بـوو، یەکسـەر دوایـی دەگەیشـتە ماڵـەکان، ئـەو خانووانـەی کـە بەدەوریـەوە بـوون، بـەڵام عومـەر خـوا لێـی ڕازی بـێ دیوارێـکی بـۆ کـرد، بـۆ ئـەوەی سـنوورەکەی دیاریـی بـکات، ئیـدی ئـەوە ئێسـتاش هــەروەك دەبینیــن: هــەر مــاوە مــاوە، ئــەو ســنووره (ســنووری ئــەو مزگەوتــە) فراوانــتر دەکـرێ و دووکان و خانـووەکان دەڕووخێنرێـن، وەك چەنـد جارێـك تـا ئێسـتا ئـەوە کـراوە، بـە ئەنـدازەی ئـەوە کـە خەڵـك زۆر دەبـێ، دەبـێ ئـەو حەوشـە و ئـەو شـوێنەش فـراوان بکـرێ، بـۆ ئـەوەی جێـی خەڵکەکـە ببێتـەوە.

---

(١) التحرير والتنوير، ج١٥ ص٢١.

٣)- ﴿ إِلَى ٱلْمَسْجِدِ ٱلْأَقْصَا ﴾، بەرەو مزگەوتی دوورتر، (**أَقصَى**)، یانی: دوورتر، لەبەر ئەوەی کە لە مەککەوە دوور بووە، (**محمد الطاهر بن عاشور**) گوتوویەتی: (**هُوَ المَسجِدُ المَعرُوفُ بِبَيتِ المَقدِس، الكَائِن بـ (إِيلِيَاء) وهُوَ المَسجِدُ الَّذِي بَنَاهُ سُلَيمَانُ، والأَقصَى: الأَبعَد، والمُرَادُ بُعدُهُ عَن مَكَّه، بِقَرِينَةِ جَعلِهِ نِهَايَةَ الإِسرَاءِ مِنَ المَسجِدِ الحَرَام**)[1].

واتـە: ﴿ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْأَقْصَا ﴾، ئـەو مزگەوتەیـە کـە ئێسـتا نـاسراوە بـە (**بَيتُ المَقدِس**)، کـە ئێسـتا لـە شـوێنێکە کاتی خـۆی پێـی گوتـراوە: (إیلیـاء) ئەویـش ئـەو مزگەوتەیـە کـە سـولەیمان دروسـتی کـردوە، {هەڵبەتـە پێـش سـولەیمانیش داوود چـادری لـەوێ هەڵـداوە، پێـش ئەویـش ئیبراهیـم ﷺ وەك دوایـی بـاسی دەکەیـن و یەکـەم کـەس ئیبراهیـم دروسـتی کـردوە، بـەڵام دوایـی سـولەیمان لـەو شـوێنە کـە داوود بـۆی دیاریـی کـردوە، شـوێنێك بـووە کـە ئیبراهیـم ﷺ کاتی خـۆی مزگـەوتی لـێ دروسـتکردوە، لـەوێ ئـەو مزگەوتـەی خـۆی دروسـتکردوە کـە نـاوی لێـنراوە: (**هَيـكَلُ سُـلَيمَان**)، پەیکـەری سـولەیمان}، (**الأقـصى**)ش واتـە: دوورتـر، کـە مەبەسـت پێـی: دوورتـرە لـە مەککـەوە، بـە نیشـانەی ئـەوە کـە کـراوە بـە کۆتایـی شـەوڕۆی پێغەمبـەر ﷺ لـە مزگـەوتی حەرامـەوە بـەرەو ئـەوێ.

٤)- ﴿ ٱلَّذِى بَٰرَكْنَا حَوْلَهُۥ ﴾، خوا پێناسەی مزگەوتی ئەقصا ئاوا دەکات، دەفەرموێ: ئەو مزگەوتەی کە پیت و پێزمان خستۆتە دەوروبەری، دەڵێ: (**البَرَكَةُ: نَمَاءُ الخَيرِ وَالفَضلِ فِي الدُّنيَا وَالآخِرَة**)، (**بَرَكَة**) یانی: پیت و پێزو بەرهەم و چاکەو خێر و خۆشیی، چ بە نسبەت دونیاوە، چ بەنسبەت دوارۆژەوە.

هەڵبەتە دەگونجێ مەبەست لەو بەرەکەت و پێزە، بەرەکەت و پێزی مەعنەویی و ماددیی بێ:

**أ- پیت و پێزە مەعنەوییەکە:**

**یەکەم:** ئیبراهیم ﷺ ئەو مزگەوتەی بنیات ناوە، یەکەمجار.

**دووەم:** پێغەمبەرانێکی زۆر کردوویانە بە ڕووگە (**قبلة**) وەك داوود و سولەیمان، هەروەها پێغەمبەرانی دیکەی بەنی ئیسرائیلیش هەر ڕوویان لەوێ کردوە وەك قیبلە، پێغەمبەری خۆشمان ﷺ ماوەی شازدە (١٦) مانگ، دوای ئەوە کە نوێژی لەسەر فەرز بوو، دوای ئەو شەوڕۆ و سەفەری شەوە، هەر ڕووی دەکردە ئەوێ، واتە: ساڵێك و چوار مانگ لە مەدینەش، هەر ئەوێ ڕووگەی بوو، ئنجا دوایی ڕووی پێ وەرسووڕێنرایەوە بەرەو کەعبە کە لە مەککەیە.

---

(١) التحرير والتنوير، ج١٥ ص٢١.

**سێیەم:** عیسا ﷺ بانگەوازی خۆی لەوێ لەو شوێنەو لەو دەور وبەرە ڕاگەیاندوە.

**چوارەم:** دەرکەوتوە کە گۆڕی هەر کام لە داوود و سولەیمان لە دەور وبەری مزگەوتی ئەقصان.

**پێنجەم:** پێغەمبەری خاتەم ﷺ ئەو سەفەرە سەرسوڕهێنەر و یاسادڕەی پێکراوە بۆ ئەوێ و، لەوێدا نوێژی بە پێغەمبەران کردوە، پێش نوێژیی بۆ کردوون.

ئەمە پیت و پێزە مەعنەوییەکە، کە دەگونجێ شتی دیکەش باس بکرێ.

**ب - پیت و پێزە ماددییەکە:**

مەبەست لە پیت و پێزی ماددیی، ئەو ڕووبار و بەروبووم و کشتوکاڵ و دار و درەخت و کەش و، هەوای گونجاو و ... هتدەیە، کە لە شام هەن.

دواییش باس دەکەین: بۆچی خوا ﷻ بە نسبەت مزگەوتی ئەقصاوە پێناسەی کردوە کە بەرەکەتی خستۆتە دەور وبەری، بەڵام بۆ مزگەتی حەڕام، باسی نەکردوە؟!

٥)- ﴿لِنُرِيَهُۥ مِنۡ ءَايَٰتِنَآ﴾، بۆ ئەوەی لە نیشانەکانی خۆمانی پێشان بدەین.

لێرەدا خوا ﷻ حیکمەتی ئەو شەوڕۆییە باس دەکات، (**تَعلِيلُ الإِسرَاءِ بِإِرَادَةِ إِرَاءَةِ الآيَاتِ الرَّبَّانِيَّة**)، خوا ﷻ بەوە حیکمەتەکەی بەیان دەکات، کە بۆیە ئەو شەوڕۆییەی پێکردوە، چونکە خوا ویستوویەتی نیشانەکانی خۆی پێشانبدات، نیشانەکانی خۆی چ بە نسبەت شەو ڕۆییەکەوە، کە لە ماوەیەکی کەمی شەودا، کردوویەتی و، سەرجەم پێغەمبەران (عليه الصلاة والسلام) لەوێ پێش نوێژیی بۆ کردوون، چ بەنسبەت بەرز بوونەوەکەی و ئەو شتانەوە کە بینیونی. کە دوایی باسیان دەکەین.

٦)- ﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ﴾، بێگومان خوا بیسەری بینەرە، ئاشکرایە ئەو ڕاناوە: ﴿إِنَّهُۥ﴾، {ئەو بە دڵنیایی} بۆ خوای پەروەردگار دەچێتەوە، بەڵام (**محمد الطاهر بن عاشور**)[1]، دەڵێ:

ڕاناوەکان بۆ پێغەمبەر ﷺ دەچنەوە، واتە: پێغەمبەر ﷺ بیسەر و بینەرە، یانی: ئەو شتانەی چاك بیستن کە پێی گوتران لەو شەوڕۆیەداو، هەروەها ئەوشتانەی پێشانی دران، چاکی دیت.

بەڵام من ئەوە بە دوور دەزانم و، وا ڕێکتر دێتەوە، کە خوا ﷻ خۆی بەو دوو وەسفە پێناسە بکات.

---

(١) التحرير والتنوير: ج١٥، ص٢٢.

## حیكمەتی ئەو سەفەرە لەو كات و ساتەدا

پێش ئەوەی كۆتایی بەم دەرسە بێنم، دەمەوێ باسی حیكمەتی ئەو شەوڕۆییە. بكەم، ئەو سەفەرە موبارەكەی پێغەمبەر ﷺ چ لە سالانی سەرەتادا بوو بێ، وەك هەندێك دەڵێن، چ لە ساڵی دەیەمدا بووبێ، یان لە ساڵی دوازدەیەمدا، واتە: ساڵێك، یان ساڵ و نیوێك پێش ئەوەی كۆچ بكات لە مەككەوە بۆ مەدینە، كە ئەم ڕایەیان بەلای زۆرینەیە، دەتوانین بڵێین: حیكمەتی سەرەكیی ئەو سەفەرەی پێغەمبەر ﷺ لەو ئان و ساتەدا، ئەوە بووە كە وێڕای خەفەت و پەژارەو ناسۆری بەردەوام سەربارە، لە ساڵی دەیەمی پێغەمبەرایەتییش دا هەر كام لە ئەبوو تاڵیبی مامی و خەدیجەی هاوسەری دڵسۆزی (خوا لێی ڕازی بێ) وەفات دەكەن، كە دوایی مێژوونووسان ئەو ساڵەیان ناو ناوە ساڵی خەمباریی (**عامُ الحُزن**)، ئەو ساڵەی كە ئەو دوو پشتیوانە نێوخۆیی و دەرەكییەی پێغەمبەر ﷺ تێیدا وەفات دەكەن، چونكە خەدیجە پشتیوانی نێوخۆیی و نێو ماڵی پێغەمبەر بوو ﷺ بۆ پێغەمبەرو، ئەبوو تاڵیبیش پشتیوانی دەرەكیی بوو، كاتێ ئەو دوو پشتیوانە لە دەست دەدات[1]، پێغەمبەر ﷺ هەر ماتەمین و خەمبارو، نارەحەت بوو، چونكە هەر كام لەو دوو كەسە، پشتیوانیی باشیان لێكردوە:

أ - یەكیان لە چوارچێوەی ماڵدا، كە مرۆڤ پێویستی بە پشتیوانی نێوخۆیی و نێو ماڵ هەیە پشتی بگرێ، چ پیاو چ ئافرەت، چ پیر، چ گەنج، لە نێوخۆدا پشتت بگیرێ گرنگە.

ب - ئەوی دیكەش لە دەرێ، كە ئەبوو تاڵیبی مامی بووە، ئنجا ئەو ساڵە، كە ئەو دوو پشتیوانە لەدەست دەدا، خەم و نارەحەتییەكی زیاتر دێتە سەر دڵ و دەروونی، بۆیە خوای كارزان و میهرەبان، بە چاكی زانیوە لەو ئان و ساتەدا لەو كاتی خەم و پەژارەی زۆردا، ئەو سەفەرە موبارەكە بە پێغەمبەرەكەی ﷺ بكات و، لە جەوی زەویی و خەڵكی زەوی بە تایبەت خەڵكی مەككە، كە كەللە ڕەق و نەسەلمێن و خراپەكار بوون و، زۆربەیان لەگەڵیدا بێ مەعریفەت و نانەجیب بوون، سەرباری ئەوەی كە هاوبەش بۆ خوا دانەر بوون، لەوێ دووریبخاتەوە و بیبات بۆ لای هاوەڵانی سەرێ (**الملأ الأعلی**) و، لەوێ ئەو هەموو ڕێز و حورمەتەی لێ بنرێ لە لایەن خوای پەروەردگار و فریشتەكانی و،

---

(١) ئەوە بینا لەسەر ئەو ڕایە، كە ئەو سەفەرە دوای ساڵی دەیەم بووبێ، بەلام وەك لە تەفسیری سوورەتی (النجم)دا ڕوونی دەكەینەوە: ئەو سەفەرە، یان دەبێ لە سالانی زووتردا بووبێ، یان زیاتر لە جارێك بووبێ و جاری دووەم یان كۆتاییان دوای ساڵی دەیەم بووبێ .

پێغەمبەرانەوە (**عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ والسَّلام**) کە ئاسمان بە ئاسمان ڕۆیشتوە هەموویان سڵاویان لێکردووەو ڕێزیان لێگرتوە، ئنجا ئەمە وەك قەرەبوو کردنەوەیەك، بووە، کە ئەگەر خەڵکی سەر زەوی لەگەڵتدا بێ ماریفەتن، ئەگەر خەڵکی سەر زەوی ئەهلی مەککە لەگەڵتدا خراپن، ئەوە تۆ لەلای خوا بەڕێز و حورمەتی و، لەلایەن خوا و فریشتەکانەوەو، لەلایەن پێغەمبەرانەوە، ڕێزت لێ دەگیرێ، خوا ﷻ بە لوتف و کەڕەمی خۆی ئێمەش لەو کەسانە بگێڕێ کە بەڕێز و حورمەتێك کە خۆی بۆمان دەڕەخسێنێ، قەرەبووی خراپەکاریی خەڵکێکمان بۆ بکاتەوە، کە ناحەقیی و زوڵممان لێدەکەن و، خوا بە لوتف و کەڕەمی خۆی، وامان لێ بکات کە بە هۆی فەزڵ و بەخششی ویەوە، بێنیاز بین لە چاوەڕوانیی لە جگە لەو (**أَللَّهُمَّ أَغنِنَا بِفَضلِكَ عَمَّنْ سِوَاك**)، ئامین.

# کورتە باسێک دەربارەی
# شەوڕۆ و بەرزبوونەوە (الإسراء والمعراج)ەوە

ئەم کورتە باسە لە پێنج برگە، پێکهاتوە:

١)- مانای (إسراء) و (معراج).

٢)- کاتی شەوڕۆ و بەرزبوونەوە.

٣)- شوێنی شەوڕۆ و بەرزبوونەوە، لە کوێوە بۆ کوێ؟

٤)- چۆنیەتی شەوڕۆ و بەرزبوونەوەی پێغەمبەر ﷺ لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەت دا.

٥)- ئایا ئەو سەفەرە موبارەکە بە ڕووح و جەستەوە بووە؟ یان تەنیا بە ڕووح؟ هەروەها ئایا لە کاتی بێداریی دا بووە، یان لەکاتی خەودا؟!

## ١)-مانای (إسراء) و (معراج):

(**الإسراء والمعراج**) بە کورتیی واتە: سەفەرکردن بە شەوو، بەرزبوونەوە، ئنجا - وەك دوایی شی دەکەینەوە - وشەی (**إسراء**) بە مانای سەفەری شەوە، بەڵام (**معراج**) وەك وشەیەکی باو، دیارە لە سەردەمی پێغەمبەریشەوە ﷺ لە نێو هاوەڵاندا باو بووە، ئەگەرنا وەك ڕوونی دەکەینەوە، وشەی (معراج) مانای بەرزبوونەوە ناگەیەنێ، بەڵکو مانای ئامرازی پێ بەرزبوونەوە دەگەیەنێ و، وشەی (**عروج**) مانای بەرزبوونەوە دەگەیەنێ.

أ- (إســــراء) یانی: شەوڕۆیی، یاخود سەفەری شەو، لە (**أَسرى، يُسْري، إسراءً**)ەوە هاتوە، (**أَسْرَى**) سەفەری شەوی کرد، (**يُسْرِي**) سەفەری شەو دەکات، (**إِسْرَاء**)واتە: سەفەری شەو، شەوڕۆیی، کە دەشگونجێ بگوترێ: (**سَرَى، يَسْرِي، سُرَى**)، ئەویش بەهەمان شێوە هەمان مانای هەیە، وەك شارەزایانی زمانی عەرەبی دەڵێن:(**سُرى**) لە (**سَرى**) (**الفِعلُ الثُّلاثِي**) وەرگیراوە و سێ پیتە، بەڵام (**إِسْراء**)، لە(**أَسْرَى**) (**الفِعلُ الرُّبَاعِي**)یە و ئەمیان چوار پیتە.

کەواتە: مەبەست لە (**إسراء**) شەوڕۆ پێکرانی موحەممەدە ﷺ لە مەککەوە، لە مزگەوتی حەرامەوە، بۆ شام بۆ مزگەوتی (**أقصى**).

**ب** - دەربارەی **(معراج)** **(إبن المنظور)** لە کتێبی: **(لِسان العرب)**[1]، قاموسە ناودارەکەی خۆیدا دەڵێ: **(المِعْرَاجُ شِبْهُ سُلَّمٍ، أَو دَرَجَةٍ تَعْرُجُ إِلَيْهِ الأَرْوَاحُ إِذَا قُبِضَت يُقَالُ: لَيْسَ شَيءٌ أَحْسَنَ مِنْهُ، إِذَا رَآهُ الرُّوحُ لَمْ يَتَمَالَكَ أَنْ يَخْرُجَ، قَالَ (الفَرَّاءُ): ولَو جُمِعَ عَلَى المَعَارِيجِ لَكَانَ صَوَابَاً، فَأَمَّا المَعَارِجُ فَجَمْعُ المِعْرَج، قَالَ الأَزْهَرِيُّ: وَيَجُوزُ أَنْ يَجْمَع المِعْرَاجُ مَعَارِجَ، وَالمِعْرَاجُ السُّلَّمُ، وَمِنْهُ لَيْلَةُ المِعْرَاج وَالجَمْع مَعَارِج وَمَعَارِيج، مِثْلُ مَفَاتِح وَمَفَاتِيح، قَالَ الأَخْفَش: إِنْ شِئْتَ جَعَلْتَ الوَاحِدَ مِعْرَجَاً ومَعْرَجَاً مِثْلُ: مِرْقَاة وَمَرْقَاة، وَالمَعَارِج: المَصَاعِد، ...)، (عَرَجَ فِي السُّلَّمِ وَالدَّرَجَة: يَعْرِج عُرُوجَاً، أَي: اِرتَقى وَعَرَجَ فِي الشَّيء، وَعَلَيهِ يَعرِجُ وَيَعرُجُ عُرُوجاً أَيضاً: رَقِيَ، وعَرَجَ الشَّيء فَهُو عَرِيجٌ: ارتَفَعَ وَعَلا)**.

واتە: **(معراج)** وەك پەیژە و قادرمە وایە، ڕووحەکان پێیدا بەرزدەبنەوە، کاتێك کە لە جەستە دەکێشرێن و جیادەبنەوە، هیچ شتێك لەو **(معراج)**ە جوانتر نیە، هەر بۆیە کاتێك ڕووح لە جەستە دێتە دەرێ، خۆی ڕاناگرێ و تەماشای دەکات، **(فرَّاء)** کە یەکێکە لە شارەزایانی زمان دەڵێ: ئەگەر وشەی **(معراج)** بە **(معاریج)** کۆبکرێتەوە ئەوە شتێکی ڕاستە، بەڵام **(معارج)** کۆی **(مِعرَج)**ە، **(الأزهري)** کە یەکێکە لە شارەزایانی زمان دەڵێ: دەگونجێ وشەی **(معراج)** بە **(معارج)** کۆبکرێتەوەو، **(معراج)** بریتیە لە پەیژە، یان قادرمە کە وشەی **(لَيلَةُ المِعرَاج)** شەوی **(معراج)** لەوەوە هاتوە، {واتە: شەوی ئەو پەیژەیەی کە پێغەمبەر ﷺ پێیدا سەرکەوتوە} کۆی **(معراج)**یش **(مَعارِج)** و **(مَعاریج)**ە، {واتە: بە **(کَسرة)**و بە **(یاء)**} وەك **(مَفاتِح)** و **(مفاتیح)**، کە هەردووکیان کۆی **(مِفتاح)**ن، و **(مَعارِج)**و **(مَعاریج)**یش هەردووکیان کۆی **(مِعراج)**ن.

**(الأفخش)** کە یەکێکی دیکەیە لە زانایان دەڵێ: دەشتوانی بڵێی: **(مِعرَج)** و **(مَعرج)** تاکی **(مَعارج)**ن، وەك **(مِرْقاة و مَرْقاة)**، و**(معارج)** **(مَصَاعِد)**ە، کە کۆی **(مَصعَد)**ە، ئەوەی کە ئینسان پێیدا بەرزدەبێتەوە.

ئنجا دەگوترێ: **(عَرَجَ فِي السُّلَّمِ وَالدَّرَجَةِ)**، واتە: بە پەیژە و قادرمەکەدا سەرکەوت، **(يَعرُج عُروجاً أَي: ارْتَقَى)**، واتە: هەڵکشا یاخود بەرزبووەوە، **(وَعَرِجَ فِي الشَّيء وَعَلَيهِ، يَعرِجُ وَيَعرُجُ عُرُوجاً)**، ئەوەش بەکاردێ، **(عَرَجَ الشَّيء فَهُوَ عَرِيجٌ: إِرتَفَعَ و علا)** واتە: شتەکە بەرزبووەوە وئەو بەرزە، یانی: بڵندبوو وهەڵکشا.

---

(١) ج٩، ص١٢٠.

کەواتە: (إسراء) بریتییە لە سەفەری شەوی پێغەمبەر ﷺ کە کورتکراوەکەی (شەوڕۆیی)یە، بە شەو لە مەککەوە بۆ شام، (معراج)یش مەبەست پێی بەرزبوونەوەیەتی لە مزگەوتی (أقصى)وە بۆ ئاسمانەکان.

باسی شەوڕۆ (إسراء) تەنیا لە سوورەتی (الإسراء)دا هاتووە، کە خوا دەفەرمووێ: ﴿ سُبْحَٰنَ ٱلَّذِىٓ أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِۦ لَيْلًا مِّنَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ إِلَى ٱلْمَسْجِدِ ٱلْأَقْصَا ٱلَّذِى بَٰرَكْنَا حَوْلَهُۥ ....﴿١﴾ ﴾، بەڵام (عروج) لەم حەوت ئایەتەی سوورەتی (النجم)دا هاتووە، وەك خوا دەفەرمووێ: ﴿ أَفَتُمَٰرُونَهُۥ عَلَىٰ مَا يَرَىٰ ﴿١٢﴾ وَلَقَدْ رَءَاهُ نَزْلَةً أُخْرَىٰ ﴿١٣﴾ عِندَ سِدْرَةِ ٱلْمُنتَهَىٰ ﴿١٤﴾ عِندَهَا جَنَّةُ ٱلْمَأْوَىٰٓ ﴿١٥﴾ إِذْ يَغْشَى ٱلسِّدْرَةَ مَا يَغْشَىٰ ﴿١٦﴾ مَا زَاغَ ٱلْبَصَرُ وَمَا طَغَىٰ ﴿١٧﴾ لَقَدْ رَأَىٰ مِنْ ءَايَٰتِ رَبِّهِ ٱلْكُبْرَىٰٓ ﴿١٨﴾ ﴾، کە ئێمە دوایی ئایەتەکان زیاتر شی دەکەینەوە، بەڵام لێرەدا بە کورتیی مانایان دەکەین:

واتە: ئایا ئێوە موناقشە (شەڕە قسە لەگەڵ موحەممەددا ﷺ دەکەن) لەسەر ئەوەی کە بینیویەتی (کە جیبریلە) ﴿١٢﴾ بە دڵنیایی جارێکی دیکەش (بینیویەتی جیبریل لەسەر شێوەی خۆی) ﴿١٣﴾ لەلای درەختی کۆتایی ﴿١٤﴾ کە بەهەشتی ئیمانداران لەوێیە {لە لای (سَدرَةُ المُنتَهى)یە} ﴿١٥﴾ کاتێك دادەپۆشێ ئەوەی ئەو درەختە دادەپۆشێ (زۆر گەورە و گرنگە) ﴿١٦﴾ (موحەممەد)چاوی لای نەداو سەرکێشیشی نەکرد ﴿١٧﴾ بە دڵنیاییەوە ئەو لە نیشانە گەورەکانی پەروەردگاری خۆی بینی ﴿١٨﴾).

## ٢)- کاتی شەوڕۆ و بەرزبوونەوە:

لەو بارەشەوە زانایان ڕاجیاییان هەیە، هەندێکیان گوتوویانە: هەر لە ساڵەکانی سەرەتای پێغەمبەرایەتییەوە ﷺ بووە، کە ساڵەکانی پێنجەم و شەشەم و حەوتەمیان دیاریی کردوە[1]، بەڵام زۆربەیان دەڵێن: ساڵێك یاخود ساڵێك و پێنج مانگ، یاخود ساڵێك و شەش مانگ، پێش کۆچی پێغەمبەر ﷺ بۆ شاری مەدینە، بووە، واتە: لە ساڵی دوازدەیەمی پێغەمبەرایەتی دا بووە، خاوەنی کتێبی: (التحرير والتنوير)[2] دەڵێ: (وَقَد اختُلِفَ فِي وَقتِ الإِسرَاء، وَالأَصَحُّ أَنَّهُ كَانَ قَبلَ الهِجرَةِ بِنَحوِ سَنة وَخَمسَةِ أَشهُر، فَإِذَا كَانَت قَدْ نَزَلَت عَقِبَ وُقوعِ الإِسرَاء بِالنَّبِي، تَكونُ قَد نَزَلَت فِي حُدودِ سَنَةِ اثنَتي عَشَرَة بَعدَ البِعثَة، وَهِيَ سَنَةُ اثنَتَين قَبلَ الهِجرَةِ فِي مُنتَصِفُ السَّنَة).

---

(١) لە تەفسیری سوورەتی (النجم)دا ڕاستیی ئەو ڕایە، جوان ڕوون دەکەینەوە.

(٢) ج١٥، ص٦.

واتە: ڕاجیایی هەیە لەبارەی کاتی شەوڕۆیی پێغەمبەرەوە ﷺ و ڕای ڕاستتر ئەوەیە: کە ئەو شەوڕۆیە پێش کۆچی پێغەمبەر ﷺ بووە بۆ مەدینە بە ساڵێك و پێنج مانگ، ئنجا ئەگەر سوورەتی (الإسراء) لە دوای شەوڕۆی پێغەمبەر ﷺ دابەزیبێ، دەبێ ئەم سوورەتە لە دەوری ساڵی دوازدەیەمی پێغەمبەرایەتیی دابەزیبێ، کە دەکاتە ساڵی دووەم، پێش کۆچ، لە نێوەڕاستیی ساڵدا، {مەبەستی پێ دابەزینی سوورەتی (الإسراء)ە، کە بە دڵنیایی دەبێ لەدوای شەوڕۆیی پێغەمبەر ﷺ بێت، چونکە لە سەرەتای ئەم سوورەتەدا باسی ئەو سەفەرە کراوە کەواتە: دەبێ سەفەرەکە پێشتر بووبێ}.

خاوەنی (**صفوة البيان لمعاني القرآن**)[1]، کە باسی کاتی (**الإسراء والمعراج**) دەکات، دەڵێ: (**في السَّنَةِ الثَّانِيَةَ عَشَرَةَ مِنَ البِعثَةِ، فِي قَولٍ، وَالمَشهُورِ أَنَّهُ فِي لَيلَةِ السَّابِعَ والعِشرَينَ مِن شَهر رَجَب**) واتە: لە ساڵی دوازدەیەمی پێغەمبەرایەتییەوە بووە، ئەوە ڕایەکە و، ڕای باوتر ئەوەیە کە لە شەوی (٢٧)ی مانگی ڕەجەبی ئەو ساڵەدا بووە.

## ٣)- شوێنی شەوڕۆ و بەرزبوونەوە، لە کوێوە بۆ کوێ؟!

**١)**- شوێنی شەوڕۆیی پێغەمبەر ﷺ، سەرەتاو کۆتاییەکەی هەر لە ئایەتەکەدا، دیاریکراون خوای پەنهانزان دەفەرموێ: ﴿ سُبْحَٰنَ ٱلَّذِىٓ أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِۦ لَيْلًا مِّنَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ إِلَى ٱلْمَسْجِدِ ٱلْأَقْصَا ٱلَّذِى بَٰرَكْنَا حَوْلَهُۥ لِنُرِيَهُۥ مِنْ ءَايَٰتِنَآ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١﴾ ﴾، واتە: پاك و بێگەردە ئەو کەسەی کە شەوڕۆی بە بەندەی خۆی کرد، لە کاتێکی کەمی شەودا، لە مزگەوتی (**الحرام**)ەوە بۆ مزگەوتی (**الأقصى**)، کە پیت و پێزمان خستۆتە دەوروبەری، تاکو لە نیشانەکانی خۆمانی پێ نیشان بدەین، بێگومان (خوا) بیسەری بینەرە.

### أ- پێناسەی مزگەوتی حەڕام:

ئێمە پێشتر باسی مزگەوتی (حرام)مان کرد، کە پوختەی پێناسەی مزگەوتی (**حرام**) ئاوایە:

(**المسجد الحرام: هُوَ الكَعْبَةُ وَالفَنَاء المجعول حَرماً لَهَا، وَهُوَ يختلف سعَةً وَضِيْقَاً باخْتِلاَفِ العُصُورِ مِنْ كَثْرَةِ النَّاسِ فِيهِ، للطَّوَافِ وَالإِعْتِكَافِ وَالصَّلاَة**)[2].

---

(١) الشيخ حسنين محمد مخلوف، ص٣٥٩.

(٢) التحرير والتنوير ج١٥، ص١٣.

واتـە: مزگـەوتی حـەڕام بریتیـە لـە کەعبـەو ئـەو حەوشـەیەی کـە لـە دەوری کـراوە بـە حـەڕەم، ئەویـش {واتـە: ئـەو حەڕەمـەی بـە دەوری کەعبەوەیـە} بـە پێـی جیاوازیـی سـەردەمەکان فراوانیـی و بەرتەسـکیی دەگـۆڕێ بـە ئەنـدازەی ئـەوە کـە خەڵـك زیاتـر لێـی کۆدەبنـەوە بـۆ تـەواف و مانـەوەو نوێژکـردن.

بێگومـان تاکـو خەڵکەکـەی زیاتـر بـوو بـێ، سـنوورەکەی فراوانـتر بـووە، کاتی خـۆی، بـە تایبـەت کاتـێ کـە دیـواری بـۆ نەکـراوە، کـە پێشـتریش باسـمان کـردوە: یەکـەم کـەس عومەری کـوڕی خەتتـاب خـوا لێـی ڕازی بـێ، دیـواری کـرد بـۆ سـنووری حەڕەمـی دەوری کەعبـە، بـۆ ئـەوەی لێـك جیـا بێتـەوە لەگـەڵ ئـەو شـوێنانەی دیکـەی کـە بـە دەوریـەوەن، ئنجـا قۆنـاغ بە قۆنـاغ ئـەو دیـوار و حەوشـەیەش فراوانـترو گەورەتـر کـراوە، بـە ئەنـدازەی ئـەوەی کـە خەڵـك زۆر بـووە، ئەوێـش فراوانـتر کـراوە.

## ب- پێناسەی مزگەوتـی ئەقصا:

ئـەوەی کـە پێویسـت دەکات زیاتـر ڕوونی بکەینـەوە، مزگـەوتی (**الأقصى**)یـە، چونکـە ئـەو دوو شـوێنە: مزگــەوتی حــەڕام، ســەرەتای ســەفەرەکەی پێغەمبــەر ﷺ بــووە لــە مەککــە، هەروەهـا شـەوڕۆییەکەی لەسـەر زەوی، کۆتـا مەنزڵـی مزگـەوتی (**الأقـصى**) بـووە، ئنجـا لەوێـوە بـەرەو ئاسـمانەکان بـەرز بۆتـەوە.

**ئێستاش با لە چەند خاڵێك دا قسە لە بارەی مزگەوتی (ئەقصا) وە بکەین:**

١ - مزگەوتی (**الأقصى**) ئەو مزگەوتەیە کە ئێستا بە (**بيت المقدس**) ناسراوە و لەو شوێنەیە کە کاتی خۆی (إيلياء)ی پێ گوتراوە، ئەو مزگەوتەش واباوە کە پێغەمبەر سولەیمان ﷺ دروستی کردوە، وەك مزگەوت، بۆیەش پێی دەگوترێ: (**الأقصى**)، واتە: (**الأبعد**) لەبەر ئەوەی کە لە شاری مەککەوە دوورترە.

٢- مزگەوتی (**الأقصى**) لە شێوەی مزگەوتدا، ئەوەی کە باوە، ئەوەیە کە سولەیمان دروستی کردوە، بەڵام لە سەرەتادا بۆ یەکەمجار مزگەوتی (**الأقصى**)ش دووەمین مزگەوتە کە پێغەمبەر ئیبراهیم ﷺ بنیاتی ناوە، وەك لەو بارەوە لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە:

**{عَـنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ قَـالَ قُلْـتُ: يَـا رَسُـولَ اللَّـهِ! أَيُّ مَسْـجِدٍ وضِـعَ فِي الأَرْضِ أَوَّلَ؟ قَـالَ: «الْمَسْـجِدُ الْحَـرَامُ»، قُلْـتُ: ثُـمَّ أَيٌّ؟ قَـالَ: «الْمَسْـجِدُ الأَقْـصَى»، قُلْـتُ: كَـمْ بَيْنَهُـمَا؟ قَـالَ: «أَرْبَعُـونَ سَـنَةً»} (رَوَاهُ أَحْمَـد: ٢١٣٧١، والبُخَـارِيُّ: ٣٣٦٦، ومُسْـلِمٌ: ١١٦٢، والنَّسـائِي: ٦٨٩، وابْـنُ مَاجَـهْ: ٧٥٣، وابْـنُ خُزَيْمَةَ فـي «صحيحـه»: ٧٨٧).**

واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! یەکەمین مزگەوت کە لەسەر زەوی دروستکرا کامە بوو؟ فەرمووی: مزگەوتی حەڕام (واتە: ئەوەی لە مەککەیە)، گوتم: دوا وی کامە؟ فەرمووی: مزگەوتی ئەقصا، گوتم: چەندە ماوەیان کەوتۆتە نێوانیان؟ فەرمووی: چل ساڵ. یانی: چل ساڵ ماوە هەبووە لە نێوان دروستکرانی مزگەوتی حەڕام و، مزگەوتی ئەقصا دا کە لە (قودس)ە).

ئنجا وا باوە کە داوودو سولەیمان (**علیهما الصلاة والسلام**)، مزگەوتی ئەقصایان دروستکردوە، بەڵام لە ئەسڵدا ئەوان دروستیان نەکردوە، بەڵکو نۆژەنیان کردۆتەوە، چونکە ئەگەر لە نێوان دروستکرانی مزگەوتی حەڕام و مزگەوتی ئەقصادا، چل ساڵ بوو بێ، ناگونجێ داوودو سولەیمان (**علیهما الصلاة والسلام**)، بنیاتنەری مزگەوتی ئەقصا بووبن، چونکە بەلای کەمەوە داوودو سولەیمان لەگەڵ ئیبراهیم دا (**علیه الصلاة والسلام**)، کە دروستکەری مزگەوتی حەڕامە، هەزار ساڵیان نێوانە، کەواتە: لە ئەسڵدا مزگەوتی ئەقصاش بە ماوەیەکی کورت کە چل (٤٠) ساڵە دوای کەعبە دروستکراوە، ئەویش وەك مێژوونووسان و توێژەرەوان دەڵێن: یەعقووب لە شوێنەی کە کاتی خۆی ئیبراهیم (**علیه الصلاة والسلام**) وەك سەربڕگە (**مذبح**)داینـاوە، دروستی کردوەو بەڵام دوایی جوولەکە شەڕوشۆڕیان بەسەرهاتوەو پەرستگاکەش تێکچووەو، دوایی لە سەردەمی داوودو سولەیماندا (**علیهما الصلاة والسلام**) کە پادشاو دەستەڵاتدار بوون وێڕای پێغەمبەرایەتیی، دروست کراوەتەوە و نۆژەن کراوەتەوە.

کەواتە: مزگەوتی ئەقصاش هەر ئیبراهیم ﷺ بنیاتی ناوە، بەڵام خاوەن کتێبەکان باسی ئەوەیان نەکردوە، هەرچەندە لە تەوراتدا ئاماژەیەك بەوە کراوە، کە ئێمە دەقی ئەوەی لە تەوراتدا هاتوە، دەیهێنین: (**وَقَالَ الربُّ لِأبرَامَ: اُترك أرضك وَعَشيْرَتِكَ وَبَيْتَ أبيكَ، وَاذْهَبْ إلى الأَرْضِ التي أُريك....، فَشَرَعَ أَبْرَام يَنْتَقِلَ فِي الأَرْضِ إلى أَنْ بَلَغَ مَوْضِعَ شَكِيمَ إلى سَهْلِ مُورَة، وَكَانَ الكنعانيون آنئذٍ يقطنون في الأرض، وظهر الربّ لأبرام وقالَ له: سأُعطي هذه الأرض لذريتك، فبنى أَبرامُ هناك مذبحاً للرب الذي ظهر له، وانتقل من هناك إلى الجبل شرقيَّ بيت إيلٍ حيث نصب خيامه مابين بيت إيلٍ غَرْباً وعايَ شرقاً، وشيَّد هناك مذبحاً للرب ودعاهُ باسمه، ثم تابع أبرام ارتحالَه نحو الجنوب**)[١].

---

(١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، سفر التكوين، الإصحاح ١٢، ص٣٣و ٣٤.

واتە: پەروەردگار بە ئەبرامی فەرموو {ئیبراهیم بە (ئەبرام) ناوبراوە لە پەیمانی کۆندا و ئەو ناوانەش لە زمانێکەوە بۆ زمانێك و لە وەرگێڕانیاندا، گۆڕانیان بەسەر دادێ}، سەرزەمینی خۆت و خزمەکانت و ماڵی بابت بە جێ بهێڵەو بەرەو ئەو سەرزەمینە بڕۆ کە پێشانت دەدەم، {دوای چەند قسەیەك دەڵێ} ئیبراهیم دەستی کرد بە کۆچکردن بە زەویدا، هەتا گەیشتە شوێنی (شەکیم) لە لای دەشتی (موڕا)، کە کەنعانییەکان ئەو کاتە لەوێ نیشتەجێ بوون، ئنجا پەروەردگار بۆ ئیبراهیم دەرکەوت و پێی گوت: ئەم زەوییە دەدەمە وەچەکەی تۆ، ئیبراهیم لەوێ سەربڕگە (**مَذبح**)یَکی بۆ ئەو پەروەردگارەی کە لەوێ بۆی دەرکەوت دروستکردو، لەوێوە گواستیەوە بۆ چیایەکە، ئەو چیایەی کە لە ڕۆژهەڵاتی {بەیتی ئیل}، لەوێ چادرەکانی خۆی چەقاندن (هەڵدان)، لە نێوان (بەیتی ئیل) بە لای ڕۆژئاوادا و (عایە) بە لای ڕۆژهەڵاتدا، [واتە: بەیتی ئیل دەکەوێتە ڕۆژئاوا و عایە دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی ئەو شوێنەی کە چادرەکانی لێ هەڵدا]، ئنجا لەوێ سەربڕگەیەکی بۆ پەروەردگار بنیاتنا، [ئەو شوێنەی کە ئاژەڵی تێدا سەردەبڕدرێ بۆ خوای پەروەردگار]، بە ناوی پەروەردگاریەوە ناوی نا، دوایی ئیبراهیم بەرەو خواروو ڕۆیشت، [واتە: بەرەو خوارووی ئەو شوێنەی کە لێی بوو].

بێگومان مەبەست لە سەربڕگە (**مذبح**)یش {یانی: ئەو شوێنەی کە قوربانیی لێ سەر دەبڕدرێ} مەبەست پێی مزگەوتە، چونکە ئەوان عادەتیان وابوو قوربانییان لە مزگەوتدا دەکرد.

ئنجا شایانی باسە: دوایی داوود، چادرەکەی خۆی لە شوێنی مزگەوتەکەی ئیبراهیمدا هەڵداوە و میحرابەکەشی بە فەرمانی خوا هەر لەوێ بنیاتناوە {(**مِحراب**) یش شوێنی تایبەتی خواپەرستیی تێداکردنە}، پاشان داوودیش وەسیەتی بۆ سولەیمانی کوڕی کردوە کە پەرستگایەکەی {پەیکەر (هیکل)ە} کەی خۆی لەوێ بنیاتبنێ، کە بە هەیکەلی سولەیمان ناسراوە.

کەواتە: پێشێ ئیبراهیم ﷺ بە پێی قسەی تەورات شوێنێکی ئاژەڵ سەربڕین (واتە: شوێنێکی قوربانیی)ی لەوێدا بنیات ناوەو، چادرەکانی لەوێ هەڵداون، دوایی داوودیش میحرابەکەی خۆی لەوێ دروست کردوەو چادرەکانیشی لەو شوێنەی ئیبراهیم دا هەڵداون، وەسیەتیشی بۆ سولەیمان کردوە و هەر لەوێ هەیکەلەکەی وەك پەرستگا بنیاتناوە {هەیکەل ناوێك بووە، هەر بۆ مزگەوت بەکاریان هێناوە}.

ئنجا مێژووزانە عیبرانییەکان بە تایبەت (**یوسیفوس**) گوتوویەتی: (**أَنَّ الجَبَلَ الَّذِي سَكَنَهُ إبْرَاهِيم بِأَرْض كَنْعَان إِسْمُهُ نَابُو، وَأَنَّهُ الجَبَل الَّذِي ابتَنَى عَلَيْهِ سُلَيْمَان الهَيْكَل وَهُوَ المَسْجِد الَّذِي بِهِ الصَّخْرَة**)[1]

واتە: ئەو چیایەی کە ئیبراهیم تێیدا نیشتەجێ بووە لەسەر زەمینی کەنعان، ناوی (نابو) بووەو، ئەو چیایەی کە سولەیمان هەیکەلی خۆی لەسەر بنیاتناوە کە ئەو مزگەوتەیە (**صخرة**)ی لێیە، ئەویش دیارە هەر ئەو شوێنەیە.

ئنجا لە (**سفر الملوك الأول**)دا کە یەکێکە لە سیفرەکانی تەورات، بە درێژیی باسی چۆنیەتی دروستکردنی هەیکەل کراوە لەلایەن سولەیمانەوە عليه السلام[2]، بەڵێ لەو سەرچاوەیەدا وردەکاریی زۆر باسکراوە - بەڵام مەرج نیە ڕاست بن - لە وبارەوە کە چۆن چۆنی سولەیمان عليه السلام ئەو مزگەوتەی بنیاتناوە، کە دوایی ناوی لێنراوە (**هیكل سليمان**).

کورتەی قسان: سەرەتا ئیبراهیم مزگەوتی (**الأقصى**)ی بنیاتناوە، چل ساڵ پاش دروستکردنی کەعبە، پاشان داوود لەو شوێنە چادری هەڵداوەو قوربانگا (**مذبح**)ێکی لەوێ بنیاتناوەو، دواتر وەسیەتی بۆ سولەیمان کردوە کە لەو شوێنە، مزگەوت (**هيكل**)ێك بنیات بنێ.

### ٢)- ئنجا شایانی باسە، کە مزگەوتی (ئەقصا) سێ جاران وێران کراوە:

### أ - وێرانکردنی یەکەم:

(**بُخْتَنَصْر**، یان **بُخْتُنْصُر**) کە بە چەند بێژەیەك هاتوە، پادشای (**بابل**) لە ساڵی (٥٧٨) پێش زایینـدا ئەو مزگەوتەی تێکداوە، بەڵام دواتر جوولەکە لەسەردەمی حوکمی فارسەکان دا، مزگەوتەکەیان نۆژەنکردۆتەوە، لەڕۆژگاری حوکمڕانیی کۆڕشی گەورە (کورش بزرگ)دا.

### ب - وێرانکردنی دووەم:

ڕۆمەکان لەسەردەمی حوکمی (**طيطوس**)دا پاش چەند جەنگێك لە نێوان ئەو و جوولەکەدا، وێرانی کردوە، دوایی جارێکی دیکە نۆژەنکراوەتەوە، بەڵام (ئەدریانوس) کە یەکێك بووە لە پادشاکانی ڕۆمەکان، جارێکی دیکە لە ساڵی (١٣٥)ی پێش زایین دا بە تەواویی وێرانی کردوە.

---

(١) التحرير والتنوير: ج١٥، ص١٧.

(٢) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، ص٧١٥ - ٧١٨، سفر الملوك الأول، الإصحاح: ٥، ص٧١٥ (الإستعدادات لبناء الهيكل)، الإصحاح:٦، ص٧١٦ (أوصاف الهيكل).

**ج - وێرانکردنی سێیەم:**

دوای ئەوەی (شاژنە هیلان)ە دایکی ئیمپراتۆر (**قسطنطین**) پادشای ڕۆمی (**بیزنطي**) بۆتە نەصڕانیی، لە کاتی سەردانیدا بۆ (ئۆرشەلیم) هیچ لە شوێنەوارەکانی ئەو مزگەوتەی نەهێشتوە و فەرمانی کردوە شوێنی مزگەوتەکە بکرێتە زبڵخانە، ئەمەش لە کتێبی: (**الأنس الجليل في تأريخ القدس والخليل**)دا، هاتوە کە (**التحرير والتنوير**) لێی خواستۆتەوە.[1]

**٣)**- بەڵام دوایی کە مسوڵمانان (شام)یان ڕزگارکرد، لە ڕۆژگاری عومەری کوڕی خەتتاب دا ﷺ، خەلیفەی دووەمی پێغەمبەر ﷺ، عومەر بۆ خۆی چوو، تاکو ئاگاداری ئازادکردنی شاری (**إيلياء**) بێ، کە ئەو کاتە بە (ئۆرشەلیم) ناسرا بوو، بەڵام دوایی ناوی لێنرا (**إيلياء**) کە لە بنچینەدا (**إيلياء**) ناوی یەکێك لە پێغەمبەرەکان بووە، لە سەرەتاکانی سەدەی نۆی پێش زایینی دا ژیاوە، ئنجا عومەر ﷺ، صوڵحی لەگەڵ خەڵکە نەصڕانییەکەی ئەو شارەدا کردو، (**بطريق**)ێکیان هەبوو،{(**بطريق**)یش ناوی پلەیەکی زانایانی نەصڕانییە}، ناوی (**صفرونيوس**) بوو، پێی گوت، شوێنی مزگەوتی داوودم پێشان بدە! ئەو (**بطريق**)ەش عومەری بردە ئەو شوێنە، کە بردی بۆ لای مزگەوتەکە عومەر گوتی: {**اللَّهُ أَكْبَرُ!! هَذَا وَالَّذِي نَفْسِي بِيدِهِ، مَسْجِدُ دَاوُدَ الَّذِي أَخْبَرَنَا رَسُولُ اللَّه ﷺ أَنَّه أُسري بِهِ إِلَيْهِ**}، واتە: خوا گەورەترە {(**اللَّهُ أَكْبَر**)ێکی کرد بۆ نیشانەی سەرسووڕمان}، سوێند بەوەی گیانی منی بە دەستە، ئەمە مزگەوتەکەی داوودە کە پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی پێداوین، کە شەوڕۆیی بۆ ئەوێ پێکراوە.

واتە: لە مزگەوتی حەڕامەوە بۆ ئەو مزگەوتە.

دوایی عومەر ﷺ و مسوڵمانان زبڵەکەیان لادا، چونکە کرابوو بە زبڵخانە، هەتا (**صخرة**) هەمووی دەرکەوت، {(**صخرة**)ش دەبێ بەردێکی گەورە بێ}، ئنجا عومەر لەلای میحرابی (داود) دوو ڕکات نوێژی کرد، بەڵام خەلیفەی دووەم عومەر ﷺ، هیچ مزگەوتی لەو شوێنە دروست نەکرد.

**٤)** کەچی دوایی (عبدالملك بن مروان) هەستا بە ڕاسپاردنی (رجاء بن حياة الكندي) کە یەکێك بووە لە زانایانی ئیسلام، لە ساڵانی (٦٦ - ٧٣)دا، مزگەوتێکی گەورەی لەوێ بنیاتنا، واتە: حەوت ساڵان بە دروست کردنیەوە بوون!

---

(١) ج١٥ ص١٧.

٥)- کەواتە: ناوهێنانی ئەو شوێنە لە قورئاندا بە (**المَسْجِدُ الأَقْصَى**) بە دوو ئیعتیبارە، چونکە ئەو کاتەی کە پێغەمبەر ﷺ چووە بۆ ئەوێ، مزگەوت نەبووە، بەڵکو شوێنی مزگەوت بووە، بەڵام بە دوو ئیعتیبار بە: (**المَسْجِد الأَقْصَى**) واتە: {مزگەوتە دوورەکە} یان {مزگەوتە دوورترەکە} ناوهێنراوە:

**ئیعتیباری یەکەم:** لەبەر ئەوەی پێشتر مزگەوت بووە، چونکە حوکمی زەوییەك کە مزگەوتی لەسەر دروست کرابێ، ئەوەیە کە لە مزگەوت ناشۆرێ، با مزگەوتەکەشی لێنەمابێ، هەر بە موڵکی مزگەوت دادەنرێ، ئەمە بە ئیعتیباری ڕابردوو.

**ئیعتیباری دووەم:** بە ئیعتیباری داهاتوو، کە لە داهاتوودا، ئەو شوێنە دەبێتە مزگەوت.

٦)- مسوڵمانانیش هەر لە کاتی فەرز بوونی پێنج نوێژەکانەوە، لە شەوی شەوڕۆیی (**ليلة الإسراء**) دا، مزگەوتی (أقصى)یان کرد بە ڕووگە، تاکو شازدە (١٦) مانگ دوای کۆچ کردنیشیان بۆ مەدینە، واتە: دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ شازدە (١٦) مانگ لە مەدینەش مایەوە، بۆ نوێژەکان ڕووگەیان مزگەوتی (**أقصى**) بوو، بەڵام دوایی ڕوویان پێ وەر سووڕێنرا بەرەو کەعبە.

٧)- گەڕیدە (**سائح**)ێکی نەصرانیی بە ناوی (أرکولف) لە ساڵی (٦٧٠)ی زایینی دا، واتە: پاش حوکمڕانیی عومەر ﷺ بە سی و چوار(٣٤) ساڵ، سەردانی قودسی کردوە و لە کتێبەکەی خۆی دا دەڵێ: مزگەوتێکم بینی عومەر دروستی کرد بوو، چوارگۆشە بوو، جێی سێ هەزار (٣٠٠٠) کەسی تێدا دەبۆوە کە نوێژی تێدا بکەن.

دەشگونجێ مسوڵمانان لە دوای عومەر ﷺ، بە داری گەورە گەورە ئەو شوێنەیان پەرژین کردبێ بۆ پاراستنی، کە نەصرانییەکان لە ڕقی جوولەکەکان، کردوویانە بە زبڵخانە، هەر لە سەردەمی (هیلان)ەی دایکی (**قسطنطين**)ەوە، کە وەك گوتمان: عومەر و ئەو هاوەڵانەی کە لە خزمەتی دابوون، مسوڵمانان خوا لێیان ڕازی بێ، پاکیان کردەوەو زبڵەکەیان لادا، تاکو شوێنی مزگەوتەکە دەرکەوتەوەو، دوو ڕکات نوێژی تێدا کرد، دەبێ چەندەی پێوە بووبن!

کە گوتیشمان: وا پێدەچێ مسوڵمانان داری گەورە گەورەیان لە دەوری دانابن دانا بێ وەك شوورایەك، بۆ ئەوەی شوێنی مزگەوتەکە دیار بێ، ئەوە لە گۆڤارێکدا هاتوە، بە ناوی (**مجلة رسالة العلم**) کە لە ساڵی دوازدەیەم (١٢)، لە ژمارە دووی کانوونی

یەکەمی ساڵی (١٩٦٨ ز)دا (عارف عارف) وتارێکی نووسیوەو خاوەنی (**التحرير والتنوير**)[1] لێی وەرگرتوە.

**٨)**- لێرەدا لەوانەیە پرسیارێك بێتە پێش کە ئایا بۆچی خوای پەروەردگار تەنها بۆ مزگەوتی (**الأقصى**) باسی پیت و پێزی کردوەو فەرموویەتی: ﴿ أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِۦ لَيْلًا مِّنَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ إِلَى ٱلْمَسْجِدِ ٱلْأَقْصَا ٱلَّذِى بَٰرَكْنَا حَوْلَهُۥ ﴿١﴾ ﴾، واتە: شەوڕۆیی بە بەندەکەی کرد لە مزگەوتی حەرامەوە بۆ ئەو مزگەوتی ئەقصایەی کە پیت و پێزمان خستۆتە دەوروبەری؟!

زانایان گوتوویانە: ئەو پرسیارە دەگونجێ بە سێ جۆر وەڵام بدرێتەوە:

**١/** گەلی عەرەب زانیارییان نەبووە دەربارەی ئەو مزگەوتە، بۆیە پێویست بووە بناسێنرێ.

**٢/** نەصرانییەکان بەهۆی بوغزیان بەرانبەر بە جوولەکەکان، شوێنەواری ئەو مزگەوتەیان سڕیەوەتەوەو کردوویانە بە زبڵخانە، خەڵکەکە هەر نەشیانزانیوە کە ئەو شوێنە پێشتر مزگەوت بووە!

**٣/** جوولەکەکانیش لێی نائومێد بوون، کە چنگیان بکەوێتەوە.

کەواتە: بۆیە حیکمەتی خوا وایخواستوە، کە سەرنجی خەڵك ڕابکێشێ، کە ئەو مزگەوتە شوێنێکی بە بەرەکەتە، پیت و پێزە، پێشتریش باسمان کرد، کە بەرەکەتەکەی چییەو چۆنە؟

سەبارەت بە بەرزبوونەوەی پێغەمبەر ﷺ کە وەك گوتمان: زیاتر وشەی معراج بەکارهاتوە، بەڵام ڕاستتر وایە کە بگوترێ (**عروج**)، چونکە (**معراج**) وەك فەرهەنگەکانی زمان دەڵێن: زیاتر بەو ئامرازە دەڵێن کە پێغەمبەر ﷺ یاخود ڕووحەکان پێیدا بەرز دەبنەوە، بەو پەیژەیە بەو ئامرازە کە هەر خوا دەزانێ چۆنە! بۆ ئەوە بەکارهاتوە، پێشتر گوتمان کە لە حەوت ئایەتی (١٢ - ١٨)ی سوورەتی (النجم)دا باسکراوە، واتە: باسی بەرزبوونەوەی پێغەمبەر ﷺ بەڵام درێژییەکەی لە سوننەت دا باسکراوە، کە ئێمە دوایی دەیهێنین.

---

(١) ج١٥ص١٩.

## ٤)- چۆنیەتی شەوڕۆ و بەرزبوونەوەی پێغەمبەر ﷺ لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا:

**یەکەم: لە قورئـــاندا:**

لـە قورئانـدا لـە دوو شـوێندا، باسـی چۆنیـەتی شـەوڕۆ و بەرزبوونـەوەی پێغەمبـەر ﷺ کـراوە، واتـە: (**الإسراء والعُـروج**):

**أ**- شەوڕۆییەکەی لە ئایەتی ژمارە (١) سوورەتی (**الإسراء**)دا باسکراوە، کە پێشتر قسەمان لێ کرد.

**ب**- بەڵام بەرزبوونەوەی پێغەمبەر ﷺ بەرەو ئاسمانەکان، لە حەوت ئایەتی سەرەتای سوورەتی (النجم) (١٢ - ١٨)دا، هاتوە، کە ئەگەر تۆزێ تەماشای ئەو ئایەتانە بکەین، بە ڕوونیی و بۆمان دەردەکەوێ کە ئەو ئایەتانە دەربارەی بەرزبوونەوەی پێغەمبەر ﷺ دەدوێن، چونکە هەندێك لە زانایان گوتوویانە: باسی بەرزبوونەوەی پێغەمبەر ﷺ لە قورئاندا نەکراوە! کە ڕاستە بە وشەی (**معراج**) و (**عروج**) باس نەکراوە، بەڵام ئەم ئایەتانە بۆ کەسێك کە سەرنجیان بدات، زۆر جوان دیارە، کە باسی بەرزبوونەوەکەی پێغەمبەر ﷺ دەکەن، کە ئەوە دەقی ئەو حەوت(٧) ئایەتە بە پێزە و پوختەیەکی چەمك و واتایەکەیانە:

**١**- ﴿ أَفَتُمَٰرُونَهُۥ عَلَىٰ مَا يَرَىٰ ﴿١٢﴾ ﴾، ڕووی دواندن لە کافرە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانە، واتە: ئایا شەڕە قسەی لەگەڵدا دەکەن، مشتومڕی لەگەڵدا دەکەن، لەسەر ئەوە کە دەیبینێ، یاخود: ئایا لە دوو دڵیی دان لەبارەی ئەوەوە کە دەیبینێ، ئنجا ئایا ئەوەی دەیبینێ چییە؟ بە ئایەتی دوایی بۆمان دەردەکەوێ کە مەبەست پێی جبریلە.

**٢**- کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ رَءَاهُ نَزْلَةً أُخْرَىٰ ﴿١٣﴾ ﴾، ئەوەی کە ئێوە مشتومڕی لەسەر دەکەن، یاخود لە دوو دڵیی دان لەو بارەوە کە بیبینێ، جارێکی دیکەش بینیویەتی، کە بێگومان ڕاناوەکە بۆ جبریل دەچێتەوە، چونکە دوایی دەری دەخات.

**٣**- کە دەفەرموێ: ﴿ عِندَ سِدْرَةِ ٱلْمُنتَهَىٰ ﴿١٤﴾ ﴾، واتە: لەلای درەختی کۆتایی، ئنجا درەختی کۆتایی وەك لە فەرمایشتەکاندا هاتوە کە دوایی دەیانهێنین، کۆتا مەنزڵ و شوێن بووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە شەوی شەوڕۆیی و بەرز بوونەوەدا، پێی گەیشتوە و لە سەرووی ئاسمانەکانەوەیە، کەواتە: ئەوەی لەوێ بینیویەتی، جبریل بووە.

٤- ﴿ عِندَهَا جَنَّةُ ٱلْمَأْوَىٰٓ ﴿١٥﴾ ﴾، لەلای درەختی کۆتایی، بەهەشتی جێگای حەوانەوەی بڕواداران هەیە.

٥- ﴿ إِذْ يَغْشَى ٱلسِّدْرَةَ مَا يَغْشَىٰ ﴿١٦﴾ ﴾، لە حاڵێکدا درەختەکە دادەپۆشێ، ئەوەی کە دایدەپۆشێ، یانی: شتێکی زۆر مەزن و سەرسوڕهێنەر دایدەپۆشێ!

٦- ﴿ مَا زَاغَ ٱلْبَصَرُ وَمَا طَغَىٰ ﴿١٧﴾ ﴾، چاو (واتە: چاوی پێغەمبەر ﷺ) لای نەدا و سەرکێشیی نەکرد و، سنوور شکێنیشی نەکرد، یانی: لەو سنوورەی کە بۆی دانرابوو، چاوی پێغەمبەر ﷺ لای نەداو، سنوور شکێنیی و سنوور بەزێنیشی نەکرد.

٧- ﴿ لَقَدْ رَأَىٰ مِنْ ءَايَٰتِ رَبِّهِ ٱلْكُبْرَىٰٓ ﴿١٨﴾ ﴾، بە دڵنیایی (موحەممەد) لە نیشانە گەورەکانی پەروەردگاری خۆی بینی.

پێغەمبەر ﷺ لێی گێڕدراوەتەوە کە جبریلی لە سەرشێوەی خۆی دوو جاران بینیوە:

أ- جارێك لەسەر زەوی، کە شەشسەد باڵی هەبووەو (**قَدْ سَدَّ الأُفُق**) ئاسۆی ون کردوە، کە ئەمەیان لە صەحیحی بوخاریی[١] دا هاتوە.

ب- جارێکیش لە شەوی شەوڕۆ بەرزبوونەوەدا، بینیویەتی، وەك دایکمان عائیشە رضي الله عنها گوتوویەتی، کە دوایی دەقەکەش دێنین، ئەم دوو بینینەی جبریل لەسەر شێوەی خۆی بووە، کە خوا جبریلی لەسەر خوڵقاندوە، بەڵام لە شێوەی پیاوێکدا و بە شێوەی دیکە، چەندان جار پێغەمبەر ﷺ جبریلی بینیوە.

**دووەم: لە سوننـــەت دا:**

ئـەوەی کـە لـە سـوننەت دا هاتـوە، هـەم لـە (**صحيح البخـاري**) و، هـەم لـە (**صحيح مسـلم**) دا هاتـوە، کـە ئێمـە دەقـی ئـەوەی (**صحيـح مسـلم**) دێنیـن و، ئـەوەی (**صحيـح البخـاري**)ش جیاوازییـەکی ئەوتـۆی نیـە لەگـەڵ ئـەوەدا کـە (مسـلم) لـە صەحیحەکـەی خۆیـدا هێناویەتـی، واتـە: ئـەو دەقـەی کـە ئێسـتا دەیهێنـم لـە هـەردوو صەحیحـی بوخاریـی و صەحیحی موسـلیم دا هاتـوە، لـە صەحیحـی بوخاریـی دا بـە ژمـارە: (٣٥٧٠)و بـە ژمـارە: (٧٥١٧) و، لـە صەحیحـی موسـلیم دا بـە ژمـارە: (٤٠٩) هاتـوە، کـە دەقەکـەی بـەم شـێوەیەیە:

{**عَـنْ أَنَـسِ بْـنِ مَالِـكٍ رضي الله عنه أَنَّ رَسُـولَ اللَّـهِ ﷺ قَـالَ: «أُتِيـتُ بِالْـبُرَاقِ (وَهُـوَ دَابَّـةٌ أَبْيَـضُ طَوِيـلٌ فَـوْقَ الْحِمَارِ، ودُونَ الْبَغْلِ يَضَـعُ حَافِـرَهُ عِنْـدَ مُنْتَهَـى طَرْفِـهِ) قَـالَ: فَرَكِبْتُـهُ حَتَّـى أَتَيْـتُ بَيْـتَ الْمَقْـدِسِ**

---

(١) صحيح البخاري : ٤٨٥٦ ومسلم: ١٧٤.

(قَالَ): فَرَبَطْتُهُ بِالْحَلْقَةِ الَّتِي يَرْبِطُ بِهِ الأَنْبِيَاءُ «قَالَ»: ثُمَّ دَخَلْتُ الْمَسْجِدَ فَصَلَّيْتُ فِيهِ رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ خَرَجْتُ، فَجَاءَنِي جِبْرِيلُ عليه السلام بِإِنَاءٍ مِنْ خَمْرٍ، وإِنَاءٍ مِنْ لَبَنٍ، فَاخْتَرْتُ اللَّبَنَ، فَقَالَ جِبْرِيلُ عليه السلام: اخْتَرْتَ الْفِطْرَةَ.

ثُمَّ عُرِجَ بِنَا إِلَى السَّمَاءِ، فَاسْتَفْتَحَ جِبْرِيلُ فَقِيلَ: مَنْ أَنْتَ؟ قَالَ جِبْرِيلُ، قِيلَ: ومَنْ مَعَكَ؟ قَالَ مُحَمَّدٌ، قِيلَ: وقَدْ بُعِثَ إِلَيْهِ، قَالَ: قَدْ بُعِثَ إِلَيْهِ، فَفُتِحَ لَنَا، فَإِذَا أَنَا بِآدَمَ، فَرَحَّبَ بِي ودَعَا لِي بِخَيْرٍ.

ثُمَّ عُرِجَ بِنَا إِلَى السَّمَاءِ الثَّانِيَةِ، فَاسْتَفْتَحَ جِبْرِيلُ عليه السلام فَقِيلَ: مَنْ أَنْتَ؟ قَالَ: جِبْرِيلُ. قِيلَ: ومَنْ مَعَكَ؟ قَالَ مُحَمَّدٌ، قِيلَ: وقَدْ بُعِثَ إِلَيْهِ؟ قَالَ: قَدْ بُعِثَ إِلَيْهِ، فَفُتِحَ لَنَا، فَإِذَا أَنَا بِابْنَيِ الْخَالَةِ: عِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ، ويَحْيَى بْنِ زَكَرِيَّاءَ صَلَوَاتُ اللَّهِ عَلَيْهِمَا فَرَحَّبَا ودَعَوَا لِي بِخَيْرٍ.

ثُمَّ عُرِجَ بِي إِلَى السَّمَاءِ الثَّالِثَةِ، فَاسْتَفْتَحَ جِبْرِيلُ، فَقِيلَ: مَنْ أَنْتَ؟ قَالَ جِبْرِيلُ، قِيلَ: ومَنْ مَعَكَ؟ قَالَ: مُحَمَّدٌ ﷺ قِيلَ: وقَدْ بُعِثَ إِلَيْهِ؟ قَالَ: قَدْ بُعِثَ إِلَيْهِ، فَفُتِحَ لَنَا فَإِذَا أَنَا بِيُوسُفَ ﷺ إِذَا هُوَ قَدْ أُعْطِيَ شَطْرَ الْحُسْنِ، فَرَحَّبَ ودَعَا لِي بِخَيْرٍ.

ثُمَّ عُرِجَ بِنَا إِلَى السَّمَاءِ الرَّابِعَةِ، فَاسْتَفْتَحَ جِبْرِيلُ عليه السلام قِيلَ: مَنْ هَذَا؟ قَالَ: جِبْرِيلُ. قِيلَ: ومَنْ مَعَكَ؟ قَالَ مُحَمَّدٌ. قَالَ: وقَدْ بُعِثَ إِلَيْهِ؟ قَالَ: قَدْ بُعِثَ إِلَيْهِ، فَفُتِحَ لَنَا، فَإِذَا أَنَا بِإِدْرِيسَ فَرَحَّبَ ودَعَا لِي بِخَيْرٍ، قَالَ اللَّهُ عَزَّوجَلَّ: (وَرَفَعْنَاهُ مَكَانًا عَلِيًّا).

ثُمَّ عُرِجَ بِنَا إِلَى السَّمَاءِ الْخَامِسَةِ، فَاسْتَفْتَحَ جِبْرِيلُ، قِيلَ: مَنْ هَذَا؟ قَالَ: جِبْرِيلُ. قِيلَ: ومَنْ مَعَكَ؟ قَالَ: مُحَمَّدٌ، قِيلَ: وقَدْ بُعِثَ إِلَيْهِ؟ قَالَ: قَدْ بُعِثَ إِلَيْهِ، فَفُتِحَ لَنَا، فَإِذَا أَنَا بِهَارُونَ عليه السلام فَرَحَّبَ ودَعَا لِي بِخَيْرٍ.

ثُمَّ عُرِجَ بِنَا إِلَى السَّمَاءِ السَّادِسَةِ، فَاسْتَفْتَحَ جِبْرِيلُ عليه السلام. قِيلَ: مَنْ هَذَا؟ قَالَ: جِبْرِيلُ. قِيلَ: ومَنْ مَعَكَ؟ قَالَ: مُحَمَّدٌ؟ قِيلَ: وقَدْ بُعِثَ إِلَيْهِ؟ قَالَ: قَدْ بُعِثَ إِلَيْهِ، فَفُتِحَ لَنَا، فَإِذَا أَنَا بِمُوسَى عليه السلام فَرَحَّبَ ودَعَا لِي بِخَيْرٍ.

ثُمَّ عُرِجَ بِنَا إِلَى السَّمَاءِ السَّابِعَةِ، فَاسْتَفْتَحَ جِبْرِيلُ، فَقِيلَ: مَنْ هَذَا؟ قَالَ جِبْرِيلُ: قِيلَ: ومَنْ مَعَكَ؟ قَالَ: مُحَمَّدٌ ﷺ قِيلَ: وقَدْ بُعِثَ إِلَيْهِ؟ قَالَ: قَدْ بُعِثَ إِلَيْهِ، فَفُتِحَ لَنَا فَإِذَا أَنَا بِإِبْرَاهِيمَ عليه السلام مُسْنِدًا ظَهْرَهُ إِلَى الْبَيْتِ الْمَعْمُورِ، وإِذَا هُوَ يَدْخُلُهُ كُلَّ يَوْمٍ سَبْعُونَ أَلْفَ مَلَكٍ لاَ يَعُودُونَ إِلَيْهِ، ثُمَّ ذُهِبَ بِي إِلَى السِّدْرَةِ الْمُنْتَهَى، وإِذَا ورَقُهَا كَآذَانِ الْفِيَلَةِ، وإِذَا ثَمَرُهَا كَالْقِلاَلِ «قَالَ» فَلَمَّا غَشِيَهَا مِنْ أَمْرِ اللَّهِ مَا غَشِيَ، تَغَيَّرَتْ فَمَا أَحَدٌ مِنْ خَلْقِ اللَّهِ يَسْتَطِيعُ أَنْ يَنْعَتَهَا مِنْ حُسْنِهَا، فَأَوْحَى اللَّهُ

إِلَيَّ مَا أَوْحَى، فَفَرَضَ عَلَيَّ خَمْسِينَ صَلاَةً فِي كُلِّ يَوْمٍ ولَيْلَةٍ، فَنَزَلْتُ إِلَى مُوسَى ﷺ فَقَالَ: مَا فَرَضَ رَبُّكَ عَلَى أُمَّتِكَ؟ قُلْتُ: خَمْسِينَ صَلاَةً. قَالَ: ارْجِعْ إِلَى رَبِّكَ، فَاسْأَلْهُ التَّخْفِيفَ، فَإِنَّ أُمَّتَكَ لاَ يُطِيقُونَ ذَلِكَ، فَإِنِّي قَدْ بَلَوْتُ بَنِي إِسْرَائِيلَ وخَبَرْتُهُمْ. قَالَ: فَرَجَعْتُ إِلَى رَبِّي فَقُلْتُ: يَا رَبِّ! خَفِّفْ عَلَى أُمَّتِي، فَحَطَّ عَنِّي خَمْسًا، فَرَجَعْتُ إِلَى مُوسَى، فَقُلْتُ: حَطَّ عَنِّي خَمْسًا، قَالَ: إِنَّ أُمَّتَكَ لاَ يُطِيقُونَ، ذَلِكَ فَارْجِعْ إِلَى رَبِّكَ فَاسْأَلْهُ التَّخْفِيفَ، «قَالَ»: فَلَمْ أَزَلْ أَرْجِعُ بَيْنَ رَبِّي تَبَارَكَ وتَعَالَى وبَيْنَ مُوسَى عليه السلام حَتَّى قَالَ: يَا مُحَمَّدُ! إِنَّهُنَّ خَمْسُ صَلَوَاتٍ، كُلَّ يَوْمٍ ولَيْلَةٍ لِكُلِّ صَلاَةٍ عَشْرٌ، فَذَلِكَ خَمْسُونَ صَلاَةً. ومَنْ هَمَّ بِحَسَنَةٍ فَلَمْ يَعْمَلْهَا، كُتِبَتْ لَهُ حَسَنَةً، فَإِنْ عَمِلَهَا كُتِبَتْ لَهُ عَشْرًا، ومَنْ هَمَّ بِسَيِّئَةٍ فَلَمْ يَعْمَلْهَا، لَمْ تُكْتَبْ شَيْئًا، فَإِنْ عَمِلَهَا، كُتِبَتْ سَيِّئَةً واحِدَةً، قَالَ: فَنَزَلْتُ حَتَّى انْتَهَيْتُ إِلَى مُوسَى ﷺ فَأَخْبَرْتُهُ، فَقَالَ ارْجِعْ إِلَى رَبِّكَ فَاسْأَلْهُ التَّخْفِيفَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: فَقُلْتُ قَدْ رَجَعْتُ إِلَى رَبِّي حَتَّى اسْتَحْيَيْتُ مِنْهُ»}.

واتـە: ئەنەسـی کـوڕی مالیـك (خـوا لێـی ڕازی بـێ) دەگێڕێتـەوە کـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویـەتی: بوڕاقیـان بـۆ هێنـام (کـە ئاژەڵێکـە سـپییە، درێـژە، لـە کـەر گەورەتـرە و لـە ئێسـتر بچووکـترە، سـمی لـەو شـوێنە دادەنـێ کـە تاکـو ئەوپـەڕی چـاو حوکمـی دەکات، {واتـە: یەکجـار زۆر خێرایـە}[1]، پێغەمبـەر ﷺ فەرمـووی: سـواری بـووم هەتـا هاتمـە (**بیـت المقـدس**)، {واتـە: لـە مەککـەوە لـە مزگـەوتی (**حـرام**)ەوە هاتمـە شـام (**بیـت المقـدس**)}، وڵاخەکەم بەسـتەوە بـەو ئاڵقەیـەوە کـە پێغەمبـەران پێیانـەوە بەسـتۆتەوە، {ئەمـەش ئـەوە دەگەیەنـێ کـە پێغەمبەرانـی دیکـەش دەبـێ ئـەو جـۆرە سـەفەرەیان هەبـوو بـێ}، دوایـی چوومـە مزگەوتـەوە دوو ڕکات نوێـژم تێـدا کرد،{واتـە: ئـەو شـوێنەی کـە مزگەوتـی لـێ بـووە، یاخـود مزگەوتـی لـێ دەبـێ}، دوایـی چوومـە دەر، جبریـل عليه السلام قاپێـك شـەڕاب و قاپێـك شـیری بـۆ هێنـام، مـن شـیرەکەم هەڵبـژارد، جبریـل عليه السلام گـوتی: خواڕسـك و فیترەتێـك کـە خـوا مرۆڤەکانی لەسـەر خوڵقانـدو هەڵتبـژارد، (واتـە: پێـکات) {لـە فەرمایشـتێکی دیکـەدا هاتـوە: دەڵـێ ئەگەر شـەڕابەکەت هەڵبژاردبایـە ئۆممەتەکـەت لایـان دەدا، وەك چـۆن ئۆممەتـانی پێشـوو لایـان دا}، دوایـی بەرزکراینـەوە بـەرەو ئاسـمان، جبریـل داوای کردنـەوەی دەرگای کـرد، {دەبـێ ئاسـمانی یەکـەم بـوو بـێ، هـەر ئاسـمانەو دەرگای خـۆی هەیـە}، گوتـرا: تـۆ کێـی؟ گـوتی: جبریلـم، گوتـرا: کێـت لەگەڵدایـە؟ گـوتی: موحەممـەد، گوتـرا: بـەدوای دا نێـردراوە؟ گـوتی: بـەدوای دا نێـردراوە، بۆمـان کرایـەوە {واتـە: دەرگای ئاسـمانی یەکـەم}، ئادەمـم بینـی بەخێـری هێنـام و، دوایـی دوعـای بـە خێـری بـۆ کـردم.

---

(١) شایانی باسە: نێوان کەوانەکان هەموویان، زیادەی خۆمە، بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی مەبەست.

ئنجا بەرزکرایـنـەوە بـەرەو ئاسـمانی دووەم، جبریـل داوای کردنـەوەی دەروازەی کـرد، پێـی گوترا: تـۆ کێـی؟ گـوتی: جبریلـم، گوتـرا: کێـت لەگەڵدایە؟ گـوتی: موحەممـەد، گوتـرا: بـەدوای دا نێـردراوە؟ گـوتی: بـە دوای دا نێـردراوە، ئنجـا : دەرگای ئاسـمانی دووەمـمان بـۆ کرایـەوە، لـەوێ هـەردوو کـوڕە پـوورەکان {واتـە: کـە کـوڕە پـووری یەکدیـن و دایکیـان خوشـك بـوون} عیسـای کـوڕی مەریـەم و، یەحیـای کـوڕی زەکەرییـام بینـی، بـە خێریـان هێنـام و دوعـای خێریـان بـۆ کـردم.

دوایـی بەرزکرایـنـەوە، بـەرەو ئاسـمانی سـێیەم، جبریـل داوای کردنـەوەی دەرگای کـرد، گوتـرا: تـۆ کێـی؟ گـوتی: جبریلـم، گوتـرا: کێـت لەگەڵدایـە؟ گـوتی: موحەممـەد، گوتـرا: بـە دوای دا نێـردراوە؟ گـوتی: بـەدوای دا نێـردراوە، ئنجـا دەرگای ئاسـمانی سـێیەممان بـۆ کرایـەوە، لـەوێ (یوسـف)م بینـی، کـە بینیـم نیـوەی جوانیـی پێـدرا بـوو! {واتـە: زۆر زۆر جـوان و بـە شـان و شـەوکەت و شـکۆو، سـەرنجڕاکێش بـوو}، ئەویـش بەخێـری هێنـام و دوعـای خێـری بـۆ کـردم.

دوایـی بەرزکرایـنـەوە بـەرەو ئاسـمانی چـوارەم، جبریـل ﷺ داوای کردنـەوەی دەرگای کـرد، گوتـرا: تـۆ کێـی؟ گـوتی: جبریلـم، گوتـرا: کێـت لەگەڵدایـە؟ گـوتی: موحەممـەد، گوتـرا: بـەدوای دا نێـردراوە؟ گـوتی: بـەدوای دا نێـردراوە، دەرگامـان بـۆ کرایـەوە، لـەوێ (ئیدریـس)م بینـی، ئەویـش بەخێـری هێنـام و دوعـای چـاك و خێـری بـۆ کـردم، خـوای زاڵـی پایەبەرزیـش فەرموویـەتی: ﴿وَرَفَعْنَٰهُ مَكَانًا عَلِيًّا ﴿٥٧﴾﴾ مریـم، {واتـە: (ئیدریس)مـان بـۆ شـوێنێکی بڵنـد بەرزکردۆتـەوە}.

دوایـی بەرزکرایـنـەوە بـەرەو ئاسـمانی پێنجـەم، جبریـل ﷺ داوای کردنـەوەی دەرگای کـرد، گوتـرا: تـۆ کێـی؟ گـوتی: جبریلـم، گوتـرا: کێـت لەگەڵدایـە؟ گـوتی: موحەممـەد، گوتـرا: بـەدوای دا نێـردراوە؟ گـوتی: بـە دوای دا نێـردراوە، بۆمـان کرایـەوەو، لـەوێ (**هـاروون**)م بینـی، بەخێـری هێنـام و دوعـای چـاکی بـۆ کـردم.

دوایـی بەرزکرایـنـەوە بـۆ ئاسـمانی شەشـەم، جبریـل ﷺ داوای کردنـەوەی دەرگای کـرد، گوتـرا: ئـەوە کێیـە؟ گـوتی: جبریلـم، گوتـرا: کێـت لەگەڵدایـە؟ گـوتی: موحەممـەد، گوتـرا: بـەدوای دا نێـردراوە؟ گـوتی: بـەدوای دا نێـردراوە، دەرگامـان بـۆ کرایـەوە، لـەوێ (**مووسـا**)م بینـی، بەخێـری هێنـام و دوعـای چـاکی بـۆ کـردم.

دوایـی بەرزکرایـنـەوە بـەرەو ئاسـمانی حەوتـەم، جبریـل ﷺ داوای کردنـەوەی دەرگای کـرد، گوتـرا: تـۆ کێـی؟ گـوتی: جبریلـم، گوتـرا: کێـت لەگەڵدایـە؟ گـوتی: موحەممـەد، گوتـرا: بـەدوای دا نێـردراوە؟ گـوتی: بـەدوای دا نێـردراوە، دەرگامـان بـۆ کرایـەوە، لـەوێ (ئیبراهیـم)م بینـی، کـە پشـتی بـە (**بیـت المعمـور**)ەوە دابـوو، (**بیـت المعمـور**)م بینـی کـە هەمـوو ڕۆژێ

حەفتا هەزار (٧٠٠٠٠) فریشتە دەچوونە نێوی و، جارێکی دیکە ئەو حەفتا هەزار فریشتەیە نەدەچوونەوە نێویی، {واتە: فریشتەکان زۆر زۆرن، ئەو (**بیت المعمور**)ەش لە ئاسمانەو شوێنێکی زۆر موبارەك و پیرۆزە، پەرستگای فریشتەکانە}[1]، دوایی منیان برد بەرەو درەختی کۆتایی (**سدرة المنتهى**)، کە گەڵایەکانی وەك گوێی فیلەکان وا بوون، {واتە: گەڵایەکانی زۆر گەورە بوون}، هەروەها میوەکەی وەك گۆزەو کووپەی گەورە وابوون، کاتێك بە فەرمانی خوا ئەوە داپۆشی کە داپۆشی، {وەك ئایەتەکەش دەفەرموێ: ﴿إِذْ يَغْشَى ٱلسِّدْرَةَ مَا يَغْشَىٰ ۝١٦﴾} ئەو درەختە، گۆڕا بەجۆرێك کە هیچ کام لە دروستکراوانی خوا لەبەر جوانیی ناتوانن وەسفی بکەن.

ئنجا خوا ﷻ سروشی بۆ کردم ئەوەی کە بۆی سروش کردم، پەنجا نوێژی لەسەر فەرز کردم لە هەر شەو و ڕۆژێکدا.

دوایی دابەزیم هەتا گەیشتمە مووسا {واتە: لە ئاسمانی شەشەم}، گوتی: پەروەردگارت چی لەسەر ئۆممەتەکەت پێویست کرد؟ گوتم: پەنجا نوێژ، گوتی: بگەڕێوە بۆ لای پەروەردگارت و داوای لێ بکە بۆت سووك بکات، چونکە ئۆممەتەکەت ناتوانن ئەو پەنجا نوێژە ئەنجام بدەن، من ئەزموونم لەگەڵ بەنی ئیسرائیلدا هەیەو، جەڕباندوومن {دوایی باسی دەکەین، کە زیاتر مەبەستی پێ چییە؟} {پێغەمبەر ﷺ} فەرمووی: گەڕامەوە بۆ لای پەروەردگارم، گوتم: ئەی پەروەردگارم! ئەرك لەسەر ئۆممەتەکەم سووك بکە، ئەویش پێنج نوێژی لێ کەم کردنەوە {لەو پەنجا نوێژە}، دووبارە گەڕامەوە {لەسەرەوەڕا} بۆ لای مووسا، گوتم: خوا پێنج نوێژی لەسەر سووك کردووم، مووسا گوتی؟ ئۆممەتەکەت ئەوەیان لە تواناد نیە، بگەڕێوە بۆ لای پەروەردگارت، داوای سووك کردنی لێبکە، فەرمووی: بەو شێوەیە من لە نێوان پەروەردگارم ﷻو لە نێوان مووسادا ؈ دەهاتم و دەچووم، {خوای میهرەبان پێنج پێنج نوێژەکانی دابەزاندوە}، هەتا خوای (خوا) فەرمووی: ئەی موحەممەد! ئەوانە پێنج نوێژن لە هەر شەوو ڕۆژێکدا، هەر نوێژێك بە دە (١٠) نوێژە، ئەوە دەکاتە پەنجا نوێژ، هەروەها هەر کەسێك ویستی چاکەیەك بکات و، نەیکرد، چاکەیەکی بۆ دەنووسرێ و، ئەگەر کردی، دە (١٠) چاکەی بۆ دەنووسرێن و، هەر کەسێك ویستی خراپەیەك بکات و، نەیکرد، هیچی بۆ نانووسرێ و، ئەگەر کردی، یەك خراپەی بۆ دەنووسرێ.

---

(١) ئەمە هەر لە خودی فەرمایشتەکەوە دیارە، بۆیەش زانایان گوتوویانە: (البیت المعمور) - کە لەسووڕەتی (الطور)یش دا ناوی هاتوە - کەعبەی فریشتەکانە.

فەرمووی: دوایی دابەزیم بۆ لای مووسا ﷺ هەواڵم پێدا، گوتی: بگەڕێوە بۆ لای پەروەردگارت داوای لێبکە بۆت سووك بکات، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوەندە گەڕامەوە لای خوا تاکو شەرمم لێکرد {چی دیکە ناگەڕێمەوە}.

دەڵێین: بێگومان خوا ﷻ هەر لە ئەزەلدا، پێنج نوێژی دیاریی کردوون، بەڵام:

١)- بە پەنجا (٥٠)ی هەواڵ پێداوە، تاکو بزانێ ئەو پێنج نوێژە یەك بە دە (١٠)ن و خێری پەنجا نوێژیان هەیە.

٢)- هەروەها بۆ ئەوەش کە قەدرو حورمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ دەربکەوێ، کە خوا چەندە لەلای بەڕێزو بە حورمەتە، لەسەر داوای ئەو لەسەر ئۆممەتەکەی سووك کردوە.

٣)- لەو لاشەوە پلەو پایەی مووساش ﷺ، دەربکەوێ.

٤)- هەروەها ئەوەش کە پێغەمبەران هەموویان دڵسۆزی یەکدین و دڵسۆزی ئۆممەتەکانی یەکدین.

لێرە پرسیارێك دێتە پێش: ئایا مووسا ﷺ کە بە دڵنیاییەوە پلەو پایەی پێغەمبەری خاتەم لە هی مووسا بەرزترە، یانی چی، لێرەدا بۆتە چاوساغی پێغەمبەری خوا ﷺو، بۆتە ئامۆژگارییکاری؟ کە هەندێك کەس توانج لەم فەرمایشتە دەدەن و دەڵێن: ئەوە ئیسرائیلیاتی جوولەکەکانە، چونکە ئەوە مەدحی مووسای تێدایە، کە هەڵبژێردراوە بەسەر موحەممەددا ﷺو بۆتە مامۆستاو ئامۆژگارییکاری؟

دەڵێین: هێچ پێویست بەوە ناکات و دروست و ڕەواش نیە: توانج لە فەرمایشتێك بدەین، کە لە هەموو کتێبەکانی سوننەت دا هاتبێ، چونکە حیکمەتی ئەوە کە پێغەمبەری خاتەم لە ڕێنمایی مووسا ﷺ بەهرەمەند بووە، مووسا بۆ خۆی ڕوونی کردۆتەوە، کە گوتوویەتی: (**فَإِنِّي قَدْ بَلَوْتُ بَنِي إِسْرَائِيلَ وخَبَرْتُهُمْ**)، واتە: من ئەزموونم لەگەڵ نەوەی ئیسرائیل دا هەیە و، لێیان شارەزام! ئەو کاتەش کە موحەممەد ﷺ چووە بۆ ئەو سەفەرە، جارێ ئەرکی بەڕێوەبردنی کۆمەڵگاو دەوڵەتی نەکەوتبووە سەرشان و، ئەو ئەزموونەی نەبوو، ئەو شارەزاییەی نەبوو، بەڵام مووسا ﷺ پێشتر ئەزموونی بەڕێوەبردنی کۆمەڵگای بەنی ئیسرائیلی هەبووە، ئنجا مووسا کە (**مفضول**)ە، و موحەممەد کە (**أفضل**)ە، سەیر نیە کە مووسا ﷺ زانیارییەکی لە لابێ و، موحەممەد ﷺ لە لای نەبێ، چونکە نەك مووسا، بەڵکو (**الحباب ابن المنذر**) لە جەنگی بەدردا پێشنیار بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەکات و، لێشی وەردەگرێ، هەروەها چەند جاری دیکە، هاوەڵان پێشنیار بۆ پێغەمبەر ﷺ دەکەن، یان

لە شتێك ئاگاداری دەكەنەوە، كە ئەو لێی شارەزا نیە و، لێشیان وەردەگرێ، چ جای پێغەمبەرێكی پایە بەرزی وەك مووسا ﷺ.

## سێ مەسەلەی گرنگی پەیوەست بە شەورۆیی و بەرزبوونەوەوە

پێش ئەوەی بچینە سەر بڕگەی پێنجەم و كۆتایی شەورۆیی و بەرز بوونەوەی پێغەمبەر ﷺ، باسكردنی سێ مەسەلەی گرنگ بەپێویست دەزانین:

### مەسەلەی یەكەم: وەسفی (بیت المقدس):

پێغەمبەر ﷺ دوای ئەوەی ئەو شەوە ئەو سەفەرە دەكات، بۆ بەیانی باسی شەورۆییەكەی خۆی دەكات، ئنجا دوای گێڕانەوەی باسی سەفەرەكەی، كافرەكانی قورەیش بە حیسابی خۆیان كەرەستەیەكی پڕو پاگەندەی خراپیان لە دژی پێغەمبەر ﷺ دەستدەكەوێ، هەتا لە هەندێ شوێنەواراندا هاتوە: هەندێ لە هاوەڵانیش كە ئیمانیان دامەزراو نەبووە، هەڵگەڕاونەوە لەبەر ئەوەی شتەكەیان لە عەقڵەوە نەچووە، لەو بارەوەش ئەم فەرموودەیە هەیە، كە ڕوونی دەكاتەوە چۆن خوای بە بەزەیی و میهرەبان دوای ئەوەی كافرەكان لە بارەی (بیت القدس)ەوە پرسیاری لێ دەكەن بۆ سەغڵەتكردنی - گوایە ڕاست ناكات و ئەو شەورۆییەی نەكردوە - باش دەفریای پێغەمبەرەكەی دەكەوێ:

**{عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: لَمَّا كَذَّبنِي قُرَيْشٌ، قُمْتُ فِي الْحِجْرِ، فَجَلاَ اللَّه لِي بَيْتَ الْمَقْدِسِ، فَطَفِقْتُ أُخْبِرُهُمْ عَنْ آيَاتِهِ وأَنَا أَنْظُرُ إِلَيْهِ} (أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ: ٣٨٨٦ و ٤٧١٠).**

هەروەها موسلیمیش هێناویەتی، بە بێژەی: **{لَمَّا كَذَّبَتْنِي قُرَيْشٌ، قُمْتُ فِي الْحِجْرِ فَجَلاَ اللَّهِ لِي بَيْتَ الْمَقْدِسِ، فَطَفِقْتُ أُخْبِرُهُمْ عَنْ آيَاتِهِ وأَنَا أَنْظُرُ إِلَيْهِ} (أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ: ٤٢٧، وَالتِّرمِذِيُّ: ٣١٣٣).**

واتە: جابیری كوڕی عەبدوڵڵا (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ)، دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو ﷺ دەیفەرموو: كاتێ قورەیش، منیان بە درۆ دانا (دوای ئەوەی ئەو شەورۆییەی بۆ گێڕاونەوە) هەڵسام لە (**حیجر**)دا {پاڕامەوە}حیجریش ئەو پاردۆكەیە كە

لـە نیزیـك كەعبەوەیـە، قوڕەیشییەكانیش لـەوێ بـوون لـە نیزیكـی}، خـواش (**بیـت المقـدس**)ی پێشـان دام و بـۆی دەرخسـتم {ئەوانیـش دیـارە لـە دەوری بـوون}، منیـش هەواڵـم پێـدەدان دەربـارەی نیشـانەكانی (**بیـت المقـدس**) و شـوێنەوارەكانی و، تەماشـام دەكـرد، واتـە: تەماشـای ئـەو شـارو شـوێنەوارەم دەكـرد كـە مـن سـەفەرم بـۆی كـردوە و، ئەوانیـش دەیانگـوت نەچـووی، دەمگـوت: فـلان شـوێنی ئاوایـە و فـلان شـوێنی ئاوایـە و.....هتـد.

## مەسەلەی دووەم: نوێژكردنی پێغەمبەری خوا ﷺ بە پێغەمبەران:

كـە ئەمیـش موسـلیم بـە ژمـارە (٤٢٩) هێناویـەتی لـە: (**بـاب صـلاة النبـي بالأنبيـاء**) پێغەمبـەر لـە درێـژەی فەرموودەكـەدا دەفەرموێ:

**{...وَقَـدْ رَأَيْتُنِـي فِي جَمَاعَـةٍ مِـنَ الأَنْبِيَـاءِ، فَـإِذَا مُـوسَى قَائِـمٌ يُصَـلِّي، فَـإِذَا رَجُـلٌ ضَرْبٌ جَعْـدٌ، كَأَنَّـهُ مِـنْ رِجَـالِ شَـنُوءَةَ، وَإِذَا عِيـسَى ابْـنُ مَرْيَـمَ عليه السلام قَائِـمٌ يُصَـلِّي، أَقْـرَبُ النَّـاسِ بِـهِ شَـبَهًا: عُـرْوَةُ بْـنُ مَسْـعُودٍ الثَّقَفِـيُّ، وإِذَا إِبْرَاهِيـمُ عليه السلام قَائِـمٌ يُصَـلِّى أَشْـبَهُ النَّـاسِ بِـهِ صَاحِبُكُـمْ «يَعْنِـي نَفْسَـهُ» فَحَانَـتِ الصَّـلاَةُ فَأَمَّمْتُهُـمْ، فَلَـمَّا فَرَغْـتُ مِـنَ الصَّـلاَةِ، قَـالَ قَائِـلٌ: يَـا مُحَمَّـدُ! هَـذَا مَالِـكٌ صَاحِـبُ النَّـارِ فَسَـلِّمْ عَلَيْـهِ، فَالْتَفَـتُّ إِلَيْـهِ، فَبَـدَأَنِي بِالسَّـلاَمِ}.**

واتـە: خۆمـم بینـی لـە نێـو كۆمەڵێـك لـە پێغەمبەرانـدا، {ئنجـا ئایـا هەموویـان بـوون، یـان تەنیـا هەندێكیـان بـوون؟ لێـرەدا بـە پێـی ڕواڵـەتی فەرموودەكـە دەردەكـەوێ كـە ئەوانـە كـە نـاوی هێنـاون، تەنیـا ئـەوان بـوون، یاخـود هەموویـان بـوون، بـەڵام ئـەو تەنیـا نـاوی هەندێكیـانی هێنـاوە، كـە دیمـەن و شـێوەیانی لـە بیـر مـاوە} مووسـام بینـی نوێـژی دەكـردو دەپاڕایـەوەو پەرسـتشی بـۆ خـوا دەكـرد، {نازانیـن چـۆن بـووە؟ چونكـە وشـەی (صـلاة) لـە زمـانی عەرەبییـدا، بـە مانـای نوێـژ و بەمانـای پاڕانـەوەش دێ، بەندایەتیـی دەكـرد}، پیاوێـك بـوو قـژی لـوول بـوو {كەڵەگـەت بـوو} وەك پیـاوانی هـۆزی شـەنوئە، عیساشـم بینی (عیسـای كـوڕی مەریـم عليه السلام)، ڕاوەسـتا بـوو دەپاڕایـەوە و بەندایەتیـی بـۆ خـوا ئەنجـام دەدا، نزیكترین كـەس كـە وێـی بچـێ: عـوڕوەی كـوڕی مەسـعوودی سـەقەفیی بـوو، هەروەهـا ئیبراهیمـم بینـی عليه السلام، ئەویـش ڕاوەسـتا بـوو دەپاڕایـەوە و بەندایەتیـی بـۆ خـوا دەكـرد، كەسێك كـە لـە هەمـوو كـەس زیاتـر پێـی بچـێ هاوەڵەكـەی خۆتانـە، (واتـە: خـۆم، پێغەمبـەر (محمـد ﷺ)، ئنجـا كاتی نوێـژ هـات و پێـش نوێژییـم بـۆ كـردن، كاتـێ لـە نوێـژ تـەواو بـووم، یەكێـك گـوتی: ئـەی موحەممـەد ﷺ ئـەوە (مالیـك) سەرپەرشـتیاری ئاگـری دۆزەخـە سـەلامی لـێ بكـە، ئـاوڕم لێدایـەوە، ئـەو سـڵاوی لـە مـن كـرد.

## مەسەلەی سێیەم: ئایا پێغەمبەر ﷺ خوای بەرزی بینیوە لەو سەفەرەیدا، یان نا؟!

لەو بارەوە ڕاجیایی هەیە لە نێوان زانایاندا، ئێمە چەند دەقێك لەو بارەوە دێنین، هەڵبەتە وا باوە کە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ)، ڕای وایە کە پێغەمبەر ﷺ خوای پەروەردگاری لە شەوی بەرزبوونەوەدا، بینیوە! بەڵام هاوەڵانی دیکە (خوا لێیان ڕازی بێ)، ڕایان وایە کە پێغەمبەر ﷺ خوای پەروەردگاری بە چاوی سەر نەبینیوە، لە شەوی بەرزبوونەوەدا، بەڵکو بە چاوی عەقڵ و دڵی بینیویەتی، کە دوایی لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسیشەوە دێنین، کە ئەویش باس لەوە دەکات کە: بە چاوی عەقڵ و دڵ بینیویەتی، با لەو بارەوە تەماشای ئەو دەقانە بکەین:

**فەرموودەی یەکەم:** {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ شَقِيقٍ عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ هَلْ رَأَيْتَ رَبَّكَ؟ قَالَ: «نُورٌ أَنَّى أَرَاهُ»} (أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ٢١٤٢٩، ومُسْلِمٌ: ٤٤٢، والتِّرمِذِيُّ: ٣٢٨٢، وقَالَ: حَسَنٌ، وابْنُ حِبَّانَ: ٥٨).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی شەقیق دەگێڕێتەوە لە ئەبوو زەڕەوە ﷺ، گوتوویەتی: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، ئایا پەروەردگاری خۆتت بینی؟ (واتە: لە شەوی شەوڕۆ و بەرزبوونەوەدا)، ئەویش فەرمووی: ڕووناکییە، چۆنی ببینم؟ (واتە: ناتوانم ببینم).

**فەرموودەی دووەم:** {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ شَقِيقٍ قَالَ: قُلْتُ لأَبِي ذَرٍّ: لَوْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَسَأَلْتُهُ، فَقَالَ: عَنْ أَيِّ شَيْءٍ كُنْتَ تَسْأَلُهُ؟ قَالَ: كُنْتُ أَسْأَلُهُ هَلْ رَأَيْتَ رَبَّكَ؟ قَالَ أَبُو ذَرٍّ: قَدْ سَأَلْتُ فَقَالَ: «رَأَيْتُ نُوراً»} (أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ: ٤٤٣).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی شەقیق: (کە یەکێکە لە زانایانی تابعیین، واتە: ئەو جیلەی کە لە دوای هاوەڵانەوە هاتوون)، دەڵێ بە ئەبو زەڕی غیفارییم ﷺ گوت: ئەگەر پێغەمبەری خوام ﷺ بینیبایە پرسیارم لێ دەکرد، ئەبوو زەڕ ﷺ گوتی: لە بارەی چییەوە پرسیارت لێ دەکرد؟ گوتی: لەو بارەوە لێم دەپرسی کە: ئایا پەروەردگاری خۆتت بینیوە؟ ئەبوو زەڕی غیفاریش گوتی: من لەو بارەوە لێم پرسی، فەرمووی: ڕووناکییم بینی.

**فەرموودەی سێیەم:** {عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ، قَالَ: قَامَ فِينَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِخَمْسِ كَلِمَاتٍ، فَقَالَ: إِنَّ اللَّهَ لا يَنَامُ،ولا يَنْبَغِي لَهُ أَنْ يَنَامَ، ولَكِنَّهُ يَخْفِضُ الْقِسْطَ ويَرْفَعُهُ، يُرْفَعُ إِلَيْهِ عَمَلُ اللَّيْلِ قَبْلَ عَمَلِ النَّهَارِ،وعَمَلُ النَّهَارِ قَبْلَ عَمَلِ اللَّيْلِ، حِجَابُهُ النُّورُ لَوْ كَشَفَهَا لأَحْرَقَتْ سُبُحَاتُ وجْهِهِ مَا

انْتَهَـى إِلَيْـهِ بَـصَرُهُ مِـنْ خَلْقِـهِ} (أَخْرَجَـهُ أَحْمَـد: ١٩٦٤٩، مُسْـلِمٌ: ٤٤٤، وابْـنُ مَاجَـهْ: ١٩٥، وأَبُـو عَوَانَـة: ٣٧٩، وابْـنُ حِبَّـانَ: ٢٦، والطَّـبَرَانِيُّ في «الأَوْسَـط»: ٦٠٢٥).

واتـە: ئەبـوو مووسـای ئەشـعەریی ﷺ دەڵـێ: ڕۆژێـك پێغەمبـەری خـوا ﷺ هەڵسا لـە نێوماندا پێنـج وشـەی فەرمـوون: (پێنـج شـتی پـێ فەرموویـن) فەرمـووی: بێگومـان خـوا (ی زاڵ و پایـە بـەرز) ناخـەوێ و ناشـگونجێ بخـەوێ، تـەرازوو نـزم دەكات و بـەرز دەكاتـەوە، كـردەوەی شـەوێی پێـش هـی ڕۆژێ بـۆ لای بـەرز دەكرێتـەوە و، كـردەوەی ڕۆژێشـی پێـش هـی شـەوێ بـۆلا بـەرز دەكرێتـەوە، پەردەكـەی (خـوا) بریتیـە لـە ڕووناكیـی، « لـە ڕیوایەتـی ئەبـوو بەكـردا - كـە ئەویـش یەكێكـە لـە ڕاوییـەكان - دەفەرمـوێ: پەردەكـەی بریتیـە لـە ئاگـر»، ئەگـەر لایبـدات، پڕشـنگەكانی ڕووی (خـوای پـەروەردگار) هەرچـی بـەدی بـكات، لـە دروسـتكراوەكانی هەمـووی دەسـووتێنێ. {واتـە: ئەگـەر ئـەو پەردەیـەی كـە خـۆی ڕووناكییـە، یاخـود ئاگـرە، خـوا لایبـدات، بـە پڕشـنگەكانی ڕووی خـوا ﷻ هەمـوو دروسـتكراوەكان لـە بەیـن دەچن}.

ئنجـا لێـرەوە بۆمـان دەردەكـەوێ كـە پێغەمبـەر ﷺ فەرموویەتـی: (رَأَيْـتُ نُـوراً)، وادیـارە هـەر ئـەو پەردەیـەی بینیـوە كـە كەوتۆتـە نێـوان خـوا ﷻ و دروسـتكراوەكانیەوە.

هەڵبەتـە ئێمـە بـە درێژیـی لەوبـارەوە قسـەمان كـردوە، لـە كاتـی تەفسـیر كردنـی سـوورەتی (الأنعـام)دا ئایەتـی: ﴿ لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَٰرُ وَهُوَ يُدْرِكُ ٱلْأَبْصَٰرَ ۖ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١٠٣﴾ ﴾، بۆیـە لێـرەدا هـەر بـە كورتیـی بەسـەریدا ڕۆیشـتین.

## هەڵوێستی هاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێ) لەوبارەوە:

لـەو بـارەوە لـە صەحیحـی موسـلیم دا: (**بـاب: معنـى قـول اللّـه عـز وجـل ولقـد رآه نزلـة أخـرى، وهـل رأى النبـي ﷺ ربَّـه ليلـة الإسراء؟**) بـاسی مانـای قسـەی خـوای پـەروەردگار: (**ولقـد رآه نزلـة أخـرى**)، واتـە: جارێـكی دیكـەش بینیویـەتی، كـە ئایا پێغەمبـەر ﷺ پـەروەردگاری خـۆی بینیـوە لـە شـەوی شـەوڕۆیی دا، یـان نـا؟ چەنـد دەقێـك دێنـێ، كـە ئێمـەش هەندێكیـان دێنیـن:

١- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: ﴿ وَلَقَدْ رَءَاهُ نَزْلَةً أُخْرَىٰ ﴿١٣﴾ ﴾ قَالَ: رَأَى جِبْرِيل!} (أَخْرَجَهُ مُسْلِم: ٤٣٤).

واتـە: ئەبـوو هورەیـرە خـوا لێـی ڕازیبێ لـە بـارەی ئایەتـی: ﴿ وَلَقَدْ رَءَاهُ نَزْلَةً أُخْرَىٰ ﴿١٣﴾ ﴾ واتـە: جارێـكی دیكـەش بینـی، دەڵـێ: جبریلـی بینی.

٢- {عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: رَآهُ بِقَلْبِهِ!} (أَخْرَجَهُ مُسْلِم: ٤٣٥).

واتە: ئیبنو عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ دەڵێ (رأى) واتە: مەبەست پێی خوای پەروەردگارە، بەڵام بە دڵی بینیویەتی.

٣- {عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: ﴿ مَا كَذَبَ ٱلْفُؤَادُ مَا رَأَىٰٓ ﴿١١﴾ وَلَقَدْ رَءَاهُ نَزْلَةً أُخْرَىٰ ﴿١٣﴾ ﴾، قَالَ: رَأَى بِفُؤَادِهِ مَرَّتَيْنِ!} (أَخْرَجَهُ مُسْلِم: ٤٣٦).

ئیبنو عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ دەڵێ: (کە دەفەرموێ: عەقڵ و دڵی بە هەڵە دا نەچوو لەوەدا کە بینی و، جارێکی دیکەش بینی)، لەو بارەوە گوتوویەتی: بە دڵی، دوو جاران بینی.

٤- {عَنْ مَسْرُوقٍ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: هَلْ رَأَى مُحَمَّدٌ رَبَّهُ؟ فَقَالَتْ: سُبْحَانَ اللَّهِ؟! لَقَدْ قَفَّ شَعْرِي لِمَا قُلْتَ!!} (أَخْرَجَهُ مُسْلِم: ٤٤٠).

واتە: مەسرووق کە یەکێکە لە زانایانی تابیعین (واتە: جیلی دوای هاوەڵان)، دەڵێ: پرسیارم لە عائیشە کرد خوا لێی ڕازی بێ، ئایا موحەممەد ﷺ پەروەردگاری خۆی بینیوە؟ گوتی: پاکیی بۆ خوا، (واتە: شتێکی سەیرت گوت!)، بە هۆی ئەوەوە کە گوتت مووەکانم وەستان!! (وەك چۆن لە کوردەوارییدا یەکێك بە یەکێك دەڵێ: مووم گرژبوون!)، واتە: شتێکی زۆر گەورەت گوت، واتە: پێغەمبەر ﷺ خوای پەروەردگاری نەبینیوە بە چاوی سەر.

٥- {عَنْ مَسْرُوق، قَالَ: قُلْتُ لِعَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، فَأَيْنَ قَوْلُهُ: ﴿ ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّىٰ ﴿٨﴾ فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَىٰ ﴿٩﴾ فَأَوْحَىٰٓ إِلَىٰ عَبْدِهِۦ مَآ أَوْحَىٰ ﴿١٠﴾ ﴾النجم، قَالَتْ: إِنَّمَا ذَاكَ جِبرِيلُ كَانَ يَأْتِيهِ فِي صُورَةِ الرِّجَالِ، وَإِنَّهُ أَتَاهُ فِي هَذِهِ الْمَرَّةِ فِي صُورَتِهِ الَّتِي هِيَ صُورَتُهُ، فَسَدَّ الأُفُقَ} (أَخْرَجَهُ مُسْلِم: ٤٤١).

واتە: مەسرووق دەڵێ: بە عائیشەم گوت رضي الله عنها (کە نکوولیی لەوە کرد: پێغەمبەر ﷺ لە شەوی شەوڕۆیی دا خوای پەروەردگاری بینیبێ)، گوتم: ئەدی فەرمایشتی خوا کە دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّىٰ ﴿٨﴾ فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَىٰ ﴿٩﴾ فَأَوْحَىٰٓ إِلَىٰ عَبْدِهِۦ مَآ أَوْحَىٰ ﴿١٠﴾ ﴾النجم، واتە: دوای ئەوە شۆڕ بۆوە، تاکو وەك دوو کەوانەی لێ هات، یاخود کەمتریش، ئنجا ئەوەی بە بەندەی خۆی ڕاگەیاند، کە بۆی سروش کرد، مەسرووق دەڵێ: ئەدی ئەوە لە کوێیە؟ {مەسرووق وای لێ حاڵی بووە کە ئەوە مەبەست پێی خوای پەروەردگارە، کە لە پێغەمبەر ﷺ نزیك بووەتەوە}، (عائشة) خوا لێی ڕازی بێ گوتی:

ئـەوە مەبەسـت پێـی جبریلـە، پێشـتر جبریـل لـە شـێوەی پیاوانـدا دەهاتـە لای پێغەمبـەر ﷺ، بـەڵام ئـەو جـارە لەسـەر شـێوەی ڕاسـتەقینەی خـۆی بینـی، کـە ئاسـۆی هەمـوو پـڕ کـرد بـوو.

هەروەها لە دەقێکی ڕاست دا هاتوە، کە جیبریل شەش سەد باڵی هەیە[1].



(١) {عـن الشـيباني قـال: سـألت زر بـن حبيـش: عـن هـذه الآيـة: (لقـد رأى مـن آيـات ربـه الكـبرى) قـال: قـال عبـد اللّـه: رأى جبريـل فـي صورتـه لـه سـت مئـة جنـاح} أخرجـه إبـن حبـان: ٦٤٢٧، قـال شـعيب الأرنـؤوط: إسـناده صحيـح عـلى شرط الشـيخين.

## ئنجا ئایا ئەو سەفەرە مووبارەکە بە ڕووح و بە جەستە بووە، یاخود تەنیا بە ڕووح؟ هەروەها ئایا لە کاتی بێدارییدا بووە؟ یاخود لە کاتی خەودا بووە؟

لەو بارەوە زانایان زۆر قسەیان کردوە، بەڵام بە گشتی دەتوانین قسەکانیان بکەین بە سێ ڕای گشتی:

ڕای یەکەم: گوتوویانە ڕووح و جەستەوە بووە و، لە کاتی بێدارییدا بووە، هەم شەوڕۆو هەم بەرزبوونەوەکەش، ئەمە قسەی زۆربەی زۆری زانایانە.

ڕای دووەم: دەڵێن: هەتا شام بە ڕووح و جەستەوە بووەو، لەوێ بەولاوە، تەنیا بە ڕووح بووە، بەڵام ڕووحەکەی لە کاتی بێدارییدا، نەك لە نووستن و خەون دا.

ڕای سێیەم: دەڵێن: ئەو شەوڕۆو بەرزبوونەوەیە، هەمووی لە حاڵەتی خەونـدا بووە و تەنها بە ڕووح بووە، کە ئەمە پاڵدراوەتە لای عائیشەو موعاویەو حەسەنی بەصرایی و ئیبنو ئیسحاق، هەڵبەتە جاری وایە ڕایەك پاڵ دەدرێتە لای یەکێك لە هاوەڵان، یان یەکێك لە تابیعین، کە ڕەنگە هەمان کەس ڕای دیکەشی هەبێ.

بەڵام ئەو ڕایەی کە ئێمە پێمان ڕاسترەو پێمان بەڵگەدارترە، هەر ڕای یەکەمە و، زۆربەی هەرە زۆری زانایان ڕایان وایە: کە پێغەمبەر ﷺ بە ڕووح و جەستەوە لە مزگەوتی حەرامەوە، لە مەککە، لە کاتێکی کەمی شەوێکدا، شەوڕۆیی پێکراوەو سەفەری پێکراوە، سەرەتا بۆ (**بيت المقدس**) لە شام و، دواتر لەوێشەوە بەرزکراوەتەوە بۆ ئاسمانەکان، دەتوانین زۆر بەڵگان لەو بارەوە بێنینەوە، کە زۆرێك کە زانایانیش ئاماژەیان بە هەموو، یاخود بەشێك لەو بەڵگانە کردوە[1]:

---

(١) بۆ وێنە:
١ - (أضواء البيان)ی (الشنقيطي).
٢- (التحرير والتنوير)ی (محمد الطاهر بن عاشور).
٣ - (الطبري).
٤ - (الشوكاني).
٥ - (ابن كثير).
٦ - (فخرالدين الرازي).
هەموویان کەم و زۆر ئەو بەڵگانە دێنن، بەڵام ئەو بەڵگانەی کە من دەیانهێنم، پێم وایە کۆی هەموو ئەو بەڵگانەیە، کە دەگونجێ بکرێنە سەلمێنەری ئەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە جەستەو ڕووحەوە، ئەو سەفەرەی کردوە و لە حاڵەتی بێدارییشدا بووە.

بەڵگەی یەکەم: خوا دەفەرموێ: ﴿سُبۡحَٰنَ ٱلَّذِيٓ أَسۡرَىٰ بِعَبۡدِهِۦ﴾، واتە: پاکیی بۆ ئەو خوایەی کە شەوڕۆیی بە بەندەکەی خۆی کرد.

ئنجا وشەی (عَبد)یش چەمك و واتایەکەی بریتیە لە کۆی ڕووح و جەستە، ئەگەرنا خوا دەیفەرموو: (**بروح عبده**)، بەڵام بەندە (عَبْد) کۆی ڕووح و جەستەیە و بە هەردووکیان دەگوترێ: بەندە و مرۆڤ، ئەگەرنا ڕووحەکەی، هەر ڕووحی پێ دەگوترێ و، جەستەکەشی تەنیا جەستەی پێ دەگوترێ و، لە کۆی هەردووکیان مرۆڤ پێك دێ، خوای پەروەردگاریش بە نازناوی بەندەی خۆی (**عَبْده**) پێغەمبەر ﷺی باسکردوە.

بەڵگەی دووەم: کە خوا دەفەرمووێ: ﴿سُبۡحَٰنَ﴾، شارەزایانی زمان گوتوویانە: (**وَالتَّسْبيحُ يَكُونُ للأمُورِ العِظَامِ، فَلَو كَانَ مَنَامَاً، لَمْ يَكُنْ لَهُ كَبير شأنٍ، حَتَّى يُتَعَّجَبَ مِنْهُ**)، یانی: (**سُبْحَانَ**) واتە: پاك و بێ خەوشیی، پاك و بێ خەوشە ئەو کەسەی کە شەوڕۆیی بە بەندەکەی خۆی کرد، ئنجا بە پاکگرتنی خواش بۆ کاری مەزن بە کاردێ و، ئەگەر خەون بووایە هێندە شتێکی گرنگ نەبوو، کە وشەی (**سبحان**) کە بۆ سەرسوڕمانە و مەبەست ئەوەیە کە خوا پاك و بێ خەوشە لەوەی نەتوانێ سەفەرێکی وا بە بەندەی خۆی بکات، ئنجا ئەگەر سەفەرەکە خەون بووایە، پێویستی نەدەکرد ئەو شێوازە لە دەربڕین بەکاربێ.

بەڵگەی سێیەم: لە سوورەتی (**النجم**)دا خوا دەفەرموێ: ﴿مَا زَاغَ ٱلۡبَصَرُ وَمَا طَغَىٰ ١٧﴾،واتە: (پێغەمبەری خوا) چاوی لای نەداو سەرکێشیی نەکرد، ئنجا شتێکی ئاشکرایە کە چاو (**بصر**) لە ئامرازەکانی جەستەیە، یانی: لە ئامرازەکانی مرۆڤە، لە حاڵێکدا کە ڕووحی لە جەستەی دایە، نەك تەنیا هی ڕووح بێ!

بەڵگەی چوارەم: کە خوا لە سوورەتی (**الإسراء**)دا دەفەرموێ: ﴿لِنُرِيَهُۥ مِنۡ ءَايَٰتِنَآۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ١﴾، واتە: (ئەو شەوڕۆییەمان پێکرد) تاکو لە نیشانە گەورەکانی خۆمانی نیشان بدەین.

هەروەها لە سوورەتی (**النجم**)دا، دەفەرموێ: ﴿لَقَدۡ رَأَىٰ مِنۡ ءَايَٰتِ رَبِّهِ ٱلۡكُبۡرَىٰٓ ١٨﴾، بە دڵنیایی (موحەممەد) لە نیشانە گەورەکانی پەروەردگاری خۆی بینین.

ئنجا بینین بۆ چاوە، واتە: چاوی سەر، کەواتە: دیارە ئەو سەفەرەش بە جەستەو ڕووحەوە بووە.

بەڵگەی پێنجەم: لە ئایەتی ژمارە (٦٠)ی سووڕەتی (الإسراء)دا، کە ئێمە خەریکی ڕوونکردنەوەی واتاکانینی، خوا دەفەرموێ: ﴿وَمَا جَعَلْنَا ٱلرُّءْيَا ٱلَّتِىٓ أَرَيْنَـٰكَ إِلَّا فِتْنَةً لِّلنَّاسِ وَٱلشَّجَرَةَ ٱلْمَلْعُونَةَ فِى ٱلْقُرْءَانِ ۚ وَنُخَوِّفُهُمْ فَمَا يَزِيدُهُمْ إِلَّا طُغْيَـٰنًا كَبِيرًا ﴿٦٠﴾﴾، واتە: ئەو بینینەی کە پێشانی تۆماندا، تەنیا تاقیکردنەوە بوو بۆ خەڵکی و، درەختی نەفرین لێکراویش لە قورئاندا کە باس دەکەین، ئەویش تاقیکردنەوەیە بۆ خەڵك.

دیارە کە درەختی نەفرینلێکراو (**الشجرة الملعونة**) مەبەست پێی (**زقّوم**)ە، کە کافرەکان دەیانگوت: چۆن درەخت لە نێو ئاگردا دەڕوێ، هەرشتێك بخرێتە نێو ئاگرەوە دەیسووتێنێ؟! نەیاندەزانی کە ئەحواڵ و هەل و مەرجەکانی ڕۆژی دوایی، جیان لە هی دنیا.

ئنجا خوا کە لێرە دەفەرموێ: ئەو پێشاندانەی کە پێشانی تۆمان دا تاقیکردنەوە بوو بۆ خەڵکی، شایانی باسیشە: وشەی: (ٱلرُّءْيَا)، هەندێك لە زانایان، کردوویانەتە بەڵگە لەسەر ئەوە کە ئەو سەفەرە خەون بووە، بەڵام، نا، زانایان دەڵێن: (**رؤیا**)و (**رؤیة**) هەردووکیان بە مانای بینین دێن! بینین بە چاوی سەر، بەڵێ: (**رؤیا**)، بە مانای خەون دێ، بەڵام بە مانای بینینی (چاوی سەر)یش دێ، ئنجا خوا کە لێرەدا دەفەرموێ: ئەو بینین و دیمەنانەی کە پێشانی تۆمان دا، تەنیا تاقیکردنەوە بوو بۆ خەڵك، زانایان دەڵێن: ئەگەر شەوڕۆییەکە خەون بووایە، کافرەکانی مەککە پێی تاقی نەدەکرانەوەو، نەدەبوو بە مایەی تاقیکردنەوە، چونکە کافرەکان دەیانگوت: خەون بووەو بینیویەتی! هەر کەسێك دەتوانێ بڵێ: خەونم بینی چوومە ئاسمان، خەونم بینی چوومە سەر مانگ، خەونم بینی...، بەڵام لێرەدا مەبەستی پێی: بینین بووە بە چاوی سەر، بۆیەش بۆ خەڵك بۆتە جێگای تاقیکردنەوەو، بۆیان بۆتە هۆی ئەوە کە لە عەقڵیانەوە نەچێ، بەڵام ئەگەر خەون بووایە، لە عەقڵیانەوە دەچوو و، هیچ کێشەو مشتومڕی لەسەر دروست نەدەبوو.

بەڵگەی شەشەم: ئەگەر خەون بووایە، نەدەبووە هۆی ئەوەی قوڕەیشییەکان پێغەمبەر ﷺ بە درۆکار دابنێن، کە ئەمە هەر لە بەڵگەی پێنجەمەوە نزیکە، بەڵام بەڵگەی پێنجەم لە بەرتیشکی ئایەتی ژمارە (٦٠)ی سووڕەتی (الإسراء)دا هاتووە، بەڵام ئەمەیان لە سیرەی ئیبنو هیشام و ئەو سەرچاوانەی دیکەدا کە باسی ژیانی پێغەمبەر دەکەن ﷺ هاتووە، هەتا دەڵێ: هەندێك لەوانەی کە ئیمانیان بێ هێز بووە هەڵگەڕاونەتەوە و، لە هەندێ

شوێنەواران دا هاتوە، کە نازناوی (**الصدِّيق**) واتە: زۆر بە ڕاستدانەر، لەو کاتەوە بوو بە نازناوی ئەبووبەکر ﷺ کە هەواڵیان پێدا گوتیان: دەزانی هاوەڵەکەت چی دەڵێ؟ کافرەکان وایانزانی کە نۆ هەنگیان لە دارێکدا دۆزیونەوەو، ئێستا ئەبووبەکر هەڵدەگێڕنەوە، لەبەر ئەوەی موحەممەد ﷺ شتێك دەڵێ، کە لە عەقڵی ئەبووبەکریشەوە ناچێ! ئەبووبەکر گوتی: چی دەڵێ؟ گوتیان: دەڵێ: دوێنێ شەو لێرەوە لە مزگەوتی حەرامەوە سەفەرم کردوە بۆ شام و گەڕاویشمەوە! {دەبێ پێغەمبەر ﷺ باسی بەرزبوونەوە ((عروج))کەی نەکردبێ، یاخود قوڕەیشییەکان هەر ئەوەندەیان بە کافی زانیبێ، کە ڕەخنەی لێبگرن، کە بە یەك شەو لە مەککەوە بچێ بۆ شام!} ئەبووبەکر ﷺ گوتی: ئنجا ئەوە چییە! من بڕوا دەکەم بەوە، کە لە یەك چرکەدا، جبریل لە سەرووی حەوت ئاسمانانەوە، هەواڵی بۆ بێنێ! ئەوەش ئاسایییە: {**فَإِنِّي أَشْهَدُ إِنْ كَانَ قَالَ ذَلِكَ لَقَدْ صَدَقَ**} (**أخرجه عبدالرزاق في المصنف: ٩٧١٩**).

واتە: من شایەدیی دەدەم، ئەگەر ئەوەی گوتبێ، ڕاستی فەرمووە.

دەڵێن: لێرەوە نازناوی (**الصديق**) واتە: بەڕاستدانەر (یان: ڕاستگۆ) بە گەورەمان ئەبوو بەکر درا، کە هەرچی پێغەمبەر ﷺ فەرمووبای، بە ڕاستی دادەنا، هەڵوێستەکەشی زۆر ڕاست و ژیرانە بووە، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ شتێك نافەرموێ، وانەبێ.

بەڵگەی حەوتەم: لە فەرمایشتەکەدا هاتوە کە: سواری ئاژەڵێك بووە بە ناوی (بوراق)، دیارە سوار بوونیش بۆ جەستەیە، ئەگەرنا ڕووح پێویستیی بە ئامڕازی ماددیی نیە بۆ گواستنەوە، بە بەڵگەی ئەوە کە ئینسان لە خەودا خەون بە بەهەشتەوە دەبینێ، خەون بە دۆزەخەوە دەبینێ، خەون بە قیامەتەوە دەبینێ، خەون بەو سەری دنیاوە دەبینێ! بەڵێ خەون کاری ڕووحە، پێویستیی بە ئامڕاز نیە ئەو ڕووحە بگوازێتەوە و پێی بێت و بچێ، بەڵکو وا پێدەچێ کە ڕووح نەك لە ژێر هەیمەنەی شوێن دا نیە، بەڵکو لە ژێر هەیمەنەی کاتیش دا نیە، چونکە لە چرکەیەکدا خەونێك دەبینی کە زۆر درێژە و ڕەنگە کات هەر نەخایەنێ.

بەڵگەی هەشتەم: لەو بارەوە فەرمایشتی پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر هاتوون، بۆیە ئێمە ناگونجێ هەر لە خۆمانەوە ئەو فەرمایشتانەی پێغەمبەر ﷺ کە گەورە پیاوانی ڕاست بێژ و متمانە پێکراوی وەك بوخاریی و موسلیم و تیرموذیی و نەسسائیی و ئەبوو داوودو ئیبن ماجەو ئەحمەد، گێڕاویاننەوە، کە ئەوانیش لە خەڵکی متمانە پێکراوو، ئەوانیش لە خەڵکی

متمانە پێکراوو، ئەوانیش لە هاوەڵان و، ئەوانیش لە پێغەمبەری خوا ﷺ بیستوویانن، ئێمە بێین هەر لە خۆمانەوە نیشانەی پرسیار بخەینە سەریان، یان بە جۆرێك مانـاو تەئویلیان بکەین، کە لە نێوەڕۆك خاڵیی بنەوە، ئەوە شتێکی زۆر بێ جێیە.

هەڵبەتە ڕایەکەی دیکەش چەند بەڵگەیەك دێننەوە، یەکیان ئەوەیە کە: لە هەندێ لە بێژەکاندا پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: دوایی لە خەو بێدار بوومەوە: (**ثُمَّ استَيْقَظْتُ مِنَ النَّوْمِ**)، واتە: باسی شەوڕۆ و بەرزبوونەوەکەی دەکات، دوایی باسی بێداربوونەوەکەی دەکات! بەڵام لە ئەگەری ڕاست بوونی ئەو ڕیوایەتەدا کە ئەو ڕستەیە تێدا هاتوە، دەڵێین: دەگونجێ ئەو سەفەرەی پێغەمبەر ﷺ وەك چۆن لە ساڵی حەوتەمدا کە پێی دەگوترێ: (**عُمْرَةُ القَضَاء**)، پێغەمبەر ﷺ چووە نێو مزگەوتی حەرامەوە، بەڵام لە ساڵی شەشەمدا خەونی بینیبوو، کە دەچێتە نێو مزگەوتەوە خۆی و هاوەڵەکانی، واتە: دوای ئەوەی کە کۆچی کردبوو لە مەککەوە بۆ مەدینە، نەچوو بۆوە بۆ مەککەو مزگەوتی حەرام و چواردەوری کەعبە، ئنجا خەونی بینی کە خۆی و هاوەڵانی، دەچنە نێو مزگەوتی حەرام و تەواف بە دەوری کەعبەدا دەکەن، بەڵام ئەو ساڵەی کە خەونەکەی بینیبوو نەهاتە دی و ساڵی دوایی هاتە دی، ئنجا وەك چۆن ئەو مەسەلەیان کە ساڵی پێشێ خەونی دیبوو، بەڵام ساڵی دواتر هاتەدی شەوڕۆو بەرزبوونەوەکەش دەگونجێ، پێغەمبەر ﷺ پێشتر بە خەون بینیبێتی و، دوایی بە کردەوە هاتبێتە دی، وەك لە سوورەتی (الفتح) ئایەتی (٢٧)دا، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿لَّقَدْ صَدَقَ ٱللَّهُ رَسُولَهُ ٱلرُّءْيَا بِٱلْحَقِّ لَتَدْخُلُنَّ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ﴾، واتە: خوا ﷻ خەونی پێغەمبەرەکەی ﷺ ڕاست هێنایە دی، ئەگەر خوا بیەوێ: بە دڵنیایی دەچنە نێو مزگەوتی حەرامەوە، بەدڵنیایی و هێمنییەوە.

کە دواییش ئەوە بوو، خەونەکە هاتە دی، بەڵام لە ساڵی داهاتوودا.

کەواتە: دەگونجێ ئەو شەوڕۆو بەرزبوونەوەیەش، پێشێ خوای پەروەردگار بە خەون نیشانی پێغەمبەری ﷺ دابێ، وەك زەمینە سازییەك، دوایش بە کردەوە سەفەرەکەی کرد بێ.

کۆتا قسە لەوبارەوە ئەو چەند قسەیە لە (**إبن كثير**)ەوە دێنین، کە لە تەفسیرەکەی خۆیدا بە تایبەتی لە خولاصەی تەفسیرەکەی: (**المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير**)[1]دا دەڵێ: (**وَالْحَقُّ أَنَّهُ ﷺ أُسْرِيَ بِهِ (يَقَظَةً) لاَ (مَنَامًا) مِنْ مَكَّةَ إِلَى بَيْتِ الْمَقْدِسِ راكباً على الْبُرَاقِ، فَلَمَّا انْتَهَى إِلَى بَابِ الْمَسْجِدِ رَبَطَ الدَّابَّةَ عِنْدَ الْبَابِ، وَدَخَلَهُ فَصَلَّى**

---

(١) ص ٧٥٦.

فِي قِبْلَتِهِ تحية المسجد ركعتين، ثم أُتِي بالمعْرَاجِ وَهُوَ كَالسُّلَّمِ ذُو دَرَجٍ يُرْقَى فِيهَا فَصَعِدَ فِيهِ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا، ثُمَّ إِلَى بَقِيَّةِ السَّمَاوَاتِ السَّبْعِ، فَتَلَقَّاهُ مِنْ كُلِّ سَمَاءٍ مُقَرَّبُوهَا، وَسَلَّمَ عَلَى الأَنْبِيَاءِ الَّذِينَ فِي السَّمَاوَاتِ بِحَسْبِ مَنَازِلِهِمْ وَدَرَجَاتِهِمْ).

واتە: ڕاست و هەق ئەوەیە كە پێغەمبەری خوا ﷺ سەفەری شەوی پێكراوە بە بێداریی و، لە كاتی خەوو لە خەوندا نەبووە، بەڵكو بێدار بووە، لە مەككەوە بۆ (**بیت المقدس**)، سواری بوڕاق بووە و كاتێك گەیشتۆتە لای دەرگای مزگەوتەكە، ئەو ئاژەڵەی كە پێی بووە، لە لای دەرگاكە بەستوویەتەوەو، دوایی چۆتە نێو مزگەوتەكەو لە شوێنی ڕووگەكەی، دوو ڕكاتی سڵاوی مزگەوتی كردوون، دوایی (**معراج**)یان بۆ هێناوە، كە وەك قادرمە و پەیژەیەكە، پلیكانەی پێوەن، لەوێوە سەركەوتووە بەرەو ئاسمانی یەكەم، دوایی بۆ حەوت ئاسمانەكان و، لە هەر ئاسمانێكدا فریشتە زۆر نزیكەكانی پێشوازییان لێكردووەو، سڵاوی لەو پێغەمبەرانە كردوە كە لەو ئاسمانانەدا بوون، هەركامیان بە گوێرەی پێگەو پلەی خۆی.

ئەمە پوختەیەك بوو دەربارەی شەوڕۆیی و بەرزبوونەوەی پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ، هەر چەندە ئەم بابەتە دەگونجێ قسەی زۆر زیاتری لەسەر بكرێ، بە تایبەت لەو بارەوە كە ئایا چۆن پێغەمبەر ﷺ ئەگەر بەرزبووبێتەوە بۆ سەرووی حەوت ئاسمانەكان، ئێستا بە پێی زانستی گەردوونیی تازە، زانراوە كە تیشك لە چركەیەكدا سێ سەد هەزار (٣٠٠٠٠٠) كیلۆمەتر دەبڕێ، مانگ كە (٣٦٠) تاكو (٣٨٠) هەزار كیلۆمەتر لە زەوییەوە دوورە، بە چركەیەك و یەك لەسەر چواری چركەیەك ڕووناكییەكەی دەگاتە ئێمە و، خۆر (**شمس**) كە سەدو پەنجا ملیۆن (١٥٠٠٠٠٠٠٠) كیلۆمەتر لە ئێمەوە دوورە، تیشكەكەی بە هەشت خولەك دەگاتە ئێمە، بەڵام ئەستێرەی وا هەیە كە هەر لە سنووری ئاسمانی یەكەمدایە و بە ملیۆنێك ساڵی ڕووناكیی، تیشكەكەی دەگاتە ئێمە، بەڵكو هەیانە بە دەیان ملیۆن ساڵی تیشكیی، ئنجا تیشكەكەی دەگاتە ئێمە، كەواتە: ئەوەی كە پێغەمبەر ﷺ سەفەری پێكردوە (بوڕاق) ئەگەر بە خێرایی تیشكیش ڕۆیشتبێ، ئنجا بەچەندان ساڵیش، ناگاتە نزیكترین ئەستێرەش! چ جای ئەو مەسافە دوورەی بڕی بێ، لەو ماوە كەمەدا؟!

**وەڵامەکەی ئەوەیە:**

کـە ئێمـە ناڵێیـن: پێغەمبـەر ﷺ ئـەو سـەفەرەی کـردوە وەك سـەفەرێکی ئاسـایی و، ناشـڵێین: بـوڕاق بـە خێرایـی تیشـك دەڕوات، هەڵبەتـە کـە باسـی (بـوڕاق) کـراوە، تەنیـا بـۆ ئـەو مەسـافەیەی نێـوان مزگـەوتی حـەڕام و مزگـەوتی ئەقصـا، واتـە: لـە شـاری مەککـەوە بـۆ شـام، هـەر ئەوەنـدە باسـی (بـوڕاق) کـراوە، ئەگەرنـا بـۆ ئـەوی دیکـە، باسـی (**معـراج**) کـراوە، کـە ئامرازێـکی دیکەیـەو، پێغەمبـەر ﷺ پێـی بەرزبۆتـەوە، بـەڵام هـەر چـۆن بـێ، ئـەو سـەفەرە، ناگونجـێ وەك سـەفەرێکی ئاسـایی بـێ، چونکـە:

١- جەستەی مرۆڤ تەحەممولی ئەو هەموو خێراییە ناکات و، هەڕروون بە هەڕروون دەبێ.

٢ - پاشان ئۆکسجین نیە بگرە هەر هەوا نیە.

٣- ئنجا تیشکە زیانبەخشەکان هەن.

کەواتـە: ئـەو ئامـڕازە کـە پێغەمبـەر ﷺ پێـی بەرزبۆتـەوە و سـەفەرەکە هەمـووی بـە موعجیـزە دادەنـرێ! شـتێك کـە تاکـو ئێسـتا مـرۆڤ ناتوانـێ بـە عەقـڵ و زانسـتی ئاسـایی دەرکـی بـکات، موعجیـزە واتـە: شـتێکی یاسـادڕ (**خـارق العـادة**)، شـتێك کـە بـە پێـی ئـەو یاسـا باوانـەی کـە مـرۆڤ دەیانزانـێ، بـە پێـی ئەوانـە نیـە، بەڵـی موعجیـزەش بـە پێـی هەنـدێ یاسـای خـوای پـەروەردگارە، بـەڵام ئـەو یاسـایەی خـوا، جیایـە لـەو یاسـا باوانـەی کـە ئێمـە دەیانزانیـن، ئەگەرنـا ئەگـەر بـە پێـی ئـەو یاسـا باوانـە بـێ، کـە پێغەمبـەر ﷺ ئـەو سـەفەرەی کـردوە، خەڵـکی دیکـەش دەیتـوانی ئـەو سـەفەرە بـکات! بەڵـێ ئـەو شـەوڕۆییەی پێغەمبـەر، شـتێکی یاسـادڕ بـووە، ئـەو حاڵەتـەی پێغەمبـەر ﷺ موعجیـزە بـووە، وەك چـۆن گەلێـك لـە شـتەکانی دیکەشـی یاسـادڕن! واتـە: نابـێ بـە پێودانگـی ئـەو یاسـایانەی ئێمـە دەیانزانیـن، تەماشـای بکەیـن، ئەگـەر وا تەماشـای بکەیـن، ئـەو کاتـە هیـچ چارمـان نیـە دەبـێ بڵێیـن: سـەفەرەکەی پێغەمبـەر ﷺ ئەگـەر لـە مەککـەوە بـۆ شـامیش بـە بـوڕاق بـوو بـێ و، ئەوەنـدە خێراییـە دەگونجـێ، بـەڵام سـەفەرەکەی دیکـەی بـۆ ئاسـمانەکان، بـە دڵنیایـی دەبـێ بڵێیـن: بـە ڕووح بـووە! کـە ڕایـەکی ئـاواش هەیـە.

بـەڵام مـن پێـم وایـە کـە: بـە ڕووح و جەسـتەوە بـووە، بـەڵام بـە شـێوەیەکی تایبـەت، بـە شـێوەیەکی یاسـادڕ کـە ئێمـە نازانیـن چۆنـە؟

مەسەلەی دووەم:

خوا ڕایگەیاندوە: کە کتێبی بە مووسا داوەو، گێڕاویەتی بە ڕێنمایی بۆ گەلی بەنی ئیسرائیل، کە جگە لە خوا بریکارو سەرپەرشتیارێکی دیکە، نەگرن، ئەوانیش وەچەی ئەوانەن کە خوا لەگەڵ (نووح)دا بە سواری کەشتیی هەڵیگرتن و دەربازی کردن، نووحیش بەندەیەکی زۆر سوپاسگوزار بوو بۆ خوا:

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ وَجَعَلْنَٰهُ هُدًى لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَلَّا تَتَّخِذُوا۟ مِن دُونِى وَكِيلًا ﴿٢﴾ ذُرِّيَّةَ مَنْ حَمَلْنَا مَعَ نُوحٍ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ عَبْدًا شَكُورًا ﴿٣﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ وَءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ ﴾، هەروەها کتێبمان بە مووسا عليه السلامدا، پسپۆڕانی زمان گوتوویانە: (عَطْفٌ عَلَى جُمْلَةِ: ﴿ سُبْحَٰنَ ٱلَّذِىٓ أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِۦ لَيْلًا ﴾)، واتە: وەك چۆن پاکیی بۆ ئەو خوایەی کە سەفەری شەوی بە بەندەکەی خۆی کرد، لە مزگەوتی حەرامەوە بۆ مزگەوتی ئەقصا، بە هەمان شێوە: کتێبیشمان بە مووسا دا.

ئنجا (**الكتاب**) لێرەدا، وەك ئەوە وایە کە خوا فەرموویەتی: ﴿ وَمَا قَدَرُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦٓ إِذْ قَالُوا۟ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَىٰ بَشَرٍ مِّن شَىْءٍ ۗ قُلْ مَنْ أَنزَلَ ٱلْكِتَٰبَ ٱلَّذِى جَآءَ بِهِۦ مُوسَىٰ نُورًا وَهُدًى لِّلنَّاسِ ۖ تَجْعَلُونَهُۥ قَرَاطِيسَ تُبْدُونَهَا وَتُخْفُونَ كَثِيرًا ۖ وَعُلِّمْتُم مَّا لَمْ تَعْلَمُوٓا۟ أَنتُمْ وَلَآ ءَابَآؤُكُمْ ۖ قُلِ ٱللَّهُ ۖ ثُمَّ ذَرْهُمْ فِى خَوْضِهِمْ يَلْعَبُونَ ﴿٩١﴾ ﴾ الأنعام، کە لە بەرگی پێنج (٥)ی ئەم تەفسیرەدا بە تەفصیل لە بارەیەوە قسەمان کردوە: کە(أل)ی سەر(**الكِتَاب**) ئەلیف و لام (أل)ی تەعریفە، بەڵام بۆ (عهد)ە، واتە: کتێبەکەمان بە مووسا دا، کە بە دڵنیایی بە مەبەست پێی تەوڕاتەو، لە زۆر شوێنی قورئاندا، تەوڕات بە (**الكتاب**) هاتوە، یانی: کتێبەکەی مووسا عليه السلام.

٢)- ﴿ وَجَعَلْنَٰهُ هُدًى لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴾، کردیشمان بە ڕێ پێشاندەرو ڕێنمایی بۆ بەنی ئیسرائیل، واتە: ئەو کتێبەمان کردە هۆکاری ئەوە کە ڕێی پێ بدۆزنەوە و، بەر پێی خۆیانی پێ ببینن و، بزانن: چۆن ژیانێك بگوزەرێنن مایەی ڕەزامەندیی خوا بێ.

٣)- ﴿ أَلَّا تَتَّخِذُواْ مِن دُونِي وَكِيلًا ﴾، ئەمە خوێنراویشەتەوە: (**أَلاَّ يَتَّخِذُوا مِنْ دُونِي وَكِيْلاً**) یانی: ئەی بەنی ئیسرائیل! جگە لە من بریكارو سەرپەرشتیارێكی دیكە بۆ خۆتان پەیدا مەكەن، یاخود: بۆیە ئەو كتێبەمان بە مووسا دا، كە ببێتە ڕێنمایی بۆ بەنی ئیسرائیل، تاكو لە جیاتی من و جگە لە من بریكارو سەرپەرشتیارێكی دیكە پەیدا نەكەن.

ئنجا كە دەفەرمووێ: (ألاّ) لە بنچینەدا (أَنْ لاَ)یە، دەڵێ: (**أَنْ: تَفْسِيرِيَّةٌ لِمَا تَضَمَّنَهُ لَفْظُ الكِتَابِ مِنْ مَعْنَى الأَقْوَالِ، أَو (أَنْ) مَصْدَرِيَّةٌ مَجْرُورَةٌ بِلاَمٍ مَحْذُوفَةٍ حَذْفاً مُطَّرِداً، وَالتَّقْدِيرِ آتَيْنَاهُمُ الكِتَابَ لِئَلاَّ يَتَّخِذُوا....**) لە ڕووی ڕێزمانی عەرەبییەوە: ئەو (أَنْ لاَ)، (أن)، یان ڕوونكەرەوەیی (**تفسيرية**)یە، لەبەر ئەوە كە وشەی (**الكتاب**) كۆمەڵێك مانای قسان دەگرێتە خۆی، واتە: ئاوامان پێگوتبوون، یاخود (أن)ی چاوگی (**مصدرية**)یە و ژێردار كراوە بە لامێك كە هەمیشە قرتاو (**حذف**) دەبێ، كە ئاوای لێدێتەوە: (**آتَيْنَاهُمُ الكِتَابَ لِئَلاَّ يَتَّخِذُوا مِن دونِي وَكِيلاً**) كتێبمان پێدان تاكو جگە لە من سەر پەرشتیارو بریكارێكی دیكە نەگرن.

٤)- ﴿ ذُرِّيَّةَ مَنْ حَمَلْنَا مَعَ نُوحٍ ﴾:

أ - (**ذرِّيةَ**) لێرەدا لەسەر (مدح و إختصاص) مەنصووبە، واتە: وەك مەدحكردن و تایبەتكردن، یانی: ئەی ئەو وەچە تایبەتەی لەگەڵ نووحدا هەڵمان گرتن! واتە: بە سواری كەشتییەكەی هەڵمان گرتن.

ب - یاخود وشەی (ذرية) حاڵە، واتە: لە حاڵێكدا ئێوە وەچەی ئەوانەن كە لەگەڵ نووحدا هەڵمانگرتن.

ج - یاخود وشەی (**ذُرِّيَّة**) (**يُنْتَصَبُ عَلَى النِّدَاءِ بِتَقْدِيرِ النِّدَاءِ، يَعْنِي: يَا ذُرِّيَّةَ مَنْ حَمَلْنَا**)، واتە: لێرەدا بانگكردن مەزەننەكراوە بۆیە مەنصووبە: هۆ وەچەی ئەو كەسانەی كە لەگەڵ نووحدا بەسواری كەشتییەكە دەربازمان كردن! ئنجا لێرەدا مەبەست ئەوەیە: ئێوە ئەی بەنی ئیسرائیل! لەوەچەی ئەو كەسانەن كە لەگەڵ نووحدا بە سواری كەشتییەكە دەربازمان كردن.

هەروەك لە سوورەتی (**الحاقة**)دا دەفەرمووێ: ﴿ إِنَّا لَمَّا طَغَا ٱلْمَآءُ حَمَلْنَٰكُمْ فِى ٱلْجَارِيَةِ ﴿١١﴾ ﴾، ئێمە كاتێك ئاوەكە لە سنوور دەرچوو، تۆفان هەڵسا، ئێوەمان سواری ڕۆیشتوو (**جارية**) كرد، واتە: ئەو كەشتییە كە بە نێو ئاودا، دەڕۆیی.

٥)- ﴿ إِنَّهُۥ كَانَ عَبْدًا شَكُورًا ﴾، بێگومان نووح بەندەیەكی زۆر سوپاسگوزار بوو، كەواتە: ئێوەش سوپاسگوزاربن بۆ خوا، سپڵەو ناسوپاس مەبن، وەك باپیرە گەورەی خۆتان نووح عليه السلام بن، كە ئەوانەی كە لەگەڵ ئەودا بوون، هەموویان وەچەی نووح بوون و، ئێوەش لەوەچەی ئەوانن.

مەسەلەی سێیەم:

خوا ﷻ بڕیاری بۆ بەنی ئیسرائیل داوەو، لە کتێبەکەیاندا پێی ڕاگەیاندوون: کە لە زەویدا دوو کەڕەتان خراپەکاریی و ملهووڕیی دەکەن، ئنجا کاتێ وەختی جێبەجێکردنی بەڵێنی یەکەمیان هات، چەند بەندەیەکی زەبردەست و بەهێزیان بۆ دەنێرێ، کە کون و قوژبنی ماڵەکانیان لێیان دەپشکنن بۆ گرتن و کوشتنیان، ئنجا دوای ئەوە خوا نۆرەی زاڵبوونیان بۆ دەگێڕێتەوە (بۆ بەنی ئیسرائیل)و، سامان و کوڕانیان بۆ دەڕەخسێنێ و، ژمارەی جەنگاوەرەکانیان لە هی دوژمنانیان زیاتر دەکات، کە ئەگەر چاکە بکەن خۆیان سوودمەندن و، لە خراپەشیان هەر خۆیان زیانبارن، ئنجا هەر کات کاتی بەڵێنی دووەم کەڕەتی لووت شکاندنیان هات (بە هۆی ملهووڕیی و ستەمیانەوە)، خوا چەند بەندەیەکی زەبردەستی بەهێزیان دەنێرێتەوە سەر، تاکو کارێکیان پێ بکەن، تەمی خەمباریی لە ڕوویان بنیشێ و، وەك یەکەمجار ئەو جەنگاوەرە دوژمنانەیان بچنە مزگەوتەکەیانەوەو، هەرچی بە ملهووڕیی بنیاتیان ناوە، بیڕووخێنن و تەختی بکەن:

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَقَضَيْنَآ إِلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ فِى ٱلْكِتَٰبِ لَتُفْسِدُنَّ فِى ٱلْأَرْضِ مَرَّتَيْنِ وَلَتَعْلُنَّ عُلُوًّا كَبِيرًا ﴿٤﴾ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ أُولَىٰهُمَا بَعَثْنَا عَلَيْكُمْ عِبَادًا لَّنَآ أُو۟لِى بَأْسٍ شَدِيدٍ فَجَاسُوا۟ خِلَٰلَ ٱلدِّيَارِ ۚ وَكَانَ وَعْدًا مَّفْعُولًا ﴿٥﴾ ثُمَّ رَدَدْنَا لَكُمُ ٱلْكَرَّةَ عَلَيْهِمْ وَأَمْدَدْنَٰكُم بِأَمْوَٰلٍ وَبَنِينَ وَجَعَلْنَٰكُمْ أَكْثَرَ نَفِيرًا ﴿٦﴾ إِنْ أَحْسَنتُمْ أَحْسَنتُمْ لِأَنفُسِكُمْ ۖ وَإِنْ أَسَأْتُمْ فَلَهَا ۚ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ ٱلْءَاخِرَةِ لِيَسُۥٓـُٔوا۟ وُجُوهَكُمْ وَلِيَدْخُلُوا۟ ٱلْمَسْجِدَ كَمَا دَخَلُوهُ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَلِيُتَبِّرُوا۟ مَا عَلَوْا۟ تَتْبِيرًا ﴿٧﴾ ﴾

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆزدە بڕگەدا :

١)- ﴿ وَقَضَيْنَآ إِلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴾، هەروەها بڕیارمان بۆ بەنی ئیسرائیل داو، پێمان ڕاگەیاندن، (بَنِىٓ) واتە: وەچە، یان کوڕان و کچان، (إِسْرَٰٓءِيلَ)یش نازناوی یەعقووبە ﷺ، کەواتە: (بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ) واتە: وەچەی یەعقووب ﷺ، کە دیارە پێشێ بنەماڵەیەك بوون، دوایی بوونە هۆز، دوایی بوونە دوازدە تیرەو هۆز، دوایی بوونە گەلێك، کە ئێستا گەلی جوولەکەیان پێ دەڵێن.

کە دەفەرمووێ: ﴿ وَقَضَيۡنَآ إِلَىٰ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ﴾، دەڵێ: (القَضَاءُ: **الحُكْمُ وَالتَّقْدِيرُ، وَعُدِّيَ بـ (إِلَىٰ) لِتَضْمِينِهِ مَعْنَى: أَبْلَغْنَا، مِثْلُ:** ﴿ وَقَضَيۡنَآ إِلَيۡهِ ذَٰلِكَ ٱلۡأَمۡرَ أَنَّ دَابِرَ هَٰٓؤُلَآءِ مَقۡطُوعٞ مُّصۡبِحِينَ ﴿٦٦﴾ ﴾الحجر، واتە: (**قَضَاء**) بە مانای بڕیاردان و ئەندازەگیریی کردنی شتێك دێ، بەڵام لێرە بە (إِلَىٰ) تێپەڕاندنی پێکراوە، {بەرکار (مفعول)ی خواستووە} تاکو مانای (**أَبْلَغْنَا**)ی بچێتە نێو، ئەگەرنا (وَقَضَيۡنَآ) واتە: بڕیارماندا، بەڵام : ﴿ وَقَضَيۡنَآ إِلَىٰ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ﴾، واتە: بڕیارمان بۆ دان و پێشمان ڕاگەیاندن بە بەنی ئیسرائیل، وەك لە سووڕەتی (الحجر)دا دەربارەی گەلی **لووط** خوا دەفەرمووێ: ﴿ وَقَضَيۡنَآ إِلَيۡهِ ذَٰلِكَ ٱلۡأَمۡرَ أَنَّ دَابِرَ هَٰٓؤُلَآءِ مَقۡطُوعٞ مُّصۡبِحِينَ ﴿٦٦﴾ ﴾، واتە: ئەو بڕیارمان بۆ داو پێشمان ڕاگەیاند، کە ئەوانە دەمەو بەیان دوا بڕاو دەبن! (واتە: گەلی **لووط**).

٢)- ﴿ فِي ٱلۡكِتَٰبِ ﴾، واتە: لە کتێبدا، کە مەبەست لە (کتێب) وا پێدەچێ تەوڕات بێ، کە ئەلیف و لامی ناساندن (**أل التعريف**) بۆ (**عهد**)ە، واتە: لە کتێبەکەدا، چونکە پێشتر باسی کتێب کراوە: ﴿ وَءَاتَيۡنَا مُوسَى ٱلۡكِتَٰبَ ﴾، واتە: لەو کتێبەدا کە بە مووسامان دابوو، پێمان ڕاگەیاند بوون ئەو بڕیارەمان بۆ دابوون ....

دەشگونجێ (الكتاب) مەبەستی کتێبێکی دیکە بێ لە کتێبەکانیان، چونکە بە پێی ئەوە کە لە پەیمانی کۆندا هاتووە، کۆمەڵێك لە پێغەمبەرانیان ناویان هاتووە: (**إشعياء، إرمياء، حزقيال، دانيال، ملاخي، عزرا، نحميا، سفنيا، ناحوم، ميخا**)، دیارە ئەمە جگە لە زەکەریاو یەحیاو عیسا و، ژمارەیەکی دیکەش ناو هاتوون.

هەڵبەتە ئۆباڵ بە ئەستۆی پەیمانی کۆن کە دەڵێ: ئەوانە هەموویان پێغەمبەر بوون، کتێبەکانیشی هەموویان هێناون و بە هەموویان، (پەیمانی کۆن) پێك دێنن، ئنجا ئایا ئەو بڕیارەی کە خوا بۆی داون و، پێی ڕاگەیاندوون بە بەنی ئیسرائیل، چی بووە؟

٣)- ﴿ لَتُفۡسِدُنَّ فِي ٱلۡأَرۡضِ مَرَّتَيۡنِ وَلَتَعۡلُنَّ عُلُوّٗا كَبِيرٗا ﴾، خوا ئەو بڕیارەی بۆ داون و پێ ڕاگەیاندوون، کە ئێوە دوو کەڕەتان لە زەویدا خراپەکاریی دەکەن و، بە باڵادەستییەکی گەورە، باڵادەست دەبن، واتە: دەبنە حوکمڕان و خاوەن دەسەڵات، بەڵام دەسەڵاتێکی گەورە و بێڕەزا.

وشەی (لَتُفۡسِدُنَّ) لە ئەسڵدا ئاوایە: (**لَتُفْسِدُونَنَّ**).

وشەی (وَلَتَعۡلُنَّ)ش لە ئەسڵدا ئاوایە: (**لَتَعْلُونَنَّ**).

بەڵام کاتێك نوون (ن)ی تەئکیدو لام (ل)ی تەئکیدیان خراوەتە سەر، ئەو گۆڕانەیان بەسەردا هاتووەو بەو جۆرەش کە قورئان هێناونی، کورتترن، واتە: بە دڵنیاییەوە لە زەویدا دوو کەڕەتان خراپەکاریی و تێکدان دەکەن و باڵا دەستییەکی گەورەتان دەبێ.

ئەوەی لێرەدا قورئان فەرموویەتی لە (پەیمانی کۆن)یش دا ئاماژەی پێکراوە، بۆ وێنە:

**أ- لە کتێبی (إِرْمِيَاء)دا:** ئەم حەوت ناوونیشانانە دەبینرێن، کە ئێمە لە (**التفسير التطبيقي للكتاب القدس، العهد القديم، سفر إمياء**)دا دەیانهێنین و لاپەڕەکانی (**التفسير التطبيقي...**)یش دێنین:

١/ {**وَعْدُ الرَّبِّ بعِقَاب يَهُوذَا، الإصحاح: ١، ص ١٤٧٦**} واتە: بەڵێنی پەروەردگار بە سزادانی یەهووذا، یەهووذاش تیرەیەکن لە جوولەکەکان، یاخود مەبەست پێی کۆی بەنی ئیسرائیل بووە.

٢/ {**خِيَانَةُ بَنِي إِسْرَائِيل، الإصحاح: ٢، ص ١٤٧٨**} واتە: ناپاکیی بەنی ئیسرائیل.

٣/ {**عَوَاقِبُ ارْتِدَادِ بَنِي إِسْرَائِيل، الإصحاح٢، ص١٤٧٩**} واتە: سەرەنجامەکانی هەڵگەڕانەوەی بەنی ئیسرائیل.

٤/ {**الوَعْدُ بِمُعَاقَبَةِ بَنِي إِسْرَائِيْل، الإصحاح٢، ص١٤٧٩**} واتە: بەڵێندان بە سزادانی بەنی ئیسرائیل.

٥/ {**إِقْتِرَابُ مَوْعِدُ العِقَاب، الإصحاح ٢، ص١٤٨٠**} واتە: نیزیك بوونەوەی کاتی سزادان.

٦/ {**الحَضُّ عَلَى غَزْوِ يَهُوذَا، الإصحاح ٥، ص١٤٨٦**} واتە: هاندان بۆ داگیرکردنی یەهووذاو هێرشکردنە سەر یەهووذا، (واتە: جوولەکەکان).

٧/ {**إِنْقِضَاضُ الغُزَاةِ الْمُبَاغِت، الإصحاح ٦، ص١٤٨٩**، پەلاماردانی کت و پڕی جەنگاوەرەکان {بۆ سەر گەلی جوولەکە}.

(**ارمیاء**) بەحیساب یەکێك لە پێغەمبەرانی بەنی ئیسرائیل بووە، هەموو ئەو ناوونیشانانەی لە کتێبەکەی خۆیدا، هێناون، یانی: هەموویان ناوونیشانی قسەکانی (**إرمیاء**)ن، کە جوولەکەکانی ئاگادار کردوونەوە: ئێوە بە هۆی گوناهو تاوانەکانتانەوە، ئەی گەلی جوولەکە! بەڵاتان بەسەر دێ و خوا سزاتان دەدات.

**ب- لە کتێبی: (إشعياء)دا:** دووەم لەو سەرچاوانەی کە باسی ئەو لادانەی بەنی ئیسرائیل و تێکدان و خراپەکاریی کردنیان لە زەویدا و، بەڵا بەسەرهاتنیانی، کردوە، کتێبەکەی: (**إشعياء**)ە، کە بە پێی قسەی پەیمانی کۆن، ئەویش یەکێك بووە لە پێغەمبەرانی بەنی ئیسرائیل و، خوا کتێبێکیشی بەو داوە.

لـە (التفسـير التطبيقـي للكتـاب القـدس، العهـد القديـم، سـفر إشـعياء الإصحـاح: ٣، ص ١٣٨١)دا، لـە ژێـر ناوونیشـانی: (**عِقَـاب جَمِيـعِ الطَّبَقَـات**)دا، واتـە: سـزادانی تێکـڕای چینـەکان، ئەمـە هاتـوە:

**(هَـا هُـوَ الـرَّبّ القَدِيـر مُزمِـعٌ أَنْ يَقْطَـعَ عَـنْ أُورْشَـلِيم وَيَهـوُذَا الطَّعَـامَ وَالـشَّرَاب، وَيَقْـضِيَ فِيهَـا عَـلَى كُلّ بطَـلٍ وَمُحَـارِبٍ وَقَـاضٍ وَنَبـيٍّ وعـرَّافٍ، وَشَـيخٍ، وَعَـلَى كُلّ قَائِـدٍ وَمشـيرٍ وَصَانِـعٍ مَاهِـرٍ، وَسَـاحِرٍ بـارِعٍ، وَأَجْعَـلُ الصُّبيَـان رُؤَسَـاء لَهُـمْ، وَالأَطْفَـالَ حُكَّامَـاً عَلَيْهِـم).**

واتـە: ئـەوە پـەروەردگاری توانـا بڕیاریـداوە کـە لـە ئۆرشـەلیم و یەهـووذا (کـە هـەردووك دەوڵەتەکـەی جوولەکـەکان بـوون) خـواردن و خواردنـەوەو ئاویـان لـێ دەبـڕێ و، هەمـوو پاڵەوانێـکی جەنـگاوەر لـە بەیـن دەبـات، هەروەهـا هـەر قازییـەك (دادوەرێـك) و هـەر پێغەمبەرێـك کـە لەوێـدا هەیـەو، هـەر عەرڕافێـك (واتـە: ئەوانـەی کـە پێشـبینی شـتان دەکـەن) و، هـەر بـە تەمەنێـك و، هـەر سـەرکردەیەك و هـەر ڕاوێژکارێـك و، هـەر صەنعاتکارێـکی شـارەزا و، هـەر جادوو گەرێـکی کارامـە، هەمـوو ئەوانـە لـە بەیـن دەبـات و، وا دەکـەم کـە منـداڵ ببنـە سـەرۆکیان و، کـەم تەمەنـان ببنـە حوکمڕانیـان.

هەروەهـا لـە (**الإصحـاح**، ٥، ص ١٣٨٥)دا، لـە ژێـر ناوونیشـانی: (**قضـاء اللـه عـلى يهـوذا**)دا، واتـە: بڕیـاری خـوا بەسـەر یەهـووذا دا، هاتـوە:

**(..لِذَلِـكَ احْتَـدَمَ غَضَـبُ الـرَّبِّ ضِـدَّ شَـعْبهِ، فَمَـدَّ يَـدَهُ عَلَيْهِـم وَضَرَبَهُـم، فَيَرْفَـعُ رَايَـةً لأُمَـم بَعيـدَةٍ وَيُصْفِـرُ لِمَـنْ فِي أَطْـرَافِ الأَرْضِ، فيُقْبِلُـونَ مُسرِعِـيْنَ (إلى أُورشَـلِيم)، دُونَ أَنْ يَكِلّـوا أَو يَتَعَـثَّروا، أَو يَعْتَرِيهِـم نُعَـاسٌ أَو نَـوْمٌ...، سِـهَامُهُمْ مُسَـنَّنَة، وَقِسِـيُّهُم مَشْـدُودَة، حَوَافِـرُ خَيْلِهِـم كَأَنَّهَـا صَـوَّان، عَجَـلاَتُ مَرْكَبَاتِهِـم مُنْدَفِعَـة كَالإِعْصَـار، زَئِيرهُـمْ كَأَنَّـهُ زَئِـيرُ أَسَـدٍ يُزَمْجِـرُ، وَيَنْقَـضُّ عَـلَى فَرِيسَـتِهِ وَيَحْمِلُهَـا وَلَيْـسَ مِـنْ مُنْقِـذٍ).**

ئەویـش هـەر باسـی ئـەو مەسـەلەیە دەکات، دیـارە پێشـی چەنـد شـتێك بـاس دەکات، کـە بەنـو ئیسـرائیل تووشـی لادان و زوڵـم و سـتەم و خراپـە دێـن، دوایـی دەڵـێ: پـەروەردگار زۆر تـووڕە بـووە دژی گەلەکـەی، بۆیـە دەسـتی بـۆ درێژکـردن و لێـی دان، ئـاڵا بـەرز دەکاتـەوە بـۆ گەلانێـکی دوور و فیکەیـان بـۆ لێـدەدات کـە لـە هەمـوو شـوێنەکانی سـەر زەمینـەوە بێـن، زۆر بـە خێرایـی دێـن بـۆ ئۆرشـەلیم، بەبـێ ئـەوەی ماندووبـن، یـان هەڵبنگـون، یاخـود وەنـەوز بیانگـرێ، یاخـود خەویـان بـێ، نـووکی ڕمەکانیـان زۆر تیـژە، ژێـی کەوانەکانیـان زۆر تونـدە، سـمی ئەسـپەکانیان وەك بـەرد وایـە، تایـەی عارەبانەکانیـان وەك گەردەلـوول بـە خێرایـی دێ، نەڕەیـان وەك نـەڕەی شـێرێکە کـە بنەڕێنـێ و خـۆی بـە نێچیرەکـەی دا دەداو هەڵیدەگـرێ، هیـچ کەسـێکیش نیـە دەربـازی بـکات.

هەڵبەتـە خـوا ﷻ کـە دەفەرمـوێ: ﴿ فِي ٱلۡكِتَٰبِ ﴾ دەگونجـێ لـە تەوراتـدا بـێ و، دەشـگونجێ لـەو کتێبانـەی دیکـەدا بـێ، کـە نموونەمـان لێهێنانـەوە، هـەم لـە کتێبـی (**إرمیاء**)و، هـەم لـە کتێبـی (**إشـعیاء**)دا.

ئنجا: جێی سەرنجە، کە:

خـوای کارزان دوو وشـە بـاس دەکات: (**إفسـاد وعُلـوّ**) کە دەفەرمـوێ: ﴿ لَتُفۡسِدُنَّ فِي ٱلۡأَرۡضِ مَرَّتَيۡنِ وَلَتَعۡلُنَّ عُلُوّٗا كَبِيرٗا ﴾.

وشـەی (**إفسـاد**) واتـە: تێکـدان، وشـەی (**علـوّ**)ش واتـە: خـۆ بەرزکردنـەوەو هەیمەنەکـردن، کـەوا پێدەچـێ (**إفسـاد**) مەبەسـت پێـی تێکـدان بێـت لـە ڕووی کۆمەڵایەتییـەوە و، (**علوّ**)یـش باڵادەسـتیی وسـتەم و زۆر بـێ لـە ڕووی سیاسـییەوە، واتـە: هـەم لـەڕووی کۆمەڵایەتییـەوە، هـەم لـەڕووی سیاسـییەوە، بەنـو ئیسـرائیل لادەدەن و، تووشـی تـاوان و خراپەکاریـی دێـن، ئنجـا خـوا ﷻ سـزایان دەدات.

ئنجـا خـوا ﷻ باسـی ئـەو دوو تێکدانـە دەکات، کـە لەنێـو بەنـو ئیسـرائیل دا دەبـن، پاشـان ئـەو دوو سـزادانەی کـە بەرهەمـی ئـەو دوو تێکدانـەن:

٤)- دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا جَآءَ وَعۡدُ أُولَىٰهُمَا ﴾، هەر کاتێك بەڵێنی یەکەمیان هات، (**الوَعْدُ: مَصْدرٌ بِمَعْنَى المَفْعُولِ أَي: مَوعُود المَرَّتَيْنِ، أَي: الزَمَانِ المُقَدَّر لِحُصُولِ المَرَّةِ الأُولَى مِنَ الفَسَادِ وَالعُلُوّ**).

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَعۡدُ أُولَىٰهُمَا ﴾، (**وَعـد**) لێـرەدا بـە مانـای (**مفعـول**)ە، واتـە: (**موعـود**) واتـە: بەڵێـن لەسـەردراو، کـە مەبەسـت پێـی ئـەو کاتەیـە، کـە دیاریـی کـراوە لـە جـاری یەکەمـدا، بـۆ خراپەکاریـی و خـۆ بەرزکردنـەوەی بەنـو ئیسـرائیل، کـە پاڵدراوەتـە لای (**أُولاهُما**) بـۆ ڕوونکردنـەوە، پاڵدراوەتـە لای، واتـە: (**المَوعـود الَّـذِي هُـوَ أُولَى المَرَّتَـيْن مِـنَ الفَسَـادِ والعُلـو**)، ئـەو بەڵێنـەی کـە یەکەمجـارە لـە خراپەکاریـی و خـۆ بـە بـەرز زانینـی بەنـی ئیسـرائیل، هـەر کاتێـك ئـەوە هـات، جـاری یەکـەم سـتەمیان کـردو خۆیـان فـەڕز کـرد:

٥)- ﴿ بَعَثۡنَا عَلَيۡكُمۡ ﴾، دەنێرینە سەرتان، دەڵێ: (**البَعْثُ: الإِرْسَال مُسْتَعْمَلٌ فِي تَكْوِين السَّيْرِ إِلى أَرْض إِسْرَائِيل، وتَعْدِيَةُ (بَعَثْنَا) بحَرْفِ (عَلَى) لِتَضْمِينِهِ مَعْنَى التَّسْلِيط**).

﴿ بَعَثۡنَا عَلَيۡكُمۡ ﴾ واتـە: دەنێرینـە سـەرتان، (**بَعَـثْ**) بریتیـە لـە نـاردن، بـەڵام لێـرەدا مەبەسـت پێـی ناردنی (**تکوینی**)یـە، نـاردنی قەدەریـی خـوای پـەروەردگارە، وشـەی (**بَعَثْنَا**)ش کـە بە

(عَلَى) گواستوویەتەوە بۆ بەرکار (**مَفْعُولٌ بِهِ**)، بۆ ئەوەیە کە مانای دەست بەسەرداگرتن و خستنە ژێر ڕکێف بگرێتە نێو خۆی.

ئنجا ئایا خوا کێیان بۆ دەنێرێ؟

٦)- ﴿عِبَادًا لَّنَآ﴾، چەند بەندەیەکی خۆمان، کە دەفەرموێ: (**عِباداً** لنا)، چەمکە گشتییەکەی مەبەستە (بەندەکانمان)، چونکە هەموو مرۆڤەکان بەندەی خوان، (**العِبَاد: أَي: المَمْلُوكُون، وهَؤلاءِ العِبَادُ المخلوقون: الآشُورِيون أَهْل بابل جُنُود بُخْتَنَّصر**)، مەبەست پێیان ئەو بەندانەن کە خوا خوڵقاندوونی، واتە: بەندەی دروستکراوی خوان {نەك ئەو بەندانەی کە بەندایەتیی بۆ خوا ئەنجام دەدەن} کە مەبەست: ئاشوورییەکانی خەڵکی بابلن، سەربازەکانی (**بختنصر**).

توێژەرانی قورئان لەو بارەوە، زۆر کێشەو مشتومڕیان بووە، ئایا دەبێ ئەوانە کێ بن، ئەو بەندانەی کە خوا دەیاننێرێ؟ بەڵام لە مێژوودا دەرنەکەوتووە کە کۆمەڵێك خەڵکی خواپەرست و پابەند بە شەریعەت و بەندایەتییکەر بۆ خوا، ئەوەیان کردبێ، بەڵکو ئەوانەی ئەوکارەیان کردوە دژی بەنی ئیسرائیل، ئەوەیان ئەنجامداوە: ئاشوورییەکانی خەڵکی بابل بوون، سەربازەکانی بوختەنەصر بوون، کە هاوبەش بۆ خوادانەرو کافر بوون، کەواتە: مەبەست لە بەندەکانمان (**عباداً لنا**) یانی: ئەوانەی خۆمان دروستمان کردوون، بەندە دروستکراوەکانمان(عبادنا المخلوقين لنا).

ئنجا ئایا ئەو بەندانە، سیفەتیان چۆنە کە خوا دەیاننێرێ بۆ بەنی ئیسرائیل، کە یەکەم جار تێکدان و خراپەکاریی دەکەن لە زەویداو ستەم و خۆ فەرز کردن ئەنجام دەدەن:

٧)- ﴿أُوْلِي بَأْسٍ شَدِيدٍ﴾، (**أُولِي**) واتە: (**أَصْحَاب**)، (**بَأْس**) واتە: سەختیی و توندیی لە جەنگدا، (**شَدِيد**)یش هەر واتە: سەختیی، (**البَأْسُ: الشَّوْكَةُ والشِّدَّةُ فِي الحَرْبِ**)، واتە: خاوەن زەبردەستیی و هێزو پێزێکی زۆری جەنگاوەریین.

٨)- ﴿فَجَاسُواْ خِلَٰلَ ٱلدِّيَارِ﴾، (**أَي: تَخَلَّلُوهَا فَطَلَبُوا مَا فِيهَا، كَمَا يَجُوس الرَّجُلُ أَخْبَارَ مَنْ يَطْلُبُهَا**)، واتە: بە نێو کون و کەلێن و قوژبنی ماڵەکاندا گەڕان و هاتن و چوون و، بەدوای ئەوەدا گەڕان کە تێیدایە وەك چۆن پیاوێك سۆراغی بابایەك دەکات کە بەدوایدا دەگەڕێ، یانی: چوونە ماڵەکانەوە بۆ پشکنین و سۆراغ کردنی گەلی بەنی ئیسرائیل کە بیانگرن و بیانکوژن و سزایان بدەن.

(**الخِلَال: إِسْمٌ جَاءَ عَلَى وزْن الجُمُوعِ، ولاَ مُفْرَدَ لَهُ، وهُوَ وَسَطُ الشَّيءِ الَّذِي يَتَخَلَّلُ مِنْهُ:** ﴿فَتَرَى ٱلْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلَٰلِهِۦ ﴿٤٣﴾﴾النور.

واتە: (خِلاَل) ناوی کۆیە و، تاکی نیە لە خۆی، واتە: نێوەڕاستی شتێك، نێوەڕاستی ئەو شتەی کە دەچێتە نێوی، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ فَتَرَى ٱلْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلَٰلِهِۦ ﴾، باسی هەڵم دەکات کە لەسەر دەریاکان هەڵدەستێ، تیشکی خۆر لێی دەدات و هەڵم هەڵدەستێ و بایەکان دەیهێنن، دوایی دەبێتە هەورو موتوربە دەبێ، دوایی دەفەرموێ: ﴿ فَتَرَى ٱلْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلَٰلِهِۦ ﴾، (الـوَدْق) واتە: (المطر)، واتە: باران دەبینی دێتە دەر لە نێو ئەو هەورە، واتە: لەمیانی ئەو هەورە دێتە دەر، کەواتە: (خلال) واتە: میان.

﴿ فَجَاسُواْ خِلَٰلَ ٱلدِّيَارِ ﴾، واتە: بەمیان ماڵەکان و خانووەکاندا دێن و دەچن و سۆراغ دەکەن و دەپشکنن.

(الدِّيَار: التَعْرِيفُ للعَهْد: أَي: دِيَارِكُمْ) (الدِّيار)یش کە ئەلیف و لامی تەعریفی لەسەرە، ناساندنەکەی بۆ عەهدە، واتە: (فَجَاسوا خِلاَلَ دِيَارِكُمْ)، یانی: بەدواتاندا دەگەڕێن و سۆراغتان دەکەن لە کەلێن و کونی ماڵ و خانووەکانتاندا.

٩)- ﴿ وَكَانَ وَعْدًا مَّفْعُولًا ﴾، ئەو بەڵێنەش بڕیارێکی جێبەجێ کراوە، واتە: دێتە دی و جێی مشتومڕ نیە.

دوایی باسی دەکەین: کە ئەوە چۆنە و، لەبەرچی وایە؟

١٠)- ﴿ ثُمَّ رَدَدْنَا لَكُمُ ٱلْكَرَّةَ عَلَيْهِمْ ﴾، دوایی نۆرەی زاڵ بوونمان بۆ ئێوە گێڕایەوە، (كَرَّة) واتە: جار، (الكَرَّةُ: الرَّجْعَةُ إِلى المَكَانِ الَّذِي ذَهَبَ مِنْهُ)، گەڕانەوە بۆ ئەو شوێنەی کە لێی ڕۆیشتوە.

کەواتە: (رَدَدْنَا لَكُمُ الكَرَّة)، واتە: (أَرْجَعْنَا لَكُمُ الرَّجْعَةَ، أَعَدْنَا لَكُمُ الرَّجْعَةَ عَلَيْهِم)، واتە: نۆرە زاڵ بوونمان بۆ ئێوە گێڕایەوە.

(ثُمَّ: تُفِيدُ التَّرَاخِي الرتْبِي وَالزَّمَنِي مَعَاً)، (ثم) لێرەدا بەدوادا هاتنی پلەیی و کاتیی وێکڕا دەگەیەنێ، واتە: دوای ئەوەی کە ئێوە بە دەستی ئەوان شکست دەخۆن و، خوا ئەوانە دەنێرێتە گیانتان و، تەمبێتان دەکەن و، بەو شێوەیە کەلێن و کونی ماڵەکانتان لێ دەپشکنن، بۆ ئەوەی بتانگرن و بتانکوژن، دوایی بارودۆخەکە دەگۆڕێ و، ئنجا نۆرەی زاڵ بوون بۆ ئێوە دەگێڕینەوە و ئێوە بەسەر ئەو دوژمنانەتاندا زاڵ دەبن.

چۆنیەتی ئەو زاڵ بوونەش لە تەفسیرەکاندا باسکراوە، بۆ وێنە: (التحريرو التنوير)ی (محمد الطاهر بن عاشور)[1] دەڵێ:

---

(١) ج١٥ ص ٣٢.

(وَذَلِكَ بَعْدَ أَن قَضَى بنو إسرائيل نيّفاً وَأَرْبَعِينَ سَنَةً فِي أَسْرِ البَابليين، وَتَابُوا إلى اللَّهِ وَندمُوا عَلَى مَا فَرَطَ مِنْهُمْ، سَلَّط اللَّه مُلُوكَ فَارِس عَلَى مُلُوك بابل الأَشُوريين، فَإِنَّ الملك «كُورش» ملك فَارِس حَارَب البَابليين وَهَزَمهم، فَضَعُفَ سُلْطَانُهُم، ثُمَّ نَزَلَ بِهِم «دَاريوس» ملك فارس، وَفَتَحَ بَابل سَنَة (٥٣٨) قَبْلَ الميلاد، وَأَذِنَ لليَهُود فِي سَنَة (٥٣٠) قَبْلَ الميلاَد، أَن يَرجعُوا إلى أُورشَلِم وَيجدِّدوا دَوْلَتَهُم، وَذَلِكَ نَصْرُ انْتَصَرُوهُ عَلَى البَابليين، إِذْ كَانُوا أَعْوَاناً للفُرْسِ عَلَيْهِم).

واتە: دوای ئەوەی {بەنو ئیسرائیل جاری یەکەم تێکدەشکێن، بە دیل دەگیرێن} چل و ئەوەندە ساڵە بە دیلەتیی لەلای بابلییەکان بەسەر دەبەن، بۆ لای خوا دەگەڕێنەوەو پەشیمان دەبنەوە لەوەی کە کردوویانە، دوای ئەوە خوا پادشاکانی فارس بەسەر پادشاکانی بابل و ئاشوورییەکاندا زاڵ دەکات و، پادشا کۆرش کە پادشای فارس بووە، جەنگ لە دژی بابلییەکان دەکات و تێکیان دەشکێنێ و بابلییەکان بێ دەسەڵات دەبن، دوایی داریوس پادشای فارس لەدوای کۆرش جارێکی دیکە شەڕیان لەگەڵ دەکات و لەساڵی (٥٣٨) پێش زاییندا، بەسەریاندا زاڵ دەبێ و، مۆڵەت دەدات بە جوولەکەکان لە ساڵی (٥٣٠) پێش زاییندا، بگەڕێنەوە بۆ ئۆرشەلیم و دەوڵەتەکەیان تازە بکەنەوە، ئەوەش سەرکەوتنێکی بەنو ئیسرائیل بووە بەسەر بابلییەکاندا، چونکە بەنو ئیسرائیل هاوکار و هاوپەیمان بوون لەگەڵ فارسەکان دا، لە دژی بابلییەکان.

**هەواڵی تێکشکانی بابلییەکان لە پەیمانی کۆندا، لە دوو شوێندا هاتوە:**

**١-** لە (**سفر**)ی (**إشعياء**)دا هاتوە، کە یەکێك بووە لە پێغەمبەرانی بەنو ئیسرائیل، هەر بە ناوونیشانی (**خَبَرُ انْهِزَامِ البَابليين**)[1]، هەمووی باسی ئەوە کراوە کە چۆن بابلییەکان تێکدەشکێن، پێغەمبەرەکەیان پێشتر ئاگاداریان دەکاتەوە، کە تێکدەشکێن، بێگومان خوای زاناوتوانا پێی ڕاگەیاندوە.

**٢** - هەروەها لە (سفر)ی (إرمیاء)[2]دا، ئەمە هاتوە: (**هَذَا مَا يُعْلِنه الرَّبّ القَدِيرُ، إلَه إِسْرَائِيل لِكُلّ المَسْبِيِّن الَّذِينَ أَجْلَيتهُم مِنْ أورشليم إلى بابل، أبنوا بيوتاً، وأقيموا فيها وَاغْرِسوا البساتين، وكَلُوا من نتاجها، تزوَّجُوا وأَنْجِبوا بنين وبنات، واتخذوا نساءً لأبنائكم وزوِّجوا بناتكم، وليَلِدْنَ أبناءً وبناتٍ، وتكاثروا هناك ولا تتناقصوا، ولكن بعد انقِضَاءِ سَبْعينَ سَنَة عليكم في بابل، ألتفت إليكم، وأفِي لكم بوعودي الصالحة بِرَدِّكم إلى هذا المَوضِع**).

واتە: ئەمە ئەوەیە کە پەروەردگاری توانا ڕایدەگەیەنێ، پەرستراوی ئیسرائیل، بۆ هەموو ئەوانەی کە بە دیل گیراون لە ئۆرشەلیم و، دوورخراونەوە بۆ بابل، پێیان ڕادەگەیەنێ

---

(١) الإصحاح: ١٠، ص ١٣٩٢ -١٣٩٥، الإصحاح: ١١و١٢و ١٣و ١٤، ص ١٣٩٦ -١٤٠٠.
(٢) الإصحاح: ٢٩، ص ١٥٢٦.

کە خانووان بۆ خۆتان دروست بکەن و، تێیاندا نیشتەجێ بن و، کشتوکاڵ بکەن و، لە بەروبوومی کشتوکاڵ و باغەکانتان بخۆن و، هاوسەرگیریی بکەن و با کوڕان و کچانتان پەیدابن، هەروەها ژن بۆ کوڕەکانتان بێنن و، کچەکانتان بە شوو بدەن و، با ئەوانیش کوڕیان بێن و کچیان بێن، زۆربن و کەم مەبن، پاشان دوای تێپەڕینی حەفتا (٧٠) ساڵ بەسەرتاندا لە بابل، ئاوڕتان لێ دەدەمەوەو، بەڵێنە چاکەکانی خۆمتان بۆ دێنمە دی، کە بتانگێڕمەوە بۆ ئەو شوێنە،{واتە: شوێنی خۆتان لە فەڵەستین}.

ئەمە ڕوونکردنەوەی واتاو چەمکی ئەوەیە کە دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ رَدَدْنَا لَكُمُ الْكَرَّةَ عَلَيْهِمْ ﴾، بەو شێوەیە ئێمە مێژوو هاوکارمان دەبێ و، هەندێك شوێنی (پەیمانی کۆن) یش بەرچاو ڕوونییمان دەداتێ، بۆ زیاتر تێگەیشتن لە چەمك و واتای ئەم ئایەتە بە پێزە، هەرچەندە هەواڵی یەقین و جێی دڵنیایی و پشتپێ بەستنی تەواو، تەنیا لەوەحی پارێزراوی خوا دایە، بەڵام پەیمانی کۆنیش وەك سەرچاوەیەکی مێژوویی، دەگونجێ سوودی لێ ببینین و، بەرچاو ڕوونییمان بداتێ بۆ زیاتر تێگەیشتن لە چەمك و واتای هەندێك لەو ئایەتانەی کە پەیوەستن بە هەندێك ڕووداوی مێژووییەوە.

١١)- ﴿ وَأَمْدَدْنَاكُم بِأَمْوَالٍ وَبَنِينَ ﴾، واتە: هاوکاریی ئێوەمان کرد بە سامان و بە کوڕان، وەك پێشتر باسمان کرد و (الإصحاح)ی (٢٩) لە (سفر)ی (إرمياء) بۆی ڕوون کردینەوە.

١٢)- ﴿ وَجَعَلْنَاكُمْ أَكْثَرَ نَفِيرًا ﴾، هەروەها ژمارەی سەربازانی ئێوەمان زۆر کرد، ژمارەی کەسانی ئێوەمان زۆر کرد، (**نَفِير: تَمييزٌ لـ(أَكْثَرَ)، فَهُوَ تَبيينٌ لِجِهَةِ الأَكْثَرِيَةِ، وَالنَّفِيرُ اسْمُ جَمْعٍ، للجَمَاعَةِ الَّتِي تَنْفِرُ مَعَ المَرْءِ من قَوْمِهِ وَعَشِيرَتِهِ، مِنْهُ قَوْلُ أَبِي جَهْلٍ: لاَ فِي العِيْرِ وَلاَ فِي النَّفِيرِ**)، واتە: (نفير) (تمييز)ە بۆ (**أكثر**) و ڕوونکردنەوەیە بۆ لایەنی زۆرییەکە، هەروەها (**نفير**) ناوی کۆیە بۆ کۆمەڵێك، کە لەگەڵ مرۆڤە، لە خزمەکانی و هۆزەکەی خۆی و لە دەوروبەریی کە ڕادەکەن بەرەو دوژمن {واتە: (**نفير**) ناوی کۆیە بۆ کۆمەڵە خەڵکێك کە لەفریای ئینسان دێن لە کاتێکدا کە لەگەڵ دوژمنیدا ڕووبەڕوو دەبێتەوە}، وەك ئەبو جەهل کاتێك لە مەککەوە دێ بۆ دەرباز کردنی کاروانەکەی ئەبوو سوفیان ئەو قسەیە، وەك پەندێك دەڵێ: (**لاَ فِي العِيْرِ وَلاَ فِي النَّفِيرِ**)، کە بە نسبەت هەندێك لە قورەیشییەکانەوە گوتوویەتی، واتە: نە لەگەڵ کاروان دان و نە لەگەڵ سوپادان، (نفير) واتە: ئەو سوپایەی هاتوە بۆ دەربازکردنی کاروان.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ وَجَعَلْنَاكُمْ أَكْثَرَ نَفِيرًا ﴾، دەڵێ: (**التَّفْضِيلُ فِي أَكْثَر، التَّفْضِيل عَلَى أَنْفُسِهِم، أَي: جَعَلْنَاكُمْ أَكْثَرَ مِمَّا كُنْتُمْ قَبْلَ الجلاَءِ، وَهُوَ المُنَاسِبُ لِمَقَامِ الإِمْتِنَانِ**).

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَجَعَلْنَٰكُمْ أَكْثَرَ نَفِيرًا ﴾، ئێوەمـان زۆر کـرد، جەنگاوەرەکانـی ئێوەمـان زۆرتـر کـرد، واتـە: بـە نسـبەت خۆتانـەوە، پێـش ئـەوەی، دەربکرێـن کـەم بـوون، بـەڵام ئێسـتا زۆرترمـان کـردوون، دەشـگونجێ: ﴿ وَجَعَلْنَٰكُمْ أَكْثَرَ نَفِيرًا ﴾، (أَي: مِـنْ أَعْدَائِكُمُ الَّذِيـنَ أَخْرَجُوكُم مِـنْ دِيَارِكُمْ، أَي: أُفْنِـي مُعْظَـمَ البَابِلِيين فِي الحُـرُوبِ مَـعَ الفُـرْس، حَتَّـى صَارَ عَـدَد بَنـي إِسْرَائِيـلَ فِي بِـلاَدِ الأَسْرِ، أَكْـثَرَ مِـنْ عَـدَدِ البَابلِيـين)، واتـە: ژمـارەی جەنـگاوەرەکانی ئێـوە زۆرتـر دەکەیـن لـە دوژمنەکانتـان کـە بابلییەکانـن، چونکـە بابلییـەکان لـەو جەنگانـەی کـە لەگـەڵ فارسـەکاندا کردیانـن، زۆریـان فەوتـان، هەتـا وای لێهـات کـە بەنـو ئیسـرائیل کـە ژێـر دەسـتی بابلییـەکان بـوون، ژمارەیـان زۆرتـر بـوو لـە خەڵکـە ئەصڵییەکـەی کـە کاتی خـۆی بـە دیلیـان گرتبـوون.

١٣)- ﴿ إِنْ أَحْسَنتُمْ أَحْسَنتُمْ لِأَنفُسِكُمْ ﴾، ئەگەر چاکە بکەن، بە قازانجی خۆتان چاکە دەکەن، ﴿ وَإِنْ أَسَأْتُمْ فَلَهَا ﴾، ئەگەر خراپەش بکەن، خراپەکەش بەس بۆ خۆتان دەکەن.

تەعبیـرەی: ﴿ إِنْ أَحْسَنتُمْ أَحْسَنتُمْ لِأَنفُسِكُمْ ﴾، وەك ئـەو تەعبیـرەی دیکـەی قورئـان وایـە، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَإِذَا بَطَشْتُم بَطَشْتُمْ جَبَّارِينَ ﴿١٣٠﴾ ﴾الشـعراء، واتـە: هـەر کاتێـك سـزای خەڵـك دەدەن، سـزایان دەدەن بـە زۆردارانـە و ملهوڕانـە.

یـان ئـەو تەعبیـرەی دەفەرمـوێ: ﴿ وَإِذَا مَرُّوا بِاللَّغْوِ مَرُّوا كِرَامًا ﴿٧٢﴾ ﴾الفرقـان، واتـە: کاتێـك بـە لای قسـە و کـرداری پـووچ دا تـێ دەپـەڕن، بەڕێـزەوە تێدەپـەڕن.

ئەمانـە کـە خـوای زانـاو شـارەزا دوو جـاری دووبـارە کردوونەتـەوە، مەبەسـت پێیـان گرنگیـی پێـدانی ئـەو کردارەیـە کـە بـاسی کـراوە.

١٤)- ﴿ وَإِنْ أَسَأْتُمْ فَلَهَا ﴾، دەڵێ: (**فَلَهَا: مُتَعَلِّقٌ بِفِعْلٍ مَحْذُوفٍ تَقْدِيرُهُ: أَسَأْتُمْ لَهَا**)، ئەگەر خراپەشتان کرد، خراپەتان بۆ نەفسەکانی خۆتان کرد.

لـە سـوورەتی (**فصلـت**)دا، ئـەم تەعبیـرە بـە شـێوەیەکی دیکـە هاتـوە، دەفەرمـوێ: ﴿ مَّنْ عَمِلَ صَٰلِحًا فَلِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَنْ أَسَآءَ فَعَلَيْهَا ﴿٤٦﴾ ﴾، واتـە: هـەر کەسـێك چاکـە بـکات، سـوودەکەی بـۆ خۆیـەتی و، هـەر کەسـێك خراپـەش بـکات، زیانەکـەی لەسـەر خۆیـەتی، (أَي: النَّفْـعُ لَهَـا وَالـضَّرَرُ عَلَيْهَـا، لِكَـن آيَـةَ الإِسْرَاءِ يُقْصَـدُ بِهَـا إِخْتِصَـاصُ النَّفْـسِ بِعَمَلِهَـا خَـيْرًا أَو شَرًّا)، لـە سـوورەتی (فصلـت)دا، بـاسی ئـەوە دەکات، کـە کـردەوەی چـاك سـوودی هەیـە بـۆ خاوەنەکـەی و، خراپـەش زیـانی هەیـە بـۆ خاوەنەکـەی، بـەڵام ئەمـەی سـوورەتی (**الإسراء**) مەبەسـت پێـی ئەوەیـە، کـە نەفسـی

مرۆڤ چاكە بكات، یان خراپە بكات، تایبەت دەبێ بە خۆیەوە، مەبەست پێی زیان و قازانج نیە، بەڵكو مەبەست پێی تایبەتمەندبوونی مرۆڤە بە كردەوەكەیەوە.

وەك (**محمد حسين طباطبائي**) لە تەفسیرەكەیدا[1]، دەڵێ: (فَالْمَقَامُ مَقَامُ بَيَانِ: أَنْ أَثَرَ العَمَلِ لِصَاحِبِهِ، خَيْراً كَانَ أَو شَرّاً، وَلَيْسَ مَقَامَ بَيَانِ: أَنَّ الإِحْسَانَ يَنْفَعُ صَاحِبَهُ، والإِسَاءَةُ تَضرُّهُ، حَتَّى يُقَالَ: ﴿وَمَنْ أَسَآءَ فَعَلَيْهَا﴾ كَمَا فِي البَقَرَةِ: ﴿لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا ٱكْتَسَبَتْ ﴿٢٨٦﴾﴾).

واتە: ئەو حاڵەتەی ئێرە، مەبەست پێی ڕوونكردنەوەی شوێنەواری كردارە بۆ خاوەنەكەی، ئنجا چاك بێ، یان خراپ و، مەبەست پێی ئەوە نیە كە چاكە سوودی هەیە بۆ خاوەنی و خراپەش زیانی پێ دەگەیەنێ، تاكو وەك لە شوێنی دیكەدا هاتوە، فەرمووبای: ﴿وَمَنْ أَسَآءَ فَعَلَيْهَا﴾ فصلت، یان وەك لە سوورەتی (**البقرة**)دا هاتوە، كە دەفەرموێ: ﴿لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا ٱكْتَسَبَتْ ...﴿٢٨٦﴾﴾، واتە: هەر كەسێك چاكە بكات، سوودەكەی بۆ خۆیەتی و، خراپەش بكات، زیانەكەی لەسەر خۆیەتی.

دیارە تاكو ئێرە هەر باسی تێكدان و خراپەكاری یەكەمە و، سزادانی خوایە ﷻ بۆ ئەو خراپەكاریی و تێكدانە كە بەسەر بەنی ئیسرائیلیدا دێنێ.

١٥)- ﴿فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ ٱلْأٓخِرَةِ﴾، ئنجا هەركات بەڵێنی جارەكەی دیكە هات، واتە: جاری دووەم، (أَي: وَعْدُ المَرَّةِ الآخِرَةِ، أَي: المَرَّةِ الثَّانِيَةِ)، واتە: بەڵێنی كاتی كەڕەتی دوایی، یانی جاری دووەم، (**فَالآخِرَةُ صِفَةٌ لموصوفٍ محذوف وهو: المرة، أي المرة الثانية**) وشەی (الآخرة) سیفەتی وەسفكراوێكی قرتێنراوە، كە بریتیە لە (كەڕەت) یانی: كەڕەتی دووەم.

١٦)- ﴿لِيَسُـٔوا۟ وُجُوهَكُمْ﴾، بۆ ئەوەی ڕووتان خراپ و تاڵخ، ڕووتان ناشیرین بكەن، واتە: كاتێك كە بەڵێنی كەڕەتی دووەم هات، كە ئێوە بۆ جاری دووەم خراپەكاریی دەكەن لە زەویدا و خۆتان فەرز دەكەن و ستەمكاریی دەكەن، ﴿لِيَسُـٔوا۟ وُجُوهَكُمْ﴾، بە سیاق و سەلیقە دەزانرێ، كە ئەمە دەرەنجامە، چونكە (ل)ی ﴿لِيَسُـٔوا۟ وُجُوهَكُمْ﴾ (**لام العلة**)یە، واتە: كۆمەڵێك بەندەی خۆمان كە خاوەنی زەبرو زەنگن، خاوەنی زەبر دەستیین، دەنێرینە سەرتان بۆ تەمبێ كردنتان لەسەر ئەو خراپەكارییە، كە لە ئەنجامدا دەم و چاوتان تاڵخ و ناشیرین ببێ.

ئەم ڕستەیە، ئاواش: (**لِيَسوءَ وجوهَكُم**)یش خوێنراوەتەوە، واتە: بۆ ئەوەی (خوا) دەم و چاوتان خراپ بكات، كە ڕاناوەكەی دەچێتەوە بۆ خوا عزوجل.

---

(١) تفسير الميزان: ج١٣، ص٤١.

هەروەها خوێنراویشەتەوە: (**لِنَسُوءَ وجُوهَكُم**) واتە: تاكو ڕووتان خراپ بكەین.

بەڵام خوێندنەوەی یەكەم، ڕاناوەكەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو جەنگاوەرانەی كە خوا دەیاننێرێتە سەریان، ﴿لِيَسُـٔوا۟ وُجُوهَكُمْ﴾، واتە: بۆ ئەوەی ئەوان كارێكتان بەسەر بێنن و، بەڵایەكتان تووش بكەن، كە شوێنەواری خراپی لە دەم و چاوتان دا دەربكەوێ.

(**سُوءُ الوُجُوه: جَعْلُ المَسَاءَةِ عَلَيْهَا، أَي: تَسْلِيطُ أَسْبَابِ الكَآبَةِ وَالمَسَاءَةِ عَلَيْكُمْ، حَتَّى تَبْدُوا عَلَى وجُوهِكُمْ لأَنَّ مَا فِي القَلْبِ يَظْهَرُ عَلَى الوجه**)، واتە: (**سُوء الوُجُوه**) ئەوەیە كە خراپە بخرێتە سەر دەم و چاو، ئەویش بە هۆی زاڵكردنی هۆیەكانی خەفەتباریی و مەینەتییە بەسەرتان دا، چونكە ئەوەی لە دڵ و دەروونـدا هەبێ لەسەر دەم و چاو دەردەكەوێ.

كەسێك كە تێكبشكێ و ماڵوێران بێ و، بە دیل بگیرێ و، خزمی بكوژرێ، بێگومان ئەو ناڕەحەتیی و گرفتارییانە كە دەچنە نێو دڵییەوەو، لە دەروونیدا تاڵاییەكانیان دەچێژێ، شوێنەواریان بە شێوەی تڵخیی و دەم و چاو گۆڕان و مۆن و مرچ بوون، لەسەر دەم و چاوی دەردەكەون.

١٧)- ﴿وَلِيَدْخُلُوا۟ ٱلْمَسْجِدَ﴾، هەروەها بۆ ئەوەی بچنە نێو مزگەوتەكەوە، واتە: ئەو جەنگاوەرانەی كە دەیاننێرینە سەرتان بۆ تەمبێ كردنتان، بچنە نێو پەرستگاكەشتانەوە.

١٨)- ﴿كَمَا دَخَلُوهُ أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾، وەك چۆن یەكەم جاریش چوو بوونە نێوی و پەرستگاكەتانیان لێ تێكداون، جاری دووەمیش بە هەمان شێوە، (**تَشْبِيهٌ بالدُّخُولِ الأَوَّلِ وَهُوَ الغَزُو:** ﴿فَجَاسُوا۟ خِلَـٰلَ ٱلدِّيَارِ﴾)، ئەمە وێچواندنە بە چوونە نێوی یەكەم، كە مەبەست پێی یەكەم جارە كە بە نێو ماڵەكانیاندا دەهاتن و دەچوون و لێیان دەگەڕان و سۆراغیان دەكردن، بۆ ئەوەی بیانگرن و بیانكوژن، واتە: جاری دووەمیش هەر بە مەرەدی جاری یەكەمتان دەبەین.

١٩)- ﴿وَلِيُتَبِّرُوا۟ مَا عَلَوْا۟ تَتْبِيرًا﴾، هەروەها تاكو ئەو سەربازە جەنگاوەرانە، ئەو بەندانەی خوا، كە دەیانكاتە هۆكارێك بۆ تەمبێ كردن و لووت شكاندنی ئێوە، ئەی جوولەكەكان! هەرچی كە ئێوە بە ملهووڕیی و خۆ فەرز كردن و زاڵ بوون بنیاتتان ناوە، هەمووی تەخت بكەن و بیڕووخێنن.

(**التَّتْبِيرُ: الإِهْلاَكُ وَالإِفْسَاد**) مەبەست لە (**تَتْبِير**) تێكدان و فەوتاندنە.

(**مَا عَلَوا**):

ئەم ڕستەیە دەگونجێ سێ مانای هەبن:

**أ** - (مَا: مَوْصُولَةٌ، وهيَ مَفْعُولُ (يتبّروا)، ﴿وَلِيُتَبِّرُوا۟ مَا عَلَوْا۟ تَتْبِيرًا﴾، وعَائِدُ الصِّلَةِ مَحْذُوفٌ لأنَّهُ مُتّصِلٌ مَنْصُوبٌ، والتَّقْدِيرُ: مَا عَلَوْهُ)، واته: ئەو سەربازانە دەنێرین بۆ ئەوەی هەرچی کە جوولەکەکان کردبوویان بە مایەی خۆ زاڵکردن و خۆ فەڕز کردن بەسەر وڵاتدا، هەموو ئەوە تێکبدەن.

(وَالعُلُوُّ: عُلُوٌّ مَجَازِيٌّ، وهُوَ الإسْتِيلاَءُ وَالغَلَبُ)، (علوّ) مەبەست پێی بەرزییە، بەڵام لێرەدا مانای مەجازیی هەیە، واتە: دەستەڵات بەسەرداراتان و زاڵبوون، یانی: ئەو بەندە بەهێزانەی خوا، سەرجەم خۆ فەڕز کردن و ملهووڕیی و هەیمەنەی جوولەکەکان تەخت بکەن و نەیهێڵن.

**ب** - واتایەکی دیکەی ئەوەیە کە: (ما) لە: ﴿مَا عَلَوْا۟﴾، دەبێتە (ما المَصْدَرِيَّة) واتە: (عُلُوّهُم) یانی: زاڵبوون و حوکمڕانییەکەیان لێ وێران بکەن.

**ج** - مانایەکی دیکەی ڕستەی: ﴿وَلِيُتَبِّرُوا۟ مَا عَلَوْا۟ تَتْبِيرًا﴾، یانی: لەماوەی زاڵبوونیان بەسەرتان دا، هەر خەریکی تێکدان و تەختکردن و لەبەین بردنی خۆتان و، شارو وڵاتتان بن.

ئێمە دوایی لە باسێکی سەربەخۆدا، تیشکی زیاتر دەخەینە سەر ئەم بابەتە.

مەسەلەی چوارەم:

**خـوا بـە بەنـی ئیسـرائیلی ڕاگەیانـدوە: نیزیکـە خـوا بەزەییتـان لەگـەڵ بنوێنـێ، بـەڵام ئەگـەر بگەڕێنـەوە بـۆ سـتەم و خراپەکاریـی، ئێمـەش دەگەڕێینـەوە سـەر سـزادانتان و، دۆزەخیـش حەپسـخانەی کافرانـە:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يَرْحَمَكُمْ ۚ وَإِنْ عُدتُّمْ عُدْنَا ۘ وَجَعَلْنَا جَهَنَّمَ لِلْكَافِرِينَ حَصِيرًا ﴿٨﴾﴾:

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە. لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يَرْحَمَكُمْ﴾، نیزیکە خوا بەزەییتان لەگەڵ بنوێنێ.

بـەڵام ئایـا بەزەیـی خـوا لـە کـێ نیزیکـە؟ بێگومـان لـە چاکـەکاران، وەك لـە ئایـەتی (٥٦)ی سـوورەتی (الأعـراف)دا دەفەرمـوێ: ﴿إِنَّ رَحْمَتَ اللَّهِ قَرِيبٌ مِّنَ الْمُحْسِنِينَ﴾، واتـە: بێگومـان بەزەیـی خـوا لـە چاکەکارانـەوە نیزیکـە، واتـە: ڕەنگـەو نیزیکـە، بـە هـۆی ئـەوەوە کـە ئێـوە واز لـە خراپـەکاری دەهێنـن و دەبنـە چاکـەکار و، واز لـە خـۆ فـەڕز کـردن و سـتەم و زۆر، دێنـن و، تەبـا دەبـن لەگـەڵ خەڵـك، لەوانەیـەو نزیکـە بەهـۆی ئـەوەوە، پەروەردگارتـان بەزەییتـان لەگـەڵ بنوێنـێ.

٢)- ﴿وَإِنْ عُدتُّمْ عُدْنَا﴾، بەڵام هەرکات گەڕانەوە {واتە: گەڕانەوە بۆ تێکدان و خراپەکاریی} ئێمەش دەگەڕێینەوە {بۆ سزادانتان}.

(**إِنْ عُدْتُـم إِلى الإِفْسَـادِ، عُدْنَـا لِعِقَابِكُـمْ**)، ئەگـەر گەڕانـەوە بـۆ خراپەکاریـی، ئێمـەش دەگەڕێینـەوە بـۆ سـزادانتان، دیـارە ئـەم شـێوازە لـە کـورت و پوختیـی، تەنهـا لـە فەرمایشـتی خـوادا هەیـە، چونکـە بەپێی سـیاق و سـەلیقە دەزانـرێ، بۆیە پێویسـتی نەکردوە کـە بفەرموێ: (**إِنْ عُدْتُـم إِلى الإِفْسَـادِ عُدْنَـا لِعِقَابِكُـمْ**)، چونکـە دیـارە ئـەوان دووجـار خراپەکارییـان کـردوە، کـە دەفەرمـوێ: کـە گەڕانـەوە، واتـە: کـە گەڕانـەوە بـۆ خراپەکاریـی، هەروەهـا دیاریشـە کـە خـوا ﷻ لەسـەر هـەردوو جارەکـە سـزای داون، کەواتـە: (**وَإِنْ عُدْتُـم عُدْنَـا**) ئەگـەر بگەڕێنـەوە سـەر خراپەکاریـی، ئێمـەش سـێ بـارە سـزاتان دەدەیـن، وەك جـاری یەکـەم و دووەم.

٣)- ﴿ وَجَعَلْنَا جَهَنَّمَ لِلْكَٰفِرِينَ حَصِيرًا ﴾، دۆزەخیشمان کردوە بە زیندان و حەپسخانە بۆ بێبڕوایان. (**الحَصِيرُ: المَكَانُ الَّذِي يُحْصَرُ فِيهِ، فَلاَ يُسْتَطَاعُ الخُرُوجَ مِنْهُ، فَهُوَ بِمَعْنَى فَاعِل: أَي حَاصِر، أَوْ بِمَعْنَى مَفْعُول: أي مَحْصُور فِيهِ**)، واتە: (**حَصير**) ئەو شوێنەیە کە مرۆڤی تێدا کورت هەڵدەهێنرێ و، لێ دەرچوونی ناکرێ (مرۆڤ تێیدا ئابڵووقە دەدرێ و بەردەست دەکرێ).

کەواتە: (**حصیر**) لێرەدا (**فعیل**)ە، بەڵام بە مانای (فاعل)ە، واتە: (**حَاصِر**)، قۆرەخکەر، دەست بەسەرکەر، یاخود: (**حصیر**) بە مانای (مفعول)ە، واتە: (**مَحْصُورٌ فِيهِ**)، واتە: دۆزەخ شوێنێکە کە کافران تێیدا زیندانیی و حەپس دەکرێن، خوا پەنامان بدات.

ئنجا بۆ ئەوەی زیاتر تیشك بخەینە سەر ئەو بابەتەی کە لەم چوار پێنج ئایەتەدا هاتبوو کورتە باسێك دەخەینە ڕوو، کە پێم وایە ئەو بابەتە لەم ڕۆژگارەدا زۆر گرنگە چونکە گەلی جوولەکە تەواو شوولیان لێ هەڵکێشاوەو ستەم و زۆرو خراپەیەکی زۆریان پەیداکردوە:

## کورتە باسێک دەربارەی
## دوو کەڕەت خراپەکاریی و، سزادانەکەی خوا بۆ بەنو ئیسرائیل

ئایا مەبەست لەو دوو کەڕەت خراپەکارییەی گەلی جوولەکە و سزادانی خوا بۆیان، چییە؟

زانایـان لـەو بـارەوە ڕاجیاییـەکی زۆر زۆریـان هەیـە، مـن بـە پێویسـتم نەزانیـوە کـە بگەڕێمـەوە بـۆ هەمـوو تەفسـیرەکان، بـەڵام شـەش ڕام هێنـاون، لەوانـە:

١ - (**الطبري**)، کە بەڕاستی توێژەرەوەی یەکەمی قورئانەو، پێشەوای توێژەران و ڕوونکەرەوانی قورئانە.

٢ - لە دوای وی: (ابن كثير).

٣ - لە دوای ویش (فخرالدين الرازي)، پاشان ئەوانی دیکەش، زۆربەیان باسی ئەو بابەتەیان کردوە.

بـەڵام مـن لـە کـۆی هەموویـان، شـەش ڕام هەڵبـژاردوون و، دواییـش ئـەوەی خـۆم بەڕاسـتری بزانـم، دەیخەمـە ڕوو:

ڕای یەکەم: (**المراغي**)[1] هێناویەتی دەڵێ:

**١- (الإِفْسَادَةُ الأُولَى: تَغيِير التَّوْرَاةِ وَقَتْل إِشْعِيَاء وَحَبْسُ إِرْمِيَاء فِي البئْرِ حِيْنَ أَنْذَرَهُمْ سَخَطَ اللَّه، فَأَغَارَ عَلَيْهِم أَوَّلاً، وَخَرَّبَ بَيْتِ المَقْدِس (بُخْتُنَصَّر) فِي زَمَنِ إِرْمِيَاء).**

واتـە: تێکـدانی یەکـەم: کـە جوولەکـەکان پێـی هەڵسـاون بریتـی بـووە لـەوە کـە تەوراتیـان گۆڕیـوە و، (**إشـعياء**) یـان {کـە یەکێـك بـووە لـە پێغەمبەرانیـان} کوشـتوەو، (**إرمياء**)یشـیان زیندانیـی کـردوە لـە نێـو بیـردا، کاتێـك کـە ئـاگاداری کردنـەوە کـە خـوا لێیـان تووڕەیـە، بۆیـە بـۆ یەکەمجـار بوختەننەصـەر پاشـادی ئاشـوورو بابـل هێرشـی کردوونـە سـەرو (بیـت المقـدس)ی تێکـداوە، ئـەوە لـە ڕۆژگاری (**إرميـاء**)دا.

**٢- (وَالإِفْسَادَةُ الثَّانِيَة: قَتْلُ زَكَرِيَّا وَيَحْي، وَقَصْدِهِم قَتْلِ عِيْسَى، فَأَغَارَ عَلَيْهِمِ ثَانِيَاً (أَسْبِيَانوس) قَيْصَر الرُّوم، وَكَانَ بَيْنَ الإِغَارَتَيْنِ نَحْو خَمْسمِائَة سَنَة).**

---

(١) تفسير المراغي: ج١٢، ص١٤ و ١٥.

واتە: تێکدانی دووەم: ئەوە بوو کە زەکەرییاو یەحیای کوڕیان کوشت و، ویستیان: عیساش بکوژن، بۆیە بۆ جاری دووەم (ئیسبیانووس) قەیسەری ڕۆم هێرشی کردە سەریان و، لە نێوان ئەو دوو تێکدان و هێرشکرانە سەرەش دا: ماوەی پێنجسەد (٥٠٠) ساڵ بووە.

**ڕای دووەم:** کە (**سعيد حوَّى**) لە (**الأساس في التفسير**) دا هێناویەتی[1]، دەڵێ:

١- (**الإِفْسَادَةُ الأُولَى: إِنْحِرَافَاتُهُم الَّتِي جَرَّتْ عَلَيْهِم غَزْوَة بُخْتَنَّصر البَابلِي**).

واتە: تێکدانی یەکەمیان ئەو لادانانەیان بووە، کە وایکردوە کە بوختەننەصری بابلیی هێرشیان بکاتە سەر.

٢- (**الإِفْسَادَةُ الثَّانِيَة: هِيَ مَا نَرَاهُ الآن إِذْ لَهُمْ دَوْلَةٌ وَسُلْطَانٌ وَإِفْسَادٌ وَطُغْيَان**).

واتە: مەبەست لە تێکدانی دووەم: ئەو حاڵەیانە کە ئێستا دەیبینین، کە دەوڵەتیان هەیەو دەستەڵاتیان هەیە و، خراپەکاریی و سەرکێشییان هەیە.

ئنجا بەپێی ئەم لێکدانەوە بێ، ئایەتی: (١٠٤) لە سوورەتی (**الإسراء**)دا کە دوایی دەیگەینێ - خوا پشتیوان بێ - کە دەفەرموێ: ﴿ وَقُلْنَا مِنۢ بَعْدِهِۦ لِبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱسْكُنُوا۟ ٱلْأَرْضَ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ ٱلْـَٔاخِرَةِ جِئْنَا بِكُمْ لَفِيفًا ﴾، واتە: لە دوای وی (مووسا) بە بەنی ئیسرائیلمان گوت: لەسەر زەویدا نیشتەجێ بن (لەسەر زەوی شام)، هەر کاتێك بەڵێنی جاری دووەم هات، ئێمە دەتان پێچینەوەو دەتانهێنین، دەبێ مەبەست پێی ئەو سزادانە بێ، کە لە جاری دووەمدا کە ڕۆژگاری ئێستایە، دەقەومێ.

**ڕای سێیەم:** کە ئەویش هەر (**سَعِيد حَوَّى**) هێناویەتی، دەڵێ:

١- (**الأُولَى: وُقُوفُهُم فِي وَجْهِ الدَّعْوَةِ الإِسْلاَمِيَّة، ثُمَّ تسليط اللَّه المُسْلِمِينَ عَلَيْهِم**).

٢- (**الثَّانية: هِي الإِفْسَادَةُ الحَالِيَة**)[2].

واتە: مەبەست لە تێکدانی یەکەم: ئەوە بوو کە کاتێك کە ئیسلام هات، لە بەرانبەر ئیسلام وەستان و دژایەتیی بانگەوازی ئیسلامەتییان کرد، دواییش سزادانەکە ئەوە بوو کە خوا مسوڵمانانی بەسەردا زاڵکردن.

---

(١) الأساس في التفسير، دار السلام، القاهرة، الطبعة: السادسة، ١٤٢٤ هـ، عدد الأجزاء: ١١ (في ترقيم واحد متسلسل) ج١١، ص٢٠٠٧.

(٢) سەرچاوەی پێشوو.

کە هەر سێ تیرە جوولەکەکەی بەنی قەینوقاع و، بەنی نەزیرو، بەنی قوڕیزە، لە مەدینە دەرکران، دوایی جوولەکەکانی خەیبەریش دەرکران و، ئاوارەی شام بوون، لە ئەنجامی پەیمان شکێنیی و بێ بەڵێنییان دا.

تێکدانی دووەمیان: ئەوەیە کە ئێستا دەیبینین.

ئنجا بەو پێیە بێ، دەبێ خوای دادگەر، جارێکی دیکەش بە دەستی مسوڵمانان - یان کەسانێکی دیکە - سزایان بدات.

**ڕای چوارەم:** کە (**سید القطب**) ڕەحمەتی خوای لێبێ لە تەفسیرەکەی خۆی (**في ظلال القرآن**)دا[١]، هێناویەتی، دەڵێ:

**(وَلَقَدْ صَدَقَتِ النُّبُوَّةُ وَوَقَعَ الوَعْدُ، فَسَلَّطَ اللَّهُ عَلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ مَنْ قَهَرَهُمْ أَوَّلَ مَرَّة، ثُمَّ سَلَّطَ عَلَيْهِم مَنْ شَرَّدَهُمْ فِي الأَرْض وَدَمَّرَ مَمْلَكَتَهُمْ تَدْمِيراً، وَلاَ يَنُصُّ القُرْآنُ عَلَى جِنْسِيَّةِ هَؤُلاءِ الَّذِينَ سَلَّطَهُم اللَّهُ عَلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ، لأَنَّ النصَّ عَلَيْهَا لاَ يَزِيدُ مِنَ العِبْرَةِ شَيْئَاً).**

وا دیارە (**سید القُطب**) (ڕەحمەتی خوای لێبێ) هەردوو تێکدانەکان، دەگەڕێنێتەوە بۆ مێژوو، وەك ڕای زۆربەی زانایان وایە، دەڵێ:

ئەو هەواڵ پێدانەی کە خوا هەواڵی پێداوە، هاتۆتە دی و، بەڵێنەکە جێ بەجێ بووە، خوا ﷻ کەسانێکی بەسەر جوولەکەکان دا زاڵکرد {ئەو تەنیا باسی یەکەمجار دەکات، بەڵام بۆ جاری دووەمیش هەروایە}، کە لەسەر زەوی دەربەدەریان کردن و، وڵاتەکەیان کاول کردن، بەڵام قوڕئان ئەوە دەرناخات کە ئایا ئەوانە کێ بوون: خوا بەسەر گەلی جوولەکەیدا زاڵ کردوون؟ چونکە دەرخستنی ماهیەتی کێ بوون و چ کەس بوون؟ هیچ لەو عیبرەت و پەندە زیاد ناکات، کە ئێمە لەو بەسەرهاتە وەریدەگرین.

**ڕای پێنجەم:** خاوەنی (تفسیر نمونە) (ناصر مکارمی شیرازی)، کە تەفسیرێکی فارسییەو لەگەڵ کۆمەڵێك لە زانایان دایان ناوە[٢] دەڵێ:

١- (**الإِفْسَادَةُ الأُولَى: تَشْكِيلُ حِزْبِ صَهْيُونيزم وَحكُومَةِ إِسْرَائِيل فِي سَنَة ١٩٤٨م**).

٢- (**الإِفْسَادَةُ الثَّانِيَة: إِحْتِلاَل الأَرَاضِي الإِسْلاَمِيَّة وَالبَيْتِ المَقْدِس وَالمَسْجِدِ الأَقْصَى**).

---

(١) ج٤، ص٢١١٤.
(٢) ج١٢، ص٣٠.

واتە: **تێکدانی یەکەم**: بریتی بوو لەوە کە: جوولەکەکان حزبی صەهیۆنیزمیان دروستکرد و پێك هێناو، پاشان دەوڵەتی ئیسرائیلیان دامەزراند، لە ساڵی ١٩٤٨ زایینی دا.

**تێکدانی دووەمیش**: ئەوەیە کە دوای ئەوەی کە دەوڵەتیان دامەزراند، سەرزەمینێکی ئیسلامیی زۆریان {بەشێکی لوبنان و، بەشێکی ئوردن و، بەشێکی میصرو، بەشێکی سووریا) یان داگیرکرد، هەروەها (**بيت المقدس**) و، مزگەوتی ئەقصاشیان خستە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە.

**ڕای شەشەم**: کە (**محمد الطاهر بن عاشور**) دەیهێنێ، هەرچەندە من خستوومەتە کۆتایی، بەڵام من لە هەموویانم پێ ڕاستترە، هەڵبەتە ئەو ڕایانەی دیکەش دەگونجێن بەڵگەیان لەسەر بهێنرێتەوە، بەڵام من پێموایە ڕای شەشەمیان، کە نیزیکە لەوەی (**المراغي**) هێنای، هەروەها نیزیکە لە یەکێك لەو دوو ڕایانەی (**سَعِيد حَوَّى**) هێنانی، هەروەها نیزیکە لەوەی (سید قطب) گوتوویەتی، بەڵام (**محمد الطاهر بن عاشور**) وردتر دەیهێنێ و، زیاتر تیشك دەخاتە سەر ڕووداوەکان.

(**محمد الطاهر بن عاشور**)[1]، دەڵێ:

**(فَالمَرَّة الأُولَى: هِيَ مَجْمُوع حَوَادِث مُتَسَلْسِلَة تُسَمّى فِي التأريخ بالأَسْرِ البَابلِي، وَهِيَ غَزَوَات بُخْتنَّصْر مَلِكِ بَابل وَآشُور، بلَادَ (أُورشَلِيم):**

**الغزو الأول سنة: (٦٠٨) قبلَ الميلاد، أَسَرَ جماعات كثيرة مِنَ اليهود ويسمّى بالأَسْر الأوْل.**

**الغزو الثاني سنة: (٦٠٦) قبلَ الميلاد، الأسر الثاني وهو أعظم من الأول، وأسر ملك يهوذا وجمعاً غفيراً من الإسرائيليين، وأخذ الذَّهب الذي في هيكل سليمان، وما فيه من الآنية النفيسة.**

**الغزو الثالث: سنة (٥٨٨) قبل الميلاد، غزاهم بختنصر وسبا كلَّ شعب يهودا، وأحرق هيكل سليمان، وبقي أورشليم خراباً يباباً، ثم عادوا لتعميرها، فيما بعد).**

شایانی باسە ئەو - **محمد الطاهر بن عاشور** - تەنیا باسی سزایەکە دەکات، تێکدانەکەیان بریتی بووە لەوە: کە کتێبەکانی خۆیان گۆڕیوە و، پێغەمبەرەکانیان کوشتوون و، ملیان داوەتە گوناهو تاوان و زوڵم و ستەم و خراپەکاریی، دەڵێ:

**تێکدانی یەکەم**: کۆمەڵە ڕووداوێکی بەدوای یەکدان، کە لە مێژوودا بە (**الأسر البابلي**) ناسراون، واتە: بەدیل گرتنی بابلیی، {بابلییەکان جوولەکەکانیان بەدیل گرتوون} کە

---

(١) (التحرير والتنوير: ج١٥، ص ٢٩، ٣٠، ٣٨.

ئەویش ئەو جەنگانەن کە (بُخْتَنَّصَّر) پادشای بابل و ئاشوور کردوونی، لە دژی وڵاتی ئۆرشەلیم، (واتە: وڵاتی جوولەکەکان)، کە:

١- جەنگی یەکەم لە ساڵی: (٦٠٨)ی پێش زایین دا بووە، کە کۆمەڵێکی زۆری لە جوولەکەکان بەدیل گرت و ئەمە پێی دەگوترێ: بە دیل گرتنی یەکەم، {کە بردوونی بۆ بابل}.

٢- جەنگی دووەم لە ساڵی: (٦٠٦) پێش زایین دا بووە، کە پێی دەگوترێ: بەدیل گرتنی دووەم، کە لە هی یەکەم گەورەتر بووە و پادشای یەهووذاش گیراوە، هەروەها ژمارەیەکی زۆر لە ئیسرائیلییەکان (واتە: جوولەکەکان)، هەروەها زێڕێك کە لە هەیکەل (پەرستگا)ی سولەیماندا بووە، ئەویشی بردوە و هەرچی قاپ و قاچاغی بە نرخ و نایاب بووە {کە لە سەردەمی سولەیماندا کۆ کراوەتەوە} هەمووی بەتاڵان بردوە.

٣- جەنگی سێیەم لەساڵی: (٥٨٨)ی پێش زایین دا بووە، کە دیسان هەر بە قیادەی بوختەننەصر بووە، (واتە: بوختەننەصر سێ جاران هێرشی کردۆتە سەر جوولەکەکان)، ئەمجارە هەموو گەلی یەهووذای بەدیل گرتوە، بە پیاوو ئافرەت و منداڵەوە و هەمووی بردوون و هەیکەلی سولەیمان (پەرستگای سولەیمان)ی سووتاندوە و ئۆرشەلیم {ئەو وڵاتەی کە جوولەکەکانی لێ بوون} بەوێرانیی و کاولکراویی ماوەتەوە، بەڵام پاشان گەڕاونەتەوە بۆ ئاوەدانکردنەوەی، دوای ماوەیەکی زۆر.

ئەوە بە نسبەت تێکدانی یەکەمەوە کە (محمد الطاهر بن عاشور)و هەندێك لە سەرچاوە مێژووییەکانی دیکەش، کە من دەرفەتم نەبوو، ئاماژە بە هەموویان بدەم، بەوە لێکی دەدەنەوە، کە بریتیە لەو جەنگانەی کە بوختەننەصر پادشای بابل و ئاشوورییەکان، لە دژی وڵاتی جوولەکە کردوونی و بەو شێوەیەی لێکردوون، کە باسمان کرد.

تێکدانی دووەم: (محمد الطاهر بن عاشور) دەڵێ: (**وأما المرة الثانية فهي سلسلة غزوات الرومانيين بلاد أورشليم**)، سزادانی دووەم، کە لە ئەنجامی خراپەکاریی دووەمی جوولەکەکاندا و، لە ئەنجامی لە ڕێ دەرچوونی دووەمیاندا، خوا جارێکی دیکە سزای داون، بریتیە لە زنجیرەیەك جەنگی ڕۆمانییەکان بۆ سەر وڵاتی ئۆرشەلیم، کە ئەویش: (**محمد الطاهر بن عاشور**) ئاوا دەیهێنێ:

(**وَبَيَانُ ذَلِكَ: أَنَّ الْيَهُودَ بَعْدَ أَنْ عَادُوا إِلَى أُورْشَلِيمَ وَجَدَّدُوا مُلْكَهُمْ، وَمَسْجِدَهُمْ فِي زَمَنِ (دَارِيُوسَ) وَأُطْلِقَ لَهُمُ التَّصَرُّفُ فِي بِلَادِهِمُ الَّتِي غَلَبَهُمْ عَلَيْهَا الْبَابِلِيُّونَ، وَكَانُوا تَحْتَ نُفُوذِ مَمْلَكَةِ**

فَارِسَ، فَمَكَثُوا عَلَى ذَلِكَ مِائَتَيْ سَنَةٍ مِنْ سَنَةِ ٥٣٠ إِلَى سَنَةِ ٣٣٠ قَبْلَ الْمَسِيحِ، ثُمَّ أَخَذَ مُلْكُهُمْ فِي الإِنْحِلَالِ بِهُجُومِ الْبَطَالِسَةِ مُلُوكِ مِصْرَ عَلَى أُورْشَلِيمَ، فَصَارُوا تَحْتَ سُلْطَانِهِمْ إِلَى سَنَةِ ١٦٦ قَبْلَ الْمَسِيحِ، إِذْ قَامَ قَائِدٌ مِنْ إِسْرَائِيلَ اسْمُهُ (مِيثِيَا) وَكَانَ مِنَ اللَّاوِيِّينَ فَانْتَصَرَ لِلْيَهُودِ، وَتَوَلَّى الْأَمْرَ عَلَيْهِمْ، وَتَسَلْسَلَ الْمُلْكُ بَعْدَهُ فِي أَبْنَائِهِ فِي زَمَنٍ مَلِيءٍ بِالْفِتَنِ إِلَى سَنَةِ أَرْبَعِينَ قَبْلَ الْمَسِيحِ، دَخَلَتِ الْمَمْلَكَةَ تَحْتَ نُفُوذِ الرُّومَانِيِّينَ، وَأَقَامُوا عَلَيْهَا أُمَرَاءَ مِنَ الْيَهُودِ كَانَ أَشْهَرُهُمْ (هِيرُودُسَ) ثُمَّ تَمَرَّدُوا لِلْخُرُوجِ عَلَى الرومانيين، فَأَرْسَل قيصر رُومِيَّةَ: الْقَائِدَ (سِيسِيَانُوسَ) مَعَ ابْنِهِ الْقَائِدِ (طِيطُوسَ) بِالْجُيُوشِ فِي حُدُودِ سَنَةِ أَرْبَعِينَ بَعْدَ الْمَسِيحِ.

فَخَرُبَتْ أُورْشَلِيمُ وَاحْتَرَقَ الْمَسْجِدُ، وَأَسَرَ (طِيطُوسُ) نَيِّفًا وَتِسْعِينَ أَلْفًا مِنَ الْيَهُودِ، وَقَتَلَ مِنَ الْيَهُودِ فِي تِلْكَ الْحُرُوبِ نَحْوَ أَلْفِ أَلْفٍ (١٠٠٠٠٠٠)، ثُمَّ اسْتَعَادُوا الْمَدِينَةَ وَبَقِيَ مِنْهُمْ شِرْذِمَةٌ قَلِيلَةٌ بِهَا إِلَى أَنْ وَافَاهُمُ الْإِمْبِرَاطُورُ الرُّومَانِيُّ (أَدْرِيَانُوسُ) فَهَدَمَهَا وَخَرَّبَهَا، وَرَمَى قَنَاطِيرَ الْمِلْحِ عَلَى أَرْضِهَا كَيْلَا تَعُودَ صَالِحَةً لِلزِّرَاعَةِ، وَذَلِكَ سَنَةَ ١٣٥ لِلْمَسِيحِ، وَبِذَلِكَ انْتَهَى أَمْرُ الْيَهُودِ وَانْقَرَضَ، وَتَفَرَّقُوا فِي الْأَرْضِ وَلَمْ تَخْرُجْ أُورْشَلِيمُ مِنْ حُكْمِ الرُّومَانِ، إِلَّا حِينَ فَتَحَهَا الْمُسْلِمُونَ فِي زَمَنِ عُمَرَ بْنِ الْخطاب سنة ١٦ هـ صُلْحًا مَعَ أَهْلِهَا وَهِيَ تُسَمَّى يَوْمَئِذٍ (إِيلِيَاءُ)).

واتە: ڕوونکردنەوەی ئەوەش بەمشێوەیە: جوولەکەکان دوای ئەوەی گەڕانەوە بۆ ئۆرشەلیم و وڵات و مەملەکەتەکەی خۆیان تازە کردەوە و مزگەوتەکەی خۆیان دروست کردەوە، لە سەردەمی (داریۆش) پادشای فارسەکاندا، ئەویش دەستی بۆ ئاوەڵاکردن کە وڵاتەکەی خۆیان ئاوەدان بکەنەوە، کە بابلییەکان بە دیلیان گرتبوون و، بردبوویانن بۆ وڵاتی خۆیان و، وڵاتەکەشیان کاولکرد بوون، جوولەکەکان لە سەردەمی (داریۆش)ەوە کە گەڕانەوە، وڵاتی خۆیان ئاوەدان کردەوە، مزگەوتەکەشیان تازە کردەوە و هەتا دوو سەد (٢٠٠) ساڵ لەسەر ئەوە بەردەوام بوون، {واتە: لە وڵاتی خۆیان بە هێمنیی و ئاسایش ژیان و، خاوەنی قەوارەی سیاسیی خۆیان بوون}، لە (٥٣٠) تاکو (٣٣٠) پێش زایین {واتە: دوو سەد ساڵ}، بەڵام دوایی جارێکی دیکە دەستەڵات و حوکمڕانییەکەیان دەستی کردەوە بە هەڵوەرین و بەتڵۆسییەکان (واتە: پادشاکانی میصر) هێرشیان کردە سەر ئۆرشەلیم و کەوتنە ژێر دەسەڵاتی بەتڵۆسییەکان، لەساڵی (٣٣٠) پێش زایینەوە، تاکو (١٦٦) پێش زایینی، لەو کاتەدا فەرماندەیەك لە جوولەکەکان، هەڵسا بە هەڵگیرساندنی شۆڕشێك بە ناوی (میثیا) کە ئەویش لە هۆزی: (اللاویین) بوو و بەسەر دوژمنەکاندا سەرکەوت و، تۆڵەی بۆ جوولەکەکان ستاندەوە لە دوژمنەکانی و بوو بە حوکمڕان بەسەریانەوە، دوایی

حوکمڕانیی لە کوڕەکانیدا بەردەوام بوو، بەڵام لە ڕۆژگارێکی پڕ لە کێشە و ئاشووبدا، تاکو ساڵی (٤٠)ی پێش زایین، (واتە: چل ساڵ پێش ئەوەی کە عیسا عليه السلام بێتە دنیاوە).

ئیدی لەو کاتەوە مەملەکەتی یەهوودا (وڵاتی جوولەکەکان) کەوتە ژێر دەستەڵاتی ڕۆمانییەکان، کە ئەوانیش کۆمەڵێك فەرماندەیان هەر لە جوولەکەکان دەکردنە سەرکردەیان، کە لە هەموویان ناسراوتر هێرۆدۆس بوو، {هیرۆدۆس جوولەکە بوو، ڕۆمانەکان کردبوویان بە گەورەی جوولەکە، بەڵام هەر لە ژێر دەستەڵاتی ئەوان دا بووە، وەك زۆر لە سەرۆکەکانی ئەو دەوڵەتانەی ئێستا، کە لە دەوڵەتانی زلهێز دایان دەنێن و وەك داشی دامە دەیان جووڵێنن!}، بەڵام دوایی جوولەکە هەڵگەڕانەوە و جەنگیان لە دژی ڕۆمانەکان کرد، بۆیە قەیسەری ڕۆمای ئەو کاتە فەرماندە (**سیسیانووس**)ی لەگەڵ کوڕەکەی بە ناوی (**طیطوس**) ناردە سەریان، {واتە: (**سیسیانووس**) ئەو فەرماندەیە بوو، کە قەیسەری ڕۆم ناردیە سەر جوولەکەکان لەگەڵ کوڕەکەی دا: (**طیطوس**)، کە ئەویش هەر فەرماندە بوو}، ئنجا لە دەوروبەری ساڵی: چل (٤٠)ی زایینی دا، {واتە: چل ساڵ دوای لە دایك بوونی عیسا عليه السلام} ئۆرشەلیمی کاول کرد و مزگەوتەکەشی سووتاند و (**طیطوس**) نەوەد و ئەوەندە هەزار کەسەی لە جوولەکەکان بە دیلگرتن و، لە کۆی ئەو جەنگانەدا کە جوولەکەکان لەگەڵ ڕۆمانەکاندا کردوویانە، هەزار هەزار کەس (واتە: یەك ملیۆن کەس) لە جوولەکە کوژران و، بەڵام دوایی جارێکی دیکە دووبارە جوولەکەکان شارەکەیان وەرگرتەوە، بەس کەمێکیان لێ مابوون، تاکو دوایی ئیمپڕاتۆری ڕۆمانیی (ئەدریانۆس) بەسەریاندا زاڵ بوو و، وڵاتەکەیانی کاولکرد و شارەکانیانی ڕووخاندن و خوێشی بە زەوییە کشتوکاڵییەکانیاندا کرد، بۆ ئەوەی جارێکی دیکە بە کەڵکی کشتوکاڵ نەیەت، ئەویش لە ساڵی: (١٣٥) زایینی دا، {واتە: (١٣٥) ساڵ دوای ئەوەی کە عیسا عليه السلام لە دایك بووە}، دوایی دەڵێ:

بەو شێوەیە لە ساڵی: (١٣٥) زایینیەوە شوێنێك بۆ جوولەکەکان وەك وڵات و قەوارەی سیاسیی و دەوڵەت نەماو، بە زەویدا بڵاوبوونەوە، {بۆیە ئێستا جوولەکە لە هەموو دنیادا هەن و بە هەموو وڵاتاندا بڵاوبوونەوە}، هەروەها ئۆرشەلیم هەر لەژێر دەسەڵاتی ڕۆمانەکان دا بوو و لە ژێر دەسەڵاتی ڕۆمانەکان دەربازی نەبوو، تاکو مسوڵمانان ئازادیان کرد لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتتاب رضي الله عنه لە ساڵی شازدە (١٦)ی کۆچییدا، کە ئەویش عومەر رضي الله عنه بە صوڵح و پێکهاتن و ئاشتەوایی چووە نێو شارەکەیانەوە (واتە: شاری قودس)، کە ئەو کاتە (ئیلیاء)ی پێ دەگوترا.

{یاخود کۆی وڵاتەکەیان (**ئیلیاء**)ی پێدەگوترا، کە وەك پێشتر گوتمان: (**ئیلیاء**) یەکێك بووە لە پێغەمبەرانی بەنو ئیسرائیل صەڵات و سەلامی خوا لە سەر تێکڕای پێغەمبەرانی خوا بێ.

پێم وایە: ئەو ڕایەی (**محمد الطاهر بن عاشور**) تەبەننیی کردوە و، ئاوا ڕوونی کردۆتەوە و ڕایەکەی خۆی بە بەڵگەی سەرچاوە مێژووییەکان پشتڕاست کردۆتەوە، نێزیکترین ڕایە لە ڕاستییەوەو کۆکەرەوەی زۆرێك لەڕایەکانی دیکەشە، هەر چەندە ناشڵێم: ڕایەکانی دیکەش - بەتایبەت لە بارەی تێکدانی دووەم و سزایەکەیەوە - ڕێیان تێناچێ.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە سێزدە (١٣) ئایەت پێك دێ و، ئایەتەکانی (٩ - ٢١) لە خۆ دەگرێ، کە خوای زانا و توانا تێیاندا، باسی سێزدە (١٣) بابەتی جۆراو جۆر دەکات، کە هەموویان لە تەوەری: {قورئان بە چاکترین ڕێبازو بەرنامە دانان}دا دەخولێنەوە:

١- قورئان باشترین ڕێنماییە و موژدەدەری بڕواداران و ترسێنەری بێبڕوایانە.

٢- مرۆڤی بێبڕوا لەبەر پەلەپەل، جاری وا هەیە نزای خراپ لە خۆی دەکات.

٣- شەوگارو ڕۆژگار، دوو نیشانەی خوان و، پڕن لە حیکمەت و سوود.

٤- هەموو مرۆڤێك چارەنووسی خۆی بە دەست خۆیەتی و، لە ڕۆژی دواییش دا نامەی کردەوەکانی بە دەستەوە دەدرێ!

٥- هەر کەس ڕێی ڕاست بگرێ، خۆی بەهرەمەندەو، لە گومڕاییش هەر خۆی زەرەرمەندە.

٦- کەس تاوانی کەس هەڵناگرێ و لە کۆڵی ناکاتەوە.

٧- خوا هەتا پێغەمبەران نەنێرێ بۆ کۆمەڵگاو خەڵکێك، لەسەر کوفر و خراپە، سزایان نادات.

٨- خوا بە هۆی خۆشگوزەرانیی و خراپەکارییەوە، ئاوەدانییەکان دەفەوتێنێ.

٩- خوا زۆر گەلی لە دوای گەلی نووح، بە هۆی گوناهەکانیانەوە، فەوتاندوون.

١٠- هەر کەس ئامانجی دنیا بێ، بە پێی ویستی خوا پێی دەگات، بەڵام لە قیامەتدا جێگەی دۆزەخە.

١١- هەر کەسیش ئامانجی دواڕۆژ بێ و، بە ئیمانەوە هەوڵی بۆ بدات، بە ئاکام دەگات.

١٢- خوا بەپێی سیستمی دادگەرانەی لە گەردووندا، کارئاسانیی بۆ هەموو لایەك دەکات، (چ چاکەکاران، چ خراپەکاران، چ دنیا ویستان، چ دواڕۆژ ویستان).

١٣- لە دنیادا بەرزیی و نزمیی هەیە، بەڵام لە ڕۆژی دواییدا، ئەو بەرزیی و نزمییە، زۆر زیاتر دەبێ.

﴿ إِنَّ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ يَهۡدِي لِلَّتِي هِيَ أَقۡوَمُ وَيُبَشِّرُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٱلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمۡ أَجۡرٗا كَبِيرٗا ٩ وَأَنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ أَعۡتَدۡنَا لَهُمۡ عَذَابًا أَلِيمٗا ١٠ وَيَدۡعُ ٱلۡإِنسَٰنُ بِٱلشَّرِّ دُعَآءَهُۥ بِٱلۡخَيۡرِۖ وَكَانَ ٱلۡإِنسَٰنُ عَجُولٗا ١١ وَجَعَلۡنَا ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ ءَايَتَيۡنِۖ فَمَحَوۡنَآ ءَايَةَ ٱلَّيۡلِ وَجَعَلۡنَآ ءَايَةَ ٱلنَّهَارِ مُبۡصِرَةٗ لِّتَبۡتَغُواْ فَضۡلٗا مِّن رَّبِّكُمۡ وَلِتَعۡلَمُواْ عَدَدَ ٱلسِّنِينَ وَٱلۡحِسَابَۚ وَكُلَّ شَيۡءٖ فَصَّلۡنَٰهُ تَفۡصِيلٗا ١٢ وَكُلَّ إِنسَٰنٍ أَلۡزَمۡنَٰهُ طَٰٓئِرَهُۥ فِي عُنُقِهِۦۖ وَنُخۡرِجُ لَهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ كِتَٰبٗا يَلۡقَىٰهُ مَنشُورًا ١٣ ٱقۡرَأۡ كِتَٰبَكَ كَفَىٰ بِنَفۡسِكَ ٱلۡيَوۡمَ عَلَيۡكَ حَسِيبٗا ١٤ مَّنِ ٱهۡتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهۡتَدِي لِنَفۡسِهِۦۖ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيۡهَاۚ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٞ وِزۡرَ أُخۡرَىٰۗ وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبۡعَثَ رَسُولٗا ١٥ وَإِذَآ أَرَدۡنَآ أَن نُّهۡلِكَ قَرۡيَةً أَمَرۡنَا مُتۡرَفِيهَا فَفَسَقُواْ فِيهَا فَحَقَّ عَلَيۡهَا ٱلۡقَوۡلُ فَدَمَّرۡنَٰهَا تَدۡمِيرٗا ١٦ وَكَمۡ أَهۡلَكۡنَا مِنَ ٱلۡقُرُونِ مِنۢ بَعۡدِ نُوحٖۗ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ بِذُنُوبِ عِبَادِهِۦ خَبِيرَۢا بَصِيرٗا ١٧ مَّن كَانَ يُرِيدُ ٱلۡعَاجِلَةَ عَجَّلۡنَا لَهُۥ فِيهَا مَا نَشَآءُ لِمَن نُّرِيدُ ثُمَّ جَعَلۡنَا لَهُۥ جَهَنَّمَ يَصۡلَىٰهَا مَذۡمُومٗا مَّدۡحُورٗا ١٨ وَمَنۡ أَرَادَ ٱلۡأٓخِرَةَ وَسَعَىٰ لَهَا سَعۡيَهَا وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَأُوْلَٰٓئِكَ كَانَ سَعۡيُهُم مَّشۡكُورٗا ١٩ كُلّٗا نُّمِدُّ هَٰٓؤُلَآءِ وَهَٰٓؤُلَآءِ مِنۡ عَطَآءِ رَبِّكَۚ وَمَا كَانَ عَطَآءُ رَبِّكَ مَحۡظُورًا ٢٠ ٱنظُرۡ كَيۡفَ فَضَّلۡنَا بَعۡضَهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖۚ وَلَلۡأٓخِرَةُ أَكۡبَرُ دَرَجَٰتٖ وَأَكۡبَرُ تَفۡضِيلٗا ٢١ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

((بە دڵنیایی ئەم قورئانە (خەڵكی) ڕێنمایی دەكات بەرەو بەرنامە (وڕێبازێك كە) ڕاستتر و چاكترینە و، مـوژدەش دەدات بە بڕوادارانێك كە كردەوەی چاك دەكەن، كە پاداشتێكی گەورەیان هەیە ﴿٩﴾ هەروەها (ڕایدەگەیەنێ) كە ئەوانەی بڕوایان بە ڕۆژی دوایی نیە، سزاو ئازارێكی بە ئێشمان بۆ داناون ﴿١٠﴾ مرۆڤی (بێبڕوا)یش وەك پەلەكردنی بۆ هاتنی خێر و خۆشیی، پەلەی هاتنی بەڵا و خراپە دەكات و، مرۆڤ (بە سروشت زۆر) پەلە كارە ﴿١١﴾ شەوگارو ڕۆژگاریشمان كردوونە دوو نیشانە (لەسەر پەروەردگارێتیی خوا)، ئنجا هەرچی نیشانەی شەوگار (مانگ)ە، خەفەمان كردوە و، نیشانەی ڕۆژگار (خۆر)یشمان كردۆتە بینەر (هۆكاری بینین) تاكو (بە ڕۆژگار) لە بەخششی پەروەردگارتان داوا بكەن (كارو كاسبی بكەن) و، بۆ ئەوەش كە ژمارەی ساڵان و، ژمێرەی كارەكانتان بزانن و، هەموو شتێكیشمان زۆر باش ڕوونكردۆتەوە (وهەر كامێكیانمان لەوانی دیكە جیاكردۆتەوە) ﴿١٢﴾ پشك و چارەنووسی هەر مرۆڤێكیشمان خستۆتە ئەستۆی خۆیەوە و، ڕۆژی قیامەتیش نووسراوێكی بۆ دەردێنین بە كراوەیی دەیبینێ ﴿١٣﴾ (پێی دەگوترێ:) نووسراوەكەت بخوێنەوە! ئەمڕۆ هەر خۆت ژمێرەر و چاودێری خۆت بی، بەسە ﴿١٤﴾ هەر كەس ڕێی ڕاستی گرت، ڕێی ڕاست گرتنەكەی سوودی بۆ خۆیەتی و، هەر كەسیش گومڕا بێ، گومڕا بوونەكەی زیانی بۆ خۆیەتی و، هیچ نەفسێكی كۆڵ (ی قورسی گوناهان) هەڵگر، كۆڵی گرانی كەسی دیكە هەڵناگرێ و، ئێمەش سزادەر(ی هیچ خەڵك و كۆمەڵگایەك) نین، تاكو ڕەوانەكراوی بۆ نەنێرین (و بیانوو بڕاویان نەكەین) ﴿١٥﴾ هەر كاتێكیش ویستمان (خەڵكی) ئاوەدانییەك بفەوتێنین، فەرمان بە خۆشگوزەرانەكانی دەكەین (چاكە بكەن) كەچی ئەوان لادان و تاوانی تێدا دەكەن و، سەرەنجام قسە (و بڕیاری خوا)ی لەسەر دەچەسپێ (كە: لادەرو خراپەكاران سزادەدەین)و كاول و وێرانی دەكەین ﴿١٦﴾ لە دوای (گەلی) نووحیش گەلێك سەدەمان لە نێو بردوون و، پەروەردگاریشت بەسە بۆ شارەزا بوون و دیتنی گوناهەكانی بەندەكانی ﴿١٧﴾ هەر كەس ژیانی پەلەی (دنیا)ی بوێ، بۆ هەر كەس، ئەوەندەی بۆیمان بوێ، تێیدا بۆی پێش دەخەین، دوایی دۆزەخی بۆ دادەنێین بە عەیبداریی و دەركراویی دەخرێتە نێوی (و تێیدا دەسووتێ) ﴿١٨﴾ هەر

کەسێکیش دوارۆژی بوێ و، کۆششی شایستەی بۆ بکات و، بڕواداریش بێ، ئا ئەوانە کۆششەکەیان سوپاسکراو (و پەسند)ە ﴿١٩﴾ هەر کامێکیان ئەوانیش و ئەوانیش (دوا ڕۆژ خوازانی بڕوادارو دنیاویستانی بێبڕوا) لە بەخششی پەروەردگارت هاوکاریی دەکەین و، بەخششی پەروەردگاریشت (لە هیچ کەس کە کۆشش بکات) قەدەغەکراو نیە ﴿٢٠﴾ سەرنج بدە! چۆن زێدەییمان داوەتە هەندێکیان بەسەر هەندێکیاندا، بە دڵنیاییش (مەنزڵگای) دوارۆژ، پلەکانی گەورەترن و زێدەییەکەیشی گەورەترە ﴿٢١﴾).

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(أَقْوَمُ): (الأَقْوَمُ: تَفْضِيلُ القَوِيم (الَّتِي هِيَ أَقْوَم) صِفَةٌ لِمَحْذُوفٍ دَلَّ عَلَيْهِ: (يَهْدِي)، القَوِيم: المُعْتَدِل، وَالحَسَنُ القَامَة، وَالجَمْع: قِوَام).

(أَقْوَم): دیارە صیغەیەکە لە بە چاکتردانانی (قویم)، واتە: ڕێك و ڕاست (أَقْوَم) واتە: ڕێك و ڕاستتر، ئنجا (الَّتِي هِيَ أَقْوَم) سیفەتە بۆ شتێك کە قرتێنراوە کە وشەی (يَهْدِي) دەلالەتی لەسەر دەکات، یانی: (للطَرِيقَةِ الَّتِي هِيَ أَقْوَم).

وشەی (قويم)یش واتە: ڕێك و ڕاست، دەگوترێ: (فُلَانٌ قَوِيمٌ) واتە: قەد و قیافەیەکی ڕێکی هەیە، کە کۆی (قَوِيم) بریتیە لە (قِوَام).

(عَجُولًا): (العَجَلَةُ: طَلَبُ الشَّيءِ وَتَحرِّيهِ قَبْلَ أَوَانِهِ)، (عَجَلَة) بریتیە لە داواکردنی شتێك و لێ خەفتانی شتێك، پێش ئەوەی کە کاتی خۆی بێ.

(فَمَحَوْنَا): (الْمَحْو: إِزَالَةُ الأَثَر)، (مَحو) بریتیە لە سڕینەوەی شوێنەوار، ﴿فَمَحَوْنَا ءَايَةَ ٱلَّيْلِ﴾، واتە: نیشانەی شەو کە مەبەست پێی (مانگ)ە، خەفەمان کردوە و، شۆقەکەیمان کەم کردوە.

(مُبْصِرَةً): واتە: پێ بینەر، دەڵێ: (أَي: مُضِيئَةً للأَبْصَار) واتە: وا دەکات کە چاوەکان ببینن، خۆی (بَصِير) یانی: بینەر، بەڵام (مُبْصِر) واتە: پێبینەر، وابکەی ئەوەی بەرانبەرەکەت ببینێ، ئەو شتە ببینێ، بێگومان لە ئەنجامی تیشکی خۆردا، ئێمە شتەکان دەبینین، واتە: خۆر پێمان دەبینێنێ.

(**وَٱلۡحِسَابَ**): (**الحِسَـابُ: إِسْـتِعْمَال العَـدَدِ**)، (حسـاب) بریتیـە لـە بەکارهێنـانی ژمـارە، دەگوتـرێ: (**حَسَـبْتُ أَحْسُـبُ حِسَـابَاً حَسْـبُانَاً**)، واتـە: ئـەو شـتەم ژمـارد.

(**فَصَّلۡنَٰهُ تَفۡصِيلٗا**): واتـە: ڕوونمـان کردۆتـەوە بـە ڕوونکردنـەوە، (**الفَصْلُ: إِبَانَـةُ أَحَـدِ الشَّيْئَيْنِ مِـنَ الآخـر، حَتَّـى يَكُـونُ بَيْنَهُـمَا فُرْجَـةٌ، وَالجَمْـعُ مَفَاصِـل وَالمفْـرَدُ مِفْصَـل**).

وشـەی (**فَصْل**) بریتیـە لـە جیاکردنـەوەی دوو شـت کـە نێوانێکیـان هەبـێ، ئنجـا (**مَفَاصِـل**) کـە کـۆی (**مِفْصَـل**)ە، واتـە: جومگـە، لەبەر ئـەوەی جومگـەکان دەبنە هـۆی لێـك جیاکردنەوەی ئەندامـەکان، کەواتـە: (**فَصَّلۡنَٰهُ**) یـانی: (**بَيَّنَّـاهُ تَفْصِيـلاً، أَي: تَبيينَـاً**)، جوانمـان ڕوونکردۆتـەوە، چونکـە کۆمەڵێـك شـت کـە لێـك جیاکرانـەوە، هەریەکەیـان بەجیـا، باشـتر دیـار دەبـێ.

(**طَٰٓئِرَهُۥ**): (**أَي: عَمَلَـهُ الَّـذِي طَـارَ عَنْـهُ، مِـنْ خَـيْرٍ أَو شَرٍّ**)، ئـەو کـردەوەی کـە لـەوەوە فڕیـوە و، لـەوەوە پەیـدا بـووە، ئنجـا چـاك بـێ، یـان خـراپ بـێ.

(**حَسِيبٗا**): (**رَقِيبَـاً فَعِيـلٌ بِمَعْنَـى فَاعِـل، أَي: الحَاسِـبُ الضَّابِـط**)، (**حَسِـيباً**) بـە مانـای چاودێـر لێـرەدا ئەمـە (**فعيـل**)ە، بـەڵام بـە مانـای: (**فَاعِـل**)ە، (**حَسيب**) واتـە: (**حَاسِـب**)، ژمێـرەر و (**ضابط**) کۆنترۆڵکـەر.

(**وَازِرَةٞ**): (**الـوِزْرُ: الثِّقْـلُ، تَشْـبيهَاً بِـوَزْرِ الجَبَـلِ، وَيُعَـبَّرُ بذَلِـكَ عَـنِ الإِثْـمِ، كَـمَا يُعَـبَّرُ عَنْـهُ بالثِّقْـل**)، (**وَازِر**) یـانی: هەڵگـری قورسـایی، (**وِزْر**) مانـای قورسـایی دێ و، گونـاه چوێـنراوە بـە قورسـایی چیـاوە و بـەوە تەعبیـر دەکـرێ لـە گونـاه، وەك چـۆن تەعبیـر دەکـرێ بـە قورسـایی، وەك خـوا لـە سـوورەتی (**العنكبـوت**) ئایـەتی (١٣)دا دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَيَحۡمِلُنَّ أَثۡقَالَهُمۡ وَأَثۡقَالٗا مَّعَ أَثۡقَالِهِمۡ ﴾، واتـە: قورسـاییەکانی خۆیـان و قورسـاییەکانی دیکـەش وێـڕای قورسـاییەکانی خۆیـان، هەڵدەگـرن.

(**مُتۡرَفِيهَا**): واتـە: خۆشـگوزەرانەکانی، (**التُّرْفَـةُ: التَوَسُّـعِ فِي النِّعْمَـةِ، كَـمَا يَقُـولُ: أَتْـرَفَ فُـلاَنٌ فَهُـوَ مُـتْرَفٌ**)، (**تُرْفَـةَ**) واتـە: فراوانیـی لـە نـازو نیعمەتـدا، واتـە: خۆشـگوزەرانیی، دەگوتـرێ: (**أَتْـرَفَ فُـلاَنٌ فَهُـوَ مُـتْرَفٌ**) خـاوەن فراوانییـە لـە نـازو نیعمەتـدا.

(**فَفَسَقُواْ فِيهَا**): دەڵـێ: (**فَسَـقَ فُـلاَنٌ: خَـرَجَ عَـنْ حَجْـرِ الشَّرْعِ**)، واتـە: لـە سـنووری شـەرع چـووە دەرێ، (**فَسَـقَ الرُّطَـبُ: خَـرَجَ عَـنْ قـشْرِهِ**)، فەرکـە خورمـا کـە لـە کەوڵەکـەی خـۆی دەردەچـێ (کەوڵـی هێشـووەکەی) ئـەوەی پێدەگوتـرێ، کەواتـە: ﴿ فَفَسَقُواْ فِيهَا ﴾، واتـە: دەرچـوون لـەو سـنوورەی، کـە دەبـوو لێـی دەرنەچـن.

(ٱلْقُرُونِ): (القَرْنُ: القَوْمُ المُقْتَرِنُونَ فِي زَمَنٍ وَاحِدٍ، وَجَمْعُهُ قُرُون)، (قَرْن) بریتیە لە کۆمەڵە خەڵکێك کە پێکەوە دەبن، لە ڕۆژگارێکدا، کە تاکەکەی (قَرْن)ەو، کۆیەکەی (قُرُون)ە، واتە: سەدەکان، ئنجا هەندێك دەڵێن: سەدە (قَرْن) حەفتا ساڵە، هەندێك دەڵێن: چل ساڵە، هەندێك دەڵێن: سەد ساڵە، ئێستا زیاتر واباوە، کە سەدە، بریتیە لە سەد ساڵ.

(ٱلْعَاجِلَةَ): (الحَيَاةُ العَاجِلَة)، واتە: ئەو ژیانەی کە بەپەلەیە، ژیانێك کە زوو دێتە ئاراوەو زوو تێدەپەڕێ، کە مەبەست ژیانی دنیایە.

(مَذْمُومًا): واتە: لۆمەکراو، سەرزەنشتکراو، عەیب لێگیراو، (الذَمُّ: الوَصْفُ بالمَعَائِبِ الَّتِي فِي المَوْصُوفِ)، (ذَمّ) بریتیە لە وەصفکردنی کەسێك، بەو عەیبانەی کە تێیدان.

(مَّدْحُورًا)، (المَدحُورُ: المَطْرُودُ، دَحَرَهُ: طَرَدَهُ)، (مدحور) واتە: دەرکراو، چونکە: (دَحَرَهُ: طَرَدَهُ) واتە: دەریکردو دووریخستەوە.

(عَطَآءُ): (أَعْطَاهُ مَالاً، وَالإِسْمُ: العَطَاء)، واتە:ماڵی پێدا و پێی بەخشی، ناوەکەش بریتیە لە (عَطَاء) واتە: بەخشش پێدراو، (رَجُلٌ مِعْطَاء: كَثِيرُ العَطَاء، إِسْتَعْطَى وَتَعَطَّى: سَأَلَ العَطَاءَ)، واتە: (مِعْطاء) کەسێك کە زۆر دەبەخشێ، پیاوێکی زۆر بەخشندە، (إِسْتَعْطَى وَتَعَطَّى) واتە: داوای بەخشینی کرد، داوای شتێکی کرد کە پێی بدرێ.

(مَحْظُورًا): (مَمْنُوعَاً)، واتە: قەدەغە، (الحَظْرُ: المَنْعُ)، واتە: نەهێشتن و قەدەغەکردن، ئنجا ئایا ئەوە لەچییەوە هاتوە؟ دەڵێ: (الحَظْرُ: جَمْعُ الشَّيءِ فِي الحَظِيرَةِ، وَالمُحْتَظِرُ فَاعِلُ الحَظِيْرَة)، (حَظِيْرَة) ئەوەیە کە چوارچێوەیەك کرابێ کە زیاتر بۆ ئەوەی کە ئاژەڵیان تێدا کۆکردبێتەوە پێی گوتراوە: (حَظِيْرَة)، ئاغەڵ، یاخود شوێنێك کە دەغڵ و دانیان تێدا کۆ کردبێتەوە، گوتوویانە: (حَظِيْرَة)، ئنجا (مُحْتَظِر) کەسێکە کە (حظيرة)ەکە دروست دەکات، ئەو چوارچێوەیە، یان ئەو ئاغەڵە.

کەواتە: (مَحْظُور) واتە: شتێك کە لە شوێنێك دانرابێ و، ڕێ لە خەڵکێك گیرابێ کە دەستی بیگاتێ، بۆیە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كَانَ عَطَآءُ رَبِّكَ مَحْظُورًا ﴾، بەخششی پەروەردگاری تۆ، لە هیچ کەسێك قەدەغە نیە و، هیچ کەس ڕێی لێ نەگیراوە، کە دەستی بیگاتێ، بە مەرجی کارکردن و هەوڵدان و ڕەچاوکردنی سیستمی خواو یاساکانی لە گەردوون و ژیانی بەشەردا.

## مانای گشتی ئایەتەکان

دوای ئـەو هەشـت ئایەتـەی باسـمان کـردن، کـە وەك پێشـەکی وان بـۆ کـۆی بـاس و بابەتـەکانی سـوورەتی (الإسراء)، ئنجـا خـوا ﷻ ئـەو ڕاسـتییە ڕادەگەیەنـێ کـە وەك پێـش دەسـتیی ئـەم سـێزدە (١٣) ئایەتەیـەو دەفەرمـوێ:

﴿ إِنَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ يَهْدِى لِلَّتِى هِىَ أَقْوَمُ ﴾، بـە دڵنیایـی ئـەم قوڕئانـە ڕێنمایـی خەڵـك دەکات بـۆ ڕێبـازو شـێوازێك کـە ڕاسـترین و چاکترینـە، ﴿ وَيُبَشِّرُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا كَبِيرًا ﴾، هەروەهـا مـوژدەش دەدات ئـەو بڕوادارانـەی کـە کـردەوە باشـەکان ئەنجـام دەدەن، کـە پاداشـتێکی گەورەیـان هەیـە، ﴿ وَأَنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ أَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴾، هەواڵیـش دەدات بـەو کەسـانەی کـە بڕوایـان بـە ڕۆژی دوایـی نیـە، کـە ئێمـە ئازارێکـی بـە ئێشـمان بـۆ ئامـادە کـردوون.

یاخـود مـوژدە دەدات بـە بـڕواداران کـە: پاداشـتی گەورەیـان هەیـە و، موژدەشـیان پێـدەدات کـە: ئەوانـەی بڕوایـان بـە ڕۆژی دوایـی نیـە ئازارێکـی بـە ئێشـمان بۆیـان داناوە! یـانی: بڕوادارینـە! موژدەتـان لێبـێ: دوژمنەکانیشـتان کـە ڕێـی ڕاسـت ناگـرن و دژایەتیـی ئێـوە دەکـەن و، دژایەتیـی هـەق دەکـەن و، دژایەتیـی خـوا و پێغەمبەرەکـەی دەکـەن، موژدەتـان لێبـێ کـە: ئازارێـکی بـە ئێشـمان بـۆ دانـاون و، وەك بـەرزەکی بانـان بـۆی دەرناچـن و، بـە ئاسـانیی قوتـار نابـن!

یـانی: دوای ئـەوەی خـوا ﷻ باسـی چارەنـووسی ڕەش و بەسـەرهاتی تاڵـی گەلـی جوولەکـەی کـرد، دەفەرمـوێ: ئـەم قوڕئانـە ئەگـەر مسـوڵمانان شـوێنی بکـەون، دەیانپارێـزێ لـەو چارەنووسـە ڕەش و تاڵـەی کـە گەلـی جوولەکـە تووشـی بـوون، بـە هـۆی لادانیانـەوە لـە بەرنامـەی خـوا، قوڕئـان مسـوڵمانان دەپارێـزێ و، ڕێنماییـان دەکات بـۆ چاکتریـن و باشـترین شـێوە ژیـان و گـوزەران، لـە ڕووی ڕووحیـی و فیکریـی و ڕەوشـتیی و ئابووریـی و کۆمەڵایەتیـی و سیاسـیی و هتـدەوە.

ئنجـا خـوا ﷻ باسـی سروشـتی مـرۆڤ دەکات: ﴿ وَيَدْعُ ٱلْإِنسَٰنُ بِٱلشَّرِّ دُعَآءَهُۥ بِٱلْخَيْرِ ﴾، وشـەی: ئینسـان لێـرەدا هەندێـك لـە زانایـان دەڵێـن: مەبەسـت پێـی: مرۆڤـە بـە گشـتی،

بەڵام وا پێدەچێ مەبەست پێی مرۆڤی بێبڕوابێ، واتە: مرۆڤێك كە جارێ دەستی هیدایەتی خوای نەگەیشتۆتێ، واتە: مرۆڤ دەپاڕێتەوە بۆ خراپە، وەك چۆن دەپاڕێتەوە بۆ چاكە، واتە: جاری وا هەیە كە تووڕە دەبێ، یان لە ئەنجامی پەلەكردنی دا، دوعای خراپ لە خۆی دەكات، وەك چۆن داوای چاكە بكات لە خوای پەروەردگاری! ﴿ وَكَانَ ٱلۡإِنسَٰنُ عَجُولًا ﴾، مرۆڤ زۆر بە پەلە و بە تاڵووكەیە، یانی: بە سروشت وا خوڵقێنراوە، وەك خوا لە ئایەتی (٣٧)ی سوورەتی (الأنبیاء)دا دەفەرموێ: ﴿ خُلِقَ ٱلۡإِنسَٰنُ مِنۡ عَجَلٍ ﴾، واتە: مرۆڤ لە پەلەپەل دروستكراوە، یانی: مرۆڤ بە سروشت خۆڕانەگرە، وەك لە سوورەتی (**المعارج**)دا فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ خُلِقَ هَلُوعًا ﴿١٩﴾ إِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ جَزُوعًا ﴿٢٠﴾ وَإِذَا مَسَّهُ ٱلۡخَيۡرُ مَنُوعًا ﴾، واتە: مرۆڤ بەهەڵپەو خۆڕانەگر دروستكراوە، ئەگەر ناخۆشیی و خراپەی تووش بوو زۆر شڵەژاووشپرزە و، ئەگەر خۆشیی و چاكەشی تووش بوو، زۆر دەستگرەوەیە.

كەواتە: مرۆڤ دەبێ ئاگاداری ئەو خاڵە بێ هێزانەی خۆی بێ، یەكێك لەوانە ئەوەیە كە پەلە دەكات، كە هەمیشە لە ئەنجامی پەلەكردندا تووشی هەڵە دێ، جاری وا هەیە لە ئەنجامی پەلەكردندا كە لەسەر شتێكی خراپ خۆی ڕاناگرێ، نزای خراپ دەكات، وەك چۆن بۆ خێروچاكە دەپاڕێتەوە، ئاواش دوعای خراپ لە خۆی، یان لە خزمێكی، یان لە منداڵێكی دەكات.

﴿ وَجَعَلۡنَا ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ ءَايَتَيۡنِۖ ﴾، هەروەها شەوگارو ڕۆژگاریشمان كردوون بە دوو نیشانە، ﴿ فَمَحَوۡنَآ ءَايَةَ ٱلَّيۡلِ وَجَعَلۡنَآ ءَايَةَ ٱلنَّهَارِ مُبۡصِرَةً ﴾، نیشانەی شەو (مانگ)مان سڕیوەتەوە و كەم شۆقمان كردوە، واتە: ڕووناكیی نیە و تاریكە، بە تایبەت لەو شەوانەدا كە مانگ لە حاڵەتی (محاق وهلال) دایە، یانی: شەوەكانی سەرەتا و كۆتایی مانگ (شهر)، ﴿ وَجَعَلۡنَآ ءَايَةَ ٱلنَّهَارِ مُبۡصِرَةً ﴾، نیشانەی ڕۆژگاریشمان كردوە بە پێبینەر، (**مُبْصِر**) واتە: ئەو شتەی وا دەكات خەڵك ببینێ، وەك دوایی باسی دەكەین، ئەم وشەیە ئیعجازێكی عیلمیی تێدایە، چونكە پێشتر وایان دەزانی بینینی شتەكان، بە هۆی ئەوەوە كە لە چاوەوە تیشكێك دەچێ و شتەكان دەبینێ، بەڵام ئێستا دەركەوتوە، كە نەخێر شتەكان تیشك دەنێرن بۆ چاو و وێنە دەنێرن و چاو وێنەیان دەگرێ.

﴿ لِّتَبۡتَغُواْ فَضۡلٗا مِّن رَّبِّكُمۡ ﴾، بۆیە ڕۆژگارمان وا لێكردوە و كردوومانە بە پێبینەر، تاكو لە بەخششی پەروەردگارتان داوا بكەن، واتە: لە ڕۆژێدا كارو كەسابەت بكەن و لە نیعمەتەكانی خوا پەیدا بكەن، ﴿ وَلِتَعۡلَمُواْ عَدَدَ ٱلسِّنِينَ وَٱلۡحِسَابَۚ ﴾، هەروەها تاكو:

بـە هـۆی نیشـانەی شـەوەوە، کـە مانگـەو، بەهـۆی نیشـانەی ڕۆژەوە کـە خـۆرە، ژمـارەی سـاڵەکان و ژمـاردنی شـتەکان بزانـن، (حِسَـابَ) واتـە: ژمـاردن.

﴿ وَكُلَّ شَيْءٍ فَصَّلْنَاهُ تَفْصِيلًا ﴾، هەروەهـا هەمـوو شـتێکمان ڕوون کردۆتـەوە، واتـە: هەمـوو شـتێك کـە پێویسـت بـکات بـۆ مرۆڤـەکان، وەك هیدایـەتی خـوا، لـە قوڕئانـدا ڕوونمـان کردۆتـەوە، یاخـود: هـەر شـتێك کـە بـۆ ژیـانی مرۆڤـان پێویسـت بـکات، لـە قوڕئانـدا ڕوونمـان کردۆتـەوە، یاخـود: ﴿ وَكُلَّ شَيْءٍ فَصَّلْنَاهُ تَفْصِيلًا ﴾ هـەر شـتێك کـە دروسـتمان کـردوە، جـوان ڕوونمـان کردۆتـەوە و، هەرکامێکیـان بوونێـکی تایبەتییـمان پێـداوە.

﴿ وَكُلَّ إِنسَانٍ أَلْزَمْنَاهُ طَائِرَهُ فِي عُنُقِهِ ﴾، هـەر مرۆڤێـك چارەنووسـی خۆیمان خسـتۆتە ئەسـتۆی خـۆی، (طَائِرَهُ) أي (عَمَلَهُ الَّذِي طَارَ مِنْهُ)، ئـەو کردەوەیـەی کـە لـەوەوە دەفـڕێ و پەیـدا دەبـێ، ئنجـا خێـر بـێ یان شـەڕ، (أَلْزَمْنَاهُ) واتـە: وامـان لێکردوە کـە بچێتـە گەردنیەوەو، لـە ئەسـتۆی دابـێ و، پێیـەوە پەیوەسـتمان کـردوە، ﴿ وَنُخْرِجُ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ كِتَابًا يَلْقَاهُ مَنشُورًا ﴾ هەروەهـا ڕۆژی دوایـی و ڕۆژی هەڵسـانەوەش، نووسراوێکـی بـۆ دەردێنیـن، کـە بـە کراوەیـی دەیبینـێ، پێـی دەگوتـرێ: ﴿ اقْرَأْ كِتَابَكَ ﴾،نووسراوەکـەت بخوێنـەوە، ﴿ كَفَىٰ بِنَفْسِكَ الْيَوْمَ عَلَيْكَ حَسِيبًا ﴾، ئەمـڕۆ خـودی خـۆت بەسـە بـۆ ئـەوەی ژمێـرەری گوناهەکانـی خـۆت بی، یـان: سـەرکۆنەی خـۆت بکـەی.

﴿ مَّنِ اهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِي لِنَفْسِهِ ﴾، هـەر کەسـێك ڕێـی ڕاسـت بگـرێ، ئـەوە ڕێی ڕاسـتی بـۆ خـۆی گرتـوە و قازانجەکـەی بـۆ خۆیـەتی، ﴿ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا ﴾ هەروەهـا هـەر کەسـێك گومـڕا بـێ، ئـەوە بـە زیانـی خـۆی گومـڕا بـووە، ﴿ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ﴾، هیـچ کـۆڵ هەڵگرێـك کۆڵـی کەسـێکی دیکـە هەڵناگـرێ، واتـە: (وَلاَ تَـزِرُ نَفْـسٌ وَازِرَة)، هیـچ نەفسـێکی گوناهبـار کۆڵـی نەفسـێکی دیکـەی گوناهبـار هەڵناگـرێ، واتـە: کـەس لـە جیاتـی کـەس گوناهـەکان هەڵناگـرێ، هـەر کەسـە گوناهـی خـۆی لـە ئەسـتۆی خۆیدایـە.

دواییـش باسـی ئـەوە دەکەیـن ئایـا کاتێـك کەسـێك کەسـێك گومـڕا دەکات، ئـەوە چۆنـە؟ ڕوونی دەکەینـەوە: ئەوەکـە بابـەتی گومڕاکـەر بەهۆیـەوە گوناهبـار دەبـێ، مانـای وا نیـە کـە گوناهـی گومڕاکـراوی هەڵگرتـوە، چونکـە ئـەوەی کـە گومـڕا دەکـرێ، گومڕابووەکـە، گوناهەکـەی هـەر لـە ئەسـتۆیەتی، بـەڵام بابـای گومڕاکـەر گوناهـی گومڕاکردنەکـەش هەڵدەگرێ و، گوناهـی خۆشـی هەڵدەگرێ، بـێ ئـەوەی لـە گوناهـی گومڕاکـراو کـەم بێتەوە.

ئنجا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا ﴾، ئێمە سزادەر و ئازاردەریش نین بۆ خەڵك و كۆمەڵگایەكان، تاكو پێغەمبەر نەنێرین.

ئایا ئەوە مەبەست پێی دنیایە، یان ڕۆژی دواییە؟ دەگونجێ مەبەست پێی هەردووكیان بێ، واتە: ئێمە نە لە دنیا و نە لە دواڕۆژدا، گەلان و كۆمەڵگاكان سزا نادەین، تاكو پێغەمبەریان بۆ نەنێرین و بەڵگەیان لەسەر تەواو نەكات، وەك لە سوورەتی (**النساء**)دا لە ئایەتی: (١٦٥)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللَّهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ ﴾، واتە: پێغەمبەرانێكی مژدەدەر و ترسێنەرن، تاكو خەڵك لە دوایی پێغەمبەران، بەڵگەیان لەسەر خوا نەبێ.

ئنجا خوای دادگەر باسی ڕاستییەكی دیكە دەكات، دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا أَرَدْنَا أَن نُّهْلِكَ قَرْيَةً ﴾، هەر كاتێك ویستمان خەڵكی ئاوەدانییەك بفەوتێنین، (أَمَرْنَا مُتْرَفِيهَا) فەرمان دەكەین بە خۆشگوزەرانەكانی، (كە چاكەكاری بكەن) (فَفَسَقُوا فِيهَا) كەچی ئەوان خراپەو لادانی تێدا دەكەن، ئاشكرایە خوا فەرمان بە لادان (**فسق**) و خراپە ناكات، چونكە دیارە كە خوا فەرمان بە چی دەكات، بۆیە ئەوەی قرتاندوە، واتە: ئێمە فەرمانمان پێكردن بە چاكە، بەڵام ئەوان لادانیان تێدا كرد و تاوان و خراپەیان تێدا كرد، ﴿ فَحَقَّ عَلَيْهَا الْقَوْلُ ﴾ سەرنجام قسەی لەسەر هاتە دی و چەسپا، واتە: بڕیاری سزادانی خوای لەسەر چەسپا، وەك یاسایەكی دادگەرانەی خوا لە ژیانی بەشەردا. ﴿ فَدَمَّرْنَاهَا تَدْمِيرًا ﴾، ئێمەش بە كاول كردن كاولمان كرد و تێكماندا.

﴿ وَكَمْ أَهْلَكْنَا مِنَ الْقُرُونِ مِن بَعْدِ نُوحٍ ﴾، چەندان سەدەشمان لە دوای نووح فەوتاندوون، واتە: خەڵكی زۆر سەدانمان فەوتاندن، (كَمْ) لێرەدا، (**كم الخبرّية**) یە: یانی: بۆ هەواڵدانەو مەبەست پێی زۆرییە، واتە: زۆر خەڵك كە لە سەدەكاندا ژیاون، لە دوای نووح فەوتاندمانن، لە ئەنجامی خراپەكاریی حوكمڕانە خۆشگوزەرانەكاندا لەسەر حیسابی خەڵكی ڕەش و ڕووت، ﴿ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ بِذُنُوبِ عِبَادِهِ خَبِيرًا بَصِيرًا ﴾، بەسیشە كە پەروەردگارت شارەزا و بینەری گوناهی بەندەكانی بێ، واتە: لە دوای شارەزایی و دیتنی خوا بۆ گوناهی بەندەكان، پێویست بە دیتن و شارەزایی كەسی دیكە ناكات، چونكە خوا ﷻ ئەوپەڕی زانیاریی و شارەزایی و دیتنی هەیە، بۆ گوناهو لادانی بەندەكانی و، كە بەپێی ئەوەش لێیان دەپرسێتەوە و سزایان دەدات.

ئنجا دێتە سەر باسی ڕاستییەکی دیکە: ﴿ مَّن كَانَ يُرِيدُ ٱلْعَاجِلَةَ ﴾، لێرەدا مەبەستەکەی دیارە کە: (مَنْ كَانَ يُرِيدُ الحَيَاةَ العَاجِلَة)، واتە: هەر کەسێك ژیانی بە پەلەی بوێ، واتە: ژیانی دنیای بوێ، تەنیا مەبەستی ژیانی دنیاو تێدا ڕابواردنی بێ، ﴿ عَجَّلْنَا لَهُۥ فِيهَا مَا نَشَآءُ لِمَن نُّرِيدُ ﴾، خێرایی بۆ دەکەین لە ژیانی دنیادا، ئەوەندەی کە بمانەوێ، بۆ هەر کەسێك کە مەبەستمان بێ، واتە: لە خۆشیی و نیعمەتی دنیا، بە خێرایی بۆی دەهێنینە دی، بەو ئەندازیەی کە بمانەوێ، بۆ هەر کەسێك کە ویستمان لەسەری بێ، ﴿ ثُمَّ جَعَلْنَا لَهُۥ جَهَنَّمَ يَصْلَىٰهَا مَذْمُومًا مَّدْحُورًا ﴾، دواییش دۆزەخی بۆ دادەنێین کە بە سەرزەنشتکراویی و بە دەرکراویی دەیخرێتە نێوی و تێیدا سزا دەدرێ و دەسووتێنرێ.

﴿ وَمَنْ أَرَادَ ٱلْـَٔاخِرَةَ ﴾، هەر کەسێکیش کۆتا مەنزڵگای دواڕۆژی بوێ، واتە: ژیانی ڕۆژی دوایی، ﴿ وَسَعَىٰ لَهَا سَعْيَهَا ﴾، کۆششی شایستەی خۆیشی بۆ بکات، ﴿ وَهُوَ مُؤْمِنٌ ﴾، لە حاڵێك دا بڕواداریش بێ، ﴿ فَأُوْلَٰٓئِكَ كَانَ سَعْيُهُم مَّشْكُورًا ﴾، ئا ئەوانە کۆشش و هەوڵەکەیان، سوپاس لەسەرکراوە و پێزانـدراوە، واتە: کۆشش و هەوڵەکەیان نرخێنراوە.

﴿ كُلًّا نُّمِدُّ هَٰٓؤُلَآءِ وَهَٰٓؤُلَآءِ مِنْ عَطَآءِ رَبِّكَ ﴾، هەر کامێك لەوانە هاوکاریی دەکەین، (إِمْدَاد) واتە: ڕست بۆ درێژ کردن و یارمەتییدان (هـؤلاء وهـؤلاء) ئەوانەش و ئەوانەش، واتە: ئەوانەی کە دنیا ویستن و، ئەوانەش کە دواڕۆژ ویستن، هاوکاریی هەردووکیان دەکەین، لە بەخششی پەروەردگارت، ﴿ وَمَا كَانَ عَطَآءُ رَبِّكَ مَحْظُورًا ﴾، بەخششی پەروەردگاریشت قەدەغە نیە، لە کەس قەدەغە نەکراوە، لەم ژیانی دنیایەدا خوا ﷻ هاوکاریی مرۆڤەکان دەکات، بە هەر شێوەیەك بیانەوێ بژین و بۆ هەر ئامانجێك بچن، خوای پەروەردگار بە پێی ئەو هەوڵ و کۆششە کە دەیدەن، وا دەکات کە بەرهەمیان بێتە دەست.

﴿ ٱنظُرْ كَيْفَ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ﴾، سەرنج بدە! چۆن هەندێکیانمان بەسەر هەندێکیاندا زێدەیی داوە، (تَفْضِيل) واتە: زێدەیی پێدان، یانی: بەرزمان کردوونەوە و هەڵمانبژاردوون، لە ڕووی ئەو ڕێژەیەوە کە لە ناز و نیعمەتەکان پێیان دەدەین، نەك لەو ڕووەوە: خوا هەڵیبژارد بن، بەو واتایە: بە چاکتری دانا بن، واتە: خوا دەفەرموێ: سەرنج بدە! چۆن لە ژیانی دنیادا، هەندێکیانمان بەسەر هەندێکیان دا هەڵبژاردوە لەڕووی پێدانی نازو نیعمەتەوە، واتە: هەندێکیان ناز و نیعمەتی زیاترمان پێداون،

بەسەر هەندێکیاندا، ئنجا ئەو ناز و نیعمەتە عەقڵە، ساغیی جەستەیە، جوانیی ڕەنگ و ڕوخسارە، ماڵ و سامانە، خزم و کەسە، هەرچی هەیە، ﴿وَلَلْآخِرَةُ أَكْبَرُ دَرَجَٰتٍ وَأَكْبَرُ تَفْضِيلًا﴾، بە دڵنیایی کۆتا مەنزڵگا و ژیانی دوارۆژیش، پلەکان تێیدا گەورەترن و، زێدەیی پێدانیش تێیدا گەورەترە، واتە: لە ژیانی بەهەشتدا: هەم پێگەو پلەکان زیاترن و بەرزترن و گەورەترن، هەم ئەو زێدەیی پێدان و ئەو بەسەردا هەڵبژاردنەی لە دوارۆژیشدا هەیە، بە پێی تەقوا و کردەوە چاکەکان، کە مرۆڤەکان ئەنجامیان دەدەن، ئەو جیاوازیی و نێوانانە، لەوێ زۆر زیاترن.

لێرەدا ئێمە دێینە کۆتایی مانای گشتی ئەم سێزدە ئایەتە موبارەکەو، لە خوا دەپاڕێینەوە: خوایە! بە لوتف و کەرەمی بێ سنووری خۆت، ئێمە لەو کەسانە بگێڕە و وامان لێ بکە کە ئامانجمان ڕازییکردنی تۆ و، ژیانێکی سەربەرزانە و پاك و ڕێك و ڕاست بێ لە دنیادا، بەڵام ئاوات و ئامانجی هەرە بەرزمان ڕازییکردنی تۆ و بە دەستهێنانی بەهەشتی تۆ بێ و، خوایە! لەوێ بەو پلە بەرزانەمان بگەیەنە و، ئەو زێدەییەمان پێبدە، کە بۆ بەندە پەسندو هەڵبژاردەکانی پەسند دەکەی، بێگومان تەنیا ئەوێ شایستەی ئەوەیە کە مرۆڤ هەوڵی بۆ بدات.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**خوا ﷻ دەفەرموێ: بە دڵنیایی قورئان مرۆڤەکان بەرەو ڕاسترین و ڕێك و پێکترین ڕێباز ڕێنمایی دەکات و، موژدەی پاداشتی گەورە بە بڕواداران کردار چاك دەدات و، هۆشداریی ئازاری بە ئێش بە بێبڕوایان بە ڕۆژی دوایی، دەدات:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ يَهْدِى لِلَّتِى هِىَ أَقْوَمُ وَيُبَشِّرُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا كَبِيرًا ﴿٩﴾ وَأَنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ أَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٠﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿ إِنَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ يَهْدِى لِلَّتِى هِىَ أَقْوَمُ ﴾، بە دڵنیایی ئەم قورئانە ڕێنمایی دەکات بەرەو باشترین و ڕێك و پێکترین.

لێرەدا دوو شت قرتێنراون:

**یەکەم:** ( إِنَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ يَهْدِى: **يَعْنِي يَهْدِي النَّاس، يَهْدِي الإِنْسَان، يَهْدِي المُجْتَمَعَات**)، ئەوە دیارە، بەڵام بۆچی قرتێنراوە؟ لەبەر ئەوەی کە مرۆڤ بە سیاق و سەلیقە دەیزانێ کە ئەم قورئانە ڕێنمایی دەکات، کێ؟ خەڵك ڕێنمایی دەکات، مرۆڤەکان ڕێنمایی دەکات، کۆمەڵگاکان ڕێنمایی دەکات.

**دووەم:** (لِلَّتِى هِىَ أَقْوَمُ) بەرەو ئەوەی کە ڕاسترە و ڕێك و پێکترە، دیسان لێرەدا شتێك قرتێنراوە، واتە: (**لِلحَيَاةِ لِلَّتِي هِيَ أَقْوَم**)، بەرەو ژیانێك کە ڕێك و ڕاسترە، وشەی (**أَقْوَم**)یش ڕێژگەی (**تَفْضِيل**)ە لە (**قَوِيم**)، (**قَوِيم**) واتە: ڕێك و ڕاست، (**أَقْوَم**) واتە: ڕێك و ڕاستر.

ئنجا لێرەدا وەك گوتمان: شتێك قرتێنراوە کە (**الَّتِي**) دەلالەتی لەسەر دەکات، کە (**الزَّمَخْشَرِي**) لە تەفسیرەکەی خۆی (**الكَشَّاف**)دا، جوان دەڵێ: (**وَأَيْنَمَا قَدَّرْتَ لَمْ تَجِد مَعَ الإِثْبَاتِ ذَوْقَ البَلاَغَةِ الَّذِي تَجِدُهُ مَعَ الحَذْفِ، لِمَا فِي إِبْهَامِ المَوْصُوفِ بِحَذْفِهِ، مِنْ فَخَامَةٍ تُفْقَدُ مَعَ إِيضَاحِهِ**).

واتە: تۆ هەر چەندە بێنی ئەو وەسفکراوە قرتێنراوە مەزەننەو ئەندازەگیریی بکەی، بۆ وێنە: (**للحَيَاةِ التِي، للطَرِيقَة التي، للكيفية التي**)، ئەو تام و چێژە ڕەوانبێژییەی کە لە کاتی قرتێنرانیدا هەستی پێدەکەی، لە کاتی چەسپاندنی ئەو وەسفکراوەدا، هەرچییەك بێ، ئەو چێژەی نیە، چونکە وەسفکراوەکە بە هۆی قرتێنرانیەوە، نامۆیی (**إبهام**)ەکە مەزنیی و گرنگییەکی تایبەت پەیدا دەکات.

زانایانی دیکەی ڕەوانبێژیی لە شوێنی دیکە دەڵێن: (**كَيْ يَذْهَبَ الذِّهْنُ أَيَّ: مَذْهَبٍ**)، تاکو زەین بەرەو هەر شوێنێك بچێ، وەك: بۆ ژیانێك کە باشترە، بۆ ڕێبازێك کە باشترە، بۆ بەڕێوەچوونێك کە ڕێك و ڕاسترە...هتد. دەگونجێ زۆر شت دابنێی کە بگونجێ لەگەڵ ئەو ناوی ئاماژەیەدا، بەڵام کە بقرتێنرێ، چەمکەکەی زۆر فراوانتر دەبێ، لەوەکە دیاریی بکرێ، جونکە ئەگەر دیاریی کرابایە بۆ وێنە: (**للطَّرِيقَةِ للَّتِي هِيَ أَقْوَم**)، یاخود: (**للحَيَاةِ للَّتِي هِيَ أَقْوَم**) سنووردار دەبوو، بەڵام ئێستا هەم ژیان دەگرێتەوە، هەم ڕێباز دەگرێتەوە، هەم بەرنامە دەگرێتەوە، هەم شێوەی بەڕێوەبردن دەگرێتەوە، ئەوانە هەموویان دەگرێتەوە و جگە لەوانەش دەگرێتەوە.

لێرەدا پێویستە ئەوە بزانرێ کە: خوا ﷻ هەم ئەم دوو ئایەتە و، هەم ئەم ئایەتانەی دیکەی کە دێن، فەرمووونی دوای ئەوەی کە لە هەشت (٨) ئایەتی دەرسی پێشوودا، باسی دوو ڕووداوی گرنگی کرد:

**یەکەمیان:** سەفەری شەوڕۆیی و بەرزبوونەوەی پێغەمبەر ﷺ، کە لە ئایەتی یەکەمدا باسی کرد.

**دووەمیان:** ڕووداوی دووکەڕەتان تێکدان و خراپەکارییەکانی جوولەکەکان و، دوایی سزادانیان لەلایەن خواوە ﷻ.

ئنجا ئەو ئایەتانە بە مسوڵمان دەڵێن:

**یەکەم:** سەرنجی سیرەو ژیانی پێغەمبەرەکەتان (محمد) ﷺ بدەن، چۆن خوای خاوەن بەزەیی و بەخششی بێ سنوور لە کاتی ئەوپەڕی سەغڵەتیی و تەنگانەدا، ئەو سەفەرە گەورە وگرنگەی شەوڕۆیی و بەرز بوونەوە (الإسراء والمعراج)ی پێکرد، بۆ لابردنی تەمی خەم و پەژارە و دڵدانەوە و بەرچاو ڕوونکردنەوەی زیاتری! ئنجا ئێوەش شوێنکەوتووی وی بن، تاکو خوای کارزان و میهرەبان لەگەڵ ئێوەش دا - هەر کەسە بەپێی خۆی - بەزەیی و بەخشش بنوێنێ.

**دووەم:** سەرنجی گەلی جوولەکە بدەن کە لە ئەنجامی سەرکێشیی و خراپەکاریی دا، خوا چۆنی سزاداون و بەڵاداری کردوون، دەجا دەرس و پەندیان لێوەربگرن و، بێگومان ئەگەر شوێن ئەم

قورئانەش بکەون، بە مەرەدی ئەوان ناچن، چونکە ئەم قورئانە بەرەو ڕاسترین و چاکترین و ڕێك و پێکترین شێواز و ڕێباز و شێوەی ژیان و بەڕێوەبردنی کۆمەڵگا، ئێوە ڕێنمایی دەکات و ڕێتان پێشان دەدات!

ئنجا ڕاستییەکانی دیکەش کە دێن، بە هەمان شێوە، کە لێرەدا خوا ﷻ چەند ڕاستییەك دەخاتەڕوو بۆ ئەهلی ئیمان و بۆ مسوڵمانان، کە بریتین لە: ژمارەیەك لە یاساکانی خۆی لە ژیانی بەشەردا لەو سێزدە ئایەتەدا، ئاشکراشە کاتێك ئەم سوورەتە دابەزیوە، ئنجا چ لە ساڵی چوار یان پێنجی پێغەمبەرایەتییدا بوو بێ، یان لە سەرەتای ساڵی دەیەم، یان لە نیوەیدا بوو بێ، گرنگ ئەوەیە پێش کۆچی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی لە مەککەوە بۆ مەدینە، بووە، واتە: لە پێش ڕاگەیاندنی دەوڵەتی ئیسلامییدا بووە، واتە: ئەم سوورەتە کاتێك دابەزیوە کە وردە وردە، کۆمەڵی مسوڵمان لە مەککە، خەریك بووە بچێتە قۆناغی بوونە کۆمەڵگا و، پێکهێنانی دەوڵەت و قەوارەی سیاسیی، بۆیە پێویستیی بەوە کردوە کە کۆمەڵێك یاسای خوا ﷻ بخرێنە بەرچاوی و بە هۆی زانینی ئەو یاسایانەی خواوە، بزانێ چۆن ئەو کۆمەڵ و کۆمەڵگایەی خۆی بەڕێوە ببات و، چۆن دەرس و پەند وەربگرێ لە گەلانی پێشوو و هەڵەکانی ئەوان دووبارە نەکاتەوە، بە تایبەت گەلی جوولەکەی دراوسێ و نیزیکیان!

٢)- ﴿ وَيُبَشِّرُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾، هەروەها قورئان موژدەش بە بڕواداراەکان دەدات.

٣)- ﴿ ٱلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ﴾، کە کردەوەباشەکان ئەنجام دەدەن، (ٱلصَّٰلِحَٰتِ) سیفەتە بۆ وەسفکراوێکی قرتێنراو، یانی: (**الَّذِينَ يَعْمَلُونَ الأَعْمَالَ الصَّالِحَات، الخِصَالَ الصَّالِحَات**) واتە: کردەوە باشەکان ئەنجام دەدەن، خەسڵەتە باشەکان لە خۆیاندا دەهێننە دی، ئایا موژدەی چییان پێ بدات؟

٤)- ﴿ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا كَبِيرًا ﴾، کە پاداشتێکی گەورەیان هەیە، پاداشتی گەورەش دەگونجێ مەبەست پێی لە دنیادا بێ، یانی: لە ئەنجامی ئیمان و کردەوەی باشدا، ئیماندارانی کردارباش، بەرهەمی باشیان دەست دەکەوێ، خوا پاداشتی باشیان دەداتەوە لە دنیادا، هەروەها دەشگونجێ مەبەست پێی ڕۆژی دوایی بێ، یاخود: مەبەست پاداشت و بەرهەمی دنیاو دوا ڕۆژیش بێ.

بەڵام بەپێی ڕستەی دوایی کەدێ، مانای دووەمیان گونجاوترە: پاداشتی گەورەی ڕۆژی دوایی.

٥)- ﴿ وَأَنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ ﴾، ئەمە دەگونجێ لە سیاقی موژدە پێدانی بڕواداران دا بێ، واتە: قورئان موژدەش دەدات بە بڕوادارانی کردار باش، کە ئەوانەی بڕوایان بە ڕۆژی دوایی نیە،

سزاو ئازارێکی بە ئێشمان بۆ داناون، یانی: موژدە بە بڕواداران دەدات، کە خۆیان سەرەنجامیان خێرە لە دنیا و لە دوارۆژدا و خاوەنی پاداشتێکی گەورە دەبن، هەروەها موژدەشیان پێ دەدات، کە دوژمنانی خوا و ڕێبازو بەرنامەی خوا ﷻ، ئەوانەی بڕوایان بە ڕۆژی دوایی نیە، ئەوانەش ئازار و سزایەکی بە ئێشیان بۆ ئامادە کراوە، لە دوارۆژدا.

٦)- ﴿أَعۡتَدۡنَا لَهُمۡ عَذَابًا أَلِيمٗا﴾، واتە: ئازارێکی بە ئێشمان بۆ داناون، بێگومان لە ڕۆژی دوایی و لە دۆزەخ دا.

لە بارەی ئەوەوە کە خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ يَهۡدِي لِلَّتِي هِيَ أَقۡوَمُ﴾، (**محي الدين درويش**) لە تەفسیرەکەی خۆی (**إعراب القرآن الكريم وبيانه**)[1]دا، دەڵێ:

(**رَجَّحَ أَبُو حَيَّان أَنَّهَا لَيْسَتْ لِلتَفضِيلِ، إِذْ لاَ مُشَارَكَةَ بَيْنَ الطَّرِيْقَةِ الَّتِي يُرْشِدُ إِلَيْهَا القُرْآنُ وَطَرِيْقَةِ غَيْرِهَا، وَفُضِّلَتْ هَـذِهِ عَلَيْهَا، وَإِنَّمَا المَعْنَى: الَّتِي هِيَ قَيِّمَةٌ، أَي: مُسْتَقِيْمَةٌ، كَمَا قَالَ:** ﴿وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلۡقَيِّمَةِ ٥﴾ **البينة**)، واتە: ئەبوو حەییانی تەوحیدیی دەڵێ: کە دەفەرموێ: (هِيَ أَقۡوَمُ) بەرەو ڕێبازێك، یاخود شێوازێك، یان ئیدارەدانێك و بەرنامەیەك، کە ڕێك و ڕاستترە، مەبەست ئەوە نیە کە بەراوردی پێکرابێ لەگەڵ ڕێبازێکی دیکەدا، کە ئەو ڕێبازەی قورئان مرۆڤەکانی بۆ ڕێنمایی دەکات، ڕاستتر و ڕێك و پێکترە، لەو ڕێبازەی کە لەگەڵی دا بەراورد کراوە! چونکە ڕێبازێك کە قورئان خەڵکی بۆ ڕێنمایی دەکات، بەراورد ناکرێ و ناخرێتە تەرازووەوە لەگەڵ هیچ ڕێبازێکی دیکەدا، بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە ئەم قورئانە مرۆڤەکان ڕێنمایی دەکات بۆ ڕاستترین و ڕێك و پێکترین ڕێباز، نەك بە لەبەر چاو گرتنی ڕێبازێکی دیکە، کە لەگەڵیدا بەراورد کراوەو پێکەوە خراونە تەرازووەوە و پێك هەڵدەسێنگرێن، وەك لە سوورەتی: (**البينة**) دا دەفەرموێ: ﴿وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلۡقَيِّمَةِ ٥﴾، واتە: ئەوەش ڕێبازی میللەتێکی ڕێك و ڕاستە، یاخود بەرنامەی ڕێبازێکی ڕێك و ڕاستە، کە لێرەدا مەبەست ئەوە نیە کە ڕێك و ڕاسترە، لە شتێك کە لە بەرانبەری دا هەیە.

بەهەرحاڵ هەردوو واتایەکەی هەن، ئەوەندە هەیە ڕایەکەی ئەبوو حەییانی تەوحیدیی لەگەڵ پێگەو پلەی بەرزو بێ وێنەی هیدایەتی خوادا گونجاوترە، چونکە ئیسلام لەزاتی خۆیدا ئەوپەڕی ڕێك و ڕاستە، نەك بە لەبەرچاوگرتنی ڕێبازی دیکە، کە لە بەرانبەریدا دابنرێ و بەراورد بکرێن.

---

(١) ج٥، ص٣٩٩.

**مەسەلەی دووەم:**

**مرۆڤی بێبڕوا جاری وایە لەبەر پەلە پەل چۆن بۆ شتی باش دەپاڕێتەوە، ئاواش بۆ شتی خراپ و داواکاریی خراپ لە خوا دەپاڕێتەوە:**

خوا دەفەرمویّ: ﴿وَيَدْعُ ٱلْإِنسَٰنُ بِٱلشَّرِّ دُعَآءَهُۥ بِٱلْخَيْرِ ۖ وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ عَجُولًا ﴿١١﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە دوو بڕگەدا:

١)- ﴿وَيَدْعُ ٱلْإِنسَٰنُ بِٱلشَّرِّ دُعَآءَهُۥ بِٱلْخَيْرِ﴾، مرۆڤ بۆ خراپە لە خوا دەپاڕێتەوە بۆ زیانی خۆی، وەك چۆن بۆ قازانج و چاکە لێی دەپاڕێتەوە.

٢)- ﴿وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ عَجُولًا﴾، لە حاڵێك دا کە مرۆڤ زۆر بە پەلەیە و تاڵووکە دەکات.

هەندێك لە زانایان دەڵێن: لێرەدا مەبەست ئینسانی بێبڕوایە، واتە: مرۆڤێك کە دەستی هیدایەتی خوای نەگەیشتوّتێ، مرۆڤی بێبڕوا: خێر و شەڕی خۆی لێك جیا ناکاتەوە، زیان و قازانجی خۆی لێك ناکاتەوە، وەك چۆن جاری وایە بۆ شتێك لە خوا دەپاڕێتەوە، کە بۆی باشە، جاری واش هەیە بۆ شتێك لێی دەپاڕێتەوە، کە بۆی خراپە، بۆ نموونە: لە خوا دەپاڕێتەوە کە گوناهی بۆ ئاسان بکات، ستەمی بۆ ئاسان بکات، خراپەی بۆ ئاسان بکات، کە بۆشی خراپە، لە ئەنجامی ئەوەدا کە شوێن شەریعەت ناکەویّ، خێر و شەڕ و، قازانج و زیانی خۆی، بۆ لێك ناکرێتەوە، ئەوە واتایەکی.

واتایەکی دیکەی ئەوەیە، کە لێرەدا تەنیا مەبەست ئینسانی کافر نیە، بەڵکو مرۆڤ بە گشتی سروشتی وایە، بە پەلەیە، جاری وا هەیە کە لە ئەنجامی پەلەکردنی دا، وەك چۆن بۆ قازانج و خێر دەپاڕێتەوە، بە هەمان شێوە بۆ خراپە و زیانی خۆی دەپاڕێتەوە.

شایانی باسیشە:

ئەم واتایە لە چەند شوێنێك لە قورئاندا، بە تەعبیری جۆراو جۆر هاتوە، بۆ وێنە:

أ/ لە سوورەتی (**یونس**)دا، لە ئایەتی (١١)دا، خوا دەفەرمویّ: ﴿وَلَوْ يُعَجِّلُ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ ٱلشَّرَّ ٱسْتِعْجَالَهُم بِٱلْخَيْرِ لَقُضِىَ إِلَيْهِمْ أَجَلُهُمْ﴾، واتە: ئەگەر خوا بۆ خەڵکی خراپەی هێنابایە پێش، وەك پەلە دەکەن لە هێنانە پێشی چاکەدا، کۆتایی پێ دەهێنان، واتە: جاری وا هەیە

مرۆڤەکان لە ئەنجامی بێبڕواییان دا (بە پێی مانای یەکەم) دەڵێن: خوایە! با دنیا تێك بچێ! خوایە! بەڵامان بۆ بنێرە! لەبەر ئەوەی پێی بڕوادارنین، ئنجا ئەگەر خوا ئەو دوعایانەیان قبووڵ بکات، کۆتاییان پێ دێنێ.

یاخود لە ئەنجامی ئەوەدا کە مرۆڤ سروشتی وایە پەلە دەکات و، تاڵووکە دەکات و خۆڕانەگرە و بە هەڵپەیە، جاری وایە لە شتێك تووڕە دەبێ، لە شتێك بێزار دەبێ، یەکسەر دوعای خراپ لە خۆی دەکات، ئنجا ئەگەر خوا ﷻ وەڵامی ئەو پاڕانەوە خراپانەیان بداتەوە، کە لە خۆیانیان دەکەن، یاخود ئەو شتە خراپانەی کە بۆ خۆیانیان داوا دەکەن، خوا کۆتایی پێ دەهێنان.

ب/ لە سووڕەتی: (الأنفال) ئایەتی (٣٢)دا، باسی هەڵوێستێکی کافرەکانی مەککە دەکات: ﴿ وَإِذْ قَالُوا۟ ٱللَّهُمَّ إِن كَانَ هَٰذَا هُوَ ٱلْحَقَّ مِنْ عِندِكَ فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِّنَ ٱلسَّمَآءِ أَوِ ٱئْتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴾، واتە: کافرەکان گوتیان: ئەی خوایە! ئەگەر ئەم قورئانە هەقەو لەلایەن تۆوەیە، لەسەرێرا بەردمان بەسەردا ببارێنە، یاخود ئازارێکی بە ئێشمان بۆ بێنە!

لە جیاتی بڵێن: خوایە! ئەگەر قورئان هەقە، ئێمەی بۆ ڕێنمایی بکەو، وامان لێ بکە کە وەك خۆی ببینین و بیناسین و بڕوای پێبێنین، کەچی دەڵێن: خوایە! ئەگەر هەقە، بەردمان بەسەردا ببارێنە! یاخود ئازارێکی بە ئێشمان بۆ بێنە!

ج/ لە سووڕەتی: (الأنبياء) ئایەتی (٣٧)دا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ خُلِقَ ٱلْإِنسَٰنُ مِنْ عَجَلٍ سَأُو۟رِيكُمْ ءَايَٰتِى فَلَا تَسْتَعْجِلُونِ ﴾، واتە: مرۆڤ لە پەلەپەل دروستکراوە، نیشانەکانی خۆمتان پێشان دەدەم، پەلە مەکەن.

کە دەفەرموێ: مرۆڤ لە پەلەپەل دروستکراوە، وەك لە شوێنێکی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿ وَخُلِقَ ٱلْإِنسَٰنُ ضَعِيفًا ﴿٢٨﴾ ﴾النساء، واتە: مرۆڤ بێهێز خوڵقێنراوە، هەروەها لە شوێنێکی دیکە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ خُلِقَ هَلُوعًا ﴿١٩﴾ ﴾المعارج، (هَلُوعًا)، واتە: بە هەڵپە، بە پەلەپەل، یانی: مرۆڤ خۆڕانەگر دروستکراوە لە خێرو شەڕدا.

ئەمانە هەموویان: وەك چۆن دەلوێ مەبەست پێیان: مرۆڤی بێبڕوا بێ، دەشگونجی مەبەست پێیان مرۆڤ بێ بە گشتی، بەڵام بێگومان لە ئەنجامی ئیمان هێناندا، لە ئەنجامی پەیوەندیی هەبوون بە خواوە، پەیوەندیی بەندایەتیی و فەرمانبەریی بۆ خوا، مرۆڤ ئەو سروشتە و ئەو سیفەتە خراپانەی بەرە و خێر و چاکە دەگۆڕێن، ئیمان وەك

چۆن کاتی خۆی زانایان لە (ئیکسیر) گەڕاون، گوتوویانە: (ئیکسیر) ماددەیەکە ئەگەر بەسەر ئاسن و فافۆن و مسی دا بکەی، دەیکاتە زێڕ[1]، ئیمان ئەو (ئیکسیرە)یە کە ئەگەر بەسەر سروشتی مرۆڤی دا بکەی، چاکی دەکات، وەك خوا ﷻ دەفەرمویٚ: ﴿وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّىٰهَا ﴿٧﴾ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَىٰهَا ﴿٨﴾ قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ﴿٩﴾﴾ الشمس.

واتە: سوێند بە نەفسی مرۆڤ و بەوەی کە ڕێکی خستوە، تاوانکردن و پاریٚز کردنی فێر کردوە (واتە: وای لێکردوە کە خێر و شەڕی لە دەست بێن)، بە دڵنیاییەوە کەسێك کە خۆی پاك و چاك دەکات، سەرفراز و بەختەوەرە.

ئنجا ئایا: نەفسی مرۆڤ، بەچی پاك و چاك دەبێ؟ بە هۆی ئیمانەوە، بە هۆی تەقواوە، هەروەك بە پێچەوانەوە: مرۆڤ بە هۆی بێ ئیمانییەوە، نەفسەکەی لادان و تاوانی تێدا زۆر دەبێ و، خراپ دەبێ.

**پێناسەی پاڕانەوە:** **(الدُّعَاءُ: طَلَبُ مَا تعْجزُ عَنْهُ مِنْ قَادِر عَلَيْهِ)**، پاڕانەوە، بریتیە لە داواکردنی شتێك لە کەسێك کە لە توانای دا هەیە، بەڵام تۆ بۆ خۆت لە بەرانبەری دا دەستەپاچەی و، لە تواناتدا نیە، مرۆڤەکان بە تایبەت لە تەنگانەدا پەنا دەبەنە بەر خوا و، لە خوا دەپاڕێنەوە، وەك خوا ﷻ لە چەند شوێنێك لە قورئاندا، باسی کردوە، کە لە تاریکاییەکاندا و لە کاتی بەڵا و موصیبەتەکانی نێو وشکانیی و دەریادا، لەو کاتەدا کە مرۆڤ هەست دەکات دەستی بە هیچ شتێك ڕاناگات، دەستی بە هیچ پچکان ڕاناگات، لەو کاتانەدا ئەو لە خۆبایی بوون و، خۆ بەزلگریی و، خوا لێ ونبوونە، ئەو پەردە و نێوان و سێوان و تەم ومژە، هەمووی لادەچێ و، دڵی مرۆڤ و سروشتی مرۆڤ، یەکسەر خوای خاوەن و پەروەردگاری خۆی دەبینێ و پەنای پێدەبات.



(١) ئەوە بیرۆکەیەکی ئەفسانەیی بووە.

## مەسەلەی سێیەم:

**خـوای کارزان شــەوگار و ڕۆژگاری کردوونــە دوو نیشــانەی خـۆی، شــەوگاری تاریـك کـردوەو، ڕۆژگاریشـی ڕۆشـن کـردوە، تاکـو بـە هـۆی ڕۆژگارەوە، مرۆڤـەکان کار و کاسـبیی بکـەن و، بژیـوی خۆیـان دابیـن بکـەن، هەروەهـا بـۆ ئـەوەش کـە بـە هـۆی نیشـانەی شـەوو ڕۆژەوە (ئنجـا چ خـودی خۆیـان بـن، چ ئـەوەی کـە ڕۆژ ڕووناك دەکاتـەوە کـە خـۆرە، ئـەوەی کـە شـەو تاریـك و بـێ شـۆق دەکات کـە مانگـە) هـەم ژمـاردنی سـاڵان، هـەم حیسـاب کـردن و ژمـاردنی کارەکانی خۆیـان بزانـن:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿وَجَعَلْنَا ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ ءَايَتَيْنِ ۖ فَمَحَوْنَآ ءَايَةَ ٱلَّيْلِ وَجَعَلْنَآ ءَايَةَ ٱلنَّهَارِ مُبْصِرَةً لِّتَبْتَغُوا۟ فَضْلًا مِّن رَّبِّكُمْ وَلِتَعْلَمُوا۟ عَدَدَ ٱلسِّنِينَ وَٱلْحِسَابَ ۚ وَكُلَّ شَىْءٍ فَصَّلْنَٰهُ تَفْصِيلًا ﴿١٢﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿وَجَعَلْنَا ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ ءَايَتَيْنِ﴾، شەوگار و ڕۆژگارمان کردوونە دوو نیشانە.

خوا لە زۆر شوێنی قورئاندا، باسی شەوگار و ڕۆژگار دەکات.

(**سبحان اللّه**) مـرۆڤ لـە ئەنجامـی ئولفـەت پێـوە گرتـن و ڕاهاتنـەوە، زۆر جـار سـەرنجی ناچێتـە سـەر ئـەو دیاردانـەی خـوا ﷻ خوڵقانـدوونی، ئـەو نیعمەتانـەی خـوا پێیـداون، ئەگەرنـا بـەدوای یەکـدا هاتنـی شـەو و ڕۆژ، بـەم شـێوە ڕێـك و پێکـە، کـە لـەم ژیانـە زەمینییـەی ئێمـەدا هەیـە، تاکـو ئێسـتا زانایـانی گەردوونـاس دەگەڕێـن و دەپشـکنن و لێدەکۆڵنـەوە، شـتێکی دیکـەی وەك ئـەم زەوییـەی ئێمـە لـە گـەردوون دا نیـە کـە ئـاوا بەڕێـك و پێکیـی و بـە بەردەوامیـی و هاوکۆکیـی (مُعَدّل)ی (١٢) سـەعات شـەوو، (١٢) سـەعات ڕۆژ، هەڵبەتـە بۆیـە دەڵێیـن: بـە موعەددەلیـی، چونکـە شـەوو ڕۆژ کـورت و درێـژ دەبـن و، جـاری وا هەیـە، لـەم شـوێنانەی کـە ئێمـە لێیانیـن: کـە ڕۆژهـەڵاتی نێوەڕاسـتی پـێ دەڵێـن: شـەوگار، یـان ڕۆژگار یـەکی دەبـن بـە هەشـت (٨) سـەعات و بەرانبەرەکەیـان دەبێتـە شـازدە (١٦) سـەعات، بـەڵام لـە شـوێنی دیکـە بـۆ نموونـە: وڵاتـانی (ئیسـکەندەنافیا) و هەندێـك وڵاتـانی ڕۆژئـاوا و وڵاتـانی جگـە لەوانیـش، جـاری وا هەیـە: شـەوگار دەبێتـەوە سـێ چـوار سـەعات، یاخـود بـە

پێچەوانەوە ڕۆژگار دەبێتەوە سێ چوار سەعات، یاخود کەمتریش، بەڵکو لە باکووری گۆی زەوی و، لە باشووری گۆی زەوی، گەلێك جار شەش (٦) مانگ شەوو، شەش (٦) مانگ ڕۆژە، بەڵام ئەگەر حیسابی گشتی گۆی زەوی بکەین، بە جۆرەیە کە گوتمان و ئەمەش هۆکاری ئەوەیە کە ژیان لە سەر زەوی هەبێ، ئەگەر زەوی لە هەر بیست و چوار (٢٤) سەعات دا، جارێك بە دەوری خۆیدا نەخولابایەوە لە بەرانبەر خۆردا، شەوو ڕۆژ دروست نەدەبوون و، ئەگەر خولانەوەکە لە بیست و چوار (٢٤) سەعات زیاتری پێچووبایە، ئەو کاتە شەوو ڕۆژ درێژتر دەبوون.

بۆ وێنە: ئەگەر خولانەوەکە بە چل و هەشت (٤٨) سەعات بووایە، ئەو کاتە ڕۆژگار دەبوو بە بیست و چوار (٢٤) سەعات و، شەوگاریش دەبوو بە بیست و چوار (٢٤) سەعات بە موعەددەلیی، بەڵام ئەگەر خێراتر خولابایەوە: ئەو کاتە شەوگار و ڕۆژگار کورتتر دەبوون، بۆ وێنە: - وەك پێشتریش لە تەفسیری سووڕەتی (یونس)دا باسمان کرد - زانایانی گەردووناس دەڵێن: ئەگەر بە هۆی کێشکردنی مانگەوە نەبووایە، مانگ بە دەوری زەوییەوە نەبووایە، شەوو ڕۆژی زەوی، یەکی دەبوونە چوار سەعات، واتە: دوو سەعات ڕۆژگار و دوو سەعات شەوگار! ئنجا ئایا بە دوو سەعاتان، خەڵك فریای چی دەکەوت! بەڵام ئێستا بە دوازدە (١٢) سەعات بە موعەددەلیی، ئینسان فریای ئیسراحەت دەکەوێ لە شەودا و، فریای کار و کاسبیی دەکەوێ لە ڕۆژدا، بەڵام بە دوو سەعات شەوو دوو سەعات ڕۆژ، خێرا خێرا شەوو ڕۆژ بەدوای یەکدا، هاتبانایە، مرۆڤ فریای هیچ شتێك نەدەکەوت، بۆیە خوا دەفەرموێ: شەوگار و ڕۆژگارمان کردوونە دوو نیشانە.

لە سووڕەتی (اللیل)دا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَغۡشَىٰ ۝١ وَٱلنَّهَارِ إِذَا تَجَلَّىٰ ۝٢ وَمَا خَلَقَ ٱلذَّكَرَ وَٱلۡأُنثَىٰٓ ۝٣ ﴾، واتە: سوێند بە شەوگار کە دادەپۆشێ (چی دادەپۆشێ؟ خڕۆکەی زەوی دادەپۆشێ)، سوێند بە ڕۆژگار کە دەدرەوشێتەوە (سەر زەوی دەدرەوشێنێتەوە) و، سوێند بەو زاتەی کە نێر و مێی دروستکردوون، {یاخود: سوێند بە دروستکرانی نێر و مێ} حاڵەتی جووتیی (**زوجیة**) نەك هەر لە مرۆڤدا، بەڵکو لە ئاژەڵاندا، بەڵکو لە ڕووەکدا، بەڵکو لە زیندەوەراندا، بگرە لە ماددەی بێ ژیانیشدا هەیە.

کەواتە: وەك چۆن نێر و مێ لە ڕووی جووتیەتیی، پێویستن لە دروستکراوەکاندا، کە پەیوەندیی یەکدی تەواوکرن (**تکاملي**)یان هەیە، بە هەمان شێوە: شەوو ڕۆژیش هەردووکیان پێویستن بۆ ژیان، شەو بۆ ئیسراحەت و پشوودان، ڕۆژیش بۆ کارو کاسبیی و هەوڵدان.

٢)- ﴿ فَمَحَوْنَآ ءَايَةَ ٱلَّيْلِ ﴾، واتە: نیشانەی شەوگارمان خەفە کردوە، سڕیومانەتەوەو، بێ شۆقمان کردوەو تاریکمان داهێناوە.

چەمکی وشەی (ءَايَةَ ): (آيـة: هِـيَ الـشيءُ العَجِيـب الَّـذِي يَدْعُـو إلى التَّأَمُّـل)، (آيـة) واتە: نیشـانە، واتە: ئـەو شـتە سەرسـوڕهێنەرەی کـە وات لـێ دەکات سـەرنجی لـێ بـدەی و تێـوەی ڕابمێنی.

لە قورئاندا وشەی (آية) - وەك جاری دیکەش باسمان کردوە - بە چوار واتا بەکارهاتوە:

١ - ڕستەکانی فەرمایشتی خوا، کە ئایەتە خوێنراوەکانن.

٢ - دیاردە سروشتییەکان، واتە: نیشانە بینراوەکان (الآيات المنظورة).

٣ - موعجیزەی پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام).

٤ - هەندێك جاریش بە مانای ئەو ڕووداوانەی کە خوا بەسەر گەلە پێشووەکانی هێناون، پێغەمبەرانی (عليهم الصلاة والسلام)و شوێنکەوتووانی پێ سەرخستوون، بەسەر بێبڕوایەکان دا، یاخود پێی دەرباز کردوون.

بـەو چـوار واتایـە وشـەی (آیـە) لـە قورئانـدا هاتـوە، بـەڵام ئایـا کام مانایـان مەبەسـتە و چـۆن یەکیـان دیاریـی دەکـرێ؟ بەپێـی سـیاق و سـەلیقە ئـەوە دەزانـرێ.

لێـرەدا کـە دەفەرمـوێ: ﴿ فَمَحَوْنَآ ءَايَةَ ٱلَّيْلِ ﴾، نیشـانەی شـەوگارمان خەفـە کـردوە، واتە: شـەوگار کـە نیشـانەیەکە، وامـان کـردوە: ڕووناکییەکـەی بسـڕینەوە و نەیهێڵیـن.

دەشـگونجێ مەبەسـت لـە (ءَايَةَ ٱلَّيْلِ ) لێـرەدا: مانـگ (قمـر) بـێ، واتـە: مانـگ کـە نیشـانەی شـەوە (لـە شـەوێدا دەردەکـەوێ) بـێ شـۆقمان کـردوە و، تاریکـمان داهێنـاوە لـە چـاو خـۆر، یاخـود خەفەمـان کـردوە، هـەردوو واتاکـە ڕاسـتن.

٣)- ﴿ وَجَعَلْنَآ ءَايَةَ ٱلنَّهَارِ مُبْصِرَةً ﴾، نیشانەی ڕۆژگاریشمان کردوە بە پێبینەر، (بصير) واتە: بینەر، (مُبصِرَة) واتە: پێبینەر.

(المَحْـو: الطَّمْـسُ: وَهُـوَ انْعِـدَامُ النُّـورِ)، (مَحْـو) واتـە: خەفـە کـردن، سـڕینەوە، کوژاندنـەوە، یاخـود نەهێشـتنی ڕووناکیـی، بـەڵام (مُبـصِرَة) هەندێـك لـە زانایـان گوتوویانـە، واتـە: بینـەر، واتـە: خەڵـك لـە ڕۆژگاردا دەبینـێ، بـەڵام، نـا، لـە ئەصڵـدا (مُبْصِرَة)،لـە: (أَبْـصَرَهُ) هاتوە، مەبەسـت حاڵـەتی تێپـەڕ (مُتَعـدِّي) (أبْصَرَهُ)یـە یـانی: پێـی بینـی، نـەك حاڵـەتی (لازم)ی، یـانی: بینـی: کەواتـە: لێـرەدا (مُبْـصِرَة) لـە (أبصرُهُ) یـەوە، یـانی: وایکـرد کـە ببینـێ، وەك: (بَـصَّرَهُ) وایکـرد کـە ببینـێ.

کەواتە: (**مُبْصِرة**) واتە: پێبینەر.

دوایی خوا باسی حیکمەت و ئامانج و بەرهەمی ئەوە دەکات، ئنجا نیشانەی ڕۆژگار، یان خودی ڕۆژگارەکەیە، یاخود ئەوەیە کە دەبێتە هۆی ڕووناکیی ڕۆژگار، کە خۆرە، ئایا بۆچی خوا ڕۆژگاری والێکردەو کە هۆکاری پێبینین (**إبْصار**) بێ؟!

٤)- ﴿لِّتَبۡتَغُواْ فَضۡلٗا مِّن رَّبِّكُمۡ﴾، تاکو لە بەخششی پەروەردگارتان بخوازن، واتە: تاکو بە هۆی ئەوەوە کە دنیا ڕووناك دادێ {لە ئەنجامی ڕۆژگاردا، یاخود لە ئەنجامی دەرکەوتنی خۆردا} ئێوە بتوانن کار و کاسبیی بکەن و، بەر پێی خۆتان ببینن.

٥)- ﴿وَلِتَعۡلَمُواْ عَدَدَ ٱلسِّنِينَ وَٱلۡحِسَابَ﴾، هەروەها بۆ ئەوەی ژمارەی ساڵەکان و ژماردن بزانن، بە تایبەت بە هۆی جووڵەی مانگەوە، کە مانگی یەك شەوە وەك دەمە داسێکە، دوو شەوە گەورەتر دەبێ و، کە لە شەوی: یەك و دوو سێ دا، پێی دەگوترێ: (**هلال**)، یاخود شەوی یەکەمیان پێی دەگوترێ: (**هلال**)، ئنجا دوایی وردە وردە لە هەموو قۆناغەکاندا ناوی تایبەتی خۆی هەیە، تاکو دەگاتە: (**بدر**) کە مانگ جێخونکە دەکات، لە (١٤) و (١٥) و هەتا (١٦)ش، لەو کاتەدا بە تایبەتی: (١٣) و (١٤) و (١٥) کە بە (**أيام البيض**)یان پێ دەگوترێ، واتە: ڕۆژانی شەوە سپییەکان، لەبەر ئەوەی مانگ بە تەواویی دەردەکەوێ لە شەوەکانیاندا، ئنجا دوایی وردە وردە لە دوای (١٦)ەوە، بەرەو کەمیی دێتەوە، بەڵام لە یەك(١)ەوە، تاکو پازدە (١٥) لایەکی مانگ دەردەکەوێ، ئنجا دوایی بەلایەکەی دیکەیدا بە پێچەوانەوە کەم دەکات، کەم دەکات، تاکو دەگاتە شەوی: (٢٧) و (٢٨) و (٢٩) و، بە تەواویی ون دەبێ.

بە هۆی جووڵەی مانگەوە ئێمە دەزانین: ئەوە شەوی یەکەمە لەو مانگە، ئنجا دووەم و سێیەم و، تاکو دەگاتە شەوی پازدە (١٥)، دوایی دەزانین ئەوە شەوی (١٦) و (١٧) و (١٨)یە، تاکو کۆتایی مانگ، ئەگەرنا بە هۆی جووڵەی خۆرەوە، ڕۆژەکان هەموویان وەك یەکن، بەڵام شەوەکان هەموو وەك یەك نین، شەوانێك کە مانگ تێیاندا: (١) تا (١٥)یە، جیان لە شەوانی: (١٦) و (١٧) و تا کۆتایی مانگ.

٦)- ﴿وَكُلَّ شَيۡءٖ فَصَّلۡنَٰهُ تَفۡصِيلٗا﴾، هەموو شتێکمان بەتەواویی ڕوون کردۆتەوە بە ڕوون کردنەوە، (**أَي: بَيَّنَاهُ بِوضُوح كَافٍ**) بە چاکیی ڕۆشنمان کردۆتەوە، لێرەدا (وَكُلَّ شَيۡءٖ) واتە: هەر شتێك کە مرۆڤەکان پێویستییانە، خوا لە فەرمایشتی خۆیدا ڕوونی کردۆتەوە و قسەی لەبارەوە کردوە و نوختەی تێدا خستۆتە سەر پیت، ئەوەی کە مرۆڤەکان پێویستییان پێیەتی، کە خوا بۆیان ڕوون بکاتەوە، بەڵام ئایا قورئان هەموو شتێکی تێدا ڕوونکراوەتەوە؟ بێگومان نەخێر، چونکە ئەوەی کە

پێویستیی بە ڕوون کردنەوەی خوا نەبێ، خوا ﷻ ڕوونی نەکردۆتەوە، بەڵکو بۆ عەقڵی مرۆڤەکانی بەجێهێشتوە، وەك لە تەفسیری سوورەتی (**النحل**)دا بە تەفصیل لەو بارەوە قسەمان کرد، لە کاتێکدا، ئەو ئایەتە موبارەکەمان تەفسیر کرد، کە دەفەرموێ: ﴿ وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ تِبْيَٰنًا لِّكُلِّ شَىْءٍ ... ﴿٨٩﴾ ﴾، لەوێ بە درێژیی قسەمان لەسەری کردوە و لێرە دووبارەی ناکەینەوە.

## کورتە باسێک

## شەوگارو ڕۆژگارو پەیوەندیی نێوان زەوی و مانگ لەچوار هەڵوەستەدا

**هەڵوەستەی یەکەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَجَعَلْنَآ ءَايَةَ ٱلنَّهَارِ مُبْصِرَةً ﴾، نیشانەی ڕۆژگارمان کردوە بە (مُبْصِرَةً )، بۆ ئەوەی بزانین کە وشەی (مُبْصِرَةً ) وەك ئێمە مانامان کرد، واتە: پێبینەر، هۆکاری بینین، دەڵێین: خوا لە سوورەتی: (**النمل**) ئایەتی (١٣)دا، دەفەرموێ: ﴿ فَلَمَّا جَآءَتْهُمْ ءَايَٰتُنَا مُبْصِرَةً ﴾، واتە: ئنجا کاتێك {دار و دەستە و گەلی فیرعەون} ئایەتەکانی ئێمەیان بۆ هاتن {لەسەر دەستی مووسا عليه السلام} کە هۆکاری ئەوە بوون: ببینن، هۆکاری ئەوە بوون: بزانن.

شارەزایان گوتوویانە: (**نُسِبَ البَصَرُ إلى الأيَاتِ كَمَا نُسِبَ البَصَرُ هُنَا إلى النَّهَارِ**)، وەك چۆن لەوێدا دیتنەکە پاڵدراوەتە لای ئایەتەکان، واتە: ئایەتەکان پێبینەر بوون، لێرەش ڕۆژگار کراوە بە پێبینەر، ﴿ وَجَعَلْنَآ ءَايَةَ ٱلنَّهَارِ مُبْصِرَةً ﴾، نیشانەی ڕۆژگاریش وەك گوتمان دەگونجێ: ڕۆژگار خودی نیشانەکە بێ، دەشگونجێ: مەبەست خۆر (**شمس**) بێ، کە ڕۆژگاری پێ کردوەتە ڕۆژگار، هەروەها بە نسبەت (**آية الليل**)یش دەگونجێ مەبەست پێی خودی شەوگارەکە بێ، دەشگونجێ مەبەست پێی ئەو شتە بێ کە لە شەوگاردا دەردەکەوێ، کە مانگ (**قمر**)ە.

بەڵێ وەك چۆن لە ئایەتی ژمارە: (١٣)ی سوورەتی (**النمل**)دا، خوا ﷻ بینینەکەی پاڵداوەتە لای ئایەتەکان، واتە: نیشانەو موعجیزەکانی مووسا عليه السلام کە خوا پێیدابوون، لێرەشدا (**الإسراء: ١٢**) بینینەکە پاڵدراوەتە لای نیشانەی ڕۆژگار، ئنجا ئەمە ئیعجازێکی زانستیی تێدایە، چونکە لە ڕابردوودا وایان دەزانی: کاتێك مرۆڤەکان شتێك دەبینن، لە

چاوی مرۆڤەوە تیشکێك دەچێ و، ئەو شتە دەبینێ، بەڵام دوای ئەوەی (**ابن الهیثم**) کە یەکێکە لە زانایانی مسوڵمان، زۆر لێی کۆڵیەوە و سەرنجی دا، کە کۆمەڵێك دەرەنجامی زانستیی دیکەش دەرخستن لە بواری فیزیا و بوارە جیاجیاکاندا، ئنجا یەکێك لەوانە ئەوە بوو: گەیشتە ئەو ڕاستییەی کە بینینی مرۆڤ بۆ شتەکان، هۆکارەکەی: ئەوەیە لە شتەکانەوە تیشك بۆ چاوی مرۆڤ دێ، نەك لە چاوی مرۆڤەوە تیشك بۆ شتەکان بڕوات، واتە: شتە بینراوەکە وات لێدەکات کە بیبینی و ئەو بۆ تۆ دەردەکەوێ، نەك لە چاوەوە تیشك بۆ شتەکان بچێ، چونکە ئێمە کەی شتەکان دەبینین؟ کاتێك کە دنیا ڕووناك بێ، چونکە کە دنیا ڕووناك بوو وشتەکان دەرکەوتن، ئنجا چاو دەیانبینێ، واتە: لە شتەکانەوە تیشك بۆ چاو دەچێ، لە شتەکانەوە وێنە بۆ چاو دەنێردرێ، ئنجا ئەگەر لە چاوەوە تیشك بۆ شتەکان چووبایە، دەبووایە کاتێك کە شتەکان تاریکیش بوونایە، مرۆڤ توانیبای بیانبینێ، چونکە بەحیساب لە چاوەوە تیشك بۆ ئەوان دەچێ، بە تایبەت کە مرۆڤ لە ڕووناکیی دا بێ!! بەڵام نا، ئێمە تەنیا کاتێك شتەکان دەبینین، کە تیشك بکەوێتە سەریان و ئەوان ببنە هۆکاری دیتنمان بۆیان.

کەواتە: وێنەی شتەکانە بۆ چاومان دێ، ئەوەش ڕاستییەکی زانستییە، کە ئەم ئایەتە موبارەکە ئاماژەی پێدەکات، کە دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلْنَآ ءَايَةَ ٱلنَّهَارِ مُبْصِرَةً﴾، واتە: نیشانەی ڕۆژگارمان کردوە بە پێبینەر، واتە: ئەو واتان لێدەکات: ببینن.

**هەڵوەستەی دووەم:** بە نسبەت شەوگار و ڕۆژگارەوە، لە چەند شوێنێك دا باسی ئەوەی کردوە کە شەوگار بۆ خەوتن و پشوودانەو، ڕۆژگار بۆ کارو کاسبیی و گوزەرانە:

١- لە سوورەتی (**القصص**)دا خوا دەفەرموێ: ﴿وَمِن رَّحْمَتِهِۦ جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ لِتَسْكُنُوا۟ فِيهِ وَلِتَبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِهِۦ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٧٣﴾﴾، واتە: خوا لە بەزەیی خۆیەوە، شەوگار و ڕۆژگاری بۆ وا لێکردوون کە تێیاندا ئارام بگرن و، لە بەخششی خوا داوا بکەن، واتە: لە شەوگاردا ئارام بگرن و ئیسراحەت بکەن و پشووی تێدا بدەن و، لە ڕۆژگاریش دا کاسبیی بکەن و لە بەخششی خوا بخوازن.

٢ - لە شوێنێکی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلْنَا ٱلَّيْلَ لِبَاسًا ﴿١٠﴾ وَجَعَلْنَا ٱلنَّهَارَ مَعَاشًا ﴿١١﴾﴾النبأ، واتە: شەوگارمان بۆ کردوون بە پۆشاك {داتان دەپۆشێ، بخەون پشوو بدەن}، ڕۆژگاریشمان کردوە بە مایەی ژیان و گوزەران {هەوڵی تێدا بدەن و کار و کاسبیی تێدا بکەن}.

کەواتە: بە پێی سیستمی خوا کە هەر ئەوەش لەگەڵ سروشتی مرۆڤدا دەگونجێ، دەبێ ئینسان شەو تەرخان بکات بۆ پشوودان، لەبەر ئەوەی تاریکە و، جەستەی مرۆڤ باشتر پشوو دەدات، لە کاتێکدا کە دنیا تاریك دەبێ، بەڵام ڕۆژگار وا باشە بەهرەی لێ وەربگیرێ، بۆ کار و کەسابەت و جموجۆڵ کردن و کۆشش.

**هەڵوەستەی سێیەم:** لەو بارەوە کە چۆن مامەڵە لەگەڵ شەوگاردا بکرێ؟ ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر دێنین ﷺ: {عَنْ جَابِرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، عَنْ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِذَا اسْتَجْنَحَ اللَّيْلُ، (أَوْ قَالَ: جُنحَ اللَّيْلُ)، فَكُفُّوا صِبْيَانَكُمْ، فَإِنَّ الشَّيَاطِينَ تَنْتَشِرُ حِينَئِذٍ، فَإِذَا ذَهَبَ سَاعَةٌ مِنَ الْعِشَاءِ فَخَلُّوهُمْ، وَأَغْلِقْ بَابَكَ، وَاذْكُرْ اسْمَ اللَّهِ، وَأَطْفِئْ مِصْبَاحَكَ، وَاذْكُرْ اسْمَ اللَّهِ، وَأَوْكِ سِقَاءَكَ، وَاذْكُرْ اسْمَ اللَّهِ، وَخَمِّرْ إِنَاءَكَ وَاذْكُرْ اسْمَ اللَّهِ، وَلَوْ تَعْرُضُ عَلَيْهِ شَيْئًا} (أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ: ٣٢٨٠).

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ) لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ئەگەر شەوگار باڵی بەسەر دنیادا کێشا، منداڵەکانتان بگرنەوە، (واتە: مەهێڵن بچنە دەر، لە کاتی بوولێڵی ئێوارە و دوای شێواندا)، چونکە شەیتانەکان لەو کاتەدا بڵاودەبنەوە، {ئێمە نازانین بەڵام ئەوە هەواڵێکی نادیارە پێغەمبەر ﷺ پێمانی دەدات و، خەڵکیش بە ئەزموونی خۆی ئەوەی بۆ دەرکەوتووە لەکاتی ئێواران دا دەبینین: مار و مێروو و زیندەوەران بڵاودەبنەوە، ئنجا ئێمە شەیتانەکان نابینین، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵمان پێدەدات، کە ئەوانیش لەوکاتەدا بڵاودەبنەوە دەفەرموێ:} دوای ئەوەی ماوەیەك لە شەو ڕۆیی، {واتە: نێوان شێوان و خەوتنان بەسەرچوو}، ئنجا لێیان بگەڕێن (ئەو کاتە زیانی نیە) هەروەها دەرگاکەت دابخەو ناوی خوا بێنەو، چرایەکەت بکوژێنەوە و ناوی خوا بێنە، ئەو دەفرەت کە شلەمەنییەکی تێدایە، یان ئاوی تێدایە، زارەکەی دابخە، یان سەرقاپی بکە و، ناوی خوا بێنە، {سەقا ئەوەیە کە ئاویان لێخواردۆتەوە، مەشکە بووە، کوندە بووە، هەرچی بووە}، هەروەها ئەو قاپە داپۆشە کە خواردنێك، یان شلەمەنیەکت تێدا هەڵگرتوە و ناوی خوا بێنە، ئەگەر تەنها ئەوە بێ کە شتێکی بەسەر ڕابهێڵی {واتە: ئەگەر تەواو سەرەکەیشت بۆ نەگیرێ، هەر شتێکی لەسەر دابنێ، با بە تەواوییش قەپاتی نەکات، گرنگ ئەوەیە بەسەر ئاوەڵەیی بەجێی مەهێڵە}.

ئەوەش چەند ڕێنماییەکی پێغەمبەری خوان ﷺ کە لە شەوگاردا بەو شێوەیە هەڵس و کەوت بکەین.

**هەڵوەستەی چوارەم:** پەیوەندنی نێوان زەوی و مانگ:

پێشتریش گوتمان: ئەگەر مانگ نەبووایە کە بە دەوری زەویدا دەخولێتەوە، ئەو کاتە شەوگار و ڕۆژگار یەکی دوو سەعات دەبوون، ئەمە ڕاستییەکی گەردوونییە، کە زانایانی گەردووناس ئێستا پێی گەیشتوون.

نەك هەر ئەوەندەش، بەڵکو ئەگەر مانگ نەبووایە بە دەوری زەوییەوە، هەڵکشان و داکشانی دەریاکان ڕووی نەدەدا، ئەگەر هەڵکشان و داکشانی دەریاکانیش نەبووایە، [وێڕای هەندێك هۆکاری دیکەش] ئەو شنە بایەی کە بەردەوام لەسەر دەریاکان هەیە، ئەوە نەدەبوو، ئەگەر ئەو بایەش نەبووایە، ئەو هەڵمی ئاوەش کە خۆر پەیدای دەکات لەسەر ڕووی دەریا، یا نەیدەگواستەوە، واتە: هیچ بایەك پەیدا نەدەبوو، ئەو هەڵمە بگوازێتەوە و بیهێنێ بۆ ناوچە ساردەکان و سەرەنجام ببێتە هەور و، هەورەکانیش موتوربە ببن و ئاویان لێ بێتە خوار بە هەرسێك جۆری: باران و بەفرو تەرزە، کە ئەوە لە چەندان شوێن لە قورئاندا خوا ئاماژەی پێداوە، بۆ وێنە:

١ - لە سوورەتی: (**النور**)دا، ئایەتی ژمارە (٤٣)دا، خوا زۆر بە ڕوونیی ئاماژەی پێداوە: ﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يُزْجِي سَحَابًا ثُمَّ يُؤَلِّفُ بَيْنَهُۥ ثُمَّ يَجْعَلُهُۥ رُكَامًا فَتَرَى ٱلْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلَٰلِهِۦ..... ﴾.

٢ - لە سوورەتی (**الأعراف**)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى يُرْسِلُ ٱلرِّيَٰحَ بُشْرًۢا بَيْنَ يَدَىْ رَحْمَتِهِۦ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَقَلَّتْ سَحَابًا ثِقَالًا سُقْنَٰهُ لِبَلَدٍ مَّيِّتٍ فَأَنزَلْنَا بِهِ ٱلْمَآءَ فَأَخْرَجْنَا بِهِۦ مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ ۚ كَذَٰلِكَ نُخْرِجُ ٱلْمَوْتَىٰ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٥٧﴾ ﴾، هەردووك ئایەتەکەش بەڕوونیی ئەوە دەگەیەنن: کە بەهۆی (با)وە، ئەو هەڵمە ئاوەی کە لەسەر ڕووی دەریاکان هەیە، دەگوازرێتەوە و دەبێتە هەور و دوایی ئەو هەورانە ئاویان لێدێتە خوار، کە وەك گوتمان ئاوەکە لە شێوەی باران و بەفر و تەرزەدا خۆی دەبینێتەوە، هەروەها لە سوورەتی (**الروم**) (٤٨) یشدا دیسان خوا ﷻ هەمان مەسەلە باس دەکات.

## مەسەلەی چوارەم:

**هەر کەس چارەنووسی خۆی لە گەردنی خۆی دایە و ڕۆژی دوایی بە نووسراوێکی کراوە، دەخرێتە بەر دەستی و پێی دەگوترێ: بیخوێنەوە، هەر خۆت بۆ ژماردن بەسی، یاخود هەر خۆت بۆ لێپرسینەوەی خۆت بەسی:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَكُلَّ إِنسَٰنٍ أَلْزَمْنَٰهُ طَٰٓئِرَهُۥ فِى عُنُقِهِۦ ۖ وَنُخْرِجُ لَهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ كِتَٰبًا يَلْقَىٰهُ مَنشُورًا ﴿١٣﴾ ٱقْرَأْ كِتَٰبَكَ كَفَىٰ بِنَفْسِكَ ٱلْيَوْمَ عَلَيْكَ حَسِيبًا ﴿١٤﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿ وَكُلَّ إِنسَٰنٍ أَلْزَمْنَٰهُ طَٰٓئِرَهُۥ فِى عُنُقِهِۦ ﴾، هەر مرۆڤێك كردەوەو چارەنووس و سەرەنجامی خۆیمان خستۆتە گەردنی خۆیەوە، چارەنووسیمان خستۆتە ئەستۆی خۆی.

(**طَائِرَهُ: عَمَلُهُ الَّذِي طَارَ مِنْهُ**) كردەوەكەی خۆی كە لەوەوە پەیدا دەبێ، یاخود (**طائر**) بە مانای سەرەنجام دێ، یاخود بە مانای چارەنووس دێ، كە دیارە چارەنووس و سەرەنجامی مرۆڤیش لە ئەنجامی هەڵوێست و كردەوەكانیەوە پەیدا دەبێ، واتە: هەر مرۆڤێك بۆ خۆی سەرەنجام و چارەنووسی خۆی، خێر و شەڕی خۆی، دیاریی دەكات.

٢)- ﴿ وَنُخْرِجُ لَهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ كِتَٰبًا يَلْقَىٰهُ مَنشُورًا ﴾، لە ڕۆژی قیامەتدا نووسراوێكی بۆ دەردێنین بە كراوەیی دەیبینێ.

وشەی: (**نُخْـرِج**) بە (**يُخْـرِجُ**)ش خوێنراوەتەوە، هەروەها بە (**يُخْـرَجُ**)ش خوێنراوەتەوە، (**نُخرج**) واتە: بۆی دەردێنین، (**يُخْـرِج**) واتە: خوا بۆی دەردەهێنێ، (**يُخْـرَجُ**) واتە: بۆی دەردەهێنرێ.

(**يَلْقَاهُ**) خوێنراویشەتەوە: (**يُلَقَّاهُ**) واتە: دەخرێتە بەردەستی و، پێی پێشان دەدرێ.

٣)- ﴿ ٱقْرَأْ كِتَٰبَكَ ﴾، نووسراوەكەت بخوێنەوە، پسپۆڕانی زمان دەڵێن: (**هذا مَقُولُ قَوْلٍ مَحْذُوفٍ دَلَّ عَلَيْهِ السِّيَاق**)، ئەمە گوتراوی قسەیەكی قرتێنراوە، كە سیاقەكە دەیگەیەنێ: (**إِقْرَأْ**) واتە: (**يُقَالُ لَهُ إِقْرَأْ**) پێی دەگوترێ: نووسراوەكەت بخوێنەوە.

٤)- ﴿كَفَىٰ بِنَفْسِكَ ٱلْيَوْمَ عَلَيْكَ حَسِيبًا﴾، ئەمڕۆ خۆت بەسی بۆ ئەوەی ژمێرەر و لێپرسەرەوەی خۆت بی، (**حسيب**): (**فَعِيْل بِمَعْنَى: فَاعِل، مِثْلُ: ضَرِيب وَصَرِيم، بِمَعْنَى: ضَارِب وَصَارِم، أَي: الحَاسِبْ وَالضّابط**)، لێرەدا (**فَعِيل**) بە مانای (**فَاعِل**)ە، کەواتە: (**حَسِيباً**) واتە: (**حَاسِب وَضَابط**)، واتە: بەسە کە تۆ ژمێرەر و کۆنترۆڵکەری کردەوەکانی خۆت بی، ئەوەتا لەبەر چاوتن.

وشەی (**كَفَىٰ**) بۆ خۆی بەکار دەخوازێ بەبێ پیت، بەڵام لێرە کە بە پیتی، (**على**) تێپەڕی پێکراوە، ﴿كَفَىٰ بِنَفْسِكَ ٱلْيَوْمَ عَلَيْكَ حَسِيبًا﴾، بۆ ئەوە بووە کە وشەی (**حسيب**) مانای (**شهيد**)ی بخرێتە نێو، واتە: وشەی (**حسيب**) هەم مانای ژمێرەر و کۆنترۆڵکەر دەگەیەنێ، هەم مانای چاودێر و شایەدییدەریش دەگەیەنێ، کەواتە: خوا ﷻ لەم دوو ئایەتەدا، سێ ڕاستیی گرنگ و مەزن دەخاتە ڕوو:

ڕاستیی یەکەم: چارەنووسی هەر کەس گرێدراوی ویستی ئازادانەی خۆیەتی، کە باسی (**عُنُقه**) دەکات: ﴿وَكُلَّ إِنسَٰنٍ أَلْزَمْنَٰهُ طَٰٓئِرَهُۥ فِى عُنُقِهِۦ﴾، خستوومانەتە ئەستۆی، گەردنی، ملی:

أ - لەبەر ئەوەی گەردن و ملی، ئینسان هەمیشە لەگەڵ مرۆڤدایەو، ئینسان بەبێ مل سەری ڕاناوەستێ، بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ: وەك چۆن هەموو کات ملت لەگەڵتە، ئەو چارەنووسەی خۆت و کردەوەی خۆشت، هەموو دەمێك لەگەڵتە.

ب - یاخود مەبەست پێی ئەوەیە، کە وەك چۆن هەندێك کەس ئەگەر ویستبێتیان، بیناسنەوە، نووسراوێکیان بە ملی هەڵواسیوە، کە ئێستاش هەروایە و کەسێك لە وڵاتێك دەچێ بۆ وڵاتێکی دیکە، نووسراو و نیشانەیەك دەخاتە ملی، یاخود بەرانبەرەکە دەیخاتە ملی کە من فلان کەسم! بۆ ئەوەی بیناسن و پێشوازیی بکەن.

ج - یاخود خوای پەروەردگار ویستوویەتی وێنایان بکات لە شێوەی ئاژەڵێکدا، کە ئاژەڵ هەندێك جار ملیان، یاخود شوێنێکیان نیشانە کردوە، بۆ ئەوەی تێکەڵ نەبێ، لەگەڵ ئەوانی دیکەدا.

ڕاستیی دووەم: مرۆڤ ڕۆژی دوایی بە ژمێردراویی و تۆمارکراویی، کردەوەکانی خۆی دەبینێتەوە، کردەوەکانی هەم بە ژمێردراویی و هەم بە تۆمارکراویی، لەبەرچاوی دەبن، کە ئەوەش ڕاستییەکە زانستی ئێستا زیاتر دەتوانێ لێمان حاڵی بکات، دوای ئەوەی تەکنولۆجیای کۆنترۆڵکردن و تۆمارکردنی دەنگ و ڕەنگ و هەڵس و کەوتەکانی مرۆڤەکان، زۆر بەرە و پێشەوە چووە، ئێستا زۆر چاك دەزانین کە کردەوەکان چۆن بە تۆمارکراویی

بەردەسـت دەکـەون، مـەرج نیـە تەنیـا بنـووسرێ: فڵانـە ڕۆژە فـڵان کـردەوەت کـرد، بەڵکـو هـەر کردەوەکـە خـۆی تۆمـار دەکـرێ، بـە دەنـگ و وێنـەوە.

ڕاسـتی سـێیەم: مـرۆڤ خـۆی بەسـە کـە کـردەوەکانی بژمێـرێ، چونکـە بـۆی سـەرژمێر کـراون و کۆنترۆڵکـراون و، بـۆی تۆمـار کـراون، واتـە: زۆر بـاش دەخرێنـە بەرچـاوی.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ ٱقۡرَأۡ كِتَٰبَكَ ﴾، مەبەسـت ئەوەیـە: ئـەی مـرۆڤ! کـردەوەکانی خـۆت بـۆ خـۆت بخوێنـەوە، واتـە: سـتەمت لێنەکـراوە، خـۆت چیـت کـردوە، ئـەوە تۆمارکـراوە، ئـەوە نـووسراوی خۆتـە کـە کـردەوەکانی خـۆتی تێـدان، کـە بـە ویسـتی ئازادانـەی خـۆت، ئەنجامـت داون و، سـەرەنجام ئـەو کـردەوەو هەڵوێسـتانەت کـە تۆمارکـراون، چارەنووسـی تـۆ و سـەرەنجامی تـۆ و قـەدەری تۆیـان لـە نێـو خۆیـان وەرگرتـوە، کەواتـە: ئەگـەر خێـرە، سـوپاس و ستایشـی خـوا بکـە و، ئەگـەر شـەڕە، تەنیـا لۆمـەی خـۆت بکـە، چونکـە چیـت کـردوە و چۆنـت کـردوە، بـەو شـێوەیە بـۆت تۆمارکـراون.

## مەسەلەی پێنجەم:

**هەر کەس ڕێی ڕاست بگرێ بە قازانجی خۆیەتی و، هەر کەس گومڕا بێ خۆی زیانبارە و، هیچ کەس کۆڵی گوناهی کەس هەڵناگرێ و، بەبێ ناردنی پێغەمبەرانیش خوا ﷻ سزای کۆمەڵگاکان نادات، نە لە دنیا و نە لە دوارۆژدا:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ مَّنِ ٱهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِى لِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا ۚ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ۗ وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا ﴿١٥﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿ مَّنِ ٱهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِى لِنَفْسِهِۦ ﴾، هەر کەس ڕێی ڕاستی گرت، ئەوە بە سوودی خۆی ڕێی ڕاستی گرتوە، ئەمە مانای ڕستەی پێشێ ڕوون دەکاتەوە، کە خوا ﷻ فەرمووی: ﴿ وَكُلَّ إِنسَٰنٍ أَلْزَمْنَٰهُ طَٰٓئِرَهُۥ فِى عُنُقِهِۦ ﴾، کەواتە: (**طَائِرُ الهِدَايَةِ نَافِعٌ لِصَاحِبِهِ، وَطَائِرُ الضَّلَالِ ضُرٌّ لِصَاحِبِهِ**)، باڵندەی ڕێی ڕاستگرتن، بۆ خاوەنەکەی بە سوودە و، باڵندەی گومڕا بوون، بۆ خاوەنەکەی زیانبەخشە، مەبەست لە (**طَائِر**) باڵندەیە، بەڵام لێرەدا مەبەست پێی ئەوەیە: ئەو کردەوەی کە ئینسان ئەنجامی دەدات، چارەنووسی دیاریی دەکات، عەرەبەکان عادەتیان وابووە، ئەگەرو ویستبایان سەفەرێك بکەن، باڵندەیەکیان هەڵدەفڕاند، ئەگەر بەلای ڕاستدا ڕۆیشتبایە دەیانگوت: (**تیامنوا**) کارەکەمان بەرەو خێر و خۆشیی و بەرەکەتە، با سەفەرەکەمان بکەین، بەڵام ئەگەر بەلای چەپدا ڕۆیشتبایە، دەیانگوت: (**تشاءموا**) کارەکەمان بەرەو نەگبەتیی و بێ خێرییە، با سەفەرەکەمان نەکەین.

ئنجا لەوەوە سەرەنجام و چارەنووسی مرۆڤیان ناوناوە: باڵندە (**طائر**)، بۆیە هەندێك لە زانایان دەڵێن: لێرەدا مەبەست لە (**طائر**) کردەوەیە، چونکە کردەوەکانی مرۆڤن، کە چارەنووس و سەرەنجامی مرۆڤ دیاریی دەکەن.

گرنگ ئەویە خوا ﷻ لێرەدا، وەك ڕاستییەك دەفەرموێ: هەر کەسێك ڕێی ڕاست بگرێ بە قازانجی خۆیەتی.

٢)- ﴿ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا ﴾، هەروەوها هەر کەسێك گومڕا بێ، بە زیانی خۆی گومڕا بووە، (**ضَلال**) واتە: سەرگەردان بوون و، ڕێی ڕاست ونکردن و، ون بوون لە ڕێی ڕاست، چونکە

(ضَلَّ) واتە: ون بوو، (ضَلَّ الإِنْسَانُ عَنِ الطَّرِيقِ) واتە: مرۆڤ لە ڕێیەکە ون بووە، بەڵام (ضَلَّ الطَّرِيقَ) واتە: ڕێیەکەی ون کرد، کەواتە: (ضَلَّ) هەم بە لازیم هاتوە، وەك: (ضَلَّ البَعِيرُ)، واتە: حوشترەکە ون بوو، (ضَلَّ الإِنْسَانُ) واتە: مرۆڤەکە ون بوو، بەڵام (ضَلَّ البَعِيرَ أَوْ ضَلَّ الطَّرِيقَ) واتە: حوشترەکەی ون کرد، یان: ڕێیەکەی بزر کرد، ئەوە (مُتَعَدِّي)یە، کە لێرەدا دەفەرموێ: (وَمَن ضَلَّ) هەر کەسێك ون بوو (فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا)، ئەوە بە زیانی خۆی ون دەبێ لەوڕێیەو، بەزیانی خۆی گومڕاو سەرگەردان دەبێ، وشەی (ضَلَّ) بە مانا (قاصر ولازم)ەکە بەکارهاتوە.

٣)- ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ﴾، هیچ نەفسێکی گوناهباری گوناه هەڵگر، گوناهی نەفسێکی دیکە هەڵناگرێ.

(وَلَا تَزِرُ)، واتـە: (وَلاَ تَحْمِـلُ)، هەڵناگـرێ (وَازِرَةٌ) واتـە: (الآثِمَـةُ، الحَامِلَـةُ للذُّنُـوب)، کەسـێك کـە گوناهـی هەڵگرتـوون، (وِزْرَ أُخْرَىٰ)، واتـە: (ثِقْلَ نَفْـس أُخْرَى)، گوناهو قورسـایی نەفسـێکی دیکـە هەڵناگـرێ، یـانی: کـەس گوناهـی کـەس لـە کۆڵـێ نـاکات، یەکێـك بـۆی هەیـە بڵـێ: ئـەدی بۆچـی خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿وَلَيَحْمِلُنَّ أَثْقَالَهُمْ وَأَثْقَالًا مَّعَ أَثْقَالِهِمْ﴾ **العنكبوت: ١٣**، واتـە: قورسـاییەکانی خۆیـان و قورسـاییانی دیکـەش لەگـەڵ قورسـاییەکانی خۆیـان هەڵدەگـرن؟

دوایی وەڵامی ئەو پرسیار و ئیشکالە دەدەینەوە.

بـەڵام مانـای ڕاسـتی ئـەم ڕسـتە قورئانییـە، ئاوایـە: خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: هیـچ کـەس کۆڵـی گوناهـی کەسـێکی دیکـە، لـە کۆڵـی گوناهـی خـۆی نانـێ، کـە ئـەو کۆڵـە گوناهـە، لـە کـۆڵ ئـەو بکاتـەوە.

٤)- ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا﴾، ئێمە سزادەر و ئازاردەریش نین، تاکو پێغەمبەر نەنێرین:

أ ـ واتە: لە دنیادا کۆمەڵگاکان سزا نادەین، تاکو پێغەمبەریان بۆ نەنێرین، ئەوە واتایەکی.

ب ـ یاخود لە دواڕۆژدا سزایان نادەین، ئەگەر بانگەوازی پێغەمبەرێکیان پێ نەگەیشتبێ بەڕاست و دروستی، لە ڕۆژی قیامەتدا، ئەوانە ئەهلی سزا و ئەشکەنجە نابن، چونکە بەڵگەیان لەسەر تەواو نەکراوە.

ج ـ یاخود مەبەست پێی دنیا و دواڕۆژە، هەردووکیان وێکڕا.

## كورته باسێك

## چوار ڕاستیی گەورە و گرنگ

**ڕاستیی یەكەم:** ڕێی ڕاست گرتنی مرۆڤ، بەویستی خۆیەتی و، لە بەرژەوەندیی خۆشیەتی ! ﴿ مَّنِ ٱهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِى لِنَفْسِهِۦ ﴾، كەواتە: ڕێی ڕاست گرتنی مرۆڤ، بەدەست خۆیەتی، بەویستی خۆیەتی، خوا كردەوەكەی بۆ خودی مرۆڤ گێڕاوەتەوە ( مَّنِ ٱهْتَدَىٰ )، كە بە كردار (**فعل**)ی ڕابردوو هێناویەتی: ( مَّنِ ٱهْتَدَىٰ ) هەر كەسێك ڕێی ڕاستی گرت، (فَإِنَّمَا يَهْتَدِى ) كە بە ئەمجار بە كرداری ئێستا (**مضارع**) ئەوە ڕێی ڕاست دەگرێ، (لِنَفْسِهِۦ) بە قازانجی خۆی، كەواتە: مرۆڤ بەویستی خۆیەتی، ئەگەر ڕێی ڕاست بگرێ و، لە بەرژەوەندیی خۆشیەتی، ئەگەر ڕێی ڕاست بگرێ.

ئەمە ڕاستییەكە خوا ﷻ لێرەو لە چەند شوێنی دیكەش ئەو ڕاستییەی ڕاگەیاندوە، هەم لە سووڕەتی (**الزمر**)دا، هەم لە كۆتایی سووڕەتی (**النمل**)دا هاتووەو، لە گەلێك لە سووڕەتەكاندا خوا ﷻ ئەو ڕاستییەی ڕاگەیاندوە كە مرۆڤ ئەگەر ڕێی ڕاست بگرێ، خۆی بەهرەمەندە لەو ڕێی ڕاست گرتنە و، بە ویستی خۆشی ئەو ڕێیە ڕاستە دەگرێ، هەروەها ئەگەر ڕێی چەوت بگرێ، خۆی زەرەرمەندە لەو ڕێی چەوت گرتنە و، بە ویستی خۆشی ئەو ڕێیە چەوتە دەگرێ.

**ڕاستیی دووەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا ﴾، گومڕا بوونی مرۆڤ بەدەست خۆیەتی و زیانباریش بەس خۆیەتی، ﴿ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا ﴾، دیسان (ضَلَّ ) كردارێكی ڕابردووە، فاعیلەكەی كێیە؟ (وَمَن ضَلَّ ) هەر كەسێك گومڕا بێ، یانی: خۆی گومڕا بێ، (فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا )، دیسان (يَضِلُّ) بە كرداری (**مضارع**) هێناویەتی، (فاعل)ەكەی دیارە كە ئەو (**مَن**) ەیە، كە پێشكەوتوە، دیسان بۆ خودی مرۆڤەكە دەچێتەوە، واتە: ئەگەر گومڕا بوو، خۆی خۆی گومڕا دەكات، ئنجا: (يَضِلُّ عَلَيْهَا ) گومڕا بوونەكەش بە زیانی خۆی تەواو دەبێ.

**ڕاستیی سێیەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ﴾، كەس گوناهی كەس هەڵناگرێ، ئێمە لە تەفسیری سووڕەتی (**النحل**)دا، بە درێژیی لەسەر ئەو مەسەلەیە قسەمان كرد، بۆیە لێرە زۆر بە كورتیی لێی دەدوێین، لەوێ لە باسێكی تایبەتدا تیشكی باشمان خستۆتە سەر:

خوا لە سوورەتی (**العنكبوت**)دا دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّبِعُواْ سَبِيلَنَا وَلْنَحْمِلْ خَطَٰيَٰكُمْ وَمَا هُم بِحَٰمِلِينَ مِنْ خَطَٰيَٰهُم مِّن شَىْءٍ إِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ ﴿١٢﴾ وَلَيَحْمِلُنَّ أَثْقَالَهُمْ وَأَثْقَالًا مَّعَ أَثْقَالِهِمْ وَلَيُسْـَٔلُنَّ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ عَمَّا كَانُواْ يَفْتَرُونَ ﴿١٣﴾ ﴾.

واتە: ئەوانەی بێبڕوان، بەوانەی بڕوایان هێناوە، گوتیان: شوێن ڕێبازەکەی ئێمە بکەون و، گوناهەکانتان هەڵدەگرین {لە جیاتی ئێوە، کۆڵی گوناهی ئێوە لە کۆڵێ دەکەین} بەڵام ئەوان هیچ بەشێك لە گوناهەکانیان هەڵناگرن و بە دڵنیایی ئەوان درۆزنن و، بە دڵنیایی ئەوان {ئەو سەرلێشێوێنەرانە} قورساییەکانی خۆیان {کە مەبەست پێی گوناهەکانە، چونکە گوناح قورسە و، پشتی ئینسان دەچەمێنێ و، باری شانی گران دەکات}، هەڵدەگرن و قورساییان لەگەڵ قورساییەکانی خۆیشیان، {واتە: قورسایی ئەوانەش کە گومڕایان دەکەن، بۆیان دەکرێتە سەربار} و لە ڕۆژی قیامەتیش دا لێیان دەپرسرێتەوە لەو بارەوە کە هەڵیان دەبەست.

ئنجا ئایا چۆن دەزانین کە دەفەرموێ: ﴿ وَأَثْقَالًا مَّعَ أَثْقَالِهِمْ ﴾، واتە: گوناهی ئەوانەش کە گومڕایان کردوون؟ لە سوورەتی (**النحل**)دا خوا ﷻ ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە: ﴿ لِيَحْمِلُوٓاْ أَوْزَارَهُمْ كَامِلَةً يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَمِنْ أَوْزَارِ ٱلَّذِينَ يُضِلُّونَهُم بِغَيْرِ عِلْمٍ أَلَا سَآءَ مَا يَزِرُونَ ﴿٢٥﴾ ﴾.

واتە: با لە ڕۆژی قیامەتدا گوناهەکانی خۆیان بە تەواویی هەڵبگرن (لە کۆڵی بنێن) و بەشێك لە گوناهی ئەوانەش کە گومڕایان دەکەن، بەبێ زانیاریی، کە ئەوەش خراپترین شتە هەڵیانگرتوە.

کەواتە: گوناهی گومڕا کراوەکان لە کۆڵ ئەوان ناکەنەوە، هەموویان بۆ لە کۆڵ بنێن، بەڵکو بایی ئەوەندە گوناهیان لە کۆڵ دەنێن، کە بوونە هۆی گومڕا کردنیان، بایی ئەوەندە گوناهی ئەوانیشیان دەکەوێتە سەر شان، واتە: لێیان هەڵناگرن، کە لە کۆڵیان بکەنەوە، بەڵام بە هۆی گومڕاکردنیانەوە بۆیان، گوناهی دیکەی ئەوان هەڵدەگرن، بەبێ ئەوەی لە هی ئەوان کەم بێتەوە، وەك لە سوورەتی (**النحل**)دا بە درێژیی لەوبارەوە قسەمان کرد.

**ڕاستیی چوارەم:** خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا ﴾، ئێمە سزادەرنین بۆ خەڵك و كۆمەڵگاكان تاكو پێغەمبەر نەنێرین، كە دەفەرموێ: سزا دەرنین واتە:

١- لە دنیادا خوا كۆمەڵگایەك لەبەین نابات، تاكو پێغەمبەرێكیان بۆ نەنێرێ، كە ئاگاداریان بكاتەوە بیانترسێنێ و، هۆشیاریان بكاتەوە.

٢- یاخود: كۆمەڵگایەك كە پێغەمبەریان بۆ نەچوو بێ، لە دوارۆژدا خوا سزایان نادات بیانباتە دۆزەخ، مادام كەسێك نەچوو بێ بەڵگەیان لەسەر تەواو بكات.

٣- كە من ئەم ڕایەی سێیەمم پێ ڕاسترە، یانی: هەم لە دنیادا و، هەم لە دوارۆژدا، خوا سزای مرۆڤەكان نادات، ئەگەر پێغەمبەری بۆ نەناردبن، بەو واتایە كە پەیام و بانگەوازی ئەو پێغەمبەرەیان پێ نەگەیبێ، چونكە خوا ﷻ لە سوورەتی (**فاطر**) ئایەتی (٢٤)دا دەفەرموێ: ﴿ وَإِن مِّنْ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٌ ﴾، واتە: هیچ كۆمەڵگایەك (ی گەورە) نەبووە، مەگەر ئاگاداركەرەوەیەكی تێدا ڕابردوە.

بەڵام جاری وا هەیە پەیام و ڕێبازی ئەو پێغەمبەرە بەو خەڵكە نەگەیشتوە، ئنجا ئەگەر پێیان نەگەیبێ، مانای وایە خەڵكەكە ئەهلی (سزا) نابن و سزا نادرێن، نە لە دنیا و نە لە دوارۆژدا.

ئەمەش بەڵگەی ڕاستیی ئەو ڕایەی جەماوەری زانایانە كە دەڵێن: بەبێ بانگكردن و ناردنی پەیامی خوا، سزادان نیە، نەك وەك موعتەزیلە و ماتوریدییەكان، دەڵێن: عەقڵ بەسە بۆ ئەوەی مرۆڤ لێ پرسینەوەی لەگەڵدا بكرێ و، سزا بدرێ، هەر چەندە خوا پێغەمبەریشی نەناردبێ، چونكە عەقڵی پێداون!

بەڵام ڕای زۆربەی زانایان ڕاستە كە دەڵێن: نا، بەبێ وەحیی و پەیامی خوا، سزاو لێپرسینەوە ڕوو لە مرۆڤەكان ناكات و، ئایەتی ژمارە: (١٦٥) لە سوورەتی (**النساء**) یش لەو بارەوە، نوختە دەخاتە سەر پیت، دوای ئەوەی باسی ژمارەیەك پێغەمبەران دەكات عليهم السلام و ناوی دوازدە (١٢) لە پێغەمبەران دێنێ، ئنجا دەفەرموێ: پێغەمبەرانێكی موژدەدەرو ترسێنەرن، تاكو خەڵك دوای (هاتنی) پێغەمبەران بەڵگەی لە سەر خوا نەبێ، ئەمەش دەقی ئایەتەكانە لەوبارەوە: ﴿ إِنَّا أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ كَمَا أَوْحَيْنَا إِلَىٰ نُوحٍ وَالنَّبِيِّينَ مِن بَعْدِهِ ۚ وَأَوْحَيْنَا إِلَىٰ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالْأَسْبَاطِ وَعِيسَىٰ وَأَيُّوبَ وَيُونُسَ وَهَارُونَ وَسُلَيْمَانَ ۚ وَآتَيْنَا دَاوُودَ زَبُورًا ﴿١٦٣﴾ وَرُسُلًا قَدْ قَصَصْنَاهُمْ عَلَيْكَ مِن قَبْلُ وَرُسُلًا لَّمْ نَقْصُصْهُمْ عَلَيْكَ ۚ وَكَلَّمَ اللَّهُ مُوسَىٰ تَكْلِيمًا ﴿١٦٤﴾ رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى

ٱللَّهِ حُجَّةُۢ بَعۡدَ ٱلرُّسُلِ ﴾، وەك دەبینین: دوای ناوهێنانی ژمارەیەك (١٢) لە پێغەمبەران، فەرموویەتی: پێغەمبەرانێکی دڵخۆشکەر و ترسێنەرن، مـوژدەدەر و وریاکەرەوەن، تاکو خەڵك لەدوای پێغەمبەران بەڵگەیان نەبێ لەسەر خوا، واتە: ئەگەر خەڵك پەیامی پێغەمبەرانیان پێ نەگات، بەڵگەیان دەبێ و بیانوویان دەبێ، بۆیە خوا پێغەمبەرانی ناردوون تاکو خەڵك بیانوو بڕاو بکەن و بەڵگەیان لەسەر تەواو بکەن، کەواتە: بەبێ گەیشتنی پەیامی پێغەمبەران، کۆمەڵگاکان بەرپرسیار نابن و خوای کارزان و میهرەبان سزایان نادات.

کەواتە: لە ڕۆژگاری ئێستای ئێمەدا ئەگەر لە وڵاتی (چین)، (هیند)، (ئەفریقیا) و لە سەرووی دنیا و لە خوارووی دنیا، لە گۆشە و کەنارەکانی دنیا، خەڵکێك هەبن پەیامی پێغەمبەری کۆتایی (محمد ﷺ) یان پێ نەگەیشتبێ، یاخود پێیان گەیبێ، بەڵام بە پێچەوانەوە پێیان گەیبێ، بۆ وێنە: قورئان مایەی ڕەحمەتە، ئەوان وەک (زەحمەت) لێی حاڵی بوون، پێغەمبەر ﷺ سەراپای خێر و خۆشیی بووە، کەچی ئەوان وابزانن: کە بۆ شەڕ و کوشتار هاتوە، پێغەمبەری خوا ﷺ تەواوکەری ڕەوشتە بەرزەکان بووە، کەچی ئەوان بە پێچەوانەی ئەوە لێی تێبگەن، وەك ناحەزانی کە پێناسەی دەکەن، وەك لە واقیعی بێسەر و بەری مسوڵمانانیشدا دەیبینن، ئایا ئەو خەڵك و کۆمەڵگایانە کە لە ئیسلام تێنەگەیشتوون، یاخود لینگەو قووچ و بە بەراوەژوو و بە پێچەوانەوە لێی حاڵی بوون، ئایا خوا ﷻ سزایان دەدات لەسەر ئەوەی بە دوای ئیسلامێك ناکەون کە پێی ئاشنا نین، یاخود بە پێچەوانەوە، لێی حاڵی بوون؟

بە پێی ئەم ئایەتە بێ، نابێ خوا ﷻ سزایان بدات لە دواڕۆژدا.

ئنجا وشەی (**كَافر**) یش لە (**كَفْر**) وە هاتوە، واتە: (**سَتر**)، (**كافِر**) یانی: (**سَاتِر**) داپۆشەر، (**كافر**) کە بە (**كُفَّار**) و (**كَافِرُون**) کۆدەکرێتەوە، واتە: کەسێك کە هەقی پێگەیشتوە و داپیۆشیوەو ڕەفزی کردوە، بۆیە کەسێك هەقی پێ نەگەیبێ و هیچی دانەپۆشیبێ و هیچی ڕەفز نەکردبێ، وشەی (**كافر**)ی بۆ بەکار نایەت، بۆیەش لەو مەوسووعەیەدا کە لە سجنی ئەمریکاییەکاندا نووسیومە: (**الإسلام كما يتجلى في كتاب الله**) بە تایبەت لە بەرگی هەشتەمدا لە چاپی یەکەمیدا و لە کتێبی دوازدەیەمدا لە چاپی دووەمیدا باسمکردوە، کە خەڵك تەنیا دابەش ناکرێ بۆ کافر و مسوڵمان، بەڵکو بەشێکی دیکەش هەیە کە پێیان دەگوترێ: ئەهلی فەترە (**أهل الفترة**) یان (**الفتريّون**)، ئەویش ئەوانەن کە: مسوڵمان نین هەقیان ناسیبێ و بڕوایان پێ هێنابێ و، کافریش نین هەقیان پێگەیبێ و

ڕەفزیان کردبێ، بەڵکو لە بنەڕەتەوە هەقیان پێنەگەیشتوە و پێی ئاشنا نەبوون، بۆیە ئەوانە بە {ئەهلی فەترە}دا دادەنرێن، وەك لە تەفسیری سوورەتی: **(المائدة)** لە بەرگی چواری ئەم تەفسیرە (تەفسیری قورئانی بەرز و بەپێز) دا بە درێژیی تەفسیری ئەو ئایەتەمان کردوە، کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ قَدۡ جَآءَكُمۡ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمۡ عَلَىٰ فَتۡرَةٖ مِّنَ ٱلرُّسُلِ ﴾: ١٩، واتە: ئەی خاوەن کتێبینە! بە دڵنیایی پێغەمبەرەکەمان دوای پچڕانێك لە ناردنی پێغەمبەران، هاتەلاتان.... **(على فترة)**[١] یانی: **(على انقطاع)** کە مەبەست پێی ئەو ماوە پچڕاوە بووە کە لە نێوان عیساو عليه السلام موحەممەددا ﷺ دا بووە (١- ٦١٠)[٢] ساڵ بووە و، ئەو ماوەیە درێژترین ماوە بووە لە نێوان هاتنی دوو پێغەمبەراندا، کە خوا زانا وتوانا بە (فترة) ناوی هێناوە، ئنجا وەك چۆن ئەوانەی کە لەو کاتەدا ژیاون: ئەهلی فەترەن، کە ئەوە ڕای زۆرینەی زانایانە و، باب و دایکی پێغەمبەر ﷺ و خزمە نیزیکەکانیشی، هەرچەندە لە هەندێك فەرموودان دا هاتوە، کە ئەوانە دەبێ ئەهلی سزا بن، بەڵام بەپێی ئەو ئایەتانە نابێ ئەوانیش ئەهلی سزابن، چونکە ئەهلی فەترەن، واتە: ئەو کاتە پەیامی پێغەمبەرێك لە ئارادا نەبووە، تاکو بڕوای پێ بێنن، بەهەمان شێوە: ئێستاش هەر کەسێك پەیامی پێغەمبەری خاتەمی وەك خۆی پێ نەگەیشتبێ، یان هەر پێی نەگەیشتبێ، دیسان بە کافر لە قەڵەم نادرێ، چونکە هەقێکی پێ نەگەیشتوە، کە ڕەفزی کرد بێ و شاردبێتیەوە و وشەی (کافر) بیگرێتەوە!



---

(١) على فترة: على انقطاع، فَتَرَ: انقطع.

(٢) ئەگەر ڕاست بێ عیسا عليه السلام لە ساڵی (١)ی زایینی لە دایك بووبێ، هەتا ساڵی (٦١٠)ی زایینی کە موحەممەد ﷺ لە تەمەنی (٤٠) ساڵیدا وەحی بۆ هاتوە و، ئەگەر بەلای کەمەوە (٣٠) ساڵ تەمەنی پێش پێغەمبەرایەتیی عیساشی لێ کەم بکەینەوە (٦١٠ - ٣٠ = ٥٨٠) ساڵ ماوەی نێوان عیسا و موحەممەد بووە.

## مەسەلەی شەشەم:

**خوا ڕایدەگەیەنێ: هەر کات ویستمان ئاوەدانییەك بفەوتێنین، فەرمان بە حوكمڕانە خۆشگوزەرانەكانی دەكەین چاكە بكەن، كەچی ئەوان لادان و خراپەی تێدا دەكەن، ئیدی یاسا و بڕیاری (خوا)ی بەسەردا دەچەسپێ و كاول دەكرێ:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَآ أَرَدۡنَآ أَن نُّهۡلِكَ قَرۡيَةً أَمَرۡنَا مُتۡرَفِيهَا فَفَسَقُواْ فِيهَا فَحَقَّ عَلَيۡهَا ٱلۡقَوۡلُ فَدَمَّرۡنَٰهَا تَدۡمِيرٗا ١٦ ﴾.

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ وَإِذَآ أَرَدۡنَآ أَن نُّهۡلِكَ قَرۡيَةً ﴾، هەر كاتێك ویستمان ئاوەدانییەك بفەوتێنین، واتە: خەڵكی ئاوەدانییەك بفەوتێنین و، لە نێو بەرین، كە مەبەست لێرەدا هاتنەدی دەرەنجامەكانە، دوای هاتنە دی پێشەكییەكان (**ترتّب النتائج على المقدمات**) ئنجا خوای دادگەر كاولكردن و فەوتاندنی كۆمەڵگایەكانمان وا بۆ وێنا (**تصوير**)، وا بۆمان دەكات كە پێشتر بڕیاری بۆ دابن، بەڵام بێگومان خوا ﷻ لە سەرەتاوە بڕیار نادات بۆ هیچ كۆمەڵگایەك كە لە نێوی بەرێ، بەڵكو ئەوە خۆیانن یاساو بڕیاری خوا ﷻ بەسەر خۆیان دەچەسپێنن، بەڵام لێرە خوای كاربەجێ هاتنەدی ئەو یاسایەی خۆی كە بریتیە لە: هاتنە دی دەرەنجامەكان دوای ئامادەكردنی پێشەكییەكان، كە پێشەكییەكان مرۆڤەكان ئامادەیان دەكەن، بەڵام دوایی دەرەنجامەكامان بیانەوێ و نەیانەوێ، دێنەدی، وەك چۆن كەسێك ژەهر دەخوات، دوایی كارتێكردن و شوێنەوارەكانی خواردنی ئەو ژەهرە لە جەستەیدا پەیدا دەبن، مرۆڤەكانیش كە لادان و گوناهو تاوان دەكەن، سەرەنجام ئاوەدانییەكانیان كاول دەبن، ئنجا چونكە ئەمە بەپێی یاسای خوایە، خوا ﷻ لە شێوەیەكدا وێنای كردوە، كە پێشتر بڕیاری بۆ دابن، بەڵام بێگومان تەنیا مەبەست ئەوەیە، كە بە پێی یاسای خوا ﷻ ئەوە دێتەدی، ئەو دەرەنجامە تاڵە، لەو پێشەكییە خراپانە پەیدا دەبێ.

خوا دەفەرموێ: هەر كاتێك ویستمان خەڵكی ئاوەدانییەك بفەوتێنین:

٢)- ﴿ أَمَرۡنَا مُتۡرَفِيهَا ﴾، فەرمان دەكەین بە حوكمڕانە خۆشگوزەرانەكان، واتە: بە حوكمڕان و كاربەدەستە خۆشگوزەرانەكانی.

(**المُتَرَفُ اسْمُ مَفْعُولٍ مِنْ: أَتْرَفَهُ إِذَا أَعْطَاهُ التُّرْفَةَ: وَهِيَ النِّعْمَةُ**)، واتە: (**مُتْرَف**) ناوی بەركارە لە (**أَتْرَفَهُ**) واتە: تورفەی پێدا، (**تُرْفَة**)ش، واتە: نیعمەت، كەواتە: (**مُتْرَف**) واتە: **خوا** پێداو،

پێ بەخشراو، یانی: فەرمان بە پێ بەخشراوەکان دەکەین، ئایا خوا ﷻ فەرمان بە چی دەکات؟ بێگومان بە چاکە و تاعەت و چاکسازیی و ئاوەدانیی دەکات، بۆیە خوا ﷻ بە پێویستی نەزانیوە باسی بکات فەرمانمان پێکردن بە چی؟ چونکە هەرشتێکی دیاریی کردبایە، وەك (**الزمخشري**) دەربارەی ئایەتەکەی پێشتر گوتی: هەر شتێکی دیاریی بکردایە، هەر سنووردار دەبوو، بەڵام لێرەدا، واتە: فەرمانمان پێکردن بە ئیمان، بە تەقوا، بە فەرمانبەریی، بە چاکەکاریی، بە خێر و خۆشیی، بە ئاوەدانیی، .... هتد، فەرمان دەکەین بە حوکمڕانە خۆشگوزەرانەکانی، کە هەچی چاکەیە بیکەن.

٣)- ﴿ فَفَسَقُواْ فِيهَا ﴾، کەچی ئەوان لادانیان تێدا کرد، چونکە هەندێك لە زانایان گوتوویانە: ﴿ أَمَرۡنَا مُتۡرَفِيهَا فَفَسَقُواْ فِيهَا ﴾، واتە: فەرمانمان کرد بە خۆشگوزەرانەکانی، ئەوانیش لادانیان تێداکرد!! بەڵام بە پێی ئەوە بێ، دەبێ بگوترێ: خوا فەرمانی پێکردن بە فیسق و ئەوانیش فیسقیان تێدا ئەنجام داوە! ئنجا جەبرییەکان ئەم ئایەتە وا تەفسیر دەکەن، دەڵێن: خوا ئەو خەڵکەی وا لێکردوە، کە خراپە بکەن، یانی: خوا ئەو خەڵکەی وا لێکردوە: خراپە بکات و ئەوانیش نەیانتوانی لە فەرمانی خوا دەربچن و لادانیان تێداکرد، چونکە لێرەدا مەبەست لە (**أمرنا**) (**الأمر التكويني**)یەو، نەیانتوانی لە فەرمانی قەدەریی و تەکوینی خوا ﷻ لابدەن و خراپەیان کردوە، وەك چۆن خوا خراپەی لێ ویستوون، ئەوان بەو شێوەیە ئەنجامیان دا وەو، سەرەنجام خوا لە نێوی بردوون و خواش ئەوپەڕی کارزان و دادگەرە!

بەڵام لە ڕاستییدا نە ئایەتەکە ئەوە دەگەیەنێ و نە ئەوەش لەگەڵ قورئاندا دەگونجێ، چونکە خوا ﷻ لە سوورەتی: (**الأعراف**) (٢٨)دا، کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا فَعَلُواْ فَٰحِشَةً قَالُواْ وَجَدۡنَا عَلَيۡهَآ ءَابَآءَنَا وَٱللَّهُ أَمَرَنَا بِهَا ﴾، ئەگەر (کافرەکان) خراپەیەکیان کرد دەڵێن: باب و باپیرانمان لەسەری بینیوە و خواش فەرمانی پێکردوە! بەڵام خوای کارزان ئەو قسەیان کە ڕاست نیە، ڕەفزی دەکات و دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَأۡمُرُ بِٱلۡفَحۡشَآءِ ﴾، واتە: (ئەی موحەممەد!) بڵێ: خوا فەرمان بە شتی ناقۆڵا و خراپ ناکات، کە دەڵێن: باب و باپیرانمان لەسەر ئەوە بینی، لەوەدا ڕاست دەکەن، بەڵام ڕاست ناکەن خوا ﷻ فەرمانی پێ نەکردوە و، بێگومان خوا فەرمان بە هیچ شتی خراپ ناکات.

کەواتە: لێرەش مەبەست ئەوە نیە، کە خوا فەرمانی پێکردوون بەلادان، بەڵکو خوا فەرمانی پێکردوون بە چاکەکاریی، بەڵام ئەوان لادانیان تێدا کردوە.

(**فسق**) یش بە مانای دەرچوون و لادان (**خروج**)ە، (**الفِسْقُ: الخُرُوجُ مِنَ الطَّاعَة**).

٤)- ﴿فَحَقَّ عَلَيۡهَا ٱلۡقَوۡلُ﴾، سەرەنجام قسە لەسەری چەسپا، قسە، واتە: یاسای خوا، قەدەری خوا لەسەر ئەو ئاوەدانیی (**قرية**) یە کە خەڵکەکەی لادان و تاوانیان تێداکردوە: هاتەدی و چەسپا، چونکە هەر کەسێك خراپە بکات، دەبێ باج بدات و سزا ببینێ.

هەندێـك لـە زانایانیـش ئاوایـان تەفسـیر کـردوە: (فَحَقَّ عَلَيۡهَا ٱلۡقَوۡلُ: **أي ثَبَـتَ عَلَيْـهِ وعِيـدُ اللَّـهِ الَّـذِي أَبْلَغَـهُ مِـنْ خِـلاَلِ رُسُـلِهِ**)، هەڕەشـەی خـوا کـە لـە ڕێـی پێغەمبەرانیـەوە ڕایگەیانـدوە، ئـەو هەڕەشـەیان لەسـەر چەسـپا.

٥)- ﴿فَدَمَّرۡنَٰهَا تَدۡمِيرٗا ١٦﴾، بە کاولکردن کاولمان کرد، (**التَّدْمِيرُ: هَدْمُ البنَاءِ وَإِزَالَةُ أَثَرِهِ، وَهُوَ مُسْتَعَارٌ هُنَا للإِسْتِئْصال**)، (**تدمیر**) بە مانای ڕووخاندنی خانوویەك و لابردنی شوێنەوارەکەیەتی، کە لێرەدا مەبەست پێی بنبڕکردن و ڕیشەکێش کردنیانە.

## سێ هەڵوەستەی پێویست لە بەردەم ئەم ئایەتەدا:

**هەڵوەستەی یەکەم:** بێگومان خوا ﷻ نایەوێ لە خۆڕا وڵاتان کاول بکات، بەڵام ئەمە دەرخستنی دەرەنجامی یاسای خوایە، بەڵام ئەوەی کە دەبێ لە کۆتایی دا بێت، کە بریتیە لە کاولکردنەکە، خوا ﷻ لەبەر گرنگیی خستوویەتە پێشەوە، واتە: لە ئەسڵ دا بەم شێوەیە: حوکمڕان و بەرپرسانی کۆمەڵگایەکان خوا فەرمانی پێکردوون بە فەرمانبەریی، بەڵام حوکمڕانە خۆشگوزەرانەکان لادانیان تێدا کردوە و شایستەی ئەوە بوون کە سزای خوایان بەسەردا بچەسپێ و، سەرەنجام سزای خوایان بە سەردا چەسپاوە.

ئنجـا خـوا ﷻ ئـەوەی هەمـوو کـۆ کردۆتـەوە لـەوەدا کـە: ویسـتوویەتی لـە بەینیـان بـەرێ، بـەڵام بۆچـی ویسـتوویەتی لـە بەینیـان بـەرێ؟ چونکـە خۆیـان پێشـەکییەکەیان سـاز کـردوون، واتـە: خـوا سـەرەنجام و دەرەنجامـی پێـش خسـتوە لەبـەر گرنگیـی، ئەگـەر نـا لـە خـۆڕا خـوا ﷻ نایـەوێ هیـچ کۆمەڵگایـەك بفەوتێنـێ، وەك خـوا فەرمویـەتی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظۡلِمُ ٱلنَّاسَ شَيۡـٔٗا وَلَٰكِنَّ ٱلنَّاسَ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ٤٤﴾ **یونـس**، واتـە: خـوا هیـچ ئەندازەیـەك سـتەم لـە خەڵکـی نـاکات، بـەڵام خەڵـك خۆیـان سـتەم لـە خۆیـان دەکـەن، ئنجا ئەگـەر هـەر لەڕێـوە خـوا ﷻ بڕیـاری کاولکردنـی کۆمەڵگایـەکی دابـێ، بێگومـان ئـەوە سـتەمە! بـەڵام خـوا بـە ڕوون و ڕاشـکاویی فەرموویـەتی: ﴿وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّٰمٖ لِّلۡعَبِيدِ ٤٦﴾ **فصلـت**، واتـە: پـەروەردگارت بـۆ بەنـدەکانی سـتەمکار نیـە، بەڵکـو مرۆڤـەکان خۆیـان سـتەم لـە خۆیـان دەکـەن، بـە هـۆی ئـەوەوە کـە لـە ئەنجامـی لادان و تـاوان دا پێشـەکییەکان سـاز دەکـەن و، ئـەو پێشـەکییانەش

ئـەو دەرەنجامەیـان بـەدوادا دێ، وەك چـۆن كەسـێك ژەهـر بخـوات، بێگومـان ئـەو ژەهـرە لـە جەسـتەیدا دەبێتـە دەرد و نەخۆشـیی و بـە ئەنـدازەی زیـان گەیانـدنی ژەهرەكـە، زیانبـار دەبێ.

**هەڵوەستەی دووەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ أَمَرۡنَا ﴾، ئاشكرایە كە فەرمانپێكراو (**مأمور به**) ەكە قرتێنراوە،

**أ-** واتە: فەرمانمان پێكردن بەوەی كە شایستەی ئێمەیە:

(**أَمَرْنَاهُـمْ بِمَـا يَلِيقُ بنَـا أَنْ نَأْمُـرَ بِـهِ!**)، ئنجا ئایا چـی شایسـتەی خوایـە، فەرمانـی پـێ بـكات؟ بێگومــان: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ وَٱلۡإِحۡسَٰنِ وَإِيتَآيِٕ ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ ﴾ **النحـل: ٩٠**، واتــە: خـوا فەرمـان دەكات بـە دادگەریـی و چاكەكاریـی و بەخشـین بـە نیزیـكان....

**ب-** یاخود (**أَمَرْنَاهُمْ بالطَّاعَةِ، لكنَّهم فسقوا**)، فەرمانمان پێكردن بە فەرمانبەریی و بە چاكە، بەڵام ئەوان لادانیان تێدا كرد.

**ج-** (**الزَّمخْشَري**)، دەڵێ: ئەوەندەیان خراپە كرد، وەك ئەوەی فەرمانمان پێكردبن بە خراپە! ئەوەندەیان تاوان و لادان تێدا كرد، وەك ئەوەی لەلایەن ئێمە وە فەرمانیان بەوە پێكرابێ.

هەڵبەتـە بەپێـی سـیاقەكەش دیـارە كـە خـوا ﷻ فەرمان بـە خراپە نـاكات و. ئاشكراشـە هەموو قورئـان، بریتیـە لـە فەرمانكـردنی خـوا ﷻ بـە چاكـە و ڕێگریـی كردنی لـە خراپە.

**هەڵوەستەی سێیەم:** (**مُتْرَفيها**) خۆشگوزەرانەكانی، واتە: حوكمڕانە خۆشگوزەرانەكان، هۆكاری كاولكاریی وڵاتانن، كە ئەمەش ڕاستییەكی مێژوویيە و لە زۆر شوێنی قورئاندا، خوا ﷻ ئەو ڕاستییەی خستۆتە ڕوو، بۆ وێنە:

لـە سـوورەتی (**القصـص**) (٥٨)دا، دەفەرمـوێ: ﴿ وَكَمۡ أَهۡلَكۡنَا مِن قَرۡيَةِۭ بَطِرَتۡ مَعِيشَتَهَاۖ فَتِلۡكَ مَسَٰكِنُهُمۡ لَمۡ تُسۡكَن مِّنۢ بَعۡدِهِمۡ إِلَّا قَلِيلٗاۖ وَكُنَّا نَحۡنُ ٱلۡوَٰرِثِينَ ﴾، واتـە: زۆر ئاوەدانییـمان لەبەیـن بـردوون كـە لـە ژیـانی خۆیانـدا تووشـی بوغرایـی و لـە خۆبایـی بـوون بـوون، ئـەوە خانووبەرەكانیانـن لـەدوای وان، كەمێـك نەبـێ، نیشـتەجێ بوونیـان تێـدا نەكـرا، هـەر ئێمـەش بوویـن بـە میراتگریـان.

وشـەی (بَطِـرَتۡ) (**البَّطَـرُ: الأَشَرُ، وَهُـوَ شِـدَّةُ المَـرَحِ، وَأَبْطَـرَهُ المَـالُ، وبَطِـرْتَ عَيْشَـكَ، مثـل: رَشِـدَت أَمْـرَكَ**)، (**بَطَـر**) بریتیـە لـە زۆر دڵخـۆش بـوون و شـادمان بـوون و بوغـڕا بـوون،

دەگوترێ: (**أَبْطَرَهُ المَالُ**) ماڵ و سامانەکە وای لێکرد: زۆر بوغرِا و لە خۆبایی و خۆشحاڵ بێ، دەگوترێ: (**بَطِرْتَ عَيْشَكَ**)، تۆ لە ژیانەکەی خۆتدا زۆر شادمان و بوغرِا بووی، وەك (**رشدت أمرك**) واتە: کارەکەت کارێکی سەر ڕاستانە بوو.

ئنجا کە (**بَطَر**)ی بە (**أَشَرْ**) لێکداوەتەوە، (**أشِرَ أَشَراً فَهُوَ أَشِرٌ: بَطرَ، وَكَفَرَ النِّعْمَةِ، فَلَم يَشْكُرها**) واتە: چاکەی خوای نادیدە گرت و نا سوپاس بوو و سوپاسی لەسەر نەکرد.

ئنجا ڕستەی: (**بَطِرَتْ معيشتها: أي كفرت نعمة معيشتِها الرّافهة الآمنة، فلم تَقُمْ بحق شكرها، أو تمرَّدت وطغت في معيشتها، والبَطَر: الأَشَرُ وقِلَّة احتمال النعمة والطغيان بها**)، کەواتە: (**بطرت معيشتها**) دوو واتای هەن:

**یەکەم:** نیعمەتی ئەو ژیانە پڕ عەیش و نۆش و هێمن و ئارامەی نا سوپاس کرد و، نا دیدەی گرت و سوپاسگوزاریی لە بەرانبەردا نەکرد.

**دووەم:** یاخیی بوو و لە خۆبایی بوو لە ژیانەکەیدا، (بَطَر)یش بریتیە لەوە کە ئینسان بە هۆی چاکەو نیعمەتی خواوە، لەخۆی بایی و بوغرِابێ و کەم چیکڵدانە بێ لە بەرانبەر چاکەو خێرو خۆشییدا.

**مەسەلەی حەوتەم:**

**خـوا گەلێـك كۆمەڵـگای تاوانبـاری پـاش گەلـی نـووح لـە بەیـن بـردوون، كـە پێویسـتە پەندیـان لـێ وەربگیـرێ و، خـواش بەسـە بـۆ شـارەزایی لـە گوناهـو تاوانەكانـی بەنـدەكانی:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَكَمْ أَهْلَكْنَا مِنَ الْقُرُونِ مِنْ بَعْدِ نُوحٍ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ بِذُنُوبِ عِبَادِهِ خَبِيرًا بَصِيرًا ﴿١٧﴾ ﴾.

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿ وَكَمْ أَهْلَكْنَا مِنَ الْقُرُونِ ﴾، زۆر سەدەمان لە بەین بردوون، وشەی (كَم)، لە ئەسڵ دا بۆ پرسیاركردنە لە بارەی ژمارەوە (**كَمْ : إِسْتِفْهَامٌ عَنِ العَدَد**)، دەگوترێ: (**كَمْ كِتَابٌ عِنْدَك؟**)، چەند كتێبت لەلان؟ بەڵام جاری وا هەیە: (**كَمْ تسْتَعْمَلُ خَبَرِيَّة دَالَّةً عَلَى عَدَدٍ كَثِيرٍ**)،(**كَمْ**) بە (خبرية) دادەنرێ و ژمارەی زۆر دەگەیەنێ. ئنجا لێرە (كم) بە مانای (كَمْ)ی خەبەرییە، نەك بۆ پرسیار كردن دەربارەی ژمارە، بەڵكو بۆ هەواڵدانە: ﴿ وَكَمْ أَهْلَكْنَا مِنَ الْقُرُونِ ﴾، واتە: زۆر سەدەمان لە بەین بردوون، زۆر سەدە، واتە: خەڵكی زۆر سەدان، كە پێكەوە لەو سەدەیەدا ژیاون.

٢)- ﴿ مِنْ بَعْدِ نُوحٍ ﴾، لە پاش (گەلی) نووح، بۆچی باسی نووح عليه السلام دەكات؟ لەبەر ئەوەی نووح یەكەمین پێغەمبەر بووە بۆ خەڵكی سەر زەوی، وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە و بەسەرهاتەكانی قورئانیش بەزۆریی لە نووحەوە دەست پێ دەكەن، واش پێدەچێ: پێش نووح مرۆڤەكان كەمتر بووبن، یان پەرت و بڵاو بووبن، بەڵام نووح عليه السلام وەك پێغەمبەرێك بۆ هەموویان ڕەوانەكرا بێ و نێردرا بێ، وەك پێشتریش بە درێژیی لە سووڕەتی (**هود**)دا، چیرۆكی گەلی (**نووح**)مان باسكرد، كە دوای ئەوەی لە نووح یاخیی دەبن و بە قسەی ناكەن، خوای دادگەر تۆفانێك دەنێرێ، كە سەر زەوی لە ئەهلی كوفر وشیرك پاك دەكاتەوە و، تەنیا ئەوانەی لەگەڵی دادەبن و، دەرباز دەبن، كە لەگەڵی سواری كەشتییەكە بوون، بۆیەش بە زۆریی خوا ﷻ لە گێڕانەوەی بەسەرهاتەكاندا، لە (نووح)ەوە دەست پێدەكات.

٣)- ﴿ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ بِذُنُوبِ عِبَادِهِ ﴾ ئەمە دوو واتای هەن:

**یەكەم:** (**أَي: هُوَ غَنِيٌّ عَنْ إِخْبَارِ أَحَدٍ بِذُنُوبِ عِبَادِهِ، فَهُوَ أَعْلَمُ بِهِم**)، واتە: خوا بێنیازە لەوەی كە هیچ كەس هەواڵی گوناهی بەندەكانی پێ بدات، چونكە بۆ خۆی پێیان زاناترە.

دووەم: (وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ : أَي: يَكْفِيكَ رَبُّكَ فَلاَ تَحْتَاجُ غَيْرَهُ لِمَعْرِفَةِ ذُنُوبِ عِبَادِهِ)، واتە: پەروەردگارتت بەسە و حەوجێی جگە لەوی نی، بۆ زانینی گوناهی بەندەکانی.

٤)- ﴿ خَبِيرًۢا بَصِيرًا ﴾، شارەزای بینەرە، بۆ گوناهی بەندەکانی، واتە: تۆ لەگەڵ هەواڵ پێدانی پەروەردگارتدا، پێویستیت بە هەواڵ پێدانی کەسی دیکە نیە، کە مەبەست ئەوەیە خوا ﷻ زۆر چاك شارەزای گوناهو تاوان و لادانی بەندەکانیەتی و، لە ئەنجامی گوناهو تاوان و لادانەکانیاندا، شایستەی ئەوە دەبن، بەو جۆرە سزایان بدات.

## مەسەلەی هەشتەم:

**هەر کەس ژیانی بە پەلەی دنیای بوێ و بیکاتە ئامانج، خوا بە ئەندازەی ئەوە کە حیکمەتی دەیخوازێ، لە ژیانی دنیای پێ دەدات، بەڵام دواتر بە عەیبداریی و دەرکراویی دەچێتە دۆزەخەوە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ مَّن كَانَ يُرِيدُ ٱلْعَاجِلَةَ عَجَّلْنَا لَهُۥ فِيهَا مَا نَشَآءُ لِمَن نُّرِيدُ ثُمَّ جَعَلْنَا لَهُۥ جَهَنَّمَ يَصْلَىٰهَا مَذْمُومًا مَّدْحُورًا ﴿١٨﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿ مَّن كَانَ يُرِيدُ ٱلْعَاجِلَةَ ﴾، هەر کەسێك پەلەی بوێ، وشەی (ٱلْعَاجِلَةَ) دەڵێ: (**صِفَةٌ لِمَوْصُوفٍ مَحْذُوف، يُعْلَمُ مِنَ السِّيَاق أَي: الحَيَاةَ العَاجِلَة**)، (ٱلْعَاجِلَةَ)، واتە: بەپەلە، شتێك کە بەپەلە و بەزوویی، دێ، یانی: کەسێك ژیانی بە پەلەی بوێ، واتە: ژیانی دنیا کە زووتر دێ و پێش دواڕۆژ دێ، بۆیە ژیانی دنیا ناونراوە: (ٱلْعَاجِلَةَ)، ژیانی دواڕۆژیش ناونراوە: (**الآجِلَة**) واتە: ئەوەی زوو دێ و، ئەوەی درەنگ دێ.

هەر کەسێك ژیانی دنیای بوێ:

٢)- ﴿ عَجَّلْنَا لَهُۥ فِيهَا مَا نَشَآءُ لِمَن نُّرِيدُ ﴾، بۆ ئەو کەسە کە ژیانی دنیای دەوێ و ئامانجیەتی و چاوی لەسەر چڕدا[1] گرتوە، بۆی دێنینە پێشێ لەو ژیانی دنیایەدا (مَا نَشَآءُ) بەو ئەندازەیەی کە بمانەوێ، (لِمَن نُّرِيدُ) بۆ هەر کەسێك کە ویستمان لەسەری بێ، (**التَّعْجِيلُ: المُبَادَرَةُ المُتَعَارَفَةُ، أَي: قَبْلَ الآخِرَة**)، (**تَعْجيل**) واتە: زوو هێنانە پێش، واتە: مەبەست پێی زوو هێنانە پێشێکی زانراو و باوە،

---

(١) چاو لەسەر چڕدا گرتن: چاوتێبڕین، چاو لەسەر کورتکردنەوە.

واتە: پێش ڕۆژی دوایی و پێش مەنزڵگای دواڕۆژ، لە دنیادا بۆی دێنینە پێش، ئەگەرنا مەرج نیە یەکسەر بۆی بێنێتە پێش، واتە: لە دنیادا ئەو شتەی بە نسیب دەکەین کە بۆ خۆی هەوڵی بۆ دەدات.

٣)- ﴿ثُمَّ جَعَلْنَا لَهُ جَهَنَّمَ يَصْلَاهَا﴾، دوایی دۆزەخی بۆ دادەنێین کە دەچێتە نێوی، چۆنی دەچێتە نێو؟ دوایی باسی دەکات: بە سەرزەنشتکراویی و عەیبدارکراویی و، بە دەرکراویی و دوورخراوەیی، لێرەدا کە دەفەرموێ: (يَصْلَاهَا) هەرچەندە لە زمانی عەرەبیدا زیاتر بە (يَدْخُلُهَا) {دەچێتە نێوی} لێکدراوەتەوە، بەڵام وشەی (صَلِي) جیایە، لە (دخول) دەڵێ: (صَلَيْتُ اللَّحْمَ: شَوَيْتُهَا)، گۆشتەکەم برژاند، یان: پیشاند، گوتراوە: (إِنَّهُ أُتِيَ بِشَاةٍ مَصْلِيَّةٍ: أَي مَشْوِيَّةٍ) یانی: ئەو مەڕێکی برژاوی بۆ هێنرا، (شَوِي) بریتیە لە برژاندن، بریتیە لەوە لە هەر چوار لاوە ئاگر بدرێتە بەر شتێك و ببرژێنرێ، بەڵام چوونە نێو ئاگر هەر چوونە نێوە، بەڵام (صَلِي) جۆرێکی تایبەتی سووتاندن و سزادانە بە ئاگر، کە لە هەر چوار لاوە ئاگری بخرێتە سەر.

٤)- ﴿مَذْمُومًا مَّدْحُورًا﴾، (الذمُّ: الوَصْفُ بالمَعَائِب الَّتِي فِي المَوْصُوفِ)، دەڵێ: (ذَمّ) بریتیە لە باسکردنی ئەو عەیبانەی کە لە وەسفکراوەکەدا هەن.

(المَدْحُور: المَطْرُود وَالمُبْعَد)، واتە: دەرکراو و دوورخراوە.

لێرەدا جێی سەرنجە کە خوا ﷻ هەم وشەی: (نَشَاءُ)و هەم وشەی: (نُرِيد)ی بەکارهێناوە: ﴿مَا نَشَاءُ لِمَن نُّرِيدُ﴾، هەندێك گوتوویانە: (الإِرَادَةُ: المشِيْئَة) کە هەردووکیان بە مانای ویست و خواست دێن.

بەڵام خاوەنی (مختار الصِّحاح)[1]، دەڵێ: لە (دیوان الأدب)دا هاتوە: (المشِيْئَةُ أَخَصُّ مِنَ الإِرَادَة)، (مَشِيْئَة) تایبەتترە لە (إِرَادَة)، (مَشِيْئَة) گشتییە، بەڵام (إِرَادَة) تایبەتییە، ﴿عَجَّلْنَا لَهُ فِيهَا مَا نَشَاءُ لِمَن نُّرِيدُ﴾.

منیش وای تێدەگەم کە وشەی: (مَشِيْئَة) تایبەتە بە شتەکانەوە، بەڵام (إِرَادَة) تایبەتە بە مرۆڤەکانەوە، یاخود تایبەتە بە خاوەن ویست و شعوور و عەقڵەکانەوە.

(مَا نَشَاء يَعْنِي: مِنَ المُعَجَّل)، لە زوو هێنراوە پێش، بۆ ئەو (مَشِيْئَة)ی بەکارهێناوە، (لِمَن نُرِيدُ) بۆ هەر کەسێك کە بمانەوێ بۆی بهێنینە پێش، واتە: (للمُعْجَّلِ لَهُ)، ئنجا خوا

---

(١) ص ٣٥٢.

ﷻ بۆ کەسێك کە دنیای بوێ، دوو قەید و بەندی خستوونەتە سەر، دەفەرموێ: ﴿ مَا نَشَآءُ ﴾، ئەو ئەندازەیەی کە بمانەوێ، ﴿ لِمَن نُّرِيدُ ﴾، بۆ هەر کەسێك کە بمانەوێ، کەواتە: ویستراوەکە (مُعَجَّل)ەکە {ئەوەی هێنراوەتە پێش} بە ڕەهایی نیە و، ئەو کەسەش کە بۆی دەهێنرێتە پێش، ئەویش دیسان بە ڕەهایی بۆی نایەتە پێش، واتە: هێنراوە پێشەکە ڕەها نیە و، بۆ هێنراوە پێشەکەش، گشتی نیە، (**لَيْسَ المُعَجَّلُ مُطْلَقاً، وَلاَ المُعَجَّلُ لَهُ عَامّاً**)، هەڵبەتە لێرەدا مەبەست پێی جێ بەجێ بوونی یاساکانی خوای پەروەردگارە، کە هەر کەسێك دنیای بوێ، خوا بۆی دەهێنێتە پێش و، هەر کەسێك دوارۆژی بوێ، وەك دوایی باسی دەکات، بۆی دێنێتە پێش، بەڵام هەمووی بەپێی یاساکانی خوا، نەك بەگۆترە و هەڕەمەکی.

بۆیەش گوتم وشەی: (**مَشِيئَة**) زیاتر شتەکان دەگرێتەوە و واتایەکەی گشتییە، چونکە لە سوورەتی (**التكوير**)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ...﴿٢٩﴾ ﴾، واتە: شتەکانتان ناوێ و کردەوەکانتان ناوێ، تاکو خوا نەیەوێ.

بۆیەش گوتمان: (**إِرَادَة**) بۆ کەسەکانە، چونکە لە سوورەتی (**الجن**)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَأَنَّا لَا نَدْرِىٓ أَشَرٌّ أُرِيدَ بِمَن فِى ٱلْأَرْضِ أَمْ أَرَادَ بِهِمْ رَبُّهُمْ رَشَدًا ﴿١٠﴾ ﴾، واتە: ئێمە نازانین خراپە ویستراوە بۆ خەڵکی سەر زەوی، یاخود پەروەردگاریان چاکە و سەر ڕاستیی بۆ ویستوون.

دەشگونجێ لە ئەنجامی سەرنجدانی ئایەتەکان لە سیاقی خۆیاندا، ئینسان بگاتە وردەکاریی زیاتر، بەڵام بە بۆچوونی من، کە ئەوە بۆ چوونی ژمارەی زۆرێك لە زانایانە: کە وشەی هاوواتا (**مترادف**) لە قورئاندا نین، واتە: (**مَشِيئَة**) و (**إِرَادَة**) هاوواتا نین، کە هیچ جیاوازییان نەبێ، ئنجا چ وەك لە (**ديوان الأدب**)دا دەڵێ: (**مشيئة**): تایبەتتر بێ و، (**إرَادَة**) گشتیتر بێ، یان وەك من تێی گەیشتووم (**مشيئة**) بۆ شتەکان بێ و، (**إرادة**) بۆ کەسەکان بێ، یاخود بە پێچەوانەوە بێ، (**إرادة**) تایبەتیی بێ و (**مشيئة**) گشتیی بێ، واتە: بە پێچەوانەی ئەوەی کە لە (ديوان الأدب)دا هاتوە، ئەوە لە ئەنجامی زیاتر سەرنجدانی ئایەتەکان لە سیاقەتی خۆیاندا، دەگونجێ بگەینە دەرەنجامی ڕوونتر.

## مەسەلەی نۆیەم:

**هەر کەسێکیش دوارۆژی بوێ و، هەوڵی شایستەی بۆ بدات و، بڕواداریش بێ، ئەوانە تێکۆشانەکەیان سوپاسکراوە و لەسەر تێکۆشانەکەیان، سوپاسکراو دەبن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَنْ أَرَادَ ٱلْـَٔاخِرَةَ وَسَعَىٰ لَهَا سَعْيَهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُوْلَـٰٓئِكَ كَانَ سَعْيُهُم مَّشْكُورًا ﴿١٩﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿ وَمَنْ أَرَادَ ٱلْـَٔاخِرَةَ ﴾، هەر کەسێك دوا ڕۆژی بوێ، واتە: ژیانی دوارۆژو کۆتایی بوێ، کە مەبەست پێی بەهەشت و پاداشتی خوایە، یاخود بەهەشت و، پاداشتی خوا و، ڕەزامەندیی خوا، هەموویان دەگرێتەوە.

٢)- ﴿ وَسَعَىٰ لَهَا سَعْيَهَا ﴾، ئەو تێکۆشانەشی بۆ بکات، کە بۆی پێویستە، (**السَّعْيُ: المَشْيُ دُونَ العَدْوِ**)، بریتیە لە ڕۆیشتنێکی خێرا، بەڵام کەمتر لە ڕاکردن، (**وَالمَقْصُودُ بِهِ هُنَا: الأَعْمَالُ الصَّالِحَة**) مەبەست پێی لێرەدا کردەوە باشەکانن.

کە دەفەرموێ: (وَسَعَىٰ لَهَا سَعْيَهَا **أَي: السَّعي اللائِقَ بِهَا**) واتە: کۆششێك کە بۆی شایستەیە، ئنجا کە دەفەرموێ: (وَسَعَىٰ لَهَا سَعْيَهَا )، واتە: (**فَهُوَ يَسْيرُ سَيْرَاً سَرِيْعَاً نَحْوَ الآخِرَة**) واتە: بە خێرایی بەرەو مەنزڵگای دوارۆژ بچێ، کە مەبەست پێی ئەنجامدانی کردەوە باشەکان و پێشبڕکێ تێدا کردنیانە.

٣)- ﴿ وَهُوَ مُؤْمِنٌ ﴾، وێڕای ئەوەی کە هەوڵی شایستەو کۆششیش دەدات، بڕواداریشە، کە دیارە ئەگەر بڕوادار نەبێ، هەوڵ نادات و کۆشش ناکات بۆ بە دەستهێنانی پاداشتی خواو ڕەزامەندیی خوا، لە دوارۆژدا، بەڵام خوا ﷻ ئیمانەکەی دوا خستوە، بۆ دەرخستنی گرنگیدان بە هەوڵ و کۆششەکە.

٤)- ﴿ فَأُوْلَـٰٓئِكَ كَانَ سَعْيُهُم مَّشْكُورًا ﴾، ئا ئەوانە کۆششەکەیان سوپاسکراوە، مەبەست ئەوەیە: (**أَي: السَّاعِي مَشْكُورٌ**) ئەو کەسەی کە هەوڵدەر و تێکۆشەرە، سوپاسکراوە.

بەڵام من پێمواییە ئەگەر بشگوترێ: (كَانَ سَعْيُهُم مَّشْكُورًا ) هەوڵ و کۆششەکەیان دەنرخێنرێ و سوپاس دەکرێ، ئەوەش هەر ڕاستە.

کە بێگومان ئەوەش مەبەست پێی هاتنە دی، یاسای خوای کاربەجێیە، لەو بوارەدا کە کەسێك هەوڵی ژیانی ڕۆژی دوایی بدات، بەپێی یاسای خوا، پێی دەگات و سوپاس دەکرێ و دەنرخێنرێ و پاداشت دەدرێتەوە.

پێشتر باسی شوکرمان کردوە کە (**شکر**) هەم بە دڵ دەکرێ، هەم بە زمان دەکرێ، هەم بە ئەندامەکان دەکرێ: بە دڵ چاکەکان لە خوا بزانی، بە زمان چاکەکان دانیان پێدا بێنی و، بە ئەندامەکانیش، ئەو چاکەو نیعمەتانەی خوا، لەڕەزامەندیی خوادا بەکاریان بێنی، بەڵام (**مُخْتَارِ الصِّحَاح**) دەڵێ: (**الشُّكْرُ الثَّنَاءُ عَلَى الْمُحْسِنِ بِمَا أَوْلاَكَهُ مِنَ الْمَعْرُوفِ**)، (**شُكْر**) بریتیە لە ستایشکردن و پێهەڵاگوتن و مەدحکردنی چاکەکار، بە هۆی ئەوەوە کە چاکەی لەگەڵ تۆدا کردوە.

بەڕێزان! ئەمانە هەموویان یاسای خوان، خوا ﷻ دەیانخاتە ڕوو، هەموویان چەند ڕاستییەکن خوا ﷻ دەیانخاتە ڕوو، بۆ ئەهلی ئیسلام، کە بەر پێی خۆیانیان پێ ببینن، خوا بەو شێوەیە مامەڵەیان لەگەڵ دەکات و، ئێوەش دەبێ بزانن کە خوا بەو شێوەیە مامەڵە لەگەڵ مرۆڤەکاندا دەکات، چ ئەوانەی کە دنیا ویستن، چ ئەوانەی کە دوارۆژ ویستن.

**مەسەلەی دەیەم:**

**خوا هاوکاریی هەر کام لە دنیا خوازان و دوارۆژ خوازان دەکات، لە بەخششی خۆی و بەخششی وی، لە کەس قەدەغە نیە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ كُلًّا نُّمِدُّ هَٰٓؤُلَآءِ وَهَٰٓؤُلَآءِ مِنْ عَطَآءِ رَبِّكَ ۚ وَمَا كَانَ عَطَآءُ رَبِّكَ مَحْظُورًا ﴿٢٠﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿ كُلًّا نُّمِدُّ ﴾، هەر کامێك لەوانە هاوکاریی دەکەین، دەڵێ: (**تنوين كُلاً عِوَضٌ عَنِ المُضَافِ إِلَيْهِ، أَيْ: كُلاً من الفَرِيْقَيْنِ**)، کە دەفەرموێ: ( كُلًّا نُّمِدُّ ) هەر کامێکیان هاوکاریی دەکەین، ئەم تەنوینی سەر ( كُلًّا ) جێداری پاڵوێدراوە، واتە: (**كلاً مِنَ الفَرِيْقَيْنِ**)، هەر کامێك لەو دوو کۆمەڵە، لە دنیا خوازان و، دوارۆژ خوازان.

٢)- ﴿ هَٰٓؤُلَآءِ وَهَٰٓؤُلَآءِ ﴾، دوایی خوا ڕوونی دەکاتەوە کە ئەمە جێدار (**بَدَلْ**)ی ( كُلًّا )ە، ئەوانیش و ئەوانیش، یانی: ئەوانیش وەك دنیا ویستان و ئەوانیش وەك دوارۆژ ویستان، یانی: کە دەفەرموێ: ( كُلًّا ) ئایا ئەوانە کە بە (**كُلاً**) تەعبیریان لێکراوە کێن؟! وەڵامەکەی: ﴿ هَٰٓؤُلَآءِ وَهَٰٓؤُلَآءِ ﴾، ئەوانیش و ئەوانیش.

٣)- ﴿ مِنْ عَطَآءِ رَبِّكَ ﴾، لە بەخششی پەروەردگارت.

وشەی: (**نُّمِدُّ**) (**الإِمْـدَادُ: إِسْتِرْسَـالُ العَطَـاءِ وَتعَاقبُـهُ**)، (**إمـداد**) بریتیە لەوەی بەخشش بنێردرێ و نەپسێنرێ و بە دوای یەکدا بێ.

(**عَطَاء: مَا يُعطى**) (**عطاء**)یش بریتیە لەوەی دەدرێ و دەبەخشرێ.

٤)- ﴿ وَمَا كَانَ عَطَآءُ رَبِّكَ مَحْظُورًا ﴾، بەخششی پەروەردگاریشت قەدەغە نیە، واتە: لە کەس نەگیراوەتەوە، هەر کەسە بەپێی هەوڵ و کۆششی خۆی، بە بەخششی پەروەردگاری دەگات، لێرە جێی سەرنج ئەوەیە کە خوای بەخشەر ﷻ دەفەرموێ: ﴿ عَطَآءُ رَبِّكَ ﴾، فەرموویەتی: بەخششی پەروەردگارت، چونکە خوا بە کافر و مسوڵمان دەیبەخشێ، بەڵام نەیفەرموە: چاکە (**فَضْل**) یان پاداشت (**ثَوَاب**)، بەڵکو وشەیەکی بەکارهێناوە، کە هەم بۆ دنیا خوازان بە کەڵك

دێ و، هەم بۆ دوارِۆژ خوازان، هەم بۆ بەخشینی شتی باش و، هەم بۆ ئەو خەڵکەش کە پێیان دەبەخشرێ، بۆیان خراپ بێ، کە بریتیە لەوەی: کەسێك هەوڵدەدات ماڵی حەرام کۆبکاتەوە، بە پێی یاسای خوا، بە ماڵی حەرام دەگات، یان کەسێك هەوڵ دەدات دەسەڵاتێکی نارِەوا و خۆسەپێنەرانە پەیدا بکات، بەپێی هەوڵی خۆی پێی دەگات، بەڵام بۆی خراپە، ماڵە حەرامەکە بۆ ئەو کەسە کە کۆی دەکاتەوە، خراپە، بەڵام خوا بەویستی تەکوینی خۆی، رِێیان لێناگرێ، چونکە بەخششی خوا لە کەس قەدەغە نیە، کەسێك دنیای بوێ، حەرامی بوێ، چاکەی بوێ، خراپەی بوێ، دەسەڵاتێکی خۆسەپێنەرانە و قۆرخکارانەی بوێ، یان دەسەڵاتێکی پەسند و چاکی بوێ، کە هەڵقوڵاوی ئیرادەی ئازادانەی خەڵك بێ، هەر کامێکیانی بوێ، خوای بەخشەر ودادگەر بەپێی یاساکانی خۆی، بواریان دەدات و، بواریشی پێداون و رِستی لە دوا درێژ کردوون، چونکە ئەگەر وانەبێ، خەڵك تاقی ناکرێتەوە.

## رِاستییەکی مەزن:

ئـەم ئایەتـە و دوو ئایـەتی پێشـێی رِاسـتییەکی زۆر مەزنیـان لـێ وەردەگیـرێ، ئەویـش ئەوەیـە کـە: خـوا ﷻ گـەردوونی بەپێـی سیسـتم (**نظـام**) دانـاوە و، یاسـاکان (**سـنن**)ی خـوا لـەو سیسـتمەدا جـێ بەجـێ دەبـن و، هیـچ شـتێك گۆترەکاریـی نیـە و هیـچ کەسـێك مافـی ڤیتـۆ (vito)ی لـە بەرانبـەر یاسـاکانی خـوادا نیـە، لـە زۆر شـوێنی قورئانـدا ئـەو رِاسـتییە باسـکراوە، بـۆ وێنـە:

١)- ﴿ وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴿٣٩﴾ وَأَنَّ سَعْيَهُۥ سَوْفَ يُرَىٰ ﴿٤٠﴾ ﴾**النجم**، واتە: بۆ مرۆڤ نیە (مرۆڤ بە گشتیی، مسوڵمان بێ یان نامسوڵمان)، مەگەر ئەوەی هەوڵی بۆ دەدات و کۆششی بۆ دەکات و، کۆششەکەشی لەمەودوا دەبینرێ، واتە: بەرهەمی کۆششەکەی دێتەوە رِێی، ئەگەر کۆششی بۆ چاکە کرد بێ، یان بۆ خراپە کرد بێ، بە رِێی رِاست، یان چەوتدا.

٢)- ﴿ لَّيْسَ بِأَمَانِيِّكُمْ وَلَآ أَمَانِيِّ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ ۗ مَن يَعْمَلْ سُوٓءًا يُجْزَ بِهِۦ وَلَا يَجِدْ لَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿١٢٣﴾ وَمَن يَعْمَلْ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُو۟لَٰٓئِكَ يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ وَلَا يُظْلَمُونَ نَقِيرًا ﴿١٢٤﴾ ﴾النساء.

واتـە: بـە خۆزگـە خواسـتنی ئێـوەو خـاوەن کتێبـەکان نیـە، هـەر کەسـێك خراپـە بـکات، سـزای دەدرێتـەوە و، جگـە لـە خـوا هیـچ سەرپەرشـتیارێك و یارمەتیدەرێـکی نیـە، هـەر

کەسێکیش کردەوە چاکەکان ئەنجام بدات لە نێر و مێ، مادام بڕوادار بێ، ئەوانەش بە ئەندازەی دەزووی سەر نێوکە خورما ستەمیان لێ ناکرێ.

٣)- ﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ ٱلْأَخِرَةِ نَزِدْ لَهُۥ فِي حَرْثِهِۦۖ وَمَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ ٱلدُّنْيَا نُؤْتِهِۦ مِنْهَا وَمَا لَهُۥ فِي ٱلْأَخِرَةِ مِن نَّصِيبٍ ﴿٢٠﴾ ﴾**الشورى**، واتە: هەر کەسێك بەروبوومی دوارۆژی بوێ، ئێمە لەو بەروبوومە بۆی زیاد دەکەین و، هەر کەسێکیش بەروبوومی دنیای بوێ، لە دنیادا پێی دەدەین، بەڵام لە دوارۆژدا هیچ پشك و بەشی نیە.

٤)- هەروەها لە سوورەتی (**آل عمران**)دا دەفەرموێ: ﴿ ...وَمَن يُرِدْ ثَوَابَ ٱلدُّنْيَا نُؤْتِهِۦ مِنْهَا وَمَن يُرِدْ ثَوَابَ ٱلْأَخِرَةِ نُؤْتِهِۦ مِنْهَاۚ وَسَنَجْزِي ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿١٤٥﴾ ﴾، واتە: هەر کەسێك پاداشت (وبەرهەم)ی دنیای بوێ، پێی دەدەین و، هەر کەسێك پاداشت ( و بەرهەم)ی دوارۆژی بوێ، پێی دەدەین و، ئێمە پاداشتی سوپاسگوزاران دەدەینەوە.

کەواتە: کێ لە دنیادا یاساکانی خوا زیاتر ڕەچاو بکات، پشکی زیاتری دەبێ و، خوا ستەم لە کەس ناکات.

## مەسەلەی یازدەیەم و کۆتایی:

**خـوا فەرموویـەتی: سـەرنج بـدە! چـۆن لـە ڕووی ژیـان و گـوزەرانی دنیـاوە، هەندێـك لـە مرۆڤەکانمـان بەسـەر هەندێکیـان زێدەیـی داوە، ئنجـا دواڕۆژ پلـەکانی و زێدەییەکـەشی گەورەتـرە:**

خـوا فەرموویـەتی: ﴿ انْظُرْ كَيْفَ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ وَلَلْآخِرَةُ أَكْبَرُ دَرَجَاتٍ وَأَكْبَرُ تَفْضِيلًا ﴿٢١﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿ انْظُرْ كَيْفَ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ﴾، سەرنج بدە! چۆن لە دنیادا هەندێکیانمان بەسەر هەندێکیان دا زێدەیی داوە و هەڵبژاردوە، کە دەفەرموێ: (**فَضَّلْنا**) هەڵمانبژاردوە، ئەوە مانای وانیە خوا بە چاکتری دانابن، بەڵکو واتە: هەڵمان بژاردوون لەو ڕووەوە، کە ناز و نیعمەتی زیاترمان پێداون، ئنجا عەقڵ و هۆشی زیاتری پێداون، هێزی جەستەیی زیاتری پێداون، جوانیی قەد و قیافەی زیاتر پێداون، هەندێ سیفەتی چاکی زیاتری پێداون، سەروەت و سامانی پێداون، خزم و کەس وکار و هێز و دەسەڵات و ... هتدی، زیاتری پێدوان، گرنگ ئەوەیە خوا ﷻ بەرزیی و نزمیی کردوە لە نیعمەتەکاندا لە نێو مرۆڤەکانیدا، بۆیە دەفەرموێ: سەرنج بدە! چۆن هەندێکمان زێدەیی داوە بەسەر هەندێکیاندا.

٢)- ﴿ وَلَلْآخِرَةُ أَكْبَرُ دَرَجَاتٍ ﴾، بە دڵنیایی مەنزڵگا و ژیانی دواڕۆژ و پلەکانیشی، گەورەترن.

٣)- ﴿ وَأَكْبَرُ تَفْضِيلًا ﴾، هەروەها زێدەییەکەشی (زێدەیی پێدرانی هەندێکیان بەسەر هەندێکیاندا) گەورەترە.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ انْظُرْ كَيْفَ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ﴾، هەندێکیانمـان زێدەیـی داوە بەسـەر هەندێکیانـدا، کەواتـە: (**الكُلُّ: مُفَضَّلٌ و مَفَضَّل عَلَيْهِ**)، هـەر کامێکیـان زێدەیی پێـدراوە و، زێدەییشـی بەسـەردا کـراوە، بۆچـی؟

چونکـە، بـۆ وێنـە: کەسـێك کـە توانـای کارو کەسـابەتی زیاتـرە، یـەکی دیکـە لـە ڕووێـکی دیکـەوە بەهێزتـرە، یەکێـك لـەو ڕووەوە کـە توانـای حوکمڕانیـی و ئیـدارەدانی کۆمەڵـگای هەیـە، یـەکی دیکـە توانـای کارێـکی دیکـەی هەیـە، هەمووشـیان پێویسـتییان بـە یەکـدی

هەیە، واتە: خوا ﷻ هەموو نیعمەتەکانی لە دەستی هەندێك کەسدا خڕنەکردوونەوە و، کورت هەڵ نەهێناون، بەڵکو هەر کامێکیان کۆمەڵێك شتی پێداوە و، لەو ڕووەوە بەسەر بەرانبەرەکەیدا هەڵبژێردراوە، ئەوی دیکەش شتێکی پێدراوە و، لەو ڕووەوە بەسەر ئەوی دیکەدا هەڵبژێردراوە، بە نسبەت پیاوان و ئافرەتانیشەوە هەر وایە، خوا کۆمەڵێك سیفەتی بە پیاوان داون، بە ئافرەتانی نەداون، هەروەها کۆمەڵێك سیفەتی بە ئافرەتانی داون، بە پیاوانی نەداون، وەك لە سوورەتی (**النساء**) (٣٤)دا، بە تەفصیل باسمانکرد، چونکە لەوێش دیسان خوای زانا و توانا دەفەرموێ: زێدەییمان داوە بە هەندێکتان، بەسەر هەندێکتاندا.

ئاشکرایە: (**تَفْضِيل**) لە (**فَضْل**)ەوە هاتوە، (**فَضْل**)یش، واتە: زیاد بوو، (**خُذِ الفَضْلَ: أَي الزِّيَادَةَ وَالجَمْعُ: فُضُول، كَأَفْلُس وَفُلُوس، وَفَضَّلَهُ عَلَى غَيْرِهِ تَفْضِيلاً: صَيَّرَهُ أَفْضَلَ مِنْهُ**)، بەڵام (**فَضَّلْنا**) لێرەدا بەو واتایە نیە کە لەلای خوا باشتر بێ، بەڵکو واتە: زێدەیی زیاتری پێداوە لەو نیعمەتەدا.

ئەم ئایەتەش، وەك ئەو ئایەتە وایە کە لە سوورەتی (**الزخرف**)دا دەفەرموێ: ﴿ أَهُمْ يَقْسِمُونَ رَحْمَتَ رَبِّكَۚ نَحْنُ قَسَمْنَا بَيْنَهُم مَّعِيشَتَهُمْ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَاۚ وَرَفَعْنَا بَعْضَهُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَٰتٍ لِّيَتَّخِذَ بَعْضُهُم بَعْضًا سُخْرِيًّاۗ وَرَحْمَتُ رَبِّكَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ ﴿٣٢﴾ ﴾.

واتە: ئایا ئەوانە بەزەیی پەروەردگارت دابەش دەکەن؟ ئێمە گوزەرانمان لە ژیانی دنیادا لە بەیندا بەش کردوون و، هەندێکیانمان چەند پلە بەسەر هەندێکیاندا زێدەیی داوە، بۆ ئەوەی هەندێکیان هەندێکیان بەکاربێنن و بەزەیی پەروەردگاریشت لەوەی کۆی دەکەنەوە، باشترە.

بەڵێ، وەك چۆن حوکمڕان خەڵك بەکاردێنێ، خەڵکیش حوکمڕان بەکاردێنێ، ئەگەر حوکمڕان خەڵك خزمەتی دەکات، دەبێ حوکمڕانیش خزمەتی خەڵك بکات، ئەگەر وەزیر خزمەتی بەڕێوەبەرە گشتییەکان دەکات، بەڕێوەبەرە گشتیەکانیش خزمەتی وەزیر دەکەن، ئەگەر کارمەندەکان خزمەتی بەڕێوەبەرەکان دەکەن، بەڕێوەبەرەکانیش خزمەتی کارمەندەکان دەکەن، هەروەها: جوتیار خزمەتی کرێکار دەکات و کرێکاریش خزمەتی جوتیار دەکات، دیسان خەڵکی هەژار خزمەتی خەڵکی دەوڵەمەند دەکات و، خەڵکی دەوڵەمەندیش خزمەتی خەڵکی هەژار دەکات، هەروەها هەموو چین و توێژەکان بەهەمان

شێوەن، بەڵام ئەوە لە کۆمەڵگایەکی تەندروستدا بەم شێوەیە، کە بە هۆی قۆرخکاریی و گەندەڵیی و ستەمکارییەوە، چینایەتیی تێدا پەیدا نەبووبێ، هەر کۆمەڵگایەکی تەندروست، دەبێ کارەکان دابەش بکات: دەبێ کەسانێك هەبن کە بەرگدروو بن و، کەسانێك هەبن کە پیشەسازیی بکەن، کەسانێك ڕێگا وبان پاك بکەنەوە، کەسانێك کشتوکاڵ بکەن، هەروەها دەبێ کەسانێك هەبن کاری ئیداریی بەڕێوەبەرن، ئنجا هەر کامێك لەوانە بۆ ئەوی دیکە ڕام و دەستەمۆ کراوە و خزمەتی ئەوی دیکە دەکات و بە هەمووشیان خزمەتی یەکدی دەکەن و کۆمەڵگاکەیان بەڕێوە دەبەن، کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿لِّيَتَّخِذَ بَعْضُهُم بَعْضًا سُخْرِيًّا﴾، بۆ ئەوەی هەندێکیان هەندێکیان بەکاربێنن، یان: هەندێکیان هەندێکیان ڕام و دەستەمۆ بکەن، مەبەست پێی ئەوەیە.

﴿وَرَحْمَتُ رَبِّكَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ ﴿٣٢﴾﴾، بەزەیی پەروەردگارت باشترە، لەوەی کە کۆی دەکەنەوە، هەم لە دنیاداو هەم لە دواڕۆژیشدا.

خوا بە لوتفی خۆی یارمەتیمان بدات: کە کۆمەڵگاکەمان پێکەوە بکەین بە کۆمەڵگایەکی تەندروست، کە هەموو توێژەکان خزمەتی یەکدی بکەن و، هیچ کامیان نەبێتە ملۆزم بۆ گیانی ئەوی دیکە و، هیچ کامیان قۆرخکاریی و گەندەڵیی نەکات لەسەر حیسابی ئەوی دیکە و، هەموویان خزمەتی یەکدی بکەن، یانی: خزمەتی خۆیان بکەن و، لە نازو نیعمەتی خوای پەروەردگاردا هەموویان خاوەن پشك و بەشبن، هەر کەسە بەپێی هەوڵدان و کۆششی خۆی.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

بەڕێزان! لەم دەرسەماندا دەچینە خزمەت ئایەتەکانی (٢٢ - ٣٩) واتە: هەژدە (١٨) ئایەت، لەم هەژدە ئایەتەدا، خوای زانای شارەزا بیست و چوار (٢٤) خەسڵەتی پەسەند و ناپەسند دەخاتە ڕوو، واتە: دوازدە (١٢) بە دوازدە (١٢)، کە نەمبینیوە لە تەفسیرەکاندا بەو شێوەیە پۆلێن بکرێن، ئەو بیست و چوار (٢٤) خەسڵەتەش زۆربەی هەرە زۆری بوارەکانی ژیان و گوزەران دەگرنەوە، ئەگەر نەڵێم هەموویان دەگرنەوە، واتە: بوارەکانی فیکریی و، عەقیدەیی و، پەرستش و، ڕەوشت و ئاکارو، ئابووریی و، کۆمەڵایەتیی و، سیاسیی و، سەرجەم هەڵس و کەوتەکان.

ئنجا لە سەرەتاو کۆتایشیاندا باسی خوا بەیەکگرتن و تەنیا خواپەرستیی کراوە، بەڵام بە شێوەی ڕێگریی کردن لە دژو پێچەوانەکەی، کە بریتیە لە: هاوبەش بۆ خوا پەیداکردن و پەرستنی جگە لە خوا، لەگەڵ خوادا.

ئنجا با ئێمە هەر لەسەرتاوە چاوێك بەو بیست و چوار (٢٤) خەسڵەتەدا بگێڕین، کە من بەپێی ڕیزبەندیی ئایەتەکان هێناومن:

**یەکەم: خەسڵەتە خراپە ڕێگریی لێکراوەکان:**

١- هاوبەش بۆ خوا دانان، ئایەتی ژمارە (٢٢).

٢- نەگوتنی تەنانەت وشەیەکی بچووکیش کە جێی دڵ ڕەنجانی باب و دایك بێ، تەنانەت وشەی (ئۆف)یش، ئایەتی (٢٣).

٣- خۆ لێ تووڕەنەکردن و تێوە نەخوڕین، بە نسبەت باب و دایك، ئایەتی (٢٣).

٤- ماڵی خۆ بێ هوودە خەرج نەکردن، یاخود ماڵی خۆ بەفیڕۆ نەدان، ئایەتی (٢٦).

٥- چرووکیی نەکردن، ئایەتی (٢٩).

٦- دەست بڵاویی نەکردن، ئایەتی (٢٩).

٧- نەکوشتنی منداڵان لەترسیی هەژاریی، ئایەتی (٣١).

٨- تخوون نەکەوتنی زینا، ئایەتی (٣٢).

٩- نەکوشتنی مرۆڤ بە ناهەق، ئایەتی (٣٣).

١٠- تخوون نەکەوتنی ماڵی هەتیو، مەگەر بە شێوەیەکی باش، (واتە: مەگەر بۆ پەرەپێدانی و زۆر کردنی و کاسبیی پێکردنی)، ئایەتی (٣٤).

١١- شوێن نەکەوتنی هیچ شتێك بەبێ زانیاریی و شارەزایی، ئایەتی (٣٦).

١٢- بە فیزو کەشخە بەڕێدا نەڕۆیشتن، ئایەتی (٣٧).

**دووەم: خەسڵەتە پەسندە فەرمان پێکراوەکان:**

١- بە تەنیا پەرستنی خوا، ئایەتی (٢٣).

٢- چاکەکاریی لەگەڵ باب و دایکدا، ئایەتی (٢٣).

٣- قسەی بەڕێزو حورمەت لەگەڵ باب و دایکدا کردن، ئایەتی (٢٣).

٤- باڵ شۆڕکردن بۆ باب و دایك، لە ڕووی بەزەیی و سۆزەوە، ئایەتی (٢٤).

٥- پاڕانەوە بۆ باب و دایك، کە خوا ڕەحمیان پێ بکات و، لەگەڵیان بەبەزەیی بێ، ئایەتی (٢٤).

٦- ماف دان بە خزمان، ئایەتی (٢٦).

٧- ماف دان بە نەدار، ئایەتی (٢٦).

٨- ماف دان بە بابای ڕێبوار، (واتە: ڕێبوارێك کە پەکی کەوتوە، یان پارەی لێ براوە، یان پێویستیی بە هاوکارییە)، ئایەتی (٢٦).

٩- قسەی ئاسان و خۆشکردن و قسەی ئومێدەوارکەر کردن، لەگەڵ نەداراندا، لە کاتی نەبوونیی دا، (واتە: قسەیەك کە ئومێدەوارکەر بێ، کە ئەگەر ناتوانی بە کردەوەش هاوکارییان بکەی، دەتوانی قسەی نەرم و خۆش و ئاسان و، ئومێدەوارکەریان لەگەڵ بکەی)، ئایەتی (٢٨).

١٠- وەفاداربوون بە بەڵێن و پەیمان، ئایەتی (٣٤).

١١- شت پێوان بۆ خەڵك بە تەواویی، (مرۆڤ کەسێك شتێکی بۆ دەپێوێ، بە تەواویی بۆی بپێوێ)، ئایەتی (٣٥).

١٢- شت کێشان بۆ خەڵك بە شێوەیەکی دادگەرانەو بە تەرازوویەکی ڕاست، ئایەتی (٣٥).

﴿ لَّا تَجۡعَلۡ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَتَقۡعُدَ مَذۡمُومٗا مَّخۡذُولٗا (٢٢) وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ
وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَٰنًاۚ إِمَّا يَبۡلُغَنَّ عِندَكَ ٱلۡكِبَرَ أَحَدُهُمَآ أَوۡ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفّٖ وَلَا
تَنۡهَرۡهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوۡلٗا كَرِيمٗا (٢٣) وَٱخۡفِضۡ لَهُمَا جَنَاحَ ٱلذُّلِّ مِنَ ٱلرَّحۡمَةِ وَقُل رَّبِّ
ٱرۡحَمۡهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيرٗا (٢٤) رَّبُّكُمۡ أَعۡلَمُ بِمَا فِي نُفُوسِكُمۡۚ إِن تَكُونُواْ صَٰلِحِينَ فَإِنَّهُۥ كَانَ
لِلۡأَوَّٰبِينَ غَفُورٗا (٢٥) وَءَاتِ ذَا ٱلۡقُرۡبَىٰ حَقَّهُۥ وَٱلۡمِسۡكِينَ وَٱبۡنَ ٱلسَّبِيلِ وَلَا تُبَذِّرۡ تَبۡذِيرًا (٢٦)
إِنَّ ٱلۡمُبَذِّرِينَ كَانُوٓاْ إِخۡوَٰنَ ٱلشَّيَٰطِينِۖ وَكَانَ ٱلشَّيۡطَٰنُ لِرَبِّهِۦ كَفُورٗا (٢٧) وَإِمَّا تُعۡرِضَنَّ عَنۡهُمُ
ٱبۡتِغَآءَ رَحۡمَةٖ مِّن رَّبِّكَ تَرۡجُوهَا فَقُل لَّهُمۡ قَوۡلٗا مَّيۡسُورٗا (٢٨) وَلَا تَجۡعَلۡ يَدَكَ مَغۡلُولَةً إِلَىٰ عُنُقِكَ وَلَا
تَبۡسُطۡهَا كُلَّ ٱلۡبَسۡطِ فَتَقۡعُدَ مَلُومٗا مَّحۡسُورًا (٢٩) إِنَّ رَبَّكَ يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقۡدِرُۚ إِنَّهُۥ
كَانَ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرَۢا بَصِيرٗا (٣٠) وَلَا تَقۡتُلُوٓاْ أَوۡلَٰدَكُمۡ خَشۡيَةَ إِمۡلَٰقٖۖ نَّحۡنُ نَرۡزُقُهُمۡ وَإِيَّاكُمۡۚ إِنَّ قَتۡلَهُمۡ
كَانَ خِطۡـٔٗا كَبِيرٗا (٣١) وَلَا تَقۡرَبُواْ ٱلزِّنَىٰٓۖ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةٗ وَسَآءَ سَبِيلٗا (٣٢) وَلَا تَقۡتُلُواْ
ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّۗ وَمَن قُتِلَ مَظۡلُومٗا فَقَدۡ جَعَلۡنَا لِوَلِيِّهِۦ سُلۡطَٰنٗا فَلَا يُسۡرِف
فِّي ٱلۡقَتۡلِۖ إِنَّهُۥ كَانَ مَنصُورٗا (٣٣) وَلَا تَقۡرَبُواْ مَالَ ٱلۡيَتِيمِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ حَتَّىٰ يَبۡلُغَ أَشُدَّهُۥۚ
وَأَوۡفُواْ بِٱلۡعَهۡدِۖ إِنَّ ٱلۡعَهۡدَ كَانَ مَسۡـُٔولٗا (٣٤) وَأَوۡفُواْ ٱلۡكَيۡلَ إِذَا كِلۡتُمۡ وَزِنُواْ بِٱلۡقِسۡطَاسِ ٱلۡمُسۡتَقِيمِۚ
ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلٗا (٣٥) وَلَا تَقۡفُ مَا لَيۡسَ لَكَ بِهِۦ عِلۡمٌۚ إِنَّ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡبَصَرَ وَٱلۡفُؤَادَ كُلُّ
أُوْلَٰٓئِكَ كَانَ عَنۡهُ مَسۡـُٔولٗا (٣٦) وَلَا تَمۡشِ فِي ٱلۡأَرۡضِ مَرَحًاۖ إِنَّكَ لَن تَخۡرِقَ ٱلۡأَرۡضَ وَلَن تَبۡلُغَ
ٱلۡجِبَالَ طُولٗا (٣٧) كُلُّ ذَٰلِكَ كَانَ سَيِّئُهُۥ عِندَ رَبِّكَ مَكۡرُوهٗا (٣٨) ذَٰلِكَ مِمَّآ أَوۡحَىٰٓ إِلَيۡكَ رَبُّكَ مِنَ
ٱلۡحِكۡمَةِۗ وَلَا تَجۡعَلۡ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَتُلۡقَىٰ فِي جَهَنَّمَ مَلُومٗا مَّدۡحُورًا (٣٩) ﴾

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

{(ئەی مرۆڤ !) لەگەڵ خوادا پەرستراوێکی دیکە دامەنێ (مەپەرستە)، ئەگەرنا بە لۆمەکراویی و پشت بەردراویی (دەستەو ئەژنۆ) دادەنیشی ﴿٢٢﴾ هەروەها پەروەردگارت بڕیاری داوە کە: بێجگە لەو (هیچ کەس و شتێك) نەپەرستن و چاکەکارییش لەگەڵ باب و دایکتاندا بکەنە پیشە، (بە تایبەت) هەرکاتێك یەکیان، یان هەردووکیان لەلات پیر دەبن و بەساڵدا دەچن، (کەمترین وشەی ناخۆشیان لەگەڵ مەڵێ) تەنانەت پێیان مەڵێ: ئۆف و تێیان مەخوڕەو، قسەیەکی بەڕێزیان لەگەڵدا بکە، (بەڕێزەوە بیاندوێنە) ﴿٢٣﴾ لە ڕووی سۆزو بەزەییەوەش باڵی سۆزو میهرەبانییان بۆ شۆڕ بکەو، بڵێ: پەروەردگارم! وەك چۆن منیان بە گچکەیی هەراش کرد، بەزەییت پێیاندا بێتەوە ﴿٢٤﴾ پەروەردگارتان (لە خۆتان) بەوەی لە دەروونتاندایە، زاناترە، ئەگەر ئێوە بەندەی چاك بن، بە دڵنیایی ئەو بۆ گەڕاوان (بۆ لای) لێبوردەیە ﴿٢٥﴾ هەروەها مافی خۆیان بدە بە خزم و نەدارو ڕێبوار (ی ئاتاج) و، ماڵ و سامان بێ هوودە خەرج مەکە (کە هیچ کەلێنێك نەگرێ) ﴿٢٦﴾ مسۆگەر سامان بە هەدەردەران (و بێ هوودە خەرجکەران) برای شەیتانەکانن و، شەیتانیش بەرانبەر پەروەردگاری ناسوپاسە ﴿٢٧﴾ هەرکاتێکیش (لەبەر نەبوونیی نەتتوانی هاوکارییان بکەی) و ئومێدی بەزەیی و چاکەیەکت لەلایەن پەروەردگارتەوە هەبوو (کە دوایی شتێکت دێتە دەست)، قسەیەکی نەرم و ئاسانیان لەگەڵدا بکە، (قسەیەکی ئومێدەوارکەرانە) ﴿٢٨﴾ هەروەها دەستت بە نووقاویی بە ملتەوە مەنووسێنەو، یەکجارییش بڵاوی مەکە، (نە چنگ قووچاو بەو نە دەستبڵاو)، ئەگەرنا بە سەرزەنشت کراویی و پەککەوتوویی ڕۆدەنیشی ﴿٢٩﴾ بە دڵنیایی پەروەردگارت هەرکەس بیەوێ، بژێوی بۆ فراوان دەکات و، (هەرکەسیشی بوێ) لێی وە تەنگ دێنێ، مسۆگەر ئەو شارەزاو بینەری بەندەکانیەتی ﴿٣٠﴾ ڕۆڵەکانیشتان لە ترسی هەژاریی مەکوژن، ئێمە بژێوی ئەوان و ئێوەش دەدەین، بێگومان کوشتنیان تاوانێکی زلە ﴿٣١﴾ توخنی زیناش مەکەون، بە دڵنیایی ئەو (زینا کردن)ە ناقۆڵایەو، خراپترین ڕێیە (بۆ تێرکردنی ئارەزووی جینسیی) ﴿٣٢﴾ نەفسێکیش کە خوا قەدەغەی کردوە (بکوژرێ) بە هەق نەبێ، مەیکوژن، هەرکەسێکیش بە ستەملێکراویی بکوژرێ، ئەوە دەستەڵاتمان بە سەرپەرشتیارەکەی داوە (تۆڵەی بکاتەوە)، ئنجا با زێدەڕۆیی لە کوشتنێدا نەکات، بە دڵنیایی ئەو سەرخراوە ﴿٣٣﴾ مەگەر بە باشترین شێوەش، ئەگەرنا توخنی ماڵی هەتیو

مەکەون، هەتا تێدەگاو پێدەگا، پەیمانیش بەجێ بێنن بێگومان پەیمان لێی دەپرسرێتەوە ﴿٣٤﴾ هەرکاتیش پێوانتان کرد (بۆ خەڵکی)، بە تەواویی بیپێون و بە تەرازووی ڕاستیش بیکێشن، ئەوە باشترەو ئاکامی چاکترە ﴿٣٥﴾ شوێن شتێکیش مەکەوە کە زانیارییت پێی نیە، بەڵنیایی بیستن و چاو و عەقڵ، هەموو ئەوانە بەرپرسیارن ﴿٣٦﴾ بە فیزو کەشخەش بە زەویدا مەڕۆ، بێگومان نە زەویت بۆ دەدڕێ و، نەهێندەی چیایانیش کەڵەگەت دەبی! ﴿٣٧﴾ هەرکام لەوانە خراپەکەیان لە لای پەروەردگارت ناپەسەندەو، نا خۆشویستراوە ﴿٣٨﴾ ئەوەش لەو حیکمەتەیە کە پەروەردگارت بۆی سروش کردووی و، لەگەڵ خوادا هیچ پەرستراوێك دامەنێ، ئەگەرنا بە عەیبداریی و بە دەرکراویی، فڕێ دەدرێیە دۆزەخەوە ﴿٣٩﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(﴿مَذْمُومًا﴾): واتە: لۆمەکراو، سەرزەنشت کراو، (ذَمَّهُ: عَابَهُ وَلاَمَهُ)، (وَالذَّمُّ خِلاَفُ المَدْحِ)، (ذَمَّهُ) واتە: عەیبی لێگرت و سەرکۆنەی کرد، (ذمّ) و (مَدْح) پێچەوانەی یەکدین، (مَدْح) واتە: پێهەڵاگوتن و پەسند کردن، (ذمّ) واتە: خراپە باس کردن و، بە ناپەسند دانان و، بە ناپەسند لە قەڵەم دان.

(﴿مَّخْذُولًا﴾): واتە: پشتبەردراو، (خَذَلَ فُلاَنَاً وَخَذَلَ عَنْهُ: تَخَلَّى عَنْ عَوْنِهِ وَنُصْرَتِهِ)، کەسێك پشتی کەسێك بەرداو، وازی لێ بێنێ و، وێڵی بکات دەڵێن: (خَذَلَهُ) یان (خَذَلَ عَنْهُ).

(﴿الْكِبَرَ﴾): واتە: بە ساڵداچوون، کەوتنە تەمەن، (كَبِرَ كِبَرَاً: طَعَنَ فِي السِّنِ فَهُوَ كَبِير)، بەساڵداچوو، کەوتە تەمەنەوە.

(﴿أُفٍّ﴾): (أَفَّ أُفّاً: قَالَ: أُفٍّ مِنْ كَرْبٍ أَوْ ضَجَرٍ، فَهُوَ أَفَّافٌ وَأَفُوفٌ لِمَن يُكْثِرُ ترديدها، أُف: كَلِمَةُ تَضَجُّرٍ وَتَكَرُّه) دەگوترێ (أَفَّ أُفّاً) واتە: وشەی (أف)ی بەکارهێنا بە هۆی خەفەتێکەوە، یاخود بە هۆی بێزارییەکەوە، ئنجا (أَفَّافٌ وَأَفُوفٌ) کەسێکە زۆر ئەو وشەیە بەکاردێنێ، (أف) وشەیەکە بەکاردەهێنرێ بۆ دەربڕینی بێزاریی و، پێناخۆش بوون.

(﴿وَلَا تَنْهَرْهُمَا﴾): واتە: تێیانەوە مەخوڕە (نَهَرَ فُلاَنَاً يَنْهَرُ: زَجَرَهُ وَأَغْضَبَهُ)، واتە: تێوەی خوڕی و دەنگیدا و، تووڕەی کرد.

(كَرِيمًا): (كَرُمَ الشَّيءُ: عَزَّ وَنَفُسَ)، واتە: ئەو شتە دەگمەن بوو، بە نرخ بوو، (الكَرِيْمُ: صِفَة لِكُلِّ مَا يُرْضَى وَيُحْمَدُ فِي بابِهِ، وَمِنْهُ: وَجْهٌ كَرِيْم)، (كَرِيْم) سیفەتی هەرشتێکە لە بواری خۆیدا کە پەسندکراو بێ و ستایشکراو بێ، دەگوترێ: (وَجْهٌ كَرِيْم) واتە: ڕوویەکی جوان، ئەگەر بگوترێ: (كِتَابٌ كَرِيم) واتە: کتێبێکی بەڕێزو بەرهەمدار.

کەواتە: (وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا)، واتە: بە ڕێزو حورمەتەوە بیاندوێنە، بە شێوازێکی وا کە ڕێزو حورمەتی تێدابێ.

(وَٱخْفِضْ لَهُمَا): (خَفَضَ الشَّيءُ يَخْفِضُ: سَهُلَ وَلاَنَ)، (خَفَضَ) واتە: نەرم بوو، یان هاتە خوار، (يَخْفِضُ) دێتە خوار، بەڵام لێرەدا مەبەست پێی ئاسانیی و نەرمییە کە دەفەرموێ: (وَاخفِضْ الشَّيءَ: حَطَّهُ بَعْدَ عُلُوٍّ)، واتە: لە سەرێ ڕا هێنایە خوارێ.

(جَنَاحَ ٱلذُّلِّ)، واتە: باڵی میهرەبانیی، دەگوترێ: (خَفَضَ فُلاَنٌ جَنَاحَهُ للنَّاسِ: أَلاَنَ جَانِبَهُ وَتَوَاضَعَ لَهُم)، واتە: لەگەڵیان میهرەبان بوو، خاکیی بوو، لەگەڵیان بە ڕەحم و شەفەقەت بوو.

(لِلْأَوَّٰبِينَ): واتە: بۆ زۆر گەڕاوان، (آبَ إلَيْهِ يَئُوبُ أَوْبَاً وَأَوبَةً وَإِيابَاً وَمَآبَاً: رَجَعَ، فهو آيِبٌ وآئِبٌ وَأَوَّابٌ)، (آبَ إلَيْهِ يَئُوبُ) واتە: گەڕایەوە بۆ لای (أَوْبَاً وَأَوبَةً وَإِيابَاً وَمَآبَاً) ئەوانە هەموویان چاوگن واتە: گەڕانەوە، (فَهُوَ آيِبٌ) واتە: گەڕاوەیە (آئِبٌ) گەڕاوە، (أوّاب) صیغەی زێدەڕۆییە، واتە: زۆر دەگەڕێتەوە.

(وَلَا تُبَذِّرْ): (التَّبْذِيرُ: التَّفْرِيقُ، وَأَصْلُهُ إلْقَاءُ البَذْرِ وَطَرْحُهُ، فَاسْتُعِيرَ لِكُلِّ مُضَيِّعٍ مَالَهُ)، (تبذير) واتە: لێکبڵاوکردن، ئەویش ڕیشەکەی لەوەوە هاتوە: کە کەسێك چەنگە تۆیەك بەزەوی وەردەکات و پرش و بڵاوی دەکات و فڕێی دەدات، ئنجا ئەوە خوازراوەتەوە بۆ هەرکەسێك کە ماڵی خۆی زایە بکات، بە شێوەیەك خەرجی بکات و کە کەلێنی بۆ نەگرێ و سوودی بۆی نەبێ.

(مَغْلُولَةً): (الغُلُّ: مُخْتَصٌّ بِمَا يُقَيَّدُ بِهِ، فَتُجْعَلُ الأَعْضَاءُ وَسْطَهُ، وَغُلَّ فُلاَنٌ بِهِ، قُيِّدَ بِهِ)، (غُلّ) تایبەتە بەوەوە کە دەست و پێی مرۆڤی پێ دەبەسترێ و، دەست و پێی مرۆڤی دەخرێتە نێو، هەردووك دەست و پێی، بەڵام بە زۆریی بەکار دێ، بۆ شتێك کە دەکرێتە گەردنیش، یانی: دەستەکان کۆدەکرێنەوە بۆ لای گەردن.

ئنجا کە دەفەرموێ: (مَغْلُولَةً إِلَىٰ عُنُقِكَ)، واتە: دەستەکانت وا مەنووقێنە کە بۆ لای ملتیان بەری بۆ ئەوەی هیچیان لێ هەڵنەوەرێ.

(**مَحۡسُورًا**): (**الحَسْرَةُ: الغَمُّ عَلَى مَا فَاتَهُ وَالنَّدَمُ، وَالحَاسِرُ: التَّعِبُ، وَالمحْسُورُ: مَنْ حَسَرَهُ التعْبُ، وَالحَسْرُ: كَشْفُ المَلْبَسِ عَمَّا عَلَيْهِ**)، (**حَسْر**) یانی: دەرخستن، (**حَسَرَ عَنْ ذِرَاعِيهِ**) واتە: قۆڵی هەڵکرد، ئەو پۆشاکەی لەسەریەتی دەری خست، ئەمە ئەسڵی واتاکەیەتی، ئنجا دوایی (**حَسْرة**) بە مانای خەم و خەفەت هاتوە، لەسەر شتێك كە لە دەست مرۆڤ دەچێ و، بۆی پەشێمان دەبێتەوە، (**حاسر**) بە بابایەكی ماندوو دەڵێن، (**مَحْسُور**) كەسێكە كە لە ئەنجامی زۆر ماندو بووندا پەكی كەوتوە، بۆیەش بە خەم و خەفەت گوتراوە: (**حسرة**)، چونكە لە ئەنجامی ئەو خەم و خەفەتەدا، مرۆڤ ئەو هێزو وزەو توانایەی كە هەیبووە، نایمێنێ و لادەچێ، وەك چۆن ئەندامێك پۆشاكی لەسەر لادەچێ، ئەویش هێزو وزەی نامێنێ.

(**مَلُومًا**): واتە: لۆمەكراو، دەگوترێ: (**اللَّوْمُ: عَذْلُ الإِنْسَانِ بنسبةِ إلى مَا فِيهِ لَوْمٌ، لُمْتُهُ فَهُوَ مَلُومٌ**)، (**لَوْم**) بریتیە لەوە كە ئینسان ڕەخنەی لێ بگیرێ، یان پاڵبدرێتە لای شتێك، كە عەیبەو كەم و كوڕییە، دەگوترێ (**لُمْتُهُ**) سەركۆنەم كردن، (**لَوْم**) ڕەخنە لێگرتن، سەرزەنشت كردن ...، ئەو وشانە بەكاردێنن، (**ملوم**)یش واتە: سەرزەنشتكراو، ڕەخنەلێگیراو، سەركۆنەكراو، لە زمانی كوردیش دا وشەی (**لَوْم**) بەكاردێنین، دەڵێین: لۆمەی كرد.

(**إِمۡلَٰقٍ**): (**إِمْلَقَ مِنْهُ الشَّيءُ: أفلَتَ، والملقَةُ: الصَّفَاة المَلْسَاء، والإملاقُ: الإفتِقَار**)، (**إمْلَقَ مِنْهُ الشَّيءُ**) واتە: شتەكە ڕۆی لەدەست چوو، (**مَلَقَة**) بە بەردێكی سپی لووس دەگوترێ كە هیچی پێوە بەند نەبێ، (**إمْلاق**)یش واتە هەژاریی و نەداریی ئەوكەسە وەك چۆن بەردێكی سپی لووس هیچی پێوە بەند نابێ، ئەویش ماڵ و سامانەكەی پێوە بەند نەبووەو هیچی بەدەستەوە نەماوە.

(**بِٱلۡقِسۡطَاسِ**): (**أي: الميزَان**)، هەم خوێنراوەتەوە (**قِسْطاس**) هەم (**قُسْطاس**)، هەردووكیان بە مانای تەرازوون.

(**وَلَا تَقۡفُ**): (**قَفوتُهُ: أَصَبْتُ قَفَاهُ، والإِقْتِفَاءُ: إتبَاعُ القفا**)، (**قَفَا**) یانی: پشتەمل، (**قَفوتُهُ**) واتە: پشتەملیم بینی، یاخود پشتە ملیم گرت، (**إقْتِفَاء**) بە دوای پشتەمل كەوتنە، كەواتە: (**وَلَا تَقۡفُ**)، واتە: بەدوای شتێك مەكەوە (**مَا لَيۡسَ لَكَ بِهِۦ عِلۡمٌ**)، كە زانیاریت لەبارەیەوە نیە.

(**مَرَحًا**): (**المَرَحُ: شِدَّةُ الفَرَحِ، فَهُوَ مَرِحٌ، وأَمْرَحَهُ غَيْرُهُ، والإسم: المِرَاحُ**)، (**مَرْح**)، بریتیە لە زۆر دڵخۆش بوون و زۆر شادمان بوون، بە كەسەكە دەگوترێ: (**مَرِح**) واتە: زۆر دڵ خۆش و

شادمان، کە بگاتە حەددی بوغرا بوون، (وأَمْرَحَهُ غَيْرُهُ) واتە: ئەوی دیکە ئەو کەسەی {زۆر دڵخۆش کرد، [ناوی ئەو زۆر دڵخۆش بوونە]ش (مِرَاح)ە، شەخسەکەش (مَرِح).

(مَدْحُورًا): واتە: دەرکراوو دوورخراوە، (دَحَرَهُ: طَرَدهُ وأَبْعَدَهُ)، (دَحَرَهُ)، واتە: دەری کردو، دووری خستەوە، بەڵام بەسەرزەنشت کراویی.

## مانای گشتی ئایەتەکان

وەك پێشتر گوتم، لە کۆی قورئانی بەرزو بەپێزدا، لێرەدا: لەم هەژدە ئایەتەدا، لە هەموو شوێنێك زیاتر باسی ڕەوشت و ئاکارە پەسندو ناپەسندەکان کراوە، لە هیچ شوێنێکی دیکە نەمبینیوە، ئەوەندەی ئێرە، ئەو پانتاییە زۆرە، تەرخان کرابێ و، ئەوەندەی ئێرە ڕەوشتی چاك و خراپ باسکرابن، کە سەرجەم (٢٤)ن، بەڵکو دەگونجێ وردتریان بکەیەوە بە (٢٥) و زیاتریش سەرژمێر بکرێن.

خوا ﷻ لە هەموو قورئانی مەککەیی دا، وێڕای بابەتی بووناسیی و، بابەتی گشتی بەندایەتیی بۆ خوا کردن، لە نێویدا مەسەلەی ئیمان و عەقیدە، ئیمان بە خوا ﷻ، بە فریشتەکانی، بە کتێبەکانی، بە ڕۆژی دوایی، بە سزاو پاداشتی خوا و بە پێغەمبەران (عَلَيهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام)، وێڕای ئەوە، پانتاییەکی زۆریش لە قورئانی مەککەیی، تەرخانکراوە بۆ ئەوە کە مسوڵمانان خۆیان بپارێزن لە خووو خەسڵەتە دزێو و ناشیرینەکان و، خۆشیان بڕازێننەوە بە سیفەت و ئاکارە بەرزو جوانەکان.

ئنجا وەك لە پێناسەی ئەم دەرسەدا گوتمان: لێرەدا: سەرجەم (٢٤) ڕەوشتی پەسندو ناپەسند خراونە ڕوو، دوازدە (١٢) بە دوازدە (١٢)، کە دیارە ئێمە لە مەسەلە گرنگەکاندا، زیاتر تیشك دەخەینە سەر یەك یەکی ئەو ڕەوشت و خووو خەسڵەتە دزێو و ئاکارو ڕەوشتە پەسندو جوانانە، کە لێرەدا خراونە ڕوو، بۆیە لێرە بە خێرایی بەسەریاندا دەڕۆین.

جێی سەرنجیشە: کە لە سەرەتاو دەستپێك، پاشان لە کۆتایی و سەرەنجامی ئەو ڕەوشت و ئاکارە بەرزو پەسندانەدا، خوا ﷻ باسی تەنیا بەندایەتیی بۆ خوا کردن و هاوبەش بۆ خوادانەنان و نەپەرستنی غەیری خوای کردوە، واتە: تەنیا پەرستنی خواو، خۆ دوورگرتن

لە پەرستنی جگە لە خوا، یان لەگەڵ خوا، یانی: خوا بەیەکگرتن و خۆ دوورگرتن لە هاوبەش بۆخوا دانان (**الشرك باللّه**)، چونکە خوا بەیەکگرتن (**توحید**)و تەنیا بەندایەتیی بۆ خوا کردن، سەرچاوەی هەموو ڕەوشتە بەرزو پەسندەکانە، بەپێچەوانەشەوە: هاوبەش بۆ خوادانان. (**الإشراك باللّه**): کانگا و زبڵدانی تێدا ترووکانی هەرچی ڕەوشت و ئاکاری پیس و بەدو خراپە، بەڵێ ئینسان تاکو لە خوا نزیکتربێ، لە ڕەوشت و ئاکاری بەرزو پەسند نیزیکتر دەبێ و ڕازاوەتر دەبێ، بە ئاکارە پەسندو جوانەکان، بەپێچەوانەوەش: هەتا لە خوا دوورتر بێ، لە ڕەوشت و ئاکاری بەرزو پەسند دوورتر دەبێ و، لە خووخدە خراپ و نزم و ناپەستەکان نزیکتر دەبێ، بۆیەش پێغەمبەران (**عَلَيهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام**) کە لە هەموو کەس لە خوا نزیکتر بوون و، لە هەموو کەس بۆ خوا صوڵحاوتر بوون و، لە هەموو کەس پارێزکارتر بوون: لە هەموو کەس ڕەوشتیان بەرزو جوانترو، ئاکاریان پەسەندتر بووە، کە تەماشای بەسەرهاتەکانیشیان دەبینین: وەك مانگی چواردە، ئەوە درەوشاوەیە، نەیارانی پێغەمبەران (**عَلَيهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام**)یش کە ناحەزی خوا بوون و لەخوا دوور بوون، دەبینین: زۆر گیرۆدە بوون بە ڕەوشت و ئاکارو خو و خەسڵەتە نزم و پەستەکانەوە.

سەرەتا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ لَّا تَجْعَلْ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَتَقْعُدَ مَذْمُومًا مَّخْذُولًا ﴾، لەگەڵ خوادا پەرستراوێکی دیکە دامەنێ، ئەگەرنا دەستەوئەژنۆ دادەنیشی، بەسەرزەنشت کراویی و پشت بەردراویی، واتە: ئەگەر لەگەڵ خوادا پەرستراوی دیکە دابنێی، سەرەنجام پەکت دەکەوێ، دەستەو ئەژنۆ دادەنیشی و ڕۆدەنیشی و، سەرزەنشتکراوو لۆمەکراوو ڕەخنە لێگیراویش دەبی و، پشت بەردراویش دەبی.

کە لێرەدا باسی دانیشتن (**قعود**) دەکات، لەبەرئەوەیە کە ئینسان هەر کارێکی بیکات، بە پێوە دەیکات و، بە پێوە وەستان ڕەمزی گورج و گۆڵیی و چالاکیی و هێزو پێزە و، دانیشتن و ڕۆنیشتن، ڕەمزی دەستەپاچەیی و بێ دەستەڵاتی و هیچ لە دەست نەهاتوویە، بۆیە وا دەفەرموێ.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ ﴾، هەروەها پەروەردگارت بڕیاری داوە، حوکمی کردوە، کە جگە لەو مەپەرستن، واتە: تەنیا خوا بپەرستن و خۆتان لەپەرستنی جگە لەو، بپارێزن، ﴿ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا ﴾، هەروەها بڕیاری داوەو، حوکمیشی کردوە: کە لەگەڵ باب و دایکتاندا چاکەکاریی بکەنە پیشە.

﴿إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ ٱلْكِبَرَ أَحَدُهُمَآ أَوْ كِلَاهُمَا﴾، ئنجا ئەگەر یەکێکیان لەلای تۆ، یاخود هەردووکیان، کەوتنە تەمەنەوە.

ئەمە یانی: خزمەتیان بکەو لەخزمەتیاندا بەو، با لەلای خۆت بن، لێیان دوورمەکەوە و سەرپەرشتییان بکە، هەتا پیرەدەبن و دەکەونە تەمەنەوە، ئنجا ئەگەر یەکێکیان، یان هەردووکیان کەوتنە تەمەنەوە، لەلای تۆ، ﴿فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ﴾ تەنانەت پێیان مەڵێ: ئۆف، یانی: وشەی (**أُفّ**)یان بۆ بەکارمەهێنە، وشەی (**أفّ**)یش، (**كَلِمةٌ تَزَجُّرٍ وَتَكَرُّه**)، وشەیەکە مانای بێزاریی و ناخۆشحاڵیی دەگەیەنێ، واتە: تەنانەت وشەیەکیش لەگەڵ ئەواندا بەکارمەهێنە، کە نیشانەی ئەوە بێ: تۆ لێیان بێزاری و، پێیان قەڵسی و هەست بە بارگرانیی دەکەی، کە خزمەتیان دەکەی! ﴿وَلَا تَنْهَرْهُمَا﴾، هەروەها تێیانەوە مەخوڕە، بە توندیی قسەیان لەگەڵ مەکە، (**نَهْر**) یانی (**زَجْر**)، واتە: تێوەخوڕین و قسەی توند لەگەڵ کردن و ڕوو لێگرژ کردن، ﴿وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا﴾، قسەیەکی بەڕێزو حورمەت و باشیان لەگەڵدا بکە، واتە: بە شێوەیەکی پڕ ڕێزو حورمەت بیاندوێنە، ﴿وَٱخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ ٱلذُّلِّ مِنَ ٱلرَّحْمَةِ﴾، لە ڕووی سۆزو بەزەییەوەش باڵی میهرەبانیی و ملکەچییان بۆ شۆڕبکە.

(**جَنَاح**) واتە: باڵ، (**ذُلّ**) واتە: میهرەبانیی و ملکەچیی، بەڵام ئەو میهرەبانیی و ملکەچییە، مەبەست پێی لە ڕووی سۆزو بەزەییەوەیە، نەك لە ئەنجامی ڕووپامایی (**تَصَنُّعُ**) و (**تَمَلُّق**) ێکدا کە لە دڵتدا نەبێ، بەڵکو با لە دڵتدا ڕەحم و بەزەیی و شەفەقەت و پەرۆشیی هەبێ، ئنجا ئا ئەو بەزەیی و پەرۆشییە کە لە دڵتدا هەیە، با لەسەر ئەندامەکانیشت دەربکەوێ، وەك چۆن باڵندەیەك باڵەکانی خۆی دەکاتەوە بۆ بەچکەکانی و، لەبن باڵی خۆییان دەگرێ، تۆش ئاوا باڵی میهرەبانیی بۆ باب و دایکت شۆڕبکەو لەبن باڵی خۆتیان بگرە.

﴿وَقُل رَّبِّ ٱرْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِى صَغِيرًا﴾ یانی: بۆ خۆت هەرچی پێت دەکرێ، لە خزمەتیاندا بیکە، دڵخۆشکردنیان، ڕێز لێگرتنیان، بە خێو کردنیان، سەرپەرشتیی کردنیان، هەرچی بۆخۆت پێت دەکرێ بۆیان بکە، ئەوەی پێشت ناکرێ: داوا لە خوا بکە: ﴿وَقُل رَّبِّ ٱرْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِى صَغِيرًا﴾، بڵێ: پەروەردگارم! بەزەییت پێیاندا بێ، لەگەڵیان میهرەبان بە، وەك چۆن ئەوان منیان بە گچکەیی پێگەیاند و پەروەردە کرد و هەراشکرد، واتە: بچووکیی خۆتت بێتەوە بیر، لە کاتێکدا خزمەتیان دەکەی، بۆ ئەوەی ئەگەر شتێکت لێ بینین، کە بە هۆی پیرییەوە تێیاندا پەیدابووە، وەك: بێ صەبریی و حەوسەڵەیی، یاخود چاك نەزانینی پاك و پیسیی خۆ ڕاگرتن، تۆش تەمەنی منداڵیی

خۆتــت بێتــەوە بیــر! ئــەوە وا دەکات زیاتــر تەحەممــوڵی ئــازارو ناڕەحەتییــەکانی حاڵــەتی کەوتنــە تەمــەن و بــە خێوکــردن و سەرپەرشــتییکردنیان بکــەی.

﴿ رَّبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَا فِى نُفُوسِكُمْ ﴾، پەروەردگارتــان لــە خۆتــان زاناتــرە بــەوەی لــە دەروونتانــدا هەیــە.

لێرەدا با سەرنج بدەین!

سـبحان اللّـه! فەرمایشـتی خـوا، هـەر لەخـوا دەوەشـێتەوە، لێـرەدا خـوا ﷻ سـەرنجمان ڕادەکێشـێ بـۆ ئـەوە کـە ئەگـەر لـە دەروونتانـدا شـتێکی پێچەوانـەی ئـەوە هەبـێ کـە دەری دەبـڕن: پێچەوانـەی ڕەحمـەت، پێچەوانـەی ڕێزلێگرتـن، پێچەوانـەی چاکەکـردن، بـۆ وێنـە: لـە دایـك و بابـت بێـزاربی، لەدڵـدا لێیـان بێـزاربی، پێتخـۆش بـێ زوو لـە کۆڵـت ببنـەوە، پێیانـەوە سـەغڵەت و ناڕەحـەت بی! ئـەوە بزانـە! پەروەردگارتـان لـە خۆتـان زاناتـرە، بـەوەی کـە لـە دەروونتانـدا هەیـە، کەواتـە: وریـای دڵ و دەروونی خۆشـتان بـن، چونکـە بێگومـان ئـەوەی کـە لـە دڵ و دەروونـدا بـێ، دوایـی لەسـەر ڕووپـەڕی ئەندامەکانیـش، هـەر ئـەوە دەردەکـەوێ، ئەگـەر ڕەحـم و بەزەییـت لـە دڵـدا هەبـێ، ڕێـزو حورمەتـت لـە دڵـدا هەبـێ، خۆشەویسـتییت بۆیـان لـە دڵـدا هەبـێ، هەرئـەوەش لەسـەر دەم و چـاو و، لەسـەر زمـان و، لەسـەر ئەندامەکانـت دەردەکـەوێ.

ئەگـەر پێچەوانـەی ئەوەشـت لـە دڵ و دەروونـدا هەبـێ، بـە هەمـان شـێوە، بۆیـە خـوا لەوێـوە، لەسـەرچاوەوە شـتەکە چارەسـەر دەکات، دەفەرمـوێ: پەروەردگارتـان لـە خۆتـان زاناتـرە بـەوەی کـە لـە دڵ و دەروونتانـدا هەیـە، کەواتـە: پێشـێ لـە دڵ و دەروونتـان وریابـن، چونکـە ئەگـەر لـە دڵ و دەروونـدا، شـەفەقەت و پـەرۆش و بەزەیـی و میهرەبانیـی و ڕێـزو حورمـەت هەبـوو، بەرانبـەر بـە بـاب ودایکـت، بـە دڵنیایـی دواییش لە وشـەکانی سـەر زمـان و، لـە نیگاکانی چـاو و، لـە نیـگاری دەم وچـاوو، لـە هەڵـس و کـەوتی ئەندامەکانیشـت، هـەر ئـەوە دەردەکەوێ!

﴿ إِن تَكُونُوا۟ صَٰلِحِينَ فَإِنَّهُۥ كَانَ لِلْأَوَّٰبِينَ غَفُورًا ﴾، ئەگـەر ئێـوە چـاك و چاکـەکار بـن، بێگومـان خـوا بـۆ کەسـانێك کـە زۆر دەگەڕێنـەوە بـۆ لای، زۆر میهرەبانـە، واتـە: ئەگـەر لەئەسـڵدا ئێـوە چاکەکاربـن، جارجـار ئەگـەر هەڵەیـەك، کـەم و کوڕییەکیشـتان لـە دەسـت قەومـا، بەرانبـەر بـە بـاب و دایکتـان، مـادام لـە ئەسـڵدا چاکەکاربـن و خراپـەکار نەبـن، صاڵح بـن و ناصاڵح نەبـن، پاشـان زوو زووش بگەڕێنـەوە بـۆ لای خـوای پەروەردگارتـان و، هەڵـەکانی خۆتـان چـاك بکـەن، بێگومـان پەروەردگارتـان لێبوردەیـە.

سەرنج بدەن!

فەرمووده‌ی خوا ﷻ چەند بە وردەیە!!

چونکە خوای پەروەردگار دەزانێ کە باب و دایك دەکەونە تەمەنەوە، یەکێکیان یان هەردووکیان، بە خێو کردنیان، ئەرك و زەحمەت و قورسایی هەیە، بە تایبەت ئەگەر نەخۆش بن و، بە تایبەتیتر ئەگەر پێویستییان بە هاوکاریی هەبێ، بۆ پاك و خاوێنیی ڕاگرتنیان، بۆیە ئەگەری ئەوە هەیە، کە مرۆڤ تووشی هەڵەیەك، یان کەم و کوڕیی و بێزاریی دەربڕینێك ببێ، بەڵام کە لە ئەسڵدا تۆ چاکەکاربی و، زوو زووش بگەڕێیەوە بۆلای پەروەردگارت، بێگومان پەروەردگارت لێبوردەیە.

ئنجا لە دوای باب و دایك، دەگوازێتەوە بۆ بازنەیەکی فراوانتر، بازنەی خزمان: ﴿ وَءَاتِ ذَا ٱلْقُرْبَىٰ حَقَّهُۥ ﴾، هەروەها مافی خۆی بدە بە کەسێك کە خاوەنی نزیکایەتییە، واتە: خزم، (ذَا) واتە: (صاحب)، (ٱلْقُرْبَىٰ) واتە: نزیکایەتیی، واتە: کەسێك کە لەگەڵ تۆدا خاوەن نیزیکایەتییە، کە مەبەست پێی نیزیکایەتیی ڕەچەڵەك و خوێن و گۆشتە، یانی: خزم، مافی خۆی بدەیە.

ئنجا دەگوازێتەوە بۆ بازنەیەکی فروانتر: (**والمسكين**) هەروەها ماف بدە بە نەداریش، پێشتر ئێمە لە تەفسیری سوورەتی (**التوبة**)دا باسمان کردوە، کە هەژار (**فقير**) کەسێکە هیچی نەبێ و نەدار (**مسكين**): کەسێکە شتێکی هەبێ، بەڵام بایی بەڕێوە چوون و ژیان و گوزەران دابینکردنی نەکات.

﴿ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ ﴾، هەروەها کوڕی ڕێگا، واتە: ڕێبوار، کەسێکە، کەسی نیە سەرپەرشتیی بکات، ئنجا وەك چۆن کەسێك کە کوڕی کەسێکە، دەبێ ئەو کەسە سەرپەرشتیی بکات، ئەو بابایەش بۆتە کوڕی ڕێگا، بەو واتایە: کە جگە لە ڕێگاکەی، لە کەس و کاری خۆی دوورە، یەکی کەوتوەو لە شوێنی خۆی دوورکەوتۆتەوە و پێویستیی بە هاوکاریی هەیە، ﴿ وَلَا تُبَذِّرْ تَبْذِيرًا ﴾، بەبێ هوودەش ماڵی خۆت خەرج مەکە، پێشتریش باسمان کرد: (**تَبْذِير**) واتە: (**تَفْرِيق**)، لەوەوە هاتوە، کە کەسێك تۆو دەوەشێنێ، چەنگە تۆوێك بە زەوی وەردەکات، پەرش و بڵاوی دەکاتەوە، تۆش ئاوا ماڵی خۆت پەرش و بڵاومەکەوە، بەبێ ئامانج، بۆچی؟ ﴿ إِنَّ ٱلْمُبَذِّرِينَ كَانُوٓاْ إِخْوَٰنَ ٱلشَّيَٰطِينِ ﴾، چونکە: بێگومان ئەوانەی ماڵی خۆیان بێ هوودە خەرج دەکەن، بە شێوەیەك کە کەڵێنیان بۆ نەگرێ و سوودی نەبێ، ئەوانە برای شەیتانانن ﴿ وَكَانَ ٱلشَّيْطَٰنُ لِرَبِّهِۦ

﴿ كَفُورًا ﴾ شەیتانیش بەرانبەر بە پەروەردگاری ناسوپاس بوو، ئێوەش نازو نیعمەتەکانی خوا، شەیتانانە خەرج مەکەن، شەیتان بەرانبەر چاکەکانی خوا نا سوپاسە، ئێوەش ئەگەر بێت و نیعمەتەکانی خوا، ئاوا بە دەست بڵاویی و، بەبێ ئەوەی کەلێن بگرێ و، بەبێ ئەوەی کە سوودێکتان پێ بگەیەنێ، بەو شێوەیە خەرجی بکەن، ڕەفتاری وەك هی وی ئەنجام دەدەن و دەبنە برای شەیتان!

﴿ وَإِمَّا تُعْرِضَنَّ عَنْهُمُ ﴾، {جاری وایە کەسێك داوای هاوکارییەکت لێ دەکات، تۆش لەتواناتدا نیە، لەوحاڵەتەدا چی بکەی؟} دەفەرموێ: ئەگەر پشتت تێکردن واتە: هاوکارییانت بۆ نەکرا، بەڵام: ﴿ ٱبْتِغَآءَ رَحْمَةٍ مِّن رَّبِّكَ تَرْجُوهَا ﴾، خوازیاری بەزەییەك بووی لە پەروەردگارتەوە، ئومێدەواری بەزەییەك بووی، واتە: ئومێدەواری ئەوە بووی کە بە هۆی بەزەیی خواوە، شتێکت بێتە دەست، ماڵ و سامانێکت بێتە دەست، ﴿ فَقُل لَّهُمْ قَوْلًا مَّيْسُورًا ﴾، لەو حاڵەدا قسەیەکی ئاسانیان لەگەڵ بکە، واتە: قسەیەکی ئومێدەوارکەرانەیان لەگەڵدا بکە، قسەیەکی ئومێد بەخشانەیان لەگەڵدا بکە، ئەگەر بە دەستیش ناتوانی هاوکارییان بکەی، لانی کەم: قسەو ڕووت لەگەڵیان دا خۆش بێ و دڵیان خۆش بکە، هەڵبەتە نەك هەر قسەی خۆش و بۆش، بەڵکو مادام بە تەما بووی: بە هۆی بەزەیی پەروەردگارتەوە، شتێکت بێتە دەست، بڵێ: ئێستا بە دەستمەوە نیە، هەرکاتێك هاتە دەستم، بەسەرچاو، یان بەشێوەیەك لە شێوەکان بە دڵخۆشیی بە ڕێیان بکە و، قسەیەکی نەرم و نیان و ئاسانیان لەگەڵ بکە.

﴿ وَلَا تَجْعَلْ يَدَكَ مَغْلُولَةً إِلَىٰ عُنُقِكَ ﴾، دەستت وەك کۆتکراوێك بەملتەوە مەنووسێنە، (غُلّ) بریتیە لەو کۆت و بەندەی کە دەکرێتە مل و دەستانەوە، یانی: دەستت وەك کۆت کرابێ، بەنووقاویی مەخە ملتەوە، کەسێك ئەگەر شتێکی پێ بێ، نەیەوێ بیدات و، بیانەوێ لێی بستێنن، دەست دەنووقێنێ، ئەگەر زۆر فشاریان بۆ هێنا، دەستی بە ملی خۆیەوە دەنووسێنێ، بۆ ئەوەی کە بە هۆی جەستەیەوە، دەستی مەحکەمتر ڕابگرێ و هیچی لێ نەیەتە دەرێ!

تۆش بەو شێوەیە لەگەڵ هەژارو نەداردا، مامەڵە مەکە، دەستت وەك کۆت کرابێ بە ملتیەوە بنووسێنی، ﴿ وَلَا تَبْسُطْهَا كُلَّ ٱلْبَسْطِ ﴾، هەروەها زۆریش دەستت بڵاومەکە، یانی: بە تەواویی دەستیشت بڵاومەکە، کە هیچی پێوە بەند نەبێ، وا مەکە کە هیچی

لێ نەیەتەدەر و، واش مەکە هیچی پێوە بەند نەبێ، بەڵکو خەرجیش بکەو، بەشی خۆشت بهێڵەوە.

﴿ فَتَقْعُدَ مَلُومًا مَّحْسُورًا ﴾ چونکە ئەگەر دەستت وەك کۆتکرابێ (زنجیری تێکرابێ) بە ملتیەوە بنووسێنی و هیچ خەرج نەکەی: سەرکۆنە و لۆمە دەکرێی و، ئەگەر دەستیشت زۆر بڵاوبکەی و هیچی پێوە بەند نەبێ: ئەوکاتەش پەکت دەکەوێ.

(**ملوم**) واتە: سەرکۆنەکراو لە ئەنجامی نەبەخشیندا و، (**محسور**)یش، واتە: پەککەوتوو لە ئەنجامی دەست بڵاویی دا.

کەواتە: نەچەنگ قوچاو بە، نەدەستبڵاو بە، بەڵکو بەو شێوەیە و لەو حاڵەتانەدا کە شەریعەت دیاریی کردوون، ببەخشە و، ئاگاشت لە پێداویستییەکانی خۆشت بێ، کە سەرەنجام تۆش دوایی دەست لە خەڵکی پان نەکەیەوە.

﴿ إِنَّ رَبَّكَ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ ﴾، بێگومان پەروەردگارت بژیو فراوان دەکات بۆ هەر کەسێك کە بیەوێ و، بۆ هەرکەسێکیش کە بیەوێ، وەتەنگی دێنێ.

(**يبسط**) واتە: فراوانی دەکات، ئنجا شتێك کە فراوان بێ، پانتاییەکی زۆر دادەگرێ، ﴿ وَيَقْدِرُ ﴾ واتە: (**وَيُضَيِّقُ**) تەسکی دەکاتەوە و تەنگی دەکاتەوە، وێکی دێنێتەوە، شتێك کە پانتاییەکەی کەم بێ، جێی خەڵکی کەمی لێ دەبێتەوە، واتە: خوا بژیو زۆر دەکات و، کەم دەکات، بە پێی ویستی کارزانانەی خۆی، ﴿ إِنَّهُۥ كَانَ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرًۢا بَصِيرًا ﴾، بێگومان ئەو بەرانبەر بە بەندەکانی شارەزایەو، بینەریشە، هەم پێیان شارەزاو ئاشنایە و، هەم باشیش دەر و دەروونیان و ڕوواڵەت و پەنهانیان دەبینێ.

﴿ وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَوْلَٰدَكُمْ خَشْيَةَ إِمْلَٰقٍ ﴾، هەروەها لە ترسی برسیەتیی منداڵەکانتان مەکوژن! ﴿ نَّحْنُ نَرْزُقُهُمْ وَإِيَّاكُمْ ﴾، ئێمە بژیوی ئەوانیش و ئێوەش دەدەین.

ئنجا لێرە دەفەرموێ: ﴿ نَّحْنُ نَرْزُقُهُمْ وَإِيَّاكُمْ ﴾، بەڵام لە سوورەتی (**الأنعام**)دا دەفەرموێ: ﴿ نَّحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ ﴾، چونکە لێرەدا دەفەرموێ: لە ترسی برسیەتیی و لە ترسی هەژاریی و نەداریی منداڵەکانتان مەکوژن، ئێمە بژیوی ئەوانیش و ئێوەش دابین دەکەین، واتە: ترسەکە بۆ ئایندەیە، بەڵام لەوێ دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَوْلَٰدَكُم مِّنْ إِمْلَٰقٍ ﴾، واتە: کە دەکەونە هەژارییەوە، منداڵەکانتان مەکوژن، ﴿ نَّحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ ﴾، واتە: ئێمە بژیوی ئێوەش و ئەوانیش دابین دەکەین، بۆچی لێرەدا بژیوی

خۆیانی پێش خستوە؟ چونکە لەو حاڵەتەدا {لە سووڕەتی (الأنعام)دا} لە هەژارییدان، بۆیە هی خۆیانی پێش خستوە، بژیوی خۆشتان و هی ئەوانیش دەدەین، بەڵام لێرەدا {لە سووڕەتی (الإسراء)دا} ئەو کەسە نەکەوتۆتە هەژارییەوە، بەڵکو لە هەژاریی دەترسێ، بۆیە دەفەرموێ: بژیوی ئەوان و ئێوەش دەدەین، ئەوانی پێش خستوە، {چونکە خۆیان هەژار نین، تاکو ئەوان پێشبخرێن}، ئنجا دوایی هی ئێوەش هەر دەدەین، ﴿إِنَّ قَتْلَهُمْ كَانَ خِطْـًٔا كَبِيرًا﴾، بە دڵنیایی کوشتنی ڕۆڵەکانتان گوناهێکی گەورەیە.

(**خَطِأَ يَخِطِيءُ خَطِيئةً**) واتە: گوناهی کرد، بەڵام (**أَخْطَأَ يُخْطِيءُ خطأً**) واتە: هەڵەی کرد، (**خِطْأ**) ئەوەیە کە بە ئەنقەست شتێك بکەی کە گوناح بێ، بەڵام (**خَطَأ**) ئەوەیە کە مەبەستت گوناهکردن نەبێ، بەڵام هەڵە بکەی.

﴿وَلَا تَقْرَبُوا۟ ٱلزِّنَىٰٓ﴾، توخنی زیناش مەکەون، لێی نیزیك مەکەونەوە، نافەرموێ: مەیکەن، بەڵکو دەفەرموێ: هەر لێی نیزیك مەبنەوە، چونکە ئەگەر بفەرموێ: مەیکەن، واتە: بەس زینا مەکەن، بەڵام کە دەفەرموێ: نیزیکی مەکەونەوە، واتە: خۆتان لە ڕوانینی ئارەزوومەندانە بۆ ئافرەتان بپارێزن، خۆتان لە خەڵوە بپارێزن، خۆتان لە قسەکردنی ناشەرعیی بپارێزن، خۆتان لە هەموو ئەو هەڵس و کەوتانە بپارێزن، کە دەبنە ڕێخۆشکەر و پێشەکیی بۆ زینا، ﴿إِنَّهُۥ كَانَ فَـٰحِشَةً وَسَآءَ سَبِيلًا﴾، بێگومان زینا گوناهێکی زۆر ناشیرین و ناقۆڵایە و ڕێیەکی زۆر خراپیشە، خراپترین ڕێیە بۆ تێرکردنی ئارەزووی جینسیی، ﴿وَلَا تَقْتُلُوا۟ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ﴾، هەروەها ئەو نەفسەش کە خوا قەدەغەی کردوە، بە هەق نەبێ، مەیکوژن، ئەو نەفسە کە قەدەغەیە، کام نەفسەیە؟ هەموو نەفسەکانن کە خوا قەدەغەی کردوون.

(**بالحق**) بە مافی خۆی، واتە: ئەو مافەی کە دەبێ شەریعەت دیاریی بکات، ئەگەر شەریعەت بۆی دیاریی کردی کە بۆت هەیە فلان کەس بکوژی، کەئەویش ئەوەیە نەفەری لێ کوشتبی، یاخود ڕێگریی لێکردبی، یاخود بیەوێ دەستدرێژیی بکاتە سەرت، شەرعیش ڕێی دەستەوکەرو بەرگریی لە خۆکردنی، بە تۆ داوە، یاخود وێنەی ئەوانە، ئەوە ئەو هەقەیە ڕێگا دراوە کە تۆ کەسێك بکوژی، ئەگەرنا جگە لەو ڕێیانەی کە شەرع دیاریی کردوون، بۆت نیە، ﴿وَمَن قُتِلَ مَظْلُومًا فَقَدْ جَعَلْنَا لِوَلِيِّهِۦ سُلْطَـٰنًا﴾، هەر کەسێکیش بە ستەملێکراویی بکوژرێ، ئێمە دەستەڵاتمان داوەتە سەرپەرشتیارەکەی، {واتە: خوێنگرو خوێن ئەستێنەکەی و میراتگرەکەی، ئەو کەسەی کە بۆی هەیە

تۆڵـەی بکاتـەوە} دەسـتەڵاتمان پێـداوە، دەسـتەڵاتەکەش تۆڵەیـە، ئنجـا ئـەو تۆڵەیـەش، چ لـە کوشـتنەوەدا بەرجەسـتە ببـێ، چ لـە خوێنـدا، یاخـود لـە بەخشـین و لێبوردنـدا، ﴿ فَلَا يُسْرِف فِّي ٱلْقَتْلِ ﴾، کەواتـە: بـا زێدەڕۆیـی نـەکات لـە کوشـتنێ دا: دووان لـە بەرانبـەر یەکێکـدا بکـوژێ، یـان یەکێـك بکـوژێ، کـە بابـای بکـوژ نیـە، بەڵکـو خزمیـەتی، یاخـود بابـای بکـوژ کـە دەکوژێتـەوە، دوایـی جەسـتەی بشـێوێنێ و وێنـەی ئەوانـە، ﴿ إِنَّهُۥ كَانَ مَنصُورًا ﴾، بـە دڵنیایـی ئـەو سـەرخراوەو پشتگیریی لێکـراوە، واتـە: بـە حوکمـی شـەریعەتی خـوای پـەروەردگار، دەسـتی کراوەیـە بـۆ هـەق وەرگرتنـەوە.

﴿ وَلَا تَقْرَبُوا۟ مَالَ ٱلْيَتِيمِ إِلَّا بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ ﴾، توخنـی ماڵـی هەتیـوش مەکـەون، مەگـەر بـەو شـێوەیەی باشـترینە، بـەو شـێوەیەی باشـترینە، ئەوەیـە کـە ماڵەکـەی بـۆ زۆر بکـەی، کەسـابەتی بـۆ پـێ بکـەی، بیپارێـزی، ئەگـەر بـەو شـێوەیە لـە سـامانی هەتیـو نیزیـك بیـەوە، کـە بـە قازانجـی ئـەو بـێ، ئـەوە قەینـاکات، بـەڵام جگـە لـە بەحاڵـەتی باشـترین بـۆ ئـەو، نابـێ توخنـی ماڵـی هەتیـو بکـەوی، کـە ماڵەکـەی لـێ بخـۆی، یاخـود زیـانی پـێ بگەیـەنی ﴿ حَتَّىٰ يَبْلُغَ أَشُدَّهُۥ ﴾، تاکـو دەگاتـە حاڵـەتی باڵـغ بـوون و حاڵـەتی تیـن و تاقـەتی، تاکـو تێـدەگاو پێـدەگا، ئەوکاتـە مامەڵـەشی لەگەڵـدا بکـەی، دەبـێ.

﴿ وَأَوْفُوا۟ بِٱلْعَهْدِ ﴾، وەفاداریـش بـن بـە پەیـمان، پەیـمان جێبەجـێ بکـەن، ﴿ إِنَّ ٱلْعَهْدَ كَانَ مَسْـُٔولًا ﴾، بێگومـان پەیـمان لێپرسراوەیـە، واتـە: لێـی دەپرسرێتـەوە و لەسـەری لێپرسـینەوە لەگـەڵ مرۆڤـدا دەکـرێ.

﴿ وَأَوْفُوا۟ ٱلْكَيْلَ إِذَا كِلْتُمْ ﴾، هەروەهـا هەرکاتێـك شـێکتان بـۆ خەڵـك پێـوا، بەتەواویـی بۆیـان بپێـون، نـەك بـە نیوەچڵیـی، ﴿ وَزِنُوا۟ ﴾، هەروەهـا بۆشـیان بکێشـن {(زِنـوا) واتـە: بکێشـن}، ﴿ بِٱلْقِسْطَاسِ ٱلْمُسْتَقِيمِ ﴾، بـە تـەرازووی ڕاسـت، ﴿ ذَٰلِكَ خَيْرٌ ﴾، ئـا ئـەوە باشـترە، ئـەو پێـوانی بـە تێـرو تەواویـی و، کێشـانی بـە تـەرازووی ڕاسـت، باشـترە لـە خـودی خۆیـدا، ﴿ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا ﴾، سـەرەنجامیشی چاکـترە، پێـوان و کێشـانی ڕاسـت و چـاك، لـە خـودی خۆیـدا ڕەوشـتێکی بـەرزو پەسـندە، سـەرەنجامیشی باشـترە، لـە دنیـادا، چونکـە کۆمەڵـگا و، بـە تایبـەتی بازرگانـەکان ئەوانـەی کـە مامەڵـە پێکـەوە دەکـەن، متمانەیـان بەیەکـدی دەبـێ، ئەگـەر بزانـن: فێـڵ و غـەش و خیانەتیـان لـە یەکـدی نەکـردوە.

واتایـەکی دیکـەی: واباشـترە بـۆ ڕۆژی دوایـی، بـۆ دواڕۆژیـش، مـرۆڤ قـەرزاری خەڵـك نەبـێ و، هەقـی خەڵـکی بـەلاوە نەیـەت، بـە دڵنیایـی ئـەو سـەرەنجامە چاکـترە.

﴿ وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ﴾، شتێك كە زانیارییت لەبارەیەوە نیە، شوێنی مەكەوە، قسەیەك مەڵێ كە نایزانی.

بەدوای مەكەوە واتە: بەكردەوە بەدوای شتێك مەكەوە، یاخود قسە لەبارەی شتێكەوە مەكە كە زانیارییت لەبارەیەوە نیە، ﴿ إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُولَٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا ﴾، بە دڵنیایی بیستن و دیتن و عەقڵ، هەركامێك لەوانە لێی دەپرسرێتەوە.

(**فؤاد**) لێرەدا بە مانای عەقڵە، بۆیە فەرموویەتی: ﴿ كُلُّ أُولَٰٓئِكَ ﴾، (**أُوْلَئِكَ**) بۆ كۆی نێرینە عاقڵەكانە.

لێرەدا خوا ﷻ هەركام لە بیستن و، دیتن و، عەقڵی، وەك مرۆڤێك داناوە، بۆیە بە كۆی نێرینە (**الجَمْع المُذَكَّر**) كۆی كردوونەوە.

﴿ وَلَا تَمْشِ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾، هەروەها زۆر بەفیزو كەشخە و دڵخۆشیی و بوغرایی بە زەویدا مەڕۆ، نەك دڵخۆش مەبە! مسوڵمان دەبێ هەمیشە ڕووخۆش و دڵ خۆش و قسە خۆش بێ، بەڵام: (**مَرَحْ**) بریتیە لە: (**أشَدُّ الفَرَحْ**)، بریتیە لە دڵ خۆشییەك كە سەربكێشێ بۆ بوغرایی و، لەخۆبایی بوون و فیزو كەشخە.

بۆچی مرۆڤ نابێ بەو شێوەیە بەزەویدا بڕوات؟! ﴿ إِنَّكَ لَن تَخْرِقَ ٱلْأَرْضَ وَلَن تَبْلُغَ ٱلْجِبَالَ طُولًا ﴾، بە دڵنیایی تۆ زەوییت بۆ نابڕدرێ و هێندە چیایانیش بەرز نابی و، كەڵەگەت نابی! بەم تەعبیرە خوا ﷻ توانج دەگرێتە خۆبەزلگرانێ، كە بەفیزو كەشخە بە زەویدا دەڕۆن، ئەی مرۆڤ! تۆ لێت ناوەشێتەوە فیزو كەشخە بكەی، نە زەوییت بۆ دەدڕدرێ و نە بەقەدەر چیایانیش بەرزو كەڵەگەت دەبی! ﴿ كُلُّ ذَٰلِكَ كَانَ سَيِّئُهُۥ عِندَ رَبِّكَ مَكْرُوهًا ﴾، هەركامێك لەوانە خراپەكەی لەلای پەروەردگارت، ناپەسند و خۆشنەویستراوە، واتە: هەركام لەو بیست و چوار (٢٤)ە كە باسمان كردن، كە دوازدە (١٢) یان، خراپن لەلای پەروەردگارت ناخۆشویستراون، ﴿ ذَٰلِكَ مِمَّآ أَوْحَىٰٓ إِلَيْكَ رَبُّكَ مِنَ ٱلْحِكْمَةِ ﴾، ئا ئەوەش لەو حیكمەتەیە كە پەروەردگارت بۆ تۆی سروش كردووەو، بۆ تۆی ناردوە، ﴿ وَلَا تَجْعَلْ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ ﴾، هەروەها لەگەڵ خوادا پەرستراوی دیكە دامەنێ، ﴿ فَتُلْقَىٰ فِى جَهَنَّمَ مَلُومًا مَّدْحُورًا ﴾، ئەگەرنا فڕێ دەدرێیە دۆزەخەوە: بە سەرزەنشت كراویی و، ڕەخنە لێگیراویی و، بە دەركراویی و، دوورخراوەیی، لە بەزەیی خوا.

## مەسەلە گرنگەكان

### مەسەلەی یەكەم:

**ئـەی مـرۆڤ ! هیـچ پەرسـتراوێك لەگـەڵ خـوادا دامەنـێ، ئەگەرنـا بـە عەیبداریـی و پشـت بەردراویـی ڕۆدەنیـشی:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ لَّا تَجْعَلْ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَتَقْعُدَ مَذْمُومًا مَّخْذُولًا ﴿٢٢﴾ ﴾:

لێرەدا بـاسی یەكەمیـن سـیفەت كـراوە، بـەڵام یەكەمیـن سـیفەتی خـراپ، كـە بریتیـە لـە هاوبـەش بـۆ خـوا دانـان و پەرسـتنی جگـە لـە خـوا، لەگـەڵ خـوادا.

### شیكردنەوەی ئەم ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿ لَّا تَجْعَلْ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ ﴾، لەگەڵ خوادا پەرستراوی دیكە دامەنێ، (إله) واتە: پەرستراو، (اللَّه) خوا ﷻ، پەرستراوی ڕاستەقینە، پەرستراوێك كە شایستەی پەرستران بێ تەنیا خوایە، وەك زۆرجاری دیكە گوتوومە: بە داخەوە زۆرێك لە مامۆستایان و، وتاربێژەكان تاكو ئێستا جیاوازیی ناخەنە نێوان (إله) و (اللَّه)ەوە! چونكە (اللَّه) واتە: خوا، بە كوردیی دەڵێین: خوا، بە فارسیی دەڵێین: (خُدا)، بە ئینگلیزیی دەڵێین: (God)، بە هەموو زمانەكان ناوی خوا، بریتیە لەو پەرستراوە ڕاستەقینەیەی كە خاوەنی گەردوونە، خاوەنی ئەو بوونەیە، بەدیهێنەر و پەروەردگار و خاوەنە، بەڵام (إله) دەگونجێ هەر خوا (اللَّه) بێ ﷻ، كە ئەو كاتە (إله)ی ڕاستەقینەیە، دەشگونجێ (إله) جگە لە خوا بێ، بۆیە (إله) كۆدەكرێتەوە و (تَثْنِيَة)ش دەكرێ، (إله، إلـهَان، آلِـهَة...)، بەڵام (اللَّه) نە دەكرێ بە دووان (مثنّی) و نە كۆ (جمع)یش دەكرێتەوە.

زۆرجـاران زۆر دڵـم نارەحـەت دەبـێ كـە دەبیسـتم دەڵێـن: خوایـەكان! چونكـە (خـوا) كۆناكرێتـەوە، بەڵكـو ناكرێتـە دووانیـش، خـوا خوایـە، جگـە لـە خـوا هەمـووی كاو بایـە، جگـە لـە خـوا، هەمـوو شـتەكان دروسـتكراوەكانی خـوان، بـەڵام دەگونجێ بڵێیـن: پەرسـتراو، پەرسـتراوەكان، خـوا دەفەرمـوێ: لەگـەڵ خـوادا پەرسـتراوی دیكـە دامەنـێ، كەواتـە: دەگونجـێ پەرسـتراوی دیكـە هەبـێ، بـەڵام ناگونجـێ خـوای دیكـە هەبـێ! هـەر یـەك خوایـە، هـەر یـەك زات، بەدیهێنـەرو پـەوەردگارو خـاوەنی ئـەم بوونەیـە، كـە دەیبینیـن، ئـەوی دیكـە دەگونجـێ بەهەڵـە وەك خـوا

مامەڵەی لەگەڵدا بکرێ و بەندایەتیی بۆ بکرێ و بهێنرێتە ڕیزی خواو ئاستی خوا، لە وەهم و خەیاڵی مرۆڤەکاندا، ئەگەرنا لە واقیع و خودی حاڵ (**نفس الأمر**)دا جگە لە خوا، پەرستراوی دیکە نیە.

٢)- ﴿ فَتَقۡعُدَ ﴾ {ئەگەر تۆ لەگەڵ خوادا پەرستراوی دیکە دابنێی} دادەنیشیی، ڕۆدەنیشی، (**القُعُودُ: مُسْتَعَارٌ لِمَعْنَى الْمُكْثِ وَالدَّوَامِ**)، وشەی (**قعود**) خوازراوەتەوە بۆ مانای مانەوەو بەردەوام بوون، یانی: بەردەوام دەبی و دەمێنیەوە بەبێ دەستەڵاتیی.

بەڵام من پێم وایە: (**مُسْتَعَارٌ لِمَعْنَى العَجْزِ وَعَدَمِ الحَرَكَة**)، بۆ دەستەپاچەیی و نەجووڵان، چونکە مرۆڤ وەختێك کە دادەنیشێ دەڵێن: فڵان کەس دانیشتوە، هەر ئەو تەعبیرە زۆر بەکاردەهێنرێ، یانی: وازی هێناوە لەو کارەی کە دەبێ بە پێوە ئەنجام بدرێ، وەك لە سوورەتی (**النور**)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلۡقَوَٰعِدُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ ﴾، (**قواعد**) کۆی (**قاعدة**)یە، (**إِمْرَأَة قاعدة**) واتە: دانیشتوە لەحاڵێکدا کە ئافرەت لە حەیز دەچێتەوە، مانای وایە توانای ئەوەی نەماوە منداڵی ببێ، دەڵێن: ئافرەتە لە بێنوێژیی چۆتەوە، ئەوکاتە پێی دەگوترێ: ئافرەتێکی (**قاعدة**)، کەواتە: (**قواعد**) یانی: ئافرەتانێك کە بە تەمای منداڵ بوون نەماون، یاخود بە تەمای هاوسەرگیریی نەماون و کەوتوونە تەمەنەوە.

وشەی (**قعود**) دانیشتن لە زمانی عەرەبیدا بۆ حاڵەتی زەم بەکارهێنراوە، بۆ وێنە: شاعیرێك کە هەجووی شاعیرێکی دیکە دەکات دەڵێ:

**دع الْمكارم لا تَرْحَلْ لِبُغْيَتها ... وَاقْعُد فَإِنَّكَ أَنْتَ الطَّاعِم الكاسي**

واتە: واز لە ڕەوشتە بەرزەکان بێنەو سەفەر مەکە بۆ وەدەست هێنانیان و، دانیشە هەر بخۆ و پۆشاکی جوان لەبەر بکە.

واتە: تۆ وا باشە هەر سەرگەرمی خواردن و پۆشینی پۆشاك بی، تۆ هی ئەوەنی بە دوای ڕەوشتە بەرزو جوانەکاندا بڕۆی.

ئنجا وشەی: دانیشتن لە زمانی کوردییشدا هەروایە، دەڵێ: دانیشە، یان هەڵمەستە، یان ئەگەر کەسێك بیەوێ بڵێ: فڵان ئیشە بکە، دەڵێ: هەڵسە بە دوای دا بچۆ.

٣)- ﴿ مَذۡمُومٗا ﴾، لە حاڵێکدا کە تۆ زەمکراویی، عەیبداریی و ڕەخنە لێگیراویی، ﴿ مَذۡمُومٗا ﴾، (**المَذْموم: المَذْكُورُ بالسُّوءِ وَالعَيْبِ: المعيُوب**)، واتە: کەسێك کە بە خراپە و بە عەیب باس دەکرێ، واتە: عەیب لێگیراو و ڕەخنە لێگیراو.

٤)- ﴿ مَّخْذُولًا ﴾، پشت بەردراوی، واتە: وازلێهێنراوو پشت بەردراوی، (المَخْذُولُ: الَّذِي أَسْلَمَهُ نَاصِرُهُ)، واتە: کەسێکە کە بابایەك کە دەبوو سەری بخات و پشتی بگرێ، وێڵی بکات لێی بگەڕێ و پشتی بەربدات، واتە: پشت بەردراو.

وەك لە سوورەتی (فاطر)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ إِن تَدْعُوهُمْ لَا يَسْمَعُوا۟ دُعَآءَكُمْ وَلَوْ سَمِعُوا۟ مَا ٱسْتَجَابُوا۟ لَكُمْ ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ يَكْفُرُونَ بِشِرْكِكُمْ ۚ وَلَا يُنَبِّئُكَ مِثْلُ خَبِيرٍ ﴿١٤﴾ ﴾، واتە: ئەگەر بانگیان بکەن، بانگکردنەکەتان نابیستن و، ئەگەر گریمان بیستباشیان نەیاندەتوانی وەڵامتان بدەنەوە و لە ڕۆژی قیامەتیشدا بێبڕوا دەبن بەو هاوبەشدانانەی ئێوە، {کە ئێوە ئەوان دەکەنە هاوبەشی خوا} هیچ کەسێك وەك شارەزا هەواڵت پێنادات {کە خوایە ﷻ}.

**مەسەلەی دووەم:**

**پەروەردگارت بڕیاری داوە، حوكمی كردوە كە جگە لەو نەپەرستن:**

خوا دەفەرمویٚ: ﴿ وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ ... ﴿٢٣﴾ ﴾.

ئەوەی پێشێ (مەسەلەی یەكەم) فەرمووی: لەگەڵ خوادا پەرستراوی دیكە دامەنێن.

بەڵام ئەمەیان دەفەرمویٚ: پەروەردگارت بڕیاری داوە: كە ئەو بپەرستن و جگە لەو نەپەرستن، ئەوەی پێشێیان باسی شیرك بوو، باسی پەرستنی جگە لە خوا بوو، ئەمەیان باسی تەنیا پەرستنی خوایە، باسی تەوحیدە.

ئێمە كۆی ئەو بیست و چوار (٢٤) خەسڵەتە، بەپێی ڕیزبەندیی ئایەتەكان دەهێنین، كەواتە: ئەمە ڕەوشت و ئاكاری دووەم، بەڵام هی یەكەمیان یەكەمین ڕەوشتی خراپ بوو، ئەمەشیان یەكەمین ڕەوشتی چاكە، كە بریتیە لە: تەنیا بەندایەتیی كردن و تەنیا پەرستنی خوا ﷻ و خۆپاراستن لە پەرستنی جگە لە خوا، واتە: هی پێشێ ڕێگریی بوو لە شیرك و، ئەمەیان فەرمانە بە تەنیا پەرستنی خوا ﷻ.

كەواتە: بناغەی كۆمەڵگایەكی ساغ و تەندروست: بەندایەتیی كردنە بۆ خوای تاكی بێ هاوەڵ و هاوتا ﷻ، ئنجا خۆپاراستنە لەوە كە هیچ كەس و هیچ شتێك بریٚتە ئاستی خوا، لە مامەڵە لەگەڵ كردنیدا، چ لە بەدیهێنەرایەتییدا، چ لە پەروەردگارێتییدا، چ لەخاوەندارێتییدا، چ لەناو سیفەتەكانیدا، چ لە پەرستشەكاندا، كە پەرستشەكان بە گشتی دەبنەوە بە دوو جۆر: (**شعائر و شرائع**)، (**شعائر**): كۆی (**شعيرة**)یە، واتە: دروشمەكان، كە ئەوانە زیاتر پەیوەندییان بەلایەنی ڕۆحییەوە هەیە و، زیاتر پەیوەندییان بەتاكەكانەوە هەیە، بەڵام (**شرائع**) كۆی (**شريعة**)ە، واتە: ئەو یاسایانەی كە ژیانی سیاسیی و، ئابووریی و، كۆمەڵایەتیی، كۆمەڵگایان پێ ڕێك دەخرێ، كە ئەوانە زیاتر پەیوەندییان بە لایەنە مادییەكانەوە و پەیوەندییان بە لایەنی گشتی كۆمەڵگاوە هەیە، كەواتە: كاتێك خەڵك تەنیا خوا دەپەرستێ، كە دروشمەكانی پەرستنی، تەنیا بۆ خوا بن.

ئنجا دروشمەكان (**شعائر**): سەجدەو ڕكووعە، نزاو پاڕانەوەیە، ئەوپەڕی خۆشویستن و، ئەوپەڕی لێ ترسان و، ئەوپەڕی بە گەورەگرتن و، ئەوپەڕی مل بۆ كەچكردن و، ئەوپەڕی پشت

پـێ بەسـتنە، ئەوانـە دەبـێ تەنیـا بـۆ خوابـن و، ڕکـووع و، سـەجدەو، نوێـژو، تاعـەت و، ڕۆژووگرتـن و، تـەواف و، نـەزرو، قوربانیـی و، سـوێند پـێ خـواردن و ... هتـد، دەبـێ تەنیـا پێشـکەش بەخـوا بکرێـن و تەنیـا بـۆ خـوا ئەنجـام بدرێـن.

بەرنامـەکان (**شرائع**)یـش: واتـە: ئـەو یاسـاو دەسـتوورانەی کـە ژیـانی کۆمەڵگایـان پـێ ڕێکدەخـرێ، لەهەمـوو بـوارەکانی: تاکیـی و، خێزانیـی و، کۆمەڵایەتیـی و، سیاسـیی و، ئابووریـی و، جەنـگ و، ئاشـتیی و، پەیوەندییـەکان دا، دەبـێ تەنیـا لـە خـواوە وەربگیرێـن، ئـەو کاتـە ئـەو کۆمەڵگایـە، مانـای وایـە: تەنیـا خـوای پەرسـتوە ﷻ، ئنجـا ئێمـە لـە کۆتایـی تەفسـیری سـوورەتی (**یوسـف**)دا، بـە درێژیـی قسـەمان کـردوە دەربـارەی: تەنیـا خواپەرسـتیی و خۆپاراسـتن لـە پەرسـتنی غەیـری خـوا، کـە شـیرکە، بۆیـە لێـرەدا ناچینـەوە سـەر ئـەو بابەتـە، بـەڵام لێـرەدا پێویسـتە ئـەوە بخەینـەڕوو، کـە وشـەی (**قضی**) لـە زمـانی عەرەبییـدا و لـە بەکارهێنـانی قورئانـدا، بـە شـەش مانایـان بەکارهاتـوە:

**یەکەم:** (القَضَاءُ بِمَعْنَى الأَمْر): بە مانای فەرمان کردن، وەك: ﴿ وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ ﴾، واتە: پەروەردگارت فەرمانی کردوە، کە جگە لەو نەپەرستن.

**دووەم:** (القَضَاءُ بِمَعْنَى الخَلْق): بە مانای دروستکردن و بەدیهێنان، وەك لە سوورەتی (**فصلت**)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ فَقَضَىٰهُنَّ سَبْعَ سَمَٰوَاتٍ فِى يَوْمَيْنِ ... ﴿١٢﴾ ﴾، واتە: خوا حەوت ئاسمانی دروستی کردن (هێنانیە دی و تەواوی کردن) لە دوو ڕۆژاندا، {واتە: بە دوو قۆناغ}.

**سێیەم:** (**القَضَاءُ بِمَعْنَى الحُكْم**)، بە مانای داوەریی و بڕیاردان، وەك لە سوورەتی (**طه**)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ فَٱقْضِ مَآ أَنتَ قَاضٍ ... ﴿٧٢﴾ ﴾، ئەو جادووگەرانەی کە فیرعەون کۆی کردبوونەوە بۆ دژایەتیی مووسا، دوای ئەوەی موعجیزەکەی مووسا دەبینن و، دەزانن کە ئەوە موعجیزەیە و لە خواوە هاتوە بە مووسا دراوە و، لە جۆری سیحر نیە و مسوڵمان دەبن، فیرعەون هەڕەشەیان لێدەکات کە دەست و پێی ڕاست و چەپیان ببڕێ و، بە گلۆپکی دار خورمایان هەڵبواسێ، پێی دەڵێن: ﴿ فَٱقْضِ مَآ أَنتَ قَاضٍ ﴾، واتە: هەرچی بڕیاری لەسەر دەدەی، بڕیاری لەسەر بدە، واتە: بێ منەت بە، چی دەکەی، بیکە، چی بڕیار دەدەی، بڕیار بدە، کەواتە: لێرەدا وشەی (**قضی**) بە مانای بڕیاردان و حوکم کردنە.

**چوارەم:** (القَضَاءُ بِمَعْنَى الفَرَاغ): لە قورئاندا بە مانای: ئەنجامدان و لێبوونەوە لە شتێکیش دێ، لە چەند شوێنێکی قورئاندا دەتوانین نموونەی بۆ بێنینەوە، بۆ وێنە:

أ - لە سووڕەتی (**البقرة**) (٢٠٠)دا، خوا دەفەرمویّ: ﴿ فَإِذَا قَضَيْتُم مَّنَاسِكَكُمْ ﴾، واتە: هەرکات پەرستشەکانی حەجتان تەواو کردن، (**قضيتم**) واتە: (**أكملتم أو أتممتم**) تەواوتان کردن، لێبوونەوە.

ب - لە سووڕەتی (**الجمعة**)دا دەفەرمویّ: ﴿ فَإِذَا قُضِيَتِ الصَّلَوٰةُ ... (١٠) ﴾، (**قضيت الصلاة يعني: أدّيت الصلاةُ، أو أُكمِلت الصلاةُ، أو أُتِمَّت الصلاةُ**) یانی: نوێژەکە کرا، یان تەواو کرا، یان: کۆتایی هات.

ج - هەروەها لە سووڕەتی (**يوسف**) (٤١)دا، دوای ئەوەی یوسوف ﷺ تەعبیری دوو خەونەکە بۆ دوو هاوەڵە زیندانییەکەی دەکات، دوایی دەڵێ: ﴿ قُضِيَ الْأَمْرُ الَّذِي فِيهِ تَسْتَفْتِيَانِ (٤١) ﴾، واتە: ئەو کارەی کە ئێوە لەبارەیەوە پرسیارتان دەکرد، کۆتایی هات و، تەواو بوو، واتە: ئەوە خەونەکەم بۆ تەعبیر کردن و، کارەکە تەواو بوو.

**پێنجەم:** (**القَضَاءُ بِمَعْنَى الإِرَادَة والمشيئة**): بە مانای ویستن و خواستن، وەك لە سووڕەتی (**آل عمران**)دا خوا دەفەرمویّ: ﴿ ...إِذَا قَضَىٰ أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُ كُن فَيَكُونُ (٤٧) ﴾، واتە: هەرکات خوا کارێکی ویست، بەس پێی بفەرمویّ: ببە، دەبێ.

**شەشەم:** (**القَضَاءُ بِمَعْنَى العَهْدِ**): واتە: ڕاسپاردن، وەك لە سووڕەتی (**القصص**)دا خوا دەفەرمویّ: ﴿ وَمَا كُنتَ بِجَانِبِ الْغَرْبِيِّ إِذْ قَضَيْنَا إِلَىٰ مُوسَى الْأَمْرَ... (٤٤) ﴾، واتە: تۆ لەلای ڕۆژئاوا نەبووی کاتێك کە ئێمە ئەو کارەمان بە مووسا ڕاگەیاند و پێمان سپارد، لێرەدا (**قَضَيْنَا يَعْنِي: عَهِدْنَا**)، کاتێك کە ڕامان سپارد و پێمان ڕاگەیاند، وەسیەتمان بۆ کرد.

ئەمە تەفسیری (**القرطبي**)[1] هێناویەتی و تەفسیرەکانیش ئاماژەیان پێکردوە و، لەوانەیە (**قضى**) بە مانای دیکەش، هاتبێ.



(١) الجامع الأحكام القرآن. ج١٠ ص٢٣٧.

مەسەلەی سێیەم:

**هەروەها پەروەردگارت فەرمانی کردوە و، بڕیاری داوە، کە ئەوپەڕی چاکە لەگەڵ باب و دایکدا بکەن و، هەرکات لەلات کەوتنە تەمەنەوە، یەکێکیان یان هەردووکیان تەنانەت وشەیەکی ناخۆشیشیان پێ مەڵێ و، تێیان مەخوڕە و، بەڕێزەوە بیاندوێنە و باڵی میهرەبانییان بۆ شۆڕبکەو، بڵێ: پەروەردگارم! وەك چۆن منیان بە گچکەیی پێ گەیاندوە، بەزەییت پێیاندا بێ:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَـٰنًا ۚ إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ ٱلْكِبَرَ أَحَدُهُمَآ أَوْ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا ﴿٢٣﴾ وَٱخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ ٱلذُّلِّ مِنَ ٱلرَّحْمَةِ وَقُل رَّبِّ ٱرْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِى صَغِيرًا ﴿٢٤﴾ ﴾.

کە ئەم دوو ئایەتە ڕەوشتەکانی: سێیەم و چوارەم و پێنجەم و شەشەم و حەوتەم و هەشتەم، دەگرنە خۆیان، بە تێکەڵیی: هەم لە ڕەوشتە چاکەکان، هەم لە خو ووخدە خراپەکان، کە ئێمە پێشتر پۆلێنمان کردن بۆ دوازدە بە دوازدە (١٢ - ١٢).

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ بڕگەدا:

١)- ﴿ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَـٰنًا ﴾، ئەمە دەگێڕدرێتەوە و بادەدرێتەوە بۆ ئەوەی پێشێ: ﴿ وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَـٰنًا ﴾، (**يَعْنِي وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَنْ تُحْسِنُوا بالوَالِدَيْنِ إِحْسَاناً**)، واتە: پەروەردگارت فەرمانی کردوە کە: لەگەڵ باب و دایکتاندا چاکەکاریی بکەن، چاکەکاریی بکەنە پیشە.

کە دەفەرموێ: ﴿ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَـٰنًا ﴾، بەبێ (ب) دەگونجا خوا بفەرموێ: (**وَأَحسِنُوا إلى الوالِدَينِ إحْسَاناً**)، بەڵام لێرەدا کە بە (ب) تەعەددای کردوە، ئەمە مانای لوتفی خراوەتە نێو، وەك لە سوورەتی (**یوسف**)دا، یوسوف عليه السلام دەفەرموێ: ﴿ وَقَدْ أَحْسَنَ بِىٓ إِذْ أَخْرَجَنِى مِنَ ٱلسِّجْنِ... ﴿١٠٠﴾ ﴾، بێگومان خوا چاکەی لەگەڵ کردم {بەڵام لێرەدا (**أحسن**) وشەی لوتفیشی خراوەتە نێو} واتە: چاکەی لەگەڵ کردم و میهرەبانیی و لوتف و پەنهانکاریی لەگەڵ مندا ئەنجامدا، کاتێك کە منی لە زیندان دەرهێنا.

لێرەشدا: ﴿ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا ﴾، یانی: چاکەیان لەگەڵدا بکەن و لەگەڵیشیاندا بە لوتف بن، بۆیە وشەی (**إحسان**) بەرکاری خواستوە و گواستوویەتەوە بۆ بەرکار.

٢)- ﴿إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ ٱلْكِبَرَ أَحَدُهُمَآ أَوْ كِلَاهُمَا ﴾، هەرکات لەلای تۆ کەوتنە تەمەنەوە و بەساڵدا چوون، یەکێکیان، یان هەردووکیان.

وشەی (**إمّا**) لە ئەسڵدا (**إن ما**)یە، بەڵام تێکدا دەغم کراون، تێکهەڵکێش کراون.

﴿إِمَّا يَبْلُغَنَّ ﴾، خوێنراویشەتەوە: (**إمّا يَبْلُغآنِّ**) کە هەر یەك مانایان هەیە، کە دەفەرموێ: ﴿ أَحَدُهُمَآ أَوْ كِلَاهُمَا ﴾، لێرە خوا ﷻ دەیتوانی بفەرموێ: (**إمَّا يَبْلُغَانِّ عِنْدَكَ الكِبَرَ**)، واتە: هەردووکیان، بەڵام بۆچی فەرموویەتی: ﴿ أَحَدُهُمَآ أَوْ كِلَاهُمَا ﴾؟ پسپۆڕانی زمان دەڵێن: ئەمە مانای گرنگیی پێدان دەگەیەنێ، واتە: ئەگەر یەکێکیان بە تەنیا، ئنجا بابە یان دایکە، یاخود هەردووکیان پێکەوە، لەلای تۆ کەوتنە تەمەنەوە، یانی: خوای پەروەردگار دەیەوێ پێمان بفەرموێ: لە هەموو حاڵەتەکاندا، چ لە حاڵەتێکدا کە باب بە تەنیا لای تۆ دەکەوێتە تەمەنەوە، چ لە حاڵەتێکدا کە دایك دەمێنێتەوە لەلای تۆ دەکەوێتە تەمەنەوە، چ لە حاڵەتێکدا کە هەردووکیان پێکەوە لەلای تۆ دەکەونە تەمەنەوە، ئەی مرۆڤ! تۆش کوڕی، یان کچی، باب و دایکت کە لەلای تۆ کەوتنە تەمەنەوە، تۆ لە خزمەتیان دابە، لەلای تۆ، واتە: تۆ بە خێویان بکە و سەرپەرشتییان بکە و وێڵیان مەکە، بەڵکو لەگەڵیاندابە و لە خزمەتیاندا بە، مەگەر خۆیان ئارەزوومەندی ئەوە بن ماڵیان جیابێ، ئەگەرنا تۆ هەر لە خزمەتیان دابە، بۆیە فەرموویەتی: ﴿ عِندَكَ ﴾، واتە: لەلای تۆ، یانی: تۆ هەر لەگەڵیان دابەو لە خزمەتیاندا بە! دوایی باسی دەکەین، کە دەبێ چۆنیان مامەڵە لەگەڵدا بکات؟ لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا ﴾، (**الوالدين**) دیارە (**ال**) تەعریفی لەسەرە، ئەو ناساندنەش بۆ جینسە (**للإستغراق**)، کەواتە: (**والدين**) بەبێ (**ال**)ی تەعریف، واتە: باب و دایك و، ئەو وشەیە بابیش و دایکیش دەگرێتەوە، بەڵام کە (**ال**)ی چووە سەر، واتە: باب و دایکی تاك تاکی مرۆڤەکان، واتە: ئەی ئەو مرۆڤانەی کە خوا دەتاندوێنێ! بە پیاوو ئافرەتەوە، ئەگەر هەرکام لە ئێوە، باب و دایکی هەردووکیان، یان یەکێکیان، لەلای کەوتنە تەمەنەوە، لە کاتێك دا کە خۆی لە خزمەتیان دایە.

٣)- ﴿ فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ ﴾، تۆ ئۆففیان پێ مەڵێ، (**أُفّ**) پێشتر باسمان کرد (أف: **إسم فعل مضارع، أي: أتضَجَّر**)، واتە: من بێزارم، نارەحەتم.

ئەمە بەسێ جۆر خوێندراوەتەوە:

أ- خوێنراوەتەوە:(أُفٍّ).

ب- خوێنراویشەتەوە:(أُفَّ).

ج- خوێنراویشەتەوە:(أُفًّ)، بەڵام زیاتر بە (أُفٍّ) خوێنراوەتەوە، یانی: من نارەحەتم و بێزاریی دەردەبڕم، {ئەوەیان پێ مەڵێ}.

٤)- ﴿وَلَا تَنْهَرْهُمَا﴾، دەڵێ: (النَّهرُ: الزَّجرُ، وَنَهَرَهُ وَانْتَهَرَهُ أَي: زَجَرَهُ)، واتە: (نَهر) و (زَجر) مانایان لێك نزیكە، واتە: تێوەخوڕین و لێ تووڕە بوون، قسەی توند لەگەڵ كردن.

یانی: قسەی توندیان لەگەڵ مەكە، تێیانەوە مەخوڕە.

٥)- ﴿وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا﴾، قسەیەكی بەڕێزو حورمەتیان لەگەڵدا بكە.

وشەی (كریم) (**الكريم من كلِّ شيء: الرفيع في نوعه، أو المَرْضِيُّ المحمود**)، واتە:(كریم) لەهەر شتێكدا واتە: باشترین لەجۆری خۆی، بۆ نموونە:

١- ئەگەر بفەرمویّ: ﴿مِن كُلِّ زَوْجٍ كَرِيمٍ ۝٧﴾ **الشعراء**، واتە: لەهەر ڕووەكێك كە زۆر بەرهەمدارە.

٢- بەڵام (**وجْهٌ كريم**)، واتە: ڕوویەكی جوان.

٣- ﴿كِتَٰبٌ كَرِيمٌ ۝٢٩﴾ **النمل**، واتە: كتێبێك كە زۆر بەخشندەیەو زانیاریی بە خوێنەرەكەی دەبەخشێت.

لێرەشدا (**كريم**) واتە: پەسەند كراوو ستایشكراو، یانی: قسەیەكی پەسەند كراوو ستایشكراوو باشیان لەگەڵدا بكە

٦)- ﴿وَٱخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ ٱلذُّلِّ﴾، باڵی میهرەبانییان بۆ شۆڕ بكە، ﴿جَنَاحَ﴾، واتە: باڵ، ﴿ٱلذُّلِّ﴾، واتە: ملكەچیی، ﴿وَٱخْفِضْ﴾، واتە خواری بكەوە و شۆڕی بكەوە و، بەرزی مەكەوە.

بەڵام كە باڵی ملكەچییان بۆ شۆڕ دەكەی، دەبێ هاندەرەكەت چی بێ؟

٧)- ﴿مِنَ ٱلرَّحْمَةِ﴾، دەبێ لەڕووی بەزەییەوە بێت، (**من الرحمة**):(**من إبتدائية أي الذُّلُّ الناشئ عن الرحمة، لا من الخوف والمداهنة**)، واتە: ئەو باڵ شۆڕكردنی میهرەبانییە، با لە بەزەییەوە بێت، باڵە شۆڕەیەك كە لەبەزەییەوە پەیدا بووە، نەك لە ترسەوە، یاخود لە مامەڵەیەكی ڕووكەشیی و ڕواڵەتییانەی بێ ڕووح، لەگەڵ باب و دایكدا!

٨)- ﴿ وَقُل رَّبِّ ٱرْحَمْهُمَا ﴾، بشڵێ: پەروەردگارم! بەزەییت پێیاندا بێت، لەگەڵیان میهرەبان بە.

٩)- ﴿ كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيرًا ﴾، وەك چۆن منیان بە گچکەیی بەخێوکرد و هەراش کرد.

ئەمە سەرنجمان ڕادەکێشێتەوە بۆ ئەوەی: کە ئەی مرۆڤ ! بزانە هەر وەك ئێستا نەبووی، کە مرۆڤێکی پڕ بەکراسی، بەڵکو بزانە لەچییەوە هاتووی! چۆن سەرەتا دایکت نۆ (٩) مانگ لەسکی خۆیدا هەڵیگرتووی، ژانی پێوە گرتووی و پێتەوە ناڕەحەت بووە، وەك خوای پەروەردگار باسی دەکات، هەروەها دوای قۆناغی کۆرپەیی، بە مەلۆتکەیی چەندە پێتەوە گرفتار بووە، پاشان بابت خەمی لێخواردووی، هەروەها دایکت خەمی لێ خواردووی، پێیان گەیاندووی، هەتا هەراش بووی و گەورە بووی، ئنجا ئێستاش کە ئەوان پێویستییان بەخزمەتی تۆیە، سەردەمی گچکەیی خۆت بەبیر بێتەوە و بۆیان لە پەروەردگارت بپاڕێوە، هەرچی بۆخۆت پێت دەکرێ بۆیان ئەنجام بدە، ئەوەی کە پێشت ناکرێ، لە خوای پەروەردگارت داوا بکە، کە بەزەیی پێیاندابێ و، لەگەڵیان بەکەرەم و بە لوتف بێ.

## کورتە باسێک دەربارەی چاکە لەگەڵ دایک و بابدا

ئێمە ئەم کورتە باسە، لە چوار بڕگان دا باس دەکەین:

### بڕگەی یەکەم: پێگەو پلەی چاکە لەگەڵ باب و دایکدا، لە قورئان و سوننەتدا:

سەرەتا با بزانین: ئەگەر مرۆڤ لەگەڵ باب و دایکیدا چاك بێ، خزمەتیان بکات و ڕێزیان لێ بگرێ، چ پێگەو پلەیەکی هەیە؟ بێگومان لە ئیسلامدا بایەخێکی زۆر بەڕێزگرتن، چاکە لەگەڵ کردنی دایك و باب دراوە، لە زۆر لە ئایەتان دا خوا ﷻ ئەوەی باس کردوە، هەروەها لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەردا ﷺ دیسان ئەوە زۆرە، کە ئێمە وەك نموونە حەوت ئایەت و حەوت فەرمایشتی پێغەمبەریش ﷺ دێنین:

**أ- حەوت ئایەت لە بارەی پلەوپایە و پاداشتی چاکە لەگەڵ باب و دایك دا:**

١)- لە سوورەتی (الإسراء) (٢٣)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا ...﴾، واتە: پەروەردگارت فەرمانی کردوەو بڕیاری داوە، کە جگە لەو مەپەرستن و، چاکەکاریی لەگەڵ باب و دایکتاندا بکەنە پیشە.

٢)- لە سوورەتی (النساء)دا دەفەرموێ: ﴿وَٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُشْرِكُواْ بِهِۦ شَيْـًٔا ۖ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا ... ﴿٣٦﴾﴾، واتە: خوا بپەرستن و، هیچ شتێك مەکەنە هاوبەشی و، لەگەڵ باب و دایکیشتاندا چاکەکاریی بکەنە پیشە.

وەك دەبینین: خوا ﷻ لە دوای پەرستنی خۆی، یەکسەر باسی چاکە لەگەڵ باب و دایکدا دەکات.

٣)- لە سوورەتی (الأحقاف)دا دەفەرموێ: ﴿وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ إِحْسَٰنًا ۖ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ كُرْهًا وَوَضَعَتْهُ كُرْهًا ۖ وَحَمْلُهُۥ وَفِصَٰلُهُۥ ثَلَٰثُونَ شَهْرًا... ﴿١٥﴾﴾، واتە: مرۆڤمان ڕاسپاردوە، کە چاکە لەگەڵ باب و دایکیدا بکات، دایکی بە زەحمەت هەڵیگرتوە و، بە زەحمەتیش دایناوە، پاشان هەڵگرتنی و لەشیربڕینەوەی، سی (٣٠) مانگی خایاندوە.

کە ئەمە زانایان دەیکەنە بەڵگە، لەسەر ئەوە کە دەگونجێ، کۆرپە تەنیا شەش (٦) مانگ لە سکی دایکیدا بمێنێتەوە و بشژی، واتە: دەڵێن: (**أَقَلُّ الحَمْلِ سِتَّةُ أَشْهُرٍ**)، کەمترین ماوەی کۆرپە لە سکی ئافرەتی دووگیاندا، شەش مانگە.

٤)- لە سوورەتی (**العنكبوت**)دا دەفەرموێ: ﴿ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حُسْنًا ۖ وَإِن جَٰهَدَاكَ لِتُشْرِكَ بِى مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَآ ۚ إِلَىَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٨﴾ ﴾، واتە: مرۆڤمان ڕاسپاردوە کە چاکە لەگەڵ باب و دایکیدا بکات.

(**حُسْنًا**) یانی: (**أَحْسِنْ مَعَهُمْ حُسْنًا**)، چاکەیان لەگەڵدا بکە چاکەی تێروتەواو، ئەوەی پێشێ کە فەرمووی: (**إِحْسَانًا**) کە هەریەك واتایان هەیە، بەڵام (**إِحْسَان**) چاوگە و (**حُسْن**) ناوە.

٥)- لە سوورەتی (**لقمان**)دا دەفەرموێ: ﴿ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ وَفِصَٰلُهُۥ فِى عَامَيْنِ أَنِ ٱشْكُرْ لِى وَلِوَٰلِدَيْكَ إِلَىَّ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٤﴾ ﴾، واتە: هەروەها مرۆڤمان ڕاسپاردوە سەبارەت بە باب و دایکی، دایکی بێ هێزیی لەسەر بێ هێزیی هەڵیگرتوە.

واتە: تاکو ئەو منداڵە لە منداڵدانی سکی دایکیدا گەورەتر دەبێ، بێگومان لە وزەو هێزو پێزی دایکی، ئەو منداڵە پێدەگات، بۆیە تاکو منداڵەکە هەراشتر دەبێ و، کۆرپەکە لەسکی دایکی دا گەورتر دەبێ، دایکی بێ هێزتر دەبێ، ﴿ وَفِصَٰلُهُۥ فِى عَامَيْنِ ﴾، دواییش لەشیرگرتنەوەیشی لە ماوەی دووساڵاندا، ﴿ أَنِ ٱشْكُرْ لِى وَلِوَٰلِدَيْكَ إِلَىَّ ٱلْمَصِيرُ ﴾، (خوا ڕایسپاردوە و دەفەرموێ:) سوپاسگوزاریی بۆ من بکەو، بۆ دایك و بابیشت بکە و سەرەنجام بۆ لای منە، واتە: دێنەوە لای من داخۆ چۆن لەگەڵ باب و دایکتاندا مامەڵەتان کردوە؟!

ئەم ئایەتەی سوورەتی (**لقمان**) کە دەفەرموێ: لە شیربڕینەوەی منداڵ (**فِصال**) لە دوو ساڵییدا دەبێ، واتە: شیر پێدانی منداڵ، لای زۆرییەکەی دەبێ دوو ساڵان بخایەنێ و، ئایەتەکەی سوورەتی (**الأحقاف**)یش کە دەفەرموێ: ﴿ وَحَمْلُهُۥ وَفِصَٰلُهُۥ ثَلَٰثُونَ شَهْرًا ﴾، هەڵگرتنی لەسکدا و ماوەی شیر پێدان و لێبڕینەوەشی، لە ماوەی سی (٣٠) مانگدا. کەواتە: دوو ساڵ کە دەکاتە بیست وچوار (٢٤) مانگ لە سی (٣٠) مانگەکە دەربکە، دەمێنێتەوە (٦) مانگ (٣٠ - ٢٤=٦)، کەواتە: لای کەمی دووگیانیی (**حَمْل**) شەش مانگە و دوو ساڵ (٢٤ مانك)یش شیر پێدان، دەکاتە سی (٣٠) مانگ.

٦)- لە سوورەتی (البقرة)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ لَا تَعْبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَانًا ..... ﴿٨٣﴾ ﴾، واتە: یادبکەوە! کاتێك پەیمانی پتەومان لە وەچەی ئیسرائیل وەرگرت (لە جوولەکە)، کە جگە لە خوا ناپەرستن و لەگەڵ باب و دایکیشتاندا چاك دەبن، چاکەکاریی بکەنە پیشە.

٧)- لە سوورەتی (الأنعام)دا، دەفەرموێ: ﴿ قُلْ تَعَالَوْا۟ أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ أَلَّا تُشْرِكُوا۟ بِهِۦ شَيْـًٔا وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا ... ﴿١٥١﴾ ﴾، واتە: بڵێ: وەرن! ئەوەی خوای پەروەردگارتان لێی قەدەغە کردوون، بە سەرتاندا بخوێنمەوە: هیچ شتێك مەکەنە هاوبەشی خوا، {ئەوە قەدەغەیە} ﴿ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا ﴾، لەگەڵ باب و دایکتاندا چاکەکاریی بکەنە پیشە و خۆتان بپارێزن لە پێچەوانەی چاکەکاریی، کە بریتیە لە هێشاندنی دڵی دایك و باب (**عقوق الوالدين**) و بێ فەرمانیی کردنیان و دڵ ڕەنجاندیان.

شایانی باسە: ئێمە لە بەرگی پێنجی ئەم تەفسیرە {تەفسیری سوورەتی (**الأنعام**)}دا، بە درێژیی باسی ئەو ئایەتانەمان کردوە، کە ئەو دە (١٠) ئەرکەیان گرتوونە خۆیان، کە پێیان دەگوترێ: (**الوَصَايَا العَشْر**) دە وەسیەتەکان، لەوێدا بەدرێژیی قسەمان لێ کردوون.

**ب- حەوت فەرموودە دەربارەی پلە وپایە و پاداشتی چاکە لەگەڵ باب و دایك دا:**

١)- {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ سَأَلْتُ النَّبِيَّ ﷺ أَيُّ الْعَمَلِ أَحَبُّ إِلى اللَّهِ؟ قَالَ: الصَّلاةُ عَلى وَقْتِها، قَالَ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: ثُمَّ بِرُّ الْوالِدَيْنِ، قَالَ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: الْجِهادُ في سَبيلِ اللَّهِ} (أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ: ٢٧٨٢، وَمُسْلِمٌ: ١٣٧).

واتە: یەکێك لە عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە و، دەڵێ: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد: کام کردەوە لەلای خوا خۆشەویستترە؟ فەرمووی: نوێژ لە کاتی خۆیدا، گوتی: ئەدی دوای ئەوە؟ فەرمووی: چاکە لەگەڵ باب و دایکان، گوتی: دوای ئەوە؟ فەرمووی: تێکۆشان لەڕێی خوادا.

**چەمك واتای وشەی (بِرُّ الوالدين):**

(**البِرُّ: ضِدُّ العُقُوقِ، وَكَذَا «الْمَبَرَّةُ» بَرِرْتُ وَالِدَيَّ أَبُرُّهُ، فَأَنَا بَرٌّ وَبارٌّ، والجمع: بَرَرة وأبرار**) واتە: (بِرّ) پێچەوانەی (**عقوق**)ە، (**عقوق**) واتە: هێشاندنی دڵی باب و دایك و ڕێزیی بەرانبەر کردنیان، (مَبَرَّة) و (بِرّ) هەردووکیان بە مانای چاکەکاریین، دەگوترێ:

(بَـرِرْتُ وَالِـدَيّ)، واتـە: لەگـەڵ بـاب و دایکمـدا چاکـەکار بـووم، یـان (بَـرِرتُ والِـدي) لەگـەڵ بابـم دا چـاك بـووم، (أَبُـرُّهُ) واتـە: چاکـەی لەگەڵـدا دەکـەم، (بَـرّ وبـارّ) هەردووکیـان واتـە: چاکـەکار، (بَـرّ) بـە (بَـرَرَة) کۆدەکرێتـەوە و، کـۆی (بارّ)یـش بریتیـە لـە (أَبْـرَار).

٢)- {عَنْ عَبْدِ اللَّه بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: جاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَاسْتَأْذَنَهُ فِي الجِهَادِ. فَقَالَ: «أَحَيٌّ وَالِدَاكَ؟» قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: «فَفِيهِمَا فَجَاهِدْ»} (أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ: ٣٠٠٤، وَمُسْلِمٌ: ٢٥٤٩).

واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی عەمـڕی کـوڕی عـاص خـوا لـە خـۆی و بـابی ڕازی بـێ، دەڵـێ: پیاوێـك هاتـە لای پێغەمبـەر ﷺ داوای مۆڵـەتی لێکـرد، بچـێ بـۆ جەنـگ و جیهـاد، فەرمـووی: بـاب و دایکـت زینـدوون؟ گـوتی: بەڵـێ، فەرمـووی: بچـۆ تێکۆشـانەکە لەخزمـەت ئەوانـدا بکـە.

واتـە: خزمـەتی ئـەوان بکـە بـۆ تـۆ بـە چوونـە جەنـگ و جیهـاد دادەنـرێ، ڕەنگـە بـاب و دایکەکـەی، پیـر بـوو بـن، بەتەمـەن بـوو بـن، هـەر ئـەو کوڕەشـیان بووبـێ، خزمەتیـان بـکات، ئنجـا ئـەو جەنـگ و جیهـادەش، پـەکی لەسـەر ئـەو نەکەوتـوە، حاڵەتێـکی دەنگـدانی گشـتی (النَّفیر العـام) نەبـووە، بۆیـە پێغەمبـەر ﷺ مۆڵـەتی داوە، چونکـە: هەرکاتێـك ئەرکێـکی تایبـەت (واجـب عینـي) هەبـێ، واتـە: فەرزێـك کـە پـەکی لەسـەر شەخسـێك بـە تایبـەت کەوتـوە، دەبـێ ئـەو واجبـە تایبەتییـە جـێ بەجـێ بـکات و، نەچـێ بـۆ ئەنجـام دانی ئەرکێـکی گشـتی، چونکـە لـە کاتێـك دا: ئـەرکی گشـتی و ئـەرکی تایبـەتی تێـك دەگیرێـن، ئەرکـە تایبەتییـەکان پێشـدەخرێن، مەگـەر لـە هەنـدێ حاڵـەتی دەگمەنـدا.

٣)- {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: إِنِّي جِئْتُ أُبَايِعُكَ عَلَى الْهِجْرَةِ، وَلَقَدْ تَرَكْتُ أَبَوَيَّ يَبْكِيَانِ، قَالَ: «ارْجِعْ إِلَيْهِمَا فَأَضْحِكْهُمَا كَمَا أَبْكَيْتَهُمَا»} (أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ٦٩٠٩، وَأَبُو دَاوُدَ: ٢٥٢٨، وَالنَّسَائِيُّ: ٤١٦٣، وَابْنُ مَاجَهْ: ٢٧٨٢، وَالحَاكِمُ: ٧٢٥٥، وَقَالَ: صَحِيحُ الإِسْنَادِ، وَابْنُ حِبَّانَ: ٤١٩).

واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی عەمـڕی کـوڕی عـاص (خـوا لـە خـۆی و بـابی ڕازی بـێ)، دەڵـێ: پیاوێـك هاتـە لای پێغەمبـەر ﷺ گوتـی: هاتـووم بەڵێنـت پێـدەدم کـۆچ بکـەم {لـە شـوێنێك بـووە دەبووایـە کـە کـۆچ بـکات بـۆ مەدینـە} بـەڵام بـاب و دایکیشـم بەجێهێشـتوون، بەگریانـەوە {ئنجـا کاتێـك پێغەمبـەر ﷺ زانـی بـاب و دایـکی بـەو شـێوەیە بەجـێ هێشـتوون}، فەرمـووی: بگەڕێـوە بـۆ لایـان، وا بکـە بیانهێنیـە پێکەنیـن، وەك چـۆن واتکـردوە بیانهێنیـە گریـان.

هەڵبەتە مەبەستی ئەوە نەبووە واز لە کۆچکردنەکەی بێنێ و بگەڕێتەوە! نەخێر، بەڵکو مەبەستی ئەوە بووە: وەك چۆن دڵت نارەحەت کردوون، بە هۆی کۆچکردنەکەتەوە، بگەڕێوە بۆ لایان و دڵیان خۆش بکە و بیانهێنە پێکەنین.

کەواتە: فەرمایشتەکانی پێغەمبەر ﷺ دەبێ بە سەلیقەی باش سەرنج بدرێن.

٤)- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «رَغِمَ أَنْفُهُ، ثُمَّ رَغِمَ أَنْفُهُ، ثُمَّ رَغِمَ أَنْفُهُ»! قِيلَ: مَنْ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «مَنْ أَدْرَكَ وَالِدَيْهِ عِنْدَ الْكِبَرِ أَحَدَهُمَا أَوْ كِلَيْهِمَا، ثُمَّ لَمْ يَدْخُلِ الْجَنَّةَ»} (أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ٨٥٣٨، وَمُسْلِمٌ: ٢٥٥١).

ئەبوو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: لووتی لە ئەرزێ بچەقێ، ئنجا لووتی لە ئەرزێ بچەقێ، ئنجا لووتی لە ئەرزێ بچەقێ، {یانی: لووتی شۆڕبێ، یاخود پەشێمان بێ، ئەوە تەعبیرێکە لە زمانی عەرەبییدا بەکارهاتوە، مەرج نیە مەبەستیان ئەوە بووبێ: لووتی بکەوێتە سەر ئەرزێ، یانی: پەشێمان بێ}، گوترا: کێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: هەر کەسێك کە فریای باب و دایکی بکەوێ، لە کاتێکدا هەردووکیان یان یەکێکیان کەوتوونەتە تەمەنەوە، (واتە: لە خزمەتیاندابێ)، کەچی نەچێتە بەهەشت.

یانی: هێندە خزمەتیان نەکات و، هێندە دڵیان ڕانەگرێ، کە لە دوای ئیمان و جێ بەجێ کردنی ئەرکە شەرعییەکان، ئەو خزمەتەیان نەبێتە سەربارێك کە بە هۆیەوە بچێتە بەهەشت، ئەگەرنا بێگومان تەنیا بە خزمەتی باب و دایك مرۆڤ ناچێتە بەهەشت، دەبێ ئیمان و عەقیدەشی هەبێ، دەبێ تاعەت و بەندایەتیشی بۆ خوا هەبێ.

بۆیە زۆر جار دەڵێم: دەبێ چاك سەرنجی فەرمایشتەکانی پێغەمبەر ﷺ بدرێ، لێدەدا یانی: کەسێك وێڕای ئیمان و عەقیدەو، ئەنجامدانی ئەرکە شەرعییە تایبەتییەکان و، خۆپاراستن لە قەدەغەکراوەکان، ئەو خزمەتی باب و دایکەشی نەکاتە سەربارێکی کردەوە چاکەکانی و، پێی نەچێتە بەهەشت، ئەوە پەشێمان و زیانبارە.

٥)- {عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ مِنْ أَبَرِّ الْبِرِّ صِلَةَ الرَّجُلِ أَهْلَ وُدِّ أَبِيهِ، بَعْدَ أَنْ يُوَلِّيَ»} (أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ٥٧٢١، وَالبُخَارِيُّ فِي الأَدَب المُفْرَد: ٤١، وَمُسْلِم: ٢٥٥٢، وَأَبُو دَاوُد: ٥١٤٣، وَالتِّرمِذِيُّ: ١٩٠٣، وَقَالَ: هَذَا إِسْنَاد صَحِيح).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ)، دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: باشترین چاکەکاریی لەگەڵ باب و دایکدا، بریتیە

لەوە کە دوای ئەوەی بابی دەمرێ، لەگەڵ ئەوانەی کە بابی خۆشیویستون (لەگەڵ دۆست و خۆشەویستەکانی بابیدا) چاکەکار بێ.

یانی: پەیوەندییان لەگەڵ بپارێزێ، بە شێوەیەك لە شێوەکان ڕێزیان بگرێ و لەگەڵیاندا چاکەکار بێ، کە ئەوە بە نسبەت دایکیشیەوە، هەروایە، بەڵام لێرە لەو مەقامەدا تەنیا باسی باب کراوە.

٦)- {عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا ذَبَحَ الشَّاةَ، فَيَقُولُ: «أَرْسِلُوا بِهَا إِلَى أَصْدِقَاءِ خَدِيجَةَ»} (أَخْرَجَهُ مُسْلِم: ٦٤٣١).

واتە: دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ عادەتی وابوو کە مەڕێکی سەردەبڕی، بەش بەشی دەکرد و دەیفەرموو: بینێرن بۆ دۆستەکانی خەدیجە.

یانی: دەستە خوشکەکانی و، ئەوانەی کە لەڕۆژگاری پێغەمبەردا ﷺ لەگەڵ خەدیجەدا هامووشۆیان هەبووە و دۆستایەتیی و خۆشەویستییان لەگەڵی هەبووە، ئەو بەشە گۆشتانە بۆ ئەوان بەرن، واتە: هەر لەبیری بووە و ئەوەش وەفایە!

مەبەست ئەوەیە کە چاکە کردن لەگەڵ باب و دایك دا، تەنیا لە کاتی ژیانیاندا کورت هەڵنەهاتووە، بەڵکو لە دوای خۆشیان دەگونجێ چاکە لەگەڵ دۆست و خۆشەویستەکانیاندا بکەی، ئەوەش هەر بەشێکە لە چاکەکاریی بەرانبەر بە باب و دایك، هەروەها بۆ هاوسەریش هەروایە، چ ژن بۆ مێردی چ مێرد بۆ ژنی.

٧)- {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «مِنَ الْكَبَائِرِ شَتْمُ الرَّجُلِ وَالِدَيْهِ»، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ! هَلْ يَشْتِمُ الرَّجُلُ وَالِدَيْهِ؟ قَالَ: «نَعَمْ يَسُبُّ أَبَا الرَّجُلِ فَيَسُبُّ أَبَاهُ، وَيَسُبُّ أُمَّهُ فَيَسُبُّ أُمَّهُ»} (أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ: ٥٦٢٨، وَمُسْلِمٌ: ٩٠، وَالتِّرمِذِيُّ: ١٩٠٢).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: یەکێك لە گوناهە گەورەکان ئەوەیە کە پیاو قسە بە باب و دایکی خۆی بڵێ! گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! هیچ پیاوێك قسە بە باب و دایکی خۆی دەڵێ، (جنێویان پێ دەڵێ)؟ فەرمووی: بەڵێ! پیاوێك قسە بە بابی پیاوێك دەڵێ، ئەویش قسە بە بابی ئەو دەڵێتەوە و، قسە بە دایکی پیاوێك دەڵێ، ئەویش قسە بە دایکی دەڵێتەوە.

مانای ئەوەیە کە ئەو بووە هۆکاری ئەوەی کە قسە بە باب و دایکی بگوترێ، کەواتە: وەك بۆخۆی پێی گوتبن وایە.

## بڕگەی دووەم: دایك و باب كافریش بن، هەردەبێ چاكەیان لەگەڵدا بكرێ:

ئەمە لە ئایەتەكانی قورئاندا زۆر بە ڕوونیی ڕاگەیەنراوە، بۆ نموونە:

**١)**- لە سوورەتی (**العنكبوت**)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَإِن جَٰهَدَاكَ لِتُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَآ ۚ إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٨﴾ ﴾.

واتە: ئەگەر باب و دایكت هەوڵیان لەگەڵ دای، شتێك بۆ من بكەیە هاوبەش، كە زانیارییت لەبارەیەوە نیە، بەقسەیان مەكە، گەڕانەوەتان بۆ لای منە، ئنجا هەواڵتان پێدەدەم بەوەی دەتانكرد. واتە: لەوەدا بەقسەیان مەكە، بەڵام لە هیچ شتێكی دیكەدا كە پێچەوانەی شەریعەتی خوا نەبێ و سەرپێچیی خوا تێدا نەبێ، بێ فەرمانییان مەكەو، ناگوێڕایەڵ مەبەو لە قسەیان دەرمەچۆ.

**٢)**- لە سوورەتی (**لقمان**)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَإِن جَٰهَدَاكَ عَلَىٰٓ أَن تُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا ۖ وَصَاحِبْهُمَا فِي ٱلدُّنْيَا مَعْرُوفًا ۖ وَٱتَّبِعْ سَبِيلَ مَنْ أَنَابَ إِلَيَّ ۚ ثُمَّ إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٥﴾ ﴾.

واتە: ئەگەر باب و دایكت هەوڵیان لەگەڵدای، (لەگەڵ تۆدا تێكۆشان) شتێك بۆ من بكەیە هاوبەش، كە زانیارییت لەبارەیەوە نیە، (واتە: نیە) بەقسەیان مەكە، گوێڕایەڵییان مەكە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا {كە نەك هەر كافر و موشریكن، بەڵكو هەوڵ دەدەن تۆش بكەنە كافرو موشریك، تۆ هەر بە چاكە لەگەڵیاندا مامەڵە بكە لە دنیادا} هاوەڵایەتیی باشیان بكە لە ژیانی دنیادا، لە ڕووی ژیانی دنیایی و گوزەرانی دنیاوە، لەگەڵیان باشبە، {یانی: ئەوە كە كافرن و موشریكن، مەیكە بیانووی ئەوەی كە لەگەڵیان خراپ بی} ﴿ وَٱتَّبِعْ سَبِيلَ مَنْ أَنَابَ إِلَيَّ ﴾، شوێنی ئەوانەش بكەوە كە بۆ لای من گەڕاونەوە، ﴿ ثُمَّ إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٥﴾ ﴾، دوایی گەڕانەوەتان بۆ لای منە، ئنجا هەواڵتان پێ دەدەم بەوەی دەتانكرد.

لەو بارەوە ئەم فەرموودەیەش دێنین:

٣)- {عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ قَالَتْ: قَدِمَتْ عَلَيَّ أُمِّي وَهِيَ مُشْرِكَةٌ فِي عَهْدِ قُرَيْشٍ، إِذْ عَاهَدَهُمْ فَاسْتَفْتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! قَدِمَتْ عَلَيَّ أُمِّي وَهْيَ رَاغِبَةٌ، أَفَأَصِلُ أُمِّي؟ قَالَ: «نَعَمْ صِلِي أُمَّكِ»} (أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ: ٢٦٢٠، وَمُسْلِمٌ: ١٠٠٣).

ئەسمائی کچی ئەبوو بەکری صیددیق (کە خێزانی زوبەیری کوڕی عەووامە خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: دایکم لەحاڵێکدا کە هاوبەش بۆ خوا دانەر بوو هات، لەو کاتەدا کە قورەیش پەیمانیان هەبوو لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ، {واتە: لە ماوەی ساڵی شەشی کۆچیی تاکو هەشتی کۆچیی، لە صولحی حودەیبییەوە، تاکو ساڵی هەشتەمی کۆچیی، کە ئازاد کردنی مەککەی تێدا دەبێ}، لەو ماوەیەدا دایکم هات {بەسەردان هاتوە لە مەککەوە بۆ مەدینە}، منیش پرسم بە پێغەمبەر ﷺ کرد گوتم: دایکم هاتوە، ئارەزوومەند بووە بێ بۆلام، {ڕەنگە دیاریی بۆ هێنابێ، وەك لە ڕیوایەتی دیکەدا هاتوە} ئایا منیش ڕێزی بگرم و پەیوەندیی لەگەڵ بپارێزم؟ {یانی: منیش دیاریی و خەلاتی لە بەرانبەردا بدەمێ؟} فەرمووی: بەڵێ، لەگەڵ دایکتدا چاك بە {هەر چەندە هاوبەش بۆ خوا دانەریش بێ}.

(القُرطُبي) دەڵێ: (وَاخْتَلَفُوا فِي الوَالِدَيْنِ المُشْرِكَيْنِ: هَلْ يخْرُجُ بِإِذْنِهِمَا إِذَا كَانَ الجِهَادُ مِنْ فُرُوضِ الكِفَايَةِ؟ فَكَانَ الثَّوْرِيُّ يَقُولُ: لاَ يَغْزُو إِلاَّ بِإِذْنِهِمَا، وَقَالَ الشَّافِعِيُّ: لَهُ أَنْ يَغْزُو بغَيْرِ إِذْنِهِمَا قَالَ ابْنُ المُنْذِرُ: وَالأَجْدَادُ آبَاءُ وَالجدَّات أُمَّهَات، فَلاَ يَغْزُو المَرْء إِلاَّ بِإِذْنِهِم، وَلاَ أَعْلَمُ دِلاَلَةً تُوجِبُ ذَلِكَ لِغَيْرِهِم مِنَ الإِخْوَةِ وَسَائِرِ القَرَابَاتِ، وَكَانَ طَاوُسُ يَرَى السَّعِيَ عَلَى الأَخَوَاتِ أَفْضَلَ مِنَ الجِهَادِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ)[1].

واتە: زانایان ڕاجیاییان هەیە لە بارەی باب و دایکی هاوبەش بۆ خوادانەرەوە: ئایا ئەگەر جەنگ و جیهاد هاتە پێش، بە مۆڵەتی ئەوان دەچێ؟ لە حاڵێکدا ئەو جەنگ و جیهادە ئەرکێکی گشتی (**فرض الكفاية**) بێ و، نەبووبێتە ئەرکی تایبەت (**فرض العين**)، (**ثوري**) ڕای وابووە بەبێ مۆڵەتی دایك و باب ناچێتە جەنگ و جیهاد، بەلام (**شافعي**) گوتوویەتی: بەبێ مۆڵەتی ئەوانیش بۆی هەیە بچێتە جەنگ و جیهاد، (**ابْنُ المُنْذِر**)یش گوتوویەتی: باپیرەکانیش حوکمی بابیان هەیە و نەنکەکانیش حوکمی دایکیان هەیە، {(واتە: باپیرەکان بابن و نەنەکانیش دایکن، یانی: لە حوکمدا و لەوەدا کە مۆڵەتیان لێ وەرگیرێ، یان لێ وەرنەگیرێ؟} مرۆڤ نابێ بەبێ مۆڵەتی ئەوان {واتە: بەبێ مۆڵەتی باب و

---

(١) الجامع لأحكام القرآن، ج١٠ ص٢٤٨.

باپیریش هەروەها دایك و نەنكیش} بچێ بۆ جەنگ و جیهادێك كە (**فرض الكفاية**)یە {واتە: گەر كۆمەڵێك بیكەن لەسەر ئەوانی دیكە لادەچێ} دەڵێ: بەڵام پێم شك نایە و نازانم كە ئەو دەقانە ئەوە بگەیەنن، كە جگە لە باب و دایك و، نەنك و باپیر، خزمانی دیكە ئەو مافەیان هەبێ و، براو خوشك و خزمەكانی دیكە ئەو مافەیان نیە، كە داوای مۆڵەتیان لێ بكرێ بۆ چوون بۆ جەنگ و جیهاد، (**طاووس**)یش كە یەكێكە لە زانایان، دەڵێ: خزمەت كردنی خوشكان، {برایەك كە چەند خوشكێكی هەن، ئەگەر خزمەتیان بكات و سەرپەرشتییان بكات و ئاگای لێیان بێ}، لە چوونە جەنگ و جیهاد لەپێناوی خوادا خێرو پاداشتی زیاترە.

قسەكەیشیم زۆر پێ بەجێیە، بە تایبەتی بۆ كۆمەڵە خوشكێك ئەگەر تەنیا برایەكیان هەبێ، یان دوو برایان هەبن و، پەكیشیان لەسەر خزمەتكردن و سەرپەرشتیی وان كەوتبێ، بە دڵنیایی خزمەتی خوشكەكانیان بكەن و ئاگایان لێیان بێ و سەرافەتیان بكەن باشترە، چونكە ئەو ئەركە بەوان نەبێ، جێ بەجێ ناكرێ، بەڵام ئەركی ئەنجامدانی جەنگ و جیهاد، خەڵكی دیكە هەیە پێی هەڵسێ، بەڵام لە حاڵێكدا كە ئەو جەنگ و جیهادە ئەركی گشتی (**فرض الكفاية**) بێ، بەڵام ئەگەر بوو بە ئەركی تایبەت (**فرض العين**) لەسەر تاك تاك، ئەو كاتە حوكمەكەی دەگۆڕێ.

## بڕگەی سێیەم: لە چاكە لەگەڵ كردندا، دایك مافی زیاترە لە باب:

لەو بارەوە وێڕای ئاماژەی ئایەتە موبارەكەكان، كە لە سوورەتی: (**الأحقاف**) و (**لقمان**) دا ئاماژەیان پێداوە، فەرمایشتی پێغەمبەریش ﷺ زۆر جوان نوقتەی تێدا خستۆتە سەر پێتان، بۆ نموونە:

**{عَن أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! مَنْ أَحَقُّ النَّاسِ بِحُسْنِ صَحَابَتِي؟ قَالَ: أُمُّكَ، قَالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: ثُمَّ أُمُّكَ، قَالَ ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: ثُمَّ أُمُّكَ، قَالَ: ثُمَّ مَنْ: قَالَ: ثُمَّ أَبُوكَ} (أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ: ٥٩٧١، وَمُسْلِمٌ: ٢٥٤٨).**

واتە: ئەبوو هوڕەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ، (لێی پرسی) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! چ كەسێك مافی زیاترە، باش مامەڵەی لەگەڵدا بكەم (باش هاوەڵایەتیی بكەم)؟ فەرمووی: دایكت، گوتی: دوایی كێ؟

فەرمووی: دوایی هەر دایكت، گوتی: دوایی كێ؟ فەرمووی: دوایی هەر دایكت، (بۆ جاری چوارەم) گوتی دوایی كێ؟ فەرمووی: دوایی بابت.

كەواتە: دەتوانین بڵێین: كە مافی دایك لەسەر منداڵ، لەسەر ڕۆڵەی خۆی، سێ ئەوەندەی مافی بابیەتی، هەڵبەتە ئەوە بە گشتی، ئەگەرنا هەندێ دایكیش هەن، وەك پێویست نین، بەڵام بە گشتی دایكان ئەرك و زەحمەتیان زیاترە لە بە خێوكردنی منداڵدا، جگە لەوەی كە هەر دایك دەتوانێ: منداڵ نۆ مانگ لەسكی خۆیدا هەڵبگرێ، بەڵام دوای ئەوەش زۆربەی دایكان زیاتر ئەركیان دەكەوێتە سەرشان و ماندووتر دەبن و، زەحمەتی زیاتر دەكێشن بە پەروەردە كردن و بەخێوكردنی منداڵەكانیانەوە، وەك (**حافظ إبراهيم**) لە شیعرێكیدا دەڵێ:

**وَالأُمُّ مَدْرَسَةٌ إِنْ أَعْدَدْتَهَا ....... أَعْدَدْتَ شَعْبَاً طَيِّب الأعراق**

واتە: دایك قوتابخانەیە، ئەگەر ئامادەی بكەی[1] .... گەلێكی نەجیب زادەت ئامادە كردوە

واتە: دایك دەبێتە هۆی پەروەردە كردنی ڕۆڵەكەی، بە شێوەیەكی چاك و نەجیب، سەرەنجام ئەو گەلە، كە ئافرەتەكان تێیدا باش ئامادە و پەروەردە كراون، ڕۆڵەو وەچەیەكی نەجیب زادە و ڕێك و پێكمان بۆ بەرهەم دێنن.

## بڕگەی چوارەم: مەگەر باب و دایك ستەمكاربن، ئەگەرنا ڕۆڵەكان هەر قەرزداریانن:

بەڵێ، منداڵ و ڕۆڵە، هەر بە قەرزداری باب و دایك دادەنرێ، مەگەر بە دەگمەن و بەڕیزپەڕ، جاری وایە بابێك ستەم لە منداڵەكەی خۆی دەكات، یان دایكێك ستەم لە منداڵەكانی خۆی دەكات، ئەوەش كەم و دەگمەنە.

**قوڵە نەزیلەكی جێی عیبرەت لە دوو توێی فەرموودەیەك دا:**

لەوبارەوە ئەو فەرموودەیە دێنین، كە بەسەرهاتێكیشە و زۆر جێی سەرنجە:

**{عَنْ جَابِر بْنِ عَبْدِ اللَّه، قَالَ جَاءَ رَجُلٌ إِلى النَّبِيّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُول اللَّه! إِنَّ أَبِي أَخَذَ مَالِي، فَقَالَ النَّبِيّ ﷺ للرَّجُل: اذْهَب فَأْتِني بِأَبِيْكَ، فَنَزَلَ جبرِيْلُ عليه السلام عَلَى النَّبِيّ ﷺ فَقَالَ: إِنَّ اللَّهَ**

---

(١) واتە: ئەو دایك و ئافرەتە، باش ئامادە بكەی.

يُقْرِئُكَ السَّلَامَ، وَيَقُولُ: إِذَا جَاءَكَ الشَّيْخُ، فَسَلْهُ عَنْ شَيءٍ، قَالَهُ فِي نَفْسِهِ مَا سَمِعَتْهُ أُذُنَاهُ، فَلَمَّا جَاءَ الشَّيْخُ، قَالَ لَهُ النَّبيّ ﷺ مَا بَالُ ابْنِكَ يَشْكُوكَ، أَتُرِيدُ أَنْ تَأْخُذَ مَالَهُ؟ فَقَالَ: سَلْهُ يَا رَسُولَ اللَّه! هَلْ أَنْفَقْتُهُ إلاَّ عَلَى إِحْدَى عَمَّاتِهِ، أَو خَالاَتِهِ، أَو عَلَى نَفْسِهِ، فَقَالَ النَّبيّ ﷺ: إِيه، دَعْنَا مِنْ هَذَا، أَخْبِرْنَا عَنْ شَيءٍ قُلْتَهُ فِي نَفْسِكَ، مَا سَمِعَتْهُ أُذُنَاكَ! فَقَالَ الشَّيْخُ: وَاللَّهِ يَا رَسُول اللَّه مَا يَزَالُ اللَّه يَزِيدُنَا بِكَ يَقِينَاً، لَقَدْ قُلْتُ فِي نَفْسِي شَيْئَاً، مَا سَمِعَتْهُ أُذُنَايَ، فَقَالَ: قُلْ، وَأَنَا أَسْمَعُ، قَالَ قُلْتُ:

غَذَوْتُك مَوْلُودًا ومُنْتُكَ يَافِعَاً ... تُعَلُّ بِما أُجْرِي عليك وتَنْهَلُ

إِذَا لَيْلَةٌ ضَافَتْك بالسُّقْمِ لَم أَبِتْ ... لسُقْمِكَ إلاَّ باكِيًا أَتَمَلْمَلُ

كَأَنِّي أَنَا الْمَطْرُوقُ دُونَكَ بالَّذِي ... طُرِقْتَ بِهِ دُوني وعَيْنِيَ تَهْمَلُ

تَخَافُ الرَّدى نَفْسِي عَلَيْكَ وَإِنَّها ... لِتَعْلَم أَنَّ المَوْت وَقْتٌ مُؤَجَّلُ

فَلَمَّا بَلَغْتَ السِّنَّ والغَايَةَ الَّتي ... إليْها مَدَى مَا كُنْتُ فِيك أُؤَمِّلُ

جَعَلْتَ جزَائِي غِلْظَةً وفَظَاظَةً ... كأَنَّك أنتَ المُنْعِمُ الْمُتَفَضِّلُ

فَلَيْتَكَ إذ لَمْ تَرْعَ حَقَّ أُبوَّتِي ... فَعَلْتَ كَمَا الجَارُ المصاقِب يَفْعَلُ

فَأَوْلَيْتَنِي حقّ الجوَارِ وَلَمْ تَكُن ... عَلَيّ بِمَالٍ دُونَ مَالِكَ تَبْخَلُ

قَالَ فَحِينَئِذٍ أَخَذَ النَّبِيّ ﷺ بتَلاَبِيب ابْنِهُ، وَقَالَ: أَنْتَ وَمَالُكَ لأَبِيْكَ} (أَخْرَجَهُ ابن ماجه: ٢٢٩١، وَصَحَّحَهُ الألباني وأحمد شاكر).

واتـە: جابیـری کـوڕی عەبدوڵـڵا (خـوا لـە خـۆی و بـابی ڕازی بـێ)، دەگێڕێتـەوە دەڵـێ: پیاوێـك هاتـە لای پێغەمبـەر ﷺ، گـوتی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا! بابـم مـاڵ و سـامانەکەی بـردووم (لێـی زەوت کـردووم)، پێغەمبـەر ﷺ بـە پیاوەکـەی گـوت: بابتـم بـۆ بێنـە، جیبریـل ﷺ دابەزیـە سـەر پێغەمبـەر ﷺ و پێـی فەرمـوو: خـوا ﷻ سـەلامت لێـدەکات و پێـت دەفەرمـوێ: ئەگـەر ئـەو پیـاوە بـە تەمەنـە هـات، لێـی بپرسـە: شـتێکی لـە دڵـی خۆیـدا گوتـوە، بـێ ئـەوەی گوێیـەکانی بیبیسـتن، {واتـە: هـەر لەبـەر خۆیـەوە گوتوویـەتی، بەبێژە نەیگوتـوە، لە دڵـی خۆیـدا قسـەکانی هێنـاوە و بـردوە}، کاتێـك پیـاوە بـە تەمەنەکـە هـات، پێغەمبـەر ﷺ، پێـی فەرمـوو: ئـەوە بۆچـی کوڕەکـەت سـکاڵات لێـدەکات؟ ئایـا دەتـەوێ مـاڵ و سـامانەکەی لـێ بسـتێنی؟ پیـاوە بـە تەمەنەکـەش گـوتی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا! ﷺ، لێـی بپرسـە: ئایـا ئـەو مـاڵ و سـامانەی ئـەوم، تەنیـا خەرجـی یەکێـك لـە پـوورەکانی (واتـە: خوشـکی بـابی)، یـان یەکێـك لـە پلکـەکانی (واتـە: خوشـکی دایـکی)، یاخـود تەنیـا خەرجـی خـودی خـۆی نەکـردوە؟

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئێ واز لەوانە بهێنە، هەواڵم پێبدە، شتێکت لەدڵی خۆتدا گوتوە، کە گوێیەکانت نەیانبیستوە؟ (واتە: گوێت پێ نەکردوە)، پیاوە بە تەمەنەکە گوتی: بە خوا ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ بە بەردەوامیی خوا یەقین و دڵنیاییمان لەبارەی تۆوە زیاد دەکات، شتێکم لە دڵی خۆمدا گوتوە، کە گوێیەکانم نەیانبیستوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بیڵێ، منیش گوێ دەگرم، کابرا گوتی: گوتوومە:

غَذَوْتُك مَوْلُودًا ومُنْتُكَ يَافِعَاً ... تُعَلُّ بِما أُجْرِي عليك وتَنْهَلُ

واتە: کە تازە لە دایك بووبووی خۆراکم پێدای، کە پێشڕاگەیشتی مەسرەفم کێشای، ئەوەی کە من بۆ تۆم بەدەست دەهێنا، تۆ جار لەدوای جار لێت دەخوارد و لێت هەڵدەهێنجا، (واتە: لە نازو نیعمەتێك دا کە من بۆم فەراهەم هێنابووی، تێتدا دەگوزەراند).

إذَا لَيْلةٌ ضَافَتْك بالسُّقْمِ لَم أَبِتْ ... لسُقْمِكَ إلاَّ باكِيًا أَتَمَلْمَلُ

واتە: ئەگەر شەوێك دەردێك میوانت بووبوایە، من شەوەکەی هەمووی شەو نخوونییم دەکێشاو، خۆم ڕادەژاند، (لە تاوی تۆ).

كَأَنِّي أَنَا الْمَطْرُوقُ دُونَكَ بالَّذِي ... طُرِقْتَ بِهِ دُونِي وعَيْنِيَ تَمْهَلُ

وەك ئەوە کە ئەوەی ئازارەکەی هەیە، من بم، نەك تۆبی، چاویشم فرمێسکی دەڕشت لە تاوی تۆ.

تَخَافُ الرَّدى نَفْسِي عَلَيْكَ وَإنَّها ... لِتَعْلَم أَنَّ المَوْت وَقَتٌ مُؤَجَّلُ

نەفسم لەوە دەترسا، کە تۆ بمری، هەرچەندە دڵنیاش بووم کە مردن کاتێکی دیاریی کراوی هەیە، {بە ساغیی و نەخۆشیی نیە}.

فَلَمَّا بَلَغْتَ السِّنَّ والغَايَةَ الَّتي ... إليْها مَدَى مَا كُنْتُ فِيك أُؤَمِّلُ

کاتێك گەیشتی بەو تەمەنەو، بەو ئامانجەی کە من هەر چاوەڕێ بووم و، هیوادار بووم پێی بگەی، واتە: ببی بە گەنج و، خاوەن ماڵ و حاڵ و تین و تاقەت.

جَعَلْتَ جزَائِي غلْظَةً وفَظَاظَةً ... كأَنْك أنتَ المُنْعمُ الْمُتَفَضِّلُ

پاداشتی منت کردە قسە ڕەقیی و دڵ ڕەقیی، وەك ئەوە کە تۆ چاکەت بەسەر منەوە هەبێ و، تۆ منت بەخێو کردبێ!

**فَلَيْتَكَ إذ لَمْ تَرْعَ حَقَّ أُبوَّتي ... فَعَلْتَ كَمَا الجَارُ المصاقِب يَفْعَلُ**

خۆزگە ئەگەر مافی بابایەتیی منیشت بۆخۆت، ڕەچاو نەدەکرد، هەروەك دراوسێیەك کە ماڵ بەماڵێ وەیە، ئاوا ڕەفتارت کردبایە.

**فَأَوْلَيْتَنِي حقّ الجوَارِ وَلَمْ تَكُن ... عَلَيّ بِمَالٍ دُونَ مَالِكَ تَبْخَلُ**

هەر مافی دراوسێیەتییت لەگەڵ جێ بەجێ کردبام، {واتە: چۆن دراوسێ خواردن دەدات بە دراوسێ و، بەتەنگیەوە دێ و، هاوکاریی دەکات}، هەر وەك دراوسێیەکی باش مامەڵەت لەگەڵدا کردبام و ماڵ و سامانەکەی خۆت لە من نەگرتبایەوەو چرووکیی و ڕژدییت نەنواندبایە.

ئنجا لەوکاتەدا پێغەمبەر ﷺ یەخەی کوڕەکەی گرت و فەرمووی: (**أَنْتَ وَمالُكَ لأَبيك**)، واتە: تۆ خۆت و سامانەکەی هی بابتن.

## مەسەلەی چوارەم:

**پەروەردگارتـان لـە خۆتـان بـەوەی لـە دەروونتاندایـە، زاناتـرە، ئەگـەر ئێـوە چـاك بـن، بێگومـان خـوا، بەرانبـەر بـە زۆر گـەڕاوان بـۆ لای لێبوردەیـە:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ رَّبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَا فِي نُفُوسِكُمْ إِن تَكُونُوا صَالِحِينَ فَإِنَّهُ كَانَ لِلْأَوَّابِينَ غَفُورًا ﴿٢٥﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿ رَّبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَا فِي نُفُوسِكُمْ ﴾، پەروەردگارتان زاناترە بەوەی لە دەروونتاندا هەیە، واتە: پەروەردگارتان لە خۆتان زاناترە، بەوەی کە لە دەروونتاندا هەیە، یاخود: پەروەردگارتان زاناترە بە ڕەهایی، نەك لە خۆتان، یان لە خەڵکی دیکە، هەر بە ڕەهایی پەروەردگارتان زاناترە بەوەی کە لەدەروونتاندا هەیە.

(**نفوس**)یـش کـۆی (**نَفْـس**)ە، (**نَفْـس**) بـە کوردیـی بـە دەروون مانـا کـراوە، نەفـس هـەر ڕووحـە، بـەڵام دەچێتـە نێـو جەسـتەو، پێـی دەگوتـرێ: (**نفـس**) و لـە دەرەوەی جەسـتە، پێـی دەگوتـرێ: ڕووح، هـەر بۆیـەش ڕووح لـە قورئانـدا، زەم و مـەدح نەکـراوە، چونکـە ڕووح پێـش ئـەوەی بچێتـە نێـو جەسـتە، نـە خێـری لەدەسـت دێ، نەشـەڕ، بـەڵام نەفـس لـە قورئانـدا، هـەم ستایشـکراوە، لـە کاتێکـدا کـە چاکـەکار دەبـێ، هـەم سـەرکۆنەو زەم کـراوە، لەکاتێکـدا کـە خراپـەکار دەبـێ، چونکـە ڕووح دوای ئـەوەی کـە دەچێتـە نێـو جەسـتەوە، بـە هـۆی جەسـتەوە: چاکـەو خراپـەی لـە دەسـت دێ.

کەواتـە: ﴿ بِمَا فِي نُفُوسِكُمْ ﴾، واتـە: لـە چاکـەو لـە خراپـە، هەڵبەتـە ئـەوەش کـە لـە دەروونـدا هەیـە، هـەر ئـەو نیـازو مەبەسـت و خولیـاو، ئـەو بڕیـارو ویسـتانەن، کـە دوایـی لە ڕێـی زمانـەوە دەردەبڕدرێـن و پاشـان لـە ڕێـی ئەندامەکانـەوە، جـێ بەجـێ دەکرێـن.

٢)- ﴿ إِن تَكُونُوا صَالِحِينَ ﴾: ئەگەر ئێوە چاك بن.

وشـەی (**صالـح**) یـانی: چـاك و پێچەوانـەی (**صالـح**) (**فاسـد**)ە، واتـە: خـراپ، هـەروەك (**مُصْلِح**) واتـە: چاکـەکار، واتـە: کـە شـتێك تێکچووبـێ چـاکی بکاتـەوە، واتـە: چاکسـازیکارو،

(**مُفْسِد**) واتە: تێکدەرو خراپەکار، ﴿ إِن تَكُونُواْ صَٰلِحِينَ ﴾، واتە: ئەگەر ئێوە ڕاست بن، لە هەبوونی نیازی چاکەکاریی لەگەڵ باب و دایکدا.

٣)- ﴿ فَإِنَّهُۥ كَانَ لِلْأَوَّٰبِينَ غَفُورًا ﴾، بە دڵنیایی ئەو (خوا ﷻ) بۆ زۆر گەڕاوان لێبوردەیە، واتە: ئەگەر ئێوە لە ئەسڵی نیازو مەبەستەکانی خۆتاندا، بەرانبەر بە دایك و بابتان، چاکەکاربن و، بەڕێز بن و، بە خزمەت بن، مەبەستتان بێ چاکەیان لەگەڵدا بکەن، هەر چەندە جار جارە وشەیەکتان لە دەم دەربچێ، یان هەڵوێستێك بنوێنن و، ڕەفتارێکتان لێ بپشکوێتەوە، کە پێچەوانەی ڕێزگرتن و چاکەکردن لەگەڵ باب و دایك بێ، پەروەردگارتان، لەگەڵتان لێبوردەیە، چونکە ئەگەر ئەسڵ ئەوەبێ لەگەڵیاندا چاکەکاربی، ئەگەر شتێکیشت لە پیتە دەربچێ، کەم و کوڕییەك ببێ، ئەوە پەروەردگارتان لێتان ناگرێ، بێگومان هەرکەسێکیش، لە ئەسڵدا چاکەکاربێ، هەرکاتێك هەڵەو کەم و کوڕییەکی بوو، دەگەڕێتەوە بۆلای خوا، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ لِلْأَوَّٰبِينَ ﴾.

پێشتریش لە شیکردنەوەی وشەکاندا، باسمان کرد کە (**آبَ يَئُوبُ أَوْبَاً، يَعْنِي رَجَعَ يَرجِعُ رجُوعَاً**)، (**آيِب**) واتە: (**راجع**)، هەروەها (**أَوَّاب**) یانی: (**رَجَّاع**) کەسێك کە زۆر دەگەڕێتەوە بۆ لای خوا.

(**الأَوَّابُ: الحَفِيْظُ الَّذِي إِذَا ذَكَرَ خطأَهُ، استغْفَر مِنْهُ**) واتە: (**أَوَّاب**) ئەو پارێزەرەیە کە هەر کاتێك هەڵەی خۆی وەبیر هاتەوە، داوای لێبوردنی بۆ دەکات.

پێغەمبەر ﷺ دەربارەی (**أَوّابين**) فەرموویەتی: {**صَلاَةُ الأَوَّابِينَ حِينَ تَرْمَضُ الْفِصَالُ**} (**أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ: ١٧٨٠، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَم**).

واتە: نوێژی (**أَوّابين**) ئەو کاتەیە کە بەچکە حوشتر گەرم دەبێ و، ناتوانێ لەسەر زەوی بێ، (**أَي: إِذَا وَجَدَ الفَصِيلُ حَرَّ الشَّمْسِ، الرَّمَضُ: شِدَّةُ وَقع الشَّمْسِ عَلَى الرَّمْلِ وَغَيْرِهِ**).

ئەوکاتەی بەچکە حوشتر هەست بەتینی گەرما دەکات لەسەر زەوی، ئەو کاتەش مەبەست کاتی چێشتەنگاوە، هەڵبەتە یەکێك لە سیفەتەکانی (**أَوّابين**) ئەوەیە نوێژی چێشتەنگاو دەکەن، بەڵام ئەسڵی مانای (**أَوّابين**) ئەوەیە: ئەوانەی زۆر بۆ لای خوا دەگەڕێنەوە.

## مەسەلەی پێنجەم:

**مافی خزم و نەدار و ڕێبوارانیش بدە، بەڵام دەستبڵاویی و هەڵە خەرجیی و سامان بەفیڕۆدان مەکە، چونکە سامان بەفیڕۆدەران برای شەیتانانن، شەیتانیش بەرانبەر بە پەروەردگاری ناسوپاس بوو:**

وەك ڕیزبەندیی سیفەت و ئاكارە پەسندو ناپەسندەكان، ئەم مەسەلەیە سیفەتەكانی: نۆیەم و دەیەم و یازدەیەم و دوازدەیەم، دەگرنە خۆیان:

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَءَاتِ ذَا ٱلْقُرْبَىٰ حَقَّهُۥ وَٱلْمِسْكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ وَلَا تُبَذِّرْ تَبْذِيرًا ﴿٢٦﴾ إِنَّ ٱلْمُبَذِّرِينَ كَانُوٓا۟ إِخْوَٰنَ ٱلشَّيَـٰطِينِ ۖ وَكَانَ ٱلشَّيْطَـٰنُ لِرَبِّهِۦ كَفُورًا ﴿٢٧﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿ وَءَاتِ ذَا ٱلْقُرْبَىٰ حَقَّهُۥ ﴾، دوای ئەوەی خوا ﷻ باسی ماف پێدانی باب و دایكانی كرد، ئنجا دەفەرموێ: هەروەها مافی خزمانیش بدە، (**الإِيْتَاءُ: الإِعْطَاءُ، وَهُوَ حَقِيْقَةٌ فِي إِعْطَاءِ الأَشْيَاءِ وَمَجَازٌ شَائِعٌ فِي التَّمْكِينِ مِنَ الأُمُورِ المَعْنَوِيَّةِ، كَحُسْنِ المُعَامَلَةِ وَالنُّصْرَةِ**).

كە دەفەرموێ: (**وَءاتِ**) ئەوە كرداری فەرمان (**فِعْل الأَمْر**)ە، واتە: بدە، ئنجا وشەی (**إيتاء**) بریتیە لە بەخشین كە حەقیقەتە لە بەخشینی شتاندا و مانای مەجازییشی هەیە، لە ڕووی مەعنەوییەوە، كە بریتیە لەوەی تۆ كەسێك وا لێبكەی، بەهرەمەند بێ لە شتێك.

﴿ ذَا ٱلْقُرْبَىٰ ﴾، (**ذَا**) واتە: خاوەن (صاحب)، (**القُرْبَى**) واتە: نیزیكیی، (**صَاحِبُ القَرَابَة**)، واتە: ئەوەی خاوەن نیزیكییە لە تۆ، مافی خۆی پێ بدە، كە بریتیە لە خزمان.

لێرەدا بە گشتی خوا ﷻ دەفەرموێ مافی خزمان بدە، بەڵام لە ئایەتەكانی دیكەداو، لە كۆی قورئانداو، لە فەرمودەكانی پێغەمبەردا ﷺ، پاشان زانایان بە هەڵهێنجان لە قورئان و سوننەت دا، ڕیزبەندییان كردوە بۆ خزمانیش كە كێ لە پێش كێیە؟! هەروەها ئەو خزمانەی كە میرات دەگرن، ئەوانیان پلە بەندیی كردوە، بەڵام لێرەدا بەگشتی دەفەرموێ: مافی خۆیان بدە بە خزمان.

٢)- ﴿ وَٱلۡمِسۡكِينَ ﴾، هەروەها نەداریش مافی خۆی پێبدە.

کاتی خـۆی لـە تەفسـیری سـوورەتی (**التوبـة**) (٦٠)دا، باسـمان کـردوە، لـە تەفسـیری ئـەو ئایەتـەدا کـە بـاسی (**الصَّدَقَات**) دەکات، کـە (**فقير**) کەسێکە هیچی نەبێ پێی بـژی و، (**مسكين**) کەسێکە شتێکی هەیـە، بـەڵام بـەشی بەڕێوەچـوونی نـاکات، بـەشی ژیـان و گـوزەرانی نـاکات، بۆیـە مـن وشـەی (**فَقـير**)م بـە (هـەژار) لێکداوەتـەوە و، وشـەی (**مسكين**)یشـم بـە (نـەدار) لێـك داوەتـەوە، دەشـگونجێ پێچەوانەکـەی تـەواو بـێ، وەك هەندێـك لـە زانایـان دەڵێـن: بـە پێچەوانـەوە: (**مسكين**) ئەوەیـە کـە هیچـی نەبـێ و (**فقير**) ئەوەیـە کـە شـتێکی هەبـێ، لـە ڕووی زمـانی کوردییشـەوە: دەگونجـێ بڵێـی: نـەدار ئـەو کەسـەیە کـە هیچـی نیـە و، هـەژار بـە مانـای (**مسكين**)ە، بـەڵام بـە هـەر حـاڵ، مـن وام دانـاوە: **فقيـر**: هـەژار مسـکین: نـەدار.

٣)- ﴿ وَٱبۡنَ ٱلسَّبِيلِ ﴾، هەروەها هاوکاریی کوڕی ڕێگا بکە، واتە: ڕێبوار، ئەو ڕێبوارەی پەکی کەوتوە و لەڕێیەدایە و، لە ماڵ و خزم و کەس و کار و نیشتیمانی خۆیشی دوورە و پێویستیی بە هاوکارییە، کە کاتی خۆی، ئەوە زەقتر بووە، سەفەرو هاتوچۆ هەروا ئاسان نەبووە و، کەسانێك هەبوون، کە چوونە سەفەری دوور، ئەو سەروەت و سامانەی کە پێیان بووە، یان نەیانماوە و خەرجیان کردوە، یان لێیان ستاندوون، ڕێگر لێیان ستاندوون و ڕووتیان کردوونەوە، یاخود لێیان بزر بووە، یاخود وڵاخەکەیان کە هۆی هاتوچۆیان بووە، مردوە، یان بە هەرحاڵ بە شێوەیەك لە شێوەکان بەدەستیانەوە نەماوەو، پێویستییان بە هاوکاریی بووە، کە ئێستاش ئەو حاڵەتە هەر هەیە، بۆیە خوا ﷻ ڕێبواریشی خستۆتە ڕێزی نەدار و خزمانەوە، کە دەبێ هاوکاریی بکرێن.

٤)- ﴿ وَلَا تُبَذِّرۡ تَبۡذِيرًا ﴾، واتە: هەروەها بە دەستبڵاویی، دەستبڵاویی مەکە، (**التَّبْذِيرُ: التَفْرِيقُ وَاسْتُعِيرَ لِكُلِّ مُضَيِّعٍ مَالَهُ**)، وەك پێشتریش گوتمان (**تَبْذِير**)، واتە: بڵاوکردنەوەو پەرش و بڵاوکردن، کە لێرەدا خوازراوەتەوە بۆ بەزایەدانی ماڵ و سامان.

کەواتـە: (**مُبَـذِّرْ**)، هەرکەسـێکە ماڵـی خـۆی زایـە دەکات، یـانی: کەلێنـی پێناگـرێ، کاتـێ خەرجـی دەکات و، هەڵــە خەرجیــی دەکات.

٥)- ﴿ إِنَّ ٱلۡمُبَذِّرِينَ كَانُوٓاْ إِخۡوَٰنَ ٱلشَّيَٰطِينِ ﴾، بە دڵنیایی ماڵی خۆ بڵاوکەرەوان، هەڵە خەرجان، ماڵی خۆ بەفیڕۆدەران، برای شەیتانانن.

٦)- ﴿ وَكَانَ ٱلشَّيۡطَٰنُ لِرَبِّهِۦ كَفُورٗا ﴾، شەیتانیش هەر لە دێر زەمانەوە، بەرانبەر بە پەروەردگاری ناسوپاس بووە.

## کورتە باسێک دەربارەی (تبذیر) و (إسراف)

**أ-** (**تبذير**) یانی: ماڵ و سامانی خۆ دەستبڵاوانە خەرجکردن و، ماڵی خۆ بەفیڕۆدان، (**مُبَذِّرِين**) کەسانێك بەشێوەیەك ماڵی خۆیان خەرج دەکەن، هیچ سوودێکیان پێ ناگەیەنێ.

**ب-** (**إسراف**) بە مانای زێدەڕۆیی کردنە لە ماڵ خەرج کردن دا، لە شتێکدا کە سوودی هەیە، بۆ وێنە: شتەکە پێویستی بە هەزار (١٠٠٠) دینارە، ئەو دەچێ چل هەزار (٤٠٠٠٠) دینار خەرج دەکات، مانای وایە سی و نۆیەکەی زێدەڕۆییە، بەڵام هەزارەکەی جێی خۆی گرتوە.

بەڵام (تبذیر)، ئەوەیە کە هەر لە ئەسڵدا ئەو ماڵ خەرجکردنە سوودی نەبێ و، کەڵێنێك نەگرێ، مرۆڤ بێ هوودە ماڵەکەی خەرج بکات.

ئنجا دەتوانین بڵێین:

ڕەفتارێکی وەك: جگەرە کێشان، قومار کردن - کە ئەوە هەر زۆر لە پێشترە - هەروەها مەی خۆریی و بەکارهێنانی ماددە سڕکەرو سەرخۆشکەرەکان، ئەوە هەر هیچ، کە وێڕای قەدەغە بوونیان، ماڵەکەش کە تێیاندا خەرج دەکرێ، ماڵ بەفیڕۆدان و پرژ و بڵاوکردنەوەو هەڵە خەرجییە، هەروەها هەرجۆرە ماڵ خەرج کردنێکی دیکە، کە هیچ کەلێنێك نەگرێ و سوودی نەبێ، چ جای زیانیشی هەبێ، ئەوە هەر هیچ! بەڵام ئەگەر هەر زیانیشی نەبێ، مادام سوودی نەبێ و کەلێن نەگرێ، ئەوە بە: (**تبذیر**) لە قەڵەم دەدرێ.

ئنجا دەپرسین: بۆچی خوا ﷻ لێرەدا کەسانێك کە دەست بڵاویی دەکەن، کەسانێك کە ماڵی خۆیان بەفیڕۆ دەدەن و بەشێوەیەك خەرجی دەکەن، کە هیچ سوودێکیان پێ ناگەیەنێ، بە برای شەیتانی داناون؟ دەڵێین: چونکە شەیتانیش بەرانبەر بە خواو بەچاکەکانی خوا، ناسوپاسە، کەسێکیش ماڵی خۆی بەشێوەیەك خەرج دەکات، کە بە هەدەری دەدات، لەو ڕەفتارەیدا، وەك شەیتانی کردوە، ئەویش ئەو نیعمەتەی کە ماڵ و سامانە، مادام کەلێنی پێنەگرت و بەفیڕۆی دا، مانای وایە وەك چۆن شەیتان بەرانبەر بە چاکەکانی خوا ناسوپاس بوو، ئەویش لە نیعمەت و چاکەی ماڵ و سامان دا، ناسوپاسە بەرانبەر بەخوا، چونکە نیعمەتەکەی خوا، نادیدە دەگرێ و بە شێوەیەك مامەڵەی لەگەڵ دەکات کە پێچەوانەی ڕەزامەندیی خواو شەریعەتی خواو، بەرژەوەندیی خۆی و کۆمەڵگاشە.

**لەوبارەوە چەند فەرموودەیەك دێنینەوە:**

**یەكەم:** {عَن أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: لَيْسَ الْمِسْكِينُ الَّذِي يَطُوفُ عَلَى النَّاسِ، تَرُدُّهُ اللُّقْمَةُ وَاللُّقْمَتَانِ، وَالتَّمْرَةُ وَالتَّمْرَتَانِ، وَلكِنِ الْمِسْكِينُ الذي لاَ يَجِدُ غِنًى يُغْنِيهِ، وَلاَ يُفْطَنُ بِهِ، فَيُتَصَدَّقُ عَلَيْهِ، وَلاَ يَقُومُ، فَيَسْأَلُ النَّاسَ} (أخرجه مالك: ١٦٤٥، وأحمد: ٩١٢٩، والبخاري: ١٤٠٩، ومسلم: ١٠٣٩، وأبو داود: ١٦٣١، والنسائي: ٢٥٧٢، وابن حبان: ٣٣٥٢).

ئەبوو هورەیرە ﷺ، دەڵێ، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: نەدار ئەو كەسە نیە كە بەسەر خەڵكەوە دەگەڕێ، پاروویەك و دوو پاروو، یان خورمایەك و دووخورما، قەناعەتی پێ دێنن و دەیگێڕنەوە، بەڵكو نەدار{ێك باشە چاكەی لەگەڵ بكرێ و هاوكاریی بكرێ}، كەسێكە سامانێكی نیە بێنیازی بكات لە خەڵكی، {واتە: دەوڵەمەندییەكی نیە، بێ نیازی بكات لە خەڵك، كە چاوی لە خەڵك نەبێ}، و هەستیشی پێ ناكرێ، چاكەی لەگەڵ بكرێ و هاوكاریی بكرێ و ناشچێ: داوا لە خەڵك بكات.

كەواتە: كە دەفەرموێ: (**الْمِسْكِينُ الذي لاَ يَجِدُ غِنًى يُغْنِيهِ**)، (**مسكين**) هێندە دەوڵەمەند نیە كە سامانەكەی بێ نیازی بكات، ئەمە پشتگیریی ئەو ڕایە دەكات كە دەڵێ: (**مسكين**) ئەو كەسەیە كە شتێكی هەیە، بەڵام پێی بەڕێوەناچێ، بەڵام (**فقير**) ئەو كەسەیە: هیچ شتێكی نیە.

**دووەم:** {مَنْ أَحَبَّ أَنْ يُبْسَطَ لَهُ فِي رِزْقِهِ، وَيُنْسَأَ لَهُ فِي أَثَرِهِ، فَلْيَصِلْ رَحِمَهُ} (أخرجه البخاري: ١٩٦١، ومسلم: ٢٥٥٧، وأبو داود: ١٦٩٣).

واتە: هەر كەسێك حەزدەكات كە بژیوی بۆ فراوان بكرێ و شوێنەواری بۆ دوا بخرێ، (واتە: تەمەنی درێژ بێ و، تەمەنی پڕ بەرەكەت بێ) با پەیوەندیی خزمایەتیی بگەیەنێ.

**سێیەم:** {مَنْ كانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ جائِزَتَهُ، قَالَ: وَما جائِزَتُهُ يا رَسُولَ اللَّهِ؟ قالَ: يَوْمٌ وَلَيْلَةٌ، وَالضِّيافَةُ ثَلاثَةُ أَيَّامٍ، فَما كانَ وراءَ ذَلِكَ، فَهُوَ صَدَقَةٌ عليْهِ، وَمَنْ كانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ، فَلْيَقُلْ خَيْرًا أَوْ لِيَصْمُتْ} (أخرجه مالك: ١٦٦٠، وأحمد: ٢٧٢٠٥، والبخاري: ٥٧٨٤، ومسلم: ٤٨، وأبو داود: ٣٧٤٨، والترمذي: ١٩٦٧).

واتە: هەر كەسێك بڕوای بە خواو بەڕۆژی دوای هەیە، با ڕێز لە میوانی خۆی بگرێ: خەڵات و دیارییەكەی، (واتە: با بەپێدانی خەڵات و دیارییەكەی، ڕێزی لێ بگرێ)،

گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ خەڵات و دیارییەکە کە پێشکەشی میوان دەکرێ، چییە؟ فەرمووی: شەو و ڕۆژێکە، {واتە: شەو و ڕۆژێك خزمەتی بکرێ و، بابای خانەخوێ گرنگیی زیاتری پێبدا، بەو واتایە کە: خزمەتی تایبەتی بکات}، ئنجا میواندارییەتیی، سێ ڕۆژە، لە دوای ئەوە بە صەدەقەو خێر پێکردن لە قەڵەم دەدرێ، هەرکەسێکیش بڕوای بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە، با چاکە بڵێ، یان بێدەنگ بێ.

پێغەمبەری خوا ﷺ بە گشتیی ئەوەی فەرمووە، ئەگەرنا، جاری وایە خزم و کەس و برادەرێك مانگێکت لە لادەبێ، یان زیاتریشت لە لادەبێ، تۆش وای نیشان نادەی: کە چاکەی لەگەڵ دەکەی و خێری پێدەکەی، بەڵکو هەر وەك میوان، لەو ماوە درێژەدا مامەڵەی لەگەڵدا دەکەی، بەڵکو لە میوانیش زیاتر و، هەروەك کەسێك کە لە ماڵەکەدایە، بەڵام پێغەمبەر ﷺ بە گشتی و بۆ هەموو حاڵەتەکان فەرمایشت دەفەرموێ، ئەمەش بۆ ئەوەی کە وەك کلتوورێك دەبێ بزانرێ: میوان دەبێ شەو و ڕۆژێك خزمەتی تایبەتی بکرێ و سێ ڕۆژان بە میوان لە قەڵەم دەدرێ، دوایی بابای خانەخوێ، ناچار نیە کە وەك میوان مامەڵەی لەگەڵ بکات، بەڵکو وەك کەسێك کە چاکەی لەگەڵ دەکات و خێری پێدەکات.

لە کۆتایی ئەم مەسەلەیەدا قسەیەکی (القرطبي) دێنین: **(من أنفق ما لَهُ في الشهوات زائداً على قدر الحاجات، وعَرَّضَهُ بذلك للنَّفاد، فهو مُبَذِّر، ومن أنفق رِبْحَ مالِهِ في شهواته، وحَفِظَ الأَصْلَ أو الرَّقَبة، فليس بِمُبَذِّر، ومن أنفق دِرْهماً في حرامٍ، فهو مُبذِّر ويُحْجَرُ عليه في نفقته الدِّرْهَمَ في الحرام، ولايُحْجَرُ عليه إن بَذَلَهُ في الشهوات، إلاّ إذا خيف عليه النَّفادُ)**[١].

(قُرطبي) وەك عادەتی خۆی لە زۆر لە ئایەتەکاندا، حوکمە شەرعییەکان هەڵدەهێنجێ، لێرەش دەڵێ:

هەر کەسێك سامان و ماڵی خۆی لە ئارەزووەکان دا، خەرج بکات، زیاد لە پێویستیی خۆی و بەهۆی ئەو خەرج کردنەی ماڵ و سامانی خۆیەوە، لە ئارەزووەکانیدا، سامانەکەی بە فیڕۆ بدات، ئەوە بە (مُبَذِّر) لە قەڵەم دەدرێ، {واتە: بەدەستبڵاو وماڵ بەفیڕۆدەر}، بەڵام هەر کەسێك قازانجی ماڵ و سامانەکەی لە تێر کردنی ئارەزووەکانیدا {مەبەست پێی ئارەزووی شەرعییە} خەرج بکات، بەڵام ئەسڵی ماڵ و سامانەکەی بهێڵێتەوە و بپارێزێ، ئەوە بە ماڵ بە فیڕۆدەر (مبذر) لەقەڵەم نادرێ، بەڵام هەرکەسێك یەك درەم

(١) الجامع لأحكام القرآن: ج١٠، ص٢٤٨.

لە حەڕامدا خەرج بکات، ئەوە بەماڵ بەفیڕۆدەر لە قەڵەم دەدرێ و، لەو درەمەدا کە لە حەڕامدا خەرجی دەکات، حەجری دەخرێتە سەر، {**حَجْر**: زاراوەیەکی فیقهییە، ئایا کێ (**حَجْر**)ی دەخرێتە سەر؟ خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تُؤْتُوا۟ ٱلسُّفَهَآءَ أَمْوَٰلَكُمُ ٱلَّتِى جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمْ قِيَـٰمًا ﴾، واتە: نەفامەکانتان ئەو ماڵ و سامانەیان تەسلیم مەکەن، کە خوا بەهۆی ئەوەوە ڕاتان دەگرێ، واتە: دەبێ حەجریان بخرێتە سەر و ڕێیان لێ بگیرێ لە تەصەڕڕوف و دەست وەردانە ماڵ و سامانی خۆیان، کەسێك کە نەزانێ ماڵ و سامانەکەی بەکاربهێنێ، لە بەرژەوەندیی خۆیدا، دەبێ دەستی بگیرێ}، بەڵام مرۆڤ مەنع ناکرێ و حەجری ناخرێتە سەر، ئەگەر ماڵ و سامانەکەی لە تێر کردنی ئارەزووەکانی دا بەکاربێنێ، مەگەر مەترسیی ئەوەی لێ بکرێ، ماڵ و سامانەکەی هەمووی خەرج بکات و هیچی بۆ نەمێنێتەوە.

یانی: دەستە و ئەژنۆ و دەست بەتاڵ دابنیشێ، لەوکاتەدا لەبەر بەرژەوەندیی خۆی، کۆمەڵگای مسوڵمان و قەوارەی ئیسلامیی، دەستی دەگرێ، چونکە ئەو کەسە بۆی نیە ماڵ و سامانەکەی خۆی، بەو شێوەیە خەرج بکات و بەفیڕۆی بدات، دواییش دەستە و ئەژنۆ دابنیشێ و دەست لەبەر خەڵکی پان بکاتەوە.

## مەسەلەی شەشەم:

**هەرکاتێکیش لەبەر تەنگ دەستیی، نەتتوانی هاوکاریی ئەو کەسانە بکەی و، بە هیوای بەزەیی و بەخششی خوا بووی، کە لە داهاتوودا شتێکت بۆ بڕەخسێنێ، قسەیەکی خۆش و ئاسانیان لەگەڵدا بکە:**

ئەم ئایەتەش ڕەوشت و ڕەفتاریی سێزدەیەم دەگرێتە خۆی:

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِمَّا تُعْرِضَنَّ عَنْهُمُ ٱبْتِغَآءَ رَحْمَةٍ مِّن رَّبِّكَ تَرْجُوهَا فَقُل لَّهُمْ قَوْلًا مَّيْسُورًا  ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿ وَإِمَّا تُعْرِضَنَّ عَنْهُمُ ﴾، هەرکاتێك ڕووت لێیان وەگێڕاو پشتت تێیانکرد، یانی: لە خزمان، لە نەدار، لە ڕێبوار، چونکە: ئەو سێیە، باسکراون، بەڵام بە (**قیاس**) بۆ سەر ئەوانەش، هەموو ئەوانەی کە لە کۆمەڵگادا پێویستییان بە هاوکاریی هەیە، وەك لە شوێنەکانی دیکەی قورئاندا، خوا ﷻ باسیان دەکات، باسی قەرزدار دەکات، باسی هەتیوان دەکات، باسی جەنگاوەران و باسی سەرجەم ئەو پێکهاتانەی کۆمەڵگا دەکات، کە پێویستییان بە دەستگرۆیی و هاوکاریی هەیە، وشەی: (**إِمَّا**) لە (**إِنْ، مَا**) پێکهاتوە، (**إِعْرَاض**)یش پێچەوانەی (**إِقْبَالَ**)ە، (**إِقْبَال**) ڕووتێکردن و (**إِعْرَاض**) پشت تێکردن و ڕوو لێ وەرگێڕانە، چونکە (**إِعْرَاض**) لە (**عُرْض**)ەوە هاتوە، (**عُرْض**) واتە: (**جَانِب**) یانی: لا مل تێکردن و ڕوولێ وەرگێڕان، چونکە کەسێك کە بەرەو ڕووی دەچی، بێگومان تۆ ڕووی تێدەکەی، کە لێرەدا ئەسڵەن ڕوو تێکردنەکەش تەعبیرێکی مەجازییە، واتە: هاوکاریی کردن و داواگرتنەوە.

لا مل تێکردن، یان ڕوو لێوەرگێڕانیش، یانی: پێنەدان، هەرکاتێك ئەوانە وابوون و، تۆش حاڵت وابوو: پشتیان تێبکەی و، ڕوویان تێ نەکەی و، هاوکارییان نەکەی:

٢)- ﴿ ٱبْتِغَآءَ رَحْمَةٍ مِّن رَّبِّكَ تَرْجُوهَا ﴾، لە حاڵێکدا تۆ ڕوویان تێناکەی، تۆ خوازیار و ئومێدەواری بەزەییەکی لە پەروەردگارتەوە، یانی: کە پشتیان تێبکەی، لەبەر ئەوەی نیتە و لەو کاتەدا بە دەستتەوە نیە و ناتوانی هاوکارییان بکەی، بەڵام مادام هیوات بە بەزەیی و بەخششی خوا هەیە شتێکست بێتە دەست لە داهاتوودا، لەوحاڵەدا:

٣)- ﴿فَقُل لَّهُمْ قَوْلًا مَّيْسُورًا﴾، {لەو حاڵەتەدا} قسەیەکی ئاسانیان لەگەڵدا بکە.

(المَيْسُور: مَفْعُولٌ مِنَ اليُسْرِ، وَهُوَ السُّهُولَةُ، وَفِعْلُهُ مَبْنِيٌّ للمَجْهُولِ، يُقَالُ: يُسِرَ الأَمْرُ، كَمَا يُقَالُ: سُعِدَ الرَّجُلُ وَنُحِسَ، وَالمَعْنَى: جُعِلَ يَسِيْراً غَيْرَ عَسِيرٍ، وَالقَوْلُ المَيْسُورُ: اللَّيِّنُ الحَسَنُ المَقْبُولُ عِنْدَهُمْ)، وشەی (مَيْسُور) (مفعول)ە لە (يُسْر)ەوە هاتووە، واتە: ئاسانیی و، کرداری (مَيْسُور) بەحاڵەتی: (مَبْنِيٌّ للمَجْهول) دێ، واتە: بکەر نادیار، دەگوترێ: (يُسِرَ الأَمْرُ)، واتە: کارەکە ئاسان بوو، هەروەك دەگوترێ: (سُعِدَ الرَّجُل) پیاوەکە بەختەوەر بوو، دیسان دەگوترێ: (نُحِسَ الرَّجُلُ) پیاوەکە نەگبەت بوو.

(القَوْلُ المَيْسُور)یش قسەیەکی نەرمی چاکە، کە پەسند بێ لەلای وان، یانی: بە قسەیەکی خۆش و، بەڕوویێکی خۆش بیاندوێنەو بەڕێیانبکەو، بۆیان ڕوونبکەوە کە جارێ بەدەستتەوە نیە.

کەواتە: مەرجی پشتتێکردن و، ڕوولێ وەرگێڕان و، هاوکاریی نەکردنی خزم و، نەدارو، ڕێبوار و پێکهاتەکانی دیکەی کۆمەڵگا، دوو شتە:

**یەکەم:** دەبێ نەتبێ، چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿ٱبْتِغَآءَ رَحْمَةٍ مِّن رَّبِّكَ تَرْجُوهَا﴾، واتە: خوازیاری بەزەییەکی لە پەروەردگارتەوە، کە تۆ ئومێدەواری، واتە: هیوات وایە: بەهۆی بەزەیی پەروەدگارتەوە، شتێکت بێتە دەست لە ئایندەدا.

**دووەم:** ئەوەیە کە تۆ قسەیەکی نەرم و باشیان لەگەڵدا بکەی، یانی: کە تۆ ناتوانی بە کرداریش هاوکارییان بکەی، لانی کەم بە گوتار، دڵیان خۆش بکە و ڕووت لەگەڵیان خۆش بێ و، قسەت لەگەڵیان نەرم بێ، وەك (مُتَنَبِّي) شاعیر دەڵێ:

لاَ خَيْلَ عِنْدِي أُهْدِيهَا وَلاَ مَال ... فَلْيُسْعِدِ النُّطْقُ إِذَا لَمْ يُسْعِدِ الحَالُ

واتە: نە ئەسپم هەیە بیکەمە دیاریی، نە ماڵ و سامان، ئەگەر بەحاڵیش نەتوانم بابای داواکار دڵخۆش بکەم، با بە قسەی خۆش دڵخۆشی بکەم.

لێرەدا کە خوا دەفەرموێ: ﴿ٱبْتِغَآءَ رَحْمَةٍ مِّن رَّبِّكَ تَرْجُوهَا﴾، مەبەست لە بەزەیی و ڕەحمەت، بریتیە لە ڕزق، بۆچی خوا ﷻ ڕزقی بەبەزەیی ناوهێناوە؟ (سُمِّيَ الرِّزْقُ رَحْمَةً، لأَنَّهُ سَبَبُ رَحْمَةِ اللّهِ للمُنْفِقِ)، واتە: بۆیە وشەی بژیو بە ڕەحمەت دانراوە و ناونراوە، چونکە کەسێك یارمەتی کەسێکی دیکە بدات، ئەوە مایەی دابەزینی بەزەیی خوایە بۆ بابای بەخشەر، دەشگونجێ بڵێین: تۆ چاوەڕێ و خوازیاری بەزەیی خوا بکە، بە هۆی

بەزەییەوە، خوا ﷻ بژیوێکت بێنێتە دەست و، توانایەکی ماددییت بۆ بڕەخسێنێ، کە بتوانی هاوکاریی و دەستگرۆیی ئاتاجان بکەی.

هەروەها ئەم ئایەتە ڕاستییەکی دیکەش دەگەیەنێ، وەك زانایان گوتوویانە: (**وَفِيهِ تَأْدِيب لِلْمُؤْمِنِ أَنَّهُ إِذَا كَانَ فَاقِدَاً لِمَا يَبْلُغُ بِهِ فِعْل الخَيْر، وَجَبَ عَلَيْهِ السَّعْيُ لِتَيْسِيرِ أَسْبَابه وَرَجَاءِ ذَلِكَ مِنَ اللَّه**)، ئەمە جۆرێك لە فێرکردنی بڕواداریشە، کە ئەگەر نەیتوانی و توانای نەبوو چاکە و هاوکاریی پێ بکات، لەسەری پێویستە هۆکارەکانی بە دەستهێنانی ماڵ و سامان بگرێتەبەرو، لە خواش بخوازێ و داوا بکات.

یانی: ئەگەر ئێستاش ناتوانێ ببەخشێ، دەبێ کارێك بکات کە لە داهاتوودا، توانای هەبێ ببەخشێ و هاوکاریی ئاتاجان بکات.

## مەسەلەی حەوتەم:

**دەست بە قووچاویی بە ملتەوە مەنووسێنە و بە تەواوییش بڵاوی مەکە، ئەگەرنا بە عەیبداریی و پەککەوتوویی دادەنیشی:**

ئەم ئایەتە موبارەکەش هەرکام لە ڕەوشت و ئاکاری چواردە و پازدە دەگرێتە خۆی:

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَجْعَلْ يَدَكَ مَغْلُولَةً إِلَىٰ عُنُقِكَ وَلَا تَبْسُطْهَا كُلَّ الْبَسْطِ فَتَقْعُدَ مَلُومًا مَّحْسُورًا ﴿٢٩﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿ وَلَا تَجْعَلْ يَدَكَ مَغْلُولَةً إِلَىٰ عُنُقِكَ ﴾، دەستت وەك كۆت كرابێ بە ملتیەوە مەنووسێنە، بۆچی خوا وا دەفەرموێ؟ (**اليَدُ: آلَةُ العَطَاءِ وَرَمْزُهُ، وَالغُلُّ: كِنَايَةٌ عَنِ البُخْلِ**)، دەست ئامرازی بەخشین و هێمای بەخشینە، (**غُلّ**) كۆت و زنجیریش كینایەیە بۆ چرووكیی و ڕژدیی، واتە: ئەو ئامرازەی كە پێی دەبەخشی بە ملتیەوە مەنووسێنە، وەك ئەوەی كە كۆت كرابێ و چرووك و ڕژد مەبە.

٢)- ﴿ وَلَا تَبْسُطْهَا كُلَّ الْبَسْطِ ﴾، بەڵام وەك چۆن نابێ: دەستت بەسترابێ و زنجیر كرابێ و بەملتەوە نووساندبێ بۆ ئەوەی هیچی لێ نەیەتە دەر، نابێ بە تەواوییش بڵاوی بكەیەوە، كە هیچی پێوە بەند نەبێ.

(**كُلَّ البَسْط: البَسْطُ الَّذِي لاَ بَسْطَ بَعْدَهُ، وَهُوَ مَعْنَى النِّهَايَة**)، (**كُلَّ البَسْط**) یانی: بە تەواویی، كە هیچ مەجالی دیكەی تێدا نەمێنێ بڵاوی بكەیەوە.

٣)- ﴿ فَتَقْعُدَ مَلُومًا مَّحْسُورًا ﴾، ئەم (**ف**)یە بۆ (**جَزاء**)ە، یاخود بۆ (**تعقیب**) بەدواداهاتنە، واتە: كە بەهۆی ئەوەوە، یان: سەرەنجام دابنیشی، (**فتقعد**)، (**قعود**) یانی: دانیشتن، (**فتقعد**) واتە: ڕۆدەنیشی و دادەنیشی، كە ئەمە ڕەمزە بۆ تەنبەڵیی و بێ دەستەڵاتیی و دەستە پاچەیی، چونكە ئەگەر كەسێك توانای هەبێ هەڵدەستێتە سەرپێ، دەگوترێ: دابنیشە، تۆ هیچت لە دەست نایەت.

(**ملوماً**) یانی: ڕەخنە لێگیراوو سەرزەنشت كراو.

٤)- ﴿ مَّحۡسُورًا ﴾، واتە: پەککەوتوو.

یانی: ئەی مرۆڤ ! لە حاڵەتی دەست بە ملەوە نووساندن دا، بە قووچاویی وەك كۆتكرابێ، سەركۆنەو لۆمە دەكرێی لەسەر چرووكیی و ڕژدیی، ڕەخنەت لێدەگیرێ و عەیبدار دەبی، لە حاڵەتی دەستبڵاوییش دا كە تەواو دەستی خۆت بڵاوبكەیەوە، ماندوو و پەككەوتوو دەبی و لێت دەبڕێ و دادەنیشی.

(**المَحْسُور: المَنْهُوكُ القِوَى، بَعِيرٌ حَسِير: إِذَا أَتْعَبَهُ السَّيْرُ فَلَمْ تَبْقَ لَهُ قُوَّةٌ، يَقُولُ سُبْحَانَهُ وَتَعَالى:** ﴿يَنقَلِبۡ إِلَيۡكَ ٱلۡبَصَرُ خَاسِئٗا وَهُوَ حَسِيرٞ ٤﴾ **الملك**)، واتە:(**محسور**) كەسێكە وزەی نەمابێ، دەگوترێ: (**بَعِيرٌ حَسِير**) كاتێك حوشترەكە هیچ توانای ڕۆیشتنی نەمابێ، زۆر ڕۆیشتبێ و تەواو ماندوو بێ و پەكی كەوتبێ.

هەروەها خوا ﷻ لە سوورەتی (**الملك**)دا دەفەرموێ: ﴿يَنقَلِبۡ إِلَيۡكَ ٱلۡبَصَرُ خَاسِئٗا وَهُوَ حَسِيرٞ ٤﴾، واتە: ئەگەر تەماشای گەردوون بكەی، بۆ ئەوەی ڕەخنەو كەم و كوڕیی و ناڕێكیی تێدا بدۆزیەوە، سەرەنجام چاوت دەگەڕێتەوە بۆ لات، بە دەركراویی، ﴿ وَهُوَ حَسِيرٞ ﴾ لە حاڵێك دا كە پەكی كەوتوە، چونكە: زۆر گەڕاوەو سووڕاوە، بەڵام هیچ كەم و كوڕیی لە دروستكراوەكانی خوا و لە گەردووندا نەدۆزیونەوە.

**مەسەلەی هەشتەم:**

**بەدڵنیایی پەروەردگارت هەرکەسێك بیەوێ، بژیوی بۆ فراوان دەكات و، بۆ هەرکەسێکیشی بوێ، لێی دەگرێتەوەو هەرخۆی شارەزاو بینەری بەندەکانیەتی:**

وەك دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ رَبَّكَ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرًۢا بَصِيرًا  ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿ إِنَّ رَبَّكَ ﴾، بێگومان پەروەردگاری تۆ، بەخێوکەری تۆ، مشوورخۆری تۆ، لەم سووڕەتەدا وشەی (**رب**) زۆر دووبارە بۆتەوە، پێشتریش گوتوومانە، وشەی (**رب**) مانای: ١- خاوەن و، ٢- بەخێوکەرو، ٣- مشوورخۆرو، ٤- سەرپەرشتیارو، ٥- پەروەردگارو، ٦- پەرستراوو، ٧- بەدیهێنەریش هەر دەگەیەنێ، بەڵام لە کوردییدا زیاتر وشەی پەروەردگار، یان پەروەرندە، یان بەخێوکار، یان سەرپەرشتیار، بەکاردێ.

٢)- ﴿ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ ﴾، ڕۆزیی و بژیو بۆ هەرکەسێك بیەوێ فراوان دەكات، واتە: زۆر دەكات.

٣)- ﴿ وَيَقْدِرُ ﴾، هەروەها تەنگ دەكاتەوە، (**قَدَرَ يَقْدِرُ، أَي: ضَيَّقَ يُضَيِّقُ**) کە مەبەست لە تەنگ کردنەوەو بەرتەسك کردنەوە، کەم کردنەوەیە، واتە: بۆ هەرکەسێکی بوێ، بژیوی بۆ فراوان دەكات و، بۆ هەرکەسێکیش بیەوێ، لێی وە تەنگ دێنێ و کەم دەكاتەوە.

٤)- ﴿ إِنَّهُۥ كَانَ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرًۢا بَصِيرًا ﴾، بە دڵنیایی ئەو سەبارەت بە بەندەکانی زۆر شارەزایەو، زۆریش بینەرە، واتە: ئاگادارو شارەزای حاڵ و باڵی بەندەکانیەتی و دەزانێ: هەرکامێکیان چۆنەو، چی بۆ باشە؟!

## ڕوونکردنەوەی چەمکی: فراوانکردن و تەنگکردنی بژیو:

پێویستە ئەوە بزانین کە فراوان کردن و تەنگکردنەوەی بژیو، وەك هەر شتێکی دیکە بە ویستی خوایە، بەڵام لەمیانی هۆکارەکاندا ئەو دوو حاڵەتە دێنە دی: کەسێك کە کۆشش دەكات و هەوڵدەدات و مشوور دەخوات و خۆی ماندوو دەكات، بە زۆریی وایە:

ئـەو جـۆرە كەسـانە بژێویـان دەسـت دەكـەوێ و ڕۆزییـان فـراوان دەبـێ، بـە ئەنـدازەی ئـەوە كـە لێزانانـە هەوڵـدەدەن و، كۆشـش دەكـەن و خۆیـان مانـدوو دەكـەن و، مشـوور دەخـۆن، وەك خـوا لـە سـوورەتی (**النجـم**)دا دەفەرمـوێ: ﴿ وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴿٣٩﴾ ﴾، واتـە: بـۆ مـرۆڤ هیـچ بەرهەمێـك نیـە، مەگـەر كۆشـش بـكات.

بـەڵام كەسـێك تەنبـەڵ تەنبـەڵ دابنیشـێ و نەیـەوێ ئارەقـە بـكات و، خـۆی مانـدوو نـەكات، بێگومـان ئـەوە بژێوەكـەی تەنـگ دەبێتـەوە، ئنجا بۆیـە خـوا هـەردوو حاڵەتەكـەی پاڵداونـە لای خـۆی، هـەم فراوانكـردنی بژێـو، هـەم كەمكردنـەوەی، كـە وشـەی (**بَسْـطُ**) و (**قَبْضِ**)ی، بـۆ بەكارهێنـاون، واتـە: فـراوان كـردن و تەنگكردنـەوە، بۆیـە پاڵـی داونـە لای خـۆی، چونكـە:

١- بە ویستی خوا ئەو حاڵەتانە دێنە دی.

٢- بەپێی ئەو یاسایانەی خوا لە ژیانی مرۆڤدا دایناون، دێنەدی، كە یەكێك لە یاساكانی خوا لە ژیانی مرۆڤدا ئەوەیە: هەر كەسێك هەوڵبدات و، كۆشش بكات و، خۆی ماندوو بكات بژێوی فراوان دەبێ و هەركەسێكیش تەنبەڵ تەنبەڵ دابنیشێ و، تەوەزەل بێ و، خۆی ئەزیەت نەدا و، خۆی ماندوو نەكات، بژێوەكەی كەم دەبێ و چاوی لە دەستی خەڵك دەبێ.

هەڵبەتـە ئـەوە بـە زۆریـی و وەك بنچینەیـەكی گشـتی وایـە، هـی واش هەیـە زۆر خـۆی مانـدوو دەكات، بـەڵام بژێوەكـەی هـەر كـەم دەبـێ، هەروەهـا هـی واش هەیـە كەمتر خـۆی مانـدوو دەكات، بـەڵام بژێـوی زیاتـری بەدەسـتەوە دێ، بـەڵام ئـەوە ڕیزپـەڕە و وەك بنچینـەی گشـتی: كەسـێك خـۆی مانـدوو بـكات بـۆ هەرشـتێك، ئـەو شـتەی دەسـت دەكـەوێ، وەك پێشـتر خـوا فەرمـووی: ﴿ مَّن كَانَ يُرِيدُ ٱلْعَاجِلَةَ عَجَّلْنَا لَهُۥ فِيهَا مَا نَشَآءُ لِمَن نُّرِيدُ ...﴿١٨﴾ ﴾، ئەمـە بـۆ دنیـا خـوازان، ﴿ وَمَنْ أَرَادَ ٱلْءَاخِرَةَ وَسَعَىٰ لَهَا سَعْيَهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُوْلَٰٓئِكَ كَانَ سَعْيُهُم مَّشْكُورًا ﴿١٩﴾ ﴾ ئەمـەش بـۆ دوارۆژ خـوازان، ﴿ كُلًّا نُّمِدُّ هَٰٓؤُلَآءِ وَهَٰٓؤُلَآءِ مِنْ عَطَآءِ رَبِّكَ ۚ وَمَا كَانَ عَطَآءُ رَبِّكَ مَحْظُورًا ﴿٢٠﴾ ﴾ ئەمـەش بـۆ هـەردووك لایـان بـۆ هەمـوو كـەس و لایـەك بـە گشـتی.

## مەسەلەی نۆیەم:

**خوا دەفەرموێ: ڕۆڵەکانتان لە ترسی هەژاریی مەکوژن، ئێمە بژیوی ئێوەو ئەوانیش دەدەین و، کوشتنیان تاوانێکی زلە:**

ئەم ئایەتە ڕەوشت و ڕەفتاری شازدەیەم دەگرێتە خۆی.

خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَوْلَٰدَكُمْ خَشْيَةَ إِمْلَٰقٍ ۖ نَّحْنُ نَرْزُقُهُمْ وَإِيَّاكُمْ ۚ إِنَّ قَتْلَهُمْ كَانَ خِطْـًٔا كَبِيرًا ﴿٣١﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿ وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَوْلَٰدَكُمْ ﴾، هەروەها منداڵەکانتان مەکوژن، (**أَوْلَادَ**) کۆی (**وَلَد**)ە، (**وَلَد**) هەم کوڕ (**إِبْن**) هەم کچ (**بِنْت**) دەگرێتەوە، ڕۆڵەکانتان مەکوژن، منداڵەکانتان مەکوژن، واتە: کوڕو کچەکانتان هەردووکیان دەگرێتەوە.

٢)- ﴿ خَشْيَةَ إِمْلَٰقٍ ﴾، واتە: لە ترسی هەژاریی، لە ترسی ئاتاجیی و نەبوونیی، (**إِمْلَاق: إِفْتِقَار، المَلَقَةُ: الصَّفَاةُ الملساءُ**)، (**مَلَقَة**) بەو بەردە تەنکە لووسە دەگوترێ، کە هیچ شتێکی پێوە بەند نابێ، ئەو مرۆڤەش کە هیچی نیە، بە تاتە بەردێکی لووس چوێنراوە، وەك ئەو چۆن هیچ گڵی پێوە بەند نابێ، ئەویش هیچ ماڵ و سامانی نیە، ئنجا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَوْلَٰدَكُمْ خَشْيَةَ إِمْلَٰقٍ ﴾، لە ترسی هەژاریی و نەبوونیی منداڵەکانتان مەکوژن.

٣)- ﴿ نَّحْنُ نَرْزُقُهُمْ وَإِيَّاكُمْ ﴾، ئێمە بژیوی ئەوانیش و، ئێوەش دەدەین.

لێرەدا منداڵەکانی پێش خستوون، چونکە ئەو کەسە ئێستا هەژار نیە، بەڵام دەترسێ هەژار بێ لە داهاتوودا، بۆیە خوا ﷻ بژیودانی ڕۆڵەکانی پێشخستوە، یانی: لە داهاتووشدا بژیوی ئەوانیش و هی ئێوەش دەدەین.

٤)- ﴿ إِنَّ قَتْلَهُمْ كَانَ خِطْـًٔا كَبِيرًا ﴾، بە دڵنیایی کوشتنیان لە ترسی هەژاریی و نەبوونیی تاوانێکی گەورەیە، (**الخِطْءُ: مَصْدَرُ خَطِئَ بوَزْنِ فَرِحَ، إِذَا أَصَابَ إِثْماً، وَلاَ يَكُونُ الإِثْمُ إِلاَّ عَنْ عَمْدٍ**)، وشەی (**خِطْء**) چاوگی (**خَطِيء**)یە، ئەمە بۆ کەسێکە کە بە ئانقەست گوناهێك بکات، گوناهیش هەر بە ئانقەست دەکرێ، گوناهێك کە بە ئانقەست نەکرێ، بە گوناه لە قەڵەم نادرێ، وەك خوا ﷻ لە سوورەتی (**العلق**)دا دەفەرموێ: ﴿ نَاصِيَةٍ كَٰذِبَةٍ خَاطِئَةٍ ﴿١٦﴾ ﴾، (**خاطئة**) واتە: گوناهبار.

هەروەها لە سوورەتی (القصص)دا دەفەرمویّ: ﴿إِنَّ فِرْعَوْنَ وَهَـٰمَـٰنَ وَجُنُودَهُمَا كَانُوا۟ خَـٰطِـِٔينَ ۝٨﴾، واتە: بەدڵنیایی فیرعەون و هامان و سەربازەكانیان، گوناهبار بوون، ئەمە بە نسبەت (خِطء) كە لە (خطِئَ)ەوە هاتوە.

بەڵام بە نسبەت هەڵە (خَطَأ)ەوە:

(**أَمَّا الخَطَأُ: وَهُوَ ضِدُّ العَمْدِ وَفِعْلُهُ: أَخْطَأَ وَاسْمُ الفَاعِلِ: مُخْطِيء**)، واتە: بەڵام هەڵە (**خَطَأ**)، پێچەوانەی ئانقەست (**عَمْد**)ە و كردارەكەی (**أَخْطَأَ**)یەو، ناوی بكەر (**اسم الفاعل**)ەكەی (**مُخْطِيء**)ە، كە بریتیە لە كەسێك، نەیویستوە ئەو گوناهە بكات، بەڵام وا هاتۆتە پێش، وەك (**القَتل الخَطَأ**)، كەسێك فیشەكێك دەگرێتە نێچیرێك، بەكەسێك دەكەوێ، یاخود تارماییەكی دێتە پێشی چاو، وا دەزانێ دڕندەیەكە، دوایی تەماشا دەكات مرۆڤێكە، یان لە كرداردا هەڵە دەكات، یاخود لە نیازو مەبەستەكەدا هەڵە دەكات، یاخود لەهەردووكیاندا هەڵە دەكات، ئەوە پێی دەگوترێ كوشتنی هەڵە.

بەڵام كوشتنی ئانقەست (**عمد**) ئەوەیە كە هەم بیەوێ ئەو كەسە بكوژێ و، هەم بەشتێك لەو كەسە بدات كە بكوژ بێ و مایەی كوشتن بێ، چونكە ئێمە نیەتەكەی نازانین، دەتوانێ بڵێ: من نەمویستوە بیكوژم، بەڵام تەماشا دەكەین: ئەگەر ئەو شتەی بەكاری هێناوە و، زەبرەكەی پێ وەشاندوە، مایەی كوشتن بێ: چەك بێ، تیغێك بێ، شتێكی وابێ كە مرۆڤی پێ بفەوتێ، ئەوكاتە دەڵێین: تۆ مەبەستت كوشتن بووە و نیەتی كوشتنت هەبووە، هەم لە دڵدا بە نیەت و هەم بە كرداریش.

لێرەدا جێی سەرنج ئەوەیە كە لە سوورەتی (**الأنعام**)دا كە پێشتر تەفسیرمان كردوە، خوا دەفەرمویّ: ﴿وَلَا تَقْتُلُوٓا۟ أَوْلَـٰدَكُم مِّنْ إِمْلَـٰقٍ ۖ نَّحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ﴾، واتە: منداڵەكانتان بە هۆی هەژاریی و نەدارییەوە مەكوژن، ئێمە بژیوی ئێوەش و ئەوانیش دەدەین.

بەڵام لێرەدا دەفەرمویّ: ﴿وَلَا تَقْتُلُوٓا۟ أَوْلَـٰدَكُمْ خَشْيَةَ إِمْلَـٰقٍ ۖ نَّحْنُ نَرْزُقُهُمْ وَإِيَّاكُمْ﴾، واتە: منداڵەكانتان لە ترسی هەژاریی مەكوژن {نەك لەبەر هەژاریی كە ئێستا تێیدان، بەڵكو لە ترسی ئاتاجییەك كە لەداهاتوودا دێ}، چونكە: ئێمە بژیوی ئەوانیش و ئێوەش دەدەین.

هۆكاری ئەو جیاوازییەش ئەوەیە كە: لە سوورەتی (**الأنعام**)دا باسی حاڵێك دەكات كە ئەو كەسە لەوكاتەدا تێیدایە، كە بریتیە لە هەژاریی و نەداریی، بۆیە پێشێ بژیوی

باب و دایکەکان پێش دەخات، ﴿ نَّحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ ﴾، یانی: ئەو حاڵەتی هەژاریی و نەدارییەی کە ئێستا تێیدان، لەبەر ئەوە منداڵەکانتان مەکوژن، ئێمە بژیوی هەردووك لاتان دەدەین، پێشێ هی خۆیان (باب و دایك) و پێش خستوە، چونکە هەژاریی و نەدارییەکە، ئەوان زیاتر هەستی پێ دەکەن، ئەوان زیاتر دەیچێژن، بەڵام لێرە لە سوورەتی (**الإسراء**)دا چونکە هەژارییەکە لەئێستادا نیە، بەڵکو چاوەڕێ دەکرێ لە داهاتوودا بێتە دی، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ نَّحْنُ نَرْزُقُهُمْ وَإِيَّاكُمْ ﴾، واتە: ئێمە بژیوی ئەوانیش و ئێوەش دەدەین، لێرەدا هی منداڵەکانی پێش خستوە، واتە: دڵنیا بن! بژیوی منداڵەکانیشتان دەدەین و هی ئێوەش دەدەین، بۆیە هیچ بیانوو و پاساوێکتان نیە بۆ کوشتنی منداڵەکانتان.

کە ئەوەش نەریتێك بووە لە نێو هەندێك لە تیرەو هۆزەکانی عەرەبدا، هەرچەندە زیاتر باسی کوشتنی کچان کراوە، زیندە بە چاڵکردنی کچان، بەڵام وا پێدەچێ جار جارە کوڕیشیان کوشتبێ، کەسێك کە خێزانی زۆر بووبێ، کە ئێستاش ئەوە هەر هەیە، هەندێ کەس منداڵی خۆی فڕێ دەدات و، هەندێ کەس منداڵی خۆی لە دایەنگا (**حضانة**) دادەنێ، بە تایبەت لەنێو وڵاتانی ڕۆژئاوادا، کە بەداخەوە ئەوە ئێستا لەنێو وڵاتانی مسوڵماننشینیشیان دا پەیدا بووە، بەتایبەتی بۆ ئافرەتانێك کە لەڕێی ناشەرعییەوە منداڵیان پەیدادەبێ، منداڵەکانیان فڕێدەدەن، یان لە شوێنێك دایدەنێن، بەڵکو جاری وا هەیە فڕێی دەدەنە زبڵخانەیەکەوە، ئنجا ئەم ئایەتە: هەم ئەو حاڵەتانە و، هەم ئەو حاڵەتانەی لە ڕابردووش دا هەبوون، هەموویان دەگرێتەوە.

### مەسەلەی دەیــەم:

**توخنـی زینـا مەکـەون، چونکـە کارێـکی زۆر دزێـو و ناقۆڵایـە و خراپتریـن شـێوازو ڕێبـازە بـۆ تێرکـردنی غەریـزەی جینسـیی:**

ڕەوشت ڕەفتاری حەقدەیەم دەگرێتە خۆی:

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَقْرَبُوا۟ ٱلزِّنَىٰٓ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةً وَسَآءَ سَبِيلًا ﴿٣٢﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿ وَلَا تَقْرَبُوا۟ ٱلزِّنَىٰٓ ﴾، نیزیکی زینا مەکەون، بێگومان ئەم تەعبیرە، مانایەکەی زۆر لەوە بەهێزترە کە بفەرموێ: زینا مەکەن! چونکە: توخنی زینا مەکەون، واتە: هەر لێشی نیزیك مەکەونەوە، چ جای بیکەن! زیناش پێکەوە جووت بوونی پیاوێك و ئافرەتێکە، بە شێوەیەکی ناشەرعیی و بەبێ گرێبەستی هاوسەرگیریی.

٢)- ﴿ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةً ﴾، بێگومان ئەو زیناکردن و داوێن پیسییە، گوناهێکی زۆر ناقۆڵایە، (**فَاحِشَة: فِعْلة بالِغَة الحَدّ الأَقْصَى فِي القُبْحِ**)، واتە: کردارێکە گەیشتۆتە ئەوپەڕی سنووری خۆی لە ناشیرینیی و ناقۆڵایی و دزێوییدا.

٣)- ﴿ وَسَآءَ سَبِيلًا ﴾، خراپترین ڕێگەشە، (**السَّبيلُ: الطَّرِيقُ، وَهُوَ مُسْتَعَارٌ، هُنَا لِلْفِعْلِ الَّذِي يُلاَزِمُهُ المَرءُ، وَيَكُونُ لَهُ دَأْبَاً**)، وشەی (**سَبيل**) واتە: ڕێگا، کە لێرەدا خوازراوەتەوە بۆ کردارێك کە مرۆڤ لەسەری بەردەوام دەبێ و دەیکات بەعادەت.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَسَآءَ سَبِيلًا ﴾، واتـە: ڕێیـەکی زۆر خراپـە، لـە هەمـوو ڕووێکـەوە داوێـن پیسـیی و، زینـا ڕێیـەکی خراپـە:

١- لە ڕووی تەندروستییەوە، بۆ هەردوو ڕەگەزی نێر و مێ.

٢- لە ڕووی خێزانییەوە.

٣- لە ڕووی ڕەوشتییەوە.

٤- لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە.

٥- لە ڕووی ئابوورییەوە.

٦- لە ڕووی سیاسییەوە.

٧- پاشان لەڕووی ئەمنییەوە، زۆرجاران دەزگا ئەمنییەکان، لەڕێی ئافرەتی خراپەوە، لەڕێی پیاوی داوێن پیس و ئافرەتی داوێن پیسەوە، زەفەر بەیەکدی دەبەن و، زەفەر بە خەڵکی دەبەن، هەروەها لە هەر ڕوویێکەوە تۆ تەماشای زیناو داوێن پیسیی بکەی، ڕێیەکی زۆر خراپەو، خراپترین ڕێیە و، دەرهاویشتەی زۆر خراپی هەن.

لە چەند بۆنەیەك دا گوتوومە: لەم کوردەواریی خۆماندا، هەندێ وشە بەکاردێنن، خراپیی و دزێویی و ناقۆڵایی هەندێك لە گوناهان کەم دەکاتەوە، بۆ وێنە: بە زینا دەڵێن: لەشفرۆشیی! ئنجا لەشکڕ و لەشفرۆش! خوا ناوی لێناوە زینا و بەکوردیی دەڵێن: داوێن پیسیی، لەشکڕو لەشفرۆش، یانی: وەك بازاڕێکە، یەك دەکڕێ و یەك دەفرۆشێ! ئەوە شتێکی بێ مانایە، زینا بەپارە، بێ یان بێ پارە، هەر زینایە و، هەر داوێن پیسییە، ئەو سزایەشی کە بۆی دانراوە هەر دەیکەوێ، مادام زینا لەگەڵ کراوەکە، بە زۆر زینای لەگەڵدا نەکرابێ.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَقْرَبُوا۟ ٱلزِّنَىٰٓ ﴾، توخنی زینا مەکەون، واتە: نەك هەر ئەنجامی مەدەن، بەڵکو ئەو هۆکارو پێشەکییانەش، کە دەبنە هۆی تووش بوونتان بە زینا، خۆ لەوانیش بپارێزن، لەوبارەوە با ئەم فەرموودەیە بێنین:

**{عَنِ ابْنِ بُرَيْدَةَ عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِعَلِيٍّ: «يَا عَلِيُّ! لاَ تُتْبِعِ النَّظْرَةَ النَّظْرَةَ، فَإِنَّ لَكَ الأُولَى، وَلَيْسَتْ لَكَ الآخِرَةُ»} (أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ٢٣٠٧١، وَأَبُو دَاوُدَ: ٢١٤٩، وَالتِّرمِذِيُّ: ٢٧٧٧، وَالحَاكِمُ: ٢٧٨٨، وَقَالَ: صَحِيح عَلَى شَرْطِ مُسْلِم).**

ئیبنو بورەیدە لە بابی ﷺ دەگێڕێتەوە کە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بە عەلی فەرموو: ئەی عەلی! بە دوای ڕوانین و سەرنجدانتدا، سەرنجدانی دیکەی بەدوا مەخە، یەکەمت بۆ هەیە، بەڵام دووەمت لە سەر حیسابە.

واتە: یەکەمجار کە پیاو، یان ئافرەت، چاویان لە یەکدی هەڵدەنگوێ، بەبێ مەبەست و بەبێ بە ئارەزووەوە تەماشا کردن، ڕووانینی یەکەم لەسەرت حیساب نیە، بەڵام ڕووانینی دووەم و سێیەم کە جار لە دوای جار سەرنج دەدەی، بێگومان ئەوە

مانای وایە کە تۆ بە مەبەستی ئارەزوومەندانەوە سەرنجی جاری دووەم و سێیەم و هتد دەدەی و لەسەرت حیسابن.

ئاشکرایە ڕواینینی حەرام گوناهی گچکەیە، بەڵام گوناهە گچکەکانیش کە بەردەوام دەبن، حوکمەکەیان بەرە بەرە گەورەتر دەبێ، وەك هەندێك لە زانایان دەڵێن: بەردەوامیی لەسەر گوناهی گچکە، دەبێتە هۆی گوناهی گەورە، ئنجا بەڕاستیی ئەگەر مرۆڤ خۆی لە وردە گوناهان بپارێزێ، خۆی بۆ لەگەورەکانیش چاکتر دەپارێزرێ، هەروەك لە فەرمایشتی پێغەمبەریشدا ﷺ هاتوە کە دەفەرموێ:

{الْحَلاَلُ بَيِّنٌ، وَالْحَرَامُ بَيِّنٌ، وَبَيْنَهُما أمورٌ مُشَبَّهَاتٌ لاَ يَعْلَمُهَا كَثِيرٌ مِنَ النَّاسِ؛ فَمَنِ اتَّقَى الْمُشَبَّهَاتِ، اسْتَبْرَأَ لِدِينِهِ وَعِرْضِهِ، وَمَنْ وَقَعَ فِي الشُّبُهَاتِ، وقعَ فِي الحَرَامِ، كَرَاعِي يَرْعَى حَوْلَ الْحِمَى، يُوشِكُ أَنْ يُوَاقِعَهُ؛ أَلاَ وَإِنَّ لِكلِّ مَلِكٍ حِمًى، أَلاَ إِنَّ حِمَى اللَّهِ فِي أَرْضِهِ: مَحَارِمُهُ... } (أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ١٨٣٩٨، وَالبُخَارِيُّ: ٥٢، وَمُسْلِمٌ: ١٥٩٩، وَأَبُو دَاوُدَ: ٣٣٣٠، وَالتِّرمِذِيُّ: ١٢٠٥، وَالنَّسَائِيُّ: ٤٤٥٣، وَابْنُ مَاجَهْ: ٣٩٨٤، عَنْ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ).

واتە: حەڵاڵ ڕوونە و حەرامیش ڕوونە و لە نێوانیان دا هەندێك شتێكی وێكچوو هەن، زۆرێك لە خەڵكی نایانزانێ، ئنجا هەركەس خۆی لە وێكچووەكان بپارێزێ، ئەوە ئایین و ئابڕووی خۆی پاك ڕاگرتوە و، هەركەسێكیش وەنێو كارە شوبهەدارەكان بكەوێ، دەكەوێتە قەدەغەوە، وەك شوانێك كە لە دەوری قەدەغە (ئاژەڵەكانی) دەلەوەڕێنێ نیزیكە بچێتە نێوی، ئەها! هەموو حوكمڕانێك قەدەغەیەكی هەیە و، ئەها! قەدەغەی خواش لە زەوی دا حەرامكراوەكانێ...

## مەسەلەی یازدەیەم:

**خوا ﷻ دەفەرموێ: نەفسێك كە خوا كوشتنی قەدەغە كردوە، بەهەق نەبێ مەیكوژن و، هەركەسێكیش بە ستەملێكراویی بكوژرێ، مافی تۆڵەمان داوەتە سەرپەرشتیارەكەی، بۆیە با زێدەڕۆیی لە كوشتنێدا نەكات، بەدڵنیایی سەرخراوە، (واتە: لەڕووی شەرعییەوە سەرخراوە):**

**ئەمەش ڕەوشت و ڕەفتاری هەژدەیەم دەگرێتە خۆی.**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَقْتُلُوا۟ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ۗ وَمَن قُتِلَ مَظْلُومًا فَقَدْ جَعَلْنَا لِوَلِيِّهِۦ سُلْطَـٰنًا فَلَا يُسْرِف فِّى ٱلْقَتْلِ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ مَنصُورًا ﴿٣٣﴾ ﴾.

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿ وَلَا تَقْتُلُوا۟ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ ﴾، ئەو نەفسەی كە خوا قەدەغەی كردوە، واتە: خوا كوشتنی قەدەغە كردوە، مەیكوژن، دیارە خودی نەفسەكە قەدەغە نیە، بەڵكو كوشتنی نەفسەكە قەدەغەیە، بەڵام خوا ﷻ وەك زۆرجار گوتوومانە: هەموو ئەو وشانەی كە بە سیاق و سەلیقەو عەقڵ دەزانرێن، بە پێویستی نەزانیوە كە فەرمایشتی بێ هەڵەو پەڵەی خۆییان پێ قەڵەباڵغ بكات.

كە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَقْتُلُوا۟ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ ﴾، واتە: (النَّفس التي حَرَّمَ اللّه قَتْلَه) ئەو نەفسەی خوا كوشتنی قەدەغە كردوە، مەیكوژن.

٢)- ﴿إِلَّا بِٱلْحَقِّ ﴾، واتە: مەگەر بە هەق، واتە: بە دادگەریی، بە شایستەیی.

ئنجا ئەمە لێرەدا بە كورتیی هاتوە، ئەو هەقە كە كەسێكی پێ دەكوژرێ، بەڵام لە ئایەتەكانی دیكەدا و، لە فەرمایشتەكانی پێغەمبەردا ﷺ ڕوونكراوەتەوە: كە هیچكەس بۆی نیە كەسێك بكوژێ، مەگەر بەهەق. بۆ نموونە: كەسێك كە دەستدرێژیی دەكرێتە سەر و لە حاڵەتی بەرگریی لەخۆكردنیدا كەسێك دەكوژێ: بەرگریی لە نەفسی دەكات، یان بەرگرییماڵی دەكات، یان بەرگریی لە نامووسی دەكات، یان بەرگریی لە نیشتیمانی دەكات، یاخود هەموو ئەو هۆكارانەی كە خوێنی بابایەكیان پێ ڕەوا دەبێ، بەبێ ئەو هۆكارانە، نابێ هیچ كەسێك بكوژن.

٣)- ﴿ وَمَن قُتِلَ مَظْلُومًا ﴾، هەر کەسێکیش بە ستەملێکراویی بکوژرێ، (**مَظْلُوماً أَي: بغَيْرِ سَبَبٍ يُوجِبُ القَتْلَ**)، بەبێ ئەوەی هۆکارێك هەبێ کە کوشتنەکەی پێویست بکات، واتە: بە ستەملێکراویی بکوژرێ.

٤)- ﴿ فَقَدْ جَعَلْنَا لِوَلِيِّهِۦ سُلْطَٰنًا ﴾، ئەوە ئێمە دەسەلاتمان داوەتە سەرپەرشتیارەکەی، (**وليٌّ**) واتە: مشوورخۆر، سەرپەرشتیار، خوێنگر و خوێن ئەستێن.

(**السُّلْطَانُ مَصْدَرٌ مِنَ السُّلْطَةِ أَي: حُكْمَ القَوَدِ**) واتە: (**سُلْطَان**) چاوگی (**سُلْطَة**)یە، واتە: دەسەلات، کە لێرەدا مەبەست پێ حوکمی تۆڵەیە، ئنجا ئەو تۆڵەیە: خوێنە، یان کوشتنەوەیە، یاخود جاری واش هەیە بریتیە لە لێبوردن.

(**لِوَلِيّه أَي: لِمُسْتَحَقِّ دَمِهِ**)، (**ولي**) کەسێك کە خاوەن هەقە بە خوێنەکەی.

٥)- ﴿ فَلَا يُسْرِف فِّي ٱلْقَتْلِ ﴾، با زێدەڕۆیی نەکات لە کوشتندا، واتە: سەرپەرشتیارەکەی خوێنگر و خوێن ئەستێنەکەی، با زێدەڕۆیی لە کوشتنێدا نەکات.

وشەی (**يُسْرِف**) بە دوو جۆر خوێندنەوە (**قِرَاءَة**) خوێندراوەتەوە:

**أ**- (**فَلاَ يُسْرِف**).

**ب**- (**فَلاَ تُسْرِف**)، ئەی مرۆڤ کە دەتەوێ تۆڵەی کوژراوە ستەملێکراوەکە بکەیەوە، زێدەڕۆیی مەکە لە کوشتنێدا، زێدەڕۆیی لە کوشتنەکەش دا زانایان دەڵێن، چەند جۆرێکی هەیە، بۆ نموونە:

١- **يَقْتُل غَيْرَ قَاتِله**.

٢- **يَقْتُل بَدَلَ وَلِيِّهِ اثْنَيْنِ**.

٣- **يُمَثِّل بالقَاتِل**.

زانایان ئەو سێ حاڵەتەیان هێناون، بەڵام دەگونجێ زێدەڕۆیی کردن لە کوشتنێدا، شتی دیکەش بگرێتەوە، ئەو سێ حاڵەتەش:

**یەکەمیان:** ئەوەیە کە تەنها بکوژەکە بکوژێ، جگە لە بکوژەکە کەس نەکوژێ، ئنجا: برایەتیی، ئامۆزایەتی، خزمیەتی، هەرکەسێکی دیکەیە.

**دووەمیان:** لە جیاتی یەکێك کە کوژراوە، بابای سەرپەرشتییکار لە بەرانبەر کوژراوەکەیدا، نەچێ دووان بکوژێ، یاخود زیاتر.

**سێیەمیان:** جەستەی بابای بکوژ نەشێوێنێ و ئەتکی نەکات.

٦)- ﴿إِنَّهُۥ كَانَ مَنصُورًا﴾، بە دڵنیایی ئەو سەرخراوە و هاوکاریی کراوە.

## سێ کورتە هەڵوەستە لە بەردەم ئەم ئایەتەدا:

**یەکەم:** لێرەدا مەبەست ئەوەیە: لە ڕووی شەرعییەوە سەرخراوە، نەك لەڕووی قەدەریی و تەکوینییەوە، ئەگەرنا ئەگەر مەبەست پێی یاسایەکی گەردوونیی بووایە، کە سەر دەخرێ و سەرخراوە، دەبووایە هەرکەسێك کە کەسێکی لێ دەکوژرێ بە ناهەق، بتوانێ تۆڵە بکاتەوە، بەڵام نەخێر، زۆر کەس لە دنیادا بەناهەق خەڵکی لێ دەکوژرێ و تۆڵەشی بۆ ناکرێتەوە و حکوومەتێکی دادگەرانەش نیە تۆڵەی بۆ بکاتەوە، یاخود بکوژەکەی دیار نیە و وەك بەرزەکی بانان بۆی دەردەچێ!

کەواتە: ئەم سەرخرانە، مەبەست پیی یاسایەکی گەردوونیی نیە، بەڵکو لێرەدا مەبەست یاسایەکی شەرعییە، یانی: لەڕووی شەرعییەوە سەرخراوە، کە ئەگەر شەرع حاکم بێ، دەبێ هەرکەسێك بە ستەملێکراویی کوژرا، دەسەڵات بدرێتە دەست سەرپەرشتیارەکانی، تۆڵەی بکەنەوە و، بابای بکوژ بکوژنەوە، یاخود خوێنی لە بەرانبەردا وەربگرن، یاخود ببوورن، ئەوە خۆیان دەزانن.

هەڵبەتە بەو مانایەی ئێمە گوتمان - کە هەر ئەوەش ڕاست و گونجاوە - مانای ئایەتەکە هیچ گرێ و ئیشکالی تێدا نابێ، بەڵام ئەگەر وامانا بکرێ کە مەبەست لە سەرخرانی بابای خزم و نیزیك لێ کوژراو، ئەوەیە کە لە ڕووی تەکوینیی و قەدەرییەوە، سەرخراوە، ئیشکال پەیدا دەبێ. ئنجا (**القرطبي**) ئەو ئیشکالەی باسکردووەو هەوڵی وەڵامدانەوەیشی داوە، لەوبارەوە، دەڵێ: (**فَإِنْ قِيلَ: وَكَمْ مِنْ وَلِيٍّ مَخْذُولٍ، لاَ يَصِلُ إِلى حَقِّهِ! قُلْنَا: المَعُونَةُ تَكُونُ بظُهُورِ الحُجَّةِ تَارَةً وَباستِيْفَائِهَا أُخْرَى، وَبِمجموعِهِمَا ثَالِثَة، فَأَيُّهَا كَانَ فَهُوَ نَصْرٌ مِنَ اللَّهِ**)[1].

واتە: ئەگەر گوترا: زۆرکەس سەرپەرشتیارە، بەڵام پشت بەردراوە و ناگاتە مافی خۆی! (وەك باسمان کرد: نیزیکێکی، خزمێکی کوژراوە و تۆڵەشی بۆ ناکرێتەوە) دەڵێین: [کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُۥ كَانَ مَنصُورًا﴾] هاوکاریی کران، جاری وایە بە هۆی ئاشکرابوونی

---

(١) الجامع لأحكام القرآن: ج١٠، ص٢٠٩.

بەڵگەوە دەبێ، جاری واش هەیە، بە هۆی ماف وەرگرتنەوەوە و، جاری واش هەیە بە هەردووکیان دەبێ، هەرکامێکیان بێ ئەوە یارمەتییە لە خواوە.

واتە: هەر نەبێ لە ڕووی شەرعییەوە، کەسێك کە بکوژە، دەزانن ستەمکارە و، دەزانن کە کوژراوەکە بە ستەملێکراویی کوژراوە و خاوەن هەقە، واتە: لەڕووی شەرعییەوە خاوەن هەقە و، بەڵگەکەی دیارە و ئەوەش جۆرێکە لە هاوکاریی کران و پشتگیریی کران لەلایەن خوای دادگەرەوە! هەروەها جاری واش هەیە تۆڵەی بۆ دەکرێتەوە بەکوشتنەوە، یان بەخوێن!

بەڵام وەك گوتم: هەر ئەو ڕایەو ئەومانایە ڕاستە، کە: لێرەدا مەبەست: سەرخرانیەتی لەڕووی شەرعییەوە، نەك لەڕووی قەدەریی و گەردوونییەوە.

**دووەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ سُلْطَنًا ﴾، (إِيْمَاءٌ بِأَنَّهُ سَيَكُونُ لِلْمُسْلِمِيْنَ كِيَانٌ سِيَاسِيٌّ وَسُلْطَةٌ فِي قَابِلِ الأَيَّامِ!)، کە خوا لەم سوورەتە مەککەییەدا دەفەرموێ: ﴿ فَقَدْ جَعَلْنَا لِوَلِيِّهِۦ سُلْطَنًا ﴾، لە شاری مەککە و لە قۆناغی مەککەیی دا، کوا دەسەڵات هەبووە! کەواتە: ئەوە ئاماژەیە بۆ ئەوە کە مسوڵمانان لە داهاتوودا، قەوارەیەکی سیاسییان دەبێ، کە لە ژێرسایەی دا دەتوانن تۆڵە لە بابای بکوژ، بکەنەوە.

**سێیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ فَقَدْ جَعَلْنَا لِوَلِيِّهِۦ سُلْطَنًا ﴾، (إِشَارَةٌ إِلَى إِبْطَالِ تَوَلِّي وَلِيِّ الْمَقْتُولِ قَتْلَ الْقَاتِلِ دُونَ حُكْمٍ مِنْ سُلْطَانٍ، لأَنَّ ذَلِكَ مِظَنَّةٌ لِلخَطَأ، وَسَبَبٌ لِلفَوْضَى).

واتە: ڕستەی: {دەستەڵاتمان داوەتە دەست سەرپەرشتیارەکە} ئاماژەیە بەوە کە نابێ بابای سەرپەرشتیار، خۆی تۆڵەکردنەوەکە و هەق کردنەوەکە بە ئەستۆوە بگرێ، بەڵکو دەبێ لایەنێکی دیکە ئەو دەستەڵاتەی پێ بدات، کە بریتیە لە دەستەڵاتی شەرعیی، دەستەڵاتی سیاسیی، چونکە هەرکەسێك بڵێ: کەسێکم لێکوژراوە و بچێ ملی کەسێك بگرێ و، خۆی بچێ بکوژ بکوژێتەوە، بێ ئیسپات و بەڵگە، وێڕای ئەگەری بە هەڵەداچوون، دەبێتە هۆی پاشاگەردانییش، بەڵکو دەبێ دەستەڵاتێکی سیاسیی هەبێ لێی بکۆڵێتەوە و ئیسپات بێ لەسەر بابای تۆمەتبار و، تۆمەتەکەی لەسەر ساغ بێتەوە، ئنجا ئەو دەستەڵاتەی دەدرێتێ کە تۆڵە بکاتەوە، ئنجا مەرج نیە ئەو کاتەش تۆڵەکە بە دەستی خۆی بکاتەوە.

شایانی باسیشە، هەندێك لە تەفسیرەکان هەندێك لەم ئایەتانەیان بە مەدینەیی داناون، چونکە پێیان گونجاو نەبووە لەگەڵ حاڵی مسوڵمانانی مەککەدا، بەڵام حیکمەتەکەیمان باسکرد، کە ئەمە ئاماژەیە بەوە کە: لە داهاتوودا مسوڵمانان قەوارەیەکی سیاسیی و دەستەڵاتێکیان دەبێ، کە بتوانن ئەوەی خوا ئاماژەی پێداوە، جێبەجێی بکەن.

## مەسەلەی دوازدەیەم:

**بەباشترین شێوەش نەبێ توخنی ماڵی هەتیو مەکەون، هەتاکو باڵغ دەبێ، (واتە: تێدەگات و پێدەگات):**

ئەمەش ڕەوشت و ڕەفتاری نۆزدەیەم دەگرێتە خۆی:

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَقْرَبُوا۟ مَالَ ٱلْيَتِيمِ إِلَّا بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ حَتَّىٰ يَبْلُغَ أَشُدَّهُۥ...(٣٤) ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ڕستەیە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿ وَلَا تَقْرَبُوا۟ مَالَ ٱلْيَتِيمِ ﴾، هەروەها نیزیکی ماڵی هەتیو مەکەون، توخنی مەکەون، (**اليَتِيْمُ: مَنْ مَاتَ أَبُوهُ، وَهُوَ لَمْ يَبْلُغ مَبْلَغَ الرِّجَالِ، وَهُوَ سِنُّ الرُّشْدِ**)، واتە: (**يتيم**) کەسێکە بابی مردووە، نەشگەیشتۆتە ئاستی پیاوان، کە بریتیە لە تەمەنی تێگەیشتن و پێگەیشتن.

ئێمە لە تەفسیری سوورەتی (**النساء**)دا بە تەفصیل قسەمان لە بارەی هەتیو (**يتيم**)ەوە کردوە، زانایانیش دەڵێن: منداڵی مرۆڤ، بە مردنی باب هەتیو دەبێ، بەڵام بەچکەی ئاژەڵ بە مردنی دایك هەتیو دەبێ، گرنگ ئەوەیە لێرە خوا ﷻ دەفەرموێ: توخنی ماڵی هەتیو مەکەون، واتە: نەك هەر مەیخۆن و زیانی پێ مەگەیەنن، بەڵکو هەر نیزیکیشی مەکەوە، کە بێگومان مەبەست توخن کەوتنی خراپ و زیانبەخشانەیە، وەك ڕستەی دوایی ڕوونی دەکاتەوە:

٢)- ﴿ إِلَّا بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ ﴾، مەگەر بە شێوەیەك کە باشترینە، لێرەدا وشەی (**أحسن**) کە بۆ (**تفضيل**)ە، مەبەست پێی زێدەییە لە چاکیی و چاکەکردندا، یانی: مەگەر بە شێوەیەك کە باشترین شێوەیە، ئەگەرنا توخنی ماڵی هەتیو مەکەون، نەك مەبەست بەراورد کردن و هەڵبژاردن (**مقارنة وتفضيل**) بێ.

٣)- ﴿ حَتَّىٰ يَبْلُغَ أَشُدَّهُۥ ﴾، هەتا دەگاتە تین و تاقەت و تۆغیانی خۆی، (**أَشُدَّهُ: أي: شِدَّةُ تَكْوِينِهِ، وقُوَّتِهِ (أَشُدّ) قِيْلَ: هُوَ جَمْع لاَ وَاحِدَ لَهُ مِنْ لَفْظِهِ، وَقِيْلَ جَمْع شِدَّة**)، (**أَشُدّ**) واتە: تا دەگاتە تین و تاقەتی خۆی، کە مەبەست پێگەیشتن و تێگەیشتنە و باڵغ بوونە، ئنجا هەندێکیان (**أشد**)یان بە هێزوتین لێکداوەتەوە، هەندێکیشیان گوتوویانە: (**أَشُدّ**) کۆیە و تاکی نیە لەبێژەی خۆی، هەندێکیشیان

گوتوویانە (**أشد**) کۆی (**شِدَّة**)یە، واتە: تین و وزەکان، واتە: تاکو ئەو منداڵە بێ بابە، لە هەموو ڕوویەکەوە تین و تاقەت و وزەکانی تەواو دەبن.

لە سووڕەتی (**النساء**) لە ئایەتی (٦)دا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَٱبۡتَلُواْ ٱلۡيَتَٰمَىٰ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغُواْ ٱلنِّكَاحَ فَإِنۡ ءَانَسۡتُم مِّنۡهُمۡ رُشۡدٗا فَٱدۡفَعُوٓاْ إِلَيۡهِمۡ أَمۡوَٰلَهُمۡ ﴾، واتە: هەتیوەکان (منداڵە بێ بابەکان) تاقی بکەنەوە، تاکو کاتێك کە تێیاندا هەستتان پێکرد کە تێگەیشتوون و پێگەیشتوون، ئەوکاتە ماڵ و سامانەکانیان تەسلیم بکەنەوە.

بەڵام ئەوەی کە لێرەدا گرنگە بزانرێ ئەوەیە: خوای کارزان کە دەفەرموێ: توخنی ماڵی هەتیوان مەکەون! مەبەست ئەوە نیە کە خۆ لەو منداڵە بێ بابانە داببڕدرێ و، هیچ جۆرە مامەڵەیەکیان لەگەڵدا نەکرێ، بە بیانووی ئەوە کە هەموو شتێکیان قەدەغەیە، لە سۆنگەی ئەوەوە کە منداڵی بچووکیان هەیە، منداڵی نابالغیان هەیە، بگوترێ: سێبەری خانووشیان حەرامە! ئاویشیان حەرامە! کە ئەمە وەهمێکی بڵاوە لە نێو کۆمەڵگادا!

بەڵام لە ڕاستییدا منداڵ با بابیشیان مردبێ، نابێ دوورییان لێ بکرێ، بەڵکو دەبێ سەردان بکرێن و سەرپەرشتیی بکرێن، دەبێ بچی لەگەڵیان دابنیشی، با چایەکیشیان لەماڵ بخۆیەوەو ئاوێکیش بخۆیەوەو بچیە سێبەری خانووشیان، بەڵام گرنگ ئەوەیە مەبەستت سوود پێ گەیاندنیان بێ و مەبەستت ماڵ خواردنیان نەبێ، خوای پەروەردگاریش هەروا دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَقۡرَبُواْ مَالَ ٱلۡيَتِيمِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ ﴾، مەگەر بە باشترین شێوە، ئەگەرنا توخنی ماڵی هەتیو مەکەون، کەسێك کە دەچێ بۆ ماڵێك کە منداڵی بچووك و نابالغی بێ بابیان هەیە، ئەگەر دوو چایان لە ماڵێ بخواتەوە، بێگومان دەتوانێ بایی ئەو دوو چایەو زیاتریش سوودیان پێ بگەیەنێ، چ سوودی ماددیی بێ، چ سوودی مەعنەویی.

### مەسەلەی سێزدەیەم:

**بەڵێن و پەیمان بە تەواویی جێبەجێ بکەن، بێگومان بەڵێن و پەیمان لێپرسراوەیە، (واتە: لێی دەپرسرێتەوە).**

ئەمەش ڕەوشت و ڕەفتاری بیستەمە:

خوا ﷻ خوا دەفەرموێ: ﴿...وَأَوْفُوا۟ بِٱلْعَهْدِ ۖ إِنَّ ٱلْعَهْدَ كَانَ مَسْـُٔولًا ﴿٣٤﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە دوو بڕگەدا:

١)- ﴿وَأَوْفُوا۟ بِٱلْعَهْدِ﴾، بەڵێن و پەیمان بە تەواویی جێبەجێ بکەن، (**العَهْدُ: مَا تَعَاقَدَ الإِنْسَانُ عَلَيْهِ مَعَ غَيْرِهِ، عَقْدَاً اخْتِيَارِيَاً يَلْتَزِمُ هُوَ بنَتَائِجِهِ**)، واتە: پەیمان (**عَهْد**) بریتیە لەو گرێبەستەی کە مرۆڤ لەگەڵ بەرانبەرەکەیدا دەیبەستێ بەویستی ئازادانەی خۆی و پابەندیش دەبێ بە دەرەنجامەکانیەوە.

(**وَأَوْفُـوا**) (**وفَى و أوفى**) یـانی: کـردنی کارێـك بـە تەواویـی (**أوفـوا**) یـانی: پەیـمان بـە تەواویـی جێبەجـێ بکـەن، بـە کوردییـش دەڵێـین: وەفاداربـن بـە پەیـمان، واتـە: پەیمانەکـە بـە تەواویی جێبەجـێ بکـەن و پێـوەی پابەندبـن.

٢)- ﴿إِنَّ ٱلْعَهْدَ كَانَ مَسْـُٔولًا﴾، بێگومان بەڵێن و پەیمان لێپرسراوەیە، (**مَسْئُولاً: أَي مَسْئُولاً عَنْهُ، يَسْأَلُكُم عَنْهُ اللَّه يَوْمَ القِيَامَةِ**)، واتە: (پەیمان) خۆی لێی ناپرسرێتەوە، بەڵکو لەبارەیەوە پرسیار دەکرێ و لێپرسینەوە دەکرێ لەو کەسەی کە ئەو پەیمانەی بەستووە، خوا لێتان دەپرسێتەوە لە ڕۆژی دواییدا، لە بارەی ئەو پەیمانەوە.

(**الوَفَـاءُ: ضِـدُّ الغَـدْرِ، وَفَى بعَهْـدِهِ وَفَـاءً وَأَوْفَى بِمَعْنَـى**)، (**وفـاء**) پێچەوانـەی (**غَـدْر**)ە، (**غَـدْر**) پەیـمان شـکێنییە، (**وفـاء**) خـاوەن پەیـمان بـوون و پابەنـد بوونـە بـە پەیمانـەوە، دەگوتـرێ: (**وَفَى بعَهْـدِهِ وَفَـاءً، وَأَوْفَى بوَعْـدِهِ وَفَـاءً**)، هەردووکیـان یـەك واتـای هەیـە، واتـە: پەیـمانی خـۆی بـردە سـەر، بـە تەواویـی.

## مەسەلەی چواردەیەم:

**پێوانیش بۆ خەڵکی بەتەواویی بپێون و بەتەرازووی ڕاستیش بکێشن، ئەوە باشترەو سەرەنجامیشی چاکترە:**

ئەمەش ڕەوشت و ڕەفتاری بیست و یەکەم و بیست و دووەم، دەگرێتە خۆی:

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَأَوْفُوا۟ ٱلْكَيْلَ إِذَا كِلْتُمْ وَزِنُوا۟ بِٱلْقِسْطَاسِ ٱلْمُسْتَقِيمِ ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا ﴿٣٥﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿ وَأَوْفُوا۟ ٱلْكَيْلَ إِذَا كِلْتُمْ ﴾، هەرکاتێك پێواتان بە تەواویی پێوانە ئەنجام بدەن، (**كَيْل**) واتە: پێوان، دەشگونجێ (**كَيْل**) بە واتای ئەو دەفرە بێ، کە شتی پێ دەپێورێ، ئەو ئامڕازەی کە پێی دەپێورێ، ئنجا ئەگەر مەبەست پێی ئامڕازەکە بێ، واتە: بە تەواویی پڕی بکەن و بیپێون، بەڵام ئەگەر (**كَيْل**) چاوگ بێ، واتە: پێوان، یانی: پرۆسەی پێوان بە تەواویی ئەنجام بدەن، هەرکاتێك پێواتان.

٢)- ﴿ وَزِنُوا۟ بِٱلْقِسْطَاسِ ٱلْمُسْتَقِيمِ ﴾، هەروەها (بۆ خەڵك) بە تەرازووی ڕاست، شتان بکێشن ﴿ بِٱلْقِسْطَاسِ ﴾، خوێنراویشەتەوە: (**قُسْطَاس**).

دەربـارەی ئـەم وشـەیە گوتـراوە: (**مُعَـرَّبٌ مِـنَ الرُّومِيَّـةِ: قِسْـطَ وَطَـاس**)، لـە ڕۆمییـەوە کـراوە بـە عەرەبیـی (**قِسْـط**) واتـە: دادگەریـی، (**طَاس**)یـش واتـە: قـاپ، یـانی: ئـەو (**طَـاس**)ەی کـە سـەنگەکەی کـە دەخرێتـە نێـو، بـا لەگـەڵ (**طاس**)ەکـەی دیکـەدا یەکسـان بـێ، واتـە: بـا دوو قاپەکـە، یەکسـان بـن.

٣)- ﴿ ذَٰلِكَ خَيْرٌ ﴾، ئا ئەوە باشترە، واتە: ئەوە باشترە لە تەرازوو بازیی، یاخود ئەوە باشترە لە نوقسانیی لە پێواندا، یاخود لە کێشاندا، لە کوێدا باشترە؟ لە دنیادا، یان لە دواڕۆژدا، بەڵکو ئەوە ڕاستترە بڵێین: لە هەردووکیاندا.

٤)- ﴿ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا ﴾، سەرەنجامیشی باشترە، پێوان بەتەواویی و کێشان بەڕاست و دروستیی، لە خودی خۆیدا باشترە، ﴿ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا ﴾، هەروەها سەرەنجامیشی چاکترە.

چونکە: کۆمەڵگایەك ئەگەر بە تەواویی شت بۆ یەکدی بپێون و بە تەواویی شت بۆ یەکدی بکێشن بە تەرازووی ڕاست، بێگومان ئەو کۆمەڵگایە متمانەیان بە یەکدی دەبێ و، ئەو کۆمەڵگایە ماڵەکەیان حەرامی تێناکەوێ و، لەگەڵ یەکدا لێك دڵنیا دەبن و، کۆمەڵگایەکی تەندروست دەبێ، سەرەنجام: هەموو کۆمەڵگایەکە قازانج دەکات، هەم کڕیارو فرۆشیار و، هەم سەرجەم پێکهاتەکان، ئەوە سەرەنجامی باشترە لە تەرازوو بازیی و، لە دزییکاریی و فێڵ و فەرەج، لە کێشان و پێواندا.

## مەسەلەی پانزەیەم:

**بە دوای شتێکیش مەکەوە کە زانیارییت لەسەری نیە، چونکە بیستن و دیتن و عەقڵ، لێیان دەپرسرێتەوە:**

**ئەمەش ڕەوشت و ڕەفتاری بیست و سێیەم دەگرێتە خۆی:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ۚ إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُو۟لَـٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا ﴿٣٦﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿ وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ﴾، بە دوای شتێك مەکەوە کە زانیارییت پێی نیە، (القَفْو: الإِتِّبَاعُ، قَفَاهُ يَقْفُوهُ، مُشَتَقٌّ مِنَ القَفَا)، (قَفَاهُ) واتە: شوێنی کەوت، (يَقْفُوهُ) واتە: شوێنی دەکەوێ، لە ئەو کردارە لە (قَفَا)وە هاتوە، (قَفَا) واتە: پشتەمل، کەسێك بە دوای شتێك بکەوێ، لە پشتیەوە دەڕوا و، پشتەملی لێی دیارە.

کەواتە: ﴿ وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ﴾، بەدوای شتێك مەکەوە کە زانیارییت لەبارەیەوە نیە، واتە: گومانی خراپ و، تۆمەتی خراپ، پاڵ مەدەنە لای خەڵك، زمانتان بە خراپە لە بەرانبەری خەڵکدا نەگەڕێ، وەك: بوختانی داوێن پیسیی، درۆکرن، شایەدیی دانی بە درۆ، گومانی خراپ، تانەدان لە ڕەچەڵەکی خەڵکی، لە سومعەو کەرامەتیان، با هەر لەخۆوە زمانتان بە خراپە نەگەڕێ و، شتێك کە زانیارییتان پێی نیە و، تەواو لێی دڵنیا نین، قسەی لەبارەوە مەکەن، بۆچی؟:

٢)- ﴿ إِنَّ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡبَصَرَ وَٱلۡفُؤَادَ ﴾، واتە: چونکە بە دڵنیایی بیستن و دیتن و عەقڵ، (فؤاد) لێرەدا بە مانای عەقڵە.

٣)- ﴿ كُلُّ أُوْلَٰٓئِكَ كَانَ عَنۡهُ مَسۡـُٔولٗا ﴾، هەرکامێك لەوانە لێیان دەپرسرێتەوە، هەرکامێك لەوانە بە جیاجیا لێی دەپرسرێتەوە، پسپۆڕانی زمان گوتوویانە: (نُزِّلَت هَذِهِ الجَوَارِحُ مَنْزِلَةَ العُقَلاَءِ)، ئەم ئەندامانە وەك کۆمەڵە مرۆڤێکی عاقڵ وێناکراون، بۆیە ڕاناوی کۆی عاقڵانیان بۆ بەکارهاتوە: هەرکامێك لەوانە لێی دەپرسرێتەوە، لێپرسینەوەش لێرەدا، مەبەست پێی سزا و پاداشت دانەوەیە، هەر کەسە بەپێی خۆی.

لێرەدا یەکێك لە زانایانی مەزهەبی مالیك بە ناوی: (ابْنُ خُوَيْز مَنْدَاد) دەڵێ:

**(تَضَمَّنَت هَـذِهِ الآيَـة الحُكـم بالقَافَـةِ، لأَنَّـهُ لَـمَّا قَـالَ: وَلاَ تَقْـفُ مَـا لَيْـسَ لَـكَ بِـهِ عِلْـم، دَلَّ عَـلَى جَـوَازِ مَـا لَنَـا بِـهِ عِلْـمٌ، فَكُلُّ مَـا عَلِمَـهُ الإِنْسَـان أَو غَلَـبَ عَـلَى ظَنّـه، جَـازَ أَنْ يَحْكُـم بِـهِ، وبهَـذَا احتجَجْنَـا عَـلَى إِثْبَـاتِ القُرْعَـةِ وَالخُـرْصِ، لأَنَّـهُ ضَرْبٌ مِـنْ غَلَبَـةِ الظَـنِّ، وَقَـدْ يُسَـمَّى عِلْـمَاً اتسَـاعَاً، فَالقَائِـفُ يُلْحِـقُ الوَلَـدَ بِأَبِيـهِ مِـنْ طَرِيـق الشَّـبَهِ بَيْنَهُـمَا، كَـمَا يُلْحِـقُ الفَقِيْـه الفَـرْعَ بالأَصْـلِ مِـنْ طَرِيـقِ الشَّـبَه)**[1].

واتـە: ئـەم ئایەتـە حوکمـی قافـەی گرتۆتـە خـۆی، {(قافة) بـە کوردیـی دەڵێـن: شـوێنگەڕ، شـوێن هەڵگـر، یاخـود حوکـم دان، بـە پێـی قیافـەو شـێوە و دیمـەن}، چونکـە خـوا کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَا تَقۡفُ مَا لَيۡسَ لَكَ بِهِۦ عِلۡمٌۚ ﴾، شـتێك کـە زانیاریـت لەبـارەوە نیـە، شـوێنی مەکـەوە، ئـەوە دەگەیەنـێ کـە هەرشـتێك زانیاریـمان لەبارەیـەوە هەبـوو، مـرۆڤ هـەر شـتێکی زانی، یاخـود گومـانی زاڵـی لەبارەیـەوە هەبـوو، بـۆی هەیـە: بڕیـاری پێبـداو، قسـە لەبارەیـەوە بـکات، ئنجـا هـەر لەسـەر ئـەم بناغەیەشـە کـە ئێمـە کارمـان بـە: تیروپشـك (قُرْعَـة) [قورعـە کێشـان]، یاخـود شـت دانـان بـە قرسـاندن کـردوە، کـە هەموویـشی بریتیـە لـە گومـانی زاڵ و، جـاری واش هەیـە: گومـانی زاڵ، بـە زانیاریـی ناودەبـرێ، ئنجـا بابـای (قَائِف) واتـە: شـوێن هەڵگـر، یـان قیافەنـاس، منـداڵ پەیوەسـت دەکاتـەوە بەبابیـەوە، لەبەر ئـەوەی دەڵـێ: پێـك دەچـن، {وەك پێشـتریش لەوبـارەوە باسـمان کـرد، لـە فەرموودەیەکـدا کـە بوخاریـی و موسـلیم هێناویانـە، دایکـمان عائیشـە خـوا لێـی ڕازی بـێ دەڵـێ: ڕۆژێـك پێغەمبـەر ﷺ هاتـەوە، زۆر دڵ خـۆش بـوو، گـوتی: فـڵان کـەسی قیافەنـاس: زەیـدو ئوسـامەی کـوڕی، کـە شـتێکیان بەسـەر دەم و چـاودا دراوە و پێیەکانیـان دیـار بـوون، گوتوویـەتی: ئـەو پێیانـە لەیەکدیـن، چونکـە ئوسـامە زۆر ڕەش بـووە و زەیدیـش زۆر سـپی بـووە، لـە لۆکـە سـپیتر بـووە، بۆیـە کەسـانێك لەبـارەی ڕەچەڵـەکی ئوسـامەو زەیـدەوە، گومانیـان دروسـت

---

(١) الجامع لأحكام القرآن ج١٠، ص٢١١ و ٢١٢.

کـردوە، بـەڵام ئـەو زانـا قیافەناسـە گوتوویـەتی، نەخێـر ئەوانـە یەکـن، جـاری وا هەیـە، بـا ڕەنگەکانیـش جیابـن، بـەڵام ڕەچەڵـەك چەسـپاوە}.

ئنجـا (**ابـن خویـز منـداد**) دەڵـێ: وەك چـۆن بابـای قیافەنـاس، لەڕێـی وێکچوونـەوە، منـداڵ پەیوەسـت دەکاتـەوە بـە بـابی، {منداڵێـك کـە بـابی دیـار نیـە، یـان گومـان هەیـە لـە بـابی}، بابـای شـەرعزانیش هـەر بـەو شـێوەیە، لقێـك بـە هـۆی وێکچوونـەوە، پەیوەسـت دەکاتـەوە بـە ئەصڵەکەیـەوە.

ئەمەش دەقی فەرموودەکەیە:

**{عَـنْ عَائِشَـةَ رَضِيَ اللَّـهُ عَنْهَـا، قَالَـتْ: دَخَـلَ عَـلَيَّ رَسُـولُ اللَّـهِ ﷺ ذَاتَ يَـوْمٍ وَهُـوَ مَـسْرُورٌ، فَقَـالَ: يَـا عَائِشَـةُ! أَلَـمْ تَـرَىْ أَنَّ مُجَـزِّزًا الْمُدْلِجِـيَّ دَخَـلَ، فَـرَأَى أُسَـامَةَ وَزَيْـدًا، وَعَلَيْهِـمَا قَطِيفَـةٌ قَـدْ غَطَّيَـا رُؤوسَـهُمَا، وَبَـدَتْ أَقْدَامُهُـمَا، فَقَـالَ: إِنَّ هَـذِهِ الأَقْـدَامَ بَعْضُهَـا مِـنْ بَعْـضٍ}** (**أخرجـه البخـاري: ٦٧٧١، ومسـلم: ١٤٥٩**).

واتـە: عائیشـە (خـوا لێـی ڕازی بـێ) دەڵـێ: ڕۆژێـك پێغەمبـەر ﷺ هاتـە ژووریٚ، دەم و چـاوی گـەش بـوو (دەم بـە زەردە خەنـدەو ڕووی گـەش بـوو)، فەرمـووی: سـەرنج نـادەی ئەی عائیشـە! موجەززیـز {بابایـەکی قیافەنـاس بـووە} تەماشـای زەیـدی کـوڕی حاریسـەو ئوسـامەی کـوڕی زەیـدی کـرد، کـە پۆشـاکێکیان بەسـەردا بـووە، {لێفەیـەك یـان پۆشـەرێکیان بەسـەردا بـووە، لـە کاتی خەوتنـدا، سـەریان داپـۆشراوە، بـەڵام پێیەکانیـان دیاربـوون}، گوتوویـەتی: ئـەم پێیانـە هەندێکیـان لـە هەندێکیانـن.

(**المـازري**) یەکێکـە لـە زانایـان دەڵـێ: (**كَانَـتِ الجَاهِلِيَّـة تَقْـدَحُ فِي نَسَـبِ أُسَـامَةَ لِكَوْنِـهِ أَسْـوَدَ شَـدِيْدَ السَّـوَاد، وَكَانَ زَيـد أَبُـوه أَبْيَـضَ مِـنَ القُطْـنِ**)[1].

واتـە: لەسـەردەمی نەفامییـدا خەڵـك تۆمەتیـان لـە ڕەچەڵـەکی ئوسـامە دەدا، چونکـە ئوسـامە زۆر زۆر ڕەش بـوو، زەیـدی بابیشـی لـە لۆکـە سـپی تـر بـوو.

---

(١) سەرچاوەی پێشوو.

**مەسەلەی شازدەیەم:**

**خـوا دەفەرمـوێ: بـە فیـزو کەشـخەش بـە زەویـدا مـەڕۆ، چونکـە زەوییـت بـۆ نـادڕێ و، هێنـدەی چیاکانیـش کەڵەگـەت نـابی:**

**ئەمیش ئاکاری بیست و چوارەم دەگرێتە خۆی:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَا تَمْشِ فِي ٱلْأَرْضِ مَرَحًاۖ إِنَّكَ لَن تَخْرِقَ ٱلْأَرْضَ وَلَن تَبْلُغَ ٱلْجِبَالَ طُولًا ﴿٣٧﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿ وَلَا تَمْشِ فِي ٱلْأَرْضِ مَرَحًا ﴾، (**المَرَحُ: شِدَّةُ الفَرَحِ**) واتە: زۆر بەدڵخۆشیی و بوغڕایی و شادمانییەکی لە سنوور بەدەر، بە زەویدا مەڕۆ.

بۆچـــــی؟

٢)- ﴿ إِنَّكَ لَن تَخْرِقَ ٱلْأَرْضَ ﴾ چونکە: بە دڵنیایی تۆ زەوییت بۆ نادڕێ، پێت هەڵناقەنرێ بە پێیەکانت، کاتێك کە پێ لەسەر زەوی دادەنێی، هێندە بەهێزو پتەو نی!

٣)- ﴿ وَلَن تَبْلُغَ ٱلْجِبَالَ طُولًا ﴾، هەروەها لە ڕووی درێژیی و کەڵەگەتیی و بەرزییشەوە، ناگەیتە چیایان، لێرەدا: (**المَقْصُودُ: التَهَكُّم بِهَذَا الفِعْلِ الشَّنِيْع**)، واتە: ئەوە جۆرێکە لە توانج تێگرتن و گاڵتە پێکردن، لەو کردارە ناڕەوایەی کە بەفیزو کەشخەو بوغڕایی بەزەویدا بڕۆی، خوا دەفەرموێ: ئەی مرۆڤ ! تۆ چی فیزو کەشخەیی بکەی لەزەویدا؟! نەزەوییت بۆ دەدڕێ و، نە دەگەیتە چیاکانیش، تۆ دروستکراوێکی بچووکی خوای، بە بوغڕایی و خۆشحاڵیی و بەخۆ سەرسام بوون، بە زەوییدا مەڕۆ.

## مەسەلەی حەڤدەیەم:

**هەرکام لەوانە، خراپەکەی لەلای پەروەردگارت ناپەسندەو ناخۆشویستراوە:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ كُلُّ ذَٰلِكَ كَانَ سَيِّئُهُۥ عِندَ رَبِّكَ مَكۡرُوهٗا ﴿٣٨﴾ ﴾.

هەر کامێك لەوانە، خراپەکەی لە لای پەروەردگارت ناپەسندە، چونکە خوا بیست و چوار (٢٤) دانە ڕەوشت و ڕەفتاری باسکردن، وەك لە سەرەتای تەفسیرکردنی ئەم ئایەتانەوە گوتمان: دوازدەیان ناپەسندن و، دوازدەشیان پەسندن، بۆیە خوا فەرموویەتی:

﴿ كُلُّ ذَٰلِكَ كَانَ سَيِّئُهُۥ عِندَ رَبِّكَ مَكۡرُوهٗا ﴾، هەرکامێك لەوانە خراپەکەی، لە لای پەروەردگارت ناپەسندە، ناخۆشویستراوە، چونکە ئەگەر وشەی (**سَيِّئُه**)ی لەگەڵدا نەباو فەرمووبای: (**كُلُّ ذَلِكَ كَانْ عِنْدَ رَبِّكَ مَكْرُوهَاً**)، ئەوکاتە دوازدە پەسندەکانیشی دەگرتنەوە، واتە: هەر کامێك لەو بیست و چوار (٢٤)انە، ئەوانەیان کە خراپن، لەلای پەروەردگارت ناپەسندن، ناخۆشویستراون، بەڵام بێگومان چاکەکانیان چاکن.

(**مَكْرُوهَاً: أي: هي مَنْهِيَّات عَنْهَا، وَالَّتِي هِيَ سَيِّئَةٌ فِي ذَاتِهَا وَمَكْرُوهَةً مَرْفُوضَة عِنْد رَبِّكَ**)، واتە: هەرکامێك لەوانە خراپەکەی لە خودی خۆیدا خراپە و، لەبەر ئەوەی کە لە خودی خۆیدا خراپەو، زیانبەخشە، بۆیە لەلای پەروەردگاریشت ناپەسندەو قەدەغە کراوە.

## مەسەلەی هەژدەیەم و کۆتایی:

ئەوەش لەو حیکمەتەیە کە پەروەردگارت بۆی سروش کردووی و، لەگەڵ خوادا هیچ پەرستراوێك دامەنێ، ئەگەرنا بە سەرزەنشت کراویی و دەرکراویی فڕێ دەدرێیە دۆزەخەوە:

خوا دەفەرموێ ﴿ ذَٰلِكَ مِمَّآ أَوۡحَىٰٓ إِلَيۡكَ رَبُّكَ مِنَ ٱلۡحِكۡمَةِۗ وَلَا تَجۡعَلۡ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَتُلۡقَىٰ فِي جَهَنَّمَ مَلُومٗا مَّدۡحُورًا ﴿٣٩﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿ ذَٰلِكَ مِمَّآ أَوۡحَىٰٓ إِلَيۡكَ رَبُّكَ مِنَ ٱلۡحِكۡمَةِ ﴾، ئەوە لەو حیکمەتەیە، کە پەروەردگارت بۆی سروش کردووی، بۆی ناردووی.

٢)- ﴿ وَلَا تَجۡعَلۡ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ ﴾، لەگەڵ خواشدا پەرستراوی دیکە دامەنێ.

٣)- ﴿ فَتُلۡقَىٰ فِي جَهَنَّمَ ﴾ {ئەگەرنا، ئەگەر پەرستراوی دیکە لەگەڵ خوادا بپەرستی} فڕێ دەدرێیە دۆزەخەوە.

٤)- ﴿ مَلُومٗا مَّدۡحُورًا ﴾، بە سەرزەنشتکراویی و دوورخراویی لە بەزەیی خوا، (**المَلُومُ: الَّذِي يُنْكَرُ عَلَيْهِ مَا فَعَله، المَدْحُور: المَطْرُود**) (**ملوم**) ئەو کەسەیە ڕەخنەی لێ بگیرێ، لەسەر ئەوەی کردوویەتی، (**مدحوراً**) واتە: دەرکراو.

کەواتە: حیکمەت هەر لە نێو قورئاندایە، نەك جیاواز بێ لە قورئان، من لە کتێبەکانی خۆمدا زۆرجار ئەم ئایەتانەم کردوونە بەڵگە، بە تایبەتی ئەم ئایەتەی دوای ئەو بیست و چوار ڕەفتارە، کە دوازدەیان پەسەندن و دوازدەیان ناپەسەندن، هاتووە، هەمووی ناو ناون: حیکمەت.

کەواتە حیکمەت یانی: ڕازانەوە بە سیفەتە بەرزو پەسەندەکان و خۆ بژارکردن و، دووریی گرتن لە ڕەوشت و ئاکارە خراپ و ناپەسەندەکان، حیکمەت ئەمە واتاکەیەتی، ئنجا ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە حیکمەتیش هەر لە نێو قورئاندایە، چونکە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكَ مِمَّآ أَوۡحَىٰٓ إِلَيۡكَ رَبُّكَ مِنَ ٱلۡحِكۡمَةِ ﴾.

کەواتە ئەو قسەیەی کە زۆر لە نێو زانایاندا باوە، کە بەزۆرییش لە شافیعییان وەرگرتووە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) کە لە کتێبەکەی خۆی (**الرسالة**)دا گوتوویەتی، گوتوویەتی: {(**حِكْمَة**) یانی: سوننەت}، لە ڕاستییدا ئەمە وانییە، بەڵکو حیکمەت هەر لە نێو قورئاندایە و حیکمەت خۆڕازاندنەوەیە بە سیفەتە بەرزەکان و، خۆدوورگرتنە لە سیفەتە ناپەسندەکان.

ئنجا کە هەندێك گوتوویانە: (**الحِكْمَةُ إِصَابَةُ الحَقِّ عِلْمًا وَعَمَلاً**)، (حیکمەت) بریتییە لەوە کە تۆ هەق بپێکی لە ڕووی زانین و کردارەوە، ئەویش هەر دەچێتەوە نێو ئەوە، چونکە ئەگەر تۆ هەق بپێکی، خۆت لە سیفەتە خراپەکان دوور دەگری و، خۆشت بە سیفەتە چاکەکان دەڕازێنییەوە.

یاخود کە گوتراوە: (**الحِكْمَةُ: وَضْعُ الشَّيءِ فِي مَوْضِعِهِ، المُؤَدِّي للغَايَةِ مِنْهُ**)، (حیکمەت) بریتییە لە دانانی هەرشتێك لەو شوێنەی خۆیدا، کە بەو ئامانجەی دەگەیەنێ، کە بۆی ڕەچاوکراوە.

یان کە گوتراوە: (**الحِكْمَةُ: مَعْرِفَةُ الحَقَائِق**)، واتە: حیکمەت زانینی ڕاستییەکانە.

یان گوتراوە: (**الحِكْمَةُ: التَخَلِّي مِنَ الرَذَائِل، وَالتَّحَلِّي بالفَضَائِل**)، واتە:(حیکمەت) بڕار کرانە لە سیفەتە نزمەکان و، ڕازانەوەیە بە سیفەتە پەسندەکان.

هەموو ئەو پێناسانە، دەچنەوە نێو ئەوە کە: خوا ﷻ کۆی ئەو بیست و چوار خەسڵەتە پەسندو ناپەسندەی، بە حیکمەت لە قەڵەم داون، کە دەبێ ناپەسەندەکان خۆیان لێ بەدوور بگیرێ و، پەسندەکانیش خۆیان پێ بڕازێنرێتەوە، کۆی ئەوەی بە حیکمەت لە قەڵەم داوە و، حیکمەتەکەشی وا داناوە، کە خوا ﷻ بە وەحیی بۆ پێغەمبەر ﷺی ناردوە.

وەك پێشتریش گوتمان خوا ﷻ دەستپێکی ئەو بیست و چوار (٢٤) ڕەوشت و ئاکارە پەسندو ناپەسندەی، بە: تەنیا خواپەرستیی و، خۆبەدوور گرتن لە هاوبەش بۆ خوا دانان، دەست پێکرد و، کۆتاییەکەشی هەر بەوە هێنا، چونکە سەرچاوەی هەموو سیفەتە بەرزەکان، بریتییە لە تەنیا خواپەرستیی، تەنیا بەندایەتیی بۆ خوا کردن، هەروەها ماك و میکرۆبی هەموو خوو و خدە خراپ و ناپەسندەکانیش، بریتییە لە هاوبەش بۆ خوادانان و،

دوور لە خوایی و پشت لە خوایی و مامەڵە کردن لەگەڵ غەیری خوادا، وەك مامەڵە کردن لەگەڵ خوادا، کە پێی دەگوترێ: (**شِرك**) هاوبەشدانان.

خوا بە لوتف کەرەمی خۆی، ئێمە لەو کەسانە بگێڕێ کە بەڕاستیی ئەهلی خوا بەیەکگرتنن و، بەندایەتییان بۆ خوا ساغدەکەنەوە و، خوا بمانپارێزێ لەوەی کە هاوبەش بۆ خوا دابنێین، شتێك کە بیزانین، یان نەیزانین، ئاشکرا بێ، یاخود پەنهان بێ.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان سێزدە (١٣) ئایەت دەگرێتە خۆی، ئایەتەکانی: (٤٠ - ٥٢)، کە تێیاندا کۆمەڵێك ڕاستیی گەورە و گرنگ لە بارەی خوای بەرز و مەزن و، قورئانی بە پێز و قسە لەجێ و، پێغەمبەری کۆتایی ﷺو زیندووکردنەوە و، قیامەت و سزاو پاداشتەوە، خراونەڕوو، لەمیانی ئەوەشدا: ئاماژە بە هەندێك بیروڕای پووچی کافرەکان کراوە و بەرپەرچیشیان دراوەتەوە و، سەرجەم ئەو بابەتانەی لەم سێزدە (١٣) ئایەتەدا خراونە ڕوو، دە (١٠) بابەتن:

چواریان لە بارەی خوای بەرزو بێ وێنەوەن و، سێیان لە بارەی قورئانەوە و، دووانیان لە بارەی زیندووکرانەوە و قیامەتەوەن و، یەکیشیان لە بارەی پێغەمبەری کۆتاییەوە (موحەممەدە ﷺ).

﴿ أَفَأَصْفَىٰكُمْ رَبُّكُم بِٱلْبَنِينَ وَٱتَّخَذَ مِنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنَٰثًا ۚ إِنَّكُمْ لَتَقُولُونَ قَوْلًا عَظِيمًا ﴿٤٠﴾ وَلَقَدْ صَرَّفْنَا فِى هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ لِيَذَّكَّرُوا۟ وَمَا يَزِيدُهُمْ إِلَّا نُفُورًا ﴿٤١﴾ قُل لَّوْ كَانَ مَعَهُۥٓ ءَالِهَةٌ كَمَا يَقُولُونَ إِذًا لَّٱبْتَغَوْا۟ إِلَىٰ ذِى ٱلْعَرْشِ سَبِيلًا ﴿٤٢﴾ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يَقُولُونَ عُلُوًّا كَبِيرًا ﴿٤٣﴾ تُسَبِّحُ لَهُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ ٱلسَّبْعُ وَٱلْأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ ۚ وَإِن مِّن شَىْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِۦ وَلَٰكِن لَّا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ ۗ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا ﴿٤٤﴾ وَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ جَعَلْنَا بَيْنَكَ وَبَيْنَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ حِجَابًا مَّسْتُورًا ﴿٤٥﴾ وَجَعَلْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً أَن يَفْقَهُوهُ وَفِىٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرًا ۚ وَإِذَا ذَكَرْتَ رَبَّكَ فِى ٱلْقُرْءَانِ وَحْدَهُۥ وَلَّوْا۟ عَلَىٰٓ أَدْبَٰرِهِمْ نُفُورًا ﴿٤٦﴾ نَّحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَسْتَمِعُونَ بِهِۦٓ إِذْ يَسْتَمِعُونَ إِلَيْكَ وَإِذْ هُمْ نَجْوَىٰٓ إِذْ يَقُولُ ٱلظَّٰلِمُونَ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا رَجُلًا مَّسْحُورًا ﴿٤٧﴾ ٱنظُرْ كَيْفَ ضَرَبُوا۟ لَكَ ٱلْأَمْثَالَ فَضَلُّوا۟ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ سَبِيلًا ﴿٤٨﴾ وَقَالُوٓا۟ أَءِذَا كُنَّا عِظَٰمًا وَرُفَٰتًا أَءِنَّا لَمَبْعُوثُونَ خَلْقًا جَدِيدًا ﴿٤٩﴾ ۞ قُلْ كُونُوا۟ حِجَارَةً أَوْ حَدِيدًا ﴿٥٠﴾ أَوْ خَلْقًا مِّمَّا يَكْبُرُ فِى صُدُورِكُمْ ۚ فَسَيَقُولُونَ مَن يُعِيدُنَا ۖ قُلِ ٱلَّذِى فَطَرَكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ ۚ فَسَيُنْغِضُونَ إِلَيْكَ رُءُوسَهُمْ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هُوَ ۖ قُلْ عَسَىٰٓ أَن يَكُونَ قَرِيبًا ﴿٥١﴾ يَوْمَ يَدْعُوكُمْ فَتَسْتَجِيبُونَ بِحَمْدِهِۦ وَتَظُنُّونَ إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٥٢﴾ ﴾.

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەكان

((ئایا پەروەردگارتان ئێوەی تایبەت كردوە بە (هەبوونی) كوڕانەوە (كوڕانی بۆ ئێوە یەكلا كردوونەوە) و، لە فریشتانیش مێینە (كچە)كانی بۆ خۆی داناون؟ بێگومان ئێوە قسەیەكی ناقۆڵای مەزن (بەرانبەر بە خوا) دەكەن ﴿٤٠﴾ بە دڵنیاییش لەم قورئانەدا، وێنەی جۆراوجۆرمان هێناونەوە تاكو بیریان بێتەوە (پەند وەربگرن) لە حاڵێكدا كە هەر سڵەمینەوەیان بۆ زێدە دەكات ﴿٤١﴾ بڵێ: ئەگەر وەك دەڵێن (خوا) پەرستراوانی دیكەی لەگەڵ بوونایە، ئەو كاتە بەرە و (خوای) خاوەن عەرش (دەچوون و) ڕێیان دەگرتەبەر (بە مەبەستی دژایەتیی كردنی)! ﴿٤٢﴾ (خوا) پاك و بێ لەكەیە و بەبەرزییەكی گەورە، بەرزە لەوەی دەیڵێن ﴿٤٣﴾ حەوت ئاسمانەكان و زەوی و هەر كەس كە تێیان دایە، بێ خەوشیی بۆ دەردەبڕن و، هیچ شتێك نیە كە بە ستایشكردنەوە پاكیی وی ڕانەگەیەنێ، بەڵام لە بە پاكگرتنەكەیان تێناگەن، بە دڵنیایی ئەو هێدیی لێبوردەیە ﴿٤٤﴾ هەر كاتێكیش قورئانت خوێند، پەردەیەكی پۆشرا و لە نێوان تۆو ئەوانەدا دادەنێین، كە بڕوایان بە دواڕۆژ نیە ﴿٤٥﴾ پۆششیشمان خستە سەر دڵەكانیان (ڕێگرە) كە تێی بگەن و، قورسایشمان خستۆتە گوێیەكانیانەوەو، هەر كات باسی یەكتایی پەروەردگارت بكەی، پاشەو پاش پشت هەڵدەكەن و، دەسڵەمنەوە ﴿٤٦﴾ ئێمە زاناترین بەوەی بۆ گوێت بۆ هەڵدەخەن، كاتێك گوێت بۆ هەڵدەخەن و، كاتێك چپە دەكەن، كاتێك ستەمكاران دەڵێن: ئێوە تەنیا شوێن پیاوێكی جادوو لێكراو دەكەون ﴿٤٧﴾ بڕوانە! چۆن وێنانت بۆ دێننەوە، سەرەنجام گومڕا بوون و ناتوانن ڕێ دەربكەن! ﴿٤٨﴾ هەروەها گوتیان: ئایا ئەگەر بووینەوە بە ئێسقان و گڵ و خۆڵ، ئایا ئێمە لە نوێ دروست دەكرێینەوە و، زیندوو دەبینەوە؟! ﴿٤٩﴾ بڵێ: ببنە بەرد، یان ئاسن ﴿٥٠﴾ یان ببنە هەر دروستكراوێك كە لە دڵ و سینەكانتان دا بە گەورە دادەنرێ (كە بگونجێ زیندوو بكرێتەوە)، ئنجا دەڵێن: كێ دەمانگێڕێتەوە (بۆ ژیان)؟ بڵێ: ئەو كەسەی یەكەمجار هێناونیە دی، ئنجا سەریانت بەرە و لا دەلەقێنن (بە گاڵتە پێكردن و سەرسوڕمانەوە) و دەڵێن: ئەوە كەیە؟ بڵێ: لەوانەیە نیزیك بێ ﴿٥١﴾ ئەو ڕۆژەی كە بانگتان دەكات، ئێوەش یەكسەر بە ستایشكردنیەوە، وەڵام دەدەنەوەو، پێتان وایە تەنیا كەمێك ماونەوە (لە ژیانی دنیاداو، لە قۆناغی بەرزەخدا) ﴿٥٢﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەكان

﴿ أَفَأَصْفَىٰكُمْ رَبُّكُم بِٱلْبَنِينَ ﴾: واتە: ئایا خوا ئێوەی تایبەت کردوە بەکورانەوە و بۆ ئێوەی ساغکردوونەوە؟ (**الصَّفَاءُ ضِدُّ الكَدَرِ، صَفَى الشَّرَابُ يَصْفُو صَفَىً، وَصَفَّاهُ تَصْفِيَةً، وَأَصْفَاهُ، الوُدَّ: أَخْلَصَهُ لَهُ**)، (**صَفَاء**) دژی لێڵییە، بە کوردیی دەڵێن: (**ساف**)، واتە: ڕوون یاخود بێ خڵتە، دەگوترێ: (**صَفَى الشَّرَابُ**)، واتە: خواردنەوەکە ساف بوو، بێ خڵتە بوو، (**وَصَفَّاهُ تَصْفِيَةً**)، واتە: سافی کرد، بێ خڵتەی کرد، پاڵاوتی. (**أصفاهُ الودَّ: أَخْلَصَهُ لَهُ**) واتە: خۆشەویستیی خۆی بۆ وی ساغ کردەوە، خۆشەویستییەکەی هیچ خڵتەی تێدانیە بەرانبەر ئەو کەسەی کە باسی دەکرێ.

کەواتە: ﴿ أَفَأَصْفَىٰكُمْ رَبُّكُم بِٱلْبَنِينَ ﴾، واتە: ئایا خوا کوڕانی تایبەت کردوون بە ئێوەو، پاڵاوتوونی و بەشی کەسی دیکەیان پێوە نیە؟!

(صَرَّفْنَا): (**الصَّرْفُ: رَدُّ الشَّيءِ مِنْ حَالَةٍ إِلى حَالَةٍ، وَتَصْرِيفُ الرِّيَاحِ: صَرْفُهَا مِنْ حَالٍ إِلى حَالٍ**)، (صرف) بریتیە لەوەی کە شتێك لە حاڵێکەوە بگۆڕێ بۆ حاڵێکی دیکە، (**تَصْرِيفُ الرِّيَاحِ: صَرْفُهَا مِنْ حَالٍ إِلى حَالٍ**) (**تَصْرِيفُ الرِّيَاحِ**) کە لە قورئاندا زۆر هاتوە، واتە: جۆراو جۆرکردنی بایەکان، گۆڕینی لە بارێکەوە بۆ بارێکی دیکە.

کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ صَرَّفْنَا فِى هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ ﴾، واتە: لەم قورئانەدا بە زۆر شێوازی جۆراو جۆر ئەو ڕاستییانەمان ڕوونکردوونەوە.

(نُفُورًا ): (**النَّفْرَةُ: الإِنْزِعَاجُ مِنَ الشيءِ إِلى الشيءِ، يُقَالُ: نَفَرَ عَنِ الشيء نُفُورًا**)، (**نُفُور**) لە (**نَفْرَة**)ەوە هاتوە، (**نَفْرَة**) بریتیە لەوەی کە ئینسان لە شتێك بێزار بێ، یاخود بە پەلە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە بڕوا، دەگوترێ: (**نَفَرَ عَنِ الشيء نُفُورًا**) لە کوردییدا سڵەمینەوەی پێ دەڵێن، یاخود دوورکەوتنەوەی پێ دەڵێن، وەك ئەوەی بڵێین: لەو شتە سڵەمییەوە.

(حِجَابًا مَّسْتُورًا ): واتە: پەردەیەکی پۆشراو، (**السَّتْرُ: تَغْطِيَةُ الشيء: والسِّتْرُ والسُّتْرَةُ: مَا يُسْتَرُ بِهِ**)، (**سَتْر**) بریتیە لە داپۆشینی شتێك، بەڵام (**سِتْرُ وَسُتْرَة**) ئەوەیە کە ئەو شتەی پێ دادەپۆشرێ، (حجاب)یش، واتە: پەردەو نێوان.

(أَكِنَّةً): (جَمْعُ كِنَان، وَهُوَ الغِطَاء الَّذِي يُكَنُّ فِيهِ الشيءُ، نحو غِطَاءَ وَأَغْطِيَة)، (أَكِنَّة) كۆی (كِنَان)ە، ئەو پۆششەیە كە شتێكی لە بن پەنهان دەكرێ، وەك (غِطَاء) كە بە (أَغْطِيَة) كۆدەكرێتەوە، (كِنَان)یش بە (أَكِنَّة) كۆدەكرێتەوە، مانایان زۆر لێك نیزیكە.

(وَقْرًا): (الوَقْرُ: الثِّقْلُ فِي الأُذُنِ، الصَّمَم) (وَقْر) بریتیە لەو قورساییەی كە بە گوێچكەدا دێ و دەبێتە هۆی ئەوەی گوێ هیچ نەبیستێ، بۆیە بە (صمم)یش لێكدراوەتەوە، واتە: كەڕیی، شتێك لە گوێدا هەبێ ببێتە مایەی نەبیستن.

(مَّسْحُورًا): (اسْم مَفْعُولٍ مِن سَحَرَهُ يَسْحَرَهُ سِحْراً، وَهُوَ الأَخْذَةُ، وَالسِّحْرُ: كُلُّ مَا لَطُفَ مَأْخَذُهُ وَدَقَّ)، (مسحور) ناوی بەركارە لە (سَحَرَهُ يَسْحَرَهُ سِحْراً فَهُوَ مَسْحُورٌ) واتە: جادوو لێكراو، (وَهُوَ الأَخْذَةُ) واتە: گرتن لەلایەن شەیتان و جندەوە بە شێوەیەكی پەنهان، مەبەست پێی جادوولێكرانە، (سحر) هەر شتێك بە پەنهانكاریی بكرێ، بە شێوەیەك هەستی پێ نەكرێ.

(وَرُفَٰتًا): (تُرَاباً: أَجْزَاءً مُتَفَتَّةً، وَالرُّفَاتُ «الرُّفَاتُ»: مَا تَكَسَّرَ وَبَلِيَ مِنْ كُلِّ شيءٍ، كَالفُتَاتِ، يُقَالُ: رَفَّتَ الشيءَ يَرْفِتُهُ ويَرْفُتُهُ: كَسَرَهُ وَدَقَّهُ).

وشەی: (رُفَات) گڵ و خۆڵ، چەند بەشێكی وردو خاش، (رِفَات، رُفَات) هەر شتێك تێك شكابێ و كۆن بوو بێ و ڕزیبێ، وەك (فُتات) واتە: وردە نانی سەر سفرە، دەگوترێ: (رَفَّتَ الشيءَ) واتە: شتەكەی وردو خاشكرد.

(فَسَيُنْغِضُونَ إِلَيْكَ رُءُوسَهُمْ): سەریانت بەرەو لا ڕادەوەشێنن، یان دەلەقێنن، (نَغَضَ رأسُهُ يَنْغُضُ ويَنْغَضُ نَغْضاً وَنغُوضاً: إِذَا تَحَرَّكَ وَاضْطَرَبَ، وَيُنْغِضُ رَأْسَهُ: حَرَّكَهُ بارْتِفَاعٍ وانْخِفَاضٍ كَالمُتَعَجِّبِ مِنَ الشَّيء)، (نَغَضَ رأسُهُ) واتە: سەری لەقی، (يَنْغُضُ ويَنْغَضُ نَغْضاً وَنغُوضاً) بە كەسێك دەگوترێ كە سەری بجووڵێ، ئەوە بۆ حاڵەتی: (لازم)، بەڵام بۆ حاڵەتی (مُتَعَدِّي) (يُنْغِضُ رَأْسَهُ) واتە: سەری خۆی لەقاند، (بارْتِفَاعٍ انْخِفَاضٍ) سەری بەرزو نزم بكاتەوە، یاخود سەری بابدات بەلای ڕاست و چەپ دا، وەك شێوەیەك لە سەرسوڕمان، دیارە ئەو شتانە دەگەڕێنەوە بۆ كلتووری گەلان، ڕەنگە هەبێ سەر بە ڕاست و چەپدا ڕاوەشێنێ، بۆ نیشانەی سەرسووڕمان، یاخود نیشانەی بە درۆ دانانی قسەیەك كە دەكرێ، یاخود سەری بە شێوەیەك بلەقێنێ، وەك گاڵتە پێكردن، زیاتر شێوازی ئەو سەر جووڵاندنانە، پەیوەستە بە كلتوور و عادەتی گەلانەوە.

(إِن لَّبِثۡتُمۡ إِلَّا قَلِيلًا): (لَبِثَ فَهُوَ لَابِثٌ وَلَبِثٌ)، (لبث) واتە: مایەوە، (لابِث ولَبِث) هەردووکیان ناوی بکەر (إسْم فَاعِل)ن.

## مانای گشتی ئایەتەکان

وەك لە پێناسەی ئەم دەرسەدا گوتمان: خوا ﷻ لەم سێزدە (١٣) ئایەتەدا، کە هەر لەسەر دواندنی بێبڕوایەکان، بەتایبەت هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، بەردەوامە، لەم سێزدە (١٣) ئایەتەدا چەند ڕاستییەك دەخاتە ڕوو:

هەندەێکیان دەربارەی خوا بە یەکگرتن و تەنیا پەرستراوێتیەتی خوا ﷻ.

یەکیان دەربارەی قورئان.

هەندێکیان دەربارەی پێغەمبەر ﷺ.

هەندێکیشیان دەربارەی زیندووبوونەوەو، هاتنی ڕۆژی دوایی و سزا و پاداشت.

سەرەتا خوا دەفەرموێ: ﴿ أَفَأَصۡفَىٰكُمۡ رَبُّكُم بِٱلۡبَنِينَ ﴾، ئایا پەروەردگارتان ئێوەی تایبەت کردوە بە کوڕانەوە؟ واتە: ئێوەی تایبەت کردوە بە هەبوونی کوڕانەوە، کوڕەکانی بۆ ئێوە ساغ و یەکلا کردوونەوە؟ ﴿ وَٱتَّخَذَ مِنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ إِنَٰثًا ﴾، کەچی لە فریشتان مێینەی بۆ خۆی داناون (هەڵبژاردوون)، ﴿ إِنَّكُمۡ لَتَقُولُونَ قَوۡلًا عَظِيمًا ﴾، بە دڵنیاییەوە بەهۆی ئەو قسەتانەوە، ئێوە قسەیەکی مەزن (ناقۆڵاو ناشیرین) بەرانبەر بە خوا ﷻ دەڵێن، شتێك کە بۆ خۆتان پێتان باش نیە، بۆ خوای دادەنێن، کە بریتین لە کچان (لە مێینەکان)، کە ئەویش هەر ڕاست نیە، چونکە فریشتەکان مێینە نین، وەك خوا ﷻ لە سوورەتی (**الزخرف**)دا دەفەرموێ: ﴿ وَجَعَلُواْ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ ٱلَّذِينَ هُمۡ عِبَٰدُ ٱلرَّحۡمَٰنِ إِنَٰثًاۚ أَشَهِدُواْ خَلۡقَهُمۡۚ سَتُكۡتَبُ شَهَٰدَتُهُمۡ وَيُسۡـَٔلُونَ ﴿١٩﴾ ﴾، واتە: فریشتەکان کە بەندەی خوای خاوەن بەزەیین، بە مێینەیان دانان! ئایا ئاگایان لە دروستکرانیان بووە {داخۆ نێرن یان مێ؟!} ئەو گەواهییدانەیان دەنووسرێ و لێشیان دەپرسرێتەوە،

لێرەدا خوا ﷻ - وەك من تێی دەگەم - هەر مەبەستی ئەوەیە، کە پووچیی عەقڵ و بیرکردنەوەی هاوبەش بۆ خوا دانەر و کافرەکان بخاتە ڕوو، کە یەکێك لە بیرۆکە پووچەکانیان ئەوەیە، پێیان وایە مێینەبوون نوقسانییە و عەیبەیە، بۆیەش زۆر بەکچان

قەڵس بوون و، هەبووە کچی خۆیانیان زیندە بە چاڵکردوە! بێگومان ئەوان کەمتر لە کوڕان، تەماشای کچانیان کردوە، کە ئەوەش بیرێکی نەفامییە و، ئێستاش هەر هەیە لە زۆر کۆمەڵگاکاندا، بەڵام خوای پەروەردگار نێر و مێیی وەك یەك خوڵقاندوون و، بە هەر کامێکیان کۆمەڵێ تایبەتمەندیی داون، ئنجا بەو تایبەتمەندییانەوە، پیاو دەبێتە پیاوو، ئافرەت دەبێتە ئافرەت و، هیچ کامیان بۆی نیە، کە بە هۆی نێرایەتیی، یان مێیایەتیی خۆی بەسەر ئەوی دیکەدا هەڵکێشێ، بەڵکو تەنیا بە هۆی کردەوەی باش، ئەگەر پیاوان کردەوەی باشیان زیاتر بێ، یان ئافرەتان کردەوەی باشیان زیاتر بێ، ئا ئەوە مایەی بەرزیی و نیزیکییانە لە خوا، ئەگەرنا خودی نێرایەتیی و مێیایەتیی، پێوەرێك نیە بۆ چاك بوون، یاخود خراپ بوون.

ئنجا ئامانج لێرەدا ئەوەیە، کە ئێوە ئەم بیرۆکە پووچانەتان هەیە!

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ صَرَّفْنَا فِي هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ ﴾، بە دڵنیایی لەم قوڕئانەدا جۆراو جۆر (بەیانی ڕاستییەکان)مان کردوە، لە حاڵەتێکەوە گۆڕیومانە بۆ حاڵەتێکی دیکە، بە زۆر تەعبیر و شێوازی دەربڕین، ئەو مەبەستانەی ویستوومانن دەرمان بڕیون (خستوومانتە ڕوو)، بە تایبەت باسی یەکتایی خوا و پەرستراوێتیی خوا ﷻ، خوا زۆر وێنەی بۆ هێناونەوە لە قوڕئاندا و، بە زۆر شێوازی دەربڕینی جۆراو جۆر، باسی کردوە، ﴿ وَلَقَدْ صَرَّفْنَا فِي هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ لِيَذَّكَّرُوا۟ ﴾، واتە: لەم قوڕئانەدا، زۆر شێوازی دەربڕینی جۆراو جۆرمان بەکارهێناون، لە حاڵێکەوە گۆڕیومانە بۆ حاڵێکی دی، چ دەربارەی تەنیا خواپەرستیی، چ دەربارەی پێغەمبەرایەتیی و وەحیی، چ دەربارەی ڕۆژی دوایی و زیندووبوونەوەو، سزاو پاداشت، چ دەربارەی قوڕئان و کتێبەکانی خوا، بۆچی؟

﴿ لِيَذَّكَّرُوا۟ ﴾، تاکو بیریان بێتەوە، (**تذکُّر**) هەم بە مانای بیرخۆ هێنانەوەیە، هەم بە مانای دەرس و پەند وەرگرتنە، بۆ ئەوەی دەرس و پەند وەربگرن، یاخود وەبیر خۆیانی بێننەوە، ﴿ وَمَا يَزِيدُهُمْ إِلَّا نُفُورًا ﴾، بەڵام هەر سڵەمینەوەو دوورکەوتنەوەو یاخیی بوونیان، تێدا زیاد دەکات.

ئنجا دێتە سەر بابەتێکی دیکە، کە لەم چەند ئایەتەدا، زۆرترین گرنگیی پێدراوە، دەفەرموێ: ﴿ قُل لَّوْ كَانَ مَعَهُۥٓ ءَالِهَةٌ كَمَا يَقُولُونَ ﴾، پێیان بڵێ: ئەگەر وەك ئەوان دەڵێن، لەگەڵ خوادا پەرستراوی دیکە هەبوونایە، ﴿ إِذًا لَّٱبْتَغَوْا۟ إِلَىٰ ذِى ٱلْعَرْشِ سَبِيلًا ﴾، لەو حاڵەتەدا بەرەو خوای خاوەن عەرش ڕێیان دەگرتە بەر، واتە: بەرەو لای خوا دەچوون، بۆچی؟!

بۆ دژایەتیی کردنی! بەڵام هەندێ لە توێژەرەوان ئاوایان لێکداوەتەوە: بۆ خۆ لێ نیزیك خستنەوەی خوا ﷻ، بەڵام مانای یەکەمیان ڕاستترو گونجاوترە لەگەڵ ئەم سیاقەدا.

هەڵبەتە خوێنراویشەتەوە: (**كَمَا تَقُولُونَ**) کەواتە: ڕووی دواندن هەر لە کافرەکانە، کە (**كَما يَقُولُونَ**) واتە: وەك ئەو بێبڕوایانە دەڵێن، بە شێوازی نادیار، بەڵام (**تقولون**) لێرەدا خوا دەیاندوێنێ، ﴿ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يَقُولُونَ عُلُوًّا كَبِيرًا ﴾، پاکیی و بەرزییەکی گەورە بۆ خوا، لەوەی کە ئەوان بەرانبەر بە خوا دەیڵێن! واتە: خوا زۆر لەوە پاکتر و چاکتر و بەرزترە، کە شایستەی ئەو جۆرە قسانە بێ، کە ئەوان دەرهەق بەوی دەیانکەن.

﴿ تُسَبِّحُ لَهُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ ٱلسَّبْعُ وَٱلْأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ ﴾، حەوت ئاسمانەکان و زەوی و، هەر کەس کە تێیان دایە، پاکیی و بێ خەوشیی بۆ (خوا) ڕادەگەیەنێ، ﴿ وَإِن مِّن شَىْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِۦ ﴾، واتە: هیچ شتێك نیە، مەگەر بە ستایشکردنەوە بە پاکی دەگرێ، ﴿ وَلَٰكِن لَّا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ ﴾، بەڵام ئێوە بە پاکگرتنەکەی ئەوان تێناگەن، لێی حاڵی نابن، ﴿ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا ﴾، بە دڵنیایی خوا هێدیی و مەندی لێبوردەیە، ئنجا ئایا مەبەست لەو بەپاکگرتنە چییە، کە ئێمە تێی ناگەین؟! دواتر لە مەسەلە گرنگەکاندا زیاتر شی دەکەینەوە و، مانای بە هێزتر و ڕاستتر ئەوەیە کە ئەوە جۆرێکە لە بە پاکگرتن و ستایشکردن، کە دروستکراوەکان بۆ خوا دەیخەنە ڕوو، کە بۆ ئێمە فامکراوو زانراو نیە.

چونکە هەندێکیان گوتوویانە: مەبەست ئەوەیە کە بە زمانی حاڵ دروستکراوەکان ئەنجامی دەدەن بۆ بەدیهێنەریان.

بەڵام زانایانی دیکە وەڵامیان داوەتەوە: کە ئەوە شتێکی زانراوو فامکراوە و لەگەڵ ئایەتەکەدا گونجاو نیە.

هەندێکی دیکە گوتوویانە: مەبەست پێی ئەوەیە کە کافرەکان ئەوە نافامن.

کە ئەو کاتە ئەو مانایە، ڕێی تێدەچێ، بەڵام ئێمە دوایی چەند فەرموودەیەك دێنینەوە لەو بارەوە، کە مەبەست لەو بە پاکگرتن و ستایشکردنەی خوا، لەلایەن دروستکراوەکانەوە، جۆرە بە پاکگرتنێکە، بە شێوەیەکی ئاسایی بۆ ئێمە زانراو و فامکراو نیە.

﴿ وَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ جَعَلْنَا بَيْنَكَ وَبَيْنَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ حِجَابًا مَّسْتُورًا ﴾، (ئەی موحەممەد!) هەر کاتێ قورئانت خوێند، لە نێوان تۆ و ئەوانەدا کە بڕوایان

بە ڕۆژی دوایی نیە، پەردەیەکی پۆشراو دادەنێین، واتە: پەردەیەك کە زۆر پۆشەرە، وەك خۆشی پۆشرابێ وایە، ئەوە واتایەکی، یاخود پەردەیەك کە پەنهانە و نابینرێ، پەردەیەکی پەنهان دادەنێین لە نێوان تۆ و ئەوانەدا کە بڕوایان بە ڕۆژی دوایی نیە، بۆ ئەوەی لە قورئان تێنەگەن، کە لێرەدا ئەمە تەعبیرکردنە لەوەی کە ئەوانە ئەوەندە بەرە و تاوان و گوناهـ چوون و، ئەوەندە دوورکەوتوونەوە لە هەق، حاڵیان وەك حاڵی کەسێکە: قسەی بۆ بکرێ، لە پاش دیوارێکەوە کە نەبیستێ، یاخود پەردەیەك لە نێوان گوێی ئەو و ئەو قسەیەدا کە دەکرێ، دانرابێ، بە شێوەیەك کە نەیبیستێ، لێی حاڵی نەبێ، واتە: حاڵی وان بەو شێوەیە، ئەگەرنا، خوا ﷻ پەردە ناخاتە سەر گوێ و چاوی خەڵك، مەبەست لێرەدا وێناکردنی حاڵی ئەوانە، وەك کەسێك وان، کە لە شوێنی دیکە خوا ﷻ باس دەکات، کە: پۆشاکیان بەسەر چاو دا درابێ و، قورساییان خرابێتە سەر گوێ و، دڵیان مۆرکرابێ و داخرابێ.

﴿ وَجَعَلْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً أَن يَفْقَهُوهُ وَفِيٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرًا ﴾، هەروەها لەسەر دڵەکانیان چەند کیف و پۆشەرێکیمان داناون تاکو تێی نەگەن و، قورساییمان خستوتە گوێیەکانیانەوە تاکو نەبیستن، ﴿ وَإِذَا ذَكَرْتَ رَبَّكَ فِي ٱلْقُرْءَانِ وَحْدَهُۥ وَلَّوْاْ عَلَىٰٓ أَدْبَٰرِهِمْ نُفُورًا ﴾، هەرکاتیش بە تەنیا باسی پەروەردگاری خۆتت کرد لە قورئاندا، واتە: هاوبەشت بۆ دانەنا و، تەنیا باسی خوات کرد، ئەو بێبڕوایانە دەبینی: پاشەو پاش بە سڵەمینەوەوە، لێت دوور دەکەونەوە.

﴿ نَّحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَسْتَمِعُونَ بِهِۦٓ ﴾، ئێمە زاناترین بەوەی کە بە هۆیەوە گوێت بۆ هەڵدەخەن، ﴿ إِذْ يَسْتَمِعُونَ إِلَيْكَ ﴾، کاتێ گوێت بۆ هەڵدەخەن و گوێت بۆ دەگرن، ﴿ وَإِذْ هُمْ نَجْوَىٰٓ ﴾، هەروەها کاتێ لە نێوان خۆیاندا چپەچپیانە، ﴿ إِذْ يَقُولُ ٱلظَّٰلِمُونَ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا رَجُلًا مَّسْحُورًا ﴾، کاتێك کە ستەمکارەکان دەڵێن: ئێوە تەنیا بە دوای پیاوێکی جادوو لێکراو دەکەون.

﴿ ٱنظُرْ كَيْفَ ضَرَبُواْ لَكَ ٱلْأَمْثَالَ ﴾، سەرنج بدە! چۆن وێنانت بۆ دێننەوە! جارێك بە جادوو لێکراوت دادەنێن! جارێك بە جادووگەرت دادەنێن! جارێك بە شاعیرت دادەنێن! جارێك بە کاهینت دادەنێن! ئاشکرایە لێرەدا خوا ﷻ باسی یەك وێنەی کردوە کە دەڵێن: ئێوە بە دوای پیاوێکی جادوو لێکراو دەکەون! بەڵام وێنەی ئەم قسەیە لە شوێنەکانی دیکەش دا، هاتوە بۆیە بە کۆ هێناویەتی (وێنانت بۆ دێننەوە).

﴿ فَضَلُّواْ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ سَبِيلًا ﴾، بۆیە سەرگەردان بوون، ناتوانن ڕێ دەركەن! كەسێ كە هەستەوەرەكانی خۆی پەككخستبن، كەسێ بە هۆی گوناهو تاوان و كوفر و خراپە و كەللە ڕەقیی و عینادییەوە، عەقڵ و چاو و گوێی خۆی لە كارخستبن، بێگومان گومڕا بووە و ناشتوانێ ڕێ دەركا و، ناشتوانێ بێتەوە سەر ڕێ، هەر بۆ خۆیشی وای بە خۆی كردووە!

﴿ وَقَالُوٓاْ أَءِذَا كُنَّا عِظَٰمًا وَرُفَٰتًا ﴾، هەروەها گوتیان: ئایا ئەگەر بووینەوە ئێسقان و بووینەوە بەشتێكی وردوخاش ئیسكی وردوخاشكراو تێكشكێنراو (**رُفات**)، واتە: چ بە شێوەی ئێسقان مابینەوە، یاخود ئێسقانەكەش وردو خاش كرابێ و، بووبێتەوە بە خاك و خۆڵ، ئایا ئەگەر وامان لێهات: ﴿ أَءِنَّا لَمَبۡعُوثُونَ خَلۡقًا جَدِيدًا ﴾، بە سەرسوڕمانەوە دەپرسن: ئایا ئێمە جارێكی دیكە لە شێوەی دروستكراوێكی نوێدا، دروست دەكرێینەوە؟!

﴿ قُلۡ كُونُواْ حِجَارَةً أَوۡ حَدِيدًا ﴾، (ئەی موحەممەد ﷺ!) پێیان بڵێ: ببنە بەرد یاخود، ببنە ئاسن، ﴿ أَوۡ خَلۡقًا مِّمَّا يَكۡبُرُ فِي صُدُورِكُمۡ ﴾، یان دروستكراوێ كە لە سینەكانی ئێوەدا گەورەیە، واتە: گەورەترە لەوەی كە زیندوو بكرێتەوە و ژیانی بهێنرێتەوە بەر، واتە: ئەگەر بەردبن، یان ئاسن بن، یان هەر دروستكراوێكی دیكە بن، كە لە سینە و عەقڵتان دا گەورەیە كە ژیانی بێتەوە بەر.

بەڵێ! خوا هەر زیندووتان دەكاتەوە.

﴿ فَسَيَقُولُونَ مَن يُعِيدُنَا ﴾، ئنجا پێت دەڵێن: كێ دەمانگێڕێتەوە بۆ ژیان؟! كێ زیندوومان دەكاتەوە؟! ﴿ قُلِ ٱلَّذِي فَطَرَكُمۡ أَوَّلَ مَرَّةٖ ﴾، بڵێ: ئەو كەسەی كە یەكەمجار ئێوەی داهێناو هێنایە دی، هەمیشە دروستكردنی شتێك، لە دووبارە كردنەوەی بە زەحمەتترە، كەسێك كە كتێبێك دەنووسێ، ئەگەر دەستنووسەكەی لێ ونبێ، دوایی دەتوانێ وەك پێشتر كە نووسیوویەتی، یاخود باشتریش بینووسێتەوە، كەسێك كە شتێ دروست دەكات، ئەگەر ئەو شتەی لێ شكا، یاخود لێی تێكچوو، دەتوانێ وەك خۆی، یان باشتریش دروستی بكاتەوە، ئەوە بە نسبەت ئێمەوە شتێكی زانراوە، بەڵام بە نسبەت خواوە ﷻ دەیەوێ ئێمە تێبگەیەنێ، ئەگەرنا بە نسبەت خوای زاناو تواناوە: دووبارەكردنەوەش هەروەك دەستپێكردن وایە، وەك یەكن، هیچی بۆ خوا ﷻ تێناچێ.

﴿ فَسَيُنْغِضُونَ إِلَيْكَ رُءُوسَهُمْ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هُوَ ﴾، ئنجا (لە بەرانبەر ئەو وەڵامەتدا) سەریانت بەرەو لا ڕادەوەشێنن (دەلەقێنن)، ئنجا چ بەرزیی و نزمیی پێ بکەن، چ ڕاست و چەپی پێ بکەن، ﴿ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هُوَ ﴾، دەڵێن: ئەوە کەنگێیە؟! کەی ئەو دووبارەکردنەوە و زیندوو کردنەوەیە دەبێ؟! ﴿ قُلْ عَسَىٰٓ أَن يَكُونَ قَرِيبًا ﴾، بڵێ: ڕەنگە نیزیك بێ، پێ دەچێ نیزیك بێ، دیارە خوا ﷻ بە توانجەوە ئاوا دەفەرموێ.

﴿ يَوْمَ يَدْعُوكُمْ فَتَسْتَجِيبُونَ بِحَمْدِهِۦ ﴾، ئەو ڕۆژە کە بانگتان دەکات، بە ستایشکردنیەوە وەڵامی دەدەنەوە، کە بانگتان دەکات زیندوو ببنەوە، ئێوەش بە دەم ستایش و مەدحی خواوە، وەڵامی خوا دەدەنەوە، ﴿ وَتَظُنُّونَ إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا قَلِيلًا ﴾، گومانیش وا دەبەن و وای بۆ دەچن، کە کەمێك نەبێ نەمابنەوە، ئنجا کەمێك نەبێ نەمابنەوە، لە ژیانی دنیادا، یاخود لە قۆناغی بەرزەخدا، یاخود هەم لە ژیانی دنیادا و، هەم لە ژیانی بەرزەخدا، کاتێك ڕۆژی دوایی و قیامەت دەبینن، هەم دنیا و هەم قۆناغی بەرزەخیش، لە چاو قیامەت و ڕۆژی دوایی، زۆر کەمتان دێتە بەرچاو! وەك لە شوێنی دیکە دەفەرموێ: پێیان وایە کە سەعاتێك ماونەوە، یاخود ڕۆژێك، یاخود کەمتر لە ڕۆژێك ماونەوە.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**خوا ﷻ بە کافرە هاوبەشدانەرەکان دەفەرمووێ: ئایا پەروەردگارتان ئێوەی تایبەت کردوە بە هەبوونی کوڕانەوە و، خۆشی لە فریشتان، مێینەکانی هەڵبژاردوون؟ بە دڵنیایی ئێوە قسەیەکی ناقۆڵای مەزن بەرانبەر بە خوا کەن:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿ أَفَأَصْفَىٰكُمْ رَبُّكُم بِٱلْبَنِينَ وَٱتَّخَذَ مِنَ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةِ إِنَـٰثًا ۚ إِنَّكُمْ لَتَقُولُونَ قَوْلًا عَظِيمًا ﴿٤٠﴾ ﴾

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿ أَفَأَصْفَىٰكُمْ رَبُّكُم بِٱلْبَنِينَ ﴾، ئایا پەروەردگارتان ئێوەی تایبەت کردوە بە کوڕانەوە؟ کوڕەکانی بۆ ئێوە یەکلایی و ساغ کردووتەوە؟.

ئایا خوا ئێوەی هەڵبژاردوە و، تایبەتی کردوون بە کوڕانەوە؟ (**الإِصْفَاءُ: جَعْلُ الشيءِ صَفْواً أَي: خَالِصَاً**) دەڵێ: (**إِصْفَاء**) هەروەها (**إِصْطِفَاء**)یش ئەوەیە کە شتێك هەڵبژێردرێ، یاخود ساف و ساغ بکرێتەوەو، شتی نامۆی پێوە نەمێنێ.

٢)- ﴿ وَٱتَّخَذَ مِنَ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةِ إِنَـٰثًا ﴾، لە فریشتەکانیش مێینەی بۆ خۆی هەڵبژاردوون؟ چونکە ئەوان بانگەشەی ئەوەیان دەکرد، کە فریشتەکان کچانی خوان و شەیتانەکانیش کوڕانی خوان.

وەك لە سووڕەتی (**الزخرف**)دا خوا لەوبارەوە دەفەرمووێ: ﴿ وَجَعَلُوا۟ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةَ ٱلَّذِينَ هُمْ عِبَـٰدُ ٱلرَّحْمَـٰنِ إِنَـٰثًا ۚ أَشَهِدُوا۟ خَلْقَهُمْ ۚ سَتُكْتَبُ شَهَـٰدَتُهُمْ وَيُسْـَٔلُونَ ﴿١٩﴾ ﴾، واتە: ئەو فریشتانەی بەندەی خوای خاوەن بەزەیین، کردیاننە مێینە! ئایا ئامادەی دروستکرانیان بوون (تاکو بزانن داخۆ نێرن، یان مێ؟!) ئەو شایەدیی دانەیان دەنووسرێ و لێشیان دەپرسرێتەوە {لەسەر ئەو بە درۆ شایەدیی دانەیان}.

٣)- ﴿إِنَّكُمْ لَتَقُولُونَ قَوْلًا عَظِيمًا﴾، بە دڵنیایی ئێوە قسەیەکی مەزن دەکەن، واتە: بە دڵنیایی ئێوە قسەیەکی ناقۆڵا و ناهەقی مەزن دەکەن، بەرانبەر بە خوا! (**قَوْلًا عَظِيمًا: فِي القُبْحِ وَالسُّوء**)، قسەیەکی زۆر مەزن لە ناشیرینیی و نا قۆڵاییدا، بەرانبەر بە خوا ﷻ دەکەن.

ئێمە پێشتر لە بەرگی پێنجەمی ئەم تەفسیرەدا، لە کاتی لێکدانەوەی ئایەتەکانی: (١٠٠ و ١٠١) لە سوورەتی (**الإنعام**)دا بە تەفصیل لەم بارەوە قسەمان کردوە، کە ئەمەش دەقی ئەم دوو ئایەتەیە:

﴿ وَجَعَلُواْ لِلَّهِ شُرَكَآءَ ٱلْجِنَّ وَخَلَقَهُمْ وَخَرَقُواْ لَهُۥ بَنِينَ وَبَنَٰتٍۭ بِغَيْرِ عِلْمٍ ۚ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿١٠٠﴾ بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُۥ وَلَدٌ وَلَمْ تَكُن لَّهُۥ صَٰحِبَةٌ ۖ وَخَلَقَ كُلَّ شَىْءٍ ۖ وَهُوَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿١٠١﴾ ﴾.

واتە: هاوبەشیان لە جنۆکە بۆ خوا دانان و خواش جنۆکەکانی دروستکردوون، هەروەها کوڕان و کچانیان بۆ (خوا) هەڵتاشین بەبێ زانیاریی، پاکیی و بەرزیی بۆ خوا لەوەی کە خوای پێ وەسف دەکەن، پەیداکەری ئاسمانەکان و زەوییە، ڕۆڵەی چۆن دەبن، لە حاڵێکدا کە هاوەڵ و هاوسەری نەبێ؟! (خوا) هەموو شتێکی وەدیهێناوە و بە هەموو شتێکیش زانایە.

خوا ﷻ لەم دوو ئایەتەدا، وێڕای خستنە ڕووی قسەکەیان، شەش (٦) بەڵگەشی بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەو قسە پووچەیان خستوونە ڕوو:

١/ دەفەرموێ: ﴿وَخَرَقُواْ لَهُۥ بَنِينَ وَبَنَٰتٍۭ بِغَيْرِ عِلْمٍ﴾، واتە: کوڕان و کچانێکیان بۆ هەڵتاشین بەبێ بەڵگە و بەبێ زانیاریی، بێگومان ناتوانن لەوبارەوە بەڵگەیەك بهێننەوە، بەبێ بەڵگە هەر لەخۆوە دەڵێن: شەیتانەکان کوڕەکانی خوان و، فریشتەکانیش کچەکانی خوان!

کەواتە: ئەوە قسەیەکی نازانستییانەی بێ بنەماو پووچە.

٢/ دەفەرموێ: ﴿سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يَصِفُونَ﴾، پاکیی و بەرزیی بۆ خوا، لەوەی کە خوای پێ وەسف دەکەن، خوا ﷻ ئەگەر بەدیهێنەر و خاوەن و پەروەردگاری هەموو شتێك بێ، نابێ وەك دروستکراوەکانی، پێویستیی بە هاوسەر بێ و، ڕۆڵەی هەبن!

٣/ ﴿بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾، (بَديع) واتە: پەیداکەر بەبێ چاولێکردن لە غەیری خۆی، (**بديع ومبدع**) کەسێکە کە شتێك دادەهێنێ بێ ئەوەی چاولێکەریی تێدا بێ، بۆ وێنەیەکی پێشتر، لە نوێ پەیدای بکات (**على غير مثال سابق**).

٤/ ﴿ أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُۥ وَلَدٌ وَلَمْ تَكُن لَّهُۥ صَٰحِبَةٌ ﴾، (خوا) چۆن ڕۆڵەی دەبن ئەگەر هاوسەری نەبێ، خوا ﷻ کوڕو کچەکانی چۆن پەیدا بوون؟ بە پێی ئەوەی بۆ ئێمە زانراوە، کوڕو کچ لە ئەنجامی پێکەوە جووتبوونی نێوان دوو هاوسەری نێر و مێ دا، پەیدا دەبن.

٥/ ﴿ وَخَلَقَ كُلَّ شَىْءٍ ﴾، خواش هەموو شتێکی هێناوەتە دی، کەواتە: هەرچی هەیە دروستکراوی خوایە و هیچیان ڕۆڵەی نین.

٦/ ﴿ وَهُوَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴾، هەروەها ئەو بە هەموو شتێك زانایە، ئەگەر گریمان کوڕ و کچی هەبوونایە، دەبووایە خوا ﷻ بزانێ، چونکە زانیاریی خوا بە هەموو شتێکەوە پەیوەستەو، هیچ شتێك نیە خوا نەیزانێ.

هەر لەو بارەوە خوا لە سووڕەتی (**الزخرف**) (١٥ - ١٩)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَجَعَلُوا۟ لَهُۥ مِنْ عِبَادِهِۦ جُزْءًا ۚ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَكَفُورٌ مُّبِينٌ ﴿١٥﴾ أَمِ ٱتَّخَذَ مِمَّا يَخْلُقُ بَنَاتٍ وَأَصْفَىٰكُم بِٱلْبَنِينَ ﴿١٦﴾ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِمَا ضَرَبَ لِلرَّحْمَٰنِ مَثَلًا ظَلَّ وَجْهُهُۥ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ ﴿١٧﴾ أَوَمَن يُنَشَّؤُا۟ فِى ٱلْحِلْيَةِ وَهُوَ فِى ٱلْخِصَامِ غَيْرُ مُبِينٍ ﴿١٨﴾ وَجَعَلُوا۟ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ ٱلَّذِينَ هُمْ عِبَٰدُ ٱلرَّحْمَٰنِ إِنَٰثًا ۚ أَشَهِدُوا۟ خَلْقَهُمْ ۚ سَتُكْتَبُ شَهَٰدَتُهُمْ وَيُسْـَٔلُونَ ﴿١٩﴾ ﴾.

واتە: لە بەندەکانی، بەشێکیان بۆ خوا دانا (واتە: بەندەکانییان کردن بە بەشێك لە خوا)، بێگومان مرۆڤی (بێبڕوا) سپڵەیەکی زۆر ڕوون و ئاشکرایە. ئایا لەوانە کە دروستی کردوون، کچی بۆ خۆی هەڵبژاردوون و ئێوەی تایبەت کردوون بە کوڕانەوە؟! (کوڕەکانی بۆ ئێوە ساغ کردووتەوە؟!) . لە حاڵێك دا هەر کات یەکێکیان موژدەی بەوەپێدرا کە بۆ (خوای) بە بەزەیی بەوێنە هێناوەتەوە، ڕووی ڕەش دادەگەڕێ و زۆر پەست و خەفەتاوییە، {داخ و خەفەتی زۆری دەچێتە دڵەوە، لەبەر ئەوەی موژدەی کچی پێدراوە، لە حاڵێکدا کە خۆیان بە کچان ڕازی نین، کەچی کچان بۆ خوا دادەنێن} ئایا کەسێك کە لە ڕازانەوە و خشڵ دا پێ دەگات و لە کاتی مشت و مڕدا ڕوونکەرەوە نیە! {ناتوانێ مەبەستەکانی خۆی جوان بگەیەنێ، ئەوە بۆ خوا دادەنێن؟!} ﴿ وَجَعَلُوا۟ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ ٱلَّذِينَ هُمْ عِبَٰدُ ٱلرَّحْمَٰنِ إِنَٰثًا ﴾، هەروەها ئەو فریشتانەی کە بەندەی خوان، بە مێینەیان لە قەڵەم دان، ئایا ئاگاداری دروستکرانیان بوون؟! بێگومان ئەو شایەدییدانەیان دەنووسرێ و لێشیان دەپرسرێتەوە.

## مەسەلەی دووەم:

**ئێمە لەم قورئانەدا ڕوونکردنەوەی جۆراو جۆرمان داون، لە هەموو ڕوویێکەوە، تاکو پەند وەربگرن و بیریان بکەوێتەوە، کەچی هەر سڵەمینەوەیان بۆ زیاد دەکات:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ صَرَّفْنَا فِي هَٰذَا الْقُرْآنِ لِيَذَّكَّرُوا وَمَا يَزِيدُهُمْ إِلَّا نُفُورًا ﴿٤١﴾ ﴾.

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿ وَلَقَدْ صَرَّفْنَا فِي هَٰذَا الْقُرْآنِ ﴾، بە دڵنیاییش لەم قورئانەدا بە شێوەی جۆراو جۆر مەبەستەكانمان ڕوونكردوونەوە، (**صَرَّفْنَا: نَوَّعْنَا البَيَانَ**)، ڕوونكردنەوەكەمان جۆراو جۆر كردوە، (**حُذِفِ مَفْعُول صَرَّفَ لأَنَّهُ نُزِّلَ مَنْزِلَةَ اللاَزِمِ، فَلَمْ يُقَدَّرْ له مفعول**)، خوا ﷻ كە فەرموویەتی جۆراوجۆرمان كردوە، چی جۆراوجۆر كردوە؟ (**صَرَّفْنَا البَيَانَ، أَوْ صَرَّفْنَا التعْبير**) ڕوونكردنەوە و دەربڕینمان جۆراوجۆر كردوە لەم قورئانەدا، بەڵام بۆیە بەركار (**مفعول**)ەكەی قرتێنراوە، چونكە وشەی (**صَرَّف**) وەك كرداری لازیم كە پێویستی بە بەركار ناكات، مامەڵەی لەگەڵدا كراوە، یان لەبەرئەوەی هەر دیارە (**صَرَّفْنَا**) واتە: (**صَرَّفْنَا البَيَانَ**)، لە چەندان شوێنی قورئاندا هاتوە و، مەگەر چۆن، ئەگەرنا وشەی (**صَرَّفَ**) بەركار (**مَفْعُول**)ەكەی دیار نیە، چونكە بە سیاق و سەلیقە دەزانرێ.

وشەی: (**صَرَّفْنَا**) چاوگەكەی: (**تَصْرِيفَ**)ە، (**التَّصْرِيفُ: تَعَدُّدِ الصَّرْفَ، وَهُوَ النَّقْلُ مِنْ جِهَةٍ إِلي جِهَةٍ أُخْرَى**)، (**تصريف**) بریتیە لە جۆراو جۆری گواستنەوە. یانی: لە حاڵێكەوە بۆ حاڵێك شتێك بگۆڕدرێ.

٢)- ﴿ لِيَذَّكَّرُوا ﴾، تاكو بیر بكەنەوە، یاخود تاكو پەند وەربگرن، ئەم وشەیە: ﴿ لِيَذَّكَّرُوا ﴾ ئاواش خوێنراوەتەوە: (**لِيَذْكُرُوا**)، بۆ ئەوەی كەبیر بكەنەوە، یاخود بیریان بێتەوە.

٣)- ﴿ وَمَا يَزِيدُهُمْ إِلَّا نُفُورًا ﴾، كەچی ئەو جۆراو جۆركردن ڕوون كردنەوەی مانا و مەبەستەكان، هەر سڵەمینەوەیان تێدا زیاد دەكات، هەر دووركەوتنەوەیان تێدا زیاد دەكات، (**النُّفُور: هُرُوبُ الوَحْشِيّ وَالدَّابَّةِ بجَزَعٍ وَخَشْيَةٍ**)، واتە: (**نُفُور**) بریتیە لەوە كە ئاژەڵێك، یاخود ژیانداریێكی كێوی بە ترس و دڵەڕاوكەوە ڕابكات، واتە: ئەوانە وەك چۆن ئاژەڵێك ترسێكی بۆ دێ، حاڵەتێكی ترس و دڵەڕاوكەی بۆ پەیدا دەبێ و ڕادەكات، ئەوانیش بەو شێوەیە دووردەكەونەوە.

ئەم قورئانە کە بە شێوەی جۆراوجۆر مەبەستەکانی تێدا ڕادەگەیەنرێن، خوا ﷻ دەیەوێ لە هەموو دەلاقە و پەنجەرەکانی عەقڵ و دڵ و خەیاڵ و ئەندێشە و هەست و سۆز و هتدەوە، مەبەستەکان بەرێتە نێو ناخ و ڕووحی مرۆڤ، لە هەموو دەرگایان دەدا، ویستوویەتی بە هەموو شێوازێك ڕاستییەکان بخاتە نێو عەقڵ و دڵی مرۆڤەوە، کەچی ئەو بێبڕوایانە لە ئەنجامی ئەوەدا کە بە خۆیانیان کردوە، لە ئەنجامی ئەوەدا کە بەهۆی گوناهو تاوان و کەللە ڕەقییەوە، کارێکیان کردوە کە پەردە بەسەر چاو و عەقڵیان هەڵکشێ، هەرچەندە ئێمە مەبەستەکانیان بە شێوەی جۆراوجۆر بۆ دەخەینە ڕوو و لە لووتکەی ڕەوانبێژیی و پاراوییدا بۆیان دەخەینەڕوو، بۆ ئەوەی بیریان بێتەوە و پەند وەربگرن، کەچی هەر سڵەمینەوەو دوورکەوتنەوەیان تێدا زیاد دەکات.

**مەسەلەی سێیەم:**

**خوا ﷻ فەرموویەتی: بڵێ ئەگەر وەك دەڵێن: خوا پەرستراوی دیکەی لەگەڵدا بوونایە، ڕێییان بەرەو خاوەن عەرش (خوا) دەگرتەبەر (کە دژایەتیی بکەن)، پاکیی و بەرزییەکی گەورە بۆ وی، لەوەی کە دەیڵێن، حەوت ئاسمانەکان و زەوی و هەر کەس کە تێیان دایە، بێ خەوشیی بۆ خوا ڕادەگەیەنن و، هیچ شتێك نیە بە ستایشکردنەوە بەپاکی نەگرێ، بەڵام لە بە پاکگرتنەکەیان تێناگەن، ئەو هێدیی لێبوردەیە:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿ قُل لَّوْ كَانَ مَعَهُۥٓ ءَالِهَةٌ كَمَا يَقُولُونَ إِذًا لَّٱبْتَغَوْا۟ إِلَىٰ ذِى ٱلْعَرْشِ سَبِيلًا ﴿٤٢﴾ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يَقُولُونَ عُلُوًّا كَبِيرًا ﴿٤٣﴾ تُسَبِّحُ لَهُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ ٱلسَّبْعُ وَٱلْأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ ۚ وَإِن مِّن شَىْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِۦ وَلَٰكِن لَّا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ ۗ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا ﴿٤٤﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ بڕگەدا:

١)- ﴿ قُل لَّوْ كَانَ مَعَهُۥٓ ءَالِهَةٌ ﴾، بڵێ: ئەگەر لەگەڵ وی پەرستراوانی دیکە هەبوونایە.

٢)- ﴿ كَمَا يَقُولُونَ ﴾، وەك ئەوان دەڵێن، ئەمە ئەگەر بە ﴿ كَمَا يَقُولُونَ ﴾ بخوێنرێتەوە، واتە: بە شێوازی نادیار (غائب)، خوا ﷻ دیار کافرەکان دەدوێنێ، بەڵام خوێنراویشەتەوە (**كما تقولون**)، واتە: ئەی کافرەکان وەك ئێوە دەڵێن، ئەگەر لەگەڵ خوادا پەرستراوانی دیکە هەبوونایە.

٣)- ﴿ إِذًا لَّٱبْتَغَوْا۟ إِلَىٰ ذِى ٱلْعَرْشِ سَبِيلًا ﴾، ئەوا ئەو کاتە بەرەو خاوەن عەرش ڕێیان دەگرتەبەر، بۆ لای دەچوون.

لێرەدا ئەو ڕاستییە دووبارە دەکەمەوە کە وشەی (**آلهة**) کۆی (**إله**)ە و (**إله**)یش یانی: پەرستراو، ئنجا بە هەق بپەرسترێ، کە پەرستراوی بەهەق (**الإله الحق**) هەر یەکێکە، کە خوا (**اللّه**)یە، یان بە ناهەق بپەرسترێ، بێگومان پەرستراوانی ساختە و ناهەق زۆرن.

کەواتە: (**إله**) جیایە لە (**اَللّه**)، (**اَللّه**) ناوی ناسێنەر (**عَلَم**)ی خوایە ﷻ لە زمانی عەرەبی دا، بە ئینگلیزی دەڵێین: (God)، بە فارسیی دەڵێین: (خدا)، بەڵام (**إله**) واتە: پەرستراو، وشەیەکە بۆ خوا بەکاردێ و، بۆ جگە لە خواش بەکاردێ، بۆ خوا بەکاردێ کە هەر خوا پەرستراوی بە هەقە، بۆ جگە لە خواش بەکاردێ، لە حاڵێکدا جگە لە

خـوا بـە ناهـەق دەكرێتـە (إلـە) و پەرسـتراو، بۆیـە خـوا (ألله) جیایـە و (إلـە) پەرسـتراو جیایـە، چەنـدان جـاری دیكـەش باسـم كـردوە: هەنـدێ لـە بانگخـواز و وتاربێـژەكان، جیاوازیـی ئـەم دوو وشـەیە ناكـەن، بـۆ وێنـە: وشـەی (خـوا) كۆدەكەنـەوەو دەڵێـن: (خوایـەكان)، كـە (ألله) لـە زمـانی عەرەبییـدا نـە دەكرێتـە دووان (**مُثنّـى**)، نـە كـۆ (**جمـع**) دەكرێتـەوە، بـەڵام (إلـە) دەكرێتـە دووان (**إلهـان**)، دەكرێتـە كـۆ (**آلهـە**)، چونكـە هـەر یـەك خـوا هەیـە، كـە (**ألله**)یـە، بـەڵام پەرسـتراوی بـە ناهـەق زۆرن.

كـە دەفەرمـوێ: ﴿كَمَا يَقُولُونَ﴾، (**أي: لا تَحَقّـقَ لِتَعَـدُّدِ الآلهـة بَـل هُـو مجـرد فَـرْضٍ**) واتـە: وەك دەڵێـن، واتـە: چەنـد پەرسـتراویی بـوونی نیـە، بـەڵام وەك گریمانەیـەك {وەك عـەرەب دەڵێـن: (**عـلى سـبيل الفَـرْض**)} ئـەوە دامانـا وابـوو (گریـمان وابـوو)، ئەگـەر گریـمان لەگـەڵ خـوادا پەرسـتراوی دیكـە هەبوونایـە، بـەرەو خـاوەن عـەرش ڕێیـان دەگرتەبـەر.

(**إبتغـاء**) واتـە: خواسـتن، (**إبتغـاء السـبيل: طلـب طريـق الوصـول إلى الـشيء**)، واتـە: داواكـردنی ڕێیـەك، كـە پێیـدا بگاتـە شـتێك، بۆچـی بـەرەو خـوای خـاوەن عـەرش ڕێیـان دەگرتەبـەر؟! ئایـا بـۆ ئـەوەی بەسـەری دا زاڵـبن! یاخـود بـۆ ئـەوەی خۆیـانی لـێ نیزیـك بخەنـەوە، هـەردوو واتایەكـە هاتـوون لـە قورئـان دا، بـۆ نموونـە:

أ - واتای یەكەم: لە سوورەتی: (**المؤمنون**) دەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ مَعَهُۥ مِنْ إِلَٰهٍ ۚ إِذًا لَّذَهَبَ كُلُّ إِلَٰهٍۭ بِمَا خَلَقَ وَلَعَلَا بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ...(٩١)﴾، واتە: لەگەڵ خوادا هیچ پەرستراوی دیكە نین، ئەگەر نا هەر پەرستراوە چی دروستكردوە سەرپەرشتیی دەكرد، (گریمان ئەگەر پەرستراوی بە هەق بوونایە)، ﴿وَلَعَلَا بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ﴾، هەروەها هەندێكیان بەسەر هەندێكیان دا زاڵ دەبوون، دە بوو بە ناكۆكییان لەسەر ئەوەی: كێ سەرپەرشتیی دروستكراوەكان بكات؟!

كەواتـە: ﴿إِذًا لَّابْتَغَوْا إِلَىٰ ذِى الْعَرْشِ سَبِيلًا﴾، واتـە: بـەرەو خـوای خـاوەن عـەرش ڕێیـان دەگرتەبـەر، بـۆ ئـەوەی بەسـەریدا زاڵـبن و دژایەتیـی و ناكۆكیـی لەگـەڵ بكـەن (ئەگـەر پەرسـتراوی دیكـە لەگـەڵ خـوادا هەبوونایـە).

ب - واتای دووەمیان: كە ئەگەر لەگەڵ خوادا پەرستراوی دیكە هەبوونایە، ڕێیان بەرەو خوا دەگرتەبەر،تاكو خۆیانی لێوە نیزیك بخەن، ئەمیش هەر سوورەتی (**الإسراء**)دا هاتوە، (كە دوایی دەیگەینێ)، كە دەفەرموێ: ﴿أُولَٰٓئِكَ الَّذِينَ يَدْعُونَ يَبْتَغُونَ إِلَىٰ رَبِّهِمُ الْوَسِيلَةَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ وَيَرْجُونَ رَحْمَتَهُۥ وَيَخَافُونَ عَذَابَهُۥٓ ۚ إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ كَانَ مَحْذُورًا(٥٧)﴾، واتە: ئەوانەی كە

ئەوانە (بێبڕوایەکان) لێیان دەپاڕێنەوە، بەرەو پەروەردگاریان هۆکار دەخوازن، کە خۆیانی لێوە نیزیك بخەن، بە ئومێدی بەزەیی خوان و لە سزایەکەشی دەترسێن.

بەڵام وەك گوتم ئەوەی کە لێرە گونجاوترە، مانای یەکەمیانە، واتە: بەرەو خوای خاوەن عەرش ڕێیان دەگرتەبەر، تاکو بەسەریدا زاڵبن و دژایەتیی و ناکۆکیی لەگەڵ بکەن و لەگەڵی یەکلایی بکەنەوە: ئایا کامیان سەرپەرشتیی دروستکراوەکان بکات؟!

٤)- ﴿ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يَقُولُونَ عُلُوًّا كَبِيرًا ﴾، پاکیی و بەرزییەکی گەورە بۆ خوا، لەوەی کە ئەوان دەیڵێن، ئەمە خوێنراویشەتەوە: (**كَمَا تَقُولُونَ**)، ئەوەش لە حاڵێکدا کە بە شێوەی دواندن بێبڕوایەکان بدوێنرێن.

٥)- ﴿ تُسَبِّحُ لَهُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ ٱلسَّبْعُ ﴾، حەوت ئاسمانەکان و زەوی و خوا بەپاك دەگرن.

٦)- ﴿ وَمَن فِيهِنَّ ﴾، هەروەها هەر کەسێك کە تێیاندایە، واتە: هەر کەسێك کە تێیان دایە لە خاوەن عەقڵ و شعوورەکان، لە ئاسمانەکان و زەوی دا: لە فریشتان و لە مرۆڤان و لە جندەکان و دروستکراوانێکی دیکە، کە ئێمە نایانزانین، هەموویان خوا بە پاك دەگرن.

٧)- ﴿ وَإِن مِّن شَىْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِۦ ﴾، هیچ شتێك نیە، (وَإِن مِّن شَىْءٍ ) واتە: (**ما مِنْ شيءٍ**)، واتە: هیچ شتێك نیە، کە خوا بە پاك نەگرێ بە ستایشکردنیەوە، هەم بە پاکیی دەگرێ، هەم ستایش و مەدحی دەکات: (**يُسبِّحُهُ مُتَلَبِّسَاً بحَمْدِهِ**) بە پاکیی دەگرێ، هاوکات لەگەڵ ئەوەدا کە ستایشیشی دەکات.

٨)- ﴿ وَلَٰكِن لَّا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ ﴾، بەڵام ئێوە لە بە پاکگرتنی ئەوان تێناگەن، هەروەها ئاواش خوێنراوەتەوە: (**لا يَفْقَهُونَ**)، واتە: ئەوان تێیناگەن، واتە: هەم بە شێوەی ئامادە (حاضر)، هەم بە شێوەی نادیار (**غائب**).

٩)- ﴿ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا ﴾، بەدڵنیاییەوە خوا هێدیی و مەندە، (**حَلِيم**) واتە: هێدیی و مەند، کەسێ کە زوو تووڕە نەبێ، پەلە نەکات، (**غَفور**) واتە: لێبوردە.

(**زِيَادَة «كان» للدلالة على أن الحِلم والغُفران صِفَتَان له مُحَقَّقَتَان**)، واتە: لەو ئایەتەدا کە (**كان**) زیاد کراوە، ئەوە دەگەیەنێ کە: (**حِلم وغفران**)، هێدیی مەندیی و لێبوردەیی، دوو سیفەتی لە مێژینەی خوان و، لە ئەزەلەوە لە خوادا چەسپاون.

## کورتە باسێك لە بارەی بە پاكگرتن و ستایشكردنی خواوە

ئێستاش كورتە باسێك دەكەین لە بارەی ستایشكران و بە پاكگیرانی خواوە ﷻ لەلایەن سەرجەم دروستكراوەكانیەوە، خوای بەرزی مەزن فەرموویەتی: ﴿ وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ وَلَٰكِن لَّا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ ﴾، واتە: هیچ شتێك نیە خوا بە پاك نەگرێ بە ستایشكردنیەوە، بەڵام لە بە پاكگرتنەكەیان تێناگەن، واتە: نە لە پاكگرتنەكەیان تێدەگەن، نە لە ستایشكردنەكەیان، چونكە خوا دەفەرموێ: بە ستایشكردنیەوە بە پاكی دەگرن، واتە: ئەگەر لە بە پاكگرتنی دروستكراوەكان بۆ خوا تێنەگەن، لە ستایش كردنەكەشیان تێناگەن و حاڵی نابن.

ئێستاش با لەو بارەوە چەند شتێك بخەینە ڕوو:

١/ كە دەفەرموێ: ﴿ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ عَمَّا يَقُولُونَ ﴾، واتە: پاكیی و بەرزیی بۆ خوا، لەوەی كە دەیڵێن، واتە: خوا زۆر زۆر پاكە و، زۆر زۆر بەرزترە لەوەی، ئەو شتانەی كافرەكان دەیانڵێن، شایستەی خوا بن و لەخوا بوەشێنەوە، لە هاوبەش و ڕۆڵە و ...هتد.

٢/ كە دەفەرموێ: ﴿ تُسَبِّحُ لَهُ ﴾، بە پاكگرتنی و بێ خەوشیی بۆ ڕادەگەیەنن، وشەی (**سَبَّحَهُ، يُسَبِّحُهُ**)، بۆ خۆی بەركار (**مَفعول به**) دەخوازێ و پێویستیی بە پیتێك نیە، بەڵام لێرەدا كە دەفەرموێ: ﴿ تُسَبِّحُ لَهُ ﴾، ئەوە (ل)ە: (**لِتَعدِيَة «يُسبّح» المُضَمَّنِ مَعْنى يَشْهَدُ**) بۆ ئەوەیە كە (**يُسَبِّحُ**) بەركار بخوازێ، لە حاڵێكدا كە مانای (**يَشْهَدُ**)ی نێواخن كراوە، كەواتە: (**تُسَبِّحُ لَهُ: تُسَبِّحُ لَهُ وَتَشْهَدُ لَهُ**)، بە پاكیی دەگرێ و شایەدییشی بۆ دەدا، هەرچی كە لە ئاسمانەكان و زەویدا هەیە، هەم خوا ﷻ بە پاك دەگرێ و، هەم شاهێدیشی بۆ دەدا كە تەنها خۆی شایستەی پەرستران و بەندایەتیی بۆ كرانە.

دەشگونجێ ئەو (ل)ە، وەك گوتراوە: (**هِيَ المُسَمَّاة لام التبيين كاللَّتِي في**: ﴿ أَلَمْ نَشْرَحْ لَكَ صَدْرَكَ ۝١ ﴾ **الشرح**)، لامی ڕوونكردنەوە بێ، وەك ئەو لامەی كە لە سوورەتی (الشرح)دا هاتوە، خۆ خوا دەیتوانی بفەرموێ: (**أَلَمْ نَشْرَحْ صَدْرَكَ**)، بەڵام كە دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ نَشْرَحْ لَكَ صَدْرَكَ ۝١ ﴾، ئەمە بۆ ڕوونكردنەوەیە، واتە: ئایا بۆ تۆ، سینەی تۆمان گوشاد نەكرد؟

٣/ کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ وَلَٰكِن لَّا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ ﴾، هیچ شتێك نیە کە خوا بە پاك نەگرێ بە ستایشکردنیەوە، ئەمە لێرەدا زانایان دوو واتایان بۆ لێکداونەوە:

واتای یەکەم: گوتوویانە: مەبەست پێی دەلالەتیانە لەسەر بەدیهێنەریان، واتە: تۆ تەماشای هەرشتێك بکەی و، لێی وردبیەوە و، سەرنجی بدەی، دەتگەیەنێ بەوەی کە بەدیهێنەر و پەیداکەر و پەروەردگارەکەی بناسی، کە دەشفەرموێ: ﴿ وَلَٰكِن لَّا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ ﴾، واتە: ئەی بێبڕوایەکان، ئێوە لە بەپاکگرتن و ستایشکردنی دروستکراوەکان بۆ خوا، تێناگەن، ئەگەرنا هیچ شتێك نیە کە خوا بە پاك نەگرێ و ستایشی نەکات.

یاخود: ئەی مسوڵمانینە! ئەوە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانن، لە بەپاکگرتن و ستایشکردنی دروستکراوەکان بۆ خوا تێناگەن، ئەگەرنا هەر کەسێ تەماشایان بکات و، لێیان وردبێتەوە، حاڵی دروستکراوەکان، ئەوەی لێ دەفامرێتەوە کە بەدیهێنەرو پەروەردگارێك هێناونیە دی، مەبەست لە بەپاکگرتنەکە، ئەوەیە.

واتای دووەم: گوتوویانە: یانی: هیچ کام لە دروستکراوەکان نیە، کە جۆرێك لە یادکردنی خواو، بەپاکگرتنی و، ستایشکردنی خوایان نەبێ، بەڵام ئەو بە پاکگرتن و ستایشکردنە بۆ خەڵکی بە گشتی زانراو نیە.

هەڵبەتە ئێمە بەبێ چەندو چوون، ڕای دووەم هەڵدەبژێرین، بۆچی؟

لەبەر کۆمەڵێك ئایەت و فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ کە لێرەدا ئاماژە بە پێنج دانەیان دەکەین وەك نموونە:

١/ لە سوورەتی (ص)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ اصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَاذْكُرْ عَبْدَنَا دَاوُودَ ذَا الْأَيْدِ ۖ إِنَّهُ أَوَّابٌ ﴿١٧﴾ إِنَّا سَخَّرْنَا الْجِبَالَ مَعَهُ يُسَبِّحْنَ بِالْعَشِيِّ وَالْإِشْرَاقِ ﴿١٨﴾ وَالطَّيْرَ مَحْشُورَةً ۖ كُلٌّ لَّهُ أَوَّابٌ ﴿١٩﴾ ﴾، واتە: یادی بەندەکەی ئێمە داوود، بکە، خاوەن هێزو توانا، ئەو زۆر بۆ لای خوا دەگەڕایەوە و پەشێمان دەبووەوە، ئێمە چیایەکانمان بۆ ڕام و دەستەمۆ کرد بوون، کە لەگەڵ ئەودا ئێواران و بەیانیان (دەمە و خۆرهەڵات) خوایان بە پاك دەگرت، (واتە: لەگەڵ داوود دا، داوود موناجات و ڕازو نیازی لەگەڵ خوا دەکرد، بەو دەنگە زوڵاڵ و خۆشەی خۆی، کە دەنگی زۆر زۆر خۆش بووە)، هەروەها باڵندەکانیش بۆی کۆدەبوونەوە هەموویان زۆر بۆ لای خوا گەڕاوەبوون.

پێغەمبەر ﷺ شەوێك گوێی لە (ئەبوو مووسای ئەشعەریی) بوو، قورئانی دەخوێند، کە ئەویش دەنگی زۆر خۆش بووە، ئەوەندە خۆش بووە، کە یەکێك لە هاوەڵان دەڵێ: دەنگی هیچ عوودو تارو سەنج {ئامێرە مۆسیقاییەکان کە ئەو کات هەبوون} نەبیستوە

هێنـدەی دەنگـی وی خـۆش بـێ!)، پێغەمبـەر ﷺ کـە گوێـی لـێ بـووە، پێـی دەفەرمـوێ: ئەگـەر دوێنـێ شـەوێ ئـاگات لـێ بووایـە کـە گوێـم بـۆ گرتبـووی: {لَقَـدْ أُوتِيـتَ مِزْمَـارًا مِـنْ مَزَامِيرِ آلِ دَاوُدَ} (أَخْرَجَـهُ البُخـاري: ٤٧٦١، والترمـذي: ٣٨٥٥). واتـە: تـۆ ئاوازێـك لـە ئـاوازەکانی (داوود)ت پـێ دراوە، دەنگـت زۆر خۆشـە! (ئەبـوو مووسـا)ش گـوتی: {لَـوْ عَلِمْـتُ لحَبَّرْتُـهُ لَـكَ تَحْبِيرًا} (أَخْرَجَـهُ ابـن حبـان: ٧١٩٧، قـال شُـعَيب الأَرنـؤوط: إِسْـنادُهُ عَـلَى شَرْطِ مُسْـلِم)، واتـە: ئەگـەر زانیبـام، هێنـدەی دیکـە دەنگـی خـۆم خۆشـتر دەکـرد بـۆ تـۆ ئـەی پێغەمبـەر! ﷺ.

خـوا دەفەرمـوێ: چیایەکانمـان بـۆ داوود دەسـتەمۆ کـرد بـوون، تاکـو لەگـەڵ ئـەودا یـادی خـوا بکـەن و، خـوا بـە پـاك بگـرن، لەمەشـەوە دیـارە کـە چیایـەکان زیکـر و یـادی خـوا دەکـەن.

٢/ هەروەها لە سوورەتی (مریم)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَقَالُوا اتَّخَذَ الرَّحْمَٰنُ وَلَدًا ﴿٨٨﴾ لَقَدْ جِئْتُمْ شَيْئًا إِدًّا ﴿٨٩﴾ تَكَادُ السَّمَاوَاتُ يَتَفَطَّرْنَ مِنْهُ وَتَنشَقُّ الْأَرْضُ وَتَخِرُّ الْجِبَالُ هَدًّا ﴿٩٠﴾ أَن دَعَوْا لِلرَّحْمَٰنِ وَلَدًا ﴿٩١﴾ ﴾.

واتـە: هەروەهـا (بێبڕوایـەکان) گوتیـان: خـوای خـاوەن بەزەیـی ڕۆڵـەی هەیـە! ، شـتێکی زۆر گەورەتـان گـوت! (گوناهـو تاوانێـکی گەورەتـان گـوت) ئاسـمانەکان خەریکـن بـە هـۆی ئـەو قسـەی ئێـوەوە شـەق ببـەن و! زەوییـش خەریکـە بقڵیشـێ! هەروەهـا چیایەکانیـش خەریکـن بڕووخێـن و، بـە دەنگـی بـەرز بکـەون، بـە هـۆی ئـەوەوە کـە لافـی ڕۆڵەیـان بـۆ (خـوای) خـاوەن بەزەیـی لێـدا.

ئەمـەش ئـەوە دەگەیەنـێ: کـە ئاسـمانەکان و زەوی و چیایـەکان، جۆرێـك لـە هەسـتیان هەیـە، بەرانبـەر بـە خـوای خـاوەن و پەروەردگاریـان.

ئنجـا بـا ئامـاژە بـە چەنـد فەرموودەیەکیـش بکەیـن، کـە دەقـن لەسـەر ئـەوەی هەمـوو دروسـتکراوەکان جۆرێـك لـە بـە پاکگرتـن و سـتایش و یـادی خوایـان هەیـە، کـە ئێمە تێـی ناگەین:

٣/ {عَنْ جَابِر بن سَمُرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِنِّي لَأَعْرِفُ حَجَرًا بِمَكَّةَ، كَانَ يُسَلِّمُ عَلَيَّ قَبْلَ أَنْ أُبْعَثَ إِنِّي لَأَعْرِفُهُ الْآنَ} (أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ: ٢٢٧٧، وَالتِّرمذي: ٣٦٢٤).

واتـە: جابیـری کـوڕی سـەمورە (خـوا لێـی ڕازی بـێ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرمووی: مـن بەردێـك دەناسـم لـە مەککـە، کـە پێـش ئـەوەی ڕەوانـە بکرێـم {بکرێمـە پێغەمبـەر} سـڵاوی لـێ دەکـردم، ئێسـتاش ئـەو بـەردە دەناسـم.

گاشە بەردێکی گەورە بووە، دیارە ئەو بەردەش وەك موعجیزەیەك سڵاوی لە پێغەمبەر ﷺ کردوە، بێگومان دەبێ بە نازناوی پێغەمبەرایەتیی سڵاوی لێکرد بێ و، گوتبێتی: (السلام عْلَيكَ يا نبيَّ اللّه)، یان گوتبێتی: (السلام عليكَ يا رسول اللّه)، ئنجا هەر چۆن بێ، بەرد کە سڵاو بکات، مانای وایە زیکریش دەکات و، خواش بە پاك دەگرێ و ستایشیشی دەکات.

٤/ {عَنْ عَبْدِ اللَّه بْنِ مَسْعُودٍ رَضِيَ اللَّه عَنْهُ، قال: وَلَقَدْ كُنَّا نَسْمَعُ تَسْبِيحَ الطَّعَامِ، وَهُوَ يُؤْكَلُ} (أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ: ٣٥٧٩، وَالتِّرمِذِيُّ: ٣٦٣٣)، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: ئێمە (لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دا بووین، خواردنمان دەخوارد}، گوێمان لە بە پاکگرتنی خواردنەکە دەبوو، (خواردنەکە خوای بەپاك دەگرت و، تەسبیحی خوای دەکرد) لە کاتێك دا کە دەخورا.

٥/ {عَنْ أَبِي سَعِيدٍ قَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: لاَ يَسْمَعُهُ (المؤذّن) جِنٌّ وَلاَ إِنْسٌ وَلاَ شَجَرٌ وَلاَ حَجَرٌ ولاَمَدَرٌ إِلاَّ شَهِدَ لَهُ} (أَخْرَجَهُ إِبْنُ مَاجَه: ٧٢٣، وَصَحَّحَهُ الألباني) واتە: ئەبوو سەعید خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هیچ شتێك گوێی لە دەنگی (بانگبێژ) نابێ لە جینن و مرۆڤ و درەخت و بەرد و گڵ (قوڕ) مەگەر (ڕۆژی دوایی)، شایەدیی بۆ دەدا.

هەڵبەتە درەخت و بەرد و گڵ و هەرشتێك کە شایەدیی بدات، مانای وایە جۆرێك لە هەست و دەرك پێکردنیان هەیە بۆ خوا ﷻ و، خاوەنی خۆیان دەناسن.

کەواتە: بە پاکگرتن و ستایشکردنی خواش، بۆ ئەوان شتێکی ئاسابیە، بەڵام دیارە بە شێوەیەکی نائاساییە بۆ ئێمە، بۆیە ئێمە نایبیستین، مەگەر وەك موعجیزەیەك کە پێغەمبەر ﷺ پێمان بگەیەنێ، وەك لە فەرموودەکان دا هاتوە، کە خواردن لە دەستی دا، خوای بە پاك گرتوە، هەروەها لە (صحيح البخاري)[1] دا هاتوە، کە ئەو بنکە دارخورمایەی پێغەمبەر ﷺ وتاری لەسەر دەدا، دوای ئەوەی پیرەژنێك مینبەرێکی بۆ دروستکرد و، چووە سەر مینبەرەکە، ئەو کۆلکە دار خورمایە هاوەڵان گوتوویانە: گوێمان لە دەنگی بوو، وەك چۆن بەچکە حوشتر دەناڵێنێ بۆ دایکی و جۆرێك لە سۆزی بۆ دەردەبڕێ، خەڵکی مزگەوت هەموومان ئاوا گوێمان لە دەنگی بوو [هاواری کرد، لە داخ و ناڕەحەتیی ئەوەی پێغەمبەر ﷺ ئەوی بە جێهێشتوە و چۆتە سەر مینبەر!] تاکو پێغەمبەر ﷺ لەسەر مینبەرەکە هاتە خوار و دەستی پێداهێنا دوو سێ جار، ئنجا بێ دەنگ بوو[2].

---

(١) {عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَخْطُبُ إِلَى جِذْعٍ فَلَمَّا اتَّخَذَ الْمِنْبَرَ، تَحَوَّلَ إِلَيْهِ، فَحَنَّ الْجِذْعُ، فَأَتَاهُ فَمَسَحَ يَدَهُ عَلَيْهِ} صحيح البخاري: ٣٣٩٠.

(٢) لە ڕیوایەتی دیکەدا وردەکاریی زیاتری ئەو ڕووداوە هاتوون، کە من لەماناکردنەکەدا ئاماژەم پێیان دا.

### مەسەلەی چوارەم:

**خوا ﷻ بە پێغەمبەری خۆی ﷺ فەرمووە، هەرکات قورئانت خوێند، پەردەیەکی پۆشراو دەخەینە نێوان تۆ و ئەوانەوە کە بڕوایان بە ڕۆژی دوایی نیە و، داپۆشەرانیش دەخەینە سەر عەقڵ و دڵیان تاکو تێی نەگەن و، قورساییش دەخەینە گوێیانەوە بۆ ئەوەی نەبیستن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ جَعَلْنَا بَيْنَكَ وَبَيْنَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْـَٔاخِرَةِ حِجَابًا مَّسْتُورًا ﴿٤٥﴾ وَجَعَلْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً أَن يَفْقَهُوهُ وَفِىٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرًا ﴾.

### شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ وَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ ﴾، هەر كاتێك قورئانت خوێند، واتە: بەبێ هەڵاواردن هەركاتێك تۆ قورئانت خوێند.

٢)- ﴿ جَعَلْنَا بَيْنَكَ وَبَيْنَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْـَٔاخِرَةِ ﴾، ئێمە لە نێوان تۆ و ئەوانەدا كە بڕوایان بە ڕۆژی دوایی نیە.

٣)- ﴿ حِجَابًا مَّسْتُورًا ﴾، پەردەیەكی پۆشراو دادەنێین، (**الحِجَاب: السَّاتِرُ الَّذِي يَحْجِبُ البَصَرَ عَن رُؤيةِ مَا وَرَاءه**)، (حجاب) ئەو پەردەیەیە كە ڕێ دەگرێ لە چاو، كە پشت پەردەكە ببینێ.

كە دەفەرموێ: ﴿ حِجَابًا مَّسْتُورًا ﴾، زانایان و شارەزایانی زمانی عەرەبیی، دوو واتایان بۆ لێكداونەوە:

١ - (**مَسْتُوراً: أي: حِجَاباً بالِغاً الغَايَةَ فِي الحَجْبِ، كَأَنَّهُ مَسْتُورٌ بساترٍ آخر:** ﴿ حِجْرًا مَّحْجُورًا ﴿٢٢﴾ ﴾)، پەردەیەك كە گەیشتووەتە ئەوپەڕی داپۆشین، وەك خۆشی پۆشرا بێ، نەك هەر ئەوشتەی كە دەیشارێتەوە و، دەیپۆشێ، بەڵكو خۆشی داپۆشراوە بە پۆشەرێكی دیكە، وەك لە شوێنێكی دیكەدا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ حِجْرًا مَّحْجُورًا ﴿٢٢﴾ ﴾الفرقان، واتە: ڕێ لێگرتنێكی ڕێ لێگیراو.

٢ - یاخود: ﴿ حِجَابًا مَّسْتُورًا ﴾، (**أي: حِجَاباً لاَ تَرَاهُ الأَعْيُن**)، واتە: پەردەیەكە كە چاوەكان نایبینن، ئنجا هەر كامێكیان بێ، واتاكەی هەر ئەوەیە كە خوا پەردەیەكی هێندە مەحكەمی داناوە، چ پەردەكە خۆشی پۆشراو بێ، چ پەردەكە هێندە پۆشەر بێ بۆ ئەو شتەی لە پێشییەوەیەو، كەوتۆتە نێوان ئەو و ئەو كەسەوە كە دەیەوێ ببینێ، كە بە هیچ جۆرێك ڕێی دیتنی نادات!

٤)- ﴿ وَجَعَلْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً أَن يَفْقَهُوهُ ﴾، هەروەها لە سەر دڵەکانیان پۆشاکانێکمان داناون، تاکو تێی نەگەن! (**أكنة: جمع كِنان، مثل: أغطية وغطاء**)، (**أكنة**) کۆی (**كِنان**)ە، یانی: کیف و شتێك کە شتێکی تێدا بپۆشرێ و پەنهان بکرێ، وەك (**غِطاء**)، بەڵام پۆشەر (**غِطاء**) بریتیە لەوەی بەسەری دابدرێ و دایپۆشێ، بەڵام (**كِنان**) ئەوەیە تێی بخرێ و، لەوێدا پەنهان بکرێ.

٥)- ﴿ وَفِيٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرًا ﴾، لە گوێچکەکانیشیاندا قورساییمان داناوە، (**وَقْرا: ثِقْلاً**)، (**وِقْر**) بە بار دەگوترێ، بەڵام (**وَقْر**) ئەو قورساییەیە کە بچێتە نێو گوێچکە و ببێتە هۆی کەڕ بوون (نەبیستن).

## ڕوونکردنەوەی دوو مەسەلەی پێویست:

مەسەلەی یەکەم: کە خوا دەفەرموێ: پەردەمان خستووەتە بەر چاویان و عەقڵ و دڵەکانیامان بە پۆشاك داپۆشیوە و قورساییمان خستووەتە نێو گوێیان، بۆ ئەوەی نەیبینن و تێی نەگەن و نەیبیستن، ئەمە: تەعبیرە لە حاڵەتی بێبڕوایی و کەللەڕەقیی بێبڕوایەکان، بەرانبەر بە قورئان و پێغەمبەر ﷺ، نەك خوا وای لێکردبن، ئەگەرنا خوا ﷻ بۆچی قورئانی بۆ دابەزاندوون و، پێغەمبەری بۆ ناردوون؟! ئەگەر هەر لە سەرەتاوە خوا پەردەی خستووەتە بەر چاویان و، دڵی خستوونەتە نێو کیف و توورەکەوە، بۆ ئەوەی: عەقڵ و دڵیان هیچی بۆ نەچێت و، هیچی نەچێتە نێو، ئەگەر هەر لەسەرەتاوە، خوا ﷻ قورسایی خستووەتە گوێچکەیانەوە، بۆ ئەوەی هیچ نەبیستن! ئەدی بۆچی پێغەمبەری بۆ ناردوون؟! بۆچی قورئانی بۆ دابەزاندوون؟! کەواتە: ئەم تەعبیرە مەبەست پێی ئەوەیە: کە ئەوانە بە هۆی کەللەڕەقیی و تاوان و دنیا ویستیی و بەرژەوەندیی خوازیی خۆیانەوە، کارێکیان بە خۆیان کردوە: عەقڵ و هەستەوەرەکانی خۆیان لە کار خستوون، نە چاویان توانای هەق بینینی هەیە، نە گوێچکەیان توانای هەق بیستنی هەیە، نە عەقڵ و دڵیان توانای تێگەیشتنی هەقی هەیە.

مەسەلەی دووەم: دەگونجێ خوێندنی قورئان، یان چەند ئایەتێکی تایبەت، مرۆڤ لە کافران پەنهان بکات، واتە: دەگونجێ خوێندنی قورئان، یان چەند ئایەتێکی تایبەت و دیاریکراو و گونجاو لەگەڵ ئەو مەبەستەدا، ببێتە هۆی پەنهان بوونی مرۆڤی مسوڵمان لە چاوی کافران، لەو بارەوەش دووشتان دێنین:

أ- {عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: لَمَّا نَزَلَتْ: (تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ) أَقْبَلَتِ الْعَوْرَاءُ: أُمُّ جَمِيلٍ ابْنَةُ حَرْبٍ، وَلَهَا وَلْوَلَةٌ، وَفِي يَدِهَا فِهْرٌ، وَهِيَ تَقُولُ: مُذَمَّمًا أَبَيْنَا، وَدِينَهُ قَلَيْنَا، وَأَمْرَهُ عَصَيْنَا، وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ

جَالِسٌ فِي الْمَسْجِدِ، ثُمَّ قَرَأَ قُرْآنًا، وَمَعَهُ أَبُو بَكْرٍ، قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَدْ أَقْبَلَتْ وَأَنَا أَخَافُ أَنْ تَرَاكَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّهَا لَنْ تَرَانِي، وَقَرَأَ قُرْآنًا اعْتَصَمَ بِهِ، كَمَا قَالَ: وَقَرَأَ: ﴿ وَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ جَعَلْنَا بَيْنَكَ وَبَيْنَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْأَخِرَةِ حِجَابًا مَّسْتُورًا ﴿٤٥﴾ ﴾الإسراء، فَأَقْبَلَتْ حَتَّى وَقَفَتْ عَلَى أَبِي بَكْرٍ، وَلَمْ تَرَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَتْ: يَا أَبَا بَكْرٍ، إِنِّي أُخْبِرْتُ أَنَّ صَاحِبَكَ هَجَانِي، فَقَالَ: لاَ وَرَبِّ هَذَا الْبَيْتِ مَا هَجَاكِ ، قَالَ: فَوَلَّتْ وَهِيَ تَقُولُ : قَدْ عَلِمَتْ قُرَيْشٌ أَنِّي بِنْتُ سَيِّدِهَا} (أخرجه الحاكم: ٣٣٧٦، عَن أسماء، وإبن حبان: ٦٥١١، وأبو يعلى: ٣٥، عن ابن عباس قال الحاكم، هذا حديث صحيح الإسناد، لم يُخْرجاه، وقال شعيب الأرنؤوط في تعليقه على صحيح ابن حبان، حديث صحيح بشواهده).

واتە: ئەسمائى كچی ئەبوو بەكری صیددیق (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ) دەڵێ: كاتێك سووڕەتی (تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ) دابەزی، ئافرەتە یەك چاوەكە: ئوممو جەمیلی كچی حەرب هات، {ئەبوو سوفیان كوڕی حەربە، ئەم ئوممو جەمیلەش خێزانی ئەبو لەهەبی مامی پێغەمبەر ﷺ بووە، دیارە كچی حەرب بووە، واتە: خوشكی ئەبوو سوفیان بووە و یەك چاویشی هەبووە، بۆیە پێیان گوتوە: (**العوراء**)}، لەبەرخۆیەوە هەر هاوار و دەنگە دەنگی بوو[1]، لە دەستیدا بەردێكی تیژ هەبوو و، لەبەرخۆیەوە دەیگوت: سەرپێچیی لە زەمكراو دەكەین و، ڕازی نابین بە كارەكەی و، ڕقمان لە دینەكەشیەتی[2]، پێغەمبەریش ﷺ دانیشتبوو لە مزگەوت و ئەبوو بەكری لەگەڵ بوو ﷺ، كاتێك ئەبوو بەكر ئەوی بینی، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ ئەوە هات و من دەترسم بتبینێ! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نامبینێ و هەندێ قوڕئانی خوێند و پەنای بە قوڕئان گرت {واتە: قوڕئانی كردە قەڵغانی خۆی تاكو نەیبینێ} و ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ وَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ جَعَلْنَا بَيْنَكَ وَبَيْنَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْأَخِرَةِ حِجَابًا مَّسْتُورًا ﴿٤٥﴾ ﴾**الإسراء**، ئەو ئافرەتەش هات {پێغەمبەری خوای نەبینی} گوتی: ئەی ئەبوو بەكر! هەواڵم پێدراوە كە هاوەڵەكەت هەجوی كردووم، {هەجو: ئەوەیە كە بە شیعر لە دژی كەسێك قسە بكرێ، واتە: زەممی كردووم بە شیعر}، ئەبوو بەكر (خوا لێی ڕازی بێ) گوتی: سوێند بە پەروەردگاری ئەم ماڵە {دیارە لەتەنیشت كەعبە بوون}، پێغەمبەر ﷺ بە شیعر لە دژی

---

(١) ولولة: الدعاءُ بالويل والعويل، واتە: (ولْوَلة) بریتیە لەوەی بڵێ: هاوار بۆ من! هەروەها بریتیە لە هاوار كردن و دەنگ بەرز كردنەوە.

(٢) مەبەستی لە زەمكراو: پێغەمبەر ﷺ بووە، (محمد) واتە: ستایشكراو (مذمم) واتە: زەمكراو، بۆیە پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: تەماشای قوڕەیش ناكەن؟! دەیانەوێ قسە بە من بڵێن، كەچی خوا لە منی لا دەدا، ئەوان قسە بە (مذمم) دەڵێن، بەڵام من ناوم (محمد)ە!) ئنجا (أم جميل) لەبەرخۆیەوە ئەوەی بە شیعر دەگوت.

تۆ قسەی نەکردوە، {بێگومان قسەکەی ئەبوو بەکر ڕاست بوو، چونکە ئەگەر قسەیەك لەدژی ئەو کرابێ، وەك لە سوورەتی (المسدّ)دا هاتوە، ئەوە شیعر نیە و، قورئانە و، خوا فەرموویەتی و مەبەستی پێ ئەو ئایەتانە بووە، کە خوا دەفەرمووێ: ﴿تَبَّتْ يَدَآ أَبِى لَهَبٍ وَتَبَّ ﴿١﴾ مَآ أَغْنَىٰ عَنْهُ مَالُهُۥ وَمَا كَسَبَ ﴿٢﴾ سَيَصْلَىٰ نَارًا ذَاتَ لَهَبٍ ﴿٣﴾ وَٱمْرَأَتُهُۥ حَمَّالَةَ ٱلْحَطَبِ ﴿٤﴾ فِى جِيدِهَا حَبْلٌ مِّن مَّسَدٍۭ ﴿٥﴾﴾ المسد.

کە دەفەرمووێ: ﴿وَٱمْرَأَتُهُۥ حَمَّالَةَ ٱلْحَطَبِ﴾، واتە: ژنەکەشی کۆڵ هەڵگرە، داران لەکۆڵێ دەنێ، ﴿فِى جِيدِهَا حَبْلٌ مِّن مَّسَدٍۭ﴾، لە گەردنی دا پەتێکی هۆنراوە هەیە (لە جیاتی ملوانکەی زێڕ و مرواریی، پەتێکی ئەستووری چنراو لە پووشی دارخورما دەخرێتە گەردنیەوە و، پێی سزا دەدرێ لە ڕۆژی دواییدا) و کۆڵەدارێکی لەکۆڵ دەنرێ (لە جیاتی ئەوەی بە فیزو کەشخەوە خۆ ڕاوەشێنێ بە نێو ژناندا، وەك خێزانی ئەبوولەهەب، کە گوتوویەتی: (**أنا بنت سيدها**) من کچی گەورەی قورەیشم، واتە: کچی حەربم، خوا ئاوای لەبارەوە فەرمووە، کە ئەو گوتوویەتی: ئەوە قسەی موحەممەد ﷺو وەك شیعر بەسەر منی دا گوتوە!! بۆیە ئەبوو بەکر سوێندی بۆ خواردوە} ئنجا ڕۆیشت و گوتی: قورەیش دەزانێ من کچی گەورەی قورەیشم {واتە: کەس بۆی نیە قسە بە من بڵێ}.

**ب-** لەو بارەوە (**القرطبي**) لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1] بەسەرهاتێك دەگێڕێتەوە، کە پێم باشە لێرەدا بە کورتیی بیهێنم، دەڵێ:

کاتی خۆی لە قورتوبە [کە شارێك بووە لە شارەکانی ئەندەلووسی کۆن و ئیسپانیای ئێستا]، لە قەڵایەکەوە لە دوژمن ڕام کرد، دوو ئەسپ سوار بەدوام کەوتن، {ئەو پیادە بووە، ئەوانیش سوار بوون} منیش هەر لەو دەشتە دانیشتم، زانیم بە ڕاکردن لەبەر دەستیان دەرباز نابم، دانیشتم و دەستمکرد بە قورئان خوێندن و سەرەتای سوورەتی: (**یس**)م خوێند و جگە لەوەش ئەو ئایەتانەی کە بە گونجاوم دەزانین بۆ ئەو حاڵەتەم، سەرەتای سوورەتی (یس) کە خوا دەفەرمووێ: ﴿يسٓ ﴿١﴾ وَٱلْقُرْءَانِ ٱلْحَكِيمِ ﴿٢﴾ إِنَّكَ لَمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٣﴾ عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٤﴾ تَنزِيلَ ٱلْعَزِيزِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٥﴾ لِتُنذِرَ قَوْمًا مَّآ أُنذِرَ ءَابَآؤُهُمْ فَهُمْ غَٰفِلُونَ ﴿٦﴾ لَقَدْ حَقَّ ٱلْقَوْلُ عَلَىٰٓ أَكْثَرِهِمْ فَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٧﴾ إِنَّا جَعَلْنَا فِىٓ أَعْنَٰقِهِمْ أَغْلَٰلًا فَهِىَ إِلَى ٱلْأَذْقَانِ فَهُم مُّقْمَحُونَ ﴿٨﴾ وَجَعَلْنَا مِنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ سَدًّا وَمِنْ خَلْفِهِمْ سَدًّا

---

(١) ج١٠، ص٢٢١.

﴿فَأَغۡشَيۡنَٰهُمۡ فَهُمۡ لَا يُبۡصِرُونَ ٩﴾، {ئەم ئایەتانەی خوێندوون و هەندێ شوێنی دیكەی قورئانی خوێندوە، كە بە گونجاوی زانیوە و لێرەدا باسی نەكردوە}، دەڵێ: ئەو دوو سوارە هاتن لە من تێپەڕین و، دوایی گەڕانەوە و گوتیان: چی لێهات؟! لە بەرخۆیانەوە دەیانگوت: (**هـذا دَيْبُلَـه، يَعنون شيطاناً**)، واتە: ئەوە شەیتان بووە؟! چی لێهات چۆن ون بوو؟! ئەوە بوو خوای پارێزەر پاراستمی.

هەڵبەتە، ئەوە دەگەڕێتەوە سەر ئەوە: ئینسان تا چ ڕاددەیەك بەئیمان و عەقیدە و دڵێكی ساغ و سافەوە ئەو ئایەتانە بخوێنێ، پێشتریش ئەگەر پەیوەندیی لەگەڵ خوادا باش بێ، بێگومان خوا سەرپەرشتیاری بەندەكانی خۆی دەبێت و، ئاگای لێیان دەبێ، وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەردا هاتوە: {**تَعرَّفْ إِلَى اللَّـهِ فِي الرَّخَـاءِ، يَعْرِفْـكَ فِي الشِّـدَّةِ**} (**أَخْرَجَـهُ أحمـد برقـم ٢٨٠٤، وَالطَّـبرَانِي: ١١٢٤٣، وَصَحَّحَـهُ كل مـن الألبـاني وشـعيب الأنـؤوط**) واتە: لە كاتی خۆشییدا خوا بناسە، خوا لە تەنگانانەدا لە فریات دێ و دەتناسێ.

### مەسەلەی پێنجـــەم:

هـەرکات بـە تەنیـا بـاسی پـەروەردگارت کـرد لـە قورئانـدا، ئـەوان (کافـرەکان) پاشـەو پـاش پشـت هەڵدەکـەن و دەسـڵەمنەوە، ئێمـە ئـەوە دەزانیـن کـە بـۆی، گـوێ بـۆ تـۆ هەڵدەخـەن، کاتێك گوێـت بـۆ ڕادەدێـرن و کاتێك چپـە دەکـەن، کـە ستەمکاران دەڵێـن: ئێـوە تەنیـا بـە شـوێن پیاوێـکی جـادوو لێکـراو دەکـەون! سـەرنج بـدە! چـۆن وێنانـت بـۆ دێننـەوە و گومـڕا بـوون و ناتوانـن ڕێ دەربکـەن:

خـوای مـەزن دەفەرمـوێ: ﴿ وَإِذَا ذَكَرْتَ رَبَّكَ فِي ٱلْقُرْءَانِ وَحْدَهُۥ وَلَّوْاْ عَلَىٰٓ أَدْبَٰرِهِمْ نُفُورًا ﴿٤٦﴾ نَّحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَسْتَمِعُونَ بِهِۦٓ إِذْ يَسْتَمِعُونَ إِلَيْكَ وَإِذْ هُمْ نَجْوَىٰٓ إِذْ يَقُولُ ٱلظَّٰلِمُونَ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا رَجُلًا مَّسْحُورًا ﴿٤٧﴾ ٱنظُرْ كَيْفَ ضَرَبُواْ لَكَ ٱلْأَمْثَالَ فَضَلُّواْ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ سَبِيلًا ﴿٤٨﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دە بڕگەدا:

١)- ﴿ وَإِذَا ذَكَرْتَ رَبَّكَ فِي ٱلْقُرْءَانِ وَحْدَهُۥ ﴾، هەر کاتێك بە تەنیا باسی پەروەردگارت بکەی، واتە: بڵێی: (لا إله إلا الله)، جگە لە خوا هیچ پەرستراوی بە هەق نین، یاخود باسی هاوبەشەکانی نەکەی، ئەوانەی لە وەهم و خەیاڵی ئەوان (کافرەکان)دا هاوبەشی خوان.

٢)- ﴿ وَلَّوْاْ عَلَىٰٓ أَدْبَٰرِهِمْ نُفُورًا ﴾، ئەوانە پاشە و پاش دەکشێنەوە بە سڵەمینەوەوە، (**نُفُور: جمع نافر، أو مصدر: نفروا نفوراً، أو حال: ولّوا نافِرين**)، (نافر) واتە: کەسێك لە شتێك ترسا بێ و ڕایکردبێ و سڵەمی بێتەوە، (**نفور**) کۆ (**جمع**)یەکەتی، یان (**نفوراً**) دەبێتە چاوگ، واتە: سڵەمیونەوە پاشەو پاش بەسڵەمینەوە، یاخود (**نفوراً**) دەبێتە حاڵ، واتە: پشتیان هەڵکردوە لە حاڵێکدا سڵەمیونەوە، بەسڵەمینەوەییەوە پشتیان هەڵکردوە.

وشـەی (**أدبار**)یـش کـۆی (**دُبُـر**)ە، یـانی: پشـت، پـاش، دوا، واتـە: پاشـەو پـاش کشـاونەوە، کەسـێك لەنـاکاو تینێـکی بەهێـزی بـۆ بـێ و فریـا ناکـەوێ بسـووڕێتەوە، هـەر کـە ترسـەکەی ڕووبـەڕوو بـۆوە، یەکسـەر پاشـەو پـاش دەکشـێتەوە، ئەوانـەش ئەوەنـدە قەڵسـن بـە بیسـتنی خـوا بەیەکگرتـن، کـە تـۆ بـاسی دەکـەی: تەنیـا خـوا بپەرسـتن، هێنـدە پێـی قەڵسـن، یەکسـەر پاشـەو پـاش دەکشـێنەوە و فریـا ناکـەون بسـووڕێنەوە و پشـتت تێبکـەن و بـڕۆن، هـەر یەکسـەر پاشـە و پـاش دەڕۆن.

٣)- ﴿ نَّحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَسْتَمِعُونَ بِهِۦٓ ﴾، ئێمە زاناترین بەوەی کە ئەوان گوێی بۆ هەڵدەخەن، بۆ تۆ، (**أَعْلَمُ: إسم تَفْضيلٍ مُسْتَعْمَل فِي مَعْنَى قُدْرَة العِلْمِ وَتَفْضيلِهِ، فَلَيْسَ لَهُ مُقَابل**) کە دەفەرموێ: ئێمە زاناترین، مەبەست ئەوە نیە لە کێ زاناترین؟! واتە: ئێمە زۆر زۆر زاناین، لێرەدا (**أعلم**) (**إسم تفضيل**)ە، بەڵام بەکارهێنراوە بۆ: بەهێزیی ئەو زانیارییەی خوا، نەك مەبەست ئەوە بێ لە کەسێك زاناترە.

کە دەفەرموێ: ﴿ بِمَا يَسْتَمِعُونَ بِهِۦٓ ﴾، ئەم (**ب**)ی، سەر (**يستمعون**) (**لتعدِية اسْم التَّفْضِيلِ إلى مُتَعَلِّقٍ لأَنَّهُ قَاصِرٌ عَنِ التعْدِيةِ إلى المفعُول**)، (**إستَمَعَ**) واتە: گوێی هەڵخست، لێرەدا ئەم گوێ هەڵخستنە بۆ ئەوەی بەرکار (**مفعول به**)ێکی ببێ، ئەو (**ب**)ی خراوەتە سەر، ﴿ بِمَا يَسْتَمِعُونَ بِهِۦٓ ﴾، ئێمە زاناترین بەوەی کە ئەوان بۆوی، گوێ بۆ تۆ هەڵدەخەن.

بەڵام ئەو (**ب**)ی سەر (**بما**) مانای هۆکار (**سبب**) و هاندەر دەگەیەنێ، یانی: ئێمە دەزانین هۆکاری چییەو بە چ هاندەرێك گوێت بۆ دەگرن.

٤)- ﴿ إِذْ يَسْتَمِعُونَ إِلَيْكَ ﴾، کاتێك گوێت بۆ ڕادەدێرن.

٥)- ﴿ وَإِذْ هُمْ نَجْوَىٰٓ ﴾، هەروەها کاتێك لە نێوان خۆیاندا چپەچپ دەکەن، (**نَجْوَىٰٓ**) واتە: چپەچپکردن، (فسکە فسك کردن، لەبەرخۆوە قسەکردن، بە شێوەیەکی پەنهان و نهێنیی قسەکردن)، (**نَجْوَىٰٓ**) چاوگە، بەڵام لێرەدا وەك ئەوان خۆیان بوونە چاوگی چپەچپ، ئەوەندە بە پەنهانیی قسە دەکەن.

٦)- ﴿ إِذْ يَقُولُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴾، کاتێك کە ستەمکاران دەڵێن، ستەمکاران مەبەست لە کافرەکانە، بەڵام لێرەدا خوا ﷻ لە بری ئەوەی بفەرموێ: (**إِذْ يَقُولُ الكَافِرُونَ**)، فەرموویەتی (**الظالمون**) تاکو بزانرێ ئەوانە وێڕای ئەوەی بێبڕوان، ستەمکاریشن.

٧)- ﴿ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا رَجُلًا مَّسْحُورًا ﴾، واتە: ئێوە تەنها بە دوای پیاوێکی جادوو لێکراو دەکەون، (**مَسْحُوراً: مَطْبُوباً خَبَلَه السِّحْرُ، أَو لَهُ سَحْرٌ وَهُوَ الرِّئة، فلا يَسْتَغْنِ عن الطعامِ والشراب**) واتە: جادوو لێکراوێك، کە جادوو شێتی کردوە، یاخود: خاوەن سی، (**سَحْر**) بە مانای سیپەلاك دێ، یاخود بە مانای هەناو دێ، واتە: ئەویش وەك ئێمە پێویستیی بە خواردن و خواردنەوە هەیە، یانی: بە دوای مرۆڤێکی وەك خۆتان دەکەون.

٨)- ﴿ ٱنظُرْ كَيْفَ ضَرَبُوا۟ لَكَ ٱلْأَمْثَالَ ﴾، تەماشا بکە! چۆن وێنانت بۆ دێننەوە.

هەر چەندە ئەوان یەك وێنەیان هێناوەتەوە، کە گوتوویانە: ﴿ رَجُلًا مَّسْحُورًا ﴾، پیاوێکی جادوو لێکراو، یاخود پیاوێك وەك ئێمە خاوەن سیپەلاك و هەناوە و پێویستیی

بـە خـواردن و خواردنـەوە هەیـە، بـەڵام بۆچـی دەفەرمـوێ: ﴿ضَرَبُوا۟ لَكَ ٱلْأَمْثَالَ﴾؟!، جـارێ ئـەو (ل)ی (لـك)، (للتَعْليـلِ والأَجْـلِ أي: ضربـوا الأمثـال لأَجْلِـكَ)، یـانی: وێنـان لەبـەر تـۆ دەهێننـەوە، بـۆ ئـەوەی وێنـای تـۆ بکـەن و ڕوونـت بکەنـەوە، بـەو شـێوەیەی کـە خۆیـان دەیانـەوێ بتناسـێنن، بـەڵام بۆچـی خـوا ﷻ لێـرەدا دەفەرمـوێ: وێنانـت بـۆ دەهێننـەوە؟ دەڵێیـن: بەڵـێ یـەك وێنەیـە، بـەڵام بۆیـە خـوا ﷻ وا دەفەرمـوێ، چونکـە لـە چەنـدان شـوێنی دیکـەی قورئـان دا، بێبڕوایـان وێنـەی دیکەیـان بـۆ پێغەمبـەر هێناونـەوە، بـۆ وێنـە:

أ - ﴿قَالُوا۟ سَاحِرٌ أَوْ مَجْنُونٌ ۝٥٢﴾ الذاريات، واتە: گوتیان جادوو گەرە یان شێتە.

ب - هەروەها باسیان کردوە کە شاعیر یان کاهینە: ﴿وَمَا هُوَ بِقَوْلِ شَاعِرٍ ۚ قَلِيلًا مَّا تُؤْمِنُونَ ۝٤١ وَلَا بِقَوْلِ كَاهِنٍ ۚ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ ۝٤٢﴾ الحاقة.

کەواتـە: کـە دەفەرمـوێ: ﴿ضَرَبُوا۟ لَكَ ٱلْأَمْثَالَ﴾، بەڵـێ لێـرەدا تەنیـا وێنەیەکیـان بـۆ هێناوەتـەوە، بـەڵام لـە شـوێنانی دیکـەش وێنـەی دیکەیـان بـۆ هێناونـەوە، بۆیـە خـوای زانـاو شـارەزا لێـرەدا کـە قسـە لـە بـارەی پێغەمبـەرەوە ﷺ دەکات، مەبەسـتی هەمـوو شـوێنەکانی دیکەشـە، یـانی: ئـاوا بـەو شـێوەیە وێنـەت بـۆ دەهێننـەوە، جارێـك وا دەڵێـن، جارێـکی دیکـە وا دەڵێـن، چونکـە ئـەو قسـانەیان هەمـوو پێکـەوە نەکـردوون، لەبـەر ئـەوەی: ئەگـەر بڵێـن: جـادوو لێکـراوە، نابـێ بڵێـن: جادووگـەرە! هەروەهـا ئەگـەر بڵێـن: شـێتە، نابـێ بڵێـن: شـاعیرە و، ئەگـەر بڵێـن شـاعیرە، نابـێ بڵێـن: کاهینـە! بـەڵام هەرجـارە، قسـەیەکیان کـردوە، هەرجـارە، تەماشـایان کـردوە: بزانـن ئـەو خەڵکـە بەچـی چەواشـە دەبێـت و هەڵدەخەڵەتـێ، چ قسـەو تۆمەتێـك لـە عەقڵـی وان دا باشـتر جێـی دەبێتـەوە، ئەوەیـان بەکارهێنـاوە، ئەگەرنـا زانیویانـە پێغەمبـەر ﷺ هیـچ کام لـەم وەسـفانەی شایسـتە نیـن، کـە ئـەوان بـۆی بەکاردێنـن.

٩)- ﴿فَضَلُّوا۟﴾، لە ئەنجامی ئەو بیرکردنەوەی خۆیان دا، ئەوان گومڕا بوون و، ڕێیان ون کرد، (ضَلَّ) واتە: ون بوو، (ضَلَّ عَنِ الطريق)، واتە: لە ڕێیەکە ون بوو، بەڵام (ضَلَّ الطريق) واتە: ڕێیەکەی ون کرد، کەواتە کرداری: (ضلَّ) هەم بە (لازِم) دێ، واتە: پێویستی بە بەرکار ناکات، وەك: (ضَلَّ البَعيرُ)، واتە: حوشترەکە ون بوو، هەم بەشێوەی (مُتَعَدِّي)یش دێ، واتە: پێویست بەبەرکار دەکات، (ضلَّ البعيرَ)، واتە: پیاوەکە وشترەکەی ونکرد، کەواتە: (ضلّ)، هەم بە مانای ون بوو، دێ، هەم بە مانای شتەکەی ون کرد، دێ، ﴿فَضَلُّوا۟﴾، ئنجا لێرەدا: هەردووکیان دەگرێتەوە: أ - لە ڕێیەکە ون بوون. ب - ڕێیەکەیان ونکرد.

١٠)- ﴿فَلَا يَسْتَطِيعُونَ سَبِيلًا﴾، دەستیان لە ڕێ گیر نابێ، واتە: ناتوانن ڕێ پەیدابکەن و، ڕێ دەرناکەن بەرەو ڕاستە شەقام، یاخود ڕێ دەرناکەن بۆ ئەوەی لەو ناکۆکییەی لە قسەکانیان دایە، دەرباز بن، چونکە قسەکانیان دژیەکی (تناقض)یان تێدایە.

## مەسەلەی شەشەم و کۆتایی:

**کافرەکان گوتیان: ئایا ئەگەر بووینەوە ئێسك و پرووسکی ورد، جارێکی دیکە لە نوێ دروست دەکرێینەوە؟! بڵێ: حەز دەکەن ببنە بەرد یان ئاسن، یان دروستکراوێك کە لە سینەتاندا: گەورەیەو قورسە ژیانی بێتەوە بەر، ئنجا دەڵێن: کێ دەمانگێڕێتەوە؟ بڵێ: ئەوە کەسەی یەکەمجار بە دیهێناون، ئنجا بەسەر لەقاندنیانەوە دەڵێن: ئەوە کەیە؟ بڵێ: ڕەنگە نیزیك بێ، ئەو ڕۆژەی بانگتان دەکات، بە ستایشکردنیەوە وەڵامی دەدەنەوەو، پێتان وا دەبێ کەمێك نەبێ نەماونەوە لە دنیادا:**

خوای بەرز و مەزن دەفەرموێ: ﴿وَقَالُوٓاْ أَءِذَا كُنَّا عِظَٰمٗا وَرُفَٰتًا أَءِنَّا لَمَبۡعُوثُونَ خَلۡقٗا جَدِيدٗا ﴿٤٩﴾ قُلۡ كُونُواْ حِجَارَةً أَوۡ حَدِيدًا ﴿٥٠﴾ أَوۡ خَلۡقٗا مِّمَّا يَكۡبُرُ فِي صُدُورِكُمۡۚ فَسَيَقُولُونَ مَن يُعِيدُنَاۖ قُلِ ٱلَّذِي فَطَرَكُمۡ أَوَّلَ مَرَّةٖۚ فَسَيُنۡغِضُونَ إِلَيۡكَ رُءُوسَهُمۡ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هُوَۖ قُلۡ عَسَىٰٓ أَن يَكُونَ قَرِيبٗا ﴿٥١﴾ يَوۡمَ يَدۡعُوكُمۡ فَتَسۡتَجِيبُونَ بِحَمۡدِهِۦ وَتَظُنُّونَ إِن لَّبِثۡتُمۡ إِلَّا قَلِيلٗا ﴿٥٢﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە یازدە بڕگەدا:

١)- ﴿وَقَالُوٓاْ أَءِذَا كُنَّا عِظَٰمٗا وَرُفَٰتًا﴾، بێبڕوایەکان گوتیان: ئایا ئەگەر بووینە ئێسقان و شتێکی وردو خاشکراو، واتە: هەر ماینەوە پەیکەری ئێسقان، یان ئێسقانەکەش وردو خاش بوو، پڕتووکاو بوو، لەگەڵ گڵ و خۆڵ تێکەڵ بوو، (العِظَام) کۆیە، تاکەکەی (العَظْم)ە، واتە: ئێسقان، (**الرُّفَات: الأَشْيَاءُ المرفُوتَة، أي: المُفَتَّتَة**)، (**رُفات**) ئەو شتانەن کە وردو خاشکراون، پڕتووکێنراون، (**رَفَتَ الشَّيءَ: كَسَرَهُ كَسْراً دَقِيْقَاً، الدُّقَاقُ والحُطَامُ والجُذَاد**) واتە: زۆر چاك وردی کرد ورد و خاشی کرد، (**دُقاق**) شتێکە کرابێ بە ئارد، (**حُطام**)یش شتێکە وردو خاش کرابێ، (**جُذاذ**)یش بە هەمان شێوە، هەموو وشانە کە لەسەر ئەو کێشە هاتوون، بۆ شتێك هاتوون کە وردوخاش کرابێ، ئنجا بەرد بێ، شووشە بێ شکێنرابێ، یاخود شتێك هاڕدرا بێ و، کرابێ بە ئارد.

٢)- ﴿أَءِنَّا لَمَبۡعُوثُونَ خَلۡقٗا جَدِيدٗا ﴿٤٩﴾﴾، ئایا دوای ئەوەی دەبینە ئێسقان و، گڵ و خۆڵ و، ورد و خاش دەبین، ئێمە بە دروستکردنێکی تازە، زیندوو دەکرێینەوە؟! **البَعْثُ: الإِحْيَاءُ، وَالخَلْقُ مَصْدَر بِمَعنَى المفْعولِ، وَلِكَونِهِ مَصْدَراً، لَمْ يَتْبَعْ مَوصُوفَهُ فِي الجَمْع**)، (**بَعْث**) واتە: زیندوو کرانەوە،

بەڵام (**خلق**) چاوگە بە مانای (**مفعول**)ە {یانی: (**مخلوق**) دروستکراو} ئنجا لەبەرئەوەی (**خلق**) چاوگە، بۆیە لە کۆکردنەوەدا بە دوای (موصوف)ەکەی نەکەوتوە {کە (**مبعوثون**)ە}، چونکە (**خلْق**) چاوگە، پێویست بە کۆکردنەوە ناکات و چاوگ (**مصدر**) خۆی مانای کۆ (**جمع**) دەگەیەنێ.

٣)- ﴿ قُلْ كُونُواْ حِجَارَةً أَوْ حَدِيدًا ﴾، پێیان بفەرموو: ببنە بەرد، یان ببنە ئاسن! (**كونوا: مُسْتَعْمَلَةٌ فِي مَعْنَى التسوية**) (**كونوا**) بە مانای یەکسان بوون بەکارهاتوە، واتە: یەکسانە بەرد بن، یان ئاسن بن! (**أو مُسْتَعْمَلَةٌ فِي الفَرْضِ**) واتە: گریمان بەرد بن، یاخود ئاسن بن، کە ماناکەیان زۆر لەیەك نیزیکن: یەکسانە، گریمان: وابن یان وابن.

٤)- ﴿ أَوْ خَلْقًا مِّمَّا يَكْبُرُ فِي صُدُورِكُمْ ﴾، یان دروستکراوێك بن لەوەی کە لە سینەتاندا گەورەیە، لە دڵ و عەقڵتان گەورەیە، کە ناگونجێ زیندوو بکرێتەوە.

(**خَلْقًا**) لێرەش دا چاوگە و بەمانای (**مخلوق**)ە، یانی: دروستکراوێك کە لە عەقڵ و دڵی ئێوەدا زۆر گەورەیە، (**يكبر: يَعْظُم، يَقْوى**)، واتە: مەزنە، بە هێزە، کە ژیانی بێتەوە بەر، (**كُونُوا أَشْيَاءَ أَبْعَدَ عن قبول الحَيَاةِ مِنَ العِظَامِ والرُّفَات**)، واتە: ئەسڵەن ئەگەر ببنە شتێك گەورەتر بێ لە ئێسکی وردو خاشکراو، دوورتر بێ لەوەی کە ژیانی بێتەوە بەر، دیسان خوا هەر ژیانتان دێنێتەوە بەر و زیندووتان دەکاتەوە.

٥)- ﴿ فَسَيَقُولُونَ مَن يُعِيدُنَا ﴾، ئنجا دەڵێن: کێ دەمانگێڕێتەوە و زیندوومان دەکاتەوە؟! ئەم (**ف**)ە (**تَفْرِيعٌ عَلَى جُمْلَةِ: قُلْ كُونُوا**)، پێشێ کە دەفەرموێ: بڵێ: ببنە بەرد، یان ئاسن، یان هەر دروستکراوێك کە لە سینەتان گەورەترە، لەوەی گیانی بێتەوە بەر، ئەوانیش لە ئەنجامی ئەوەدا دەڵێن: کێ زیندوومان دەکاتەوە و دەمانگێڕێتەوە؟! کەواتە: قسەکەی وان لق و دەرهاویشتەی ڕستەی پێشەوەیە.

٦)- ﴿ قُلِ ٱلَّذِى فَطَرَكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ ﴾، بڵێ: ئەو کەسەی کە یەکەمجار ئێوەی هێنایە دی، (**الفَطْرُ: الإِبْتِدَاءُ وَالإِخْتِرَاع**)، وشەی (**فَطْر**) بە مانای شەقکردن دێ، شەق کردنی نێوان بوون و نەبوون، لێرەدا (**فَطْر**) یانی: شتێك کە لە سەرەتاوە دەست پێ بکرێ و دابهێنرێ و پێشینەی نەبووبێ، واتە: وەك چۆن یەکەمجار خوا ئێوەی هێناوەتە دی، کە هیچ نەبوون، ئێستا دوای ئەوە شتێك بوون، بەڵام لە بەین دەچن، دەتوانێ ئاسانتر دووبارەتان بکاتەوە، وەك گوتم: ئەم وێنا کردنەش بۆ عەقڵی ئێمەیە، ئێمە شتێك کە لەسەرەتاوە دروستی دەکەین، بە زەحمەتتر بۆمان دروست دەبێ و، دەیهێنینە بوون، بۆ وێنە: شتێك دەنووسی، خانوویەك دروست دەکەی، بەڵام دوای ئەوەی کە دروستی دەکەی،

ئەگەر لێت تێك بچێ، ئاسانتر دەتوانی دووبارەی بکەیەوە بۆ ئێمە وایە، ئەگەرنا بەنسبەت خوای پەروەردگارەوە هەموو حاڵەتەکان یەکسانن.

٧)- ﴿ فَسَيُنْغِضُونَ إِلَيْكَ رُءُوسَهُمْ ﴾، ئێمە پێشتر باسی (**نَغَضَ**)ەمان کرد، کە بەمانای (**حَرَّكَ**) دێ، (**نَغَضَ رَأْسُهُ**)، واتە: سەری جووڵا و ڕاوەشا، بەڵام (**أَنْغَضَ رأْسَهُ**)، واتە: سەری خۆی جووڵاند و لەقاند و ڕاوەشاند، ئنجا: (**ينغضون إليك رؤسهم**) واتە: سەریان بەرەو تۆ دەلەقێنن و دەجووڵێنن، نزمی دەکەنەوەو بەرزی دەکەنەوە، یاخود بەلای ڕاست و چەپ دا، هەرچەند تەفسیرەکان وایان نەگوتوە، بەڵام وەك پێشتر گوتم: ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ کلتووری کۆمەڵگا و گەلان، جووڵەی سەر، یان جووڵەی چاوو دەست، ئەوانە پەیوەندییان بە کلتووری گەل و میللەتانەوە هەیە، سەریان بەرەو تۆ دەلەقێنن، یانی: وەك گاڵتە پێکردن، یاخود وەك سەرسوڕمان دەربڕین.

٨)- ﴿ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هُوَ ﴾، دەڵێن: ئەوە کەی دێ، ئەو زیندوو کردنەوە و ژیاندنەوە و گێڕاندنەوەیە؟! ئەم ڕاناو (**هو**) (**الضَّميرُ عَائِدٌ إلى العَوْدِ المأخُوذِ مِنْ قَوْلِهِ: يُعيدنَا**)، واتە: (**مَتَىٰ هُوَ أي: مَتَّى هَذَا العَوْد**) ئەم گەڕانەوە و گێڕانەوەیە کەیە؟!

٩)- ﴿ قُلْ عَسَىٰ أَن يَكُونَ قَرِيبًا ﴾، بڵێ: ڕەنگە، لەوانەیە نیزیك بێ، (**عَسَى للرجَاءِ عَلَى لِسَان الرَّسُولِ أي: لا يَبعدُ أَنْ يَكُونَ قَرِيْبَاً**) ئەوە لەسەر زمانی پێغەمبەر ﷺ وا دەفەرموێ: تۆ بڵێ: ڕەنگە نزیك بێ، بۆیە وا دەفەرموێ، چونکە پێغەمبەر ﷺ کاتەکە نازانێ، ئەگەر نا، خوا نافەرموێ: ڕەنگە، لەوانەیە، ڕێی تێدەچێ، ئەو شتانە بۆ خوا ناگونجێن، بەڵام پێغەمبەر ﷺ دڵنیایە کە قیامەت دێت، بەس نازانێ کەنگێ دێ؟ بۆیە دەفەرموێ: ڕەنگە، لەوانەیە، نزیك بێت.

١٠)- ﴿ يَوْمَ يَدْعُوكُمْ فَتَسْتَجِيبُونَ بِحَمْدِهِ ﴾، ئەو ڕۆژەی بانگتان دەکات، ئێوەش بە ستایشکردنەوە وەڵامی خوا دەدەنەوە، واتە: خوا بانگتان دەکات زیندوو ببنەوە، ئێوەش یەکسەر زیندوو دەبنەوە، یاخود بانگتان دەکات: فڵان و فڵان (لەسەر زمانی فریشتەکان)، ئێوەش دەڵێن: (**لبَّيك**) بەڵێ لە خزمەتداین، یەکسەر بانگکران و زیندوو کردنەوەتان یەك دەبێ و، بە ستایشکردنی خواوە، وەڵامی خوا دەدەنەوە، لێرەدا (**دعاء**) دەگونجێ مەبەست لێی بانگکردنی ڕاستەقینە بێ، یاخود مەبەست پێی فەرمانی: تەکوینیی و قەدەریی خوا بێ، واتە: دروستتان دەکاتەوە.

١١)- ﴿ وَتَظُنُّونَ إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا قَلِيلًا ﴾، واتە: ئەو کاتەش پێتان وادەبێ، کەمێك نەبێ نەماونەوە، واتە: ماوەیەکی کەم نەبێ، نەماونەوە لە ژیانی دنیادا، یاخود لە ژیانی بەرزەخدا، یاخود لە هەردووکیان دا، چونکە هەم ژیانی دنیا، هەم ژیانی قۆناغی بەرزەخ، واتە: دوای مەرگ و مردن،

ئەگەر بەراورد بکرێ لەگەڵ ڕۆژی دوایی دا، ماوەیەکی کەم دێتە بەر چاو، بۆیە دەفەرموێ: ئەوکاتە پێتان وادەبێ کە کەمێك ماونەتەوە، ئەم ڕاستییەش لە زۆرێك لە ئایەتەکانی دیکەی قورئاندا، خوا خستوویەتە ڕوو، کە لە ڕۆژی دوایی دا، مرۆڤەکان کە ژیانی دنیا بەراورد دەکەن بە دوارۆژ، دەڵێن: ﴿ لَمْ يَلْبَثُوٓا۟ إِلَّا عَشِيَّةً أَوْ ضُحَىٰهَا ﴿٤٦﴾ ﴾ النازعات، واتە: تەنیا ئێوارەیەك یان چێشتەنگاوێك ماونەوە!

یاخود وەك لە ئایەتەکانی سوورەتی (**طه**) هاتوە، کە هەندێکیان دەڵێن: تەنها دە (١٠) ڕۆژ ماونەوە و، هەندێکیان دەڵێن: تەنها ڕۆژێك ماونەوە!

کەواتە: لێرەدا هەریەکە و مەزندەی ماوەیەکی کەم دەکات و، مەزەندەی هەندێکیان بۆ هەندێکیان جیاوازە، واتە: ژیان و مانەوەی مرۆڤەکان لە دنیاو بەرزەخدا، لەچاو دوارۆژ، ئاوا کەمیان دێتە بەرچاو.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـە هەشـت (٨) ئایـەت دەگرێتـە خـۆی، ئایەتەکانـی: (٥٣ - ٦٠)، لـەو هەشـت ئایەتـەدا، خـوای زانـای توانـا ﷻ بـاسی پێنـج بابـەتی جـۆراو جـۆری کـردوە، کە تـەوەری سـەرەکییان ئامۆژگاریـی و بەرچـاو ڕوونیـی خـوای میهرەبانـە بـۆ بەندەکانی، لـە پێش هەموویانـەوە پێغەمبەری خاتـەم ﷺ، بڕوادارانیـش لـە پشـتیەوە و، خەڵکیـش بـە گشـتیی، لـە چەنـد ڕوویەکـەوە:

١- چۆنیەتی قسەکردن و، مامەڵەی بڕواداران لەگەڵ خەڵك و کۆمەڵگادا.

٢- زانایی و پایە بەرزیی و بێ وێنەیی خوا و، بەرزکردنەوەی هەندێك لە پێغەمبەران بەسەر هەندێکیاندا و، باسێکی داوود ﷺ کە خوا (زەبوور)ی پێداوە و، لە خوا پاڕانەوە و هۆکار گرتنەبەری سەرجەم بەندە چاکەکان، لە پێش هەموویانەوە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بۆ لای خوا ﷻ و سام و هەیبەت و ترسیان لە سزا و لێپرسینەوەی خوا.

٣- ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە هیچ ئاوەدانییەك نیە، پێش ئەوەی قیامەت بێ، خوا لە بەینی نەبات (خەڵکەکەی نەفەوتێنێ)، یاخود سزایەکی سەختی نەدات، لەسەر تاوان و لادەکانیان.

٤- ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە: کە بە هۆی بە درۆدانانی گەلە پێشووەکانەوە، خوا کۆتایی بە ناردنی نیشانە و موعجیزە بەرهەستەکان هێناوە، بۆیە بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ لەو شێوە موعجیزەی نەناردوە، چونکە عادەتی خوا وابووە، هەر قەومێك خوا موعجیزەیەکی بەرهەستی پێبدا و بڕوای پێنەهێنێ، سزای بدات و لە بەینی بەرێ.

٥- خوا دەیخاتەوە بیری پێغەمبەرەکەی ﷺ کە پێی فەرمووە: پەروەردگارت ئابڵووقەی خەڵکی داوە و لە ژێر ڕکێفی ویدان و لە چەنگی قوتار نابن.

هەروەهـا بـاسی ئـەو سـەفەرە سەرسـوڕهێنەرە دەکات، کـە پێـی کـردوە، ئەویـش سـەفەری شـەوڕۆیی و بەرزبوونـەوە بـوو، کـە لـە سەرسـوڕهێنەریی دا، وەك خەونێـك بـووە، کـە بـۆ تاقیکردنـەوەی خەڵـکی بـووە، هەروەهـا درەختـی نەفریـن لێکـراو، کـە لـە قوڕئانـدا باسـکراوە، کـە مەبەسـت پێـی درەختـی (زەققـووم)ە، ئەویـش دیسـان هـەر بـۆ تاقیکردنـەوەی خەڵـك بـووە.

﴿ وَقُل لِّعِبَادِى يَقُولُوا۟ ٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ ۚ إِنَّ ٱلشَّيْطَـٰنَ يَنزَغُ بَيْنَهُمْ ۚ إِنَّ ٱلشَّيْطَـٰنَ كَانَ لِلْإِنسَـٰنِ عَدُوًّا مُّبِينًا (٥٣) رَّبُّكُمْ أَعْلَمُ بِكُمْ ۖ إِن يَشَأْ يَرْحَمْكُمْ أَوْ إِن يَشَأْ يُعَذِّبْكُمْ ۚ وَمَآ أَرْسَلْنَـٰكَ عَلَيْهِمْ وَكِيلًا (٥٤) وَرَبُّكَ أَعْلَمُ بِمَن فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۗ وَلَقَدْ فَضَّلْنَا بَعْضَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ عَلَىٰ بَعْضٍ ۖ وَءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ زَبُورًا (٥٥) قُلِ ٱدْعُوا۟ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُم مِّن دُونِهِۦ فَلَا يَمْلِكُونَ كَشْفَ ٱلضُّرِّ عَنكُمْ وَلَا تَحْوِيلًا (٥٦) أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ يَبْتَغُونَ إِلَىٰ رَبِّهِمُ ٱلْوَسِيلَةَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ وَيَرْجُونَ رَحْمَتَهُۥ وَيَخَافُونَ عَذَابَهُۥٓ ۚ إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ كَانَ مَحْذُورًا (٥٧) وَإِن مِّن قَرْيَةٍ إِلَّا نَحْنُ مُهْلِكُوهَا قَبْلَ يَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ أَوْ مُعَذِّبُوهَا عَذَابًا شَدِيدًا ۚ كَانَ ذَٰلِكَ فِى ٱلْكِتَـٰبِ مَسْطُورًا (٥٨) وَمَا مَنَعَنَآ أَن نُّرْسِلَ بِٱلْـَٔايَـٰتِ إِلَّآ أَن كَذَّبَ بِهَا ٱلْأَوَّلُونَ ۚ وَءَاتَيْنَا ثَمُودَ ٱلنَّاقَةَ مُبْصِرَةً فَظَلَمُوا۟ بِهَا ۚ وَمَا نُرْسِلُ بِٱلْـَٔايَـٰتِ إِلَّا تَخْوِيفًا (٥٩) وَإِذْ قُلْنَا لَكَ إِنَّ رَبَّكَ أَحَاطَ بِٱلنَّاسِ ۚ وَمَا جَعَلْنَا ٱلرُّءْيَا ٱلَّتِىٓ أَرَيْنَـٰكَ إِلَّا فِتْنَةً لِّلنَّاسِ وَٱلشَّجَرَةَ ٱلْمَلْعُونَةَ فِى ٱلْقُرْءَانِ ۚ وَنُخَوِّفُهُمْ فَمَا يَزِيدُهُمْ إِلَّا طُغْيَـٰنًا (٦٠) ﴾.

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

{هەروەهـا (ئـەی موحەممـەد!) بـە بەندەکانـم بڵـێ: کام قسـە باشـترە ئـەوە بڵێـن، چونکـە شـەیتان بەینیـان تێکـدەدات، بـە دڵنیایـی شـەیتان دوژمنێـکی ئاشـکرای مرۆڤـە ﴿٥٣﴾ پەروەردگارتـان پێتـان زاناتـرە، ئەگـەر بیـەوێ ڕەحمتـان پـێ دەکات، یـان ئەگەر بیـەوێ ئازارتان دەدات، تۆشـمان بـە بریـکار نەناردۆتـە سـەریان ﴿٥٤﴾ هەروەهـا پـەروەردگارت زاناتـرە بـەو کەسـانەی لـە ئاسـمانەکان و زەوی دان و، بێگومـان هەندێـك لـە پێغەمبەرانیشـمان بەسـەر هەندێکیانـدا پەسـند و پلـە بەرزتـر کـردوە و، زەبووریشـمان بـە داوود دابـوو ﴿٥٥﴾ بڵـێ لـەو (پەرسـتراو)انە بپاڕێنـەوە کـە پێتـان وایـە جگـە لـە خـوا هـەن، (وشـتێکیان لـە دەسـت دێ)، کـە ناتوانـن نـە زیانتـان لـێ لابـەرن و نـە لێشـتان لا بـدەن ﴿٥٦﴾ ئەوانـەی کـە (کافـرەکان) لێیـان دەپاڕێنـەوە، کامیـان (لـە هەموویـان) لـە خـوا نزیکـترە (لەبـۆ خـوا سـوڵحاوان)، بـەرەو لای پەروەردگاریـان هـۆکار دەگرنەبـەر و، ئومێـدەواری بەزەییەکەینـی و، لـە ئـازارو سـزایەکەی دەترسـێن، بـە دڵنیایـی ئـازار و سـزای پـەروەردگارت مەترسـیلێکراوە ﴿٥٧﴾ هیـچ ئاوەدانییەکیـش نیـە کـە ئێمـە پێـش هاتنـی (ڕۆژی) قیامـەت (خەڵکەکـەی) نەفەوتێنیـن، یـان سـزایەکی تونـدی نەدەیـن (لەسـەر تـاوان و لادانیـان)، ئـەوە لـە کتێبـدا نـووسراوە ﴿٥٨﴾ تەنیـا ئـەوەش ڕێـی لێگرتیـن نیشـانان (موعجیـزە بەرهەسـتەکان بـۆ پێغەمبـەری کۆتایـی و ئۆممەتەکـەی) بنێریـن کـە: (گەلـە) پێشـووەکان بـە درۆیـان دانـان، حوشتریشـمان بـە گـەلی سـەموود دا (نیشـانەیەکی) پـێ بینـەر و بەرچـاو ڕوونکـەرەوە بـوو، کەچـی (ئـەو گەلـە) ستەمکارانە پێـی بێبـڕوا بـوون و، نیشـانەکانیش تەنیـا بـۆ ترسـاندن دەنێریـن [و، هـەر کاتێـك خەڵکەکـە بڕوایـان پـێ نەهێنـان، سـزایان دەدەیـن] ﴿٥٩﴾ یادیـش بکـەوە: کاتێـك پێـمان گـوتی: بـە دڵنیایـی پـەروەردگارت ئابڵووقـەی خەڵـکی داوەو لـە ژێـر ڕکێفـی وی دان، ئـەو دیتنـەی (لە شـەوڕۆدا) پێشانیشـمان دای و، (بـاسی) درەختـی نەفریـن لێکراویـش لـە قورئـان دا، تەنیـا بـۆ تاقیکردنـەوەی خەڵـکی بـوون، هەرچەنـدە لـە سـزای خۆشـمانیان دەترسـێنین، کەچـی هـەر یاخیبوونێـکی گەورەیـان بـۆ زیـاد دەکات﴿٦٠﴾.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(يَنزَغُ بَيْنَهُمْ): واتە: بەینیان تێکدەدا، (**نَزَغَ: أَفْسَدَ وَأَغْرَى وَبَابُهُ قَطَعَ**)، (**نَزَغ**) واتە: تێکی بەردان و بەینی تێکدان، لەسەر کێشی (**فَعَلَ**)یە، (**نَزَغَ، يَنْزَغُ، نَزْغاً، قَطَعَ، يَقْطَعُ، قَطْعاً**)، وشەی (**نَزْغ**) لەگەڵ (**نَخْس**) مانایان لێك نیزیکە، کە بریتیە لەوەی نقورچکە لە شتێك بدەی، یان نەقیزەیەك لە ئاژەڵێك وەژەنی، دیاریشە خوتخوتەو دنەدانی شەیتان، وەك نوقورچکە لێدانی مرۆڤ و نەقیزەلێدانی ئاژەڵ وێنا کراوە.

(زَعَمْتُم): واتە: (**قُلْتُم**) گوتتان، (**وَيُطْلَقُ عَلَى الظَّنِّ، وَأَكْثَرُ مَا يَكُونُ الزَعْمُ فيمَا يُشَكُّ فِيهِ، ولا يَتَحَقَّقُ، وَقَالَ بَعْضُهُم: كِنَايَةٌ عَنِ الكَذِبِ، وَقِيْلَ: زَعَمَ زَعْمَاً: قَالَ خَبَراً لا يُدْرَى أَحَقٌّ هُوَ أَم بَاطِلٌ**).

بۆیە کە وشەی (**زَعَمْتُم**) بە (**قُلْتُم**) گوتتان، لێکدراوەتەوە، ئەوە جێی تێبینییە، چونکە وشەی (**زعم**) بۆ گومان بەکاردێ و، زیاتر بۆ ئەو شتانە بەکاردێ کە جێگای دوو دڵیین و مرۆڤ دڵنیانیە وابن، هەندێکیشیان گوتوویانە: وشەی (**زعم**) کینایەیە بۆ درۆ، (**زَعَمَ زَعْمَاً**) واتە: هەواڵێکی گوت کە نازانین نە ڕاستە نە درۆیە!

کەواتە: وشەی (زَعَمْتُم) واتە: پێتان وابوو، بەڵام پێوابوونەکە بەلای درۆدا نیزیکترە، تاکو بەلای ڕاستییدا.

(تَحْوِيلًا): واتە: لادان، (**حَوَّلتُهُ تَحْوِيْلاً: نَقَلْتُهُ مِنْ مَوْضِعٍ إِلى مَوْضِع**)، (**حَوَّلتُهُ تَحْوِيْلاً**) واتە: لامدا لە لایەکەوە بۆ لایەکی دیکە، ئەمە بە لێتێپەڕ (**مُتَعَدِّي**) هاتوە، واتە: بەرکار (**مفعول به**)، دەخوازێ، بەڵام وەك چۆن بە (**مُتَعَدِّي**) هاتوە (**حَوَّلَهُ**)، بە (**لازم**)یش هاتوە، (**وَحَوَّلَ هُوَ تَحْوِيْلاً**) واتە: ئەو خۆی لاچوو، لایدا لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە.

(ٱلْوَسِيلَةَ): (**الوَسِيْلَةُ: مَا يُتَقَرَّبُ بِهِ إِلى الغَيْرِ، وَالجَمْعُ: الوَسَائِل**)، (**وَسِيْلَة**) واتە: هەر شتێك کە پێی نیزیك ببەوە بۆ لای شتێکی دی، کۆیەکەی (**وَسَائِل**) واتە: هۆکار، هۆکاری لێ نیزیك بوونەوە، خوای بەخشەر وەك لێرە باسی کردوە، لە سوورەتی: (**المائدة**)شدا دەفەرموێ: ﴿وَٱبْتَغُوٓاْ إِلَيْهِ ٱلْوَسِيلَةَ ﴿٣٥﴾﴾، واتە: هۆکار بەرەو خوا بگرنەبەر، لێرەش دەفەرموێ: ﴿يَبْتَغُونَ إِلَىٰ رَبِّهِمُ ٱلْوَسِيلَةَ ﴿٥٧﴾﴾ واتە: هۆکار بەرەو خوا دەگرنەبەر.

(**مَحۡذُورٗا**): واتە: مەترسیلێکراو، (**الحَذرُ: التَحَرُّز**)، واتە: لە خۆ وریا بوون، (**حَذِرْ: يَعْنِي: مُتَحَرِّز والتَحْذِير: التَخْوِيف**)، (**حَذِرْ**) واتە: کەسێك لە خۆی وریایە، (**تحذير**)ش ترساندن و وریا کردنەوەیە.

(**فَظَلَمُواْ بِهَا**): (**ظلموا**) واتە: ستەمیان کرد، پێویستیی بە (**ب**) نیە، بۆ ئەوەی پەڕینەوەی پێ بکات بۆ بەکار (**مفعول به**)، بەڵام لێرە وەك زانایان دەڵێن: (**ضُمِّنَ ظلموا مَعْنى كَفَرُوا**) واتە: (**ظلموا بها**) بەهۆی (ب)وە مانای (**كفروا**)ی خراوەتە نێو، (**فَظَلَمُواْ بِهَا**) واتە: پێی بێبڕوابوون بە شێوەیەکی ستەمکارانە، یاخود ستەمیان لێکردو پێشی بێبڕوابوون.

(**مُبۡصِرَةٗ**): واتە: پێبینەر، یان بەرچاو ڕوونکەرەوە، (**أَبْصَر**) واتە: (**رَأَى**) بینی، بەڵام (**بَصُرَ**) واتە:(**عَلِمَ**) زانین، (**التَبَصُّرُ: التَأَمُّلُ والتَعَرُّف**)، (**تَبَصُّر**) واتە: لێ وردبوونەوە و ناسینەوەی شتێك، (**المبصرة**) واتە: ڕوونکەرەوە، یاخود دەبێتە پێبینەر، (**تَجْعَلُهُم بُصَراء**) واتە: وایان لێدەکات کە ببینن، کە بە دڵنیاییەوە مەبەست لە بینینی عەقڵیی و دەروونییە، واتە: بزانن و پەی پێ بەرن و لەو شتە ئاگادار بن.

(**ٱلرُّءۡيَا**): زیاتر بە مانای خەون بەکاردێ، بەڵام (**الرُّؤيَا: أَشْهَرُ اسْتِعْمَالِهَا فِي رُؤيَا النَّوم، وَتُسْتَعْمَلُ فِي رُؤيَة العَين**) (**رؤيا**) زیاتر واباوە کە بۆ خەون بەکاردێ، بەڵام جاری واش هەیە بە مانای بینینی چاویش (بینینی ئاسایی) بەکاردێ.

(**فِتۡنَةٗ**): (**أي: اختبارا**) واتە: بۆ تاقیکردنەوە، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿وَفَتَنَّٰكَ فُتُونٗاۚ﴾ (٤٠) **طه**، خوا بە مووسا دەفەرموێ: تۆمان بە زۆر جۆر و شێوە تاقیکردەوە.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

١)- هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو دوو ئایەتەی کە دەفەرموون: ﴿ قُلِ ٱدْعُوا۟ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُم مِّن دُونِهِۦ فَلَا يَمْلِكُونَ كَشْفَ ٱلضُّرِّ عَنكُمْ وَلَا تَحْوِيلًا ﴿٥٦﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ يَبْتَغُونَ إِلَىٰ رَبِّهِمُ ٱلْوَسِيلَةَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ وَيَرْجُونَ رَحْمَتَهُۥ وَيَخَافُونَ عَذَابَهُۥٓ ۚ إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ كَانَ مَحْذُورًا ﴿٥٧﴾ ﴾.

لەو بارەوە ئەم فەرموودەیە هەیە:

{عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعودٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: كَانَ نَفَرٌ مِنَ الإِنْسِ يَعْبُدُونَ نَفَراً مِنَ الْجِنِّ، فَأَسْلَمَ النَّفَرُ مِنَ الْجِنِّ، وَاسْتَمْسَكَ الإِنْسُ بِعِبَادَتِهِمْ، فَنَزَلَتْ: ﴿ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ يَبْتَغُونَ إِلَىٰ رَبِّهِمُ ٱلْوَسِيلَةَ ﴾} (أخرجه مسلم: ٣٠٣٠، والبخاري: ٤٧١٤ و ٤٧١٥، بدون تصريح بسبب النزول).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: کۆمەڵێك لە مرۆڤەکان کۆمەڵێك لە جینیان دەپەرست {لە سەردەمی نەفامییدا}، دواتر جینەکان مسوڵمان بوون، کەچی مرۆڤەکان هەر پابەند بوون بە پەرستنەکەی خۆیانەوە، لەو بارەوە خوا ئەم ئایەتەی ناردە خوار: کە ئەوانەی ئێوە پێتان وایە لە بری خوا پەرستراون و لێیان دەپاڕێنەوە، ئا ئەوانە کامەیان لە خوا نیزیکترە، هۆکار بەرەو خوا دەگرێتە بەر و لە خوا دەپاڕێتەوە.

کەواتە: ئەو پەرستراوە گومانلێکراوانەی ئێوە کە جندەکانن، خۆیان مسوڵمان بوون و، دەیانەوێ لە خوا نزیك ببنەوە، کەچی ئێوە هەر دەیانپەرستن!

٢)- هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا مَنَعَنَآ أَن نُّرْسِلَ بِٱلْءَايَٰتِ إِلَّآ أَن كَذَّبَ بِهَا ٱلْأَوَّلُونَ ۚ وَءَاتَيْنَا ثَمُودَ ٱلنَّاقَةَ مُبْصِرَةً فَظَلَمُوا۟ بِهَا ۚ وَمَا نُرْسِلُ بِٱلْءَايَٰتِ إِلَّا تَخْوِيفًا ﴿٥٩﴾ ﴾.

{عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ سَأَلَ أَهْلُ مَكَّةَ رسولَ اللَّه ﷺ أَنْ يَجْعَلَ لَهُمْ الصَّفَا ذَهَبًا، وَأَنْ يُنَحِّيَ الْجِبَالَ عَنْهُمْ، فَيَزْدَرِعُوا، قال اللَّه عَزَّوَجَلَّ: إنْ شِئْتَ آتيناهُم مَا سَأَلُوا، فَإِنْ

**كَفَـرُوا أُهْلِكُـوا كَـمَا أُهْلِـك مَـنْ قَبْلَهُـمْ، وَإِنْ شِـئْتَ نَسْـتَأْنِي بِهُـم، لَعلنَّـا نُنْتِـجُ مِنْهُـم، فَقَـالَ: لا بَـل نَسْـتَأْنِي بهـم، فَأَنْـزَلَ اللَّـهُ هَـذِهِ الآيَـةَ}**[1].

واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی عەببـاس (خـوا لـە خـۆی و بابـی ڕازی بـێ) دەڵـێ: خەڵـکی مەککە لـە پێغەمبـەری خوایـان ﷺ داوا کـرد: کێـوی **(صفا)**یـان بـۆ بکاتـە زێـڕ و، ئـەو چیایانـەی لـە دەوروبـەری مەککـەن و تەنگیـان بـە خەڵـکی مەککـە هەڵچنیـوە، دووریـان بخاتـەوە، تاکـو کشـتوکاڵ بکـەن، خـوا ﷻ فەرمـووی: ئـەی موحەممـەد! ﷺ ئەگـەر دەتـەوێ ئـەوەی کـە داوایـان کـردوە، پێیـان دەدەیـن، بـەڵام ئەگـەر بێبڕوابـوون دەفەوتێنرێـن، وەك چـۆن ئـەو گەلانـەی پێـش وان فەوتێـنراون، {دوای ئـەوەی، ئـەوەی لـە پێغەمبەرەکەیانیـان داوا کـردوە، پێیـان دراوە، کەچـی بڕوایـان نەهێنـاوە، بۆیـە فەوتێـنراون}، ئەگـەر دەشـتەوێ پەلەیـان لێناکەیـن، بەڵکـو ئەگـەر خۆشـیان بـڕوا نەهێنـن، خەڵکێـکی بڕواداریـان لـێ بەرهـەم بێنیـن، پێغەمبـەر ﷺ فەرمـووی: بەڵکـو چـاوەڕێ دەکەیـن و پەلەیـان لـێ ناکەیـن، {بەڵکـو بڕوابێنـن، یـان وەچـەی بڕواداریـان لـێ وە پـاش بکـەوێ} بۆیـە خـوا ﷻ ئـەم ئایەتـەی نـاردە خـوارەوە.



---

١) أخرجـه الطـبراني: ١٢٧٣٦، قـال المنـذري (٤٧/٤)، رواتـه رواة الصحيـح، وقـال الهيثمـي (١٠/١٩٦)، رجالـه رجـال الصحيـح، وأخرجـه أيضًـا: أحمـد: ٢١٦٦، وعبـد بـن حميـد: ٧٠٠، والحاكـم: ١٧٤،: ٣٢٢٥،: ٧٦٠٢، وَقَـالَ فِي الموضـع الأول: صحيـح محفـوظ ، وفِي الثـاني: صحيـح الإسـناد عـلى شرط مسـلم، وفِي الثالـث: صحيـح الإسـناد، ووافقـه الذهبـي فِي الموضعـين الأخيريـن، وقـال مؤلفـا الإسـتيعاب، قلنـا: وهـذا إسـناد صحيـح عـلى شرط الشـيخين ولم يخرجـاه.

## مانای گشتی ئایەتەکان

خوا ﷻ ڕوو دەکاتە پێغەمبەری خاتەم ﷺ و لە پشت ئەویشەوە ڕوو لە بڕواداران دەکات، چ لە ڕۆژگاری خۆیدا، چ وەچەکانیان، چ لە ئێستاداو، تاکو دنیا بە کۆتا دێ، دەفەرموێ: ﴿ وَقُل لِّعِبَادِي يَقُولُوا الَّتِي هِيَ أَحْسَنُ ﴾، بە بەندەکانم بڵێ: با کام قسە باشترە، ئەوە بکەن، واتە: باشترین شێوە بەکاربێنن لە دواندنی خەڵکدا، بە تایبەت لە دواندنی بێبڕوایان دا، بۆچی؟! چونکە ﴿ إِنَّ الشَّيْطَانَ يَنزَغُ بَيْنَهُمْ ﴾، چونکە بێگومان شەیتان بەینیان تێکدەدات، ئنجا ئەگەر ئەوان شێواز و دەربڕینی خراپ بەکاربێنن، ئەوە زەمینەی بەین تێکدان و، ناکۆکیی پەیداکردن، بۆ شەیتان خۆش دەکەن، کەواتە: با خۆیان بپارێزن لە هەر وشە و تەعبیرێکی دڵ بریندارکەر و، هەر قسەیەکی نەگونجاو، کە شایستەی بەندەکانی خوا نەبێ، شایستەی شوێنکەوتووانی پێغەمبەر ﷺ و، شایستەی پەیڕەوانی قورئان نەبێ، ﴿ إِنَّ الشَّيْطَانَ كَانَ لِلْإِنسَانِ عَدُوًّا مُّبِينًا ﴾، بە دڵنیاییەوە شەیتان بۆ مرۆڤ، دوژمنێکی ئاشکرایە، هەمیشە لێی لە بۆسە دایە، خوا خوایەتی بیانوویەکی بکەوێتە دەست و، خاڵێکی بێهێزی لێ بگرێ و، زەفەری پێ بەرێ.

بەڕاستیی ئەمە ئامۆژگاریی و ڕێنماییەکی زۆر گەورە و گرنگی خوای کارزان و شارەزایە، بۆ ئێمەی مسوڵمان، کە مسوڵمانان جگە لە وشە و تەعبیری بە نەزاکەت، جگە لە لێدوان و قسەی ڕێك و پێك، نابێ بە شایستەی خۆیان بزانن، لە حاڵێکدا کە خۆیان بە بەندەی خوا و، پەیڕەوی قورئان و، شوێنکەوتەی پێغەمبەر ﷺ دەزانن.

﴿ رَّبُّكُمْ أَعْلَمُ بِكُمْ ﴾، پەروەردگارتان پێتان زاناترە، یانی: لە خۆتان زاناترە بە ئێوە بە ڕەهایی، ﴿ إِن يَشَأْ يَرْحَمْكُمْ أَوْ إِن يَشَأْ يُعَذِّبْكُمْ ﴾، لێرەدا ڕووی دواندن، مەرج نیە تەنیا لە بڕواداران بێ، ڕووی دواندن لە هەموو ئەوانەیە کە قورئانیان ئاڕاستە کراوە، خوا دەفەرموێ: پەروەردگارتان لە خۆتان پێتان زاناترە، بە ڕەهایی، ئەگەر بیەوێ بەزەییتان لەگەڵ دەنوێنێ، یان ئەگەر بیەوێ سزاتان دەدا، واتە: خوا ﷻ ئەگەر بیەوێ دەتوانێ: بە زۆر واتان لێ بکات ڕێی ڕاست بگرن و سەرەنجام شایستەی ئەوەبن کە خوا بەزەیی پێتان بێتەوە، هەروەها ئەگەر بیەوێ دەتوانێ: واتان لێ بکات، ڕێی چەوت و هەڵە و خراپە بگرنەبەر و، سەرەنجام سزاتان بدات، بەڵام خوا ﷻ نەیویستوە زۆر لە بەندەکانی

بکات، نە بۆ گرتنی ڕێی ڕاست، نە بۆ گرتنی ڕێی چەوت، بەڵکو هەڵبژاردنی داوەتە دەست خۆیان و سەرپشکی کردوون و دەستی ئاوەڵا کردوون، چونکە ئەگەر وانەبێ، تاقیکردنەوە نایەتە دی، ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ عَلَيۡهِمۡ وَكِيلٗا﴾، {ئەی موحەممەد ﷺ} تۆمان بە بریکار نەناردووەتە سەریان، (**وكيل**) لەسەر کێشی (**فعيل**)ە، بە مانای (**مفعول**)، واتە: تۆ بریکارو کار پێ سپێردراو نی، کە لە بری ئێمە ئاگات لێیان بێ، لە جیاتی ئێمە بیانخەیە سەر ڕێی ڕاست و، لە ڕێی چەوت لایان بدەی، تۆ ئەوەت پێ نەسپێردراوە، بەڵکو گەیاندنی پەیامی خوات پێ سپێردراوە.

﴿وَرَبُّكَ أَعۡلَمُ بِمَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۗ﴾، پەروەردگاریشت زاناترە بە هەموو ئەو کەسانەی لە ئاسمانەکان و زەوی دان، واتە: لە ئێوە پێیان زاناترەو، لە خۆیان پێیان زاناترەو، لەهەر کەس کە هەیە خوا پێیان زاناترە، یاخود هەر بە ڕەهایی پێیان زاناترە، وشەی (أعلم) کە بۆ (**تفضيل**)ە، زۆرجار کە لە قورئاندا دێ، بەرانبەرێکی لە ئاستدا ڕەچاو نەکراوە، بەڵکو مەبەست: مانای تەواو و ئەوپەڕی ئەو وشەیەیە، لێرەدا، یانی: بە ڕەهایی خوا زاناترە، بە هەموو ئەو کەسانەی لە ئاسمانەکان و زەویدان، لە خاوەن عەقڵ و هەست و ئیرادەکان، کە فریشتەکان و جینەکان و مرۆڤەکانن، یاخود دروستکراوانی دیکەی خوان، کە ئێمە نایانزانین، ﴿وَلَقَدۡ فَضَّلۡنَا بَعۡضَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ عَلَىٰ بَعۡضٖۖ﴾، بە دڵنیاییەوەش هەندێ لە پێغەمبەرانمان بەسەر هەندێکیاندا هەڵبژاردوون، هەندێکیان پلەی بەرزترمان پێداون و پەسندترمان کردوون، هەموویان پەسندن، بەڵام هەندێکیان پەسندترن، هەموویان پلە بەرزن، بەڵام هەندێکیان پلە بەرزترن، ﴿وَءَاتَيۡنَا دَاوُۥدَ زَبُورٗا﴾، زەبووریشمان بە داوود دابوو، کە لە پەیمانی کۆندا بە زەبوور گوتراوە: (**مزامير داود**)، کە دواتر لە مەسەلە گرنگەکان دا باسی دەکەین.

﴿قُلِ ٱدۡعُواْ ٱلَّذِينَ زَعَمۡتُم مِّن دُونِهِۦ﴾، بڵێ: لەوانە بپاڕێنەوە کە پێتان وایە: جگە لە خوا پەرستراون، جگە لە خوا، شتێکیان لە دەست دێ، ﴿فَلَا يَمۡلِكُونَ كَشۡفَ ٱلضُّرِّ عَنكُمۡ وَلَا تَحۡوِيلًا﴾، بە دڵنیاییەوە نە دەتوانن زیانتان لێ لابەرن و، نە دەشتوانن زیانتان لێ لا بدەن، زیان لێ لابردن ئەوەیە، ئەو زیانە لابەرن و نەیهێڵن، زیان لێ لادانیش ئەوەیە، ئەو زیانە لابدەن بۆ یەکێکی دی، هیچ کامیان لە دەست نایەن.

﴿أُوْلَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ يَبۡتَغُونَ إِلَىٰ رَبِّهِمُ ٱلۡوَسِيلَةَ﴾، ئەوانەی لێیان دەپاڕێنەوە، بەرەو پەروەردگاریان هۆکار دەگرنە بەر (دەخوازن)، هۆکاری لێ نیزیك بوونەوە،

هـۆكاری بەندایەتیـی باشـتركردن، هـۆكاری ڕازییكـردنی خـوا، ﴿ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ ﴾، كامەیـان لـە هەموویـان نیزیكـترە، زیاتـر خەفتانـی هـۆكاری نیزیـك بوونـەوە لـە خـوا دەكا، زیاتـر خەفتانـی هـۆكار گرتنـە بـەر بـۆ بەدەسـتهێنانی ڕەزامەندیـی خـوا، دەكات، ﴿ وَيَرْجُونَ رَحْمَتَهُۥ وَيَخَافُونَ عَذَابَهُۥٓ ﴾، بـە ئومێـدی بەزەیـی خـوان و، لـە سـزا و ئازارەكـەشی دەترسێن، واتـە: ئەوانـەی ئێـوە لێیـان دەپاڕێنـەوە، خۆیـان خەفتـانی ئـەوە دەكـەن و، هـۆكار دەخـوازن بـۆ لـە خـوا نیزیـك بوونـەوە و، ئومێدیـان بـە بەزەیـی خـوا هەیـەو، ترسیشـیان لـە سـزا و ئـازاری خـوا هەیـە، ﴿ إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ كَانَ مَحْذُورًا ﴾، بـە دڵنیایـی سـزا و ئـازاری پـەروەردگارت، مەترسـیلێكراوە.

كەواتـە: كەسـێ خـۆی خەفتـانی ئـەوە دەكات، زیاتـر لـە خـوا نیزیـك بێتـەوە و هـۆكاری خـۆ لـە خـواوە نزیـك خسـتن دەسـتەبەر بـكات، چـۆن دەبـێ چاوەڕوانییەكـت لێـی هەبـێ؟! ئـەو بـۆ خـۆی هیچـی لـە دەسـت نایـەت، بـۆ تـۆی چـۆن لـە دەسـتی دێ؟! وەك گوتـراوە: (**مَنْ لَمْ يَكُن لِنَفْسِهِ، فَكَيْفَ يَكُونُ لِغَيْرِهِ؟**)، كەسـێ بـۆ خـۆی شـتێكی پـێ نەكـرێ، بـۆ جگـە لـە خـۆی چـۆن شـتی پـێ دەكـرێ؟ یاخـود گوتـراوە: (**فَاقِدُ الشَّيْءِ لاَ يُعْطِيهِ**)، كەسێك شـتێكی نەبـێ، ناتوانـێ لێـی ببەخشـێ! ئـەوان خۆیـان پێویسـتییان بـەوە هەیـە، كـە خـوا بەزەیـی پێیـان دابـێ و، لـە سـزا و ئـازاری خـۆی چەپاڵەیـان بـدات و، خۆیـان پێویسـتییان بـەوە هەیـە خـوا لێیـان ڕازی بـێ و، بـە بەنـدەی خـۆی حیسـابیان بـكات و، پەسـندیان بـكات، ئنجـا كـە خۆیـان ئاتاجـن، چـۆن دەتوانـن بـە ئێـوە ببەخشـن؟!

ئنجـا خـوا عـز وجـل دێتە سـەر بـاسی ڕاگەیاندنی ڕاسـتییەكی دیكـە، دەفەرمـوێ: ﴿ وَإِن مِّن قَرْيَةٍ ﴾، لێـرەدا (**إن**) بـە مانـای (**ما**)یـە و (**نافية**)یـە، واتـە: (**مَا مِنْ قَرْيَةٍ**) هیـچ ئاوەدانییـەك نیـە، ﴿ إِلَّا نَحْنُ مُهْلِكُوهَا قَبْلَ يَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ ﴾، مەگـەر ئێمـە فەوتێنەرینـی پێش ڕۆژی هەڵسـانەوە، پێـش ڕۆژی قیامـەت، یانی: خەڵكەكـەی دەفەوتێنیـن، ﴿ مُهْلِكُوهَا ﴾، واتە: (**مُهْلِكُوا أَهْلِهَا**) خەڵكەكـەی دەفەوتێنیـن، نـەك خانووبـەرە و دارودیوارەكانیـان! وشـەی (**قَرْيَة**) واتـە: ئاوەدانیـی گـەورە، شـاری قەرەباڵـغ، كـە لێـرە دەگونجـێ بـە مانـای وڵات بـێ، چونكـە كاتی خـۆی: دەوڵەتۆكـە شـارەكان (**دويلات المدن**) هەبـوون، هـەر شـارێكی گـەورە دەوڵەتێـك بـووە، بەزۆرییـش وابـووە قەڵایـەكی هەبـووە، ئـەو قەڵایـەش شـوورەی بـۆ كـراوە، بـۆ ئـەوەی لـە مەترسـیی دوژمنـان پارێـزراو بـێ، شـوورەكە بورجـی هەبـوون و، پاسـەوان و ئێشـكچی لەسـەر بـوون و، شـارەكەیان پاراسـتوە، ﴿ أَوْ مُعَذِّبُوهَا عَذَابًا شَدِيدًا ﴾، یاخـود ئێمـە سـزا دەرینـی بـە سـزایەكی سـەخت.

واتە: هەر ئاوەدانییەك، یان ئێمە فەوتێنەرینی پێش هاتنی ڕۆژی هەڵسانەوە، یاخود سزادەرینی بە سزایەكی سەخت.

فەوتێنەریانین، واتە: بە شێوەی ئاسایی خۆیان دەمرن، كاتێك كە تەمەنی ئاسایی بەڕێ دەكەن، كۆتاییان پێ دێ، هیچ ئاوەدانییەك نیە كە خەڵكەكەی ئاوایان بەسەر نەیەت، پێش ڕۆژی هەڵسانەوە، یاخود ئەگەر لادان و تاوان و ستەم و خراپە بكەن، پێش مردنی ئاسایی دەیانفەوتێنین، كە بریتیە لە سزادانی خوا بە هۆی بەڵایەكەوە، هەروەك دەڵێن: بەڵای ناگەهانیان بۆ دێ، پێش ئەوەی بەمردنی ئاسایی بمرن، خوا بە مردنێكی نائاسایی بە هۆی بەڵاو غەزەبێكەوە لەنێویان دەبات، ﴿كَانَ ذَٰلِكَ فِى ٱلْكِتَٰبِ مَسْطُورًا﴾، ئا ئەوە لە كتێبدا نووسراوەو تۆمار كراوە، دەگونجێ مەبەست: (لە كتێبدا) كتێبەكانی خوا بێ بەگشتی، هەندێك جاریش (**كتاب**) لە قورئاندا، بەمانای تەورات هاتوە.

دەشگونجێ (**كتاب**) لێرەدا مەبەست پێی زانیاریی ئەزەلیی و بێ سەرەتای خوای پەروەردگار بێ، واتە: ئەوە لە لای خوا تۆمار كراوە و زانراوە، كە ئەو مانایە زیاتر بەلای منەوە پەسندە.

ئنجا هەر بەو بۆنەوە كە خوا ئاوەدانییەكان پێش هاتنی ڕۆژی دوایی، یان بەمردنی ئاسایی خۆیان، یاخود بەمردنی نائاسایی و بەڵا دەفەوتێنێ، دواتر دێتە سەر باسی ناردنی بەڵگە و موعجیزە بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ، كە وەك لە هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەكاندا باسمان كرد، كافرەكان زۆرجار داوایان لە پێغەمبەری خاتەم دەكردو هەڵیان دەپێچا و دەیانگوت:

١- كێویی (**صفا**)مان بۆ بكە بە زێڕ!

٢- ئەو چیایانەمان بۆ دووربخەوە!

٣- ئێرە وڵاتێكی قاقڕ و بێ ئاوو دێمەكارە، ڕووبارمان بۆ بێنە!

٤- گوڵ و گوڵزار و باخ و باخاتمان بۆ بڕەخسێنە، زۆر پێشنیاریان بۆ پێغەمبەر ﷺ دەكردن، یان دەیانگوت: سەركەوە بۆ ئاسمان! یان دەیانگوت: فریشتامان بۆ بێنە! خوا لە وەڵامی ئەو قسە و قاڵانەدا دەفەرموێ: ﴿وَمَا مَنَعَنَآ أَن نُّرْسِلَ بِٱلْءَايَٰتِ إِلَّآ أَن كَذَّبَ بِهَا ٱلْأَوَّلُونَ﴾، هیچ شتێك ڕێی لێ نەگرتین كە نیشانەكان بنێرین، واتە: ئەو موعجیزە بەرهەستانەی كە بۆ پێغەمبەرانی پێشوومان ناردوون، هیچ شتێك ڕێگر نەبووە كە بیاننێرین بۆ پێغەمبەری خاتەمیش ﷺ ﴿إِلَّآ أَن

﴿كَذَّبَ بِهَا ٱلْأَوَّلُونَ﴾، تەنیا ئەوە ڕێی لێگرتین کە: گەلە پێشووەکان بەو موعجیزەو نیشانە بەرهەستانە، بێبڕوا بوون! ئنجا ئەگەر بۆ ئەمانیشمان ناردبان، هەر پێیان بێبڕوا دەبوون.

﴿وَءَاتَيْنَا ثَمُودَ ٱلنَّاقَةَ مُبْصِرَةً﴾، حوشتریشمان بە گەلی سەموددا، کە بەڵگەیەکی بەرچاو ڕوونکەرەوە بوو، یاخود: بەڵگەیەکی ڕۆشن بوو، یاخود بەڵگەیەك بوو، بە هۆیەوە خەڵکەکە دەیانتوانی هەق ببینن و هەقانیەتی پێغەمبەرەکەی خۆیان: کە صالح ﷺ بوو بزانن، کەچی ئەوان: ﴿فَظَلَمُواْ بِهَا﴾، بە هۆیەوە ستەمیان کرد، یاخود واتە: بە هۆی ئەو حوشترەوە کە دەبووایە ڕێی ڕاست بگرن، کەچی تووشی ستەم بوون، چونکە پێی بێبڕوابوون، بە حوشترەکە بێ بڕوا بوون، دوایی دەستدرێژییان کردە سەر وشترەکەو کوشتیان و تووشی ستەم بوون.

یاخود: ﴿فَظَلَمُواْ بِهَا﴾، واتە: پێی بێبڕوا بوون و بە شێوەیەکی ستەمکارانە، بڕوایان پێ نەهێنا! یاخود هەم پێی بێبڕوابوون، هەم ستەمیشیان لێ کرد!.

﴿وَمَا نُرْسِلُ بِٱلْـَٔايَٰتِ إِلَّا تَخْوِيفًا﴾، ئێمە نیشانەکان، تەنیا بۆ ترساندن دەنێرین.

لێرەدا مەبەست لە (آيات) موعجیزە بەرهەستەکانن، نەك ڕستەکانی فەرمایشتی خوا، وشەی (آيات)، دەبێ لە هەر جێیەدا بەپێی سیاقەکەی تەماشای بکەین، چونکە (آية) کە کۆیەکەی (آيات)ە، چوار واتای هەن:

**یەکەم:** ڕستەکانی فەرمایشتی خوا: ﴿وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا ﴿٢﴾﴾ الأنفال.

**دووەم:** موعجیزەی پێغەمبەران (**علیهم الصلاة والسلام**)، ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَىٰ تِسْعَ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ ﴿١٠١﴾﴾ الإسراء، کە بە دڵنیایی مەبەستی ئەو موعجیزانەن، کە خوا بە مووسای ﷺ دابوون.

**سێیەم:** دیاردە سروشتییەکان، کە هەر کامیان نیشانەیە لەسەر بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگارێتیی خوا، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿وَكَأَيِّن مِّنْ ءَايَةٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ يَمُرُّونَ عَلَيْهَا وَهُمْ عَنْهَا مُعْرِضُونَ ﴿١٠٥﴾﴾ یوسف، زۆر نیشانە هەن لە ئاسمانەکان و زەویدا، (بێبڕوایەکان) بەلایاندا ڕەت دەبن، کەچی پشتیان تێدەکەن.

**چوارەم:** بەڵاو موسیبەتە گەورەکان، کە خوا بۆ فەوتاندنی گەلە کافرەکان ناردوونی، یاخود بۆ سەرخستنی ئیمانداران ناردوونی.

کەواتە: دەبێ بە پێی سیاقەکە، چەمك و واتایەکەی دیاریی بکەین، لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا نُرْسِلُ بِٱلْآيَٰتِ إِلَّا تَخْوِيفًا ٥٩﴾، نیشانەکان نانێرین مەگەر بۆ ترساندن، واتە: موعجیزەکان نادەینە پێغەمبەران ، مەگەر بۆ ئەوەی خەڵکەکەی خۆیانیان پێ بترسێنن، کە ئەگەر دوای ئەو موعجیزەیە هەر بڕوا نەهێنن، کە لەسەر داوای خۆیان نێردراوە، ئەو کاتە دەبێ بزانن کە لە بەین دەبرێن و سزا دەدرێن.

واتە: ئێمە نەمانویست ئەو کۆمەڵگایەی کە پێغەمبەری خاتەم ﷺ بۆی نێراوە، کە لەپێشدا مەککە و ئاوەدانییەکانی دەوروبەرنی، لە دورگەی عەرەبییدا و، دواتریش هەموو مرۆڤایەتییە، خوا نەیویستوە کە موعجیزەیەك بۆ پێغەمبەر موحەممەد ﷺ بنێرێ، کە دوایی ئەگەر خەڵکەکە بڕوایان پێ نەهێنا، لە بەینیان بەرێ و سزایان بدات! چونکە خوا عادەتی وایە: ئەو موعجیزانە بنێرێ بۆ ترساندن، ترساندنیش یانی: ئەگەر بڕوا نەهێنن دوای هاتنی ئەو بەڵگەو نیشانەیە، لە بەین دەبرێن، ئنجا لەبەرئەوەی کە ئۆممەتی موحەممەد ﷺ کۆتا ئاڵقەی بەشەرە لەسەر زەوی، ئەگەر خوا موعجیزەیەکی وای ناردبایە، کە دوایی ئەگەر بڕوایان نەهێنابایە، دەبووایە لە بەین ببرێن و ئەوانیش لە بەین برابان، ئەو کاتە مرۆڤایەتیی کۆتایی پێ دەهات، بۆیە خوا موعجیزەیەکی ناردوە، کە ئەگەر بڕواشی پێ نەهێنن، خوا لە بەینیان نەبات، بەڵکو سزایەکەیان هەڵبگرێ بۆ قیامەت، کە ئەو موعجیزەیەش بریتیە لە قورئان، کە موعجیزەیەکی فیکریی و عەقڵیی و ئەدەبییە و، لەبری ئەوەی هەستەوەرەکانی مرۆڤ بدوێنێ، وەك لە قۆناغە سەرەتاییەکاندا، موعجیزەکانی خوا بۆ پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بەو شێوەیە بوون: عەقڵ و هۆشی مرۆڤ دەدوێنێ، لەبەر ئەوەی مرۆڤایەتیی، دوای هاتنی پێغەمبەری خاتەم ﷺ، گەیشتووەتە قۆناغی کامڵ بوون و پێگەیشتن.

لە کۆتاییی دا خوا دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قُلْنَا لَكَ إِنَّ رَبَّكَ أَحَاطَ بِٱلنَّاسِ﴾، یاد بکەوە! کاتێك پێمان گوتی: بە دڵنیاییەوە پەروەردگارت ئابڵووقەی خەڵکی داوە، واتە: هەموو مرۆڤەکان لەبەر دەست و ڕکێفی وی دان، ئەو هەقیقەت و ڕاستییەت هەمیشە لەبەرچاو بێ، کە ئەوانە هەرچەند کەللەڕەق بن، هەرچەند خراپەکار بن، بەڵام دواجار هەر لە ژێر ڕکێف و کۆنترۆڵی خوادان، لە چەنگی دەستەڵاتی خوا قوتار نابن، دڵنیابە تۆش پشتت بە هێزێکی بێ سنوور بەستوە، کە هێزی خوای پەروەردگارە.

﴿ وَمَا جَعَلْنَا ٱلرُّءْيَا ٱلَّتِيٓ أَرَيْنَٰكَ إِلَّا فِتْنَةً لِّلنَّاسِ وَٱلشَّجَرَةَ ٱلْمَلْعُونَةَ فِي ٱلْقُرْءَانِ ﴾، ئەو دیتنەی کە پێشانمان دای، هەروەها درەختە نەفرین لێکراوەکە لە قورئاندا، ئەوەشمان تەنیا بۆ تاقیکردنەوەی خەڵك خستۆتە ڕوو، واتە: هەم دیتنەکەمان کە پێشان دای، هەم باسی درەختە نەفرین لێکراوەکە لە قورئاندا، ئەوەش هەر بۆ تاقیکردنەوەی خەڵك، بوو.

دیتنەکە کە لێرە خوا بە وشەی: ﴿ ٱلرُّءْيَا ﴾، هێناویەتی، کە زیاتر بە مانای (خەون) دێ، ئەوەی کە مرۆڤ لە کاتی خەوتن دا دەیبینێ، بەڵام جارجار بە مانای دیتنیش دێ، بۆیە لێرە زانایان دەڵێن: بۆیە خوا بە وشەی: ﴿ ٱلرُّءْيَا ﴾، هێناویەتی، مەبەست پێی سەفەری شەوڕۆیی و بەرزبوونەوەی پێغەمبەرە ﷺ، وەك لە دەرسی یەکەمی ئەم تەفسیرەدا باسمانکرد، لە تەفسیری ئایەتی یەکەم دا: ﴿ سُبْحَٰنَ ٱلَّذِيٓ أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِۦ لَيْلًا مِّنَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ إِلَى ٱلْمَسْجِدِ ٱلْأَقْصَا ٱلَّذِي بَٰرَكْنَا حَوْلَهُۥ لِنُرِيَهُۥ مِنْ ءَايَٰتِنَآ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ١ ﴾.

ئنجا زانایان دەڵێن: بۆیە وشەی ﴿ ٱلرُّءْيَا ﴾، هاتوە، چونکە ئەو سەفەرە هێندە سەرسوڕهێنەرو دەستەوسانکەر بووە، هێندە یاسادڕ و نائاسایی بووە، وەك خەونێك بووە، بەڵام خەون نەبووەو حەقیقەت بووە و لە حاڵەتی بێداریی دابووە و (وەك پێشتر باسمان کرد)، بەجەستەو بەڕووح بووە، بەڵام ئەوەندە سەرسوڕهێنەر بووە و، ئەوەندە لە حاڵەتی ئاسایی مرۆڤەکان بەدەر بووە، وەك خەون هاتۆتە بەر چاو.

﴿ وَنُخَوِّفُهُمْ فَمَا يَزِيدُهُمْ إِلَّا طُغْيَٰنًا كَبِيرًا ﴾، ئێمە هەر دەیانترسێنین و هەڕەشەیان لێ دەکەین و، وریایان دەکەینەوە و، ئاگاداریان دەکەینەوە، کەچی ئەو ترساندن و وریاکرنەوە و هەڕەشە لێکردنە، هەر سەرکێشییەکی گەورەیان تێدا زیاد دەکات، لەجیاتی ئەوەی چاو بەخۆیاندا بگێڕنەوە، بەڵام هەر زیاتر سواری سەری خۆیان بوون و، ئەسپی سەرشێتی گومڕایی هەڵیگرتوون، هەڵوەستە ناکەن و، چاو بە خۆیاندا ناگێڕنەوە و، لەسەر بێبڕوایی خۆیان هەر بەردەوامن.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

فەرمانکردنی خوا ﷻ بە پێغەمبەر ﷺ، کە بە بەندەکانی بڵێ: بە باشترین شێوە لەگەڵ خەڵکدا بدوێن، چونکە شەیتان کە دوژمنێکی ئاشکرای مرۆڤەکانە، هەرخەریکی نێوان تێکدانیانە و، ئەگەر ئەوان وشە و تەعبیری نارێك بەکاربێنن، ئەو کاتە شەیتان بواری زیاتری بۆ دەڕەخسێ بۆ بەین تێکدانیان، پاشان خوا پێیان ڕادەگەیەنێ کە لە خۆیان زیاتر پێیان زاناتر و ئاگادارترە و، ڕەحم پێکردن و سزادانیان تەنیا مافی خۆیەتی و هیچ کەس بریکاری خوا نیە لەو بارەوە و، هەرخۆشی زاناترە بە هەر کەس کە لە گەردوون دایە و، هەندێ لە پێغەمبەرانی بەسەر هەندێکیان پەسند کردوە و، زەبووریشی وەك کتێب و بەرنامەیەك بە داوود داوە:

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَقُل لِّعِبَادِى يَقُولُوا۟ ٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ ۚ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ يَنزَغُ بَيْنَهُمْ ۚ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ كَانَ لِلْإِنسَٰنِ عَدُوًّا مُّبِينًا ﴿٥٣﴾ رَّبُّكُمْ أَعْلَمُ بِكُمْ ۖ إِن يَشَأْ يَرْحَمْكُمْ أَوْ إِن يَشَأْ يُعَذِّبْكُمْ ۚ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ عَلَيْهِمْ وَكِيلًا ﴿٥٤﴾ وَرَبُّكَ أَعْلَمُ بِمَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۗ وَلَقَدْ فَضَّلْنَا بَعْضَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ عَلَىٰ بَعْضٍ ۖ وَءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ زَبُورًا ﴿٥٥﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ بڕگەدا:

١)- ﴿ وَقُل لِّعِبَادِى يَقُولُوا۟ ٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ ﴾، هەروەها بە بەندەکانم بڵێ: با ئەوە بڵێن کە باشترینە، با ئەو وشەیە بڵێن و، ئەو شێوازە بەکاربێنن و، ئەو جۆرە دەربڕینە ڕەچاو بکەن، کە باشترینە.

(الّتي: صِفَةٌ لِمَوصُوفٍ مَحْذوف) واتە: ئەم (التي)یە سیفەتە بۆ وەسفکراوێك کە قرتێنراوە و بە سیاق و سەلیقە دیارە، واتە: با ئەو وشەو تەعبیر و شێوازانەی کە باشترینن، بەکار بێنن.

یاخود: ﴿يَقُولُوا۟ ٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ﴾، (أَي: يَقُولـوا الكَيْفِيَّةَ الَّتِـي هِـيَ بَالِغَـةٌ فِي الحسـن)، بـا ئـەو چۆنیەتییـە لـە قسـەکردن دا ڕەچـاو بکـەن، کـە گەیشـتۆتە ئـەو پـەڕی لـە چاکیـی دا، ئنجـا بـۆ پاسـاودانی ئـەوەی کـە بۆچـی دەبـێ بەنـدەکانی خـوا بەگشـتی، بـە باشـترین شـێوە قسـە بکـەن لەگـەڵ یەکـدی دا، یاخـود: بەنـدەکانی خـوا، یـانی: ئەوانـەی بـە ویسـتی ئازادانـەی خۆیـان بەندایەتیـی بـۆ خـوا دەکـەن، واتـە: بـڕواداران، باشـترین شـێوە بەکاربێنـن؟ لـە بڕگـەی داهاتـوودا ڕوونی دەکاتـەوە:

٢)- ﴿إِنَّ ٱلشَّيْطَـٰنَ يَنزَغُ بَيْنَهُمْ﴾، چونكە: بەدڵنیایی شەیتان بەینیان تێك دەدات، (النَّزْغُ): الطَّعْنُ السَّرِيعُ، وَالإِفْسَادُ السَّرِيع)، وشەی (نَزْغ) كە ماناكەی لە (نَخْس)ەوە نزیكە، بە مانای تێوەژەنینی خێرا، یاخود بەین تێكدانی خێرا دێ، كە لە ئەسڵدا (نَزْغ) بریتیە لەوەی كەسێك نەقیزە لە وڵاخێكەوە بژەنێ، یاخود قەمچییەكی لێبدات بۆ ئەوەی بڕوا، یان كەسێك نقورچێك لە كەسێك دەدات، بۆ ئەوەی بێداری بكاتەوە، ئنجا خوتخوتەو دنەدانی شەیتان، بەو نوقورچكە و لێ هەڵقورنجین و، نەقیزە لێدانی مرۆڤ بۆ وڵاخ، وێناكراوە.

٣)- ﴿إِنَّ ٱلشَّيْطَـٰنَ كَانَ لِلْإِنسَـٰنِ عَدُوًّا مُّبِينًا﴾، بە دڵنیایی شەیتان بۆ مرۆڤ دوژمنێكی ئاشكرایە، ئنجا ئەو دوژمنە ئاشكرایە، لەمیانی وشەو تەعبیری خراپدا، بەینی مرۆڤەكان تێكدەدات، تۆ ئەگەر وشەو تەعبیری خراپ بەكارنەهێنی، بەرانبەرەكەت دڵی بریندار نابێ، هەستی ناڕووشێ و باشتر گوێت بۆ دەگرێ، بە تایبەت بۆ ئیمانداران، پێویستە لەو ئاستە بەرزەدابن، كە شایستەی خوا ﷻ یەو، شایستەی قورئانە و، شایستەی پێغەمبەرە و، شایستەی ئیسلامە.

٤)- ﴿رَّبُّكُمْ أَعْلَمُ بِكُمْ ۖ إِن يَشَأْ يَرْحَمْكُمْ﴾، پەروەردگارتان پێتان زاناترە، ئەگەر بیەوێ بەزەییتان لەگەڵ دەنوێنێ، واتە: ئەگەر بیەوێ: دەتانخاتە سەر ڕاستە ڕێ و، شایستەی بەزەیی خوا دەبن.

٥)- ﴿أَوْ إِن يَشَأْ يُعَذِّبْكُمْ﴾، یان ئەگەر بیەوێ: سزاتان دەدات، واتە: ئەگەر بیەوێ گومڕاتان دەكات و، سەرەنجام شایستەی ئازار و ئەشكەنجەی خوا دەبن، واتە: ئەگەر بیەوێ واتان لێ بكات، دەتوانێ، بەڵام خوا نەیویستوە بە زۆر، نە كەس وا لێ بكات، شایستەی بەزەییەكەی بێ، نە كەسیش وا لێ بكات، شایستەی سزایەكەی بێ، كە بە هۆی ئیمان و خواپەرستیی و، ڕێی ڕاست گرتنەوە، مرۆڤ شایستەی بەزەیی خوا دەبێ و، بە هۆی لادان و گومڕایی و، سەرپێچیی و، خراپەكارییەوە، شایستەی سزای خوا دەبێ.

٦)- ﴿وَمَآ أَرْسَلْنَـٰكَ عَلَيْهِمْ وَكِيلًا﴾، بەڵام ئێمە تۆمان نەناردوە كە سەرپەرشتیار و بریكاری ئێمە بی و، نەهێڵی مرۆڤەكان بەرەو كوفر بڕۆن و، بە زۆر بیانكەی بە ئیماندار، بۆ ئەوەمان

نەناردووی، بەڵکو بۆ ئەوەمان ناردووی کە تۆ پەیامی ئێمەیان پێ ڕابگەیەنی، ئەگەرنا تۆ بەرپرسیارنی بە سەریانەوە، بەو واتایە کە: دوایی ئێمە سزای تۆ بدەین، لەسەر ئەوەی کە هێشتت کافر بن؟! یان بۆچی هێشتت لە ڕێ لابدەن؟! نا تۆ تەنیا گەیاندنی پەیامی خوات لەسەرە.

٧)- ﴿ وَرَبُّكَ أَعْلَمُ بِمَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، پەروەردگاریشت زاناترە، بە هەر کەسێك کە لە ئاسمانەکان و زەوی دا هەیە، چونکە توانجیان لە پێغەمبەر دەدا، وەك لەسەر زاری ئەوان دەفەرموێ: ﴿ أَهَٰذَا ٱلَّذِي بَعَثَ ٱللَّهُ رَسُولًا ﴿٤١﴾ ﴾الفرقان، واتە: ئا ئەوەیە خوا کردوویەتی بە ڕەوانە کراوی خۆی؟! لەبەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ پارەو سامانی نەبوو، پێیان لەوە کەمتر بوو کە خوای پەروەردگار بیکاتە نوێنەرو ڕەوانەکراوی خۆی! بۆیە خوا دەفەرموێ: پەروەردگارت زاناترە بەو خەڵکەی کە لە ئاسمانەکان و زەویدا هەن، ئێمە دەزانین کێ شایستەی هەڵگرتنی پەیامی ئێمەیە.

٨)- ﴿ وَلَقَدْ فَضَّلْنَا بَعْضَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ عَلَىٰ بَعْضٍ ﴾، بەدڵنیاییەوەش هەندێك لە پێغەمبەرانمان بەسەر هەندێکیان دا بەرزکردۆتەوە، هەندێکیانمان پلەی بەرزتر پێداوە و پەسندترمان کردوە، هەموویان پلەبەرز و پەسندن، بەڵام هەندێکیان پلەبەرزو پەسندترن، کەواتە: ئەوەی کە بەرزیی و نزمیی دەکات، چ لە نێوان پێغەمبەران دا، چ لەنێوان سەرجەم مرۆڤەکانی دیکەدا، کە هەندێکیان زیاتریان پێ دەدات، هەندێکیان پەسندتر دەکات، بێگومان تەنیا خوایە و ﷻ، ئەوە ئیشی ئەوان نیە!

٩)- ﴿ وَءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ زَبُورًا ﴾، زەبووریشمان بە (داوود)دا، لە حاڵێکدا کە داوود عليه السلام شوانێك بوو، مەڕی دەلەوەڕاند، کەچی خوا هەڵیبژارد بۆ پێغەمبەرایەتیی و، کتێبیی زەبووریشی پێدا، دەشگونجێ لێرەدا بۆیە باسی زەبوور کرابێ، چونکە خوا فەرموویەتی: ﴿ وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِي ٱلزَّبُورِ مِنۢ بَعْدِ ٱلذِّكْرِ أَنَّ ٱلْأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ ٱلصَّٰلِحُونَ ﴿١٠٥﴾ ﴾الأنبياء، واتە: لە زەبووردا لە دوای زیکر {زیکر واتە: تەوڕات، کە زەبوور لە دوای تەوڕات هاتۆتە خوار، تەوڕات بە مووسا عليه السلام دراوە و زەبووریش بە داوود عليه السلام دراوە و داوودیش بە ڕەچەڵەك دەچێتەوە سەر پێغەمبەرانی پێشوو لە بەنی ئیسرائیل، بۆیە لێرە باسی زەبوور کراوە} نووسراوە: کە سەر زەمین بەندە چاکەکانم بە میراتی دەگرن.

کەواتە: ئەو موحەممەدە ﷺ کە بەندەی چاکی خوایەو، شوێنکەوتووەکانی کە بەندەی چاکی خوان، ئەوە کاتی خۆی پەروەردگار لە زەبووردا تۆماری کردوە، کە ئەو بەندە شایستە و چاکانە، سەر زەمین بە میرات دەگرن، نەك بە هۆی سەروەت و سامانەوە، کەسێك شایستەی ئەوە بێ خوا ﷻ سەری بخات و، ڕێزی لێ بنێ، بەڵکو بە هۆی ئەو چاکیەتیی و شایستەییەی کە بە پێی شەریعەتی خوا، شایستەیی هەیە، بۆیە بەو هۆیەوە خوای پەوەردگار لێرەدا باسی زەبووری کردوە، کە بە پێغەمبەر داوودی عليه السلام داوە.

## فامینەوەی پێنج ڕاستی گەورە و گرنگ لە هەردووک ئایەتی (٥٤ و ٥٥)

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ رَّبُّكُمْ أَعْلَمُ بِكُمْ إِن يَشَأْ يَرْحَمْكُمْ أَوْ إِن يَشَأْ يُعَذِّبْكُمْ وَمَآ أَرْسَلْنَـٰكَ عَلَيْهِمْ وَكِيلًا ﴿٥٤﴾ وَرَبُّكَ أَعْلَمُ بِمَن فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلَقَدْ فَضَّلْنَا بَعْضَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ عَلَىٰ بَعْضٍ وَءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ زَبُورًا ﴿٥٥﴾ ﴾،

١- ئەو ئایەتەیان کە دەفەرموێ: ﴿ رَّبُّكُمْ أَعْلَمُ بِكُمْ إِن يَشَأْ يَرْحَمْكُمْ أَوْ إِن يَشَأْ يُعَذِّبْكُمْ وَمَآ أَرْسَلْنَـٰكَ عَلَيْهِمْ وَكِيلًا ﴿٥٤﴾ ﴾ ئەو ڕاستییەی لێ وەردەگیرێ:

ئـەی پێغەمبـەر ﷺ! هەروەهـا ئـەی شـوێن کەوتـووانی پێغەمبـەری خاتـەم! پەروەردگارتان زاناتـرە بـە بەنـدەکان، خـوا ﷻ چـی بـوێ ئەنجامـی دەداو، هیـچ شـتێکی لەبـەر عاسـێ نابـێ، کـە کافـرەکان ئێسـتا لـە ئێـوە عاسـێ بـوو ون و بـڕوا ناهێنـن، لەبەرئـەوە نیـە کـە خـوا ناتوانێ هیدایەتیـان بـدات، هۆکارەکـەی ئەوەیـە خـۆی ویسـتوویەتی بـەو شـێوەیەبن، خەڵـك بـە ویسـتی ئازادانـەی خـۆی بـڕوا بێنـێ، یـان بـڕوا نەهێنـێ، ئەگەرنـا ئەگـەر ویسـتبای جەبریـان لـێ بـکات، وای لێدەکـردن، شایسـتەی بەزەیـی خوابـن، یـان وای لێدەکـردن کـە شایسـتەی سـزای خوابـن، بـەڵام ویسـتوویەتی دەسـتیان ئـاوەڵا بـکات و ئازادیـان بـکات.

٢- پاشان کە دەفەرموێ: ﴿ وَرَبُّكَ أَعْلَمُ بِمَن فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، واتە: پەروەردگارت زاناترە بە هەرکەس کە لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، واتە: ئێوە لە کەس نائومێد مەبەن، لە کەس تەمابڕاو مەبن، چونکە پەروەردگارت زاناترە بە هەر کەسێك کە لە ئاسمانەکان و زەوی دا هەیە، کە سەرەنجام بڕوا دێنێ، یان ناهێنێ، گرنگ ئەوەیە هەرکەس هەرچییەك دەکات بەویستی ئازادانەی خۆی دەیکات.

٣ - کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ فَضَّلْنَا بَعْضَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ عَلَىٰ بَعْضٍ ﴾، ئەوە وەڵامی یەکێك لە قسەو تۆمەتەکانە، کە کافرەکان ئاڕاستەی پێغەمبەری خاتەمیان ﷺ دەکرد، بۆ وێنە: لە سوورەتی (الزخرف)دا گوتوویانە: ﴿ وَقَالُوا۟ لَوْلَا نُزِّلَ هَـٰذَا ٱلْقُرْءَانُ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنَ ٱلْقَرْيَتَيْنِ عَظِيمٍ ﴿٣١﴾ ﴾ واتە: دەبوایە ئەو قورئانە دابەزیبایە سەر یەکێك لە دوو پیاوە مەزنەکان، لە دوو ئاوەدانییەکاندا، کە مەبەستیان پێ مەککەو تائیف بووە، بە ڕای زۆربەی زانایان.

دیـارە لـە مەککـە، مەبەسـتیان پـێ (**أبـو جهـل**) بـووە و، لـە تائیفیـش مەبەسـتیان پـێ یەکێـکی دیکـە بـووە لـە زلـەزلانی قورەیـش، هەروەهـا تانەیـان لـە پێغەمبـەر ﷺ داوە:

﴿...أَهَٰذَا ٱلَّذِي بَعَثَ ٱللَّهُ رَسُولًا ﴿٤١﴾﴾ **الفرقان**، واتە: ئا ئەمەیە خوا بە پێغەمبەری ڕەوانەکردوە؟! لێرە دا خوا دەفەرموێ: بەرزکردنەوەی پێغەمبەران (**علیهم الصلاة والسلام**) بەسەر خەڵکی دیکەدا، کە هەموو پێغەمبەران پەسندکراو و بەرزکراوو پایەدارن، بەڵام لە نێو پێغەمبەرانیش دا، هەندێکیان لە هەندێکیان پایەدارترو پلە بەرزترن، ئا ئەوە هەموو کاری خوایە ﷻ.

دیارە خواش کارزان و کاربەجێیەو، ستەم لەکەس ناکات، بەڵام بەخششی خۆشی بە کەسێك دەبەخشێ کە شایستەیە.

٤- کە دەفەرموێ: ﴿وَءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ زَبُورًا﴾ ئێمە (زەبوور)یشمان بە داوود دابوو، وەك پێشتریش باسمانکردوە، دەگونجێ دوو حیکمەتی تێدابن، کە لێرە باسی داوود بە تایبەتیی کراوە:

**یەکەم:** لەبەر ئەوەی داوود ﵇ شوان بووە، ئاژەڵی لەوەڕاندوە، کەچی بەنو ئیسرائیل لەگەڵ جالووت دا {لە (پەیمانی کۆن)دا دەڵێ: جالوتی جەزیرەیی (**جالوت الجزيري**) لەگەڵ ئەودا} دەبێتە شەڕیان، داوود دێت بە قۆچەقانی[1] جالووت دەکوژێ، لە کاتێکدا نیزیك دەبێ سوپاکەی بەنو ئیسرائیل شکست بێنێ. واتە: خوا ﷻ بابایەکی شوان، لەبەرئەوەی سروشت و مەعدەنەکەی باشبووە، دەیکاتە پێغەمبەر و کتێبێکیشی پێ دەدا کە زەبوورە.

**دووەم:** یاخود لەبەرئەوە باسی داوود کراوە، کە لە سوورەتی (**الأنبياء**)دا خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِي ٱلزَّبُورِ مِنۢ بَعْدِ ٱلذِّكْرِ أَنَّ ٱلْأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ ٱلصَّٰلِحُونَ ﴿١٠٥﴾﴾ واتە: بە دڵنیایی لە زەبووردا لە دوای زیکر {مەبەست: تەوراتە، کە بیرخەرەوە بوو بۆ گەلی بەنو ئیسرائیل} لە زەبووردا نووسیومانەو ڕامانگەیاندوە {وەك یاسایەکی خۆمان}، کە سەرزەمین بەندە شایستەو چاکەکانم بە میراتی دەگرن.

کەواتە: ئەوە:

أ- هەم دڵخۆشییە بۆ مسوڵمانان، کە مادام ئێوەش بەندەی چاك و بۆ خوا صوڵحاوبن، سەرەنجامی ئەو کێبڕکێ و ناکۆکییەی ئێستا پەیدابووە، بە قازانجی ئێوە دەبێ، سەرکەوتن لە گرەوی ئێوەدایە و بەرانبەرەکانتان و دوژمنەکانتان شکستیان پێ دەبڕێ.

ب- هەم هۆشدارییشە بۆ کافرەکان کە ئەمە یاسایەکی خوایەو ڕایگەیاندوە، کاتی خۆی لە زەبووردا، کە بەندە شایستەکانی خوا سەرزەمینی خوا بە میرات دەگرن.

---

(١) بەردەقانی (مِقْلاع).

کەواتـە: ئێـوە بـە چـاوی کـەم تەماشـای ئـەو بڕوادارانـە مەکـەن، تەماشـای پێغەمبـەر موحەممـەد ﷺ و ئـەو پەیامـەی پێیـدا ناردوە مەکـەن، چونکـە بـە پێـی یاسـای خـوا، کاتی خـۆی لـە زەبـووردا تۆمارکـراوە، بەنـدە چاکـەکانی خـوا سـەرزەمینی خـوا بـە میـرات دەگـرن.

٥- شایانی باسە خوا لێرە باسی زەبوور دەکات و لە شوێنێکی دیکەش دا هەرباسی زەبوور دەکات، لە سوورەتی (**النساء**) (١٦٢)دا، باسی ئەوە دەکات کە زەبووری بە داوود داوە، ئێستا لە کتێبی پیرۆز (**الكتاب المقدس**)دا (خاوەن کتێبەکان وای ناو دەنێن)، کە دوو بەشە: (پەیمانی کۆن و پەیمانی نوێ)، پەیمانی کۆن (٣٩)[1] کتێب دەگرێتە خۆی، کە یەکێك لەو کتێبانە تەوراتە و، یەکێکیان (زەبوور)ە، کە ئەوان دەڵێن: (مزامیر)، یەکێکی دیکەیان (**أناشيد**)، **یان** (**حكم سليمان**)ە، (پەیمانی نوێ)ش چوار ئینجیلەکەو، کۆمەڵێك کتێب و نامەی دیکەش دەگرێتە خۆی، ئنجا بە پێی ئەوەی ئێستا لە (پەیمانی کۆن)دا هەیە، وەك لە (**التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم**) هاتوە لە لاپەڕە: (١١٣٠ تاکو ١٢٧٨) هەمووی بۆ مەزامیر تەرخانکراوە، {واتە: (مزامیر) کە کۆی (مزمور)ە، و ئەویش بە مانای ئاواز (**نَغْمَة**)، یاخود بە مانای پاڕانەوەو لاڵانەو ڕاز و نیازکردنە لە خزمەت خوادا}.

ئنجـا مەزامیـری داوود چـل و یـەك (٤١) مەزمـوورە، کـە لـە پەیـمانی کۆنـدا لـە لاپـەڕە: (١١٣٣ تاکـو ١١٧٩) دەگرێتـەوە، ئەوانـە هەموویـان هـی داوودن، بـەڵام جگـە لـە مەزامیـری داوود، کۆمەڵێـك مەزمـووری دیکـەش هاتـوون و چـل و یەکەکـەی داوود، ژمارەیـەکی دیکەشـیان خراوەتـە سـەر، تاکـو دەبـن بـە سـەدو پەنجـا (١٥٠)، واتـە: سـەدو نـۆ (١٠٩) مەزمـووری دیکەش کـە لەگـەڵ ئەوانـەی داوود: (٤١+١٠٩=١٥٠) مەزمـوور، کـە هەموویـان لـە ژێـر ناوونیشـانی (المزامیـر) داهاتـوون و لـە لاپـەڕە (١١٣٠تاکـو ١٢٧٨) لـە (پەیـمانی کـۆن) دەگرنـەوە.

هەڵبەتـە ئـەوەی لـە پەیـمانی کۆنـدا هەیـە، زیاتـر پاڕانـەو کڕووزانـەوەی داوودە، کـە واش پێدەچـێ (زەبـوور) زیاتـر پاڕانـەوەو لاڵانـەوەو موناجـاتی داوود عليه السلام بووبـێ، بـەڵام ئایـا چەنـدی ڕاسـت مـاوەو چەنـدی گـۆڕدراوە؟ ئـەوە لێـی دڵنیانیـن.

٦ - بە نسبەت ئەوەوە کە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)، هەندێکیان بەسەر هەندێکیاندا بەرزکراونەوە؟ خوا لە سوورەتی (البقرة)دا دەفەرموێ: ﴿تِلْكَ ٱلرُّسُلُ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ﴿٢٥٣﴾﴾، واتە: ئەوانە پێغەمبەرانێکن، هەندێکیانمان بەسەر هەندێکیان دا بەرزکردۆتەوە. {هەموویان بەرزن، بەڵام هەندێکیان بەرزترن، هەموویان پەسندن، بەڵام هەندێکیان پەسندترن، هەموویان هەڵبژێردراون، بەڵام هەندێکیان بەسەر هەندێکیان دا هەڵبژێردراون}.

---

(١) بەڵکو بەپێی کتێبی: (الكتاب المقدّس قراءة رعائية) چل و نۆ (٤٩) کتێبن.

## پرسیارێك و وەڵامەكەی:

كـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَقَدْ فَضَّلْنَا بَعْضَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ عَلَىٰ بَعْضٍ ﴾، لێـرەدا پرسـیارێك دروسـت دەبـێ، چونكـە فەرمایشـتێكی پێغەمبـەر ﷺ هەیـە، دەفەرمـوێ: {مَا يَنْبَغِي لِعَبْدٍ أَنْ يَقُولَ: أَنَا خَيْرٌ مِنْ يُونُسَ بْنِ مَتَّى} (أخرجه مسلم: ٢٣٧٦، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، واتـە: هیـچ بەندەیـەك بـۆی نیـە بڵـێ: مـن لـە یونـسی كـوڕی مەتتـا چاكـترم[1].

كـە پێـم وایـە: بۆیـەش پێغەمبـەر ﷺ بـاسی (یونـس) علیه السلام دەكات، چونكـە خـوا بـاسی هیـچ كام لـە پێغەمبـەرانی نەكـردوە كـە بـەو شـێوەیەی (یونـس) سـزای دابـێ، كـە لـە سـكی نەهەنگـدا زیندانیـی و بەنـدی كردبـێ و، دواتـر لـە ئەنجامـی گەڕانـەوەی دا بـۆ لای خـواو، لـە ئەنجامـی بـە پاكگرتنـی خـواو، داوای لێبـوردن كـردن لـە خـوا، خـوا دەربـازی كردبێـت و بەخشـیبێتی، تەنیـا بـاسی (یونـس) كـراوە بەو شـێوەیە، بەڵێ بـاسی (ئادەم)كـراوە و لە بەهەشـت دەركـراوە، بـەڵام ئـەوەی (یونـس) خەسـت و خۆڵـترە.

ئنجـا ئایـا لێـرەدا كـە خـوای زانـا و شـارەزا دەفەرمـوێ: هەنـدێ لـە پێغەمبەرانمـان بەسـەر هەندێكیـان دا هەڵبـژاردوون، فەرمایشـتەكە لەگـەڵ ئـەو ئایەتـەدا، دژناوەسـتێ و تێـك ناگیرێـن؟!

زانایـان چەنـد وەڵامێكیـان داونـەوە، بـۆ وێنـە: مـن قسـەیەكی پێشـەوا (**النووي**)م هێنـاوە لـە (شرح صحيح مسـلم)[2] دوو وەڵامـان دەداتـەوە، كـە هەردووكیانـم بـە دڵـن:

**یەكەم:** دیارە تاكو ئەوكاتە كە خوا بە پێغەمبەری ڕاگەیاندوە: هەندێ لە پێغەمبەرانی بەسەر هەندێكیان دا بەرزكردووەتەوە، تاكو ئەوكاتە پێغەمبەر (موحەممەد) ﷺ نەیزانیوە كە هەندێ لە پێغەمبەران لە هەندێكیان پایە بەرزترو پلەدارترن، واتە: دوایی خوا ﷻ ئەو ئایەتانەی ناردوون و، كاتێ پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (هیچ بەندەیەك بۆی نیە بڵێ من لە یونس چاكترم)، ئەوە ئەو كاتە بووە، كە جارێ خوا ئاگاداری نەكردۆتەوە كە هەندێ لە پێغەمبەران بەسەر هەندێكیان دا

---

(١) شـایانی باسـە: ئێمـە لـە تەفسـیری سـوورەتی (یونـس)دا بـە تەفصیـل بـاسی ژیـانی (یونس)مـان كـردوە و هەمـوو ئـەو ئایەتانـەی لـە بارەیـەوە هاتـوون، هێناومانـن، وەك عـادەتی خۆمـان كـە لـە هـەر شـوێنێكدا بـاسی یەكـێ لـە پێغەمـەران (علیهـم الصـلاة والسـلام) ژیـان و بەسـەرهاتەكەی دەكەیـن، هەرچـی لـە قورئـاندا لـە بارەیـەوە هاتـوە، هەوڵدەدەیـن هەمـووی كۆبكەینـەوە.

(٢) ج١٥، ص١٤١.

بەرزکراونەتەوە، چونکە دوایی، پێغەمبەر بۆ خۆی فەرموویەتی: {**أَنَا سَيِّدُ النَّاسِ يَوْمَ القِيَامَةِ**} (**أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ**:٣٣٤٠، **وَمُسْلِم**: ٣٢٧)، واتە: من سەروەری خەڵکم لە ڕۆژی قیامەت دا.

کە لێرەدا پێغەمبەر ﷺ پایەبەرزیی خۆی ڕاگەیاندوە، وەك حەقیقەتێك، بەڵام کاتێك کە قسەکەی دیکەی فەرمووە، دەبێ جارێ خوا ئاگاداری نەکردبێتەوە کە خۆی سەروەری ڕۆڵەکانی ئادەمە و سەروەری پێغەمبەرانیشە و، پێغەمبەرانیش هەندێکیان لە هەندێکیان بەرزترن.

**دووەم:** پێغەمبەری خوا کە ئەوەی فەرمووە، ئەوە ئاگادارکردنەوەو تێوەخوڕینە، بۆ هەر کەسێك کە نەفامانە لە پلەو پایەی (یونس) علیه السلام دانەبەزێنێ، لەبەر ئەوەی خوا ﷻ بەسەرهاتەکەی ئاوا گێڕاوەتەوە، کە سزای داوە و لە سکی نەهەنگدا زیندانیی کردوە، ئەوە نەکاتە بیانوو دەستەچیلەی ئەوە کە لە پلەوپایەی یونوس دابشکێنێ، بۆیەش بەتایبەتی باسی وی کردوە، کەواتە: ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خاتەم ﷺ لەگەڵ حەقیقەتی: هەبوونی پلە پلەیی لە نێو پێغەمبەران دا (علیهم الصلاة والسلام)، تێك ناگیرێ.

### مەسەلەی دووەم:

**خوا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: بە کافرەکان بڵێ: لەوانەی پێتان وایە جگە لە خوا پەرستراون، بپاڕێنەوە، بەڵام نەدەتوانن زیانتان لێ لابەرن و، نە دەشتوانن لای بدەن، ئەوانەی لێیان دەپاڕێنەوە {لە بەندە چاکەکان}، کامیان لە خوا نیزیکترە، خەفتانی هۆکاری پێ نیزیککەوتنەوەی زیاتر لە خوا دەکەن، واتە: خەفتانی ئەو هۆکارانە دەکەن، کە زیاتر پێیان لە خوا وەنیزیك بکەون و، ئومێدەواری بەخشندەیی خوان و، لە سزایەکەشی دەترسێن و، بێگومان سزای پەروەردگارت جێگای مەترسییە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ قُلِ ادْعُوا الَّذِينَ زَعَمْتُم مِّن دُونِهِ فَلَا يَمْلِكُونَ كَشْفَ الضُّرِّ عَنكُمْ وَلَا تَحْوِيلًا ﴿٥٦﴾ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ يَدْعُونَ يَبْتَغُونَ إِلَىٰ رَبِّهِمُ الْوَسِيلَةَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ وَيَرْجُونَ رَحْمَتَهُ وَيَخَافُونَ عَذَابَهُ ۚ إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ كَانَ مَحْذُورًا ﴿٥٧﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ بڕگەدا:

١)- ﴿ قُلِ ادْعُوا الَّذِينَ زَعَمْتُم مِّن دُونِهِ ﴾ بڵێ: بپاڕێنەوە لەوانەی پێتان وایە جگە لە خوا پەرستراون و، شتێکیان لە دەست دێ و، شایانی پەرستنن. (زَعَمْتُم مِّن دُونِهِ **أي: زعمتموهم آلهة من دون الله**) ئەوانەی پێتان وایە، خەیاڵتان وایە، پەرستراون جگە لە خوا، لێیان بپاڕێنەوە.

٢)- ﴿ فَلَا يَمْلِكُونَ كَشْفَ الضُّرِّ عَنكُمْ وَلَا تَحْوِيلًا ﴾، واتە: هەرچەند زۆریان لێ بپاڕێنەوە، نە دەتوانن زیانتان لێ لابەرن، نە دەشتوانن زیانتان لێ لابدەن. (**الكَشْفُ: مستعارٌ للإزالة**) (**كشف**) واتە: دەرخستن، بەڵام لێرەدا خوازراوەتەوە بۆ لابردن: (**كَشَفَ عَنْهُ الضُّرَّ**) واتە: زیانەکەی لێ لابرد، ئەگەرنا (**كَشَفَ**) واتە: (**أَظْهَرَ**) دەریخست.

٣)- ﴿ وَلَا تَحْوِيلًا ﴾، (**التَّحْوِيْلُ: نَقْلُ الشَّيءِ من مكان إلى آخر**) (تحويل) ئەوەیە شتێك بگوازیەوە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێك، لە لایەکەوە بۆ لایەك، واتە: نەدەتوانن ئازارو سزایەکەی خواتان لێ لابەرن و، نە دەشتوانن لێتان لابدەن و لە ئێوەوە بیگوازنەوە بۆ یەکێکی دیکە.

٤)- ﴿ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ يَدْعُونَ ﴾، واتە: ئا ئەوانەی لێیان دەپاڕێنەوە.

٥)- ﴿يَبْتَغُونَ إِلَىٰ رَبِّهِمُ ٱلْوَسِيلَةَ﴾، واتە: بەرەو لای خوا هۆکار دەخوازن، خەفتانی هۆکارن و بە دوای هۆکارێك دا دەگەڕێن، کە لە خوایان نیزیك بخاتەوە.

٦)- ﴿أَيُّهُمْ أَقْرَبُ﴾، کامەیان نزیکترە لە خوا و بەندایەتیی بۆ خوا چاکترە: ئەو خەفتانی هۆکاری زیاتر دەکات و، زیاتر بە دوای هۆکاراندا دەچێ کە پێیان لە خوا نیزیك بێتەوە.

ئەمە واتایەکی.

واتایەکی دیکەی: ئەوانەی ئێوە لێیان دەپاڕێنەوە، بەرەو پەروەردگاریان هۆکار دەخوازن، تاکو بزانن کامیان لە خوا نیزیکترە؟ واتە: بۆ زانینی ئەوەی کە کامیان لە خوا نیزیکترە، هۆکار دەگرنەبەر، کە بزانن کێ لە خوا نیزیکترە؟ تاکو ئەوانیش وەك وی بکەن، چاوی لێ بکەن و بیکەنە سەرمەشق، بۆ خوا پەرستیی باشتر.

شایانی باسە: مانای یەکەمیان گونجاوترە و، هی دووەمیان دەبێ شتێك مەزەندە (**تقدیر**) بکرێ کە قوتێنراوە، کە بریتیە لە (تاکو بزانن) بەلام هی یەکەم پێویستیی بەوە نیە.

٧)- ﴿وَيَرْجُونَ رَحْمَتَهُۥ﴾ واتە: هەروەها بە ئومێدی بەزەیی خوان، (**الرَّجَاءُ: الأَمَلُ مَعَ العَمَل**) (**رجاء**) بریتیە لە هیوا هەبوون لەگەڵ کرداردا، بەڵام (**أمل، أُمنية**) بریتیە لەوەی ئینسان خۆزگە بخوازێ، بەڵام بەبێ ئەوەی کردەوەی شایستەی هەبێ، بۆ هێنانەدی ئەوشتەی بە ئاواتی دەخوازێ.

٨)- ﴿وَيَخَافُونَ عَذَابَهُۥٓ﴾، لە سزا و ئازارەکەشی دەترسێن.

٩)- ﴿إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ كَانَ مَحْذُورًا﴾، واتە: بە دڵنیایی سزاو ئازاری پەروەردگارت مەترسلێکراوە، (**مَحْذُوراً**) واتە: (**فَيَنْبَغِي أَن يُحْذَر**) پێویستە وریایی بەرانبەر بکرێ.

کەواتە: ئەو سێ خەسڵەتە گەورە و گرنگە، کە خوا عز وجل لەو بەندە لە خوا نیزیکانەدا دەیانخاتە ڕوو، کە کافرو هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان نەزانانە لێیان دەپاڕێنەوەو دەیانهێننە ئاستی خوا، دەفەرموێ: ئا ئەوانەی ئێوە چاوەڕوانییتان لێیان هەیەو، بە پەرستراویان دادەنێن، خاوەنی ئەو خەسڵەتە بەرزانەن، کە بێگومان مەبەست پێیان: ئەو کەسانەن کە بۆ خوا صوڵحاون، ئەگەر نا ئەوان داروبەردیشیان پەرستووەو، شەیتانیشیان پەرستووەو، **طاغووتیشیان** پەرستوە، بەڵام لێرەدا مەبەست ئەو کەسانەن کە بۆ خوا صوڵحاون، ئنجا مەبەست فریشتەکان بن، چ پێغەمبەران بن، وەك چۆن

نەصرانییەکان عیسا ﷺ دەپەرستن و، جوولەکەکان عوزێر دەپەرستن! ﴿ وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ عُزَيْرٌ ٱبْنُ ٱللَّهِ وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَى ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ ٱللَّهِ ﴿٣٠﴾ ﴾التوبة، هەروەها وەك چۆن هەندێك لەو مسوڵمانە بە هەڵەداچووانەی، کە هەندێك لە دۆستانی خوا، دێننە ڕیزی خوا، دەیانهێننە ئاستی خواو، ئەوەی کە لە خوا چاوەڕێ دەکرێ: ئنجا شیفای نەخۆشە، سەرخستنە، ژێرخستنە، دەروولێکردنەوەیە، تاوان بەخشینە، ئەو شتانەی تەنیا بە خوا دەکرێن، لێیان چاوەڕێ دەکەن، چونکە هەرشتێك تەنیا هی خوابێ و، لە جگە لە خوا داوابکرێ، ئەو غەیرەی کردوە بە هاوبەش بۆ خوا!

ئنجا خوا دەفەرموێ: ئا ئەو جۆرە کەسانەی ئێوە چاوەڕوانیی ئەوانەتان لێیان هەیە بە هەڵە، ئەوانە بەردەوام خەفتانی ئەوە دەکەن و، هەمیشە مشووری ئەوە دەخۆن و، بە دوای ئەوە دا دەگەڕێن، کە هۆکاری زیاتری لە خواوە نیزیك کەوتنەوە بۆ خۆیان دەستەبەر بکەن، کامەیان لە خوا نیزیکە زیاتر خەفتانی ئەوە دەکەن، یاخود: ئەوانە هۆکار دەخوازن کە بزانن چ کەسێك لە خوا نیزیکترە؟ تاکو ئەوانیش وەك ئەو بکەن و بە ئومێدی بەزەیی خوان و، لە سزایەکەشی دەترسێن.

کەواتە: ئەم سێیە:

**یەکەم:** خۆشویستنی لە خوا نیزیکیی.

**دوووم:** ئومێدەواربوون بە بەزەیی خوا.

**سێیەم:** ترسان لە سزای خوا.

ئەم سێیە، هەر سێکیان پێویستن بۆ بەندایەتیی کردنی ڕاست و دروست بۆ خوا، دەبێ تۆ:

١- هەم خۆشەویستیی خوات هەبێ و، هەوڵبدەی زیاتر لێی نزیکبی.

٢ - هەم ئومێدتت بە بەزەیی خوا بێ.

٣- هەم بترسی لە سزا و لێپرسینەوەی خوای دادگەر، هەڵبەتە خوا ﷻ وەك زاتی خۆی جێگای مەترسیی نیە، بەڵام سزاو لێپرسینەوەی خوا، جێگای مەترسییە، سزاو لێپرسینەوەی خواش، پەیوەندیی بە کردەوە خراپەکانی ئێمەوە هەیە، ئەگەرنا خوا لە زاتی خۆیدا مەترسیلێکراونیە، لێترساونیە، بەڵکو خۆشویستراوو، بە بەرز گیراوو، بە مەزن گیراو و، پشت پێ بەستراوو، ئەوپەڕی ڕێزو تەقدیر بۆ دانراوە.

**مەسەلەی سێیەم:**

**خوا ڕایگەیاندوە: خەڵکی هیچ ئاوەدانییەك نیە، پێش ڕۆژی قیامەت نەیفەوتێنین بە مردنی ئاسایی خۆیان، یاخود بە سەختیی سزایان نەدەین، بە هۆی تاوان و لادانیانەوە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَإِن مِّن قَرْيَةٍ إِلَّا نَحْنُ مُهْلِكُوهَا قَبْلَ يَوْمِ الْقِيَامَةِ أَوْ مُعَذِّبُوهَا عَذَابًا شَدِيدًا كَانَ ذَٰلِكَ فِي الْكِتَابِ مَسْطُورًا ﴿٥٨﴾﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چوار بڕگەدا:**

١)- ﴿وَإِن مِّن قَرْيَةٍ﴾ لێرەدا (إِنْ) یانی: (ما)، بۆ لابردن (**نفي**)ە، وشەی (مِنْ)یش (**زائدة لتأكيد الإستغراق**)، (مِنْ) زیادکراوە بۆ جەختکرونەوە لە سەر گشتگیریی فەوتاندن (**إهلاك**)، ئەگەنا دەگونجا ئاوابێ: (**وما قريةٌ إلاّ نحن مهلكوها...**) بەڵام ئەم (مِنْ)ەی چۆتە سەر، بۆ ئەوەی زیاتر مانای ئەوە بگەیەنێ، کە هیچ ئاوەدانییەك نیە، هەر لەسەرەتاوە بیگرە تا کۆتایی، ئەمەش بۆ جەختکردنەوەیە لەسەر ئەوە کە ئەو فەوتاندنەی ئاوەدانییەکان، هەموویان دەگرێتەوە و هیچیان نابوێرێ و هەڵناوێرێ.

بەڵام ئایا لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿وَإِن مِّن قَرْيَةٍ إِلَّا نَحْنُ مُهْلِكُوهَا ﴿٥٨﴾﴾ (**قرية**) واتە: ئاوەدانیی، یانی: خوا هەموو ئاوەدانییەك لە بەین دەبات؟! نەخێر، چونکە زۆرێك لە زانایان دەڵێن: لێرەدا سیفەتێك قرتاو (**محذوف**)ە، کە بە سیاق و سەلیقە دەزانرێ و لە شوێنەکانی دیکەی قورئان دا باسکراوە، واتە: (**وَإِنْ مِنْ قَرْيَة ظَالِمَة**) هیچ ئاوەدانییەکی ستەمکار نیە، کە خوا پێش ڕۆژی قیامەت نەیفەوتێنێ، یان خوا بە سەختیی سزای نەدات، ئنجا دەڵێن: ئەمە وەك ئەو ئایەتەی سوورەتی (الكهف) وایە، کە دەفەرموێ: ﴿وَكَانَ وَرَاءَهُم مَّلِكٌ يَأْخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ غَصْبًا ﴿٧٩﴾﴾، واتە: لە پشتیانەوە پاشایەك هەبوو، {لە پێشیانەوە کە بەرەو ڕووی دەچوون، بەڵام ناوی لێناوە (**وراء**)}، هەموو کەشتییەکی داگیر دەکرد، ﴿يَأْخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ﴾ زانایان دەڵێن: (**أي سفينة صالحة**) واتە: هەر کەشتییەکی باشی داگیر دەکرد!

بەبەڵگەی ئەوەی: ئەو بەندە چاکەی دەبێتە هاوەڵی مووسا عليه السلام دەڵێ: بۆیە کەشتییەکەم خراپ کردو تێکدا، تاکو نابەرچاوبێ و، ئەو پادشا ستەمکارە، کە تەماعی لە کەشتییە تازەو نوێیەکان دەکرد، ئەو کەشتییە نا بەرچاوبێ و، وا نەبێ کە تەماعی تێ بکات.

ئنجا ئایا چۆن دەزانین کە وشەی (**سفینة**) کە لە سوورەتی (**الكهف**)دا هاتوە، (**سفینة صالِحة**)یە؟! بەوە دەزانین کە: بەندە چاکەکە دەڵێ: بۆیە تێکمدا، چونکە ئەو پادشایە هەموو کەشتییەکی داگیر دەکرد، ئنجا ئەگەر (**كلّ سفینة**) (هەموو کەشتییەك) مەبەستی پێ هەموو کەشتییەکی چاك و خراپ بێ، مانای وایە: بە خراپکراوییش داگیری دەکرد!

کەواتە: مەبەستی کەشتییەکی چاك و بەرچاوە، کە جێی تەماع بێ.

ئنجا بە هەمان شێوەش خوا ﷻ لە زۆر شوێنی قورئاندا، باسی ئەوە دەکات ئاوەدانییە ستەمکارەکان دەفەوتێنێ، بۆ وێنە:

**أ** - لە سوورەتی (الأنبیاء)دا دەفەرموێ: ﴿ وَكَمْ قَصَمْنَا مِن قَرْيَةٍ كَانَتْ ظَالِمَةً ﴿١١﴾ ﴾، واتە: زۆر ئاوەدانییمان فەوتاندوون کە ستەمکاربوون، واتە: خەڵکەکەیان ستەمکار بووە.

**ب** - هەروەها لە سوورەتی (**القصص**)دا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كُنَّا مُهْلِكِي الْقُرَىٰ إِلَّا وَأَهْلُهَا ظَالِمُونَ ﴿٥٩﴾ ﴾، واتە: ئێمە ئاوەدانییەکان نافەوتێنین، مەگەر خەڵکەکەیان ستەمکاربێ، ئنجا لەبەرئەوەی لە شوێنەکانی دیکەدا، باسی ئاوەدانییە ستەمکارەکان کراوە، کەواتە: لێرەش کە بە گشتی باسی (قریة) کراوە، واتە: ئەو ئاوەدانییانەی کە خەڵکەکەیان ستەمکار و لادەر و تاوانبارن.

بەڵام دەشگونجێ وشەی (قریة) هەر وەك خۆی بێ، بەڵام مەبەست ئەوەبێ: هەر ئاوەدانییەك کە هەیە، یان ئەوەتا خوا بە مردنی ئاسایی خۆی دەیفەوتێنێ، یان بە هۆی کارەسات و بەڵای ناگەهان، وەك دەفەرموێ:

٢)- ﴿ إِلَّا نَحْنُ مُهْلِكُوهَا قَبْلَ يَوْمِ الْقِيَامَةِ ﴾، پێش ڕۆژی قیامەتێ بە مردنی ئاسایی خۆیان دەڕۆن، چونکە: هەموو پشت (جیل)ەکان، وەك چینی بێستانی دێن و دەڕۆن و، دەبڕێنەوە، هەرکەسە تاقیکردنەوەی خۆی دەکات و، ئەم سەر زەوییە بە جێدێڵێ و، دەچێتە قۆناغی بەرزەخ و خەڵکێکی دیکە دێن شوێنیان دەگرنەوە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ أَنشَأَكُم مِّن ذُرِّيَّةِ قَوْمٍ آخَرِينَ ﴿١٣٣﴾ ﴾**الأنعام**، واتە: ئێوەمان لە وەچەی خەڵکێکی دیکە پێ گەیاندوە، ئەوان ڕۆیشتوون و ئێوە هاتوون، نۆرەی خۆتانە تاقیکرنەوەی خۆتان بدەن، ئێوەش دوایی دەڕۆن و وەچەکەتان ئەوانەی لە ئێوە پەیدادەبن، ئەوانیش تاقیکردنەوەی خۆیان دەدەن، هەروەها چین بە چین، کەواتە: هیچ ئاوەدانییەك نیە کە خوا نەیفەوتێنێ، پێش ڕۆژی دوایی.

٣)- ﴿ أَوْ مُعَذِّبُوهَا عَذَابًا شَدِيدًا ﴾ واتە: یاخود سزادەری نەبێ بە سزایەکی سەخت، ئەمە لە کاتی لادان و ستەمکارییدا، ئەویدیکەش لەو حاڵەتەدا کە لادان و تاوانیان نەکردوەو، ژیانی

ئاساییان بە ڕێ کردوەو بە مردنی ئاساییش مردوون، بەڵام ئەوەی ژیانی نائاسایی بەڕێبکات، بە مردنی نائاسایش دەمرێ، هەردوو واتاکان گونجاون.

٤)- ﴿كَانَ ذَٰلِكَ فِي ٱلْكِتَٰبِ مَسْطُورًا﴾ واتە: ئا ئەوە لە کتێبدا تۆمارکراوە نووسراوە.

وەك پێشتریش گوتمان: (**الكتاب**) دەگونجێ مەبەست تەورات بێ، یاخود کتێبە پێشووەکانی دیکەبن کە بە پێغەمبەران (**عليهم الصلاة والسلام**) دراون، چونکە (**ال**)ی سەر (**الكتاب**) بۆ ناساندن (**تعريف**)ە ومەبەست پێی (**عهد**)ە، یانی: (کتێبەکە) کە (تەورات)ە، یاخود: کتێبەکان کە بۆ پێغەمبەران نێرراون، دەشگونجێ: (**ال**) بۆ (جنس) بێ، واتە: تێکڕای ئەو کتێبانەی خوا ناردوونیە خوار.

بەڵام مانای ڕاستر بەلای منەوە ئەوەیە، کە وشەی (الكتاب) لێرەدا خوازراوەتەوە بۆ زانیاریی خوا و نەخشەو ئەندازەگیریی ئەزەلیی خوا ﷻ.

بەڵام ئایا بۆچی خوا، وشەی (الكتاب) بەکاردێنێ، بۆ زانیاریی خۆی؟! چونکە: ئێمە کاتێ بمانەوێ شتێکما لەبیر نەچێ و، لێمان تێکنەچێ، دەینووسین و تۆماری دەکەین، وەك گوتراوە: (**قَيِّدوا العلم بالكتاب**) زانیاریی بە هۆی نووسینەوە ببەستنەوە، ئنجا خوا دەیەوێ ئێمە تێبگەیەنێ، کە وەك چۆن ئێوە کاتێ شتێك دەنووسن، لێتان تێکناچێ و پاش و پێش ناکات، زانیارییەکانی خواش، وەك ئەوە وایە نووسرابن و تۆمارکرابن.

هەڵبەتە دەشگونجێ، خوا ﷻ زانیارییەکانی خۆی هەموو تۆمارکردبن، لە دروستکراوێکی خۆی دا کە ئێمە نازانین چۆنە؟ کەچەند وشەیەك لەوبارەوە لە قورئانی مەزن دا بەکارهاتوون: (**إمامٍ مبين، كتابٍ مبينٍ، لوحٍ محفوظ**)، کە دەشگونجێ: مەبەست لە هەموو ئەو وشەو تەعبیرانە، زانیاریی بێ سنووری خوابێ و، زانیاریی ئەزەلیی و بێ سەرەتا و کۆتایی خوابێ، کە یەکێکە لە سیفەتەکانی خوا، کە سیفەتەکانی خواش لەگەڵ خوا ﷻن. وەك چۆن زاتی خوا، بێ سەرەتایە، سیفەتەکانیشی بێ سەرەتان.

(**مسطور**) یانی: (**مكتوب**) تۆمارکراو، نووسراو.

کەواتە: کورتەی مانای ئەم ئایەتە ئاوای لێدێتەوە:

سەرجەم خەڵکی ئاوەدانییەکان لە نێوان دوو ئەگەران دان: یان بە مردنی ئاسایی خۆیان دەمرن، پێش هاتنی ڕۆژی قیامەت، یاخود خوا ﷻ بەلای ناگەهانیان بۆ دەنێرێ و سزایان دەدات، لەسەر لادان و تاوانیان، لەو دوو حاڵەتە بەدەرنین.

## مەسەلەی چوارەم:

خوا ﷻ دەفەرموێ: هیچ شتێك ڕێگرمان و پەرچ نەبوو کە: موعجیزان بنێرین {لەسەر داوای کافرەکان بۆ پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ} ئەوە نەبێ کە گەلە پێشووەکان پێیان بێبڕوابوون، وەك گەلی سەموود کە بە حوشترەکەی پێغەمبەر صالح ؑ بێ بڕوابوون، عادەتیشمان وایە کە نیشانەکان بۆ ترساندن دەنێرین [و هەر گەلێك بڕوایان پێ نەهێنا، دەیفەوتێنین]:

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا مَنَعَنَآ أَن نُّرْسِلَ بِٱلْـَٔايَـٰتِ إِلَّآ أَن كَذَّبَ بِهَا ٱلْأَوَّلُونَ ۚ وَءَاتَيْنَا ثَمُودَ ٱلنَّاقَةَ مُبْصِرَةً فَظَلَمُوا۟ بِهَا ۚ وَمَا نُرْسِلُ بِٱلْـَٔايَـٰتِ إِلَّا تَخْوِيفًا ﴿٥٩﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ وَمَا مَنَعَنَآ أَن نُّرْسِلَ بِٱلْـَٔايَـٰتِ ﴾ واتە: هیچ شتێك ڕێی لێ نەگرتین کە نیشانەکان بنێرین، هیچ شتێك ڕێگرمان نەبوو لە ناردنی نیشانەکان، کە بە دڵنیایی مەبەست لە نیشانەکان لێرەدا موعجیزە بەرهەستەکانن، کە خوای زانا و توانا بە پێغەمبەرانی پێشووی داون.

(**المَنْعُ: كَفُّ الفَاعِلِ عن فعلٍ يريده، فَالْمَنْعُ هُنَا مُسْتَعَارٌ للصَّرْفِ عَنِ الفَاعِلِ**)، (**منع**) بریتیە لەوە کە بکەر ئەو کارەی دەیەوێ، ئەنجامی نەدا، وشەی (منع) لێرەدا خوازراوەتەوە بۆ لادان لە ئەنجامدانی کارێك، واتە: ئەو کارەمان بۆیە نەکرد.

٢)- ﴿ إِلَّآ أَن كَذَّبَ بِهَا ٱلْأَوَّلُونَ ﴾ واتە: بە هۆی ئەوەوە کە گەلە پێشووەکان بێبڕوابوون بە نیشانەکانی خوا، بێبڕوابوو بەو موعجیزە بەرهەستانەی کە خوا بۆ پێغەمبەرانی پێشوو دەیناردن.

کەواتە: بە درۆ دانانی گەلە پێشووەکان، هۆکاری نەناردنی موعجیزە بەرهەستەکانە، لەلایەن خوای باڵادەستەوە بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ.

کە دەفەرموێ: ﴿ أَن نُّرْسِلَ بِٱلْـَٔايَـٰتِ ﴾، (نُّرْسِلَ) واتە: بنێرین، بەڵام لێرەدا مەبەست لە ناردن، دەرخستن و هێنانەدی و ڕەخساندنە، دوایی خوا وێنەیەکمان بۆ دێنێتەوە لەو گەلە پێشووانەی کە نیشانە و موعجیزەی بەرهەستی پێداون، بەڵام ئەوانە پێی بێبڕوابوون و، سەرەنجام سەریان بە فەتارەت چوو.

٣)- ﴿ وَءَاتَيْنَا ثَمُودَ ٱلنَّاقَةَ مُبْصِرَةً فَظَلَمُواْ بِهَا ﴾ واتە: حوشترەکەمان بە گەلی (ثمود)دا، کە نیشانەیەکی ڕوون بوو، بەڵام پێی بێبڕوابوون بەشێوەیەکی ستەمکارانە. {(مبصرة) أي مضيئة واضحة، أو هو اسم فاعل أبصر المتعدّي إلى مفعولٍ، أي: جعل غيره مُبْصِراً وَذَا بصِيرَةٍ)} واتە: وشەی (مُبْصرة) دوو واتای هەن:

أ- لە خودی خۆیدا ڕۆشنبوو، واتە: بە ڕۆشنیی ئەوەی دەگەیاند، کە صاڵح پێغەمبەری خوایە، لەلایەن خواوە ڕەوانە کراوەو پەیامی خوای هێناوە، ئەو حوشترە ئەوەی دەگەیاند، کە حوشترێك بوو وەك پێشتر باسمانکرد و، لە تەفسیری سوورەتی (الحجر)دا بە تەفصیڵ بەسەرهاتەکەیمان هێناوە و، لە سوورەتی (الأعراف)یش ئاماژەیەکمان پێدا کە لە لەتکە شاخێك، لە گابەردێکی گەورە ئەو حوشترە هاتەدەر، بە خۆی و بە بەچکەیەکەوە! بۆیەش (النّاقة)، (ال)ەکەی بۆ ناساندن (تعريف)ە ومەبەست پێی (عهد)ە، یانی: حوشترەکە، حوشترە ناسراو و زانراوەکە.

ب - یاخود (مبصرة) ناوی بکەر (اسم فاعل)ە، دەگوترێ: (أبصر غيره) واتە: غەیری خۆی والێکرد کە ببینێ و، خاوەن (بصيرة)بێ و بەرچاو ڕوونبێ، واتە: ئەو حوشترە پێبینەربوو بۆ ئەوان، بەرچاو ڕوونکەرەوە بوو بۆ ئەوان، وای لەوان کرد کە ببینن، بزانن، دڵنیابن: کە صاڵح ﷺ پێغەمبەری خوایە، بەڵام ئەوان چییانکرد؟!

أ - ﴿ فَظَلَمُواْ بِهَا ﴾ {(الظلم) مُضَمَّنٌ معنى التكذيب} وشەی (ظلم) مانای بەدرۆدانانی خراوەتە نێو، واتە: بەدرۆیان دانا لە حاڵێکدا کە ستەمیشیان لێکرد!

ب - یاخود ﴿ فَظَلَمُواْ بِهَا ﴾ ستەمکارانە نکووڵییان لێکرد، یانی: (الظلم: مُضَمَّن مَعْنَى الجَحْد) لەم حاڵەتەدا (ظَلموا) دەبێ مانای نکووڵییکردن (جحد)ی خرابێتە نێو.

ج - یاخود: ﴿ فَظَلَمُواْ بِهَا ﴾ واتە: (فكفروا بها ظالمين) پێی بێبڕوابوون لە حاڵێکدا ستەمیشیان لێکرد، چونکە ئەوەبوو دوایی حوشترەکەشیان کوشت.

﴿ وَمَا نُرْسِلُ بِٱلْأَيَٰتِ إِلَّا تَخْوِيفًا ﴿٥٩﴾ ﴾ واتە: نیشانەکانیش نانێرین مەگەر بۆ ترساندن، (أي: نُخَوِّفهُم بهَا، فَإذَا لَمْ يَتَحَقَّقِ الهَدَفُ، أَوْقَعْنَا بِهِم العُقُوبَة) واتە: ئێمە بە هۆی ئەو نیشانەو موعجیزەوە کە دەینێرین، ئەو گەل و کۆمەڵگایە دەترسێنین، ئنجا ئەگەر ئامانجەکە نەهاتە دی و نەترسان، ئەو کاتە سزای خوای دادگەریان بەسەردا دەچەسپێ، هەروەك خوا سزای بۆ گەلی سەموود نارد و لە بەینی بردن، دوای ئەوەی کە بێبڕوابوون بە صاڵح ﷺ هەرچەندە ئەو موعجیزەیەی بۆ هێنان، کە حوشترێك بوو بە بەچکەوە.

مەبەست لەم ئایەتانە ئەوەیە، کە ئێمە بۆیە ئەو جۆرە موعجیزانە بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ نانێرین، چونکە گەلە پێشووەکان پێیان بێبڕوابوون و، ئەگەر گەلی پێغەمبەریش ﷺ واتە: ئەو خەڵکەی پێغەمبەر ﷺ یان بۆ نێردراوە - کە هەم ئەو خەڵکەبوون کە لە ڕۆژگاری خۆی دابوون، لە مەککەو مەدینەو، نیوەدوورگەی عەرەبیی و لە هەموو دنیادا، هەم هەموو مرۆڤایەتیین تاکو دنیا بە کۆتا دێ - خوا ﷻ موعجیزەیەکی بەرهەستی وای بۆ ناردبانایەو، پێی بێبڕوا بوونایە، دەبوو ئەو خەڵکەی لە بەین ببردایە، وەك چۆن گەلی سەموودو گەلەکانی دیکەی لە بەین بردن، بەڵام لەبەر ئەوەی کە نەیویستوە لە بەینیان بەرێ، ئەو جۆرە بەڵگە و موعجیزەیەی بۆ نەناردوون، بەڵکو بەڵگەو موعجیزەیەکی دیکەی بۆ ناردوون، کە لەگەڵ قۆناغی کامڵبوون تێگەیشتن و پێگەیشتنی زیادی بەشەردا دەگونجێ، کە بریتیە لە قورئان، قورئان زیاتر عەقڵ و هۆشی مرۆڤەکان دەدوێنێ، نەك هەستەوەرەکانیان.

دیارە پێشتریش باسی هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتەمان کرد، کە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: خەڵکی مەککە داوایان لە پێغەمبەر ﷺ کرد کە چیای صەفایان بۆ بکاتە زێڕو، ئەو چیایانەی دەوروبەری مەککەیان بۆ لابەرێ و دووریان بخاتەوە، تاکو کشتوکاڵ بکەن، باخ و باخات بنێژن، خواش بە پێغەمبەر ﷺی فەرموو: ئەگەر دەتەوێ ئەوەی داوایانکردوە، بۆیان دێنینەدی، بەڵام ئەگەر پێی بێبڕوابوون، لە بەین دەچن، وەك چۆن گەلانی پێش تۆ لە بەین چوون و ئەگەر بشتەوێ، لێیان لە سەرەخۆ دەبین، پەلەیان لێناکەین، تاکو ئەگەر خۆشیان بڕوانەهێنن، خەڵکێکیان لێ بەرهەم بهێنین، بڕوابێنن، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: بەڵکو پەلەیان لێ ناکەین، خواش بەو بۆنەیەوە ئەم ئایەتەی ناردە خوار.

## مەسەلەی پێنجەم:

**خوا فەرموویەتی: یاد بکەوە! کاتێ پێمان فەرمووی: پەروەردگارت دەوری خەڵکی داوەو، ئەو دیتنەی پێشانمان دای و، درەختی نەفرین لێکراویش لە قورئاندا، تەنیا بۆ تاقیکردنەوەی خەڵك بوون، هەرچەندە دەشیانترسێنین، کەچی هەر یاخیی بوونی گەورەتریان لێ دەردەکەوێ و، لێ زیاد دەبێ:**

خوای پەروەردگار دەفەرمووێ: ﴿ وَإِذْ قُلْنَا لَكَ إِنَّ رَبَّكَ أَحَاطَ بِالنَّاسِ ۚ وَمَا جَعَلْنَا الرُّؤْيَا الَّتِي أَرَيْنَاكَ إِلَّا فِتْنَةً لِّلنَّاسِ وَالشَّجَرَةَ الْمَلْعُونَةَ فِي الْقُرْآنِ ۚ وَنُخَوِّفُهُمْ فَمَا يَزِيدُهُمْ إِلَّا طُغْيَانًا كَبِيرًا ﴿٦٠﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿ وَإِذْ قُلْنَا لَكَ إِنَّ رَبَّكَ أَحَاطَ بِالنَّاسِ ﴾ یاد بکەوە! کاتێ پێمان فەرمووی: بە دڵنیایی پەروەردگارت ئابڵووقەی خەڵکی داوە، دیارە خوا ﷻ پێشتر وای بە پێغەمبەری خاتەم فەرمووە، چونکە لە پێش سوورەتی (الإسراء)دا - وەك پێشتر گوتمان - بەلای کەمەوە، بە پێی ڕای هەندێك لە زانایان، ئەگەر ڕیزبەندیی دابەزینی ژمارە پەنجا (٥٠) بێ، کەواتە: چل ونۆ (٤٩) سوورەتی دیکە، لە پێش ئەم دابەزیون.

کە خوا ﷻ لە سوورەتە مەککەییەکاندا، زۆرجار تەئکیدی لەوە کردۆتەوە، کە ئەو خەڵکە لە ژێر دەستەڵاتی پەروەردگار دان.

ئنجا یاد بکەوە! کاتێ پێمان فەرمووی: پەروەردگارت دەوری خەڵکی داوە (ئابڵووقەی داون)، ئەمە دڵدانەوەیە بۆ پێغەمبەر ﷺ، یانی: تۆ دڵتەنگ مەبەو خەم مەخۆ، ئەوانە لە ژێر ڕکێف و دەستەڵاتی ئێمە دان و ئێمە باڵادەستین بە سەریانەوە، بەڵام خوا تاقییان دەکاتەوە.

٢)- ﴿ وَمَا جَعَلْنَا الرُّؤْيَا الَّتِي أَرَيْنَاكَ إِلَّا فِتْنَةً لِّلنَّاسِ ﴾ واتە: ئەو دیتنەش کە پێشانمان دای، تەنیا بۆ تاقیکردنەوەی خەڵك بوو، کە مەبەست لەم دیتنە - وەك پێشتر گوتمان - دیتنی ئەو نیشانانە بوو، کە پێغەمبەر لە سەفەری شەوڕۆیی و بەرزبوونەوەی (**الإسراء والعروج**) بینیني، کە بە ڕای بەڵگەدارتر: لە ساڵانی سەرەتای پێغەمبەرایەتییدا، ئەو سەفەرە موبارەکە کراوە، کە

لە یەك شەودا، بەڵكو لە بەشێكی شەودا پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەككەوە بۆ قودس چووە و لە وێشەوە بەرزبۆتەوە بۆ ئاسمانەكان، وەك پێشتر بە تەفصیل باسمان كرد، ئنجا خوا دەفەرموێ: ئەو دیتنەمان كە پێشانی تۆدا، تەنیا بۆ تاقیكردنەوەی خەڵك بوو.

هەڵبەتە وشەی (**الرؤيا**) زیاتر بۆ مانای ئەوەی كە لە خەوندا دەبینرێ، بەكاردێ، بەلام بۆ دیتنی چاویش بەكاردێ، بەلام من وای تێدەگەم، هەڵبەتە تەفسیرەكانیش ئاماژەیان پێداوە، كە خوا ﷻ بۆیە ئەو دیتنەی پێغەمبەر ﷺ بینیویەتی لەو شەوەدا، ئەو موعجیزەو بەڵگانەی بینیون، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ لِنُرِيَهُۥ مِنْ ءَايَٰتِنَآ ﴿١﴾ ﴾ الإسراء، یان لە سووڕەتی (**النجم**)دا كە دەفەرموێ: ﴿ لَقَدْ رَأَىٰ مِنْ ءَايَٰتِ رَبِّهِ ٱلْكُبْرَىٰٓ ﴿١٨﴾ ﴾، بۆیە خوا ئەو دیتنەی پێغەمبەر بەچاوی سەر بینیویەتی، ناوی لێناوە: (**رؤيا**)، چونكە ئەوەندە سەیر و سەرسوڕهێنەرە، وەك خەون دەچێ، ئەوەندە شتێكی یاسا درە، ئەوەندە شتێكی نائاسایی بووە، كە لە شێوەی خەون دایە، بۆیە وشەی (**رؤيا**)ی بۆ بەكارهێناوە.

جێی سەرنجیشە: ئەوانەی كە نكووڵییان كردوە لەوەی: ئەو سەفەر و شەو ڕۆییەی پێغەمبەر ﷺ بە جەستە و ڕۆحەوە بووبێ، ئەو وشەیان بە بەڵگە هێناوەتەوە و گوتوویانە: خوا ناوی لێناوە: (**رؤيا**)!! بەلام ئێمە پێشتر بەڵگەمان لەو بارەوە هێنایەوە، كە حیكمەتی ئەوە كە وشەی (**رؤيا**)یەی لێرەدا بەكارهاتوە، بۆ تەعبیركردن لەو سەفەرەی پێغەمبەر ﷺ، كە بە تەئكید بە جەستە و ڕوووحەوە بووە، ئەوەیە كە ئەو سەفەرە هێندە شتێكی سەرسوڕهێنەر بووە، هێندە شتێكی نائاسایی بووە، وەك خەون چووە، ئەگەرنا، لە ڕاستییدا خەون نەبووە.

كە دەفەرموێ: ﴿ فِتْنَةً لِّلنَّاسِ ﴾ وشەی (فتنة) لێرەدا بە مانای ناكۆكییە، بە مانای تێكچوونی سیستمی ژیانە، ئەگەرنا: بە مانای: سزاو ئازارو، تاقیكردنەوەو، گەلێك مانای دیكە بە پێی سیاقەكان بەكارهاتوە، لەو بارەوەش ئەم دەقە هاتوە:

**{عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: (وَمَا جَعَلْنَا الرُّؤْيَا الَّتِي أَرَيْنَاكَ إِلاَّ فِتْنَةً لِلنَّاسِ)، قَالَ: هِيَ رُؤْيَا عَيْنٍ أُرِيَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَيْلَةَ أُسْرِيَ بِهِ إِلَى بَيْتِ الْمَقْدِسِ، قَالَ: وَالشَّجَرَةَ الْمَلْعُونَةَ فِي الْقُرْآنِ؟ قَالَ: هِيَ شَجَرَةُ الزَّقُّومِ} (أخرجه البخاري: ٦٦١٣، والنسائي: ٣١٢، والترمذي: ٣١٣٤).**

واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ)، دەڵێ: مەبەست كە: ﴿ وَمَا جَعَلْنَا ٱلرُّءْيَا ٱلَّتِىٓ أَرَيْنَٰكَ ﴿٦٠﴾ ﴾ دیتنێكی چاو بوو، كە پێشانی پێغەمبەر ﷺ درا،

ئـەو شـەوەی شـەوڕۆیی پێکـرا، بـۆ (**بیت المقدس**)، {یـانی: دیتنـی خـەون نەبـوو}، هەروەها کە دەفەرمـوێ: ﴿ وَٱلشَّجَرَةَ ٱلْمَلْعُونَةَ فِى ٱلْقُرْءَانِ ﴾ ئەمـەش مەبەسـت پێـی درەختـی زەققوومـە.

ئنجا ئەوانەی کە گوتوویانە: مەبەست لە (**رؤیا**) خەونە:

**أ** - هەندێکیان گوتوویانە: ئەو پێشاندانە خەونێك بووە، خوا پێشانی پێغەمبەری داوە ﷺ، کە ئەو شوێنانەی زلەزلەکانی قوڕەیشیان لێ کوژراون لە جەنگی (بەدر)دا، پێشانی دراون، کە ئەو کاتە لە مەککە بووە، پێش جەنگی بەدر، بە چەند ساڵێك.

**ب** - هەندێکیشیان گوتوویانە: مەبەست لەو خەونە، ئەوەیە کە لە ساڵی شەشەمی کۆچییدا کە صوڵحی حودەیبییەی لێ کەوتەوە، ئەوەبوو کافرەکان پێغەمبەر ﷺیان گێڕایەوە، بەڵام دوایی ڕێککەوتن و، لە ساڵی داهاتوودا، کە ساڵی حەوتەم بوو و ناوی لێنرا (**عام عمرة القضاء**) ساڵی گێرانەوەی عومرە، لەو ساڵەدا، خەونەکەی پێغەمبەر ﷺ هاتەدی، وەك خوای پەنهانزان باسی کردوە، دەفەرموێ: ﴿ لَّقَدْ صَدَقَ ٱللَّهُ رَسُولَهُ ٱلرُّءْيَا بِٱلْحَقِّ ﴿٢٧﴾ ﴾ **الفتح**.

زانایـان دەڵێـن: پێغەمبـەر ﷺ ئـەو خەونـەی لـە مەککـە بینیـوە و ئـەوەی گەیاندوەکـە: کاتێـك دێ بـە دەسـتەڵاتەوە دێنـەوە نێـو مەککـە.

بـەڵام ئـەوەی کـە گوتمـان، هـەر ئـەوە زیاتـر بـە عەقـڵ و بـە دڵـەوە دەنووسـێ، کـە مەبەسـت شـەوڕۆیی پێغەمبـەر ﷺ بـووە، چونکـە ئـەوە بـووە هـۆی تاقیکردنـەوەی خەڵـك و تەنانـەت هەندێـك لەوانـەی ئیمانیـان بێهێزبـوەو، هەڵگەڕاونـەوە و کافـرەکان کەرەسـتەیەکی پڕوپاگەنـدەی خەسـت و خۆڵیـان دەسـتکەوت دژی پێغەمبـەر ﷺ بـە حیسـابی خۆیـان، کـە موحەممـەد ئێسـتا شـتێك دەڵـێ، لـە عەقڵـی کەسـەوە ناچـێ! تاقیکردنەوەکـە لـەوە دابـووە، ئەمـما ئـەو خەونانـەی کـە بینیـونی، نەبوونـە هـۆی تاقیکردنـەوە بـۆ خەڵـك، بۆیـە ئـەوەی کـە لێـرەدا دەگونجـێ هـەر ئـەو واتایەیـە کـە پێشـتر هەڵمانبـژاردوەو باسـمانکرد.

لـە کۆتایـی دا خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَنُخَوِّفُهُمْ فَمَا يَزِيدُهُمْ إِلَّا طُغْيَـٰنًا كَبِيرًا ﴾ واتـە: هەرچەنـدە دەیانترسـێنین، بـەڵام هـەر یاخیـی بـوونی گەورەتریـان تێـدا زیـاد دەکات، واتـە: هەرچەنـدە دەیانترسـێنین و هەڕەشـەیان لـێ دەکەیـن، کـە ئەگـەر ئیـمان نەهێنـن، سـزاتان دەدەیـن، ئـەوە گەلـە پێشـووەکانن، دەرسـیان لـێ وەربگـرن، ئەهـا ئـەوان کـە بەرانبـەر بـە پێغەمبەرەکانیـان ناسـپاس بـوون، خراپەکاربـوون، سـتەمکاربوون، چییـان بەسـەرهات! هەرچەنـدە دەیانترسـێنین و بەسـەرهاتەکانیان بـۆ دەگێڕینـەوە، بـەڵام هـەر یاخیبـوون و بوغرابـوونی زیاتریـان تێـدا پەیـدا دەکات! ئینسـان ئەگـەر میزاجـی تێکچـوو، خـواردنی خـۆش و

باشـیش بخـوات، لەبەرئـەوەی میزاجەکـەی ناتـەواوە، هـەر زیاتـر پێـی تێکدەچـێ، دەبـێ سـەرەتا نەخۆشـییەکەی لابـرێ، ئنجـا سـوود دەبینـێ و بەهرەمەنـد دەبـێ لـەو خـواردن و خۆراکـەی دەیخـوات، واتـە: ئـەو ئایەتـە قورئانییانـە کـە هاتوونـە خـوار بـۆ کافـرەکان، هـەر پـتر کوفـرو خراپـەی تێـدا زیـاد کـردوون، لەبـەر ئـەوەی میزاجەکەیـان لای داوەو تێکچـووە.

ئنجـا: ﴿ وَٱلشَّجَرَةَ ٱلْمَلْعُونَةَ فِى ٱلْقُرْءَانِ ﴾ درەختـی نەفریـن لێکـراو، لـە قورئـان دا بـاس نەکـراوە، چییـە؟ هەروەهـا لـە فەرمایشـتی پێغەمبەریـش دا ﷺ نەهاتـوە، بـەڵام لـە سـۆنگەی ئـەوەوە کـە: هیـچ درەختێـك، بـە زەمکردنـەوە هێنـدەی (زەققـووم) بـاس نەکـراوە، کـە خـوای پـەروەردگار دەفەرمـوێ: ﴿ طَلْعُهَا كَأَنَّهُۥ رُءُوسُ ٱلشَّيَٰطِينِ ﴿٦٥﴾ ﴾ **الصافـات**، واتـە: بـەری ئـەو درەختـە، میـوەی ئـەو درەختـە، وەك سـەری شـەیتانان وایـە، بێگومـان کەسـیش سـەری شـەیتانانی نەبینیـوە، بـەڵام لـە خەیـاڵ و وەهمـی هەمـوو کەسـدا، سـەری شـەیتان شـتێکی دزێـوو ناقۆڵایـە! بەڵـێ لەبـەر ئـەوەی هیـچ درەختێـك ئەوەنـدەی دەرحتـی زەققـووم زەم نەکـراوە، بۆیـە وا پێدەچـێ، کـە مەبەسـت پێـی ئـەو بـێ و ئەویـش بـوو بـە هـۆی تاقیکردنـەوە بـۆ کافـرەکان، کـە ئەبـوو جەهـل و هەنـدێ لـە زلـەزلانی قورەیـش دەیانگـوت: خەڵکینـە! بیسـتووتانە لـە نێـو ئاگـردا درەخـت بـڕوێ؟! موحەممـەد دەڵـێ: درەختێـك لـە دۆزەخـدا هەیـە، بـەری هەیـەو بەرەکـەی زۆر تـاڵ و ناخۆشـە! نێـو دۆزەخیـش ئاگـرە، کەچـی موحەممـەد دەڵـێ: ئـەو درەختـە لەوێـدا ڕواوە!![1] دیـارە بەشـەر ئەگـەر لـە چوارچێـوەی بچـووکی دنیـای خـۆی دەرنەچـێ، بـڕوا بـەو شـتانە ناهێنـێ، بـەڵام بـڕوا هێنـان بـە پەنهـان (**غیـب**) و، بـە دەسـتەڵاتی بـێ سـنووری خـوا و، بڕواهێنـان بـەوەی کـە ڕۆژی دوایـی هـەم بەهەشـتەکەی، هـەم دۆزەخەکـەی، جیایـە لـە وەزعـی ئێسـتای دنیـا، ئـەوە وات لێـدەکات کـە تـۆ سـنوورو ئاسـۆی دڵ و فیکـرت فراوانتربـێ و، بـڕوا بـەو شـتانە بێنـی کـە پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ لەلایـەن خـواوە هەواڵیـان پـێ دەدا، یـان ئـەو شـتانەی کـە خـوای پەنهانـزان دەیانفەرمـوێ.

بەڵـێ ئـەو درەختـی زەققوومـەش، بـوو بـە هـۆی فیتنـەو تاقیکردنـەوە بـۆ کافـرەکان، کـە گومـان بخەنـە سـەر ڕاسـتیی پێغەمبـەر ﷺ، وەك چـۆن سـەفەرە شـەوڕۆییەکەشی کەرەسـتەیەکی دیکـەی تاقیکردنـەوە بـوو بۆیـان.

---

(١) الإستيعاب فـي بيـان الأسـباب، ج٣، ص١٥٩ {أخرجـه الطبري فـي جامـع البيـان (٢٣/٤٠، ١٤١)} قلنـا: وهـذا مرسـل صحيـح الإسـناد، وذكـره السـيوطي في (الـدر المنثـور)، (٧/٩٥) و زاد نسـبته .... عبـد بـن حميـد وابـن أبي حاتـم.

خواش ﷻ بەندەکانی خۆی تاقیدەکاتەوە و، ئەوەش تاقیکرنەوەبوو بۆ بڕواداران، کە ئایا بڕوای پێ دێنن؟ هەروەها تاقیکرنەوەش بوو بۆ کافرەکانیش، خوای کارزان و پەروەردگاریش بەندەکانی خۆی تاقیدەکاتەوە، ئنجا ئەوەی لە تاقیکردنەوەکان، سەربەرزانە دەرچوو، ئەوە لە لای خوا بەندەیەکی پەسندە و، کەسێکیش متمانەی بە خوا بێ و، بەڕاستیی خوا بناسێ، زانیاریی بێ سنووری، دەستەڵاتی بێ سنووری، حیکمەتی بێ سنوور و ڕەهای، دیارە هەر شتێك خوا بفەرموێ دەیکەم و کردوومە و پێمدەکرێ، لە سەدا سەد (١٠٠/١٠٠) لێی دڵنیادەبێ، هەروەها هەر شتێك پێغەمبەری خوا ﷺ لەلایەن خواوە هەواڵی پێبدات، بە تەواویی لێی دڵنیا دەبێ، بەو شێوەیەش لە تاقیکردنەوەی خوای دادگەر و کارزان دەردەچێ، خوا (عزوجل) ئێمە لەو کەسانە بگێڕێ، کە لە هەموو تاقیکردنەوەکانی خوا، سەربەرزانە و ڕووسوورانە دەردەچن و، سەرەنجام دەبن بەو بەندانەی کە لەلای خوا پەسندو خۆشویستراوو جێگای ڕەزامەندیین.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان پێنج (٥) ئایەت دەگرێتە خۆی، کە بریتین لە ئایەتەکانی: (٦١ - ٦٥)، لەو پێنج ئایەتەدا، خوای زانای شارەزا ﷻ باسی بەسەرهاتی ئادەم عليه السلام و ئیبلیس - نەفرینی خوای لێبێ - کردوە، کە پاش ئەوەی خوا ﷻ فەرمان بە فریشتەکان دەکات، کڕنووشی ڕێزگرتن بۆ ئادەم ببەن، کە ئیبلیسیش لە نێو واندا بووە، هەرچەندە ئیبلیسیش فریشتە نەبووە، بەڵکو لە جینن بووە، بەلام وێڕای ئەوە کە فریشتەکان هەموویان کڕنووشی ڕێزگرتن بۆ ئادەم دەبەن، ئیبلیس ئامادە نابێ ئەو کڕنووشە ببات و ئەو ڕێزە لە ئادەم بگرێ، خواش ﷻ نەفرینی لێ دەکات، ئەویش هەڕەشەی گومڕاکردنی تێکڕای وەچەی ئادەم، لە ئادەم و وەچەکەی دەکات، کە هەموویان گومڕا دەکات و بنبڕیان دەکات و جگە لە هەندێکیان.

خوای کارزانیش ﷻ بێ منەتی دەکات و ڕای دەگەیەنێ کە ئیبلیس توانای بەسەر بەندە هەڵبژاردە و ساغەکانی دا ناشکێ.

﴿ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَـٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِـَٔادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ قَالَ ءَأَسْجُدُ لِمَنْ خَلَقْتَ طِينًا ﴿٦١﴾ قَالَ أَرَءَيْتَكَ هَـٰذَا ٱلَّذِى كَرَّمْتَ عَلَىَّ لَئِنْ أَخَّرْتَنِ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ لَأَحْتَنِكَنَّ ذُرِّيَّتَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٦٢﴾ قَالَ ٱذْهَبْ فَمَن تَبِعَكَ مِنْهُمْ فَإِنَّ جَهَنَّمَ جَزَآؤُكُمْ جَزَآءً مَّوْفُورًا ﴿٦٣﴾ وَٱسْتَفْزِزْ مَنِ ٱسْتَطَعْتَ مِنْهُم بِصَوْتِكَ وَأَجْلِبْ عَلَيْهِم بِخَيْلِكَ وَرَجِلِكَ وَشَارِكْهُمْ فِى ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَوْلَـٰدِ وَعِدْهُمْ ۚ وَمَا يَعِدُهُمُ ٱلشَّيْطَـٰنُ إِلَّا غُرُورًا ﴿٦٤﴾ إِنَّ عِبَادِى لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَـٰنٌ ۚ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ وَكِيلًا ﴿٦٥﴾ ﴾

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

{هەروەها یادبکەوە! کاتێك بە فریشتەکانمان فەرموو: کڕنووش (ی ڕێزگرتن بۆ ئادەم) ببەن و، یەکسەر هەموویان کڕنووشیان برد، جگە لە ئیبلیس، گوتی: ئایا کڕنووش بۆ کەسێك بۆ دروستکراوێك ببەم، کە لە قوڕێ دروستتکردووە؟! ﴿٦١﴾ (ئیبلیس) گوتی: ئایا ئەو کەسەت دیوە کە بە سەرمندا هەڵتبژاردووە و، ڕێزت لێناوە، ئەگەر هەتا ڕۆژی قیامەتێ دوام بخەی، (بەهێڵیەوە) تێکڕای وەچەکەی جگە لە کەمێك، هەموویان گومڕا و بنبڕ دەکەم ﴿٦٢﴾ (خوا) فەرمووی: بڕۆ (چیت لە دەست دێ بیکە)، هەر کەسێك لەوان شوێنت بکەوێ، بە دڵنیایی دۆزەخ سزاتانە، سزایەکی پڕ بە پێست و تەواو ﴿٦٣﴾ هەر کەسێکیش کە پێت دەکرێ بە دەنگ دان و خوتخوتەت، لەوان تاوی بدە و ڕای پێچە و، سوارە و پیادەی خۆتیان بەسەر وەربکە و، لە سامان و ڕۆڵەکانیاندا بەشدرییان بکە و، گفتیشیان پێ بدە (گفت و بەڵێنی درۆ و فریودەر) شەیتانیش تەنیا گفتی فریودەرانەیان پێدەدات ﴿٦٤﴾ بە دڵنیایی تۆ دەسەڵاتت بەسەر بەندە (ساغ و دامەزراوە)کانمدا نیە و، پەروەردگاریشت بەسە بریکار و سەرپەشتیار(ی بەندە ساغەکانی) بێ ﴿٦٥﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(لَأَحْتَنِكَنَّ): واتە: (لَأَسْتَأْصِلَنَّ)، ڕیشە کێشیان دەکەم، بنبڕیان دەکەم، ئەم وشەیە لەوەوە هاتوە، دەگوترێ: (حَنَكَ الفَرَسَ: جَعَلَ فِي فِيهِ الرَّسَنَ)، (حَنَكَ الفَرَسَ)، واتە: لغاوی لە زار کرد، (رَسَنْ) بە ڕێشمەش دەگوترێ و، بە (لغاو)یش دەگوترێ، ئەو لغاوەی کە لە زاری ئەسپ دەکرێ، بۆ ئەوەی لەوەڕی بۆ نەخورێ، هەروەها بە ڕێشمەش دەگوترێ، (وَاحْتَنَكَ الجَرَادُ الأَرْضَ: أَكَلَ مَا عَلَيْهَا، وَأَتَى عَلَى نَبْتِها)، (وَاحْتَنَكَ الجَرَادُ الأَرْضَ)، کوللە زەوییەکەی ڕووتەن کرد، هەرچی لێی بوو، خواردی، واتە: هیچی لەسەر نەهێشت و بنبڕی کرد.

(مَّوْفُورًا): (وَفَرَ الشَّيءُ يَفِرُ: تَمَّ وَكَمُلَ)، واتە: ئەو شتە تەواو بوو، هەمووی هاتەدی، (وَفَّرْتُهُ مُبَالَغَةٌ)، (وَفَّرْتُهُ)، واتە: زۆرم کرد، ئەمە زێدەڕۆییە لە (وَفَرَ)ە، (وَفَرَ)، واتە: زۆر بوو، بەڵام (وَفَّرَهُ)، یانی: شتەکەی زۆر زۆر کرد، زێدەڕۆیی کردنە لە (وَفَرَ)دا.

( وَٱسْتَفْزِزْ ): (فَـزَّهُ: أَزْعَجَـهُ، الإِسْـتِفْزَاز: الإِزْعَـاجُ)، (إِسْـتِفْزِزَ أَي: أَزْعِـجْ) ،(فَـزَّهُ أَي: أَزْعَجَـهُ)، واتـە: بێـزاری کـرد، یاخـود لـە شـوێنی خـۆی هەڵیقەنـد، تـاوی دا، ڕای پێچـا، (إِسْـتَفْزِزْ)، یانـی: هەڵپێچـە و تـاو بـدە و، لـە شـوێنی خۆیـان نارەحەتیـان بکـە، کـە ئـەوێ بەجـێ بهێڵـن، یاخـود لـە پێـش تـۆوە بـڕۆن.

(وَأَجْلِبْ ): (أَصْلُ الجَلْبِ: سَوْقُ الشَّيءِ)، (جَلْـب)، بریتیـە لـە ئـەوە کـە شـتێك پێـش خـۆت بـدەی و لێـی بخـوڕی، (أَجْلَبْتُ عَلَيْهِ: صِحْتُ عَلَيْهِ بِقَهرٍ)، (أَجْلَبْتُ عَلَيْهِ)، واتـە: بـە سـەریم دا هـاوار کـرد، (أَجْلَبَ عَلَيْهِ)، واتـە: بـە سـەریدا شـیڕاند، بەسـەریدا هـاواری کـرد، دەنگـی بـە سـەردا بـەرز کـردەوە، بۆیـە دەنگـی بـە سـەردا بـەرز دەکاتـەوە، تاکـو پێـش خـۆی بـدات و، لێـی بخـوڕێ و، هەڵیپێچـێ.

کەواتە: (وَأَجْلِبْ عَلَيْهِم)، یانی: بە سەریاندا هاوار بکە و، هەڵیانپێچە.

(بِخَيْلِكَ ): (خَيْـل) نـاوی کۆیـە، بـۆ ئەسـپ، لـە غەیـری بێـژەی خـۆی، (فَـرَس)، یانـی ئەسـپ، بـەڵام (خَيْـل)، واتـە: کۆمەڵـە ئەسـپێك، کۆمەڵـە وەڵاخـە بەرزەیـەك، (أَصْـلُ الإِجْـلاب: السَّـوْقُ بِجَلَبَـةٍ مِـنَ السَّـائِق)، لـە ڕیشـەدا (إجـلاب) بریتیـە لـە پێـش خـۆدان و، لێخوڕینـی کۆمەڵـە ئاژەڵێـك، یـان کۆمەڵـە خەڵکێـك، بـە دەنگـدان و بەسـەردا هاوارکردنـی بابـای لێخـوڕ.

کەواتــە: (أَجْلَــبَ عَــلَى العَــدُوِ: جَمَــعَ عَلَيْــهِ)، خەڵکــی لێکۆکــردەوە، دوژمنــی بەســەردا کۆکـردەوە، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ بِخَيْلِكَ وَرَجِلِكَ ﴾،واتـە: سـوارە و پیـادە، سـوارە و پیـادەی خۆتیـان بەسـەر وەرکـە، بەسـەردا کۆبکـەوە، چونکـە (الجَلَبَـةُ: الأَصْـوَات) واتـە: دەنگـەکان.

(وَرَجِلِكَ ): (رَجِـلٌ وَرَاجِـل: المَـاشِي، وَالجَمْـعُ: رَجَّالَـةَ وَرَجْـل، وَرِجَـال نَحْـوُ رِكَابْ، لِجَمْـعِ الرَّاكِـبْ)، (رَجِـلْ و رَاجِـل)، هەردووکیـان بـە مانـای پێـڕۆ، کەسـێك کـە، بـە پێیـان دەڕوات، (رَجِـلْ) و (رَاجِـل)، هەردووکیـان بـە (رَجّالَـة) و (رَجْـل)، کۆدەکرێنـەوە، هەروەهـا (رِجال)یـش، کـۆی (راجـل)ە، وەك چـۆن (رِكَاب) کـۆی (رَاكِـبَ)ە، واتـە: سـوارەکان.

(غُرُورًا): یانـی: فریـودان، (غَـرَرْتُ فُلَانـاً: أَصَبْتُ غِرَّتَـهُ، وَنِلْـتُ مِنْـهُ مَـا أُرِيـدُهُ)، واتـە: فـڵان کەسـم هەڵخەڵەتانـد، ئـەوەی کـە دەمـەوێ لـەو چنگـم کـەوت، (وَالغِـرَّةُ: غَفْلَـةٌ فِي يَقْظَـةَ)، (غِـرَّة) بریتیـە لـە بێئاگاییـەك لـە حاڵەتـی بێدارییـدا، (وَغَـرَّهُ كَـذَا غُـرُوراً)، ئـەو شـتە فریویـدا، (وَالغَـرُورُ كُلُّ مـا يَغُـرُّ الإِنْسَـانَ مِـنْ مَـالٍ، وجَـاهٍ، وَشَـهْوَةٍ، وَشَـيْطَان)، (غَـرُور)، واتـە: فریـودەر، هـەر شـتێك کـە ئینسـان فریـو دەدا و هەڵیدەخەڵەتێنـێ، لـە سـامان و ناوبانـگ و ئـارەزوو و شـەیتان.

## مانای گشتی ئایەتەکان

ئێمە لە سەرەتای سوورەتی (**الأعراف**)دا، بە درێژیی باسی بەسەرهاتی: ئادەم و حەووا (**عليهما الصَّلاةُ وَالسَّلام**)، دایك و بابی مرۆڤایەتیی لە لایەك و ئیبلیس لە لایەكی دیكە وەمان كرد، لەوێ بەسەرهاتیانمان بە درێژیی باسكردوە، بۆیە لێرە، چ لە مانای گشتییدا، چ لە مەسەلە گرنگەكاندا، بە خێرایی بەسەریدا دەڕۆین، چونكە ئەو بەسەرهاتە لە گەلێك شوێنی قورئاندا هاتوە، ئنجا ئێمە لە سەرەتای سوورەتی (**الأعراف**) ئایەتەكان: (١٠-٢٥) واتە: (١٦)دا، كە باسی بەسەرهاتی ئادەم و حەووا (**عَلَيْهِما الصَّلاةُ وَالسَّلام**) و ئیبلیس دەكەن، لێكۆڵینەوەیەكی تێر و تەسەلمان كردوە و، هەموو ئەو ئایەتانەی لە هەموو ئەو سوورەتەكاندا هاتوون لەو بارەوە، هێناومانن و شیمان كردوونەوە. دووبارە بوونەوەی بەسەرهاتی ئادەم و حەوواش (**عليهما الصَّلاةُ وَالسَّلام**)، لەگەڵ ئیبلیسدا، كە ئادەم و حەووا باب و دایكی مرۆڤایەتیین و ئیبلیسیش بابی جیننە و، جینن هەموویان وەچەی ئەون، گەلێك پەند و عیبرەت و دەرسی گەورە گەورەی تێدان، بۆیە خوا ﷻ لە چەند سوورەتێكدا ئەو بەسەرهاتەی هێناوە، بەڵام هیچی دووبارە كردنەوەی، بە مانای دووبارەكردنەوە نیە، بەڵكو لە هەر شوێنێك دا كە ئەو بەسەرهاتە هاتوە، كۆمەڵێك دەرس و پەندی دیكەی تێدان و، لە ڕوویەكی دیكە و، بە ئیعتیبارێكی دیكە هاتوەو، شتی تازەی تێدایە.

لێرەدا خوا ﷻ هەر بە كورتیی ئەو بەسەرهاتە دێنێ، لەبەر ئەوەی هەم لە سەرەتای سوورەتی (**الأعراف**)دا، و لە سوورەتی (**ص**)دا و، لە گەلێك جێی دیكەی قورئان دا، كە پێش سوورەتی (**الإسراء**) دابەزیون، خوا ئەو بەسەرهاتەی هێناوە، بۆیە لێرەدا بە كورتیی باسی كردوە، چونكە وەك باسمان كرد: ئەم سوورەتە لەو سوورەتانەیە كە پێش وی ژمارەیەكی باش سوورەتی دیكە دابەزیون.

خواش ﷻ بەسەرهاتێك كە بە درێژیی لە شوێنێك، یان لە چەند شوێنێكدا باسی كردوە، دوایی كە باسی دەكات، ئاماژەیەكی كورتی پێ دەكات و لێرەشدا بەو شێوەیە.

خوا عز وجل فەرموویەتی:

﴿ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُواْ لِءَادَمَ ﴾، یادبكەوە! كاتێك كە بە فریشتەكانمان فەرموو: كڕنووش بۆ ئادەم بەرن.

هیچ گومانی تێدانیە، کە مەبەست لە کڕنووش (**سجود**) لێرەدا، واتە: سڵاوی لێ بکەن، کڕنووشی ڕێزگرتنی بۆ بەرن، چونکە کڕنووش بە مانا باوە شەرعییەکەی، وەك زاراوەیەکی شەرعیی ئێستا لەلای ئێمە ئەوەیە: کە سەر بخەیە سەر زەوی، بەڵام لە قورئاندا کڕنووش بە مانای چەمینەوە، دێ، هەروەها بە مانای ڕێزلێگرتن و سڵاو لێکردن دێ، کە بە تەئکید لێرەدا مەبەست ئەوەیە، چونکە کڕنووشی پەرستش، کڕنووش بە مانا باوەکەی، تەنها بۆ خوا ﷻ دەبردرێ و، لە تەفسیری سوورەتی (**یوسف**)یش دا لەوبارەوە لە کاتی تەفسیرکردنی: ﴿ وَرَفَعَ أَبَوَيْهِ عَلَى ٱلْعَرْشِ وَخَرُّواْ لَهُۥ سُجَّدًا ﴾دا کورتە باسێکمان لەوبارەوە کردوە.

﴿ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبْلِيسَ قَالَ ءَأَسْجُدُ لِمَنْ خَلَقْتَ طِينًا ﴾، تێکڕا هەموویان کڕنووش (ی ڕێزگرتن)یان بۆ (ئادەم) برد و سڵاویان لێ کرد، ڕێزیان لێنا، جگە لە ئیبلیس، ﴿ قَالَ ءَأَسْجُدُ لِمَنْ خَلَقْتَ طِينًا ﴾، گوتی: ئایا کڕنووش بۆ دروستکراوێك بەرم، بۆ کەسێك بەرم کە لە قوڕێ دروستت کردوە؟ ئەم پرسیارکردنە پرسیارکردنی نکوولیلێکەرانەیە، واتە: ناگونجێ و فەرمانەکەی تۆ لە جێی خۆیدا نیە، ئنجا ئەوە بەر لەوەی بێ فەرمانیی خوا بێ، ڕەخنە گرتنە لە خوا ﷻ ! ئنجا کە دەڵێ: لەبەر ئەوەی ئەوت لە قوڕێ دروستکردوە، لێرەدا ئیبلیس خۆی بە و کەرەسەیەوە کە لێی دروست کراوە، خۆی بە جەستەی خۆیەوە، هەڵدەکێشێ، لە حاڵێکدا کە جەوهەری هەر دروستکراوێك، لە کار و ئەرکەکەیدا، لەوەدا کە بە ئیرادەی خۆی ئەنجامی دەدا، شێردراوەتەوە، نەك لەو کەرەسەیەی کە لێی دروستکراوە، کە هیچ ئیرادە و هەڵبژاردنی خۆی تێدانیە.

پێشتریش گوتوومانە: لە هەموو شوێنەکاندا، خوا ﷻ کە باسی ئەوە دەکات، کاتێك فەرمانی بە فریشتەکانی کردوە، کڕنووش بۆ ئادەم بەرن، یەکسەر باسی ئیبلیسیش دەکات، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە ئیبلیس فریشتە بووە، بەڵکو ئیبلیس لە جینن‌ـە، بەڵام لە نێو فریشتەکاندا بووە، بەڵگەشمان لەسەر ئەوە کە ئیبلیس لە جندە، ئەوەیە کە لە سوورەتی (**الكهف**)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ كَانَ مِنَ ٱلْجِنِّ فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِۦٓ ﴿٥٠﴾ ﴾، واتە: ئیبلیس لە جینن بوو، (واتە: بابی جیننە) بۆیە لە فەرمانی پەروەردگاری دەرچوو، ئنجا خوا ﷻ لە چەندان شوێن دا، بە ئێمەی ڕاگەیاندوە کە فریشتەکان لە فەرمانی خوا دەرناچن: ﴿ لَّا يَعْصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ ﴿٦﴾ ﴾التحريم.

کەواتـە: ئیبلیـس کـە توانیویەتـی لـە فەرمانـی خـوا دەربچـێ، مانـای وایـە جیابـووە لـە فریشـتە، چونکـە فریشـتە لـە فەرمانـی خـوا دەرناچـن، ئایەتەکـەی سـوورەتی (**الکهف**)یـش بە ڕوونیـی نوقتـە دەکاتـە سـەر پیـت کـە لـە جینـن بـووە.

﴿ قَالَ أَرَءَيْتَكَ هَٰذَا ٱلَّذِى كَرَّمْتَ عَلَىَّ ﴾، ئیبلیـس لەسـەر ڕەخنەگرتنـی لـە خـوا ﷻ بـەردەوام دەبـێ و، لەسـەر بـێ ئەدەبیـی کردنـی بەرانبـەر بـە پـەروەردگاری بـەردەوام دەبـێ، دەڵـێ: ئایـا ئـا ئـەوەت بینیـوە، ئـەو دروسـتکراوەت بینیـوە، ئـەو کەسـەت بینیـوە، کە ڕێـزت لێگرتـوە و بەسـەر منـدا هەڵتبـژاردوە: ﴿ أَرَءَيْتَكَ هَٰذَا ٱلَّذِى ﴾، ئـەم شـێوازە دەربڕینـە سـووکایەتیی پێکردنـی ئیبلیـس دەگەیەنـێ بـە ئـادەم، ئـا ئـەوە دەبینـی! ئـا ئـەو کەسـە دەبینـی کـە بەسـەر منـدا هەڵتبـژاردوە و ڕێـزت لێنـاوە و، لـە مـن زیاتـر ڕێـزت لێنـاوە!

﴿ لَئِنْ أَخَّرْتَنِ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴾، ئەگـەر تـۆ دوامبخـەی تاکـو ڕۆژی هەڵسـانەوە، واتـە: بمهێڵیـەوە و نەممرێنـی، ﴿ لَأَحْتَنِكَنَّ ذُرِّيَّتَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلًا ﴾، وەچەکـەی تێکـڕا جڵـەو دەکـەم، یاخـود بنبـڕ دەکـەم، کـە دەڵـی: جڵەویـان دەکـەم، واتـە: وەك چـۆن ئەسـپێك جڵـەو دەکـرێ، ئەسـپێك لغـاو دەکـرێ، ئیختیـار و ئیـرادەی دەکەوێتـە دەسـتی ئـەو کەسـەی چۆتـە سـەر پشـتی و سـواری بـووە، منیـش وەچـەی ئـادەم ئـاوا لـێ دەکـەم، پێـش خۆمیـان دەدەم و ویسـتیان زەوت دەکـەم، وەك چـۆن وڵاخێـك کاتێـك سـوارەکە سـواری دەبـێ و لغـاوی دەکات و بـواری نیـە بڵـەوەڕێ و کاتێـك لغاوەکـەی لـێ تونـد دەکات، ئەزیەتـی پـێ دەگات و، بـە ناچاریـی ئـەو کەسـەی سـواری بـووە، بـۆ کوێـی بـوێ، ئـاوا دەڕوات، منیـش ئـاوا وەچـەی ئـادەم وا لێدەکـەم، ﴿ إِلَّا قَلِيلًا ﴾، جگـە لـە کەمێکیـان.

یاخـود ﴿ لَأَحْتَنِكَنَّ ﴾، یـانی: بنبـڕی دەکـەم (**إحتنـك**)، یـانی: بنبـڕی کـرد، هەمـووی خـوارد، چەنەگـەی خسـتە سـەرێ و هەمـووی خـوارد، وەك چـۆن دەگوتـرێ: (**إحْتَنَكَ الجَرَادُ الأرْضَ**)، واتـە: کوللـە زەوییەکـەی ڕووتانـدەوە و خـواردی و بنبڕی کـرد، کەواتە: ﴿ لَأَحْتَنِكَنَّ ذُرِّيَّتَهُۥٓ ﴾، یـان بـە مانـای ئـەوە دێ: لغاویـان دەکـەم و پێـش خۆمیـان دەدەم، یـان: بنبڕیـان دەکـەم و هیچیـان لـێ ناهێڵـم، واتـە: هیچیـان لـێ ناهێڵـم لەسـەر ڕێـی تـۆ ئـەی پـەروەردگار! بەڵکـو هەموویـان گومـڕا دەکـەم و سـەر لـێ دەشـێوێنم، جگـە لـە کەمێکیـان.

خـوا فەرمـووی: ﴿ قَالَ ٱذْهَبْ فَمَن تَبِعَكَ مِنْهُمْ فَإِنَّ جَهَنَّمَ جَزَآؤُكُمْ جَزَآءً مَّوْفُورًا ﴾، واتـە: [چیـت لـە دەسـت دێ، بیکـە]، هـەر کەسـێك لـەوان شـوێنت کـەوێ، ئـەوە دۆزەخ سـزاتانە، سـزایەکی زۆر، سـزایەکی پـڕ بـە پێسـت، سـزایەکە بەشـی هەمووتـان دەکات.

لێرەدا دیار نیە کە ئایا خوا ﷻ وەڵامی داواکارییەکەی ئیبلیسی داوەتەوە، کە هەتا قیامەت بیهێڵێتەوە، یان نا؟

بەڵام لە شوێنی دیکە دەفەرموێ: ﴿ قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ ٱلْمُنظَرِينَ ﴿٨٠﴾ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْوَقْتِ ٱلْمَعْلُومِ ﴿٨١﴾ ﴾ص، تاکو ڕۆژی کاتێکی دیاریکراو، کە مەبەست پێی ئاخیر زەمان (ساعة)ە، واتە: تاکو قیامەت ناتهێڵمەوە، بەڵکو تاکو ئەم گەردوونە کۆتایی پێ دێ، دەتهێڵمەوە، نەك بکەویە کاتێك کە فووی دووەمیش بە کەڕەنادا دەکرێ و، ئنجا هەڵسانەوە و زیندووبونەوەی دروستکراوەکان دێتە پێشێ، تاکو ئەو کاتە نا، بەڵام ئەو کاتەی کە دنیا بە کۆتا دێ، واتە: تاکو مرۆڤێك لەسەر زەوی مابێ، تۆش دەمێنی.

﴿ وَٱسْتَفْزِزْ مَنِ ٱسْتَطَعْتَ مِنْهُم بِصَوْتِكَ ﴾، هەر کەسێکت لەوان بۆت هەڵدەپێچرێ، هەڵیپێچە بە دەنگی خۆت، دەنگی بدە، تاوی بدە.

(إسْتِفْزَاز)، یانی: (إزْعاجْ)، واتە: کەسێك لە شوێنێك هەڵیکەنی و ڕەپێچەکی دەی و پێش خۆتی بدەی، بەرەو ئەو جێیە و ڕووە و ئەو مەبەستەی دەتەوێ، یانی: هەر کەسێك لەوان، کە دەتوانی، بە دەنگی خۆت هەڵیپێچە.

﴿ وَأَجْلِبْ عَلَيْهِم بِخَيْلِكَ وَرَجِلِكَ ﴾، سوارە و پیادەی خۆتیان بەسەر وەربکە.

بێگومان لێرەدا مەبەست لە: دەنگی خۆت و سوارەو پیادە، مانا ڕواڵەتییەکەیان نیە: [بەسەریاندا هاواربکە و، سوارە و پیادەی خۆتیان بەسەر وەربکە]، ئەگەرنا یەکێك بۆی هەیە، بڵێ: کوا دەنگی شەیتان لە کوێ دەبیسترێ؟ کوا سوارە و پیادەی شەیتان؟ بەڵکو مەبەست پێی ئەوەیە کە وەك چۆن کەسێك بیەوێ کۆمەڵە خەڵکێك پێش خۆی بدات، بە سەریاندا هاوار دەکات، ئنجا سوپای خۆی کە سوارەن، تێیان بەردەدا، پاشان ئەوانەی کە پیادەشن، پێڕۆن، بەسەریان وەردەکات، واتە: هێز و توانای خۆی، هەمووی بەکاردێنێ، بۆ پێش خۆدانی ئەو خەڵکە، ئەی شەیتان! تۆش ئاوایان لێ بکە، چی لە دەستت دێ، بیکە.

﴿ وَشَارِكْهُمْ فِى ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَوْلَٰدِ ﴾، هەروەها لە سامانەکان و ڕۆڵەکانیاندا، بەشداریان بە، واتە: چی لە دەستت دێ، لە ماڵ و سامانەکانیان بۆ خۆت بەکاری بێنە، تێیدا بەشدار بەو، بەو شێوەیان لێبکە، کە ماڵ و سامانەکەیان لە هێنانەدی ئامانجەکانی تۆدا، بەکاربێنن، هەروەها ڕۆڵەکانیشیان بەو شێوەیە مامەڵەیان، لەگەڵدا بکە، کە تۆ

دەتەوێ ﴿ وَعِدْهُمْ ﴾، هەروەها گفتیشیان پێ بدە، بەڵێنیشیان پێبدە، دڵیشیان خۆش بکە، ﴿ وَمَا يَعِدُهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ إِلَّا غُرُورًا ﴾، شەیتانیش تەنیا بەڵێن و گفتی فریو دەریان پێدەدا، تەنیا تاوان و خراپەیان بۆ دەڕازێنێتەوە و هەڵیان دەخەڵەتێنێ.

﴿ إِنَّ عِبَادِي لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَٰنٌ ﴾، بەڵام بە دڵنیاییەوە بەندەکانی من، تۆ دەستەڵاتت بەسەریاندا ناشکێ، واتە: بەندە هەڵبژاردەکانی من، بەندە ساغەکانی من.

ئنجا ئایا ئەوە چۆن دەزانین؟ بەهۆی ئەوەوە کە: لە شوێنەکانی دیکەدا، ئیبلیس خۆی دەڵێ: ﴿ إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿٨٣﴾ ﴾، جگە لە بەندە هەڵبژاردەکانت، کە خوێنراویشەتەوە: (**المُخْلِصِين**)، واتە: بەندە خۆ ساغکەرەوەکانت، ئەوانە ئیبلیس خۆی گوتوویەتی: دەستەڵاتم بەسەریاندا ناشکێ، ئنجا خوای پەروەردگاریش لەوێدا فەرموویەتی: ﴿ قَالَ هَٰذَا صِرَٰطٌ عَلَيَّ مُسْتَقِيمٌ ﴿٤١﴾ إِنَّ عِبَادِي لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَٰنٌ إِلَّا مَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلْغَاوِينَ ﴿٤٢﴾ ﴾الحجر، کەواتە: لێرەدا (**إِنَّ عِبَادِي**)، واتە: عەبدە هەڵبژاردەکانم، عەبدە خۆساغ کەرەوەکانی من، بە هەردووك خوێندنەوەکە:

(ٱلْمُخْلَصِينَ ): هەڵبژاردەکان.

(**المُخْلِصِين**): خۆ ساغکەرەوەکان.

ئەو بەندانەی من کە هەڵمبژاردوون و، ئەو بەندانەی من کە خۆیان ساغکردۆتەوە، تۆ دەستەڵاتت بە سەریاندا ناشکێ.

﴿ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ وَكِيلًا ﴾، پەروەردگاریشت بەسە بریکار و سەرپەرشتیار و کارپێسپێردراو، بێ، هەر کەسێك کاری خۆی، حەواڵەی خوا بکات و پشت بە خوا ببەستێ، خوا بەسە کە سەرپەشتیار و مشوورخۆر و کار پێسپێرراوی بێ.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکـــەم:

**خـوا فەرموویەتـی: یـاد بکـەوە! کاتێـك بـە فریشـتەکانمان فەرمـوو: کڕنووشـی ڕێزگرتـن بۆ ئـادەم بـەرن، تێکـڕا کڕنووشـیان بـرد، جگـە لـە ئیبلیس گوتـی: ئایا کڕنـووش بۆ دروسـتکراوێك ببـەم، بـۆ کەسـێك ببـەم، کـە لـە قـوڕێ دروسـتت کـردوە؟ گوتـی: ئایـا ئـەو دروسـتکراوەت دیـوە کـە ڕێـزت لێگرتـوە و بەسـەر منتـدا هەڵبـژاردوە! ئەگـەر هەتـا قیامەتـێ مهێڵیـەوە، وەچەکـەی جگـە لـە کەمێکیـان، هەمـووان بنبـڕ دەکـەم، گومـڕا دەکـەم و، پێـش خۆمیـان دەدەم:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ قَالَ ءَأَسْجُدُ لِمَنْ خَلَقْتَ طِينًا ﴿٦١﴾ قَالَ أَرَءَيْتَكَ هَٰذَا ٱلَّذِى كَرَّمْتَ عَلَىَّ لَئِنْ أَخَّرْتَنِ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ لَأَحْتَنِكَنَّ ذُرِّيَّتَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٦٢﴾﴾:

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ﴾، یاد بکەوە! کاتێك بە فریشتەکانمان فەرموو: کڕنووش بۆ ئادەم بەرن، (لِلْمَلَٰٓئِكَةِ)، کە (ال)ی ناساندن (**تعريف**)ی لەسەرە، ئایا مەبەست پێی سەرجەم فریشتەکانە و (ال) بۆ (**جنس**)ە؟ یاخود مەبەست پێی کۆمەڵە فریشتەیەکی دیارییکراون و (ال) بۆ (**عهد**)ە؟ هەردوو واتاکان ئەگەریان هەیە و زانایان لەوبارەوە بوونە دوو ڕا:

**أ** - هەندێکیان گوتوویانە: تێکڕای فریشتەکانی خوا کڕنووشی ڕێزگرتنیان بۆ ئادەم بردوە.

**ب** - هەندێکیش گوتوویانە: کۆمەڵە فریشتەیەکی تایبەت و دیارییکراو بوون.

بـەڵام گومانـی تێدانیـە، - وەك پێشـتریش باسـمان کـرد - کـە مەبەسـت لـە کڕنـووش (سَـجْدَة)، لێـرەدا کڕنووشـی ڕێزلێگرتنـە، نـەك کڕنـووشی پەرسـتن.

٢)- ﴿فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ﴾، تێکڕا کڕنووشیان برد، جگە لە ئیبلیس.

ئنجا ئایا ئیبلیس كێیە و چ كەسە؟ لە شوێنی دیكە بۆ وێنە: لە سوورەتی (**الكهف**)دا بۆمان باسكراوە، كە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ كَانَ مِنَ ٱلْجِنِّ فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِۦٓ ۗ أَفَتَتَّخِذُونَهُۥ وَذُرِّيَّتَهُۥٓ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِى وَهُمْ لَكُمْ عَدُوٌّۢ ۚ بِئْسَ لِلظَّٰلِمِينَ بَدَلًا ﴿٥٠﴾ ﴾.

واتە: یادبكەوە! كاتێك بە فریشتەكانمان گوت: كڕنووش بۆ ئادەم ببەن یەكسەر تێكڕا كڕنووشیان برد جگە لە ئیبلیس {لە هەموو قورئاندا تەنیا لێرەدا خوا بۆمان دەردەخات كە ئەو ئیبلیسە لە جۆری جند بووە، نەك لە جۆری فریشتە}، ﴿ كَانَ مِنَ ٱلْجِنِّ ﴾، لە جینن بوو، واش پێدەچێ، بە پێی ئەوە كە لە سوورەتی (**الحجر**)دا باسكراوە: ﴿ وَٱلْجَآنَّ خَلَقْنَٰهُ مِن قَبْلُ مِن نَّارِ ٱلسَّمُومِ ﴿٢٧﴾ ﴾، واتە: جاننیشمان پێشتر لە ئاگرێكی بلێسەداری كونكەر دروستكردبوو، كە مەبەست ئیبلیسە، ئیبلیس بابی جینن (**أَبُو الْجِن**)، بێ.

﴿ فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِۦٓ ﴾، لە فەرمانی پەروەردگاری دەرچوو.

﴿ أَفَتَتَّخِذُونَهُۥ وَذُرِّيَّتَهُۥٓ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِى ﴾، ئنجا ئایا خۆی و وەچەكەی جگە لە من بە دۆست و سەرپەشتیار و، بە نیزیكی خۆتان، دەگرن ﴿ وَهُمْ لَكُمْ عَدُوٌّۢ ۚ بِئْسَ لِلظَّٰلِمِينَ بَدَلًا ﴾، لە حاڵێك دا كە ئەوان دوژمنن بۆ ئێوە، ئەوە خراپترین قەرەبوویە، خراپترین جێگرەوەیە، بۆ ستەمكاران.

بەپێی ڕستەی: (**أفتتَّخذونه وذرِّيَّته أولياء...**) دەبێ جینن هەموویان وەچەی ئیبلیس بن.

٣)- ﴿ قَالَ ءَأَسْجُدُ لِمَنْ خَلَقْتَ طِينًا ﴾، ئیبلیس گوتی: ئایا كڕنووش بۆ كەسێك بەرم كە لە قوڕێ دروستتكردوە؟ یانی: كاتێك كە دروستت كردوە، قوڕ بووە.

لێرەدا وشەی (**طِيْنًا**)، لە ڕووی ڕێزمانی عەرەبییەوە دەبێتە (**حال**)، واتە: (**حَالَ كَوْنِه طِيْنَاً**)، ئایا كڕنووش بۆ كەسێك بەرم، لە حاڵێكدا كە ئەو لە قوڕییە.

(ءَأَسْجُدُ) ئەم هەمزەیەی پێشێ، بۆ پرسیار لێكردنی نكوولێلێكەرانە (**الإستفهام الإنكاري**) یە، چونكە: (**أَسْجُدُ**) یانی: كڕنووش دەبەم، بەڵام: (ءَأَسْجُدُ)، یانی: ئایا كڕنووش بەرم؟! یانی: ناگونجێ، كڕنووش ببەم، وەك یەكێ شتێكت وێ دەدا، دەڵێ: ئەو شتە دەدەیە من؟ نكووڵیی لێ دەكەی، كە ئەو شتە لەو كەسە وەربگری و قبووڵی بكەی.

لێرەدا جێی سەرنج ئەوەیە کە ئیبلیس دەڵێ: ﴿ ءَأَسْجُدُ لِمَنْ خَلَقْتَ طِينًا ﴾، دەڵێ: (**جَعَلَ جِنْسَ الطِّيْنِ حالاً مِنْهُ لِتَحقِيرِهِ**)، واتە: ڕەگەزی قوڕی کردوە بە (**حَال**) لە ئادەم دا، بۆ ئەوەی بە کەم تەماشاکردن و سووکایەتیی پێکردن بگەیەنێ.

بەڵام بێگومان: ئادەم بەو ڕووحە، کە خوا ﷻ فووی بەبەردا کرد، کە دروستکراوێکی تایبەتیی خوایە و، بە فەرمانی ڕاستەوخۆی خوا دروست بووە: ﴿ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي ﴿٢٩﴾ ﴾الحجر، ﴿ قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي ﴿٨٥﴾ ﴾الإسراء، بەڵێ بەو دروستکراوە تایبەتییە، کە خراوەتە نێو ئەو جەستە قوڕینەی ئادەمەوە، ئادەم بۆتە جێنیشینی خوا، بۆتە دروستکراوێکی ڕێزلێگیراوی خوا، بۆتە شایستەی ئەوە کە فریشتەکان ڕێزی لێبگرن، کەچی ئیبلیس خۆی بەسەر ئەو لایەنە جەوهەرییەی ئادەمەوە، هەر نابات، وەك: ئادەم تەنیا قوڕ بێ، بێخەبەر لەوە کە ئادەم تاکو تەنیا قوڕ بووە، تەنیا جەستە بووە، خوا بە فریشتانی نەفەرمووە: کڕنووشی بۆ بەرن، بەڵکو دەفەرمووێ: ﴿ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُواْ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾الحجر، واتە: هەر کاتێك جەستەکەیم ڕێك خست، {یانی: وام لێکرد کە ئامادە بێ، فووی ئەو ڕووحەی بەبەردا بکەم} لە ڕووحی خۆم فووم پێداکرد، ئەو کاتە کڕنووشی بۆ بەرن.

هەتا تەنیا جەستە بووە، شایستەی ئەوە نەبووە، کە خوا بە فریشتان بفەرمووێ: کڕنووشی بۆ بەرن، بەڵام دوای ئەوەی ئەو ڕووحە تایبەتییە، ئەو دروستکراوە تایبەتییەی کە بە فەرمانی ڕاستەوخۆی خوا دروست بووە، ئەوەی چۆتە بەر، ئنجا شایستەی ئەوە بووە فریشتە کڕنووشی بۆ ببەن، کەچی ئیبلیس خۆی بەسەر ڕووحەکەوە هەر نابات، وەك ئادەم قوڕێکی ڕووت بێ و، ڕووحی تێدا نەبێ!

٤)- ﴿ قَالَ أَرَءَيْتَكَ هَٰذَا الَّذِي كَرَّمْتَ عَلَيَّ ﴾، ئیبلیس گوتی: ئا ئەو دروستکراوە دەبینی! کە ئەمەش هەر بێڕێزیی کردن و سووکایەتیی پێکردن و، بە هەند هەڵنەگرتنی ئادەمە، ﴿ كَرَّمْتَ عَلَيَّ ﴿٦٢﴾ ﴾، ئا ئەوەت بینیوە کە تۆ ڕێزت لێگرتوە و بەسەر مندا ڕێزت لێگرتوە و هەڵتبژاردوە!

وشەی: (أَرَءَيْتَكَ)، (**مُرَكَّبٌ من «أ» الإِسْتِفْهَام، وَ «رَأَى» و «ت» المُخَاطَب المُفَرد المَرْفُوْع و «ك» الخِطَاب**)، (أَرَءَيْتَكَ)، کە ئەمە پێکهاتەیەکی زۆر سەرسوڕهێنەرە، لە چوار بەش پێکهاتوە:

١- هەمزەی (**إِسْتِفْهَام**)، (أ).

٢- (**رَأى**)، (**أَرَءَيْ**).

٣- (**ت**)ە بۆ تاکی، دوێندراو (**أَرَءيْتَ**).

٤- (ك) جارێكی دیكە: تاكی دوێنراو، (أَرَءَيْتَكَ)، ﴿ أَرَءَيْتَكَ هَٰذَا ٱلَّذِى ﴾، ئا ئەوەت بینیوە! ﴿ كَرَّمْتَ عَلَىَّ ﴾، كە ڕێزت لێ گرتوە بەسەر منداو، هەڵتبژاردوە بەسەر مندا.

ڕستەی: ﴿ كَرَّمْتَ عَلَىَّ ﴾، یانی: (كَرَّمْتَهُ وَفَضَّلْتَهُ عَلَيَّ)، ڕێزت لێگرتوە و بەسەر مندا هەڵتبژاردوە: (ضُمِّن كَرَّمَ مَعْنَى: فَضَّلَ لِذَا عُدِّيَ بِـ عَلَى)، (كَرَمَهُ)، واتە: ڕێزی لێگرت، بەڵام لێرە (كَرَّم)، بە (عَلَى)، تێپەڕێنراوە بۆ لای بەركار (مَفْعُولْ بِه)، تاكو مانای (فَضَّلَ)ی بخرێتە نێو، (فَضَّلَ) واتە: هەڵتبژاردوە، واتە: ﴿ كَرَّمْتَ عَلَىَّ ﴾، دوو واتایان دەگەیەنێ: ڕێزت لێگرتوە و، بەسەر منیشدا هەڵتبژاردوە.

٥)- ﴿ لَئِنْ أَخَّرْتَنِ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴾، ئا ئەو دروستكراوەی كە ڕێزت لێگرتوە و، بەسەر مندا هەڵتبژاردوە: ئەگەر من بهێڵیەوە و، مۆڵەتم بدەی تاكو ڕۆژی هەڵسانەوە.

٦)- ﴿ لَأَحْتَنِكَنَّ ذُرِّيَّتَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلًا ﴾، وەچەكەی تێكڕایان بنبڕ دەكەم، یاخود جڵەویان دەكەم و لغاویان دەكەم و پێش خۆمیان دەدەم، بەرەو دۆزەخ، (إِلَّا قَلِيلًا) ، جگە لە كەمێكیان.

جێی سەرنج ئەوەیە: كە شەیتان لە هەموو ئەو شوێنانەدا، پێی خۆش نەبووە شتێك بڵێ: كە هەموو كەس بزانێ درۆیە، لە هەموویان دا: بەندە چاكەكانی خوا (**عباد اللّه المخلصين**) كە لێرە بە كەمێك (قَلِيلًا)، ناویان دەبات، هەڵداوێرێ و جیایان دەكاتەوە، خوای پەروەردگاریش لە سوورەتی (**سبأ**)دا پشگیریی ڕایەكەی ئیبلیسی كردوە، كە دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ صَدَّقَ عَلَيْهِمْ إِبْلِيسُ ظَنَّهُۥ فَٱتَّبَعُوهُ إِلَّا فَرِيقًا مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٢٠﴾ ﴾سبأ، واتە: بەدڵنیایی ئیبلیس گومانەكەی خۆی لەسەریان {لەسەر وەچەی ئادەم} ڕاست بردە سەر {كە گوتی: هەموویان گومڕا دەكەم، جگە لە كەمێكیان}، جگە لە كۆمەڵێك لە بڕواداران، هەموویان شوێنی كەوتن.

كەواتە: درۆ هێندە شتێكی خراپە، ئیبلیسیش نەیویستوە درۆیەك بكات، هەموو كەس بزانێ درۆیە، هەڵبەتە ئیبلیس درۆی كردوە، وەك لە سوورەتی (**إبراهيم**)دا پێشتر باسمان كرد: ﴿ وَوَعَدتُّكُمْ فَأَخْلَفْتُكُمْ ﴿٢٢﴾ ﴾إبراهيم، واتە: منیش بەڵێنم پێدان، بەڵێنەكەشم نەبردە سەر، كەواتە: درۆی كردوە، بەڵام درۆیەكی كردوە، كە لە قیامەتێ خەڵك بۆی ئاشكرا دەبێ، بەڵام درۆیەك كە هەر لە دنیادا دیاربێ، ئەوە كە بڵێ: هەموویان گومڕا دەكەم، دواییش لە دنیادا دیار دەبێ و، ئاشكرا دەبێ، كە نەخێر ئیبلیس ناتوانێ هەموو وەچەی ئادەم گومڕا بكات، درۆیەكی نەكردوە هەر لە دنیادا

کەشف بێ، بەڵام درۆیەکی کردوە، کە هەتا قیامەتێ کەشف نابێ، ئەویش بریتیە لەو بەڵێنانەی کە ئیبلیس بە شوێن کەوتووانی خۆییان دەدا، ئەگەر ئاوا بکەن، ئاوا دەبێ و، زیندوو بوونەوە نیە و، لێپرسیەوە نیە و، پێغەمبەران ڕاست ناکەن و ... هتد، کە ئەوانە تاکو قیامەتێ کەشف نابن.

پێشتر باسمان کرد: (**الإِحْتِنَاك: وَضْعُ الرَّاكِبِ اللِّجَامَ فِي حَنَكِ الفَرَسِ، لِيَرْكَبَهُ ويُسَيِّرَهُ، فَهُوَ هُنَا تَمْثِيلٌ لِجَلْبِهِ ذُرِّيَّةِ آدَمَ إِلى مُرَادِهِ**)، دەڵێ: (**إحْتِنَاك**)، ئەوەیە کە بابای سوار لغاو بخاتە زار و شەوێلگەی ئەسپەوە، تاکو سواری بێ و لێی بخوڕێ، ئەمەش وێناکردنە بۆ ئەوە کە چۆن شەیتان وەچەی ئادەم، بەرەو ئەو مەبەستەی دەیەوێ، دەبات، کە پێش خۆییان دەدات و، لێیان دەخوڕێ و دەیانبات.

وەك چۆن سوارێك ئەسپێك کە لغاوی دەکات، دەتوانێ بۆ ئەو مەبەستە بیئاژوێ و، لێیبخوڕێ کە دەیەوێ، لێرەدا هەڵپێچانی ئیبلیسیش بۆ ئەو مرۆڤانەی کە هەڵیاندەپێچێ و بە قسەی دەکەن، وای وێنا کردوە وەك چۆن ئەسپێك لغاو دەکرێ، ئیرادەی دەکەوێتە دەست، ئەو سوارەو، ڕێشمەی دەکەوێتە دەستی و، بەرەو ئەو ئامانجەی دەیبات کە دەیەوێ، بە هەمان شێوە ئیبلیسش ئەوانەی کە شوێنی دەکەون، وەك ڕێشمەی لە مل کردبن، جڵەو و لغاوی کردبن، ئاوا بەرەو ئەو ئامانجەی کە دەیەوێ، پێش خۆیان دەدا.

یاخود وشەی (**الإحْتِنَاك**) یانی: (**الإسْتِئصَال**)، دەگوترێ: (**احْتَنَكَ: الجَرَادُ الزَّرْعَ: ذَهَبَ بِهِ كُلِّهُ**)، واتە: کوللە هەموو کشتوکاڵەکەی خوارد، هەموو ڕووەکەکەی خوارد، یانی: لە بنی هێنا و لە ڕیشەوە بنبڕی کرد.

## مەسەلەی دووەم:

**خوا بە ئیبلیسی فەرمووو: بڕۆ چیت پێدەکرێ درێغیی مەکە، هەر کەس لەوان شوێنت بکەوێ، سزای دۆزەخە، سزایەکی پڕ بە پێستە، هەر چیشت لەوان پێ کۆدەکرێتەوە بە دەنگت تاویان بدە و، سوارە و پیادەتیان وەسەر بگێڕە و، بەشداریی سامان و منداڵیشیان بکە و، گفتیان پێبدە، شەیتانیش تەنیا گفتی فریودەریان پێ دەدات، بە دڵنیایی تۆ بە بەندەکانم ناوێری و، پەروەردگارت بەسە بریکارو سەرپەرشتیار و کار پێسپێرراو بێ:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ قَالَ اذْهَبْ فَمَن تَبِعَكَ مِنْهُمْ فَإِنَّ جَهَنَّمَ جَزَاؤُكُمْ جَزَاءً مَّوْفُورًا ﴿٦٣﴾ وَاسْتَفْزِزْ مَنِ اسْتَطَعْتَ مِنْهُم بِصَوْتِكَ وَأَجْلِبْ عَلَيْهِم بِخَيْلِكَ وَرَجِلِكَ وَشَارِكْهُمْ فِي الْأَمْوَالِ وَالْأَوْلَادِ وَعِدْهُمْ ۚ وَمَا يَعِدُهُمُ الشَّيْطَانُ إِلَّا غُرُورًا ﴿٦٤﴾ إِنَّ عِبَادِي لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَانٌ ۚ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ وَكِيلًا ﴿٦٥﴾ ﴾:

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ بڕگەدا:

١)- ﴿ قَالَ اذْهَبْ ﴾ خوا فەرمووی: بڕۆ، (اذْهَب: إِمْضِ لِشَأْنِكَ، إِسْتَمِرَّ عَلَى عَمَلِك)، بڕۆ بە دوای حاڵی خۆت بکەوە، یاخود بەردەوامبە لەسەر کاری خۆت.

گومانی تێدانیە کە خوا دەفەرموێ: ﴿ قَالَ اذْهَبْ ﴾، بڕۆ، مەبەست پێی فەرمان پێکردنی ڕواڵەتیی نیە، بەڵکو مەبەست بێ منەتکردنی ئیبلیسەو، ئەم فەرمانە بە سیاق و سەلیقە دەزانرێ، کە ئەوە هەڕەشەیە، وەك چۆن کەسێك هەڕەشە دەکات، تۆش دەڵێی: دەبڕۆ چیت پێ دەکرێ، بیکە، مەبەستت ئەوە نیە بچێ کارەکە ئەنجام بدات، بەڵکو مەبەستت ئەوەیە کە: تۆ هیچت پێ ناکرێ، یاخود: هەرچی بیکەی، بە زیانی خۆت تەواو دەبێ.

٢)- ﴿ قَالَ اذْهَبْ فَمَن تَبِعَكَ مِنْهُمْ فَإِنَّ جَهَنَّمَ جَزَاؤُكُمْ جَزَاءً مَّوْفُورًا ﴾، هەر کەسێك لەوان شوێنت بکەوێ، واتە: لە مرۆڤەکان، لە وەچەی ئادەم، شوێنت بکەوێ، ﴿ فَإِنَّ جَهَنَّمَ جَزَاؤُكُمْ جَزَاءً مَّوْفُورًا ﴾، بە دڵنیایی ئەوە دۆزەخ سزاتانە، سزایەکی پڕ بە پێست، سزایەکی زۆر و تێر و تەواو.

٣)- ﴿ جَزَآءً مَّوۡفُورًا ﴾، دەگوترێ: (جَزَاهُ جَزَاءً: أَعْطَاهُ عَنْ عَمَلِهِ عِوَضاً)، واتە: لە بری کردەوەکەی قەرەبووی دایە، (جَزَاء: بِمَعْنَى المَفْعُولِ)، (جَزَاءً)، بە مانای (مَفْعُول)ە، واتە: (مَجْزِيٌّ) قەرەبوویەك كە دەدرێتەوە بە کەسێك، (مَوْفُور: إِسْمُ مَفْعُولٍ مِنْ وَفَرَهُ، أَي: كَثَّرَهُ)، (مَوْفُور)، ناوی بەرکارە لە (وَفَرَهُ) هاتوە، (وَفَرَهُ، كَثَّرَهُ)، زۆری کرد، (مَوْفُور: أَي: وَافِراً وَافِيَاً كَافِيَاً)، واتە: شتێك كە زۆر بێ و، تێر و تەواو بێ و، بەشی ئەو شتە بکات.

٤)- ﴿ وَٱسۡتَفۡزِزۡ مَنِ ٱسۡتَطَعۡتَ مِنۡهُم بِصَوۡتِكَ ﴾، هەر کامێك لەوان كە دەتوانی، بە دەنگی خۆت، هەڵیقەنە و هەڵیپێچە و، ڕای پێچە و پێش خۆتی بدە، (الإِسْتِفْزَازُ: طَلَبُ الفَزِّ، وَهُوَ الخِفَّةُ وَالإِنْزِعَاجُ، وَتَرْكُ التَّثَاقُل)، وشەی (فَزّ)، پێشتر باسمان کرد بریتیە لە هەڵقەندنی کەسێك، هەڵپێچانی کەسێك، جووڵاندنی کەسێك، كە لێرەدا: (فَزّ)، بریتیە لە سووکیی و بێزارکردن و، هەڵقەندن و، واز لە تەنبەڵیی هێنان، (الإِسْتِفْزَازُ: طَلَبُ الفَزِّ)، (إستفزاز) داواکردنی سووکیی و ڕاپەڕاندن و هەڵقەندنە، لە شوێنی خۆی.

کە دەفەرمـوێ: (بِصَوۡتِكَ )، بـە تەئکیـد مەبەسـت پێـی هاندانـی شـەیتان و دنەدانـی و، خوتخوتەیەتـی، ئەگەرنـا کـەس دەنگـی شـەیتانی نەبیسـتوە.

٥)- ﴿ وَأَجۡلِبۡ عَلَيۡهِم بِخَيۡلِكَ وَرَجِلِكَ ﴾، (الخَيْلُ: إِسْمُ جَمْعِ الفَرَسِ)، (خيل) ناوی کۆیە بۆ ئەسپ (فرس) ﴿ وَأَجۡلِبۡ عَلَيۡهِم بِخَيۡلِكَ وَرَجِلِكَ ﴾، (رَجِلِكَ: جمع الرجل، كَصَحْب وَصَاحِبْ)، (صَحْب) واتە: هاوەڵ، بە (صَاحِبْ) کۆدەکرێتەوە، (رَجِل)یش، کۆی (رَاجِل)ە، واتە: پیادەکان، پێرۆیەکان. (الإِجْلَابُ: جَمْعُ الجَيْشِ وَسَوْقُهُ، مُشْتَقٌّ مِن الجَلَبَةِ وَهُوَ الصِّيَاحُ)، (جَلَبَة)، واتە: بەسەردا هاوارکردن، (إِجْلاب)، بریتیە لە کۆکردنەوەی سوپا و لێخوڕینی و پێش خۆدانی.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَأَجۡلِبۡ عَلَيۡهِم بِخَيۡلِكَ وَرَجِلِكَ ﴾، یـانی: سـوارە و پیـادەی خۆتیـان بەسـەر وەربکـە، (خَيْـل)، هـەر بـە مانـای ئەسـپەکان دێ و کـۆی (فَـرَسْ)ە، بـەڵام هـاوکات بـە مانـای ئەسـپ سـوارانیش دێ، (رَجِل)یـش یـانی: پیـادە، هەڵبەتـە سـوپا کاتی خـۆی وابـووە و، ئێسـتاش هـەر وایـە، لـە سـوارە و پیـادە پێـك دێ: (المشـاةُ والـدروع)، پێرۆیـەکان و سـوارەکان، کـە ئێسـتا: دەبابـە و مودەڕڕەعـە و سـەیارەو ئەوانـەن، کاتـی خۆشـی ئەسـپ سـواران بـوون، بێگومـان کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَٱسۡتَفۡزِزۡ مَنِ ٱسۡتَطَعۡتَ مِنۡهُم بِصَوۡتِكَ وَأَجۡلِبۡ عَلَيۡهِم بِخَيۡلِكَ وَرَجِلِكَ ﴾، ئەمـە هەمـووی وێناکردنـە، واتـە: چـۆن سـوپایەك، یـان دەوڵەتێـك، یـان هێزێـك لەگـەڵ هێزێکـی دیکـەدا، بەشـەڕ دێ، ئـەو لایەنـەی دەیـەوێ بەرەنـگاری لایـەنی بەرانبـەر بێتـەوە، هەرچـی سـوارەو پیـادەی خۆیەتـی، دەنگیـان دەدا و هەڵیـان دەپێچـێ و،

ڕایان دەپێچێ کە بە گژ تەڕەفی بەرانبەریاندا بکات، واتە: تۆش بەو شێوەیە بکە، ئاوا بە خەستیی دوژمنایەتیی، وەچەی ئادەم بکە.

٦)- ﴿ وَشَارِكْهُمْ فِي ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَوْلَٰدِ ﴾، هەروەها بەشدارییان بکە لە سامانیان و، لە ڕۆڵەکانیاندا، ئەمە دوایی زیاتر تیشکی دەخەینە سەر، واتە: چیت پێ دەکرێ، بۆ ئەوەی ئەوان هەڵس و کەوت و تەصەڕڕوفی ناشەرعیی لە ماڵ و سامانەکانیان دا بکەن، بە دڵی تۆ، ئەو ئامانجانەی کە تۆ دەتەوێ بیانهێنیەدی، هانیان بدە بۆی، هەروەها لە ڕۆڵەکانیشیاندا بەشداریی بکە، واتە: وابکە کە منداڵەکانیشیان بەو شێوەیە تەصەڕڕوفیان لەگەڵدا بکەن و بەکاریان بێنن، کە تۆ دەتەوێ.

٧)- ﴿ وَعِدْهُمْ ﴾، هەروەها گفتیشیان پێ بدە و، دڵیشیان خۆش بکە بۆ ئەو مەبەستانەی خۆت، دوایی خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا يَعِدُهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ إِلَّا غُرُورًا ﴾، بە دڵنیایی شەیتانیش تەنیا بەڵێنی فریودەریان پێ دەدات، ئەو بەڵێنانەیان پێدەدا، کە پێی هەڵخەڵەتێن، فریوی پێ بخۆن و کڵاویان لەسەر دەنێ، ئەگەرنا بەڵێنەکانی نایەنە دی، وەك لە سووڕەتی (**إبراهيم**)دا، ئیبلیس لەوێ، لە ڕۆژی دوایی دا دان پێدادێنێ و، پێ لێدەنێ و دەڵێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ وَعَدَكُمْ وَعْدَ ٱلْحَقِّ ﴿٢٢﴾ ﴾، واتە: بە دڵنیایی خوا بەڵێنی ڕاستی پێدان، ﴿ وَوَعَدتُّكُمْ فَأَخْلَفْتُكُمْ ﴿٢٢﴾ ﴾، واتە: منیش بەڵێنم پێدان، بەڵێنەکەشم درۆ بوو، بەڵێنەکەم پێچەوانە بوو.

لەوێ شەیتان دانی پێدا دێنێ، لێرەش خوا دەفەرموێ: شەیتان تەنیا بەڵێنی فریودەریان پێدەدا.

٨)- ﴿ إِنَّ عِبَادِى لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَٰنٌ ﴾، خوا لە کۆتایی دا: ئەوە ڕادەگەیەنێ کە بەندەکانی من، تۆ دەسەڵاتت بەسەردا ناشکێن، لێرەدا خوا ﷻ بە پێویستی نەزانیوە بفەرموێ: (إِنَّ عِبَادِي الْمُخْلَصِين)، یان (إِنَّ عِبَادِي الْمُخْلِصِين)، ﴿ لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَٰنٌ ﴾، چونکە خوا پێشتر ئەو ڕاستییەی ڕاگەیاندوە، ئیبلیس خۆی بە زمانی خۆی، بە زاری خۆی، دانی بەوە داهێناوە کە: بەندە هەڵبژاردەکانی خوا، یان بەندە خۆساغکەرەوەکانی خوا، ناکەونە ژێر ڕکێفی شەیتان، ئیبلیس دەستەڵاتی بەسەریاندا ناشکێ، ئنجا لەبەر ئەوەی لە شوێنەکانی دیکەدا باسکراوە، لێرەدا بە پێویستیی نەزانیوە باسی بکات، تەنیا بەوەندە وازی هێناوە، بفەرموێ: ﴿ إِنَّ عِبَادِى ﴾، ئنجا مادام خوا ئەو بەندانەی پاڵداوەتە لای خۆی، واتە: ئەو بەندانەی کە تایبەتن بە منەوە، بۆ من ساغ و ملکەچن، بەویستی خۆیان بۆ من ملکەچن، تۆ دەستەڵاتت بەسەریاندا ناشکێ و پێیان ناوێرێ.

٩)- ﴿ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ وَكِيلًا ﴾، پەروەردگاریشت بەسە بریکار و کار پێسپێرراو بێ، (أي: **يَكْفِي رَبُّكَ لِوَكَالَتِكَ، أي: عَاصِمَاً وَحَافِظَاً**)، پەروەردگارت بەسە: بریکار و سەرپەرشتیار و کار پێ سپێرراوی تۆ بێ، واتە: پارێزەر و چەپاڵەدەری تۆ بێ.

## چـــوار کورتە سەرنج لەم ئایەتە:

**یەکەم:** ﴿ وَٱسۡتَفۡزِزۡ مَنِ ٱسۡتَطَعۡتَ مِنۡهُم بِصَوۡتِكَ وَأَجۡلِبۡ عَلَيۡهِم بِخَيۡلِكَ وَرَجِلِكَ ﴾، واتە: هەرچی هۆکار و ئامرازی هەڵخەڵەتاندن و، خوتخوتە و گومڕا کردن هەیە، کۆی بکەوە بۆ ئەوانەی لە وەچەی ئادەم شوێنت دەکەون، هەموو هۆکارەکان بگرە بەر لە دژیان، بۆ ئەوەی هەرچی زووتر هەڵیانخەڵەتێنی و گومڕایان بکەی، چیت پێدەکرێ بیکە.

لێـرەدا کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَٱسۡتَفۡزِزۡ مَنِ ٱسۡتَطَعۡتَ مِنۡهُم بِصَوۡتِكَ ﴾، ئەمـە هەرچەنـدە لـە تەفسـیرەکاندا نەمبینیـوە، بـەڵام پێـم وایـە: دژایەتـی ئیبلیـس بـۆ مرۆڤـان وێنـا کـراوە بـە لێـدانی شـەیپووری جەنـگ و پێکهاتـە و جۆرەکانـی سـوپا، کـە بـە گشـتی دەبنـەوە بـە: سـوارە و پیـادە، واتـە: وەك چـۆن شـەیپووری جەنـگ لێـدەدرێ، تـۆش ئـاوا شـەیپووریان بـۆ لێـدە، مۆسـیقا و تەپـڵ و دەهـۆڵـی جەنگیـان بـۆ بکوتـە، بـۆ ئـەوەی هەڵیـان پێچـی و ڕایـان پێچـی و هەرچـی جۆرەکانـی هێـزی خۆتـە، لـە سـوارە و پیـادە بۆیـان بخـە ڕێ و بەسـەریان وەرکـە.

**دووەم:** ﴿ وَٱسۡتَفۡزِزۡ مَنِ ٱسۡتَطَعۡتَ مِنۡهُم بِصَوۡتِكَ ﴾، بەنسبەت ئەم ڕستە قورئانییەوە: هەندێك لە تەفسیرەکان گوتوویانە: ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی بەکارهێنانی ئامێرەکانی مۆسیقا، حەرامە! ئێمەش دەڵێین: ئەم ئایەتە هیچ پەیوەندیی بەوەوە نیە و هیچ پەیوەندیی بە ئامێرەکانی مۆسیقاوە نیە و، لە ڕاستییدا ئەو شوێنەوارانەی لەو بارەوە هاتوون، هەموویان لێکدانەوە و تێگەیشتنی زانایانن، لە هـاوەڵان و شوێنکەوتووان و زانایانی دیکە، کە زێدە هەستیارییان هەبووە بەرانبەر بە ئامێرەکانی مۆسیقا، لەبەر ئەوەی لە ڕۆژگاری ئەوان دا، ئەو ئامێرانەی مۆسیقا، زیاتر نیشانەی کەسانی بێ بەند و بار بوون، وەك لە زۆربەی ڕۆژگارەکانیشدا هەر وایە، ئەگەرنا ئەم ئایەتە کەم و زۆر پەیوەندیی بەوەوە نیە و، من لە کتێبی: (چەند بابەتێکی هونەریی لە ژێر ڕۆشنایی قورئان و سوونەتدا) بە تەفصیل باسم کردوە، کە ئەسڵ لە دەنگە خۆشەکاندا: دەنگی ئامێر بێ، دەنگی مرۆڤ بێ، دەنگی تەیر و تواڵ بێ، دەنگی تاڤگە بێ، ئەسڵ لە دەنگی خۆشدا، ئەوەیە کە یەکێکە لە نیعمەتەکانی خوا و شتێکی ڕەوایە، بەڵام کاتێك کە بۆ مەبەستی خراپ بەکاردەهێنرێ، ئەو کاتە حوکمەکەی دەگۆڕێ، ئەگەرنا ئەگەر بۆ مەبەستی حەڵاڵ، یان بۆ مەبەستێکی واجب، یان بۆ مەبەستێکی ڕەوا، بەکاربهێنرێ، حوکمەکەی

لەسەر ئەسڵی خۆی، کە بریتیە لە ڕەوایەتیی (**إباحة**) دەمێنێتەوە، خواش ﷻ لە قورئاندا، دەنگی خۆشی بە: یەکێك لە موعجیزەکانی داوود ﷺ، داناوە: ﴿ يَٰجِبَالُ أَوِّبِي مَعَهُۥ وَٱلطَّيْرَ ۖ وَأَلَنَّا لَهُ ٱلْحَدِيدَ ﴿١٠﴾ ﴾سبأ، وەك پێشتریش باسمان کرد و لەوبارەوە فەرمایشتی پێغەمبەریشمان هێنا کە مەدحکردنی دەنگی خۆشی داوودی تێدایە: (**....لقد أوتيت مزماراً من مزامير آل داود**)[1].

سێیەم: ﴿ وَشَارِكْهُمْ فِى ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَوْلَٰدِ ﴾، (**المُشَارَكَةُ: فِي الأَمْوَالِ وَالأَوْلَادِ: هِيَ أَنْ يَكُوْنَ لِلشَّيْطَانِ نَصِيبُه مِنْهَا، مِنْ حَيْثُ الحَرَامُ والإِسْرَافُ وَالتَبْذِير وَالإِفْسَادُ**)، هاوبەشیی کردنی شەیتان لە سامانەکانیاندا ئەوەیە: کە شەیتان پشك و بەشی هەبێ تێیاندا، لەو ڕووەوە کە ئەو ماڵ و سامانە لە ڕێی حەڕامەوە وەدەستبێنن، یاخود: لە شوێنی حەڕامدا خەرجی بکەن، یان زێدەڕۆیی تێدا بکەن، یان دەستبڵاویی تێدا بکەن {واتە: یان لە حاڵێکدا ئامانجەکە ڕەوایە، هەڵە خەرجیی بکەن، یان زێدەڕۆیی تێدا بکەن، یان بۆ ئامانجی ناڕەوا بەکاری بێنن} یان بۆ تێکدان و خراپەکاریی بەکاری بێنن.

بە نسبەت ڕۆڵەکانیانەوە: هەم زیندە بە چاڵکردنیان دەگەیەنێ، هەم ناولێنانیان بە ناوی خراپ دەگەیەنێ، هەم ئەوە کە ئەو منداڵانەیان بە شێوەیەکی ناشەرعیی پەیدابێ لە ڕێی زیناو داوێن پیسییەوە، هەروەها هەموو هەڵس و کەوت و ڕەفتارەکانی کەمرۆڤ دەیانکات، لەگەڵ منداڵەکانیاندا، کە ناشەرعیی بن، ئەوە هەمووی دەگرێتەوە.

(**مجاهد**) کە یەکێکە لە زانایانی تابیعین و قوتابی عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس بووە، (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: (**إِذَا جَامَعَ الرَّجُلُ، ولَمْ يُسَمِّ انْطَوى الجَانُّ عَلَى إِحْلِيلِه، فَجَامَعَ مَعَهُ، فَذَلِكَ قَوْلُهُ تَعَالَى:** ﴿ لَمْ يَطْمِثْهُنَّ إِنسٌ قَبْلَهُمْ وَلَا جَآنٌّ ﴿٥٦﴾ ﴾الرحمن)[2].

موجاهید دەڵێ: کاتێك کە پیاو سەرجێیی لەگەڵ هاوسەری دا دەکات، بەڵام ناوی خوا ناهێنێ، جند خۆی لە زەکەری دەئاڵێنێ و کاتێك کە لەگەڵ خێزانیدا جووت دەبێ، ئەویش بەشداریی تێدا دەکات، ئەوە فەرموودەی خوای بەرزە،[3] کە دەفەرموێ: ﴿ لَمْ يَطْمِثْهُنَّ إِنسٌ قَبْلَهُمْ وَلَا جَآنٌّ ﴿٥٦﴾ ﴾الرحمن، واتە: لە پێش بەهەشتییەکاندا نە مرۆڤ و،

---

(١) أخرجه أحمد: ٢٣٠١٩، والبخاري في الأدب المفرد: ١٠٨٧، ومسلم: ٧٩٣، والنسائي في الكبرى: ٨٠٥٨، والدارمي: ٣٤٩٨، وابن حبان برقم ٨٩٢، والحاكم: ٧٧٥٧، وقال: صحيح على شرط الشيخين.

(٢) الجامع لأحكام القرآن: ١٠، ص٢٣٦.

(٣) واتە: بەشێکە لە چەمك و واتای فەرمایشتی خواو، فەرمایشتی خوا دەیگرێتەوە نەك ئەوە مانای ئایەتەکە بێ.

نـە جنـد، لەگـەڵ ئـەو ئافرەتانـەدا جـووت نەبـوون، واتـە: ئافرەتانـێ کـە خـوای بەخشـەر بـە تایبـەت بـۆ پیـاوانی ئیمانـدار لـە بەهەشـتدا دروسـتیان دەکات.

**چوارەم:** ﴿ وَعِدْهُمْ ﴾، (**أي أعْطهم المَوَاعِيدَ بِحُصُوْلِ مَا يَرْغَبُوْنه**)، بەڵێنیان پێبدە کە ئەوەی ئارەزوویانە، (گوایە) بۆیان دێـتە دی، بۆ وێنە:

١ - ئەوە کە بتەکانیان تکایان بۆ دەکەن.

٢ - ئەوە کە ترسیان نەبێ لە سزای خوا.

٣ - ئەوە کە بەڵێن بدات بەوانە کە گوناهو سەرپێچیی دەکەن، کە لەززەتە حەڕامەکانیان بۆ دابین دەبن!

٤- ئەوە کە بڵێن: سزا و پاداشت، زیندووبوونەوە نیە.

ئەوانـە هەموویـان بەڵێنـی شـەیتانن، بۆیـە خـوا دەفەرمـوێ: ئـەو بەڵێنانـەی کـە شـەیتان پێیـان دەدات، تەنیـا فریـو دان و، هەڵخەڵەتانـدن و، کڵاو لەسـەرنانن.

سُبْحَانَك اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان لـە حـەوت ئایەتـان پێـك دێ، ئایەتـەكانی: (٦٦ - ٧٢) خـوای بـەرز و مـەزن لـەم حـەوت (٧) ئایەتـەدا، بـاسی پێنـج بابـەت دەكات:

**یەكەم:** ڕام و دەستەمۆكرانی دەریا بۆ سەفەر و هاتووچۆ تێداكردنی مرۆڤەكان.

**دوو:** لە فریا هاتنی خوا بۆ مرۆڤان، لە كاتی لێ قەومانی نێو دەریادا، كە جگە لە خوا هاواریان بە كەس ناگات و هیچ كەس پێیان ڕاناگات.

**سێ:** هەڕەشە و هۆشداریی خوا بۆ مرۆڤەكان، كە بەڵای ناگەهان: هەمیشە لە وشكانیی و دەریادا بۆیان لە بۆسەدایە، با پشتێنی لێ نەكەنەوەو خاترجەم نەبن.

**چوار:** ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە كە خوا ڕێزی لە مرۆڤان گرتوەو، دەریا و وشكانیی بۆ ملكەچ كردوون و، بژیوە خۆش و بە سوودەكانی بۆ ڕەخساندوون و، بەسەر زۆرێك لە دروستكراوانی خۆیدا، هەڵیبژاردوون.

**پێنجەم:** باسی سەرەنجامی خێری بڕوادارانی ڕاستە ڕێ گرتووی بەرچاو ڕوون و، سەرەنجامی شوومی دڵ كوێرانی گومڕا.

﴿ رَّبُّكُمُ ٱلَّذِى يُزْجِى لَكُمُ ٱلْفُلْكَ فِى ٱلْبَحْرِ لِتَبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِهِۦٓ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا ﴿٦٦﴾ وَإِذَا مَسَّكُمُ ٱلضُّرُّ فِى ٱلْبَحْرِ ضَلَّ مَن تَدْعُونَ إِلَّآ إِيَّاهُ ۖ فَلَمَّا نَجَّىٰكُمْ إِلَى ٱلْبَرِّ أَعْرَضْتُمْ ۚ وَكَانَ ٱلْإِنسَـٰنُ كَفُورًا ﴿٦٧﴾ أَفَأَمِنتُمْ أَن يَخْسِفَ بِكُمْ جَانِبَ ٱلْبَرِّ أَوْ يُرْسِلَ عَلَيْكُمْ حَاصِبًا ثُمَّ لَا تَجِدُوا۟ لَكُمْ وَكِيلًا ﴿٦٨﴾ أَمْ أَمِنتُمْ أَن يُعِيدَكُمْ فِيهِ تَارَةً أُخْرَىٰ فَيُرْسِلَ عَلَيْكُمْ قَاصِفًا مِّنَ ٱلرِّيحِ فَيُغْرِقَكُم بِمَا كَفَرْتُمْ ۙ ثُمَّ لَا تَجِدُوا۟ لَكُمْ عَلَيْنَا بِهِۦ تَبِيعًا ﴿٦٩﴾ ۞ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِىٓ ءَادَمَ وَحَمَلْنَـٰهُمْ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَرَزَقْنَـٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَـٰتِ وَفَضَّلْنَـٰهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا ﴿٧٠﴾ يَوْمَ نَدْعُوا۟ كُلَّ أُنَاسٍۭ بِإِمَـٰمِهِمْ ۖ فَمَنْ أُوتِىَ كِتَـٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ يَقْرَءُونَ كِتَـٰبَهُمْ وَلَا يُظْلَمُونَ فَتِيلًا ﴿٧١﴾ وَمَن كَانَ فِى هَـٰذِهِۦٓ أَعْمَىٰ فَهُوَ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ أَعْمَىٰ وَأَضَلُّ سَبِيلًا ﴿٧٢﴾ ﴾

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەكان

{پەروەردگارتان ئەو كەسەیە كە كەشتییانتان لە دەریادا بۆ دەئاژوێ، تاكو (بازرگانیی و كار وكاسبیی بكەن و)، لە بەخششی وی بخوازن، بە دڵنیایی ئەو (پەروەردگارەتان) لەگەڵتان بە بەزەییە ﴿٦٦﴾ هەركاتێكیش لە دەریادا زیانتان تووش بوو (گرفتار بوون) جگە لەوی، تێكڕای ئەوانەی لێیان دەپاڕێنەوە بزر دەبن، كەچی كە بەرەو وشكانیی قوتاری كردن، ڕووتان (لە خوا) وەرگێڕاو، مرۆڤیش سپڵە و ناسپاسە (بەرانبەر بە خوا) ﴿٦٧﴾ ئایا ئێوە خاترجەم (بێ ترس و بیم) بوون كە (خوا) بەبەری وشكانییتاندا ڕۆبچوێنێ، یان بایەكی ڕامەڵكەری خۆڵ و وردە بەردتان بنێرێتە سەر، پاشان هیچ بریكار و سەرپەرشتیارێكتان نەبێ (دەربازتان بكات)؟! ﴿٦٨﴾ یان ئایا خاترجەم و بێ باك بوون، لەوەی (خوا) كەڕەتێكی دیكە، بتانگێڕێتەوە نێوی (دەریا) و بایەكی تێكشكێنەرتان بنێرێتە سەر و، بە هۆی نا سپاسییتانەوە، نغرۆتان بكات، پاشان هیچ كەسێكتان چنگ نەكەوێ كە تۆڵەستێن و، داواكاری ئەو مافەتان بێ، لێمان؟ ﴿٦٩﴾ بە دڵنیاییش ئێمە ڕێزمان لە وەچەی ئادەم گرتووە، لە وشكانیی و دەریادا (بە هۆی ڕەخساندنی هۆیەكانی بار و سوارەوە) هەڵمانگرتوون و، لە بژیوە چاك و سوودبەخشەكان پێمان داون و، بەسەر زۆرێك لە دروستكراواغاندا هەڵمانبژاردوون ﴿٧٠﴾ ڕۆژێك (یاد بكەوە!) كە هەر كۆمەڵە خەڵكە بە (ناوی) پێشەوایەكەیانەوە بانگ دەكەین، ئنجا هەر كەس نووسراوەكەی بە دەستی ڕاستی بدرێتەوە، ئا ئەوانە نووسراوەكەیان دەخوێننەوە و، هێندەی دەزووی سەر نێوكە خورماش ستەمیان لێ ناكرێ ﴿٧١﴾ هەر كەسێكیش لەم (ژیانی دنیای) ەدا كوێر بێ، (كوێردڵ بێ، لە ئاست هیدایەتی خوادا) ئەوە لە ڕۆژی دواییدا، كوێر و ڕێ لێ ون بووتریشە ﴿٧٢﴾}.

## شیكردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(يُزْجِي): واتە: لێ دەخوڕێ دەئاژوێ: (زَجَى الشَّيءُ زَجْواً: سَاقَهُ وَدَفَعَهُ بِرِفْقٍ، أَزْجَى الشَّيءَ، زَجَاهُ وَزَجَّى الشَّيءَ، أَي: سَهَّلَهُ والمُزْجَى: القَلِيْل)، (يُزْجِي) لە (أَزْجَى)ەوە هاتوە، (أَزْجَى يُزْجِي) واتە: لێی خوڕی، چونكە دەڵێ: (زَجَى الشَّيءُ، زَجْواً سَاقَهُ وَدَفَعَهُ بِرِفْقٍ) شتەكەی پێش خۆداو، لێی خوڕی و ئاژووتی بە نەرمیی، (أَزْجَى الشَّيءَ أَي: زَجَاهُ) كەواتە: (أَزْجَى) لەگەڵ (زَجَى) لەگەڵ (زَجَّى) هەرسێكیان بە مانای لێ خوڕین، دێن و هەرسێكیان كرداری تێپەڕ (مُتَعَدِّي)ن و پێویستییان بە بەركار (مفعول بە) دەكات.

هەروەها (زَجَّى) وەك چۆن بە مانای (زَجَى) و (أَزْجَى) دێ، واتە: لێی خوڕی و پێش خۆیداو ئاژووتی، بە هەمان شێوە بە مانای ئاسان كردنیش دێ، (زَجى): ئاسانی كرد (سَهَّلَهُ)، هەروەها (مُزْجَى) بە مانای كەم دێ، دەگوترێ: (شَيءٌ مُزْجَى) واتە: شتێكی كەم، یان (بِضَاعَةٌ مُزْجَاة) بە (تاء) واتە: كەل و پەل و شمەكێكی كەم بایەخ، بۆچی؟! چونكە شتی كەم، كە نرخ و بەهای كەم بێ، پاڵ پێوە دەنرێ بە ئاسانیی، بەڵام شتێك كە نرخی زۆر بێ، دەستی پێوە دەگیرێ.

(أَن يَخْسِفَ بِكُمْ): كە بە زەویتاندا بەرێتە خوار، (أَن يَخْسِفَ بِكُمْ) یانی: (أَنْ يَخْسِفَ بِكُمُ الأَرْضَ) وشەی (أَرْضِ)ی باس نەكردوە، لەبەرئەوەی دەزانرێ، كە ئەوەی لە بن پێی مرۆڤدا ڕۆدەچوێنرێ و، مرۆڤ پێیدا دەبردرێتە خوار، هەر زەوییە.

دەگوترێ: (خَسَفَتِ الأَرْضُ خَسْفَاً وَخُسُوفَاً: غَارَتْ بِمَا عَلَيْهَا، وَخَسَفَ اللّهُ بِهِمُ الأَرْض: غَيَّبَهُمْ فِيهَا) (خَسَفَتِ الأَرْضُ خَسْفَاً وَخُسُوفَاً) واتە: ئەو زەوییە ڕۆچوو، بەوەی كە لە سەریەتی (وَخَسَفَ اللّهُ بِهِمُ الأرضَ: غَيَّبَهُم فِيهَا) خوا لە زەویدا ونی كردن پەنهانی كردن، واتە: بە زەویدا بردنیە خوار و پێیدا ڕۆی چواندن.

(حَاصِبًا): (الحَاصِب: الحَصْبَاءُ وَالحَصْبُ: صِغَارُ الحِجَارَةِ) (حَصْبَاءُ) و (حَصَب) بریتیە لە وردە بەرد، بەردی گچكە، چەو.

(حَاصِب) بە دوو واتا هاتوە:

**یەك:** (**مَكَانٌ ذُو حَصْبَاء**) شوێنێك كە وردە بەردی لێ بن.

**دوو:** (**الرِّيحُ الشَّدِيْدَةُ تَحْمِلُ التُّرَابَ وَالحَصْبَاءَ**) بایەكی توند، كە هەم گڵ و هەم وردە بەرد، (چەو) لەگەڵ خۆی ڕاماڵێ.

(**تَارَةً أُخْرَىٰ**): واتـە: كەڕەتێـكی دیكـە، (**التَّـارَةُ: الْمُـدَّةُ، وَالحِـيْنُ، وَالجَمْـعُ: تِـيَر**) (**تِـيَر**) كـۆی (**تَارَة**)یـە، واتـە: جـارەكان، (**تَـارَة**) بـە مانـای كـەڕەت، یـان بـە مانـای كات دێ، كاتێـكی دیكـە، كەڕەتێـكی دیكـە.

(**قَاصِفًا**): (**القَصْـفُ: الكَسْرُ وَالهَشْـمُ: هِـيَ الرِّيْـحُ الَّتِـي تَكْسِرُ مَـا جَـرَتْ عَلَيْـهِ مِـنَ الشَّـجَرِ وَالبِنَاء**)، (**قَصْـف**) بـە مانـای تێكشـكاندن دێ، كـە لێـرەدا (**قَاصِـف**) بایەكـە هـەر شـتێك بـە سـەریدا بـڕوا لـە درەخـت و خانووبـەرە، تێـكی بشـكێنێ.

(**تَبِيعًـا**): (**تَبيـع: التابِـعُ الْمُطَالِـبُ بالثَّـأْرِ والخـادم التَّابِـعُ، والعِجْـل**) (**تَبيـع**) واتە: شـوێن كەوتوو، كەسـێك كـە بـە دوای شـتێكدا دەچـێ و داوای تۆڵـە دەكا (**والْمُطَالِـبُ بحَـق**) هەروەهـا (**تَبيـع**) بـە مانـای كەسـێكە كـە داوای مافێـك دەكات، هەروەهـا بـە مانـای شـوێنكەوتوو و خزمەتچیی دێ، كـە بـە دوای گەورەكـەی دەكـەوێ بـۆ ئـەوەی خزمـەتی بـكات، هەروەهـا بـە مانـای بەچكـەی ڕەشـە وڵاخیـش دێ، واتـە: گۆلـك.

(**فَتِـيلًا**): (**فَتِيْـل: مَـا فَتَلَـهُ الإِنْسَـانُ بَـيْنَ أَصَابِعِـهِ مِـنْ خَيْـطٍ أو وَسَـخٍ، الخَيْـطُ الَّـذِي فِي شَـقِّ النَّـوَاةِ**)، (**فَتيـل**) ئەوەیـە كـە ئینسـان لـە نێـوان دوو پەنجەكانیـدا، بـای دەدات، لـە چڵـك، یاخـود دەزوو، بـە دوو پیتكـە دەیپروێنـێ، هەروەهـا بـەو دەزووەی سـەر نێـوكی دەنكـە خورمـاش دەگوتـرێ، كـە دەزووێكـە وەك چـۆن بـە دوو پەنجـە شـتێك دەخرێتـە نێـو دوو سـەرە پەنجـەوە، ئەویـش شـتێكی باریكـە وەك دەزووێـك.

## مانای گشتی ئایەتەکان

خـوا ﷻ لـەم حـەوت ئایەتـەدا، بـاسی چەنـد بابەتێـك دەكات، كـە سـەرەتا دەسـت پێـدەكات بـە خسـتنە ڕووی یەكـێ لـە چاكـەو نیعمەتـە مەزنـەكانی خـۆی، كـە بریتیـە لـە ڕام كـردن و دەسـتەمۆ و ملكەچكـردنی دەریـا، بـۆ سـەفەرو بـارو سـوار و هاتووچـۆی مرۆڤـان، دەفەرمـوێ:

﴿ رَّبُّكُمُ ٱلَّذِى يُزْجِى لَكُمُ ٱلْفُلْكَ فِى ٱلْبَحْرِ لِتَبْتَغُواْ مِن فَضْلِهِۦٓ إِنَّهُۥ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا ﴿٦٦﴾ ﴾، پەروەردگارتـان ئـەو كەسـەیە كەشـتییەكانتان بـۆ دەئـاژوێ، كەشـتییەكانتان بـۆ لـێ دەخـوڕێ لـە دەریـادا.

وشـەی (ٱلْفُلْكَ) هـەم بـە مانـای یـەك كەشـتیی (السـفینة)دێ، هـەم بـە مانـای كـۆی كەشـتییەكان (**السُّـفُن**)یش دێ.

خـوا ﷻ تەنیـا وشـەی (ٱلْفُلْكَ)ی بەكارهێنـاوە لـە قورئانـدا، كـە بـە زۆریـی لـە هەمـوو سـیاقەكاندا، هـەم مانـای كەشـتییەك دەگەیەنـێ، هـەم بـە مانـای كۆمەڵـە كەشـتییەكیش دێ، بـەڵام ئەگـەر وشـەی (**سَـفِينة**)ی بەكارهێنابایـە، ئەوكاتـە هـەر یـەك كەشـتیی دەگەیانـد و، ئەگـەر (**سُـفُن**) بووایـە ئەوكاتـە تەنیـا چەنـد كەشـتییەكی دەگەیانـد، بـەڵام خـوا ﷻ وشـەیەكی بەكارهێنـاوە، كـە هـەم مانـای تـاك دەگەیەنـێ، هـەم مانـای كـۆ دەگەیەنـێ، پەروەردگارتـان ئـەو كەسـەیە: كەشـتییەكانتان بـۆ دەئـاژوێ لـە دەریـادا، واتـە: دەریـای وا لێكـردوە، كـە كەشـتییەكان تێیـدا بـڕۆن، وەك چـۆن هـەواشی وا لێكـردوە كـە فڕۆكـەكان تێیـدا بـڕۆن، مەبەسـت لـە ئاژووتنـی خـوا بـۆ كەشـتییەكان ئەوەیـە، واتـە: خـوا دەریـا و ئـاوی وا دروسـتكردوە: كەشـتیی بتوانـێ لەسـەری بـڕۆن و بخـزن، نـەك وەك وشـكانیی، كـە لـە بنیـدا نـەڕوات، ئـاو لـە بـن كەشـتییەكەدا دەخـزێ و دەڕوات، شـلە، ﴿لِتَبْتَغُواْ مِن فَضْلِهِۦٓ ﴾، بـۆ ئـەوەی لـە بەخشـشی خـوا داوا بكـەن واتـە: پێیـدا بێـن و بچـن و، بازرگانیـی و كار و كەسابەت بكـەن.

خـوا لێـرەدا ئـەو مـاڵ و سامانەی كـە بـە هـۆی بازرگانیـی و، كارو كەسـابەتەوە وەدەسـت دێ، یاخـود ئـەوەی كـە لـە دەریـادا ڕاوی دەكـەن، ئێسـتا زۆرجـاران كەشـتیی، بـۆ ڕاوكـردنی

ژیاندارانی نێو دەریا بەكاردێ، نەك هەر بەس بۆ مەبەستی گواستنەوەی كەل و پەل و، مرۆڤەكان و باروسوار، ئەوانەی هەمووی بە: بەخششی خوا (**فضل الله**) ناوبردوون، ﴿ إِنَّهُۥ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا ﴾، بە دڵنیایی ئەو لەگەڵتان بە بەزەیی و میهرەبانە.

ئنجا بە بۆنەی ڕۆیشتنی كەشتییەكانەوە بە نێو دەریادا، بۆ داواكردنی بەخششی خوا، كە مەبەست پێی ئەو بژیوو ڕۆزییەیە، كە بە سواریی كەشتییەكان دەستیان دەكەوێ، چ وەك بازرگانیی، چ وەك گواستنەوەی كەل و پەل، چ وەك ڕاووشكار لە دەریادا، دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا مَسَّكُمُ ٱلضُّرُّ فِي ٱلْبَحْرِ ضَلَّ مَن تَدْعُونَ إِلَّآ إِيَّاهُ ﴾، هەر كاتێك زیانێكتان لە دەریادا تووش بوو، واتە: گرفتار بوون، ﴿ ضَلَّ مَن تَدْعُونَ إِلَّآ إِيَّاهُ ﴾، جگە لەوی، ئەوانەی لێیان دەپاڕێنەوە، هەموویان ون دەبن، جگە لەو خوایەی كە دەریای بۆ ڕام و دەستەمۆ كردوون، ئەوانەی دیكەتان هەموو لێ ون دەبن، واتە: هەر بانگیان ناكەن، یاخود ئەگەر بانگیشیان بكەن، نین، تاكو لە فریاتان بێن و دەربازتان بكەن! ﴿ فَلَمَّا نَجَّىٰكُمْ إِلَى ٱلْبَرِّ أَعْرَضْتُمْ ﴾، كەچی دوای ئەوەی دەربازی كردن بۆ وشكانیی، پشتتان هەڵكرد، پشتتان لە خوا كرد، لاملتان لە خوا كرد، ﴿ وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ كَفُورًا ﴾، بە دڵنیایی مرۆڤ سپڵە و ناسوپاسە، واتە: مرۆڤێك دەستی هیدایەتی خوای نەگەیشتبێ، یاخود مرۆڤی بێبڕوا.

﴿ أَفَأَمِنتُمْ أَن يَخْسِفَ بِكُمْ جَانِبَ ٱلْبَرِّ ﴾، ئایا خاتر جەم بوون و، بێ ترس و بیم بوون، كە خوا بە لای وشكانییدا ڕۆتان بچوێنێ، ئەو وشكانییەی كە دەچنە سەری، پێتان وایە كە دەرباز بوون لە مەترسیەكانی نێو دەریا، ناگونجێ ئەو وشكانییەش لە بنتاندا ڕۆبچێ، ئایا خاترجەم بوون لەوە؟!

﴿ أَوْ يُرْسِلَ عَلَيْكُمْ حَاصِبًا ﴾، یاخود: هەر لەو وشكانییەدا كە بۆی چوون، لەو سەر زەمینەدا كە لە كەشتییەكان دابەزیون و چوونە نێوی، ئەگەر زەوییەكەش لە ژێرتان ڕۆنەچێ و پێدا نەچنە خوار، ئایا خاترجەم بوون لەوە كە: خوا بایەكی ڕاماڵكەری خۆڵ و چەوو وردە بەردتان، بنێرێتە سەر، بایەكی بەهێز، وەك دەبینین ئەو بایانەی كە هەڵدەكەن، دار و بەرد ڕا دەماڵن، بگرە گەردەلوولی وا هەیە سەیارە لوول دەدات و هەڵیدەگرێ و، دار و درەخت تێكدەشكێنێ و، خانووبەرەكان دەڕووخێنێ، ﴿ ثُمَّ لَا تَجِدُوا۟ لَكُمْ وَكِيلًا ﴾، ئنجا هیچ كار پێ سپێردراوێك و، هیچ سەرپەرشتیارێكتان دەست نەكەوێ، كە دەربازتان بكات لەو بایە بەهێزە، یان لەو بە زەوییدا چوونە خوار و ڕۆچوونە؟

﴿ أَمْ أَمِنتُمْ أَن يُعِيدَكُمْ فِيهِ تَارَةً أُخْرَىٰ ﴾، یان ئایا خاترجەم و بێ بیم و بێ باك بوون، لەوەی خوا کاتێکی دیکە، کەڕەتێکی دیکە بتانگێڕێتەوە نێوی، واتە: نێو دەریا، ﴿ فَيُرْسِلَ عَلَيْكُمْ قَاصِفًا مِّنَ الرِّيحِ ﴾، ئنجا بایەکی تێکشکێنەرتان بنێرێتە سەر، بایەکی بەهێز کە شت تێك دەشکێنێ، ﴿ فَيُغْرِقَكُم بِمَا كَفَرْتُمْ ﴾، بە هۆی ناسوپاسییتانەوە نغرۆتان بکات، نقوومتان بکات لە دەریادا، ﴿ ثُمَّ لَا تَجِدُوا لَكُمْ عَلَيْنَا بِهِ تَبِيعًا ﴾، دواییش هیچ داواکارێکی مافەکانتان، یان داواکاری تۆڵەتان لە ئێمە، چنگ نەکەوێ، واتە: هیچ کەستان چنگ نەکەوێ، کە بە دوای مافی ئێوە بکەوێ و داوای ماف و قەرەبووتان بۆ بکات، لە ئێمە، یاخود تۆڵە لە ئێمە بکاتەوە، ئایا لەوە دڵنیا بوون؟!

خوا ﷻ وەك پرسیار کردنی نکووڵیلێکەرانە و، سەرزەنشتکەرانە ئەو پرسیارانە دەکات، دوایی دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ ﴾، بە دڵنیاییەوە ڕێزمان لە وەچەی ئادەم گرتوە، ﴿ وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ ﴾، لە وشکانیی و دەریاش دا هەڵمانگرتوون، واتە: هۆیەکانی هات و چۆی نێو وشکانیی و دەریامان بۆ ڕەخساندوون، کە سواری هۆکارەکان ببن، ﴿ وَرَزَقْنَاهُم مِّنَ الطَّيِّبَاتِ ﴾، هەروەها لە بژیوە خۆش و بەتام و بە سوودەکان، پێمان داون، ﴿ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا ﴾، بەسەر زۆرێك لەوانەش دا کە دروستمان کردوون، هەڵمان بژاردوون، واتە: مرۆڤەکانمان بەسەر زۆر لە دروستکراوەکانماندا، هەڵبژاردوون، دوایی ئەوە ڕوون دەکەینەوە کە مەبەست پێی چییە؟!

ئنجا دێتە سەر بابەتێکی دیکە، دەفەرموێ: ﴿ يَوْمَ نَدْعُوا كُلَّ أُنَاسٍ بِإِمَامِهِمْ ﴾، واتە: یاد بکەوە! ڕۆژێك هەر کۆمەڵە خەڵکێك، بە ناوی پێشەوایەکەیانەوە بانگ دەکەین، کۆمەڵێ شوێن فلانکەس کەوتوون و، کۆمەڵێ بە دوای فلانکەس کەوتوون، یان بە دوای بەرنامەیەك کەوتوون، یان بە دوای فلان کتێبە کەوتوون، بانگیان دەکەین:

﴿ فَمَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِيَمِينِهِ ﴾، ئنجا هەر کەسێك نووسراوەکەی خۆی، بە دەستی ڕاستی وێ بدرێتەوە ﴿ فَأُولَٰئِكَ يَقْرَءُونَ كِتَابَهُمْ ﴾، ئا ئەوانە نووسراوەکەی خۆیان دەخوێننەوە، چونکە پێی دڵخۆشن، بۆیە دەخوێننەوەو، شانازیی پێوە دەکەن، بە بڕوانامەکەی خۆیان، بە لیستی کردەوەکانی خۆیان، کە لیستێکی نوورانییە، پڕە لە کردەوەی چاك تێدا تۆمارکراو، ﴿ وَلَا يُظْلَمُونَ فَتِيلًا ﴾، بە ئەندازەی دەزووی سەر نێوکە خورماش، ستەمیان لێ ناکرێ!

﴿ وَمَن كَانَ فِي هَٰذِهِۦٓ أَعۡمَىٰ ﴾، هەر کەسێکیش لەم ژیانی دنیایەدا، کوێر بێ، واتە: کوێردڵ بێ، نەك کوێری چاو، بەڵکو کوێری دڵ و عەقڵ بێ، هەق نەبینێ، ﴿ فَهُوَ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ أَعۡمَىٰ ﴾، لە مەنزڵگای کۆتایی دا کوێرتریشە، یاخود: لەوێ چاوی دڵیشی و، چاوی سەریشی کوێر دەبێ، ﴿ وَأَضَلُّ سَبِيلٗا ﴾، گومڕاتریشە، واتە: گومڕاترە لەوەی کە لە دنیادا بوو، یانی: گومڕا بوونی دوا ڕۆژی و، کوێر بوونی دوا ڕۆژی، لە هی دنیای زیاترو، بە زەڕترە.

لێرەدا خوای دادگەر باسی ئەوەی نەکردوە، کە بە دەستی چەپیان نامەی کردەوەکانیان دەدرێتەوە، چونکە لە شوێنەکانی دیکە ئەوە باسکراوە، بەڵام لێرەدا خوا ﷻ باسی شتێکی کردوە، کە ئەمە زێدەیە، بۆ سەر ئەوە کە نامەی کردەوەکانیان لە پشتەوە ڕاو، لە لای چەپرا، وێ بدرێتەوە، کە بریتیە لەوەی لە دواڕۆژدا کوێر دەبن و گومڕاو سەرگەردان دەبن، زیاتر لەوەی کە لە دنیادا، کوێرو گومڕاو سەرگەردان بوون.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

خـوا فەرموویـەتی: پەروەردگارتـان ئـەو کەسـەیە کـە کەشـتییەکانتان لـە دەریـادا بـۆ دەئـاژۆێ، تاکـو کار و کاسـبیی و بازرگانیـی بکـەن و لـە بەخششـی خـوا بـە دەسـت بێنـن، چونکـە خـوا پێتـان میهرەبـان و بـە بەزەییـە، هـەرکات تـووشی زیانێـك بـوون و گرفتاریـش بـوون لـە دەریـادا، جگـە لـە خـوا، لـە کـەس ناپاڕێنـەوە، چونکـە دەزانـن کـەس لـە فریاتـان نایـەت، هەرکاتێکیـش دەربـازی وشـکانیی کـردن، ئێـوە پشـت هەڵدەکـەن و، مرۆڤیـش ناسوپاسـە بەرانبـەر بـە پـەروەردگاری، ئایـا خاترجـەم و بـێ تـرس بـوون، کـە بـەلای وشـکانییتاندا ڕۆچوێنـێ، یـان بایـەکی ڕامالکەرتـان بـۆ بنێـرێ و هیـچ فریـاد ڕەسێکتان چنـگ نەکـەوێ؟ یـان ئایـا خاترجـەم و بـێ تـرس بـوون، کـە جارێـکی دیکـە بتانگێڕێتـەوە نێـو دەریا و، بایـەکی تێکشـکێنەرتان بـۆ بنێـرێ و نغرۆتـان بـکات و، هیـچ کەسیشـتان چنـگ نەکـەوێ، کـە داواکاری مـافی ئێـوە بـێ لـە ئێمـە واتـە: تۆڵەتـان بـۆ لـە ئێمـە بکاتـەوە؟!

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ رَّبُّكُمُ ٱلَّذِى يُزْجِى لَكُمُ ٱلْفُلْكَ فِى ٱلْبَحْرِ لِتَبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِهِۦٓ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا ﴿٦٦﴾ وَإِذَا مَسَّكُمُ ٱلضُّرُّ فِى ٱلْبَحْرِ ضَلَّ مَن تَدْعُونَ إِلَّآ إِيَّاهُ ۖ فَلَمَّا نَجَّىٰكُمْ إِلَى ٱلْبَرِّ أَعْرَضْتُمْ ۚ وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ كَفُورًا ﴿٦٧﴾ أَفَأَمِنتُمْ أَن يَخْسِفَ بِكُمْ جَانِبَ ٱلْبَرِّ أَوْ يُرْسِلَ عَلَيْكُمْ حَاصِبًا ثُمَّ لَا تَجِدُوا۟ لَكُمْ وَكِيلًا ﴿٦٨﴾ أَمْ أَمِنتُمْ أَن يُعِيدَكُمْ فِيهِ تَارَةً أُخْرَىٰ فَيُرْسِلَ عَلَيْكُمْ قَاصِفًا مِّنَ ٱلرِّيحِ فَيُغْرِقَكُم بِمَا كَفَرْتُمْ ۙ ثُمَّ لَا تَجِدُوا۟ لَكُمْ عَلَيْنَا بِهِۦ تَبِيعًا ﴿٦٩﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چواردە بڕگەدا:

١)- ﴿ رَّبُّكُمُ ٱلَّذِى يُزْجِى لَكُمُ ٱلْفُلْكَ فِى ٱلْبَحْرِ ﴾، پەروەردگارتان ئەو کەسەیە کە کەشتییەکانتان، (یان کەشتییتان) لە دەریادا بۆ لێدەخوڕێ و دەئاژۆێ، بێگومان ڕستەی ناویی (الجُمْلَة الإِسْمِيَّة) بەردوامیی و چەسپاویی دەگەیەنێ، ﴿ رَّبُّكُمُ ٱلَّذِى ﴾، پەروەردگارتان ئەو کەسەیە، کە بەردەوام....

کە دەفەرموێ: ﴿يُزۡجِي لَكُمُ﴾، (يُزجي) (الفِعْل المُضَارِع)ەو، تازە بوونەوە دەگەیەنێ.

کە دەفەرموێ: ﴿رَّبُّكُمُ ٱلَّذِي﴾، ئەمە ناساندن (**تعريف**)ی خوایە عزَّوجل.

کە دەفەرموێ: ﴿يُزۡجِي لَكُمُ ٱلۡفُلۡكَ فِي ٱلۡبَحۡرِ﴾، هەم (ٱلۡفُلۡكَ)، هەم (ٱلۡبَحۡرِ) هەر دووکیان (ال)ی تەعریفیان لەسەرە بۆ (**جنس**)ن، واتە: تەنیا پەروەردگارتان سەرجەم کەشتییانتان لە تێکڕای دەریایان دا بۆ دەئاژوێ، تەنیا پەروەردگارتان توانیویەتی ئاو وا لێبکات، ئاوی دەریاکان وا لێبکات، کە کەشتیی تێیدا بڕوات و بێت و بچێ.

٢)- ﴿لِتَبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِهِۦٓ﴾، بۆ ئەوەی لە بەخششی خوا بخوازن، (**الإِبْتِغَاءُ: الطَّلَبُ، وَالفَضْلُ: الرِّزْقُ، وَالمَقْصُودُ بِهِ التِّجَارَةِ**)، بۆ ئەوەی لە بەخششی خوا بخوازن، واتە: داوا بکەن، بە هۆی سوار بوونی کەشتییانەوە لە دەریادا، هاتووچۆ کردنتان، دەبێتە هۆی ئەوەی بژیوێك کە بەخششی خوایە و، پێتان دەدا، داوا بکەن وەدەستی بێنن.

زۆربەی توێژەرەوان تەنیا بە بازرگانیی، لێکیان داوەتەوە، بەڵام وەك باسمان کرد: ئێستا کەشتییەکان وێڕای ئەوە کە بۆ هاتووچۆو بار و سوار و گواستنەوەی کەل و پەل، بەکاردەهێنرێن، بە تایبەتی ئێستا: گواستنەوەی نەوت و غاز و ئاسن و ئەو شتە قورسانە، بە هەمان شێوە بۆ ڕاووشکاریش بەکاردەهێنرێن، بۆ دەرهێنانی ئەو بژیوەی کە لە خودی دەریاکاندا هەیە، لەو ئاژەڵ و ژیاندارانەی کە تێیاندا هەن، کە هەموویان گۆشتیان حەڵاڵ و ڕەوایە، جگە لەوەی کە دیار بێ، زیان بەخشە، بۆ ئەوەش بەکاردەهێنرێن.

٣)- ﴿إِنَّهُۥ كَانَ بِكُمۡ رَحِيمٗا﴾، بە دڵنیایی ئەو (خوا) بەرانبەرتان بە بەزەییە، ئەمە ئاگادار کردنەوەی مرۆڤە، کە: خوا ﷻ بۆیە وای بۆ کردوون، چونکە لەگەڵتان میهرەبان و بە بەزەییە.

٤)- ﴿وَإِذَا مَسَّكُمُ ٱلضُّرُّ فِي ٱلۡبَحۡرِ﴾، هەروەها هەرکات لە دەریاش دا زیانێکتان تووش بوو! زیانی نێو دەریا بریتیە لەوە کە بای بەهێز هەڵبکات! ئنجا کەسێك قەدری ئەو نیعمەتی دەرباز بوون لە نێو دەریا دەزانێ، کە سواریی کەشتیی بووبێ!

جاری دیکەش باسم کردوە: ئێمە لە ساڵی (١٩٩٨ز) لە دوورگەی (ماڵتا)وە کە دوورگەیەکە لە نێو دەریای سپی نێوە ڕاست دا، بەبانگهێشتی حکوومەتی (لیبیا) بۆ کۆبوونەوەیەکی گشتی چووینە شاری: (**بنغازي**)، کە کەشتییەکەمان نزیکەی بیست (٢٠) سەعات، یان زیاتر لە دەریادا بوو، تەنیا بۆ سەرێکی، هەردووك سەری دەوری چل (٤٠) سەعات، یان زیاتر،

لـە حاڵێکـدا کـە هەشـتا (٨٠) کیلۆمەتـری لـە سـەعاتێکدا دەبـڕی، لـە سـەری گەڕانـەوەدا، تـووشی بایـەکی زۆر بەهێـز بوویـن، کـە کەشـتییەکەمان وەك تەپەدۆڕێـکی بچـووکی سـەر ئـاو، ئـەو دەریایە گەمـەی پـێ دەکـرد و، دەیهێنـاو دەیـبرد و، زۆر حاڵەتێـکی مەترسـییدار بـوو.

دەگونجـێ تـووش بـوون لـە دەریـادا، مەبەسـت پێـی ئـەو حاڵەتـە بـێ، کـە ئـەو کەشـتییە، دێ و دەچـێ: بـە پێشـەوەدا ڕۆدەچـێ، بـە دواوەدا، بـەلای ڕاسـتدا، بـە لای چەپـدا، هەرجـارە کـە ڕۆدەچـێ، دەڵێـی: ئـەوە جـاری کۆتاییـە!

یاخـود مەبەسـت پێـی ڕێ ونکردنـە لـە دەریـادا، کـە ڕێ ون بـوون لـە دەریـادا، مەگـەر چـۆن ئەگەرنـا سـەرەنجامەکەی بریتیـە لـە نغـرۆ بـوونی کەشـتیی و، ئەوانـەی کـە لـە کەشـتییەکەدان، دەفەرمـوێ: هەرکاتـێ زیانتـان تـووش بـوو، لـە دەریـادا.

٥)- ﴿ ضَلَّ مَن تَدۡعُونَ إِلَّآ إِيَّاهُۖ ﴾، هەموو ئەوانەی کە لێیان دەپاڕێنەوە، ون دەبن، جگە لەو یانی: جگە لە خوا کە ئاوی دەریای بۆ ڕام و دەستەمۆ کردوون.

ئەمە دوو واتای هەن:

**یەك:** ﴿ ضَلَّ مَن تَدۡعُونَ إِلَّآ إِيَّاهُۖ ﴾، یانی: هەموو ئەوانەی کە لێیان دەپاڕێنەوە، جگە لە خوا، ون دەبن، کە لێرەدا ئەگەر وابێ، ئەو هەڵاواردن (**إستثناء**)ە، ﴿ إِلَّآ إِيَّاهُۖ ﴾، هەڵاواردنی پەیوەست (**إستثناءٌ مُتَّصِل**)ی پێ دەگوترێ، چونکە کەسانێك کە جگە لە خواپەرستان چاوەڕوانییان لێیان هەبووە، لە فریشتە و جند و مرۆڤ، خاوەنی هەست و ویستن.

**دوو:** دەشگونجێ: ﴿ ضَلَّ مَن تَدۡعُونَ ﴾، ئەم (مَن)ە، مەبەست بتەکانیان بێ، واتە: ئەو بتانەی کە لێیان دەپاڕێنەوە، ون دەبن، جگە لە خوا، ئەو کاتە ئەو هەڵاواردنە، هەڵاواردنێکی پچڕاو (**إستثناءٌ مُنفَصِل**)ی پێ دەگوترێ، چونکە خوا ﷻ لە هەموو ڕوویەکەوە، جیایە لە بتەکان و، هەر کاتێك هەڵاوێردراو جیابوو لە لێ هەڵاوێردراو، (**مُسْتَثْنَى**) جیابوو لە (**مُسْتَثْنَى مِنْهُ**) ئەوە پێی دەگوترێ: هەڵاواردنی پچڕاو (**إسْتِثْنَاءٌ مُنفَصِل**) هەردوو واتاکە هەڵدەگرێ.

٦)- ﴿ فَلَمَّا نَجَّىٰكُمۡ إِلَى ٱلۡبَرِّ أَعۡرَضۡتُمۡۚ ﴾، کاتێك (خوا) دەربازی کردن بەرەو وشکانیی، پشتتان هەڵکرد (**الإِعْرَاضُ: التَّرْك**) وازهێنان واتە: وازتان لە خوا هێنا، پشتتان لە خوا کرد.

٧)- ﴿ وَكَانَ ٱلۡإِنسَٰنُ كَفُورًا ﴾، بە دڵنیایی مرۆڤ، سپڵەیە (**كَفُور**) لێرەدا بە مانای سپڵە و ناسپاس و پێنەزان دێ.

ئنجا وشەی (ٱلْإِنسَٰنُ) کە ناسێنراو (**مُعَرَّف**)ە: (**التعريفُ للجِنسِ المُفيدِ للإستغراقِ الحَقِيْقِي، أو الإِسْتِغْرَاق العُرْفِي**).

کە دەفەرموێ: ﴿ وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ كَفُورًا ﴾، یانی: جینسی مرۆڤ، سپڵە و نا سپاسە، ئنجا ئەمە لێرەدا، یان بە مانای ئەوەیە کە تێکڕای مرۆڤەکان سپڵە و ناسپاسن، مەگەر ئەوانەی دەستی هیدایەتی خوا بیانگاتێ و، بە هۆی ئیمانەوە ببنە سوپاسگوزار و، سپڵەییان تێدا نەمێنێ، ئەگەرنا هەموو مرۆڤەکان ناسپاسن، یاخود مەبەست پێی ئیستیغراقی عورفییە، واتە: ئەو مرۆڤانەی کە بێبڕوان، ئەوانە ناسپاسن بەرانبەر بە خوا.

٨)- ﴿ أَفَأَمِنتُمْ أَن يَخْسِفَ بِكُمْ جَانِبَ ٱلْبَرِّ ﴾، ئایا دڵنیا و خاترجەم و بێ ترس بوون، کە (خوا) لای وشکانییتان لە بندا ڕۆبچوێنێ، بە لای وشکانییتاندا بەرێتە خوار، (**الجَانِبُ: الشِّقُّ، وَهُوَ شَاطِئُ البحر الَّذِي يُرْسُونَ عَلَيْهِ**) (**جَانِب**) واتە: لا، بەر، بەری وشکانیی، کە مەبەست پێی کەناری دەریایە، ئەو قەراغ دەریا و وشکانییەی کە لە نیزیك دەریایە، کە کەشتییەکانی تێدا لەنگەر پێ دەگرن.

وشەی: ﴿ أَن يَخْسِفَ ﴾، خوێنراویشەتەوە: (**أَنْ نَخْسِفَ**) واتە: ڕۆ ببەین.

٩)- ﴿ أَوْ يُرْسِلَ عَلَيْكُمْ حَاصِبًا ﴾، یاخود ئەگەر زەوییتان لە بندا ڕۆ نەچوێنێ، بایەکی ڕماڵکەر کە خۆڵ و لم و چەو و وردە بەرد، ڕا دەماڵێ، هێندە بەهێزە، بایەکی واتان بنێرێتە سەر، خوێنراویشتەوە: (**أو نُرْسِلَ عليكم**) بنێرینە سەرتان، (**حاصِبْ**) واتە: وردە بەرد هاوێژ، کە (**حَصْباء**) بەردی بچووکە، کە (چەو)ی پێ دەڵێین واتە: بایەکتان بنێرێتە سەر، کە وردە بەردتان پێدا بدات.

١٠)- ﴿ ثُمَّ لَا تَجِدُوا لَكُمْ وَكِيلًا ﴾، دوایی ئێوە هیچ کار پێسپێردراوتان چنگ نەکەون، (**الوَكِيْلُ: المُوَكَّلُ إِلَيْهِ القِيَامُ بِمَهَامِّ مُوَكِّلِهِ**)، (**وَكِيْل**) کەسێکە کاری پێ سپێردرابێ کە هەڵسێ بە کار وبارە گرنگەکانی ئەو کەسەی کە ڕایسپاردوە، واتە: بریکار، کار پێسپێردراو، سەرپەرشتیار، فریادڕەس.

١١)- ﴿ أَمْ أَمِنتُمْ أَن يُعِيدَكُمْ فِيهِ تَارَةً أُخْرَىٰ ﴾، یان ئایا خاترجەم بوون، کە کەڕەتێکی دیکە بتانباتەوە نێوی، واتە: بتانباتەوە نێو دەریا، خوێنراویشەتەوە: (**أَن نُعيدَكُم**) بتانبەینەوە نێو دەریا، پێشتر گوتمان (**تارة**) بە مانای (**حِينٌ**) واتە: کات دێ، هەروەها (**التارةُ: المَرَّةُ المُتَكَرِّرة**) کەڕەتی دووبارە بووەوە، بەو مانایەش دێ.

لێرەدا مەبەست ئەوەیە، کە خوا پاڵنەر و هاندەری چوونە نێو دەریاتان بۆ بڕەخسێنێ، ئەگەرنا هەر چەندە بە ویستی خوا دەچنەوە نێو دەریا، بەڵام بە ئیرادەی

خۆیان پاڵنەر و هاندەریان دەبێ، کە بچنەوە بۆ کار و کەسابەت و بازرگانیی و، ئەو کارانەی کە بەرژەوەندییەکانی خۆیانیان تێدا دەبیننەوە.

١٢)- ﴿ فَيُرْسِلَ عَلَيْكُمْ قَاصِفًا مِّنَ ٱلرِّيحِ ﴾، خوێنراویشەتەوە: (**فَنُرسلَ عَلَيكُم**) بنێرینە سەرتان، هەروەها (**رِيحْ**) خوێنراویشتەوە: (**رِيَاح**) (**قاصِفاً مِنَ الرِّياحِ**)، (**رِيحْ**) تاکە و (**رِياح**) کۆیە، یان: بایەکی تێکشکێنەرتان بنێرێتە سەر، یاخود تێك شکێنەرێك لە بایەکانتان بنێرێتە سەر، (**القَاصِف: التي تَقصِفُ أي: تَكسِرُ**) تێکدەشکێنێ.

ئنجا بۆچی خوا ﷻ بای تێکشکێنەری ناو ناوە (**قاصِف**) کە (**رِيحْ**) (**مؤنث**)ە، هەروەها (**رِياح**)یش، بۆچی نەیفەرمووە: (**قاصِفةً**)؟! دەڵێ: (**وُصِفَ الرِّيحُ بِهِ، فَعُمِلَ مُعامَلَةَ الصِّفَاتِ المُخْتَصَّةِ بالمُؤَنَّثِ، فَلَم يُلحِقُوهُ عَلامَةَ التأنيث**) چونکە وشەی (**قاصِف**) لێرەدا کراوە بە سیفەتێکی تایبەت بە (با)وە، ئنجا سیفەتی تایبەت بە (با)وە، پێویستیی بەوە نەکردوە کە نیشانەی مێیینەی بخرێتە سەر، چونکە (**قاصِف**) سیفەتی بایە، واتە: بایەکی تێکشکێنەر، وەك (**حامِل**) پێویست ناکات پێی بڵێی (**حامِلة**)، چونکە هەر ئافرەت دووگیان دەبێ، یاخود لە ئاژەڵ، هەر مێیینە ئاوس دەبێ، لەبەرئەوە پێویست ناکات، پێی بڵێی: (**حامِلة**)، چونکە کاتێك (**تاء التأنيث**) دەخرێتە سەر سیفەتی مێیینە، کە ئەو سیفەتە، هاوبەش بێ لە نێوان نێر و مێدا، وەك: (**عاقِل، عاقِلة**) (**إمرأةٌ عاقِلة**) چونکە پیاویش عەقڵی هەیەو، ئافرەتیش عەقڵی هەیە، بەڵام هەر ئافرەت دووگیان دەبێ بۆیە پێویست ناکات، پێی بگوترێ: (**حامِلة**) لێرەش هەر (با) تێکشکێنەرە و سیفەتی تێکشکاندن هەر سیفەتی بایە، بۆیە خوا ﷻ سیفەتی (**تأنيث**)ی نەخستۆتە سەر (**حاصِب**) یاخود (**قاصِف**) هەردووکیان، لەبەر ئەوەی بەس با ڕا دەماڵێ و تەنیا با تێکدەشکێنێ.

١٣)- ﴿ فَيُغْرِقَكُم بِمَا كَفَرْتُمْ ﴾، سەرەنجام نغرۆتان بکات، نوقمتان بکات، لە ئاوی دەریادا بە هۆی سپڵەییتانەوە، بە هۆی ئەوەوە کە سپڵەییتان نواندوە.

هەروەها (**يُغرِقَكُم**) خوێنراویشتەوە: (**نُغرِقَكُم**) واتە: نغرۆتان بکەین.

١٤)- ﴿ ثُمَّ لَا تَجِدُوا۟ لَكُمْ عَلَيْنَا بِهِۦ تَبِيعًا ﴾، ئنجا دوای ئەوەی نغرۆمان کردن، هیچ داواکارێك بەسەر ئێمەوەتان چنگ نەکەوی، کە ئەو مافەتان بۆ داوا بکاتەوە، یان ئەو تۆڵەیەتان بۆ لە ئێمە بکاتەوە (**تَبيع: مُبَالَغَةٌ فِي التَّابعِ، أَي: المُتَّبِعِ غَيرَهُ المُطالِبِ لاقتَضَاء شيءٍ مِنْهُ**) (**تَبيع**) زێدەڕۆییە لە (**تابع**)دا، (**تابع**) یش بریتیە لە شوێنکەوتوو، کەسێك شوێن کەسێك دەکەوێ، واتە: ئەوەی کە بە دوای دەکەوێ و داوای لێ دەکات، مافێکی لێ داوا دەکات، یاخود دەیەوێ: تۆڵەی لێ بستێنێتەوە، کەسێکی واتان چنگ ناکەوێ.

## مەسەلەی دووەم:

**خوا ﷻ ڕایگەیاندوە: ڕێزمان لە وەچەی ئادەم گرتووەو لە وشکاینی و دەریادا هەڵمان گرتوون و، لە بژیوە خۆش و بە سوودەکانمان پێداون و، بەسەر زۆرێك لە دروستکراوانماندا هەڵمانبژاردوون:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ وَحَمَلْنَٰهُمْ فِي ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا ﴿٧٠﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ ﴾، بە دڵنیاییەوە ئیمە ڕێزمان لە وەچەی ئادەم گرتوە، (**التَّكْرِيمُ: جَعَلَ الشيءِ كَرِيمًا، أَي: نَفِيسًا**) (**تَكريمْ**) بریتیە لەوەی شتێك (**كَريم**) بکەی، واتە: بە نرخی بکەی، بەڕێزی بکەی، بەهاداری بکەی.

٢)- ﴿ وَحَمَلْنَٰهُمْ فِي ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ ﴾، لە وشکانیی و دەریادا هەڵمان گرتوون، (**الحَمْلُ: وَضْعُ الشيءِ عَلَى المَرْكَبِ مِنَ الرَّوَاحِلِ**)، (**حَمْل**) ئەوەیە کە تۆ شتێك بخەیە سەر شتێك، یان بیخەیە سەر شتێك کە سواری دەبن، واتە: ئێوەمان سوار کردوەو کردوومانن بە هەڵگیرا و لە وشکانیی و دەریادا، واتە: هۆکارەکانمان بۆ ڕەخساندوون، کە سواریان ببن و هاموشۆو بار و سواریان پێ بکەن، لە وشکانیی و لە دەریادا.

٣)- ﴿ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ ﴾، هەروەها لە بژیوە خۆش و بە تام و سوودبەخشەکان، پێمان داون.

٤)- ﴿ وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا ﴾، دیسان هەڵمانبژاردوون و، بەرزمان کردوونەوە و، پەسندمان کردوون، بەسەر زۆرێك لەوانەدا کە دروستمان کردوون، بە هەڵبژاردن و پەسند کردنێکی مەزن.

کە لێرەدا مەبەست ئەو هەڵبژاردنە بیناوەیە، کە دەیبینین، کە هەموو ئەو دروستکراوانەی کە لەسەر زەوی دەژین، مرۆڤ بەسەریاندا هەڵبژێردراوە و، هەموویان بۆ مرۆڤ دەستەمۆ کراون، تەصەڕوفیان تێدا دەکات و هەموویان بۆی ملکەچن و دەستەمۆن.

## کورتە باسێک لە بارەی ڕێزگرتنی خواوە بۆ مرۆڤ

**ئەم کورتە باسە لە حەوت بڕگەدا دەخەینەڕوو:**

### بڕگەی یەکەم: خوا ﷻ لەو ئایەتە موبارەکەدا، پێنج (٥) شتی باسکردوون:

١- ڕێز لێگرتنی بۆ وەچەی ئادەم.

٢- هەڵگرتنیان لە وشکانییدا.

٣- هەڵگرتنیان لە دەریادا.

٤- پێدانی بژیوە خۆش و بەتام و بە سوودەکان.

٥- بەرزکردنەوەو هەڵبژاردن و پەسەندکردنیان بەسەر زۆرێك لە دروستکراوەکانیدا.

کەواتە: لەم ئایەتەدا خوا عز وجل پێنج شتی باسکردوون، کە هەموویان ئەوە دەگەیەنن، خوا مرۆڤی بە دروستکراوێکی ناوازە هێناوەتە دی و کۆمەڵێ شتی پێداون، بە دروستکراوەکانی دیکەی نەداون و، سەر زەویشی بۆ ڕام و دەستەمۆ کردوە، بە دەریا و وشکانییەوە.

### بڕگەی دووەم:

کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ ﴾، وشەی (**قَد**) بۆ ساغکردنەوە (**تَحقیق**)ەیە و (**ل**)ەکە بۆ سوێند پێ خواردنە و، (**و**)ەکەش بۆ بادانەوەو گێڕانەوەی ئەو مەبەستەیە بۆ سەر مەبەستە پێشووەکان واتە: وەك چۆن ئەو کارانەی پێشترمان بۆ مرۆڤان کردوون، بە دڵنیایی ڕێزیشمان لە وەچەی ئادەم گرتوە، ﴿بَنِيٓ ءَادَمَ ﴾، وەچەی ئادەم، واتە: پیاوان و ئافرەتانێك کە لە ئادەم و حەووا پەیدا بوون، واتە: کوڕان و کچانێك، نێر و مێیانێك، هەموویان دەگرێتەوە، یانی: ڕێز لێ گرتنی خوا بۆ مرۆڤان، گشتییە بۆ هەموو بەشەر، بە تێکڕای: ڕەنگ و زمان و ڕەچەڵەك و ئایین و هتدەوە.

وەك لـە صەحیحـی موسـلیم دا هاتـوە، كـە ڕۆژێـك جەنازەیـەك بـە لای پێغەمبـەردا ﷺ دەگـوزەرێ، ئەویـش لەبـەری هەڵدەسـتێ، ئەوانیـش دەڵێـن: ئـەوە تەرمـی جوولەكەیەكـە؟ ئەویـش دەفەرمـوێ: {أَلَيْسَـتْ نَفْسًـا}[1] واتـە: ئایـا مـرۆڤ نیـە؟!

یـانی: مـادام مرۆڤـە، خـوا بـە زیندوویـی ڕێزی لێنـاون و، بـە مردووییش هـەر ڕێـزی لێناون، بۆیـە مـن لەبـەری هەڵدەستم، واتـە: وەك مـرۆڤ، ڕێـز لـە مـرۆڤ دەگیـرێ، چاوپۆشیی لەوە بكـە داخـۆ چ دیـن و، چ فیكـرەو، چ بۆچـوون و، چ ڕێبـازو، چ ڕەنـگ و، چ زمانێـكی هەیـە! وەك مـرۆڤ، هەمـوو مرۆڤـەكان ڕێزلـێ گیـراون، ئەمـە ڕاسـتییەكە، چەسـپێندراوە لە كتێبـی خوادا.

كەواتـە: هیـچ كەسـێك بـۆی نیـە بـە نـاوی ئیسـلامەوە، بـە نـاوی دینـەوە، بـێ ڕێزیـی بەرانبـەر مرۆڤێـك، یـان كۆمەڵـە مرۆڤێـك بـكات، لەبەرئـەوەی: ڕەنگیـان، ڕەگەزیـان، زمانیـان، نەتەوەیـان، حاڵـەتی كۆمەڵایەتییـان، بـە كـەم تەماشـا دەكات، یاخـود لەبەرئـەوەی: ئایینیـان، مەزهەبیـان، ڕێبازیـان، بیرۆكەیـان، بـە پێـی ئـەوە نیـە كـە ئـەو بـە چـاكی دەزانـێ، بـۆ وێنـە: مسـوڵمانان بێگومـان غەیـری ئیسـلام بـە هەڵـە دەزانـن، بـەڵام كەسـانێك كـە شـوێن كەوتـووی غەیـری ئیسـلامن، نابـێ شـوێنكەوتنی ئـەو كەسـانە بـۆ غەیـری ئیسـلام، بكەنـە بیانـوو و پاسـاوی ئـەوە كـە ڕێزیـان لـێ نەگـرن، چونكـە مرۆڤـەكان وەك مـرۆڤ ڕێـز لـێ گیـراون: پیـاو بـن، یـان ئافـرەت بـن، نێـر بـن، یـان مـێ بـن، واتـە: هـەر ڕەنـگ و ڕەگـەز و زمانێكیـان هەبـێ.

## بڕگەی سێیەم:

خـوا هـەم بـاسی ڕێـز لێگرتنـی مرۆڤـانی كـردوە، هـەم بـاسی هەڵبژاردنیـانی كـردوە، كـە بێگومـان ڕێـز لـێ گرتنەكـە گشـتییە، بـەڵام هەڵبژاردنەكـە تایبەتییـە، جیاوازییەكەشـیان، جیاوازیـی نێـوان (**تكریـم**)و (**تفضیـل**)، ئەوەیـە كـە ڕێـز لـێ گرتنەكـە گشـتییە، بـەڵام هەڵبژاردنەكـە تایبەتییـە، ڕێـز لێگرتنەكـە تەماشـای ئـەوە دەكـرێ، كـە ئـەو مرۆڤانـە لـە خـودی خۆیانـدا ڕێـز لێگیـراون، بـەڵام هەڵبژاردنەكە تەماشای ئـەوە دەكـرێ كـە بـە بـەراورد لەگـەڵ بەرانبەرەكانیانـدا و، بەسـەر بەرانبەرەكانیانـدا هەڵبژێـردراون.

---

(١) {عَنْ عَبْدِ الرَّحْمنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى، قَالَ: كَانَ سَهْلُ بْنُ حُنَيْفٍ وَقَيْسُ بْنُ سَعْدٍ قَاعِدَيْنِ بِالْقَادِسِيَّةِ، فَمَرُّوا عَلَيْهِمَا بِجَنَازَةٍ فَقَامَا، فَقِيلَ لَهُمَا إِنَّهَا مِنْ أَهْلِ الأَرْضِ، أَيْ مِنْ أَهْلِ الذمَّةِ؛ فَقَالاَ: إِنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَم، مَرَّتْ بِهِ جَنَازَةٌ فَقَامَ، فَقِيلَ لَهُ إِنَّهَا جَنَازَةُ يَهُودِيٍّ، فَقَالَ: أَلَيْسَتْ نَفْسًا} أخرجه مسلم: ٢٢٦٩.

## بڕگەی چوارەم:

کە وشەی (كَثِيرٍ) لێرەدا هاتوە، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا ﴾، زانایان مشت و مڕێکیان لەو بارەوە بووە:

١- هەندێکیان گوتوویانە: (كَثِيرٍ) واتە: (كُلّ)، (يعني: فَضَّلْنَاهُم عَلَى كُلِّ مِمَّنْ خَلَقْنَاهُ تَفْضِلاً) بەسەر هەموو ئەوانەدا، کە دروستمان کردوون، هەڵمانبژاردوون.

دەڵێم: ئەو مانایە ڕێك دەرناچێ، چونکە خوا (مِن)ی، هەندێك (تَبعيض)ی، خستۆتە سەر، دەفەرموێ: ﴿ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا ﴾، بەسەر زۆرێك لەوانی دیکەدا کە دروستمان کردوون، هەڵمانبژاردوون، پەسندمان کردوون، بە چاکترمان داناون.

٢ - دەگونجێ مەبەست ئەوە بێ، کە مرۆڤ لە خۆی وریا بێ، لە خۆی بایی نەبێ، خوای کارزان دەیەوێ فێرمان بکات: بوغڕا نەبین و لافی ئەوە لێنەدەین کە باشترین دروستکراوی خواین!

٣ - دەگونجێ خوا دروستکراوانێکی دیکەی هەبن، لە مرۆڤ چاکتر بن، یان بەڕەهایی و لە هەموو ڕوویەکەوە، یان بە هەندێك ئیعتیبار و، لە هەندێك ڕووە وە، بۆ وێنە: فریشتەکان لەو ڕووەوە کە بێ فەرمانیی خوا ناکەن، لە مرۆڤ چاکترن، بە دڵنیایی بەڕەهایی لە بێبڕواو خراپەکارەکان هەر چاکترن، چونکە: خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ... ﴿٥٥﴾ ﴾ الأنفال، واتە: بە دڵنیایی خراپترین پێڕۆ، خراپترین ژیاندار لە لای خوا، ئەوانەن کە بێبڕوان.

کەواتە: مرۆڤی بێبڕواو خراپەکار، لە ئاژەڵ و لە دڕندەو زیندەوەر و تێکڕای دروستکراوەکانی دیکەی خوا، خراپترە.

## بڕگەی پێنجەم:

کە دەفەرموێ: ﴿ تَفْضِيلًا ﴾، کە دیارە بە نەناسراو (نَكرة) هاتوە، دەڵێ: (التَنْكِيرُ فِي «تَفضيلاً» وَهُوَ مَفعولٌ مُطْلَقٌ أي: تَفْضِيلاً كَبيْراً)، واتە: بە هەڵبژاردنێکی گەورە مرۆڤەکانمان بەسەر زۆرێك لە دروستکراوەکانماندا کە دروستمان کردوون، هەڵبژاردوون.

## بڕگەی شەشەم:

بەرزیی و نزمیی لە نێوان جۆری مرۆڤ و، جۆرەکانی دیکە لە دروستکراوەکان دا، بۆ ئێمە پەنهانە، بۆ وێنە: فریشتە، جینن، یاخود دروستکراوەکانی دیکە، ئەوە تەنیا بە

بەڵگەی تەوقیفیی دەزانرێ، واتە: بەڵگەیەك، دەق بێ لە شەریعەتەوە هاتبێ و نوختەی خستبێتە سەر پیت، لەوەوە بۆمان دەزانرێ، ئەگەرنا لە خۆمانەوە بۆمان نیە بڵێین: مرۆڤ لە فلان دروستکراوەی دیکەی خوا باشترە، بەرەهاییی، بەڵام دەگونجێ بڵێین: لەو ڕووەوەو، بەو ئیعتیبارە کە خوا مرۆڤی کردوە بە جێنشینی خۆی لەسەر زەوی، لە مرۆڤ دروستکراوەکانی سەرزەوی، لە هەموویان لەلای خوا بەڕێزترە بەرەهاییی و خوا هەڵیبژاردوە بەسەر دروستکراوەکاندا، چونکە هەموویان لە ژێر تەصەڕووفی مرۆڤدان: بەڕووەکەوە، بە ماددەی بێ ژیانەوە، بە ژیاندارانەوە، بە هەواو ئاو و وشکانییەوە، هەموویان لە خزمەتی مرۆڤدان، بەڵام بۆ ئەوە: کە ئایا مرۆڤ لە فریشتان گەورەتر و چاکترن، یان مرۆڤ بە گشتی لە جند چاکتر و گەورەترن؟ پێویستیی بە بەڵگەی تەوقیفیی دەکات، هەڵبەتە بە نسبەت جیننەوە، لەبەر ئەوەی پێغەمبەران تەنیا لە مرۆڤان بوون، دەتوانین بڵێین: ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە مرۆڤ لە جینن گەورەتر و چاکترن، بەڵام بە گشتی، ئەگەرنا بێگومان جندیکی مسوڵمان لە مرۆڤێکی کافر چاکتر و گەورەترە، ئەوە هیچ گومانێك لەوەدا نیە، بەڵکو دار و بەرد و ماددەی بێ ژیان و ڕووەك و ئاژەڵ و دڕندەکانیش، لە مرۆڤی کافر چاکترن، بە دەقی ئایەت، بەڵام بە نسبەت مرۆڤە بڕوادارەکان و فریشتانەوە، کە زۆرێك لە زانایان لەو بارەوە قسەیان کردوە، پێم وایە باشتر وایە نەچینە نێو ئەو وردەکارییانەوە، مەگەر بگوترێ: بەو ئیعتیبارانە و لەو ڕووانەوە: فلان دروستکراو لە فلان باشترە، منیش لەو کتێبەدا کە لە سجنی ئەمریکاییەکاندا نووسیومە، لە باسی: ئیمان بە فریشتەدا، تۆزێك باسی ئەو بابەتەم کردوە[1].

## بڕگەی حەوتەم و کۆتایی:

ئایا لە نێوان ئەم ئایەتەدا کە دەفەرموێ: مرۆڤمان هەڵبژاردوون بەسەر زۆرێك لە دروستکراوانماندا و، ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ فِىٓ أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ﴿٤﴾ ثُمَّ رَدَدْنَٰهُ أَسْفَلَ سَٰفِلِينَ ﴿٥﴾﴾ التین، ناکۆکیی نیە؟!

دەڵێین: نەخێر هیچ جۆرە ناکۆکییەك نیە، چونکە ئەوەی دوو ئایەتەکەی سوورەتی (التین) دەیفەرموون: بە دڵنیایی مرۆڤمان لە باشترین پێکهاتەدا دروستکردوە، دوایی گێڕاومانەتەوە بۆ ژێری هەرە ژێرەوە (نزمترین پلە)، مەبەست پێی ئەوەیە کە: مرۆڤ لە

---

(١) موسوعة: الإسلام كما يتجلى في كتاب الله تعالى، الكتاب الرابع: الإيمان بملائكة الله وبالجنّ، الطبعة الثانية/٢٠١٧م.

ئەصڵدا لە باشترین پێکهاتەدا دروست بووە، بەڵام دوایی بە هۆی بێبڕوایی و لادانیەوە گێڕراوەتەوە بۆ پلەی هەرە خوارێ، بەڵام لە ئایەتی ژمارە (٧٠)ی (**الإسراء**)دا تەنیا باسی حاڵەتی یەکەم دەکات، کە بریتیە لەوەی مرۆڤ لە ئەصڵدا ڕێز لێگیراوە و بەسەر زۆر لە دروستکراوەکاندا پەسند کراوەو بەرز کراوەتەوە.

بەڵام باسی ئەوەی نەکردوە: کاتێك کە بێبڕوا دەبێ و، لە ڕاستە شەقامی خوا لا دەدا، چی بەسەر دێ؟! وەك لە سوورەتی (**التین**)دا باسکراوە و لە سوورەتەکانی دیکەش دا، باسکراوە، وەك سوورەتی (**الأنفال**) کە خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٥٥﴾﴾، واتە: بێگومان خراپترین ژیاندار لە لای خوا ئەوانەن کە بێبڕوان، لەبەر ئەوەی بڕوا ناهێنن.

**مەسەلەی سێیەم و کۆتایی:**

**یـاد بکەنـەوە! ڕۆژێـك کـە هـەر کۆمەڵـە خەڵکـە بـە پێشـەوایەکەیان بانـگ دەکەیـن، ئنجـا هـەر کـەس نووسراوەکـەی بـە دەسـتی ڕاسـتی بدرێتـەوە، ئـەوە نامەکەیان خۆشـحاڵانە دەخوێننـەوەو، هیـچ سـتەمیان لـێ ناکـرێ و، هەرکەسـێکیش لـەم ژیانـەدا کوێـردڵ بووبـێ، لـە ڕۆژی دواییـدا کوێرتـر دەبـێ و، گومڕاتـر دەبـێ:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ يَوْمَ نَدْعُوا۟ كُلَّ أُنَاسٍۭ بِإِمَٰمِهِمْ ۖ فَمَنْ أُوتِىَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ فَأُو۟لَٰٓئِكَ يَقْرَءُونَ كِتَٰبَهُمْ وَلَا يُظْلَمُونَ فَتِيلًا ﴿٧١﴾ وَمَن كَانَ فِى هَٰذِهِۦٓ أَعْمَىٰ فَهُوَ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ أَعْمَىٰ وَأَضَلُّ سَبِيلًا ﴿٧٢﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿ يَوْمَ نَدْعُوا۟ كُلَّ أُنَاسٍۭ بِإِمَٰمِهِمْ ﴾، ئەو ڕۆژە کە هەر کۆمەڵە خەڵکە، بە پێشەوایەکەیان بانگ دەکەین.

وشـەی ( يَوْمَ ) کـە (**مَنصـوب**)ە، وەك زانایـان و شـارەزایانی زمـانی عـەرەبی دەڵێـن: (**فعـل**) ێـك لـە پێشـیەوە هەیـە، کـە بـە سـەلیقە دەزانـرێ، وەك (**أُذْكُـر**) یـاد بکـەوە! کەواتـە: (**یـومَ**) دەبێتـە (**مَفْعُـول بـهِ**) ئـەو (**فعـل**) و (**فاعـل**)ە تەقدیـر کـراوە، کـە (**آذکـر**)ە.

دەشـگونجێ ( يَوْمَ ) بـە وانـەی پێـش خـۆی (**مَنصـوب**) بووبـێ، واتـە: ئـەو ئایەتانـەی لـە پێشـیدا هاتـوون، بـەڵام ئـەوەی یەکەمیـان زیاتـر پێدەچـێ.

هەڵبەتـە لێـرەدا خـوا ﷻ دەیـەوێ لێـمان حاڵـی بـکات: کـە مـرۆڤ لـە دنیـادا، بـە دوای چـی بکـەوێ و، چ ڕێبازێـك بگـرێ و، ڕیـشی خـۆی لـە مسـت کـێ بنـێ و شـوێنی بکـەوێ، لـە ڕۆژی دواییشـدا بـە نـاوی ئـەوەوە بانـگ دەکـرێ.

٢)- ﴿ فَمَنْ أُوتِىَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ ﴾، ئنجا هەر کەسێك نووسراوەکەی خۆی بە دەستی ڕاستی وێ بدرێتەوە.

(**ف**) کـە چۆتـە سـەر (فَمَنْ)، شـارەزایانی زمـانی عـەرەبی، پێـی دەڵێـن: (**فَـاءُ التفْريع**) یـان (**فاء التوضیـح**)، واتـە: ئـەوەی پێشـێ کـە گوتـراوە، پێویسـتیی بـە ڕوونکردنـەوە دەکات، چونکـە:

﴿ يَوْمَ نَدْعُوا كُلَّ أُنَاسٍ بِإِمَامِهِمْ ﴾)، ئەمە شتێکی کورتە و بە کورتیی هاتوە و پێویستیی بە درێژە پێدان و ڕوونکردنەوە دەکات، ڕوونکردنەوەکەش ئەوەیە کە: هەر کەسێك بە دەستی ڕاستی نووسراوەکەی بدرێتەوە، لیستی کردەوەکانی بدرێتەوە، بڕوانامەکەی بدرێتەوە:

٣)- ﴿ فَأُولَٰئِكَ يَقْرَءُونَ كِتَابَهُمْ ﴾، ئا ئەوانە نووسراوەکەی خۆیان دەخوێننەوە، واتە: بە خۆشحاڵیی و شادمانییەوە، دەیخوێننەوە، بە پێچەوانەی کەسێکەوە کە لە پشتەوە ڕا، یاخود بە لای چەپیدا، نامەی کردەوەکانی بدرێتەوە، کە خۆزگە دەخوازێ، ئەو نامەیەی هەر نەبینیبایە و، ئەو نامەیەی هەر وێ نەدرابایەوە، وەك خوا لە سوورەتی (**الحاقة**)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِشِمَالِهِ فَيَقُولُ يَا لَيْتَنِي لَمْ أُوتَ كِتَابِيَهْ ﴿٢٥﴾ وَلَمْ أَدْرِ مَا حِسَابِيَهْ ﴿٢٦﴾ يَا لَيْتَهَا كَانَتِ الْقَاضِيَةَ ﴿٢٧﴾ ﴾، واتە: ئەوەی کە بە دەستی چەپی نامەی کردەوەکانی بدرێتەوە، دەڵێ: خۆزگە ئەو نووسراوەم هەر وێ نەدرابایەوە، خۆزگە هەر نەمزانیبایە لێپرسینەوەم چۆنە! خۆزگە ئەو مردنەی کە دەمردم، یەکجاریی بووایە ( و، زیندوو نەکرابامەوە). کە بێگومان ئەو خۆزگانە هیچیان بەر ناگرن، وەك گوتراوە: (داری خۆزگە بەر ناگرێ).

٤)- ﴿ وَلَا يُظْلَمُونَ فَتِيلًا ﴾، ئەوانەی کە بە دەستی ڕاستیان، نامەی کردەوەکانیان دەدرێتەوە و خۆشحاڵانە نامەی کردەوەکانیان و، بڕوانامەکانیان دەخوێننەوە و، پێی سەر بەرزن: هیچ ستەمیان لێ ناکرێ، (**فَتيل: شِبْهُ الخَيْطِ فِي شَقِّ النَّوَاةِ**)، (**فَتِيل**) وەك دەزوویێك وایە، کە لە نێو کەلێنی نێوکە خورما دایە، نێوکە خورما کە شتێکی ڕەقە، درزێکی تێدایە، ئنجا لە نێو ئەو درزەدا، شتێکی وەك دەزوو هەیە، ئەوە پێی دەگوترێ: (**فَتيل**) کە وێنەی پێ دەهێنرێتەوە بە شتی بچووك و کەم بایەخ و بێ ئەمیەت.

کەواتە: ﴿ وَلَا يُظْلَمُونَ فَتِيلًا ﴾، لێرەدا (**ظُلْم**) بە مانای (**نَقْص**) دێ، واتە: بە ئەندازەی دەزووی سەر نێوکە خورماش، لە پاداشتی کردەوەکانیان، کەم ناکرێتەوە.

٥)- ﴿ وَمَن كَانَ فِي هَٰذِهِ أَعْمَىٰ ﴾، بەڵام هەر کەسێکت لەمەدا {لەم ژیانە دنیاییەدا} کوێر بووبێ، کاتی خۆی کوێر بووبێ، کە بە تەئکید مەبەست پێی کوێریی دڵە، وەك لە سوورەتی (**الحج**)دا دەفەرموێ: ﴿ فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى الْأَبْصَارُ وَلَٰكِن تَعْمَى الْقُلُوبُ الَّتِي فِي الصُّدُورِ ﴿٤٦﴾ ﴾.

واتە: ئەوان چاوەکان (ی سەر)یان کوێر نین، بەڵکو ئەو چاوانەیان کوێرن کە لە سینەیاندان، واتە: چاوی دڵیان کوێرە، چاوی عەقڵیان کوێرە، کوێر دڵن.

کە دەفەرمووێ: ﴿ وَمَن كَانَ فِي هَٰذِهِۦٓ ﴾، هەر دیارە: (فِي هَٰذِهِۦٓ) یانی: (فِي هَـٰذِهِ الحَيَاةِ الدُّنيَا)، بەڵام خوا (الحَيَاة الدُّنيَا)ی (حـذف) کردوە، چونکە بە سەلیقە دەزانرێ و، وەك چەندان جار گوتوومانە: خوا ﷻ هەر وشەیەك کە عەقڵ بە ئاسانیی دەرکی پێ بکات، لە فەرمایشتی خۆیدا، نایهێنێ، بۆ ئەوەی هەرچی زیاتر، ئەو فەرمایشتە کورت و پوخت بێتەوە.

لێرە خوا ﷻ بۆ ئەوانەی کە چاکەکارن و ئیماندارن، دەفەرمووێ: ﴿ فَمَنْ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ ﴾، بەڵام بۆ ئەوانەی دوایی، بۆ بێبڕوایانی خراپەکار، دەفەرمووێ: ﴿ وَمَن كَانَ فِي هَٰذِهِۦٓ أَعْمَىٰ ﴾، هەر کەسێك لەم ژیانی دنیایەدا کوێر بووبێ، ئایا بۆچی: وەك لە شوێنەکانی دیکە بەراوردی پێکردوون: ﴿ فَمَنْ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ ﴾، ﴿ وَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِشِمَالِهِۦ ﴾؟!

وەڵامەکەی ئەوەیە کە: لەبەرئەوەی وێدرانەوەی نووسراو بە دەستە چەپ، لە ئایەتەکانی دیکەدا، باسکراوە، بەڵام لێرەدا خوا ﷻ بە سیفەتێکی دیکەش ئەوانە دەناسێنێ، تاکو حاڵێکی دیکەشیان بزانرێ، وێڕای ئەوەی بە دەستی چەپیان، یان لە پشتەوە ڕا، ﴿ وَرَآءَ ظَهْرِهِۦ ﴿١٠﴾ ﴾ الإنشقاق، نامەی کردەوەکانیان دەدرێتەوە، ئەوەش بزانرێ کە هەر کەسێك لەم ژیانە دنیاییەدا کوێردڵ بووبێ، لە ڕۆژی دواییش دا هەر کوێر دەبێ، بگرە کوێرتریش دەبێ.

٦)- ﴿ فَهُوَ فِي ٱلْءَاخِرَةِ أَعْمَىٰ ﴾، ئەو کەسە لە دوا ڕۆژدا هەر کوێرە، بەڵام لەوێ دەبێتە کوێری ڕواڵەتیی واتە: چاویان کوێر دەبێ، دیارە لە دنیادا: عەقڵ و دڵیان کوێر بووە، بەڵام لە دواڕۆژدا، چاوی سەریشیان کوێر دەبێ، وەك لە سوورەتی (طه)دا دەفەرمووێ: ﴿ وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ أَعْمَىٰ ﴿١٢٤﴾ قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرْتَنِىٓ أَعْمَىٰ وَقَدْ كُنتُ بَصِيرًا ﴿١٢٥﴾ قَالَ كَذَٰلِكَ أَتَتْكَ ءَايَٰتُنَا فَنَسِيتَهَا ۖ وَكَذَٰلِكَ ٱلْيَوْمَ تُنسَىٰ ﴿١٢٦﴾ ﴾.

واتە: هەر کەسێك پشت لە بەرنامە و لە یادی من بکات، (پشت لە کتێبێك بکات کە منی دەخاتەوە یاد، یان دیداری من و دوا ڕۆژی دەخاتەوە یاد)، ئەوە لە دنیادا ژیانێکی تەنگ و تاڵ و بێزارکەری دەبێ و لە ڕۆژی دواییشدا بە کوێریی کۆی دەکەینەوە. گوتی: پەروەردگارم! بۆچی بە کوێریی کۆت کردمەوە {هێناتم بۆ گۆڕەپانی سزا و پاداشت} لە حاڵێك دا من لە دنیادا بینەر بووم، چاو ساغ بووم؟! (خوا) فەرمووی: هەر بەو شێوەیە سزات دەدەین کە بووی، کاتێ خۆی ئایەتەکانی ئێمەت بۆ هاتن، تۆ پشت گوێت خستن و لە

بیرت کردن، {ئنجا بەو شێوەیە کە تۆ ئایەتەکانمانت پشت گوێ خستن} ئەمڕۆش ئێمە تۆ پشتگوێ دەخەین { و نیعمەتی بینین و چاوەکانت لێ وەردەگرینەوە}.

چونکە (**الجَزَاءُ مِنْ جِنْسِ العَمَل**) سزاو پاداشت بە پێی جۆری کردەوەیە، کەسێك لە دنیادا چاو و عەقڵ و دڵی، بەرانبەر بە ئایەتەکانی خوا کوێربن، کوێردڵ بێ و ئایەتەکان نەبینێ، لە دوارۆژیشدا خوای دادگەر چاوی ڕواڵەتیی لێ دەستێنێتەوە.

لێرەدا وشەی: ﴿ أَعْمَىٰ ﴾ مەبەست پێی: زێدە کردن (**تفضیل**) نیە، بەو واتایە کە بگوترێ: کوێرترە، بەڵکو: ﴿ فَهُوَ فِي ٱلْآخِرَةِ أَعْمَىٰ ﴾، یانی: لە دوارۆژیشدا کوێرە، کوێری ڕواڵەتییە، ﴿ وَأَضَلُّ سَبِيلًا ﴾، گومڕاتریشە لە ڕاستە ڕێ.

لێرەدا خوا نەیفەرمووە: (**أَشَدُّ ضَلاَلاً**) یاخود وێنەی ئەوە، بۆچی؟! بۆ ئەوەی: وشەی (**سَبیل**) بگونجێ لەگەڵیدا باسبکرێ، ئەگەرنا ئەگەر فەرمووبای: (**فَهُوَ فِي الآخِرَةَ أَعْمَى وَأَشَدُّ ضَلاَلاً**) لە دوارۆژدا کوێرە و گومڕاییەکەی سەختترو خەستتریشە، ئەگەر وای فەرمووبا، ئەو کاتە نەدەگونجا وشەی (**سبیل**)ی لەگەڵ بێ، بۆیە خوا لێرەدا ﷻ ئەو وشە کورتەی بەکارنەهێناوە، بەڵکو گواستوویەتەوە بۆ تەعبیرێك کە لە زمانی عەرەبییدا پێی دەگوترێ: (**إطْنَاب**) یاخود (**التَّرْكِيبُ المُطْنِب**) واتە: درێژ کردنەوەی قسە و زیادە لەسەر ڕۆیشتنی، چونکە لێرەدا کە خوای کاربەجێ ئاوا درێژەی داوەتێ، چەند مانایەکی زیادە دەگەیەنێ:

**یەك:** حاڵەکەیانی وێنا کردوە: ﴿ فَهُوَ فِي ٱلْآخِرَةِ أَعْمَىٰ وَأَضَلُّ سَبِيلًا ﴾.

**دوو:** زیاتر ڕوونی کردۆتەوە.

**سێ:** زیاتر خراپیی حاڵەکەیانی پێشان داوە.

**چوار:** هەروەها ڕوونیکردۆتەوە: کە کوێرییان لە دنیا و لە دوارۆژدا، هۆکارەکەی بریتیە لە گومڕاییان لە ڕاستەڕێی خوا ﷻ.

ئەم: ﴿ وَأَضَلُّ سَبِيلًا ﴾ە، هەموو ئەو واتایانە دەگرێتە خۆی، بۆیە خوا ﷻ بە پێچەوانەی عادەتی قورئانەوە، لە شێوازی کورتەوە، گواستوویەتەوە بۆ شێوازی درێژ، کە لە زمانی عەرەبیدا پێی دەگوترێ: (**إطناب**)، کە (**إیجاز**) بەرانبەرەکەیەتی.

ئنجا كـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَأَضَلُّ سَبِيلًا ﴾، ئەمـە بـە مانـای: زێدەیـی (**مُفَاضَلَة**)یـە، بـەڵام (**مُفاضلَة**) كـە، دەگەڕێتـەوە بـۆ زێدەیـی یەكێـك لـە حاڵەتـەكانی، كـە حاڵـەتی ڕۆژی دواییـەتی، لـە گومڕاییـدا، بەسـەر حاڵـەتی دنیـای دا، نـەك بـەراوردی پـێ كرابـێ لەگـەڵ غەیـری خـۆی دا، واتـە: لـە غەیـری خـۆی گومڕاتـرە، بەڵكـو یـانی: گومڕابـوونی دوا ڕۆژی زیاتـرە، لـە گومـڕا بـوونی دنیـای، چونكـە گومـڕا بـوونی دنیـای، دیـارە لـە ڕاسـتە شـەقامی خـوا گومـڕا بـووە، بـەڵام لـە ڕۆژی دوایـی دا، گومـڕا دەبـێ و، بـە ڕێ نازانـێ: چـۆن بچـێ بـۆ جێـگا و ڕێـگای خـۆی، كـە دیـارە ڕۆژی دوایـی عالەمێـكی زۆر فراوانـترە، ئنجـا ئـەو كەسـەی لـە دنیـادا گومـڕا بـووە، لـە ڕۆژی دوایـی دا گومڕاتریشـە.

كـە دەفەرمـوێ: ﴿ يَوْمَ نَدْعُواْ كُلَّ أُنَاسٍ بِإِمَٰمِهِمْ ﴾، ئـەو ڕۆژە یـاد بكـەوە! هـەر كۆمەڵـە خەڵكـە بانگدەكەیـن، بـە پێشـەوایەكەیان، بـۆ وێنـە دەگوتـرێ: ئـەی ئۆممـەتی موحەممـەد! ﷺ، كـە پێشـەوای ئـەو ئۆممەتـە، موحەممـەدە، پێغەمبـەری كۆتایـی ﷺ، هەروەهـا ئەوانـەی كـە شـوێن (**بـووذا**) كەوتـوون دەگوتـرێ: ئـەی كۆمەڵـی **بـووذا**! یـان ئەوانـەی شـوێن زەرادەشـت كەوتـوون: ئـەی كۆمەڵـی (**زەرادەشت**)! هەروەهـا ئەوانـەی كـە شـوێن بـت و، صەنەمـەكان كەوتـوون، یـان ئـەوەی شـوێن هـەر **طاغـووت** و دیكتاتۆرێـك كەوتبـێ، هەركەسـە بـە دوای كـێ و بـە دوای چـی كەوتبـێ، بـە نـاوی ئـەو ڕێبـازەوە و بـە نـاوی ئـەو پێشـەوایەوە، بانگـی دەكـرێ.

چونكـە وشـەی (إِمَـام) یـانی: (**كُلُّ مَـا يُؤْتَـمُّ بـهِ**) هەركەسـێك كـە بكرێتـە سـەر مەشـق و پەیڕەویـی لـێ بكـرێ، جـا چ بەرنامـە و ڕێبازێـك بـێ، چ كەسـێك بـێ، چ حیزبێـك بـێ، چ ڕژێمێـك بـێ، گرنـگ ئەوەیـە هەركەسـە بـە دوای چـی كەوتبـێ، بـە نـاوی ئـەوەوە بانـگ دەكـرێ.

لـە كۆتایـی ئـەم دەرسـەدا، دەمـەوێ ئامـاژە بـەوە بكـەم: خـوای پـەروەردگار سـێ وشـەی لـە قوڕئانـدا بەكارهێنـاون، بـۆ وێنـە هێنانـەوە بـۆ شـتی بچـووك و كـەم: (**الفَتيـل، القِطمـير، النَّقـير**) كـە هەرسـێكیان پەیوەندییـان بـە خورمـاوە هەیـە:

**یەك**: (الفَتيلُ: غِلاَلَةٌ رَقِيْقَةٌ تُشبِهُ الخَيْطَ فِي بَطْنِ النَّوَاة)، (**فتيل**) بریتیە لە دەزوویكی باریك، كە وەك دەزوو دەچێ، لە نێو نێوكە خورمادایە.

**دوو**: (القِطْمِير: اللِّفَافَةُ الرَقِيْقَةُ الشَّفَّافَةُ بَيْنَ الثَّمَرَةِ وَالنَّوَاةِ)، (**قطمير**) پەردەیەكی تەنكی ڕوونە، لە نێوان نێوكە خورماو، گۆشتەكەیدا كە دەخورێ، واتە: ئەو مادده شیرینییەی كە دەخورێ.

**سێ:** (**النَّقِير: تَجْوِيفٌ صَغِيرٌ فِي ظَهْرِ النَّوَاةِ، مِثْلُ النُقْطَة**)، (**نَقير**) بریتیە لە درزێكی بچووك لە پشتی نێوكە خورما، كە وەك خاڵێك وایە، واتە: ئەو كەلێن و درزەی كە لە پشتی نێوكە خورمایە.

خوا ﷻ ئەوشتانەی خورمای بە نموونەی شتی كەم و بچووك هێناونەوە، چونكە: خورما، وەك میوەیەكی جیهانیی، لە هەموو شوێنان چنگ دەكەوێ و، ئەو شوێنەی كە دار خورماشی لێ نەبێ، خورمای بۆ دەچێ، ئێستاش و ئەو كاتیش كە قورئان هاتۆتە خوارێ، ئیدی هەموو كەس زانیویەتی كە ئەو شتانەی خوای پەروەردگار وێنەیان بێ دەهێنێتەوە بۆ بچووكیی: (**فَتیل و قُطمیر و نَقیر**)، چین و چۆنن؟!

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان هەشـت (٨) ئایـەت دەگرێتـە خـۆی، ئایەتـەکانی: (٧٣ - ٨١) و، لـە چـوار تـەوەری سـەرەکیی دا:

تـەوەری یەکـەم: هەواڵـدانی خـوای پەنهانـزان، بـە تێکۆشـانی کافـرەکان و هەوڵدانیـان، بـۆ لادانی پێغەمبـەری خـوا موحەممـەد ﷺ لـە پەیامـی خـوا و، لـە ڕێبـازی خـوا و، چەسـپاندن و دامەزرانـدنی خـوا بـۆی و، ترسـاندنی خـوا بـۆ پێغەمبـەر ﷺ کـە ئەگـەر لابـدات، سـزای دووقـاتی دەدات، لـە کاتی ژیـان و مردنـدا.

تـەوەری دووەم: هەواڵـدانی خـوا ﷻ بـە هەوڵـی کافـرەکان، بـۆ وەدەرنـانی پێغەمبـەر ﷺ لە وڵات، (کـە مەبەسـت پێـی شـاری مەککەیـە)، کـە ئەگـەر وایـان کردبایـە، لـە بەیـن دەبـران و ماوەیـەکی کـەم نەبـێ، لـە دوای پێغەمبـەر ﷺ نەدەمـان، ئـەوەش بـە پێـی یاسـای خـوا، کـە بـە ڕای ژمارەیـەك لـە زانایـان ئـەوەش هـەر هاتـە دی، کـە سـەرانی کافـرانی قوڕەیـش لـە جەنگـی بـەدردا، کـوژران، چونکـە ئـەوە: دوو سـاڵی پێچـوون دوای ئـەوەی پێغەمبـەر ﷺ ناچـار کـرا شـاری مەککـە بەجـێ بهێڵـێ.

تـەوەری سـێیەم: ئامۆژگاریـی و ڕێنمایـی خـوا بـۆ پێغەمبەرەکـەی ﷺ، کـە پێنـج نوێـژە فـەرزەکان ئەنجـام بـدات، بەرپـا بـکات و، شـەو نوێژیـش بـکات، وەك خـوا پەرسـتییەکی زیـادە بـۆ وی، بەڵکـو بەهـۆی ئـەوەوە شایسـتەی پێگـەی ستایشـکراو (**المقـامُ المحمـود**) بـێ.

تـەوەری چـوارەم: ڕێنمایـی کـردنی خـوا ﷻ بـۆ پێغەمبـەر ﷺ: لـە خـوا بپاڕێتـەوە، کـە چوونـە ژوور و هاتنـە دەری، پـڕ خێـر بـێ، هەردووکیـانی پـڕ خێـر و بەرەکـەت بـن و، خـوا یارمەتیـی بـۆ بڕەخسـێنێ و ڕاییگەیەنـێ: کـە هـەق هـات و ناهـەق پووچـەڵ بـووەوە، چونکـە ناهـەق (**باطـل**) پـووچ و قرپۆکـە.

﴿ وَإِن كَادُواْ لَيَفۡتِنُونَكَ عَنِ ٱلَّذِيٓ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ لِتَفۡتَرِيَ عَلَيۡنَا غَيۡرَهُۥۖ وَإِذٗا لَّٱتَّخَذُوكَ خَلِيلٗا ٧٣ وَلَوۡلَآ أَن ثَبَّتۡنَٰكَ لَقَدۡ كِدتَّ تَرۡكَنُ إِلَيۡهِمۡ شَيۡـٔٗا قَلِيلًا ٧٤ إِذٗا لَّأَذَقۡنَٰكَ

ضِعْفَ ٱلْحَيَوٰةِ وَضِعْفَ ٱلْمَمَاتِ ثُمَّ لَا تَجِدُ لَكَ عَلَيْنَا نَصِيرًا ﴿٧٥﴾ وَإِن كَادُوا۟ لَيَسْتَفِزُّونَكَ مِنَ ٱلْأَرْضِ لِيُخْرِجُوكَ مِنْهَا ۖ وَإِذًا لَّا يَلْبَثُونَ خِلَٰفَكَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٧٦﴾ سُنَّةَ مَن قَدْ أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ مِن رُّسُلِنَا ۖ وَلَا تَجِدُ لِسُنَّتِنَا تَحْوِيلًا ﴿٧٧﴾ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِدُلُوكِ ٱلشَّمْسِ إِلَىٰ غَسَقِ ٱلَّيْلِ وَقُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ ۖ إِنَّ قُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ كَانَ مَشْهُودًا ﴿٧٨﴾ وَمِنَ ٱلَّيْلِ فَتَهَجَّدْ بِهِۦ نَافِلَةً لَّكَ عَسَىٰٓ أَن يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَّحْمُودًا ﴿٧٩﴾ وَقُل رَّبِّ أَدْخِلْنِى مُدْخَلَ صِدْقٍ وَأَخْرِجْنِى مُخْرَجَ صِدْقٍ وَٱجْعَل لِّى مِن لَّدُنكَ سُلْطَٰنًا نَّصِيرًا ﴿٨٠﴾ وَقُلْ جَآءَ ٱلْحَقُّ وَزَهَقَ ٱلْبَٰطِلُ ۚ إِنَّ ٱلْبَٰطِلَ كَانَ زَهُوقًا ﴿٨١﴾

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

((هەروەها نیزیك بوو ئەو (بێبڕوای)انە، لەوەی بۆمان سروش كردووی، سەرت لێ بشێوێنن و لات بدەن، تاكو جگە لەوە بە ناوی ئێمە هەڵبەستی و بڵێی، ئنجا ئەگەر واتكردبایە، بە دۆستیان دەگرتی ﴿٧٣﴾ ئەگەر لەبەر ئەوەش نەبووایە كە چەسپاندمانی و، دامەزراومان كردی، نیزیك بوو شتێكی كەم بە لایاندا بچی ﴿٧٤﴾ ئەو كاتەش سزای دوو قاتی ژیان و، سزای دووقاتی مردنمان پێ دەچێژتی، ئنجا هیچ پشتیوانیشت لە دژی ئێمە چنگ نەدەكەوتن ﴿٧٥﴾ هەروەها نیزیك بوو لەسەر زەمین (ی مەككە) بێزار و سەغڵەتت بكەن، تاكو وەدەرت بنێن لێی، ئەو كاتەش كەمێك نەبێ، لە دوای تۆ نەدەمانەوە (ولە نێومان دەبردن) ﴿٧٦﴾ (ئەوەش) یاسای خوایە لە ژیانی ئەو (پێغەمبەر)انەدا كە پێش تۆ ناردوومانن و، هەرگیز لادانیش بۆ یاسای ئێمە نابینی ﴿٧٧﴾ لە كاتی لادانی خۆر لە نێوەڕاستی ئاسمانەوە، تاكو تاریكایی شەو، نوێژ بەرپا بكە و، قورئان خوێندنی (نوێژی) بەیانیش [گرنگیی پێ بدە]، بە دڵنیایی قورئان خوێندنی بەیانی بینراوو لەلا ئامادە بووە (فریشتەكان ئامادەی دەبن) ﴿٧٨﴾ لە شەوگاریشدا شەونوێژی پێ بكە (بە قورئان) (ئەوەش خوا پەرستییەكی) زیادەیە بۆ تۆ، نیزیكە پەروەردگارت دوای زیندوو كردنەوەت، پێگەی ستایشكراوت پێ بدات ﴿٧٩﴾ هەروەها بڵێ: پەروەردگارم! بە چوونە نێوێكی باش، بمخە نێو (هەر كار و چالاكییەكەوە)و، بە هاتنە دەرەوەیەكی باشیش، بمهێنە دەرێ و، لەلایەن خۆتەوە دەستەڵاتێكی وەسەرخەرم بۆ بڕەخسێنە ﴿٨٠﴾ بڵێ: هەق هات و بەتاڵ فەوتا، بێگومان ناهەق پووچەڵ و فەوتاوە ﴿٨١﴾)).

# شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(لِيَفْتِنُونَكَ ): واتە: بۆ ئەوەی لاتبدەن، (فَتَنَ المَالُ النَّاسَ: إِسْتَمَالَهُم، الفَاتِنُ: المُضِلُّ عَنِ الحَقِّ، لِيَفتِنُوكَ: لِيَصرِفُوكَ)، دەگوترێ: (فَتَنَ المَالُ النَّاسَ) واتە: ماڵ و سامان خەڵکی لادا، (الفَاتِنُ: المُضِلُّ عَنِ الحَقِّ) (فاتِن) واتە: گومڕاکەر، لادەر لە هەق، کەواتە: (لِيَفتِنوكَ: لِيَصرِفوكَ) بۆ ئەوەی لات بدەن، بەڵام بۆچی خوا نەیفەرمووە: (لِيَصرِفوكَ) فەرموویەتی: (لِيَفتِنوكَ)؟ تاکو ئەوە بگەیەنێ: وەك حاڵەتێکی تاقیکردنەوە، کە خوا بۆتی دەڕەخسێنێ، ئەوانە کاردەکەن بە هەوڵ و کۆششی خۆیان لات بدەن، وشەی (فَتَنَ) وێڕای ئەوە کە مانای تاقیکردنەوە دەگەیەنێ، مانای سزاش دەگەیەنێ، واتە: کە سەرەنجامیش تووشی سزا ببی، واتە: (ليفتنوك) ئەو مانایەی: (لِيَصرِفوكَ) دەیگەیەنێ، واتە: لات بدەن، دەیگەنێ و وێڕای لادان، ئەو مانایانەی دیکەش دەگەیەنێ.

(وَإِذًا لَّاتَّخَذُوكَ خَلِيلًا ): ئەو کاتەش تۆیان بە دۆست دەگرت، (الخَلِيْلُ: الصَّدِيقُ، وَالجَمْعُ أَخِلاّء)، وشەی: (خَليل) واتە: برادەر، هاوەڵ و کۆیەکەی بریتیە لە (أَخِلاّء) واتە: هاوەڵەکان، وشەی (خَلَّة)ش (الخَلَّةُ: الفَقْرُ وَالحَاجَّةُ) واتە: هەژاریی و ئاتاجیی، هەروەها (الخَلَّةُ: الخَصْلَةُ) بە مانای خەصڵەت و سیفەتیش دێ.

(كِدتَّ): واتە: نیزیك بوو، دەگوترێ: (كِدْتُ أَفْعَلُ كَذَا: قَارَبْتُ الفِعْلَ، وَلَمْ أَفْعَلهُ) ئەگەر بڵێی: (كِدْتُ أَفْعَلُ كَذَا) واتە: نیزیك بوو ئەو کارە بکەم، بەڵام نەمکرد، بەڵام ئەگەر بگوترێ: (مَا كِدْتُ أَفْعَلُ، أَي: فَعَلْتُ بَعْدَ إِبْطَاءٍ) کارەکەم کرد، بەڵام دوایی سستیی نواندنێك، دوای ئەوە کە پێی چوو، کەواتە: وشەی (كَادَ) یانی: (قارَبَ) نیزیك بوو.

(تَرْكَنُ ): واتە: بە لایاندا بچی، پشتیان پێ ببەستی، ڕوویان تێبکەی، (رَكَنْتُ إِلى كَذَا: إِعْتَمَدْتُ إِلَيْهِ) پشتم پێ بەست، (تركن)ش لە (رُكْن)ەوە هاتوە، لەبەرئەوەی ئینسان ئەگەر مەترسییەکی بۆ بێ، خۆی دەپەستێتە گۆشەیەکەوە، چونکە هەم پشتی دیوارە، هەم ئەملا ولای دیوارە، تەنیا ئەو لایەی کە ڕووبەڕوویەتی دەمێنێتەوە، تاکو بەرگریی لە خۆی بکات، (رَكَنَ، يَرْكَنُ، ورَكِنَ يَرْكَنُ) هەردووکیان هاتوون، واتە: پشتی پێ بەست، یان بەلایدا چوو، خۆی خستە سەر، واتە: سەنگی خۆی خستە سەرێ، بۆ ئەوەی

بە هۆیەوە ڕابوەستێ، (**رُكْنُ الشيءِ: جَانِبُهُ**) واتە: لایەکەی، بەڵام لە ڕاستییدا (**رُكْن**) بە مانای گۆشە دێ، واتە: ئەو شوێنەی کە ئەملاولای گیراون و، پشتیشی گیراوە و تەنیا لای پێشەوەی بەتاڵە، چۆڵاییە.

(ضِعْفَ): (**ضِعْفَ: أَضْعَفْتُ الشَّيءَ، وَضَعَّفْتُهُ، وَضَاعَفْتُهُ: ضَمَمْتُ إِلَيْهِ مثله فَصَاعِدًا**)، ئەو سێ کردارە: (**أَضْعَفْتُ الشَّيءَ، وَضَعَّفتُهُ وَضَاعَفْتُهُ**) هەرسێکیان واتە: وێنەی ئەو شتەم خستە گەڵ ئەو شتە، یاخود: وێنەی خۆی و زیاتریش، کە لە کوردییدا دەڵێین: دوو قاتی کردەوە، دوو چەندان، یاخود دوو بەرانبەر، یان چەند بەرانبەر، چەند قات.

(لَيَسْتَفِزُّونَكَ): (**لَيَسْتَفِزُّوكَ: لِيَزْعِجُوكَ**) تاکو بێزارت بکەن، سەغڵەتت بکەن، تەنگە تاوت بکەن، هەڵتپێچن، (**الفَزُّ مِنَ الرِّجَالِ: الخَفِيْفُ**) واتە: پیاوێك کە قالب سووك بێ، زوو بە دەستەوە بێ پێی دەگوترێ: (**فَزّ**)، (**الفَزَّةُ: الوَثْبَةُ بالإِنْزِعَاجِ**)، (**فَزَّة**) واتە: بازدانی ئینسان بە هۆی بێزارییەوە، کەسێك شتێك هەڵیپێچێ و سەغڵەتی بکات، لەوێ لا بچێ، یاخود ڕاپەرێ و دەرپەڕێ.

(لَّا يَلْبَثُونَ): (**لَبِثَ بالْمَكَانِ: مَكَثَ وَأَقَامَ، لَبِثَ يَلْبَثُ لَبْثاً وَلُبْثاً**) (**لَبِثَ بالْمَكانِ**) مایەوەو تێیدا نیشتەجێ بوو، دەگوترێ: (**لَبِثَ يَلبَثُ**)، هەم (**لَبْث**) هەم (**لُبْث**) هەردووکیان چاوگن.

(خِلَٰفَكَ): (**خَلْفَكَ**) واتە: لە دوای تۆ، دەگوترێ: (**جَاءَ خِلاَفَهُ، أَي: بَعْدَهُ**) لە دوای وی هات.

(سُنَّةَ): (**السَّنَنُ: الطَّرِيْقَةُ وَالمِثَالُ**) واتە: ڕێبازو وێنە، (**السُّنَّةُ: الطَّرِيْقَةُ والسِّيْرَةُ حَمِيْدَةً كَانَت، أَو ذَمِيْمَةً**)، (**سُنَّة**) بە مانای ڕێباز دێ، ئنجا ستایشکراو بێ، یاخود زەمکراو، (**سُنَّة**) بە کوردیی دەبێتەوە یاسا، دەگوترێ: حاڵەتێکی بەردەوام (**العَادَةُ المُتَّبَعَة**) نەریتێکی پەیرەویی لێکراو، واتە: یاسای خوا.

(لِدُلُوكِ ٱلشَّمْسِ): واتە: لە کاتی لادانی خۆرەوە، (**دَلَكَتِ الشَّمْسُ: زَالَتْ عَنْ كَبِدِ السَّمَاءِ، فَهِيَ دَالِكٌ وَدَالِكَة**)، خۆر ئەگەر لە نێوەڕاستی ئاسمان، لە نێو جەرگەی ئاسمان، لایدا بە لای ڕۆژئاوادا، پێی دەگوترێ: (**دَالِكٌ وَدَالِكَة**) و حاڵەتەکەش پێی دەگوترێ: (**دلوك**) واتە: لادان.

(إِلَىٰ غَسَقِ ٱلَّيْلِ): واتە: هەتا تاریکایی شەو، دەگوترێ: (**غَسَقَ اللَّيْلُ يَغْسِقُ غَسْقاً، وَغُسُوقاً وَغَسَقَاناً، أَي: أَظْلَمَ، وَالغَاسِقُ اللَّيْلُ إِذَا غَابَ الشَّفَقُ وَاشْتَدَّت ظُلْمَتُهُ**)، (**غَسَقَ اللَّيْلُ**

**يَغْسِقُ غَسْقاً، وَغُسُوقاً وَغَسَقَاناً**) واتە: شەوەکە تاریك دادێ، بە تاریك داهاتن، (**غَاسِقٌ**) بە شەو دەگوترێ، کاتێك کە سوورایی و تیشکی خۆر لە ئاسۆی ئاسمان نامێنێ و، تاریکاییەکەی خەست دەبێتەوە.

(ٱلْفَجْرِ): (**الفَجْرُ: إِنْكِشَافُ ظُلْمَةِ اللَّيْلِ عَنْ نُورِ الصَّبَاحِ**) (**فجر**) بریتیە لە لێك جیابوونەوەی تاریکایی شەو لە ڕۆشنایی بەرە بەیان، هەروەها (**فَجْرٌ**) بە مانای تەقینەوە و بە مانای لێك جیاکردنەوەش دێ.

(مَشْهُودًا): دەگوترێ: (**شَهِدَ: أَي حَضَرَ، يَوْمٌ مَشْهُود: يَجتَمِعُ فيهِ النَّاسُ لأَمْرٍ ذِي شَأْنٍ**)، (**يومٌ مَشهود**) واتە: ڕۆژێکی لەلا ئامادە بوو، کە خەڵك تێیدا کۆدەبنەوە بۆ کارێکی گرنگ.

کەواتە: ﴿إِنَّ قُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ كَانَ مَشْهُودًا﴾، واتە: بێگومان قورئان خوێندنی نوێژی بەیانیی، لەلا ئامادە بووە (فریشتەکان لەلای ئامادە دەبن).

(فَتَهَجَّدْ بِهِۦ): واتە: بە قورئان شەو نوێژ بکە، یانی: لە شەو نوێژدا بیخوێنە، (**هَجَدَ يَهْجُدُ هُجُوداً: نَامَ، صَلَّى باللَّيْلِ، فَهُوَ هَاجِد**)، شارەزایانی زمانی عەرەبی دەڵێن: وشەی (**هَجَدَ**) لەو جۆرە کردارانەیە، کە دوو مانای پێچەوانەی یەکدی دەگەیەنن، وەك وشەی (**عَسْعَسَ**)، کە هەم بە مانای هات (**أَقْبَلَ**) دێ، هەم بە مانای ڕۆیی (**أَدْبَرَ**) دێ، کە خوا دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّيْلِ إِذَا عَسْعَسَ ۝١٧﴾ التكوير، واتە: شەوگار کە دێ، یان شەوگار کە دەڕوا.

لێرەش (**هَجَدَ**) هەم بە مانای نووست (**نام**) و، هەم بە مانای بێداربووە (**إِسْتَيْقَظَ**) دێ، یان بە مانای: شەونوێژی کرد (**صَلَّى باللَّيْل**)دێ، وشەی (**هَاجِد**) واتە: شەونوێژکەر، کەسێکە کە شەو هەڵدەستێتەوە، هەروەها (**هاجِد**) بە مانای خەوتوو (**نائِم**)یش دێ، کەسێك کە خەوتووە.

بەڵام بە پێی سیاقەکە دەزانرێ، کە ئایا لەو شوێنەدا: مەبەست لە (**هجود**)، شەونوێژ کردن و بێدارییە، یاخود خەوتنە؟!

ئنجا (**تَهَجُّد**) هەندێك لە شارەزایانی زمانی عەرەبی دەڵێن: وەك (**تَأَثُّم**) وایە، (**تَأَثَّمَ**) یان (**تَحَرَّجَ**) واتە: (**تَرَكَ الإِثْمَ**) واتە: وازی لە گوناح هێنا، وازی لە (**حَرَج**) هێنا.

کەواتە: (**تَهَجُّد**)یش واتە: وازی لە خەوتن هێناوەو، بێدار بووە بۆ شەو نوێژکردن.

(نَافِلَةً ): (النَّافِلَةُ: مَا زَادَ عَنِ الحَقِّ، أَو النَّصِيبِ، أَو الفَرْضِ) (نَافِلَة) لە: (نَفْل)ە، یانی: زیادە، (نَافِلَةً ) شتێکە زیاد بێ لە هەق، یاخود لە پشك و بەش، یاخود لە فەڕز.

( وَزَهَقَ ): (زَهَقَ: أي: هَلَكَ، مَاتَ، وَمَحَلَ) واتە: لەبەین چوو، مرد، پووکایەوە.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

١)- هۆی هاتنە خواری ئەو سێ ئایەتە موبارەکەی، ئەمە دەقەکەیانە: ﴿ وَإِن كَادُوا۟ لَيَفْتِنُونَكَ عَنِ ٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ لِتَفْتَرِىَ عَلَيْنَا غَيْرَهُۥ ۖ وَإِذًا لَّٱتَّخَذُوكَ خَلِيلًا ﴿٧٣﴾ وَلَوْلَآ أَن ثَبَّتْنَـٰكَ لَقَدْ كِدتَّ تَرْكَنُ إِلَيْهِمْ شَيْـًٔا قَلِيلًا ﴿٧٤﴾ إِذًا لَّأَذَقْنَـٰكَ ضِعْفَ ٱلْحَيَوٰةِ وَضِعْفَ ٱلْمَمَاتِ ثُمَّ لَا تَجِدُ لَكَ عَلَيْنَا نَصِيرًا ﴿٧٥﴾ ﴾:

لەبارەی هۆی هاتنە خواری ئەم ئایەتانەوە، چەند بەسەرهاتێك باسکراون، ئەو بەسەرهاتانە دێنم، دوایی ڕای خۆشم لەو بارەوە دێنم:

### بەسەرهاتی یەکەم:

{عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: إِنَّ أُمَيَّةَ بْنِ خَلَفَ، وَأَبَا جَهْلِ بْنِ هِشَام، وَرِجَالاً مِنْ قُرَيْشٍ، أَتَوْا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَقَالُوا: تَعَالَ فَاسْتَلِمْ آلِهَتَنَا، وَنَدْخُلُ مَعَكَ فِي دِيْنِكَ، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَشْتَدُّ عَلَيْهِ فِرَاقُ قَوْمِهِ، وَيُحِبُّ إِسْلاَمَهُمْ، فَرَقَّ لَهُمْ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ: ﴿ وَإِن كَادُوا۟ لَيَفْتِنُونَكَ ﴾ إِلَى قَوْلِهِ: ﴿ نَصِيرًا ﴾}[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ) دەڵێ: ئومەییەی کوڕی خەلەف و ئەبوو جەهلی کوڕی هیشام و، پیاوانێك لە قورەیش، هاتنە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، گوتیان: وەرە دەست لە پەرستراوەکانی ئێمە بدە (وەك ڕێز لێگرتن و بە پیرۆزگرتن)، ئێمەش دێینە نێو ئایینەکەتەوە، پێغەمبەریش ﷺ زۆر لەلای قورس بوو کە گەلەکەی پەرت بن، بە قسەی ناکەن و زۆر حەزی بە مسوڵمان بوونیان دەکرد، (ئەوەش حاڵەتێکی ئاسایی و سروشتی پێغەمبەرە ﷺ)، بۆیە دڵی بۆیان نەرم بوو، (هیچی نەکرد، بەس دڵی بۆیان نەرم بوو)، خواش لەو بارەوە ئەو ئایەتانەی ناردنە خوار.

---

(١) لباب النقول ص١٣٨، وقال مؤلِّفا الإستيعاب: هذا إسنادٌ ضعيف، ج٢، ص٤٤٨ .

بەڵام وەك زانایان و شارەزایانی فەرموودەناس گوتوویانە: ئەم گێڕدراوەیە سەنەدەكەی بێهێزە.

## بەسەرهاتی دووەم:

{عَنْ جُبَيرِ بْنِ نُفَيرٍ: أَنَّ قُرَيْشاً أَتَوا النَّبِيَ ﷺ فَقَالُوا لَهُ: إِنْ كُنْتَ أُرْسِلْتَ إِلَيْنَا، فَاطْرُدِ الَّذِيْنَ اتَبَعُوكَ مِنْ سِقَاطِ النَّاسِ وَمَوَالِيهِم، لِنَكُونَ نَحْنُ أَصْحَابَكَ، فَرَكَنَ إِلَيْهِم، فَأَوْحَى اللَّهُ إِلَيْهِ: ﴿ وَإِن كَادُواْ لَيَفْتِنُونَكَ عَنِ ٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ ........ ﴾}[1].

واتە: جوبەیری كوڕی نوفەیر دەڵێ: قورەیش هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ پێیان گوت: ئەگەر تۆ بۆ لای ئێمە نێردراوی، ئەوانەی كە شوێنت كەوتوون لە خەڵكی كەم بایەخ و لە كۆیلەكان، ئەوانە دەربكە، تاكو ئێمە ببینە هاوەڵت و ببینە كۆڕو مەجلیستەوە، پێغەمبەریش ﷺ دڵی بە لایاندا چوو بەڵام خوا ئەو ئایەتانەی بۆ سروش كردن.

بەڵام ئەمیش سەنەدەكەی بێهێزە و پشتی پێ نابەسترێ.

## بەسەرهاتی سێیەم:

{عَنْ قَتَادَةَ قَالَ: ذُكِرَ لَنَا أَنَّ قَوْمًا خَلَوْا بِرَسُولِ اللَّهِ ذَاتَ لَيْلَةٍ إِلَى الصُّبْحِ، يُكَلِّمُونَهُ، وَيُفخِّمُونَهُ، وَيُسَوِّدُونَهُ، وَيُقَارِبُونَهُ، وَكَانَ فِي قَوْلِهِمْ أَنْ قَالُوا: يَا مُحَمَّدُ! إِنَّكَ تَأْتِي بِشَيْءٍ لا يَأْتِي بِهِ أَحَدٌ مِنَ النَّاسِ، وَأَنْتَ سَيِّدُنَا وَابْنُ سَيِّدِنَا، فَمَا زَالُوا يُكَلِّمُونَهُ حَتَّى كَادَ يُقَارِبُهُمْ، حَتَّى مَنَعَهُ اللَّهُ، فَقَالَ: ﴿ وَإِن كَادُواْ لَيَفْتِنُونَكَ عَنِ ٱلَّذِىٓ ... ﴾} **(أَخْرَجَهُ الطَّبَرِيُّ في تفسيره ج١٤، ص٨٨، وعبدالرزاق في تفسيره ج١، ص٣٨٣، والإستيعاب فِي بيانِ الأسباب ج٢، ص٤٥٠ و ٤٥١، قُلنا هذا: مُرسَلٌ صحيح الإسنادِ).**

واتە: قەتادە {كە یەكێكە لە زانایانی تابیعیین، جیلی دوای هاوەڵان، ئەو گێڕراوەیەی هێناوە}، دەڵێ: بۆمان باسكراوە كە قورەیشییەكان شەوێك بە تەنیا لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتن، تاكو بەرەبەیان قسەیان لەگەڵدا دەكردو، بە گەورەیان دەگرت و، ڕێزیان لێدەنا، وایاندەكرد خۆیان لێ نزیك دەخستەوە، لە نێو قسەكانیاندا كە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺیان دەكرد ئەوە بوو، كە گوتیان: تۆ شتێكت هێناوە، كە هیچ كەس ئەو شتەی نەهێناوە {واتە: قسەیەك دەكەی بەرنامە و پەیامێك كە هیچ كەس نەیهێناوە، كە ڕاستیان كردوە}،

---

(١) لُباب النقول في أسباب النزول ص١٣٨، والإستيعاب فِي بيانِ الأسباب ج٢، ص٤٤٩، قال (المؤلفان قُلنا: وَهَذَا إِسْنَادٌ ضَعِيفٌ جِداً.

تۆ گەورەمانی و، کوڕی گەورەشمانی، ئیدی هەروا قسەیان لەگەڵدا دەکرد و خەریك بوو پێغەمبەر ﷺ نیزیکییان لێ بکات، دوایی خوا پێشگیریی لێکرد و پاراستی و، ئەو ئایەتانەی ناردنە خوار، فەرمووی: ﴿ وَإِن كَادُوا۟ لَيَفْتِنُونَكَ عَنِ ٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ ... ﴾.

بەڵام: ئەمەش گێڕدراوەیەکی (مُرسَل)ە، یانی: بەرز نەکراوەتەوە بۆ لای هاوەڵان ئەوەیان لێگێڕرابێتەوە، بۆیە بە فەرمووده دانانرێ، واتە: فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ، چونکە ئەو شتانەی کە هاوەڵان دەیگێڕنەوە، مادام بە سەنەدێکی ڕاست بێ و ئەو شتە پەیوەندیی بە پێغەمبەرەوە هەبێ ﷺ ئەوە حوکمی فەرمووده وەردەگرێ.

## بەسەرهاتی چوارەم:

**{عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، قَالَ: كَانَ النَّبِيّ ﷺ، يَسْتَلِمُ الحَجَر الأَسْوَدَ فِي طَوَافِهِ، فَمَنَعَتهُ قُرَيْشٌ، وَقَالوا: لاَ نَدَعُكَ تسْتَلِمُ حَتَّى تُلِمَّ بآلِهَتِنَا، فَحَدَّثَ نَفْسَهُ، وَقَالَ: «مَا عَلَيَّ أَنْ أُلِمَّ بهَا بَعْدَ أَنْ يَدَعُونِي أَسْتَلِمُ الحَجَرَ، وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِنِّي لَهَا كَارِهٌ»} (أخرجه الطَّبَري فِي تفسيره ج١٥، ص١٣٠).**

واتە: سەعیدی کوڕی جوبەیر، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە تەوافیدا عادەتی وابوو، دەستی دەگەیاندە بەردە ڕەشە، {یان ماچی کردوە، یان دەستی گەیاندوتێ، کە ئەوە سوننەتە} قوڕەیشییەکان پێشگیرییان لێکرد (ڕێیان نەداو) گوتیان: لێ ناگەڕێین دەست بگەیەنیە بەردە ڕەشە، تاکو دەستیش لە پەرستراوەکانی ئێمە نەدەی، {کە لە دەوری کەعبە دایاننابوون، سێسەدوشەست (٣٦٠) صەنەم بوون} پێغەمبەریش ﷺ بە دڵیدا هات، گوتی: چی دەبێ ئەگەر دەستێکیش بگەیەنمە بتەکان، دوای ئەوەی کە لێم دەگەڕێن دەست لە بەردە ڕەشە بدەم (یان ماچی بکەم) خواش دەزانێ کە من ئەوەم پێ ناخۆشە!

ئەمەش گێڕراوەیەکی (**مُرسَل**)ە و، بە دەقێکی سوننەت دانانرێ و پشتی پێ نابەسترێ.

## بەسەرهاتی پێنجەم و کۆتایی:

**{عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللَّه عنهما، فِي رِوَايَةِ عَطَاءٍ: أَنَّهَا نَزَلَتْ فِي وَفْدِ ثَقِيفٍ، أَتَوُا النَّبِيَّ فَسَأَلُوهُ شَطَطًا، قَالُوا: مَتِّعْنَا بِآلِهَتِنَا سَنَةً، حَتَّى نَأْخُذَ مَا يُهْدَى لَهَا، فَإِذَا أَخَذْنَاهُ، كَسَّرْنَاهَا، وَأَسْلَمْنَا، وَحَرِّمْ وَادِيَنَا، كَمَا حَرَّمْتَ مَكَّة، حَتَّى تَعْرِفَ العَرَبُ فَضْلَنَا عَلَيْهِم، فَهَمَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، أَنْ يُعْطِيَهُمْ ذَلِكَ، فَنَزَلَت هَذِهِ الآيَة}**[1].

---

(١) الجامع لأحكام القران: ج١٠، ص٢٤٤،: ٤٠٤٢.

واتــە: عەتــاء لــە ئیبنــو عەبباســەوە (خــوا لــە خــۆی و بــابی ڕازی بــێ) گێڕاویەتــەوە: کــە ئــەم ئایەتانــە دەربــارەی شــاندی هــۆزی (**ثَقیـف**) هاتنــە خــوار، کــە هاتنــە لای پێغەمبــەر ﷺ و کۆمەڵــێ شــتی بــێ جێیــان لــێ داوا کــردو، گوتیــان: لێــمان گــەڕێ مــاوەی ســاڵێك پەرســتراوەکانمان بپەرســتین، تاکــو ئــەوەی بــۆ پەرســتراوەکانمان دەکرێتــە دیاریــی و خــەڵات، {خەڵــك پــارە و ســامانی بــۆ بتــەکان دەبــرد، بــە حیســاب نــەزر و صەدەقەیــان لــە خۆیــان دەگــرت و لــەو شــوێنانەیان دادەنــان، کــە ئــەو بتانــەی لێــن}، بــا ئــەو پــارەو ســامانە وەربگریــن، دوای ئــەوەی کــە پارەکەمــان وەرگــرت و کۆمــان کــردەوە، بتــەکان دەشــکێنین و مســوڵمان دەبیــن، بــەڵام تــۆش ئــەو شــیوەی ئێمــە (ئــەو دۆڵ و ناوچەیــەی ئێمــە) حــەڕام بکــە، وەك چــۆن حەرەمــی مەککــە هەیــە، {بــا ئێمــەش ئــەو شــوێنەی کــە هــۆزی (**ثَقیـف**)ی لــێ بــوون، بکرێتــە ناوچەیــەکی حــەڕام خــاوەن حورمــەت و ئــەو شــتانەی کــە لــە شــوێنە ئاساییەکان قەدەغــە نیــن، لــەوێ قەدەغــە بــن، وەك حەرەمــی مەککــە، بۆچــی؟!} تاکــو عــەرەب زێدەیــی ئێمــە بەســەریانەوە بزانــن و، پلــەی ئێمــە لەســەر خۆیانــەوە بزانــن! پێغەمبەریــش ﷺ خەریــك بــوو وا بــکات، بــەڵام ئــەو ئایەتــە هاتــە خــوار.

منیش بە کورتیی دەربارەی کۆی ئەو گێڕراوانە، دەڵێم:

بێگومــان کافــرەکان هەوڵیانــداوە لەگــەڵ پێغەمبــەری خــوادا ﷺ کــە لایبــدەن و بــەرەو ناهــەق پەلکێــشی بکــەن و، بیهێننــە ســەر ڕێچکــەی خۆیــان، بــەڵام گومــانی تێدانیــە، کــە ئــەو گێڕراوانــە، جگــە لــە یەکێکیــان کــە ســەنەدەکەی ڕاســت (**صحیح**)ە، ئەویــش (**مُرسَل**)ە، ئــەوانی دیکــە ســەنەدەکەیان بێهێــزە، بۆیــە پشــتیان پــێ نابەســترێ.

بــەڵام بۆیــە هێنامــن، تاکــو ئەگــەر کەســێك لــە تەفســیرەکاندا بیبینــی - چونکــە تەفســیرەکان زۆربەیــان هەمــوو ئــەو گێڕراوانەیــان هێنــاون - ئنجــا بــۆ ئــەوەی هیچکــەس بەوانــە هەڵنەخەڵەتــێ و پێــی وابــێ کــە: پێغەمبــەر ﷺ شــتێکی وای بــە دڵــدا هاتــوە، کــە دەســت بــە بتانــدا بێنــێ، یــان شــتێکی وای بــە دڵــدا هاتــوە، کــە لەبەرئــەوەی ڕێــی نــادەن دەســت بگەیەنێتــە بــەردە ڕەشــە {کــە پێغەمبــەر ﷺ مــادام تــەواف کردبــێ، نەبیســتراوە، تەنیــا ڕێــی دەســت گەیاندنــە بــەردە ڕەشــەی لــێ بگــرن} ئنجــا بــۆ ئــەوەی ڕێــی بــدەن، بــا دەســت بگەیەنێتــە بتەکەنیــان، یاخــود ڕێگەیــان بــدات: مــاوەی ســاڵێکی دیکــە بتەکانیــان بپەرســتن، ئــەوە دەبــێ کــەی بــوو بــێ؟ ئــەم ســوورەتە مەککەییــە و (**ثَقیـف**) لــە مەدینــەدا هاتوونــە لای پێغەمبــەر ﷺ مســوڵمان بــوون و وتووێژیــان لەگەڵــدا کــردوە!!

کەواتە: ئەو گێڕدراوانە هیچیان هی ئەوە نین، بۆ تەفسیری ئەو ئایەتانە پشتیان پێ ببەسترێ، وەك دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا باشتر تیشك دەخەینە سەر ئەوە، کە نێوەڕۆکی ئەو ئایەتانە و چەمك و واتای ڕاستەقینەی ئەو ئایەتانە، لەگەڵ ئەو هۆی هاتنە خوارەوانەدا، ناگونجێ، بەڵام زانایان و ئەوانەی کە ویستوویانە: مانا و مەبەستەکانی قورئان ڕوون بکەنەوە، زۆرجار هەندێ گێڕراوەیان هێناون، لەبەر ئەوەی لە پێش ئەواندا باسکراون، بەڵام هەندێکیان زۆر لێی ورد نەبوونەوە، کە ئایا لەگەڵ نێوەڕۆکی ئایەتەکان دا، دەگونجێن، یان ناگونجێن؟! کە وەك دوایی باسی دەکەین، هیچ کام لەم گێڕراوانە لەگەڵ نێوەڕۆکی ئایەتەکان دا ناگونجێن.

## مانای گشتی ئایەتەکان

خوا ﷻ ڕوو لە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەکات و، هەوڵ و تەقەلـلا و کۆششی بێوچان و نەپساوەی کافرەکانی بۆ دەخاتە ڕوو، هەم بۆ ئەو، هەم بۆ ئۆممەتەکەی کە چەند هەوڵیان لەگەڵ داوە: بیهێننە سەر ڕێچکەکانی خۆیان و لە ڕاستە شەقامی خوا، لایبدەن و وای لێبکەن کە شتێکی دیکە بفەرموێ و ڕابگەیەنێ، جیا لەوەی کە خوا ﷻ پێی ڕاگەیاندوە، بەڵام خوا پێغەمبەری ﷺ خۆی پاراستوە و دامەزراو و پێ چەسپاوی کردوە و کەمێکیش بە لایان نەچووە، نەك زۆر، دەفەرموێ:

﴿ وَإِن كَادُواْ لَيَفْتِنُونَكَ عَنِ ٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ ﴾، ئەوانە نزیك بوو لاتبدەن، لەوەی کە بۆ لای تۆمان سروش کردوە، ئەو پەیام و بەرنامە و قورئانەی کە بۆ تۆمان سروش کردوە، خەریك بوو لەوە لاتبدەن، ﴿ لِتَفْتَرِىَ عَلَيْنَا غَيْرَهُۥ ﴾، بۆ ئەوەی جیا لەوە بە ناوی ئێمەوە بڵێی، دیارە لەو شتانەدا کە ئەوان ویستوویانە، نەك بە گشتی، یانی: هەندێك شت کە لەگەڵ قورئاندا دژە و جیایە لە قورئان، هەندێ شتی دیکە کە جێی پەسەندی ئەوانە، ﴿ وَإِذًا لَّٱتَّخَذُوكَ خَلِيلًا ﴾، ئەگەر واشت کردبایە، ئەو کاتە تۆیان بە دۆست دەگرت و خۆشدەویست، تۆیان وەك هاوەڵ و براردەرێکی خۆیان دادەنا.

ئەوان بەو جۆرە هەوڵیان داوە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ، بەڵام با بزانین پێغەمبەری خوا ﷺ، چۆن بووە؟

﴿ وَلَوْلَآ أَن ثَبَّتْنَٰكَ لَقَدْ كِدتَّ تَرْكَنُ إِلَيْهِمْ شَيْـًٔا قَلِيلًا ﴾، ئەگەر ئێمە تۆمان نەچەسپاندبایە و دامەزراو نەکردبایە، خەریك بوو شتێکی کەم بەلایاندا بچی.

(تَثْبِیت)، بریتیە لە چەسپاندن و ڕاگیرکردن و دامەزاروکردنی شتێك، یانی: ئەگەر ئێمە تۆمان ڕاگیر و دامەزراو و چەسپاو نەکردبایە، ﴿ لَقَدْ كِدتَّ تَرْكَنُ إِلَيْهِمْ شَيْـًٔا قَلِيلًا ﴾، بە دڵنیایی نیزیك بوو کەمێك، شتێکی کەم بە لایاندا بچی، واتە: ئەصڵەن پێغەمبەر ﷺ، شتێکی کەمیش بەلایاندا نەچووە و مەیلی بە لادا نەکردوون، ئەوەی کە ئەوان داوایان لێکردوە، وەڵامی نەداونەوە، کەمیشی وەڵام نەداونەوە، چ جای زۆر.

﴿ إِذًا لَّأَذَقْنَٰكَ ضِعْفَ ٱلْحَيَوٰةِ وَضِعْفَ ٱلْمَمَاتِ ﴾، ئنجا ئەگەر تۆ کەمێکیش بە لایاندا چووبای، ئێمە هەم سزای دوو قاتی ژیان، هەم سزای دوو قاتی مردنمان پێ دەچێژتی، ﴿ ثُمَّ لَا تَجِدُ لَكَ عَلَيْنَا نَصِيرًا ﴾، دواییش تۆ بەسەر ئێمەوە و لە بەرانبەر ئێمەدا، هیچ پشتیوان و هاوکار و، وەسەرخەرت چنگ نەدەکەوتن، کە لە سزای ئێمە بتپارێزن، لە ئازاردانی ئێمە چەپاڵەت بدەن.

﴿ وَإِن كَادُوا۟ لَيَسْتَفِزُّونَكَ مِنَ ٱلْأَرْضِ لِيُخْرِجُوكَ مِنْهَا ﴾، ئنجا کە نەیانتوانیوە لای بدەن، لەو ڕاستە شەقامەی کە خوا ﷻ پێغەمبەری خاتەمی ﷺ، خستۆتە سەر، لەو بەرنامەیەی کە بۆی سروش کردوە، کاتێك نائومێد بوون لەوە کە لایبدەن و کەمێك بە لای خۆیاندا پەلکێشی بکەن، گواستوویانەتەوە بۆ جۆرە هەوڵێکی دیکە، کە بریتی بووە لەوەی: وەدەری بنێن، بێزار و جاڕزی بکەن، سەغڵەت و نارەحەتیی بکەن و ناچاری بکەن: وڵات بەجێ بهێڵێ، ﴿ وَإِن كَادُوا۟ لَيَسْتَفِزُّونَكَ مِنَ ٱلْأَرْضِ لِيُخْرِجُوكَ مِنْهَا ﴾، هەروەها ئەوانە نیزیك بوو کە تۆ هەڵپێچن و بێزارت بکەن، جاڕزت بکەن، وات لێبکەن: ئەو شوێنەی کە ئیستا لێی، جێی بهێڵی، کە شاری مەککەیە، بۆچی؟ ﴿ لِيُخْرِجُوكَ مِنْهَا ﴾، تاکو وەدەرت بنێن، لەو سەرزەمینە، کە مەککەیە، ﴿ وَإِذًا لَّا يَلْبَثُونَ خِلَٰفَكَ إِلَّا قَلِيلًا ﴾، ئەگەر واش بکەن، کەمێك نەبێ لە دوای تۆ نامێننەوە، یان ئەگەر وایان کردبایە، کەمێك نەبا، لە دوای تۆ لەو شارەدا، لەو سەر زەمینەدا، نەدەمانەوە بە سەلامەتیی، کە ئەمە زۆربەی زانایان وایان لێکداوەتەوە کە ئەوانە لە دوای پێغەمبەر ﷺ بە سەلامەتیی نەمانەوە، چونکە جەنگی بەدر هاتە پێش، دوای ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ ناچار کرا مەککە بەجێ بهێڵێ، کە لە جەنگی بەدردا، لە زلەزلەکانی قوڕەیش حەفتا (٧٠) کەس کوژران و حەفتا (٧٠)شیان لێ بەدیل گیران و دڕکیان شکا و، زەبوون کران، واتە: بە سەلامەتیی لەو شارەدا، نەمانەوە لە دوای پێغەمبەر ﷺ.

واتایەکی دیکەی ئەوەیە: کە ئەگەر وابکەن، لە دوای تۆ نامێننەوە مەگەر کەمێك، واتە: ئەگەر تۆ وەدەر بنێن، بەڵام قورەیشییەکان پێغەمبەریان ﷺ وەدەرنەنا لە مەککە، بەڵکو خۆی لەبەر بەرژەوەندیی کارو پرۆژە ئیسلامییەکەی، شاری مەککەی بەجێهێشت، ئەگەرنا دەیتوانی هەر بمێنێتەوە، بەڵام بە نارەحەتیی.

کەواتە: ﴿ وَإِذًا لَّا يَلْبَثُونَ خِلَٰفَكَ إِلَّا قَلِيلًا ﴾، ئەوە هەواڵ پێدانە، کە ئەگەر وا بکەن، لە دوای تۆ نامێننەوە لە شاری مەککەدا، جگە لە کەمێك، بەڵام وایان نەکرد، بۆیە مانەوە، بەو واتایە کە شاری مەککە بەسەر کافرەکان دا کاول نەبوو، ئیدی دوایی کە لە جەنگی بەدردا، لێیان کوژرا و لە جەنگی ئوحوددا و، لە جەنگەکانی دیکەدا، ئەوە پێچەوانەی مانەوەیان نیە لە شاری مەککەدا.

﴿ سُنَّةَ مَن قَدْ أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ مِن رُّسُلِنَا ﴾، ئنجا ئەوە کە خوا سزایان دەدا، لەسەر ئەوەی تۆ ناچار بکەن، ئەو شارە بەجێهێڵی و، کەمێك نەبێ لە دوای تۆ بە سەلامەتیی نەمێننەوە، ئەوە یاسای خوایە، لە ژیانی ئەو پێغەمبەرانەدا (**عَلَيهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام**) کە پێش تۆ ڕەوانمان کردوون، واتە: ئەوە یاسای خوایە و عادەتی خوایە، لە ژیانی پێغەمبەرانی پێشووشدا هاتۆتە دی و، بۆ تۆش دێتە دی، ﴿ وَلَا تَجِدُ لِسُنَّتِنَا تَحْوِيلًا ﴾، تۆش لادان نابینی بۆ یاسای ئێمە، یاسای ئێمە ناگۆڕێ و لانادرێ، وەك چۆن بۆ پێغەمبەرانی پێشوو (**عَلَيْهِم الصَّلاةُ وَالسَّلام**) خوا وای کردوە، هەر کامێکیان، گەلەکەی وەدەریان نابێ، خوا گەلەکەی سزا داوە، گەلی تۆش ئەگەر وەدەرت بنێن، خوا سزایان دەدا، ئنجا ئایا خوا سزای داون، لەبەر ئەوە کە وەدەریان ناوە، یاخود ئایا ئەگەر وەدەریان نابایە، سزای دەدان؟ هەردوو واتایەکە لەگەڵ سیرە و ژیانی پێغەمبەردا ﷺ دەگونجێن، دەگونجێ بڵێین: بەڵێ خوا سزای دان، بەوە کە حەفتا لە زلە زلەکان و قسە ڕۆیشتووەکانیان کوژران، لە جەنگی بەدردا وحەفتاشیان بەدیل گیران، پاشان قات و قڕیی و گرانییان بەسەر هات، کە پێغەمبەر ﷺ تووکیی لێ کردن.

دەشگونجێ بڵێین: نەخێر خوا سزای نەدان بەو واتایە، کە وەك گەلانی پێشوو سزا بدرێن و بنبڕ بکرێن و، لە بەین ببرێن، چونکە هەر مانەوە، بەڵێ دڕکیان شکا، بەڵام بنبڕ نەکران وەك گەلانی پێشوو، هەردوو واتایەکە لەگەڵ واقیعی ژیانی پێغەمبەردا ﷺ دەگونجێن.

ئنجا خوا ﷻ فەرمان بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەکات بە چەند شتێك، کە خولاسەکەیان ئەوەیە، ئینسان ئەگەر بیەوێ خۆڕاگربێ، لە گەرمەی نارەحەتیی و گرفتارییەکاندا، دەبێ

پەیوەندیی لەگەڵ خوادا قایمتر و پتەوتر بکات، بۆیە دەفەرمویٚ: ﴿ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِدُلُوكِ ٱلشَّمۡسِ إِلَىٰ غَسَقِ ٱلَّيۡلِ ﴾، نوێژ بەرپابکە لە کاتی لادانی خۆرەوە {لە نێوەڕاستی ئاسمان بە لای ڕۆژئاوا} تاکو تاریکایی شەو، کە ئەمە چوار نوێژان دەگرێتەوە:

١ - کاتێك کە تۆزێك خۆر لادەدا لە نێوەڕاستی ئاسمان، نوێژی نیوەڕۆ دەبێ.

٢ - کە زیاتر لادەدا، نوێژی ئێوارە (عصر) دەبێ.

٣ - کە خۆر ئاوا دەبێ و بە تەواویی لادەدا، نوێژی شێوان دەبێ.

٤ - ﴿ غَسَقِ ٱلَّيۡلِ ﴾ لە تاریکایی شەودا، دوای ئەوەی سوورایی تیشکی خۆر لە ئاسۆیەکان نامێنێ، نوێژی خەوتنان دەبێ.

٥ - ئنجا نوێژی پێنجەم ﴿ وَقُرۡءَانَ ٱلۡفَجۡرِ ﴾، هەروەها قورئان خوێندنی بەیانی، ﴿ إِنَّ قُرۡءَانَ ٱلۡفَجۡرِ كَانَ مَشۡهُودٗا ﴾، بە دڵنیایی قورئان خوێندنی (نوێژی) بەیانیی، لەلا ئامادەبوویە، فریشتەکان لە لای ئامادە دەبن و دەیبینن، واتە: گرنگیی بدە بە قورئان خوێندنی نوێژی بەیانییش، چونکە قورئان خوێندنی نوێژی بەیانیی، فریشتەکان لە لای ئامادە دەبن.

کەواتە: ئەم ئایەتە ئاماژەیە بە کاتی هەر پێنج نوێژەکان، دوای ئەوەی کە خوا ﷻ پێنج نوێژەکەی لەسەر پێغەمبەر ﷺ فەرز کردن، هەر لەم سوورەتەدا کە باس دەکات، لە سەفەری شەووڕۆ (بەرزبوونەوەی)دا، ئنجا کاتەکانی بۆ دیارییکردوون، لە قورئاندا، بەڵام وەك دوایی باسی دەکەین، خوا ﷻ جیبریلیشی ناردوە و بەکردەوەش پێغەمبەری ﷺ فێر کردوە، بە وردیی هەر کام لە کاتی پێنج نوێژەکان، کەییەو چۆنە؟

﴿ وَمِنَ ٱلَّيۡلِ فَتَهَجَّدۡ بِهِۦ نَافِلَةٗ لَّكَ ﴾، هەروەها لە شەویشدا بە هۆی خوێندنی قورئانەوە، شەونوێژ بکە، ئەوەش زیادەیە بۆ تۆ، واتە: خواپەرستییەکی زیادەیە بۆ تۆ.

﴿ عَسَىٰٓ أَن يَبۡعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامٗا مَّحۡمُودٗا ﴾، نیزیکە پەروەردگارت زیندووت بکاتەوە و پێگەی ستایشکراوت پێ ببەخشێ.

ئەمە وەك دوایی باسی دەکەین، مەبەست پێی تکاکردنی مەزن (**الشَّفَاعَةُ العُظْمَى**)ە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ، دوای ئەوەی مرۆڤەکان دەچن بۆ لای ئادەم و داوای لێ دەکەن، تکایان بۆ بکات لەلای خوای پەروەردگار: لێپرسینەوە و سزا و پاداشت دەست پێبکات و کۆتایی بە ڕاگرتنیان بێت لە (گۆڕەپانی) کۆکردنەوە و لێپرسینەوەدا، ئادەم حەواڵەی

لای نووحیان دەكات و، نووح حەواڵەی لای ئیبڕاهیمیان دەكات و، ئیبڕاهیم حەواڵەی لای مووسایان دەكات و، مووسا حەواڵەی لای عیسایان دەكات و، عیساش حەواڵەی لای موحەممەدیان دەكات، (**عَلَيهِم الصَّلاةُ وَالسَّلام**)، پێغەمبەر موحەممەدیش ﷺ تكا لە خوای پەروەردگار دەكات كە ئەو ڕۆژە، ئەو مەینەتییە كۆتایی پێ بێنێ و، دوای تكایەكەی دەست دەكرێ بە لێپرسینەوەی مرۆڤەكان.

﴿ وَقُل رَّبِّ أَدْخِلْنِي مُدْخَلَ صِدْقٍ وَأَخْرِجْنِي مُخْرَجَ صِدْقٍ ﴾، هەروەها بڵێ: ئەی پەروەردگارم! بە چوونە نێوێكی باش بمخە نێوو، بە هێنانە دەرێكی باش، بمهێنە دەر.

وشەی (مُدْخَلَ) و (مُخْرَجَ)، یانی: بردنە نێو و، هێنانە دەر، كە مەبەست پێی چوونە نێوی پێغەمبەرە ﷺ بۆ هەر كار و چالاكییەك و هاتنەدەری پێغەمبەرە ﷺ لە هەر كار و چالاكییەك، یاخود چوونە نێو شاری مەدینەیە، بۆ پێغەمبەر ﷺ، و هاتنە دەریەتی لە شاری مەككە.

یانی: پەروەردگارم! با هەردووكیان، هەم هاتنە دەرەكەم لە شاری مەككە، هەم چوونە ژوورەكەم بۆ شاری مەدینە، یان: هەم چوونە نێو كارو چالاكییم و هەم لێ هاتنە دەرێم بە شێوەیەكی ڕێك و پەسند و چاك بێ. ﴿ وَاجْعَل لِّي مِن لَّدُنكَ سُلْطَانًا نَّصِيرًا ﴾، لە لایەن خۆتەوە دەسەڵاتێكی پشتگیریكەر و سەرخەرم بۆ بڕەخسێنە، ﴿ وَقُلْ جَاءَ الْحَقُّ وَزَهَقَ الْبَاطِلُ ﴾، هەروەها بڵێ: هەق هاتوو باتیڵ پووچەڵ بووە، مرد، فەوتا،

﴿ إِنَّ الْبَاطِلَ كَانَ زَهُوقًا ﴾، بە دڵنیایی باتیڵ (ناهەق) پووچەڵ و فەوتاوە.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ئـەی موحەممـەد ﷺ! نیزیـك بـوو لـەوەی بۆمـان سروش کردووی، کافـرەکان لات بـدەن، تاکـو شـتێکی جیـا لـەوەی بۆمـان ناردووی، بـە نـاوی ئێمـەوە بڵێـی، ئـەو کاتـەش تۆیـان بـە دۆسـت دەگـرت، ئەگـەر تۆشـمان نەچەسـپاندبایە، نیزیك بوو شـتێکی کـەم بـە لایانـدا بچـی، ئـەو کاتـەش سـزای دوو قاتـی ژیـان و، سـزای دوو قاتـی مردنمـان پـێ دەچێژتـی، ئنجـا هیـچ وەسـەرخەرێکیشـت لـە بەرانبەرمانـدا، چنـگ نەدەکـەوت:**

خــوا دەفەرمــوێ: ﴿ وَإِن كَادُواْ لَيَفۡتِنُونَكَ عَنِ ٱلَّذِيٓ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ لِتَفۡتَرِيَ عَلَيۡنَا غَيۡرَهُۥۖ وَإِذٗا لَّٱتَّخَذُوكَ خَلِيلٗا ﴿٧٣﴾ وَلَوۡلَآ أَن ثَبَّتۡنَٰكَ لَقَدۡ كِدتَّ تَرۡكَنُ إِلَيۡهِمۡ شَيۡـٔٗا قَلِيلًا ﴿٧٤﴾ إِذٗا لَّأَذَقۡنَٰكَ ضِعۡفَ ٱلۡحَيَوٰةِ وَضِعۡفَ ٱلۡمَمَاتِ ثُمَّ لَا تَجِدُ لَكَ عَلَيۡنَا نَصِيرٗا ﴿٧٥﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دە بڕگەدا:

١)- ﴿ وَإِن كَادُواْ لَيَفۡتِنُونَكَ ﴾، پێشتریش گوتمان: (كَادَ)، یانی: (قَرُبَ)، نیزیك بوو، (لَيَفۡتِنُونَكَ)، واتە: لاتبدەن، (**عُدِّيَ لِيَفْتِنُونَكَ بـــ»عَنْ» لِتَضْمِينِهِ مَعْنَى فِعْلٍ كَانَ الفَتْنُ لأَجْلِهِ، وَهُوَ مَا فِيهِ مَعْنَى يَصْرِفُونَك**)، (**فَتْن**)، واتە: تاقیکردنەوە، یاخود ئازاردان، سزادان، نارەحەتکردن، ئەو مانایانەی هەموو هەن.

لێـرەدا وشـەی (لَيَفۡتِنُونَكَ)، بـە پیتـی (عَـنْ)، بـەرکاری پـێ خـوازراوە، تاکـو مانـای فیعلێکی بچێتـە نێـو، کـە ئـەو تاقیکردنەوەیـە لـە پێنـاوی ئـەودا بـووە، ئەویـش ئەوەیـە کـە مانـای: لاتبـدەن (**يَصْرِفُونَـك**)ی بخرێتـە نێـو.

کەواتـە: ﴿ وَإِن كَادُواْ لَيَفۡتِنُونَكَ ﴾، واتـە: خەریـك بـوو کـە تووشـی بـەڵات بکـەن و لاتبـدەن، نیزیـك و خەریـك بـوو، لـە چـی لایبـدەن و تووشـی بـەڵای بکـەن؟

٢)- ﴿ عَنِ ٱلَّذِيٓ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ ﴾، لەوەی کە بۆمان سروش کردووی، ئنجا ئەوەی کە بۆی سروش کراوە، بێگومان قورئانە، وەك خوا ﷻ لە سوورەتی (**الأنعام**)دا دەفەرموێ: ئەی پێغەمبەر!

ﷺ بفەرموو: ﴿ وَأُوحِيَ إِلَيَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ لِأُنذِرَكُم بِهِۦ وَمَنۢ بَلَغَ ﴿١٩﴾ ﴾، واتە: ئەم قورئانەم بۆلا سروش کراوە، تاکو ئێوەشی پێ بترسێنم و وریابکەمەوە و هەر کەسێکیش کە پێی دەگات، دیسان پێی بترسێنم و پێی وریا بکەمەوە.

٣)- ﴿ لِتَفْتَرِيَ عَلَيْنَا غَيْرَهُۥ ﴾، تاکو جگە لەو، بە ناوی ئێمەوە بڵێی، واتە: جگە لە قورئان، بە ناوی ئێمەوە بڵێی، لەو بابەتانەدا کە ئەوان مەبەستیان بوون، ئەمە دەگونجێ مەبەست پێی یەکێك لەو دووانە، یان، هەردووکیان بێ:

أ)- پێغەمبەر ﷺ چی دیکە ئاوا بە قورسیی - وەك لە ئایەتەکاندا هاتوە - باسی بت و صەنەمەکانیان نەکات و، قسەی سەخت و ڕەقیان لەسەر نەکات، کە: ئەوانە هیچ نین و، بت و صەنەمن و، دەبنە سووتەمەنیی دۆزەخ، قسەکانی سووك بکاتەوە، لەو بارەوە.

ب)- کارێك بکات کە مسوڵمانە سادە و ڕەش و ڕووتەکان - بەلای کەمەوە - جارێ نەیەنە کۆڕ و مەجلیسەکەی، تاکو ئەو داواکارییە جێ بەجێ بکات، کە زلەزلەکان دەیانگوت: ئێمە لەگەڵ ئەو ڕەش و ڕووتانە دانانیشین، با ئەوانە نەیەنە کۆڕ و مەجلیسەکەتەوە!

دەبێ مەبەست لەوە کە خوا دەفەرموێ: ﴿ لِتَفْتَرِيَ عَلَيْنَا غَيْرَهُۥ ﴾، بۆ ئەوەی شتێکی دیکەی غەیری ئەوەی بۆمان سروش کردووی، بە ناوی ئێمەوە بڵێی، مەبەست پێی ئەو جۆرە شتانە بێ:

چونکە خوای پەنهانزان باس دەکات، کە زۆر هەوڵیان لەگەڵ داوە و، ئەگەر خوا نەیچەسپاندبایە، خەریك بوو، تۆزێك بە لایاندا بچێ، ئنجا ئەو شتانە، ئەو تۆزەن، ئەگەرنا خوا کە قورئانی بۆ ناردوە، ئەو غەیری قورئان بڵێ، ئەوە تۆزێك و، هەندێك نیە، بەڵکو لادانێکی یەکجارەکییە! ئەو کاتەش خوا ﷻ بەوە وازی لێ نەدەهێنا، کە سزای ژیانی دنیا و سزای مردن و مەرگی پێ بچێژێ و بۆی دوو قات بکاتەوە! ئاوا دەبێ بە وردیی سەرنجی ئایەتەکان بدەین، تاکو بەهەڵە لێیان تێ نەگەین.

کەواتە: لێرەدا ﴿ لِتَفْتَرِيَ عَلَيْنَا غَيْرَهُۥ ﴾، واتە: جگە لەوەی بۆمان سروش کردووی، لەو شتانەدا کە ئەوان داوای دەکەن، تۆ شتێکی دیکەی جیا لە قورئان، بە ناوی ئێمەوە بڵێی، یان بکەی.

٤)- ﴿ وَإِذًا لَّٱتَّخَذُوكَ خَلِيلًا ﴾، ئنجا ئەگەر واشت کردبایە، تۆیان بە دۆست دەگرت، (الخَلِيْلُ: الصَّدِيْقُ الَّذِي يَتَخَلَّلُ حُبُّهُ القَلْبَ)، واتە: (خلیل) ئەو برادەر و هاوەڵەیە، کە خۆشەویستییەکەی دەچێتە نێو دڵ و دەروونەوە، جێگیر دەبێ تێیدا.

٥)- ﴿ وَلَوْلَآ أَن ثَبَّتْنَٰكَ ﴾، ئەگەر ئێمە تۆمان نەچەسپاندبایە (**التَّثْبِيتُ: جَعَلُ الشَّيء ثَابِتاً، أي: مُتَمَكِّناً مِنْ مَكَانِهِ غَيْرَ مُقَلْقِلٍ**)، (**تثبيت**) ئەوەیە شتێك بچەسپێنی، دامەزراوی بکەی لە شوێنی خۆیدا، بە شێوەیەك کە جووڵە جووڵ و لەرەلەر و لەقەلەقی نەمێنێ.

ئەگەر ئێمە تۆمان دامەزرا و و چەسپاو نەکردبایە:

٦)- ﴿ لَقَدْ كِدتَّ تَرْكَنُ إِلَيْهِمْ ﴾، تۆ (ئەی موحەممەد!) نیزیك بوو، هەندێك بە لایاندا بچی و پشتیان پێ ببەستی و سەنگی خۆتیان بدەیە سەرێ، یانی: شتێك بکەی کە ئەوان لێت داوا دەکەن، (**الرُّكُونُ: المَيْلُ بالرُّكْنِ، أي: بالجَانِبِ مِنَ الجَسَدِ، وَاسْتُعْمِلَ فِي المُوافَقَةِ**)، (**ركُون**)، بریتیە لەوە کە ئینسان لایەکی خۆی بخاتە سەر شتێك، سەنگی بداتە سەرێ، دوایی بەکارهێنراوە بۆ گونجان و، وەڵامدانەوەی شتێك کە لە مرۆڤ داوا دەکرێ، ڕازی بێ و وەڵام بداتەوە و جێبەجێی بکات.

٧)- ﴿ شَيْـًٔا قَلِيلًا ﴾، (**شَيْئاً: مَفْعُولٌ مُطْلَقٌ لِـ «تَرْكَنُ» أي: شَيْئاً مِنَ الرّكُونِ**)، (**شَيْئاً**)، لێرەدا بەرکارێکی ڕەها (**مَفْعُول مُطْلَق**)ە، بۆ (**تَرْكَنُ**)، واتە: شتێکی کەم مەیلیان بەلادا بکەی، یان شتێکی کەم پشتیان پێ ببەستی و سەنگی خۆتیان بدەیە سەرێ.

٨)- ﴿ إِذًا لَّأَذَقْنَٰكَ ضِعْفَ ٱلْحَيَوٰةِ ﴾، ئەگەر واشت کردبایە، ئێمە دوو قاتی ژیانمان پێ دەچێژتی، واتە: سزای دوو قاتی ژیان، چونکە: (**الضِّعْفُ: مُمَاثِلُ مِقْدَارُ شَيءٍ ذِي مِقْدَار**)، (**ضِعْف**) یانی: وێنەی ئەندازەی شتێك کە ئەندازەکەی زاندرابێ.

کە دەفەرموێ: (**ضِعْفَ**) بە سیاق و بە سەلیقە دیارە کە یانی: (**ضِعْفَ عَذَابِ الحَيَاةِ**)، یانی: سزای دوو قاتی ژیانی دنیامان پێ دەچێژتی.

٩)- ﴿ وَضِعْفَ ٱلْمَمَاتِ ﴾، هەروەها سزای دوو قاتی مردنیشمان پێ دەچێژتی.

١٠)- ﴿ ثُمَّ لَا تَجِدُ لَكَ عَلَيْنَا نَصِيرًا ﴾، دواییش لەسەر ئێمە هیچ یارمەتییدەر و سەرخەرت چنگ نەدەکەوتن، (**النَّصِيرُ: النَّاصِرُ، هُوَ المُخَلِّصُ مِنَ الغَلَبَةِ، أو الَّذِي يَثْأَرُ لِلْمَغْلُوبِ**)، (**نصير**) سیغەی مبالەغەی (**نَاصِرُ**)ە، زۆر سەرخەر، (**نَاصِر**)یش، یانی: دەربازکەر، لەوە کە مرۆڤ تێ بشکێ، یاخود کەسێك کە تۆڵە دەکاتەوە: بۆ کەسێك کە تێشکاوە و بەرانبەرەکەی پێی وێراوە.

## کورتە باسێک لە پێنج سەرنج دا

**لێرەدا پێنج (٥) کورتە سەرنج دەخەینە ڕوو لە بارەی ئەم ئایەتانەوە:**

**١)-** کە دەفەرموێ: (**الضِّعْفَ**)، خاوەنی تەفسیری (التحرير والتنوير)[1] دەڵێ: (**إِنَّ الضِّعْفَ أُطْلِقَ هُنَا عَلَى الْقَوِيِّ الشَّدِيدِ، لِعَدَمِ إِمْكَانِ حَمْلِ الضِّعْفِ عَلَى حَقِيقَتِهِ، إِذْ لَيْسَ ثَمَّ عِلْمٌ بِمِقْدَارِ الْعَذَابِ يُرَادُ تَضْعِيفُهُ، كَقَوْلِهِ:** ﴿ فَـَٔاتِهِمْ عَذَابًا ضِعْفًا مِّنَ ٱلنَّارِ ﴿٣٨﴾ ﴾الأعراف).

واتە: لێرەدا وشەی (**الضِّعْفَ**)، بەکارهێنراوە بۆ: بە هێزی سەخت {واتە: سزایەکی بەهێزی سەخت} چونکە ناگونجێ وشەی (**ضِعْفَ**)، {یانی: دوو بەرانبەر} بەپێی مانا ڕاستەقینەکەی خۆی، بەکاربهێنرێ، چونکە ئێمە زانیارییمان نیە بە ئەندازەی سزایەك کە دەویسترێ دوو قات بکرێتەوە، نازانین، ئەو سزایە چەندە؟ تاکو بزانین دوو بەرانبەرەکەی و دوو قاتەکەی چەندە؟ ئنجا ئەمە وەك قسەی خوای بەرز وایە، کە دەفەرموێ: ﴿ فَـَٔاتِهِمْ عَذَابًا ضِعْفًا مِّنَ ٱلنَّارِ ﴿٣٨﴾ ﴾، واتە: خوایە سزای چەند بەرانبەر {یاخود دوو بەرانبەر} یان لە ئاگر بدە، {هی ئەو زلە زلانەی ئێمەیان گومڕا کردوە و، لە ڕێ لاداوە}.

کەواتە: لێرەدا مەبەست هەر ئەوەیە: با سزای ئەوان زیاتر بێ، دوو هێندەی ئێمە، یاخود چەند بەرانبەری هی ئێمە بێ، چونکە ئەوان بوونە هۆی گومڕاکردنی ئێمە، واتە: سزایەکی سەخت و بەهێز، بەهێزتر و سەختتر لە هی ئێمە بێ.

**٢)-** کە دەفەرموێ: ﴿ ضِعْفَ ٱلْحَيَوٰةِ وَضِعْفَ ٱلْمَمَاتِ ﴾، خاوەنی تەفسیری (التحرير والتنوير)[2] دەڵێ: (**وَإِضَافَةُ الضِّعْفِ إِلَى الْحَيَاةِ وَإِلَى الْمَمَاتِ، عَلَى مَعْنَى «فِي»، فَالتَّقْدِيرُ: لَأَذَقْنَاكَ ضِعْفاً فِي الْحَيَاةِ وَضِعْفاً فِي الْمَمَاتِ**)، واتە: وشەی (**ضِعْف**)، کە پاڵدراوەتە لای ژیان و پاڵدراوەتە لای مردن، لێرەدا بە مانای (**فِي**) دێ، واتە: (**ضِعْفاً فِي الْحَيَاةِ وَضِعْفاً فِي الْمَمَاتِ**)، دوو بەرانبەری سزای ژیان و، دوو بەرانبەری سزای مردنمان پێ دەچێژتی.

**٣)-** زۆربەی زانایان وایان لێك داوەتەوە کە: ﴿ ضِعْفَ ٱلْحَيَوٰةِ ﴾، واتە: لە ژیانی دنیادا، سزای دوو قاتمان پێ دەچێژتی، ﴿ وَضِعْفَ ٱلْمَمَاتِ ﴾، واتە: لە ڕۆژی دواییدا سزای دوو قاتمان

---

(١) ج١٥، ص١٧٦.

(٢) ج١٥، ص١٧٦.

پێ دەچێژتی، بەڵام (**محمد الطاهر بن عاشور**) ڕایەکی دیکەی لەوبارەوە هەیە و دەڵێ: ئەگەر پێغەمبەر ﷺ بە لای کافرەکان دا، لای دابا و، پشتی پێ بەستبان و سەنگی خۆی دابایە سەریان و وەڵامی داواکانی دابانەوە، ئەو کاتە خوا ﷻ باسی سزای ڕۆژی دوایی دەکرد و سزای ڕۆژی دواییش، وا باس ناکرێ کە دوو قات و چەند قاتە، بەڵکو بە ئازار و سزای بەئێش و مەزن، باسکراوە وەك خوا ﷻ لە سوورەتی (**الأنفال**)دا، فەرموویەتی: ﴿ لَّوْلَا كِتَٰبٌ مِّنَ ٱللَّهِ سَبَقَ لَمَسَّكُمْ فِيمَآ أَخَذْتُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٦٨﴾ ﴾، واتە: ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە کە خوا پێشتر بڕیارێکی داوە، بە هۆی ئەوەوە کە قەرەبووتان وەرگرت، {فیدیەتان وەرگرت، لە دیلەکانی جەنگی بەدر} سزا و ئازارێکی مەزنتان توش دەبوو.

بەڵام لێرە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ لَقَدْ كِدتَّ تَرْكَنُ إِلَيْهِمْ شَيْـًٔا قَلِيلًا ﴾، نیزیك بوو کە شتێکی کەم بە لایاندا بچی، ئنجا لە بەرانبەر شتێکی کەم دا کە بە لایاندا چووبایە، ناگونجێ خوا سزای دوارۆژی بدات، کە ئەو مەیلکردنەش مەبەست پێی بەهەڵە داچوونی پێغەمبەری خوایە لە کۆششکردن (**إجتهاد**)دا، کە ئەویش بۆ ئەوە بووە بەرژەوەندیی ئایین و بەرژەوەندیی کار و بانگەوازەکەی دابین بکات، ئنجا لە بەرانبەر کۆششکردنی پێغەمبەردا ﷺ، ئەگەر لە کۆششەکەشی دا نەیپێکابێ، سزای دوا ڕۆژی بۆ نەبووە، چونکە سزای دوارۆژ بۆ ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ سەرپێچیی لە فەرمانی خوا بکات، بەڵام هەقی بووە کە ئیجتهاد و کۆشش بکات، لەو شتانەدا کە دەقیان لەسەر نیە و، جارێ خوا سروشی بۆ نەکردوە و پێی ڕانەگەیاندوە چی بکات، مافی خۆی بووە: کۆشش بکات، هەروەك لە وەرگرتنی قەرەبووی دیلەکانی جەنگی بەدردا، خۆی و هاوەڵانی کۆششیان کرد و خواش ﷻ لەسەر ئەوە سزای نەدان، لەبەر ئەوەی خوا بڕیاری داوە سزای کەسانێك نادات کە لە کۆششکردن (**إجتهاد**)دا بە هەڵەدا دەچن، بەڵام بێگومان سزای کەسانێك دەدا کە سووراو سوور دەزانن ئەوە سەرپێچیی فەرمانی خوایە و، سەرپێچییش دەکەن، بەڵام کەسێك کە دەقێکی لەبەر دەست نیە و بەرچاو ڕوون نیە و عەقڵی خۆی بەکاردێنێ، لە شتێکدا کە پێی وایە بەرژەوەندیی ئایین و بەرنامەی خوا لەوەدا هەیە، لەسەر ئەوە سزا نیە، چونکە کۆششکەر (**مجتهد**)، ئەگەر پێکای، دوو پاداشتیی هەن و ئەگەر نەیپێکا، پاداشتێکی هەیە، وەك لە فەرمایشتێکی صەحیحی پێغەمبەردا ﷺ دا هاتوە، کە دەفەرموێ:

**{إِذَا حَكَمَ الْحَاكِمُ فَاجْتَهَدَ ثُمَّ أَصَابَ فَلَهُ أَجْرَانِ، وَإِذَا حَكَمَ فَاجْتَهَدَ ثُمَّ أَخْطَأَ فَلَهُ أَجْرٌ}**
(**أخرجه البخاري: ٦٩١٩ ، ومسلم: ١٧١٦**).

واتـە: بابـای حوكمـڕان هـەر كاتـێ كۆششـی كـرد، (ئیجتهـادی كـرد و عەقڵـی خـۆی بەكارهێنـا) پاشـان پێـكای، دوو پاداشـتی هـەن و، ئەگـەر كۆشـشی كـردو نەیپێـكا، پاداشـتێكی هـەر هەیـە.

كەواتـە: لـە بـواری كۆششـكردن دا سـزادان هـەر لـە ئـارادا نیـە، بـەڵام مەبەسـت لـە سـزادانی ژیـان و مـردن، لـە كاتی مەیلكردنـی پێغەمبەر ﷺ بـە لایاندا، مەبەسـت، ئەو بـەڵا و گرفتارییانەن، كـە بـە هـۆی هەڵـە و كـەم و كوڕییەكانـەوە، كە مـرۆڤ تووشـیان دەبێ، بەسـەری دێن.

چونكـە مـرۆڤ هەرچەنـدە نیـاز و مەبەسـتی بـاش بـێ، بـەڵام كـە نەیپێـكا، تووشـی دەرەنجامێكـی خـراپ دێ، مـادام لـەو كۆششـكردنەی نەپێكابـێ، بـەڵام خـوا ﷻ پێغەمبـەری ﷺ دامەزرانـدوە و، چەسـپاندوە، كۆششـێك و ئیجتهادێكـی هەڵـە نـەكات، كـە دوایـی باجەكـەی بـدات[1]، هـەم لـە ژیانـی دنیـادا و هـەم لـە كاتـی مەرگیشـدا.

ئەمـەش ڕایەكـە (**محمـد الطاهـر ابـن عاشـور**)، هێناویەتـی، بـەڵام پێـم پەسـند نیـە، هـەر چەنـدە ناڵێـم هیـچ ڕێـی تێناچـێ، بـەڵام ڕای زۆربـەی زانایـان گونجاوتـر و ڕێكـترە.

٤)- كە دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ﴾، لێرەدا بۆ ڕیزبەندیی پلە پلەییە، چونكە دەرباز نەبوون لە سزا، گرنگترە لە پێ چێژتنی سزایەكە، لە پلەدا، بۆیە خوا ﷻ كە دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ لَا تَجِدُ لَكَ عَلَيْنَا نَصِيرًا﴾، دوایی تۆ لەسەر ئێمە هیچ یارمەتیدەر و سەرخەرت چنگ نەدەكەوتن، دیارە دەست نەكەوتنی یارمەتیدەر و سەرخەریش، گرنگترە، لە پێ چێژرانی سزا.

٥)- مرۆڤ هەتا پلەی بەرزتر بێ، ئەو بەڵایەی كە بەسەری دێ، یاخود ئەو سزایەی كە دەدرێ لەسەر سەرپێچییەكەی، مەزنتر دەبێ، وەك لە سوورەتی (**الأحزاب**)دا هاتوە: ﴿يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِيِّ مَن يَأْتِ مِنكُنَّ بِفَٰحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ يُضَٰعَفْ لَهَا ٱلْعَذَابُ ضِعْفَيْنِ ۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرًا ﴿٣٠﴾﴾، واتە: ئەی ئافرەتانی پێغەمبەر! ﷺ، هەر كامێك لە ئێوە، گوناهێكی ناقۆڵای ئاشكرا بكات، سزای بۆ دوو قات دەكرێتەوە، { یان: (سزای بۆ چەند بەرانبەر دەكرێتەوە} و ئەوەش لە لای خوا ئاسانە.

لەبـەر ئـەوە كـە مەقـام و پێگـەی هاوسـەرانی پێغەمبـەر ﷺ بەرزتر بـووە، بێگومـان ئەگەر سـەرپێچیی بكـەن، سزایەكەشـیان سـەختتر دەبـێ، جێـی سـەرنجە: كـە وشـەی ﴿بِفَٰحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ﴾، كـە هـەم لێـرەدا لـە سـوورەتی (**الأحـزاب**)دا هاتـوە، هـەم لـە سـوورەتی (**النسـاء**) دا هاتـوە، هـەم لـە سـوورەتی (**الطلاق**)یشـدا هاتـوە، زۆرێـك لـە توێژەوانـی قورئـان بـە زینـاو

---

(١) ئەمـە ڕاسـت نیـە و پێغەمبـەری خـوا ﷺ چەنـد جارێـك لـە ئیجتیهادەكـەی دا نەیپێـكاوە، بـەڵام خـوا بـۆی ڕاسـت كردۆتـەوە و، ئـەوەی دیلـەكانی جەنـگ و (إبـن أم مكتوم)یـش، نموونـە زەقـن لەوبـارەوە.

داوێـن پیسییان لێکداوەتـەوە، بـەڵام وەك لـە تەفسـیری سـوورەتی (**النساء**)دا باسـمکردووەو، ڕوونمکردۆتـەوە[1]، لـە هـەر سـێ شـوێنەکەدا ﴿ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖ ﴾، مەبەسـت پێـی سـەرپێچیکردنی ئافرەتـە لـە مێـردی و مەبەسـت پێـی یاخیبوونـی و، ئەوەیـە کە بە شـێوەیەك لەگـەڵ مێـردی دا ڕەفتـار بـکات، کـە مێردەکـەی نارەحـەت بـکات، بـێ فەرمانیـی بـکات و سـەرپێچیی لـێ بـکات و، لـە سـنووری شـەرع بچێتـە دەر، بـەڵام بـە تەئکیـد مەبەسـت پێـی داوێـن پیسـی نیـە، هـەر کەسـێك بـە وردیـی سـەرنجی ئـەو ئایەتانـە بـدا لـەو سیاقانەدا کـە تێیانـدا هاتـوون، لـەوە دڵنیـا دەبـێ کـە وشـەی (**فاحِشَة**)، کاتێـك لـە قورئانـدا بەکارهاتبێـت بـە موتڵەقیـی، مەبەسـت پـێ زینـا، یـان نێربازییـە، بـەڵام: ﴿ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖ ﴾، واتـە: گوناهێکـی ناقـۆڵای ئاشـکرا و ڕوون، مەبەسـت پێـی سـەرپێچیی ئافرەتـە لـە مێـردی.

لێـرەدا خـوا ﷻ زۆر بـە ڕوونیـی و ڕاشـکاویی ڕایگەیانـدوە کـە: پێغەمبـەر ﷺ تەنانـەت کەمێکیـش بـە لای کافرەکانـدا نەچـووە، تەنانـەت کەمێکیـش، بـەڵام بـە هـۆی ئـەوەوە کـە خـوا عـز وجـل پاراسـتوویەتی.

ئنجـا ئایـا مەبەسـت لـەو: کـەم بـە لادا چوونـە، چییـە؟ ئەوەیـە کـە پێغەمبـەری ﷺ ئیجتهادێـك کۆشـشێك بـکات، بـۆ بەرژەوەندیـی ئایینەکـەی، بـۆ بەرژوەندیـی گەیاندنـی پەیامەکـەی و، ئـەو ئیجتهـاد و کۆششـە پێغەمبـەر ﷺ تێیـدا نەپێکـێ.

بۆ نموونە:

**أ** - پێغەمبەر ﷺ لە ڕوو وەرچەرخاندنی دا لە عەبدوڵڵای کوڕی ئوممی مەکتووم، نەیپێکا و، خوای پەروەردگار ڕەخنەی لێ گرت وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ۝١ أَن جَآءَهُ ٱلۡأَعۡمَىٰ ۝٢ وَمَا يُدۡرِيكَ لَعَلَّهُۥ يَزَّكَّىٰٓ ۝٣ أَوۡ يَذَّكَّرُ فَتَنفَعَهُ ٱلذِّكۡرَىٰٓ ... ﴾ العبس (١ - ٨).

**ب** - هەروەها لە وەرگرتنی فەرەبوو لە دیلەکانی جەنگی بەدردا نەیپێکا، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسۡرَىٰ حَتَّىٰ يُثۡخِنَ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ ... ۝٦٧ ﴾ الأنفال.

**ج** - هەروەها لە مۆڵەتدانی دا، بە دڵ نەخۆشەکان لە جەنگی تەبووکدا، نەیپێکا، ﴿ عَفَا ٱللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمۡ ۝٤٣ ﴾التوبة، بەڵام هەموو ئەو نەپێکانانە کە بە هۆی کۆششکردنەوە بوون و، بۆشی هەبووە کە کۆشش بکات، ئەوە نەبووە کە ڕێك دیاربێ سەرپێچییە لە فەرمانیی خوا، هەڵبەتە خوا ﷻ هەر بۆی ڕاست کردۆتەوە و جارجاریش سەرزەنشتێکی سووکی کردوە و ئاگاداری کردۆتەوە کە نەدەبوو وابووایە.

---

(١) هەروەها لە تەفسیری سوورەتی (الأحزاب)یش دا.

## مەسەلەی دووەم:

**خوا بە پێغەمبەرەکەی خۆی ﷺ فەرمووە: نیزیك بوو کافرەکان بێزارت بکەن و ناچارت بکەن، تاکو لەسەر زەمینی مەککە دەرت بکەن، ئەو کاتەش کەمێك نەبێ پاش تۆ، لێی نەدەمانەوە، ئەوەش یاسای خوایە لە ژیانی پێغەمبەرانماندا، کە لە پێش تۆ ناردوومانن و، لادانیش بۆ یاسای خوا نابینی:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِن كَادُوا۟ لَيَسْتَفِزُّونَكَ مِنَ ٱلْأَرْضِ لِيُخْرِجُوكَ مِنْهَا ۖ وَإِذًا لَّا يَلْبَثُونَ خِلَـٰفَكَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٧٦﴾ سُنَّةَ مَن قَدْ أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ مِن رُّسُلِنَا ۖ وَلَا تَجِدُ لِسُنَّتِنَا تَحْوِيلًا ﴿٧٧﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ وَإِن كَادُوا۟ لَيَسْتَفِزُّونَكَ مِنَ ٱلْأَرْضِ ﴾، (ئەی موحەممەد!) نیزیك بوو بێبڕوایەکان بێزارت بکەن و هەڵتپێچن و هەڵتستێنن لە زەوی، دەگوترێ: (**فَزَّ: أَي بَارَحَ المَكَانَ**)، شوێنەکەی خۆی بەجێهێشت، (**الإِسْتِفْزَازُ: الحَمْلُ عَلَى التَّرَحُّلِ**)، (**إِسْتِفْزَازُ**)، بریتیە لەوە کە تۆ کەسێك ناچار بکەی شوێنەکەی بەجێ بهێڵێ.

کە دەفەرموێ: ﴿ لَيَسْتَفِزُّونَكَ مِنَ ٱلْأَرْضِ ﴾، (**ال**)ی سەر (ٱلْأَرْضِ)، بۆ ناساندن (**تعريف**)ی (**عهد**)ە، زەوییەکەت ئەو زەوییەی خۆت، یاخود زەوییەك کە تێیدا نیشتەجێی، کە شاری مەککەیە، نیزیك بوو بێزارت بکەن و ناچارتبکەن و لەسەر زەوی هەڵتستێنن، بۆچی؟

٢)- ﴿ لِيُخْرِجُوكَ مِنْهَا ﴾، تاکو لەوێت دەربکەن، ﴿ لِيُخْرِجُوكَ مِنْهَا ﴾، ئەمە: (**تَعْلِيلٌ للإِسْتِفْزَازِ**)، هۆکار هێنانەوەی هەڵسانەکەیە، یانی: بێزار و ناچار و جاڕزت دەکەن، تاکو تۆ لەوێ وەدەرنێن.

٣)- ﴿ وَإِذًا لَّا يَلْبَثُونَ خِلَـٰفَكَ إِلَّا قَلِيلًا ﴾، ئنجا ئەگەر واشیان کردبایە، کەمێك نەبێ لە دوای تۆ نەدەمانەوە.

(خِلَـٰفَكَ )، خوێنراویشەتەوە: (**خَلْفَكَ**)، (**خَلْفَكَ: أَي: بَعْدَكَ، وَأَصْلُ الخَلْفِ: الوَرَاءُ فَاسْتُعْمِلَ مَجَازاً فِي البَعْدِيَةِ**)، وشەی (**خَلْفَ**)، واتە: پشتەوە، بەڵام بە مەجاز بەکارهێنراوە بۆ دوایی، لە ڕووی کات (**زمن**)ەوە.

پێشتر گوتمان: (لَبِثَ)، واتە: مایەوە، (لَّا يَلْبَثُونَ خِلَٰفَكَ )، واتە: دوای تۆ نامێننەوە لەو شوێنەدا، لە شاری مەککەدا، مەگەر کەمێك، (إذاً) (إِذًا: ظَرْفُ لِلزّمَانِ وتَنْوِينُهَا عِوَضٌ عَنْ جُمْلَةٍ مَحْذُوفَةَ وَالتَّقْدِيرُ: إِذَا أَخْرَجُوكَ لا يَلْبَثُونَ بَعْدَك..)، (إذا)، زەرفە بۆ کات، کاتێك کە شتێکی تێدا ئەنجامدراوە، تەنوینەکەش کە خراوەتە سەری، (إذاً)، ئەوە قەرەبووی ڕستەیەکی قرتێنراوە، کە ماناکەی ئاوای لێدێتەوە: ئەگەر تۆیان وەدەر نابایە، کەمێك نەبێ، لە دوای تۆ نەدەمانەوە.

ئێمە دوایی چەند سەرنجێك لەسەر ئەو ئایەتە دەدەین و، زیاتر ماناکەی شی دەکەینەوە.

٤)- ﴿ سُنَّةَ مَن قَدْ أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ مِن رُّسُلِنَا ﴾، (السُّنَّةُ: العَادَةُ وَالسِّيرَةُ الَّتِي يَلْتَزِمُهَا صَاحِبُهَا)، ( سُنَّةَ )، بریتیە لەو نەریت و شێوە ژیانەی کە خاوەنەکەی پێوە پابەنددەبێ.

لە ڕاستیی دا (سنة)، یانی یاسا، هەڵبەتە یاساش عادەتێکە دووبارە دەبێتەوە و بەردەوامە، واتە: ئا ئەوە کە لە دوای تۆ جگە لە کەمێك نەدەمانەوە، ئەگەر تۆیان وەدەر نابایە، ئەوە یاسای خوایە، لە ژیانی ئەو پێغەمبەرانەدا کە پێش تۆ ناردوومانن، یانی: بە نسبەت ئەوانیشەوە، هەر بەو یاسایە مامەڵەمان کردوە، لەگەڵ کافرە ناحەز و دوژمنەکان، کە پێغەمبەرانیان وەدەرناوەو دەرکردوە لە نیشتیمان و زێدی خۆیان: ئەویش ئەوەیەکە: سزامان داون.

٥)- ﴿ وَلَا تَجِدُ لِسُنَّتِنَا تَحْوِيلًا ﴾، هەروەها تۆ لادان نابینی، بۆ یاسای ئێمە، ئەمە ڕستەیەکە نێواخن کراوە، بۆ ئەوەی تەواو ڕوونی بکاتەوە، کەواتە: ئەمە یاسای خوایە، لە پێغەمبەرانێکدا کە لە پێش تۆدا ڕەوانەمان کردوون، هەر بەو شێوەی مامەڵەمان کردوە لەگەڵ نەیارەکانیاندا، ئنجا تۆ لادانیش نابینی بۆ یاسای خوا، یاسای خوا ناگۆڕێ و لانادرێ لە کەس و، هیچ کەس مافی ڤیتۆی لە بەرانبەر یاساکانی خوادا نیە.

## چوار سەرنجی کورت لەسەر ئەو دوو ئایەتە:

١)- کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِن كَادُوا لَيَسْتَفِزُّونَكَ مِنَ الْأَرْضِ لِيُخْرِجُوكَ مِنْهَا ﴾، ئەمە ئاماژەی تێدایە بەوە کە پێغەمبەر ﷺ لە مەککە دەچێتە دەر و، ئەوان ناچاری دەکەن مەککە بەجێ بهێڵێ، واتە: دەبنە هۆکاری چوونە دەری لە مەککە و کۆچکردنی.

هەروەها ئاماژەشە بەوە: کە دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ ناچار دەبێ، شاری مەککە بەجێ بهێڵێ، ناحەزەکانی کەمێك نەبێ نامێننەوە و ئەوەش ڕوویدا، چونکە لە جەنگی بەدردا حەفتا (٧٠) لە سەرانیان، لە نێویاندا ئەبوو جەهل و نەضری کوڕی حارث و ئومەییەی کوڕی خەلەف و، عوتبە و شەیبەی کوڕانی ڕەبیعە و زۆرێك لە زلەزلەکان، کوژران، کەواتە: بە سەلامەتیی نەمانەوە لە مەککەدا، چونکە حەفتایان لێ کوژرا و حەفتاشیان لێ بەدیل گیرا و، ماڵوێرانییەکی زۆریان بەسەرهات.

دەشگونجێ مەبەست ئەوەبێ، کە دەفەرموێ: ﴿وَإِذًا لَّا يَلْبَثُونَ خِلَٰفَكَ إِلَّا قَلِيلًا﴾، واتە: ئەگەر تۆ وەدەر بنێن لە شاری مەککە، لە دوای تۆ کەمێك نەبێ نامێننەوە، بەڵکو خوا وەك چۆن گەلانی پێشووی بنبڕکردوە، ئەو گەل و خەڵکەی تۆش، کە شاربەدەرت دەکەن و ناچاری کۆچکردنت دەکەن، ئاوا بنبڕیان دەکات، بەڵام لەبەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بە ویستی ئازادانەی خۆی شاری مەککەی بە جێهێشت، نەك ئەوان هەڵیپێچن و بڵێن: وەرە دەبێ بڕۆی، بۆیە خوا ئەو خەڵکەی سزا نەدا، بە سزایەکی بنبڕکەر، ئەوەش مانایەکی دیکەیەتی، کە وەك لە مانا گشتییەکەش دا گوتمان، ئەم ئایەتە موبارەکە هەردووك ماناکەی، لەگەڵ حاڵەت و ژیانی پێغەمبەردا ﷺ دەگونجێن.

دەگونجێ بڵێین: کەمێك نەبێ نەمانەوە لە دوای پێغەمبەر ﷺ، واتە: بە سەلامەتیی نەمانەوە، چونکە زلەزلەکانیان هەموویان کوژران یان بەدیل گیران لە جەنگی بەدردا، کەواتە: بە سەلامەتیی نەمانەوە، بەڵکو دڕکیان نەما و لووتیان شکێنرا.

دەشگونجێ بڵێین: خوا ﷻ فەرموویەتی: ئەگەر ئەوان دەرتبکەن، کەمێك نەبێ لە دوای تۆ نامێننەوە، بەڵام بۆیە مانەوە و بنبڕ نەکران، چونکە پێغەمبەریان ﷺ دەرنەکرد، بەڵکو بە ویستی ئازادانەی خۆی شاری مەککەی بەجێهێشت، هەردووك واتایەکان گونجاون.

٢)- کە دەفەرموێ: ﴿سُنَّةَ مَن قَدْ أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ مِن رُّسُلِنَا﴾ پسپۆڕان گوتوویانە: (**جُمْلَةٌ مُسْتَأْنَفَةٌ اسْتِئْنَافاً بَيَانِياً لِبَيَانِ سَبَبِ كَوْنِ لُبْثِهِم بَعْدَهُ قَلِيلاً**)، واتە: ئەمە ڕستەیەکە کە دەست پێدەکات، دەست پێکردنێکی ڕوونکردنەوە، تاکو هۆی ئەوە ڕوونبکاتەوە، کە بۆچی کەمێك نەبێ لە دوای پێغەمبەرەوە ﷺ نامێننەوە؟ واتە: کەمێك نەبێ نامێننەوە بە سەلامەتیی، لەسەر مانای یەکەمیان، یاخود کەمێك نەبێ نامێننەوە کە بنبڕ نەکرێن، لەسەر مانای دووەمیان.

ئەویش ئەوەیە کە ئەمە: عادەت و یاسای نەگۆڕی خوای کارزانە.

٣)- کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَجِدُ ﴾، ئەمە وەك پسپۆڕانی زمان دەڵێن: زێدەڕۆییە، لە لابردن (نفي)دا، ﴿ وَلَا تَجِدُ لِسُنَّتِنَا تَحْوِيلًا ﴾، یانی: لادانت بۆ یاسای ئێمە چنگ ناکەوێ. هەروەها دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَجِدُ أَكْثَرَهُمْ شَٰكِرِينَ ﴿١٧﴾ ﴾الأعراف، واتە: زۆربەیانت شوکرانە بژێر و سوپاسگوزار دەست ناکەوێ.

چونکە ئەگەر خوا ﷻ بفەرموێ: یاسای ئێمە ناگۆڕێ، ئەوە هەر ئەوە دەگەیەنێ، کە ناگۆڕێ، بەڵام کە بفەرموێ: ﴿ وَلَا تَجِدُ لِسُنَّتِنَا تَحْوِيلًا ﴾، یانی: هەرچەندە زۆر بگەڕێی و سۆراغ بکەی و بپشکنی، هەوڵبدەی، گۆڕانێك و لادانێك بۆ یاسای ئێمە نابینی.

هەروەها بەنسبەت ڕستەکەی دیکەیشەوە: یانی: هەرچەندە سۆراغ بکەی و بپشکنی، زۆربەیانت سوپاسگوزار چنگ ناکەوێ.

٤)- (**التَحْوِيلُ: تَغَيِيرُ الحَالِ، وَهُوَ التَّبْدِيْلُ**)، (**تحويل**) بریتیە لە گۆڕانی حاڵ، یاخود بریتیە لە گۆڕین و لادان، ئنجا هەر بۆ ئەوەی بزانرێ: لە تەفسیرەکاندا چی هاتوە! هەرچەندە ئەو دوو گێڕدراوەیەم بە دڵ نین، بەڵام دەیانهێنم:

أ)- {**عَنْ سَعِيدِ بْنُ جُبَيرٍ رَحِمَهُ اللَّه قَالَ المُشْرِكُوْنَ لِلنَّبِيّ ﷺ: كَانَتِ الأَنْبِيَاءُ يَسْكُنُونَ الشَّامَ، فَمَالَكَ والمَدِيْنَة؟ فَهَمَّ أَنْ يَشْخَصَ فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى:** ﴿ وَإِن كَادُواْ لَيَسْتَفِزُّونَكَ مِنَ ٱلْأَرْضِ ﴾}(**أخرجه السيوطي في (لباب النقول في أسباب): ص١٣٩، ، وقال مؤلِّفا الإستيعاب: سنده ضعيف) ج٢، ص٤٥٢**).

واتە: سەعیدی کوڕی جوبەیر، کە یەکێکە لە زانایانی شوێنکەوتووانی هاوەڵان، (تابعین)، دەڵێ: هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان بە پێغەمبەریان ﷺ گوت: پێغەمبەران زیاتر لە شام نیشتەجێ دەبوون، تۆ چیتە لێرە لە مەدینە! ئەویش ویستی بچێ بۆ ئەوێ (یانی: بۆشام) بەڵام خوای بەرز ئەم ئایەتەی بۆ نادرە خوار.

کە بە تەئکید وەك سەنەدەی بێهێزە، نێوەڕۆکەکەشی هەر بێهێزە، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ لەوە ژیرتر بووە، بە قسەی هەندێك لە موشریکەکان هەڵخەڵەتێ، پاشان موشریکەکان لە مەککە بوون، بەڵام ئەمە باسی مەدینە دەکات، سوورەتەکەش سوورەتێکی مەککەییە.

ب)- {عَنْ الحَضْرَمِيِّ: أَنَّهُ بَلَغَهُ أنَ بَعْضَ اليَهُودِ قَالَ للنَّبِيّ: إنَّ أَرْضَ الأَنْبِيَاءِ أَرْضُ الشَّامِ، وَإنَ هَذِهِ لَيْسَتْ بِأَرْضِ الأَنْبِيَاءِ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ: ﴿ وَإِن كَادُوا۟ لَيَسْتَفِزُّونَكَ مِنَ ٱلْأَرْضِ ﴾}(أَخْرَجَهُ الطَّبري: ج١٥، ص٩٠ و ٨٩، وقال مؤلِّفا الإستيعاب[1]: سنده ضعيف).

واتـە: حەضرەمیـی دەڵـێ: پێمگەیشـتوە کـە هەندێـك لـە جوولەکـەکان بـە پێغەمبەریـان ﷺ گـوت: سـەرزەمینی شـام، سـەرزەمینی پێغەمبەرانـە، ئێـرە، (واتـە: ئـەم شـاری مەککـە) سـەرزەمینی پێغەمبـەران نیـە، (واتـە: ئێـرە بـە جـێ بهێڵـە و بچـۆ بـۆ شـام، گوایـە دەبـێ پێغەمبەریـش ﷺ وەك لـە ڕیوایەتـی پێشـێدا هاتـوە، بـە دڵیـدا هاتبـێ، شـتێکی وا بـکات!).

بەڵام خوای پەروەردگار ئەو ئایەتەی بۆ ناردۆتە خوار!

کـە بـە تەئکیـد ئـەو دوو گێڕدراوەیـە، هـەم لەگـەڵ نێوەڕۆکـی ئایەتـەکان دا ناگونجێـن، هـەم لەگـەڵ کەسـایەتیی بـەرز و نـاوازەی پێغەمبـەر ﷺ، عەقـڵ و تێگەیشـتنی دا کـە لـە لووتکـەدا بـووە.



(١) ج٢، ص٤٥٢.

### مەسەلەی سێیەم:

**خـوا فەرمانـی بـە پێغەمبـەر ﷺ کـردوە: لـە کاتـی لادانـی خـۆرەوە لـە نێوەڕاسـتی ئاسـمانێ، نوێـژ بەرپابکـە، هەتـا تاریکیـی شـەو، هەروەهـا قورئانـی نوێـژی بەیانییـش بخوێنـە، بێگومـان قورئـان خوێندنـی نوێـژی بەیانیـی لـەلا ئامادە بـووە {فریشـتەکان لـە لای ئامادە دەبـن} لـە شەوێشـدا شـەونوێژ بـە قورئـان خوێنـدن بکـە، ئـەوە زیادەیەکـە تایبـەت بـە تـۆ، نیزیکـە پـەروەردگارت پـاش زیندووکرانـەوەت، پێگـەی ستایشـکراوت پـێ ببەخشـێ:**

﴿ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِدُلُوكِ ٱلشَّمْسِ إِلَىٰ غَسَقِ ٱلَّيْلِ وَقُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ إِنَّ قُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ كَانَ مَشْهُودًا ﴿٧٨﴾ وَمِنَ ٱلَّيْلِ فَتَهَجَّدْ بِهِۦ نَافِلَةً لَّكَ عَسَىٰٓ أَن يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَّحْمُودًا ﴿٧٩﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە هەشت بڕگەدا:

١)- ﴿ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِدُلُوكِ ٱلشَّمْسِ ﴾، نوێژ بەرپابکە لە کاتێکدا کە خۆر لادەدا، (**الدُّلُوكُ: زَوَالُ الشَّمْسِ عَنْ كَبِدِ السَّمَاءِ، واللاَّمُ لامُ التَّوْقِيْت بِمَعْنَى: عِنْدَ**)، (**دُلُوك**)، بریتیە لە لادانی خۆر لە نێوەڕاستی ئاسمان {هەندێکیشیان گوتوویانە: (**الدُّلُوكِ: الغُرُوْبُ**)، واتە: ئاوابوون} (**ل**)کەش کە دەفەرموێ: ﴿ لِدُلُوكِ ٱلشَّمْسِ ﴾، لامی دیارییکردنی کاتە، یانی: لەلای، لە نیزیکی.

٢)- ﴿ إِلَىٰ غَسَقِ ٱلَّيْلِ ﴾، تاکو تاریکایی شەو (**الغَسَقُ: الظُّلْمَةُ**)، (**غَسَقْ**)، بە مانای تاریکیی دێ، واتە: تاکو شەو تاریك دادێ، تۆ نوێژ بەرپابکە، کە وەك پێشتر گوتمان: ئەمە ئاماژەیە بە کاتی چوار نوێژەکان، نوێژی نیوەڕۆ، کە خۆر تۆزێك لە نێوە ڕاستی ئاسمان لادەدا، نوێژی عەسر، کە خۆر زیاتر لادەدا، پاشان نوێژی شێوان، کە خۆر بە تەواویی ئاوا دەبێ و، نوێژی خەوتنان، کە شەو تاریك دادێ.

٣)- ﴿ وَقُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ ﴾، هەروەها قورئان خوێندنی نوێژی بەیانییش، گرنگیی پێ بدە، ﴿ وَقُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ ﴾، بە چی مەنصووبە؟ دەڵێ: (**أي: أَقِمْ قُرْآنَ الفجر**)، واتە: قورئان خوێندنی نوێژی بەیانیی بەرپابکە، واتە: نوێژی پێ بکە، ئەمە بۆ ئەوەیە کە بزانرێ هەموو نوێژێك دەبێ قورئانی تێدا بخوێندرێ، بەڵام بە تایبەت لێرەدا باسی قورئان خوێندنی نوێژی بەیانیی کردوە، لەبەر ئەوەی کاتی نوێژی بەیانیی، کاتێك کە دنیا کش و ماتە، ئەو قورئانەی تێیدا دەخوێنرێ، باشتر دەبیسترێ و، لە دڵ و عەقڵی خوێنەر و، بیسەرەکانیش دا باشتر جێگیر دەبێ، سوننەتیشە

قورئان زیاتر له نوێژی بەیانییدا بخوێندرێ، بۆیه بە تایبەت ئەوە باسکراوە، بەڵام ئەوە ئاماژەشه که نوێژەکانی دیکەش، دەبێ قورئانیان تێدا بخوێنرێ، وەك دوایی باسی دەکەین.

٤)- ﴿ إِنَّ قُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ كَانَ مَشْهُودًا ﴾، بێگومان قورئان خوێندنی نوێژی بەیانیی له لا ئامادەبوویه، (مَشْهُودًا)، (شَهِدَ أي: حَضَرَ)، ئامادەبوو، (شَهِدَ)، یانی: بینی، که واته: (مشهود) یانی: بینراو، یان: لەلا ئامادەبوو، ئەمەش: (إسْتِئْنَافٌ بَيَانِيٌّ لِوَجْهِ تَخْصِيصِ صَلَاةِ الصُّبْحِ بِاسْمِ القُرْآنِ، مَشْهُوداً أي مَحْضُوراً) ئەمە بۆ ڕوونکردنەوەی ئەوەیە که بۆچی نوێژی بەیانیی تایبەت کراوە بە ناوی قورئانەوە، تاکو بزانرێ: له بەر ئەوەیە که له نوێژی بەیانییدا فریشتەکان ئامادە دەبن.

٥)- ﴿ وَمِنَ ٱلَّيْلِ فَتَهَجَّدْ بِهِۦ ﴾، هەروەها له شەوگاریشدا بە هۆی قورئانەوە، شەونوێژ بکه، (تَهَجُّدْ: مُشْتَقٌّ مِنَ الهُجُودِ وَهُوَ النَّوْمُ، ومَادَةُ التَفَعُّلِ فِيهِ للإزَالَةِ مِثْلُ: التَحرُّجْ والتَأَثُّمْ)، پێشتر باسمان کرد که (تَهَجُّدْ)، له (هُجُودِ)ەوە هاتوە، (هُجُودَ)، هەم بە مانای خەو (نوم) دێ، هەم بە مانای له خەو هەڵسان و بێداریی (إستيقاظ)یش دێ، {هَجِدَ: نَامَ، إستيقظ}، بەڵام ماددەی (تفعّل) بۆ لابردنە، وەك (تَحرُّجْ)، واتە: لابردنی حەرەج، (تأثُّم)، واتە: لابردنی گوناه، کەواتە: (تَهَجُّدْ)، واتە: لابردنی خەو، که بریتیه له شەو بێداریی و شەونوێژ کردن.

٦)- ﴿ نَافِلَةً لَّكَ ﴾، یانی: (زِيَادَةً لَكَ على الصَّلَوَاتُ الخَمْسِ المَفْرُوضَةَ)، ئەمە زێدەییە بۆ تۆ له پێنج نوێژە فەرزەکان، واتە: زیادە بۆ تۆ دانراوە، ئنجا ئایا ئەو زیادەیە، فەرز بووە لەسەر پێغەمبەر ﷺ، یاخود سوننەت بووە؟ دوایی باسی دەکەین.

٧)- ﴿ عَسَىٰٓ أَن يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَّحْمُودًا ﴿٧٩﴾ ﴾ نیزیکه پەروەردگارت زیندووت بکاتەوە و پێگەی ستایشکراوت پێ ببەخشێ، (الرَّجَاءُ مِنَ اللهِ وَعْدٌ، أي: لِيَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَاماً مَحْمُوداً)، وەك دەڵێن: (الكَريمُ إِذَا أَطْمَعَ أَعْطَى)، بەخشەر، ئەگەر کەسێکی ئومێدەوار کرد، پێی دەبەخشێ.

لێرەدا خوا دەفەرموێ: نیزیکە، ڕەنگە، لەوانەیە پەروەردگارت زیندووت بکاتەوە و پێگەی ستایشکراوت پێ ببەخشێ، کەواتە: ئەمە بەڵێنە لە لایەن خواوە، واتە: بۆ ئەوەی کە خوا ئەوەت پێ ببەخشێ، بەو جۆرەی گوترا خوا بپەرستە.

٨)- ﴿ مَقَامًا مَّحْمُودًا ﴾، (المَقَامُ: مَحَلُ القِيَامِ، وَالمُرَادُ بِهِ المَكَانُ المَعْدُوُد لأَمْرٍ عَظِيْمٍ، وَهُوَ وَصْفٌ مَجَازِيٌّ، لأَنَّ المَحْمُودَ مَنْ يَقُوُمُ فِيهِ)، (مقام)، شوێنی هەڵسان و ڕاوەستانە و، مەبەست پێی ئەو شوێنەیە کە ئامادە کراوە بۆ کارێکی مەزن، کە ئەوەش وەصفێکی مەجازییە، چونکە: ئەوەی ستایش دەکرێ، ئەو کەسەیە کە لەو شوێنە دەوەستێ، لەو پێگەیەدا دەوەستێ، نەك خودی شوێنەکە.

## کورتە باسێک: چوار بابەتی گرنگ

هەر لەبەر ڕۆشنایی ئەم دوو ئایەتەی (٧٨و ٧٩)دا، ئێمە چوار بابەتی گرنگ دەخەینە ڕوو، بۆ زیاتر تیشك خستنە سەر نێوەڕۆك و چەمك و واتای، ئەو دوو ئایەتە موبارەکە، ئەو دوو ئایەتەش، ئەمە دەقەکەیانە:

خوا دەفەرموێ: ﴿ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِدُلُوكِ ٱلشَّمْسِ إِلَىٰ غَسَقِ ٱلَّيْلِ وَقُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ إِنَّ قُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ كَانَ مَشْهُودًا ﴿٧٨﴾ وَمِنَ ٱلَّيْلِ فَتَهَجَّدْ بِهِۦ نَافِلَةً لَّكَ عَسَىٰٓ أَن يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَّحْمُودًا ﴿٧٩﴾ ﴾.

### بابەتی یەکەم: گرنگیی و پێویستی خواپەرستیی، بۆ خۆڕاگریی لە بەردەم ئاستەنگ و کێشە و گرفتەکاندا:

١)- لێرەدا خوا ﷻ پاش باسکردنی فێڵ و پیلانی دوژمنانی پێغەمبەر ﷺ، کە هەوڵ و تەقەللایان داوە بێزاری بکەن و، وفشاری لێ بکەن و، ناچاری بکەن: شار و سەر زەمینەکەی خۆی کە مەککەیە بەجێی بهێڵێ، دوای ئەوە، فەرمان بە پێغەمبەر ﷺ، دەکات، کە نوێژ بەرپا بکات، پێنج نوێژە فەرزەکان، هەروەها شەو نوێژیش بکات، زیادە لە پێنج فەرزەکان.

ئەمەش ئەوەی لێ وەردەگیرێ، کە بۆ خۆڕاگریی و دامەزراویی لە بەردەم کێشە و گرفت و، تەنگ و چەڵەمە و، نارەحەتییەکانی کە زادە و بەرهەمی پیلان و فێڵ و تەڵەکەی دوژمنان و ناحەزانن، باشترین هۆکار بۆ دامەزراویی و نەلەخشاویی، بریتییە لە پتەوکردن و توند و تۆڵکردنی پەیوەندیی بەندایەتیی لەگەڵ خوای بەرزی بێ وێنەدا، لە زۆر شوێنی قورئاندا، ئەو ڕاستییە هاتوە، هەروەها لە فەرمایشتی پێغەمبەریشدا ﷺ هاتوە، بۆ وێنە:

١ - ئایەتەکانی (٧٨ - ٧٩)ی سوورەتی (**الإسراء**).

٢ - ئایەتەکانی: (٩٧ - ٩٨ - ٩٩)ی سوورەتی (**الحجر**)، واتە: سێ (٣) ئایەتی کۆتایی سوورەتی (**الحجر**)، کە پێشتر تەفسیرمان کردوون، خوای پەروەردگار هەمان ئەو ڕاستییە مەزنە دووبارە دەکاتەوە، کە بۆ خۆڕاگریی لە بەردەم پیلانی ناحەزاندا، پێویستە مرۆڤ خواپەرستیی خۆی، بەندایەتیی خۆی، بۆ خوا تۆختر بکات و قووڵتر بکاتەوە، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّكَ

يَضِيقُ صَدْرُكَ بِمَا يَقُولُونَ ﴿٩٧﴾ فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَكُن مِّنَ ٱلسَّٰجِدِينَ ﴿٩٨﴾ وَٱعْبُدْ رَبَّكَ حَتَّىٰ يَأْتِيَكَ ٱلْيَقِينُ ﴿٩٩﴾ ﴾.

واتـە: بـە دڵنیایـی ئێمـە دەزانیـن کـە تـۆ سـینەت تەنـگ دەبـێ بـەوەی کـە دەیڵێـن، (بۆیـە) بـە ستایشـکردنی پەروەردگارتـەوە، بـە پاکیـی بگـرە، {واتـە: زۆر (**سـبحان اللـّە**) و (**الحمداللّە**) بکـە، پـەروەردگارت بـە پـاك بگـرە و ستایشـی بکـە}، هەروەهـا لـە کڕنـووش بـۆ خـوا بـەران بـە، {واتـە: زۆر نوێـژ بکـە} و پـەروەردگاری خـۆت بپەرسـتە، تاکـو یەقینـت بـۆ دێ. {کـە بـە تەئکیـد مەبەسـت پێـی ئـەو مردنەیـە، کـە هیـچ کـەس گومانـی تێیـدا نیـە}.

٣)- شوێنێکی دیکە کە خوا ئەو ڕاستییەی تێدا خستۆتە ڕوو، ئایەتی (٤٥)ی سوورەتی (**البقرة**) یە، کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱسْتَعِينُوا۟ بِٱلصَّبْرِ وَٱلصَّلَوٰةِ ﴿٤٥﴾ ﴾، واتە: یارمەتیی وەربگرن لە خۆڕاگریی و لە نوێژ.

واتـە: هەوڵبـدەن سـیفەتی خۆڕاگریـی لـە خۆتانـدا بێننـە دی، داوای یارمەتیـی و هاوکاریـی لـە خۆڕاگریـی بکـەن و داوای یارمەتیـی لـە نوێـژ بکـەن. بـۆ ئـەوەی نەلەخشـا و دامەزراوبـن لـە دینداریتانـدا، لـە خواپەرسـتیی و لـە گرتنـی ڕاسـتە شـەقامیی خـوای پـەروەردگاردا و، لـە بەرانبـەر کێشـمە کێـش و گرفـت و، نارەحەتییـەکان دا، کـە ناحەزانتـان بۆتـان دێننـە پێـش.

٤)- شوێنێکی دیکەش، ئایەتی ژمارە سێ (٣)ی سوورەتی (**طه**)یە، کە دەفەرموێ: ﴿ فَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ ٱلشَّمْسِ وَقَبْلَ غُرُوبِهَا ۖ وَمِنْ ءَانَآئِ ٱلَّيْلِ فَسَبِّحْ وَأَطْرَافَ ٱلنَّهَارِ لَعَلَّكَ تَرْضَىٰ ﴿١٣٠﴾ ﴾.

واتـە: دەجـا خۆڕاگربـە لەسـەر ئـەوەی دەیڵێـن و، پـەروەردگارت بـە پـاك بگـرە بـە ستایشـکردنیەوە، بـەر لـە خۆرهەڵاتـن و لـە پێـش ئاوابوونـی دا، هەروەهـا لـە کاتەکانـی شـەوگاردا، پـەروەردگارت بـە پـاك بگـرە و لەمـلا ولای ڕۆژگاریشـدا، بـە پاکـی بگـرە، بەڵکـو ڕازیبـی.

واتـە: بەڵکـو لـە ئەنجامـی خـوا بـە پاکڕاگرتـن و ستایشـکردنت دا، بـۆ خـواو، لـە ئەنجامـی بەندایەتیـی کردنـی چاکـت دا، بـۆ خـوا، لـە کاتەکانی شـەوو لـە کاتەکانـی ڕۆژدا، بە شـێوەیەك دینداریـی بکـەی و بەندایەتیـی بـۆ خـوا ئەنجـام بـدەی، کـە لـە کـردو کۆششـی خـۆت و لـە بەرهەمـی کۆششـی خـۆت ڕازیبـی.

٥)- شوێنێکی دیکە، ئایەتەکانی: (٢٤ - ٢٥ - ٢٦)ی سوورەتی (**الإنسان**)ن، کە دەفەرموێ: ﴿ فَاصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ وَلَا تُطِعْ مِنْهُمْ ءَاثِمًا أَوْ كَفُورًا ﴿٢٤﴾ وَاذْكُرِ اسْمَ رَبِّكَ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴿٢٥﴾ وَمِنَ اللَّيْلِ فَاسْجُدْ لَهُ وَسَبِّحْهُ لَيْلًا طَوِيلًا ﴿٢٦﴾ ﴾.

واتە: دەجا خۆڕاگربە بۆ بڕیاری پەروەردگارت و، گوێڕایەڵیی هیچ گوناهبارێك و هیچ سپڵەیەك لەوان مەکە و، ناوی پەروەردگارت بێنە بەیانیان و ئێواران و، لە شەوگاریشدا کڕنووشی بۆ ببە و، شەوگارێکی دوور و درێژ خوا بە پاك بگرە.

کە بە تەئکید مەبەستی پێ ڕاز و نیاز و لێ پاڕانەوە و نوێژکردنە.

٦)- شوێنێکی دیکە، ئایەتی کۆتایی سوورەتی (**النحل**)ە، کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ اللَّهَ مَعَ الَّذِينَ اتَّقَوا وَّالَّذِينَ هُم مُّحْسِنُونَ ﴿١٢٨﴾ ﴾، واتە: بە دڵنیاییەوە خوا لەگەڵ ئەوانەیە، کە پارێزیان کردوە و لەگەڵ ئەوانەش دایە، کە چاکەکارن.

پارێزیان کردوە، یانی: لە هەموو ئەو شتانەی خوا پێی ناخۆشن، خۆیان پاراستوە، خواش بە گشتی دوو جۆرە شتی پێ ناخۆشن: ١- قەدەغەکانی بشکێنی، ٢- ئەرکەکانی بچوێنێ، چاکەکاریشن، یانی: هەم لە خواپەرستییاندا، هەم لە هەڵس و کەوتی ڕۆژانەیان لەگەڵ خەڵکدا، خوا لەگەڵ ئا ئەوانە دایە و، بە لەگەڵ دابوونێکی تایبەت، ئەگەرنا خوا بە گشتی لەگەڵ هەموو دروستکراوەکانی خۆی دایە.

٧)- شوێنێکی دیکە، ئایەتی سوورەتی (**آل عمران**)ە، فەرموویەتی: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ ءَامَنُوا اصْبِرُوا وَصَابِرُوا وَرَابِطُوا وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٢٠٠﴾ ﴾، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! خۆڕابگرن و، لە بەرانبەر ناڕەحەتییەکان خۆڕابگرن و، سەنگەر نشینیی بکەن و، پارێز لە خوا بکەن، بەڵکو سەرفرازبن.

٨)- وەك نموونەیەکیش ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ، دێنین: {عَنْ حُذَيْفَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا حَزَبَهُ أَمْرٌ، صَلَّى} (**أخرجه أبو داود: ١٣١٩ وَصَحَّحَهُ الألباني، وَضَعَّفَه شعيب الأرنؤوط**).

واتە: حوزەیفە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ عادەتی وا بووە، ئەگەر کارێك سەغڵەتی دەکرد و ناڕەحەت دەبوو، نوێژی دەکرد {واتە: بەندایەتیی بۆ خوا دەکرد}.

## بابەتی دووەم: دیارییکردنی کاتی پێنج نوێژە فەڕزەکان:

دیـاره ئایەتـی ژمـاره (٧٨) لـه سـووڕەتی (الإسراء)، کاتی پێنـج نوێـژه فـەڕزەکان ڕوون دەکاتـەوه، چونکـه پێنـج نوێـژه فـەڕزەکان، لـه سـەفەری شـەوڕۆیی و بەرزبوونـەوەی پێغەمبـەر ﷺ، بـۆ ئاسـمانەکاندا فەڕزکـران، وەك پێشـتر باسـمان کـرد، لـه دەرسـەکانی سـەرەتای تەفسـیرکردنی ئـەم سـووڕەتەدا، ئنجـا دوای ئـەوەی پێنـج نوێـژه فـەڕزەکان، واتـە: بەیانـی، نیـوەڕۆ، ئێـواران، شـێوان، خەوتنـان، فەڕزکـران، دەبـێ کاتەکانیـش دیاریـی بکرێـن، بۆیـه لـەم ئایەتـی ژمـاره (٧٨)ی سـووڕەتی (الإسراء)دا، کاتـی پێنـج نوێـژه فـەڕزەکان دیاریـی کـراوه، بـا سـەرنج بدەیـن چـۆن؟

١ -) خوا دەفەرموێ: ﴿ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِدُلُوكِ ٱلشَّمۡسِ ﴾، نوێژ بەرپا بکە، لەو کاتەدا کە خۆر لادەدا، ﴿ إِلَىٰ غَسَقِ ٱلَّيۡلِ ﴾، هەتا تاریکایی شەو، ﴿ وَقُرۡءَانَ ٱلۡفَجۡرِ ﴾، هەروەها قورئان خوێندنی نوێژی بەیانییش گرنگیی پێ بدە، کاتی هەر پێنج نوێژەکان بە کورتیی لێرەدا هەیە:

وشـەی (**دلـوك**)، دەگوتـرێ: (**دَلَكَـتِ الشَّـمْسُ فِي وَسَـطِ السَّـمَاءِ، فَهِـيَ دَالِـكٌ وَدَالِكَـةٌ**)، واتـه: خۆر لـه نێوەڕاسـتی ئاسـمان لای دا، ئنجـا: هـەم (**دَالِـكٌ**)ی بـۆ بـەکاردێ، هـەم (**دَالِكَـةٌ**)ش، واتـه: (**مَائِلَـة**) لاداو، ئنجـا ئـەم (**دلـوك**)ە، واتـه: لادانـی خـۆر لـه نێوەڕاسـتی ئاسـمان بـەرەو ڕۆژئـاوا، بـه سـێ واتایـان هاتـوه: (**زَوَالِ الشَّـمْسِ عَـنْ وَسَـطِ قَـوْسٍ فَـرَضِيٍّ فِي طَرِيـقِ مَسِـيرِهَا الْيَوْمِـيِّ، وَوَرَدَ بِمَعْنَـى: مَيْلُ الشَّـمْسِ عَـنْ مِقْـدَارِ ثَلَاثَـةِ أَرْبَـاعِ الْقَـوْسِ، وَهُـوَ وَقْـتُ الْعَصْرِ، وَوَرَدَ بِمَعْنَـى غُرُوبِهَـا، فَصَـارَ لَفْـظُ الدُّلُـوكِ، مُشْـتَرَكًا فِي الْمَعَـانِي الثَّلَاثَـةِ**)[1].

**یەك:** لادانی خۆر لە نێوەڕاستی ئاسمان لە کەوانەیەکی گریمانەییدا، {کەوانەیەکی گریمانەیی، واتە: ئەو کەوانەیە لە ئاسمان نیە، بەڵام گەردووناسان وەك گریمانە دایدەنێن}، لە ڕێی ڕۆیشتنی ڕۆژانەی خۆردا {لەبەر چاوی ئێمە، ئەگەر نا، زەوییە بە دەوری خۆیدا دەخولێتەوە لە بەرانبەر خۆردا، ئێمە وا دەزانین خۆر لە خۆرهەڵاتەوە دەچێ بۆ خۆرئاوا، بۆ چاوی ئێمە وا دیارە} کە تۆزێ لادەدا، ئەمە کاتی نوێژی نیوەڕۆیە.

**دوو:** واتای دووەمی (**دلوك**)، لادانی خۆرە لە ئەندازەی سێ لەسەر چواری (٣/٤)ی کەوانەیەك {کەوانەیەکی گریمانەیی} لە ڕێی ڕۆیشتنی ڕۆژانەیدا، کە ئەویش کاتی ئێوارەیە (**عَصْر**).

---

(١) التحرير والتنوير، ج١٥، ص١٨٢.

سێ: ئاوابوونی خۆر، کە ئەویش کاتی نوێژی شێوانە.

کەواتـە: وشـەی (لِدُلُوكِ)، ﴿ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِدُلُوكِ ٱلشَّمْسِ ﴾، پێشـتریش باسـمان کـرد کـە (ل)ی سـەر (لِدُلُوكِ)، لامـی تەوقیتـە، واتـە: (عِنْدَ دُلُوكِ الشَّمْسِ)، لـە کاتـی لادانـی خـۆردا، لـە نێوەڕاسـتی ئاسـمان، ئەمـە وشـەیەکە سـێ مانـای تێـدا هاوبەشـن:

١- خۆر تۆزێك لابدات کە نوێژی نیوەڕۆیە.

٢- خۆر بە ئەندازەی سێ لەسەر چوار (٤/٣)ی کەوانەیەك لابدات، کە نوێژی عەسرە.

٣- خۆر بە تەواویی لابدات و ئاوابێ کە نوێژی شێوانە.

٢)- کە دەفەرموێ: ﴿ إِلَىٰ غَسَقِ ٱلَّيْلِ ﴾، (وَالْغَسَقُ: الظُّلْمَةُ، وَهِيَ انْقِطَاعُ بَقَايَا شُعَاعِ الشَّمْسِ حِينَ يُمَاثِلُ سَوَادُ أُفُقِ الْغُرُوبِ، سَوَادَ بَقِيَّةِ الْأُفُقِ، وَهُوَ وَقْتُ غَيْبُوبَةِ الشَّفَقِ، وَذَلِكَ وَقْتَ الْعَشَاءِ)، وشەی (غَسَقِ)، واتە: تاریکیی کە بریتیە لە نەمانی پاشماوەکانی تیشکی خۆر، بە شێوەیەك کە تاریکایی ئاسۆی خۆرلێئاوابوون، لەگەڵ تاریکایی بەشەکانی دیکەی ئاسۆدا، یەکسان بێ، کە ئەویش بریتیە لە ونبوونی سوورایی بنی ئاسمان، (غَيْبُوبَةِ الشَّفَقِ)، کە ئەوەش کاتی نوێژی خەوتنانە.

٣)- ﴿ وَقُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ ﴾، (أَيْ أَقِمْ قُرْآنَ الفَجْرِ فِي الصَّلَاة)، قوڕئان خوێندنی بەیانیی بەرپابکە لە نوێژدا، ﴿ وَقُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ ﴾، دەڵێ: (مَنْصُوبٌ بِالْعَطْفِ عَلَى الصَّلَاةِ)، دەفەرموێ: ﴿ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾، (أَيْ أَقِمْ قُرْآنَ الفَجْرِ)، یانی: (قرآنَ الفجر) بۆیە (منصوب)ە چونکە گێڕراوەتەوە بۆ سەر: نوێژ بەرپابکە (أقم الصلاة) یانی: قوڕئانخوێندنی بەیانیی بەرپابکە، یاخود: (مَنْصُوبٌ عَلَى الإِغْرَاءِ أَيْ: عَلَيْكَ بِقُرْآنِ الفَجْرِ)، (عَلَيْكَ قُرْآنَ الفَجْرِ)، واتە: گرنگیی و بایەخ بدە بە قوڕئان خوێندنی بەیانیی.

کەواتـە: کـە دەفەرمـوێ: ﴿ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِدُلُوكِ ٱلشَّمْسِ ﴾، ئەمـە مەبەسـت تەنیـا مەبەسـت پێـی یـەك نوێـژ نیـە، بەڵکـو مەبەسـت: نوێژکردنـە لـە (دُلُوكِ)ەوە تاکـو (غَسَقْ)، لە تۆزێـك لادانـی خـۆرەوە لـە نێـوە ڕاسـتی ئاسـمان، هەتـا بـە تەواویـی ئـاوا دەبـێ، کـە ئەویـش کاتـەکانی ئەنجامدانـی هـەر چـوار نوێژەکانـی: نیـوەڕۆ و عەسر و شـێوان و خەوتنانـن، دواییش ﴿ وَقُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ ﴾، ئەویـش کاتـی نوێـژی پێنجەمـە، چونکـە (ٱلْفَجْرِ)، واتـە: شـەبەقی بەیـان، کـە تاریکیـی و ڕووناکیـی لێـك جیادەبنـەوە، بۆیـەش تەنیـا بـۆ نوێـژی بەیانیـی، باسـی قوڕئـان کـراوە، چونکـە لـە نوێـژی بەیانییـدا دنیـا کـش و ماتـە و لـە هەمـوو نوێژەکـەی

بەیانییـدا، دەنـگ بـە قورئـان خوێنـدن بـەرز دەکرێتـەوە، نـەك وەك نوێـژی خەوتنـان و شـێوان تەنیـا لـە دوو ڕکاتیـان دا دەنگـی پـێ بەرزبکرێتـەوە، یـان وەك نوێـژی نیـوەڕۆ و ئێـوارە (**عـصر**)، کـە لـە هیـچ ڕکاتێکیـان دا دەنـگ بـە قورئـان خوێنـدن بەرزنەکرێتـەوە، لـە نوێـژی بەیانییـدا، لـە هـەردوو ڕکاتەیـدا دەنـگ بـە قورئـان خوێنـدن بـەرز دەکرێتـەوە، چ سـوورەتی (**الفاتحـة**)، چ سـوورەتی دوای (**الفاتحـة**) {ئـەو سـوورەتانەی لـە دوای سـوورەتی (**الفاتحـة**)، دەخوێنرێـن} ئنجـا وەك لـە سـوننەتی پێغەمبـەردا ﷺ هاتـوە، پێغەمبـەری خـوا، ئەوەنـدە قورئانـەی کـە لـە نوێـژی بەیانیـدا خوێندوویەتـی لـە نوێژەکانـی دیکـەدا بـە گشـتی هێنـدەی قورئـان نەخوێنـدوە، کتێبـەکانی سـوننەت بۆمـان بـاس دەکـەن کـە: پێغەمبـەر ﷺ نوێـژی بەیانیـی قورئانـی زۆری تێـدا دەخوێنـد، هەروەهـا نوێـژی خەوتنـان، لـە دوای نوێـژی بەیانیـی، قورئانـی زۆری تێـدا خوێنـدوە، بـەڵام نوێـژی شـێوان بـە زۆریـی وا بـووە، کەمـی قورئانـی تێـدا خوێنـدوە، هـەر ڕکاتـە سـوورەتێکی کـورت، یـان چەنـد ئایەتێکـی کـەم، لەبـەر ئـەوەی کاتەکـەی کەمـە، دیسـان نوێـژی نیـوەڕۆش، زۆری قورئـان تێـدا خوێنـدوە، بـەڵام بـە دەنگـی نـزم، هەروەهـا نوێـژی ئێـوارە (**عصر**)یـش ئەویـش کەمـتر لـە نوێـژی نیـوەڕۆی تێـدا خوێـنراوە.

ئنجـا جگـە لـەو ئاماژەیـەی قورئـان، پێغەمبەریـش ﷺ لـە بـارەی کاتـی پێنـج نوێـژە فەرزەکانـەوە فەرمایشـتی هـەن، کـە مـن دووانیـان بـە نموونـە دێنمـەوە:

**١)- {نَزَلَ جِبْرِيلُ فَأَمَّنِي فَصَلَّيْتُ مَعَهُ، ثُمَّ صَلَّيْتَ مَعَهُ، ثُمَّ صَلَّيْتُ مَعَهُ، ثُمَّ صَلَّيْتَ مَعَهُ، ثُمَّ صَلَّيْتُ مَعَهُ، يَحْسُبُ بِأَصَابِعِهِ خَمْسَ صَلَوَاتٍ} (أخرجه البخاري: ٤٠٠٧، ومسلم: ١٨٨٨، وأبو داود: ٣٩٤، والنسائي: ٤٩٣).**

واتـە: پێغەمبـەر ﷺ دەفەرمـوێ: جیبریـل عليه السلام، لـە ئاسـمان دابـەزی، پێـش نوێـژی بـۆ کـردم و، منیـش نوێـژم لەگـەڵ کـرد، دوایـی نوێـژم لەگـەڵ کـرد، دوایـی نوێـژم لەگـەڵ کـرد، دوایـی نوێـژم لەگـەڵ کـرد، دوایـی نوێـژم لەگـەڵ کـرد، بـە پەنجەکانـی {پێغەمبـەر ﷺ} پێنـج نوێـژی ژمـاردن.

ئنجـا نوێـژی یەکەمیـان ئەگـەر نیـوەڕۆ بووبـێ، هـی دووەمیـان عـەسر بـووە و هـی سـێیەمیان شـێوان بـووە و چوارەمیـان خەوتنـان بـووە و پێنجەمیـان بەیانیـی بـووە.

بـەڵام ئەگـەر نوێـژی یەکـەم بەیانیـی بووبـێ، بێگومـان دووەمیـان نیـوەڕۆ بووە، سـێیەمیان عـەسر بـووە، چوارەمیـان شـێوان بـووە، پێنجەمیـان خەوتنـان بـووە، کەواتـە: جبریـل کاتەکانـی بـۆ دیاریـی کـردوون، کـە هـەر کام لـە نوێـژەکان، لـە چ کاتێکـدا بکـەن؟

٢)- {عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ بُرَيْدَةَ عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ رَجُلًا أَتَى النَّبِيَّ ﷺ، فَسَأَلَهُ عَنْ مَوَاقِيتِ الصَّلَاةِ، فَقَالَ: «اشْهَدْ مَعَنَا الصَّلَاةَ»، فَأَمَرَ بِلَالًا فَأَذَّنَ بِغَلَسٍ، فَصَلَّى الصُّبْحَ حِينَ طَلَعَ الْفَجْرُ، ثُمَّ أَمَرَهُ بِالظُّهْرِ حِينَ زَالَتِ الشَّمْسُ عَنْ بَطْنِ السَّمَاءِ، ثُمَّ أَمَرَهُ بِالْعَصْرِ وَالشَّمْسُ مُرْتَفِعَةٌ، ثُمَّ أَمَرَهُ بِالْمَغْرِبِ حِينَ وَجَبَتِ الشَّمْسُ، ثُمَّ أَمَرَهُ بِالْعِشَاءِ حِينَ وَقَعَ الشَّفَقُ، ثُمَّ أَمَرَهُ الْغَدَ فَنَوَّرَ بِالصُّبْحِ، ثُمَّ أَمَرَهُ بِالظُّهْرِ فَأَبْرَدَ، ثُمَّ أَمَرَهُ بِالْعَصْرِ وَالشَّمْسُ بَيْضَاءُ نَقِيَّةٌ، لَمْ تُخَالِطْهَا صُفْرَةٌ، ثُمَّ أَمَرَهُ بِالْمَغْرِبِ قَبْلَ أَنْ يَقَعَ الشَّفَقُ، ثُمَّ أَمَرَهُ بِالْعِشَاءِ عِنْدَ ذَهَابِ ثُلُثِ اللَّيْلِ أَوْ بَعْضِهِ (شَكَّ حَرَمِيٌّ) فَلَمَّا أَصْبَحَ قَالَ: «أَيْنَ السَّائِلُ؟ مَا بَيْنَ مَا رَأَيْتَ وَقْتٌ»} (أخرجه مسلم: ١٣٩١، وأبو داود: ٣٩٥، والنسائي: ٥٢٢).

واتە: سولەیمانی کوڕی بورەیدە لە بابیەوە (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە، کە پیاوێك هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ لە بارەی کاتەکانی نوێژەوە، پرسیاری لێ کرد، واتە: کاتەکانی پێنج نوێژە فەرزەکان، ئەویش فەرمووی: نوێژمان لەگەڵ بکە {واتە: ئەمڕۆ پێنج نوێژە فەرزەکانمان لەگەڵدا بکە، دەبێ ئەو کاتەی ئەو پیاوە هاتوە، شەو بووبێ}، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بە بیلال کرد، کە لە کاتی تاریکاییدا {واتە: بەرە بەیانیی دابوو، شەبەقی بەیانی دابوو، بەڵام جارێ دنیا هەر تاریك بوو} لە کاتێکی زوودا بانگی دا، نوێژی بەیانی کرد، کاتێ کە تازە شەبەقی بەیانی دابوو، بەر لەوەی دنیا سپی هەڵگەڕێ.

دوایی بۆ کاتی نوێژی نیوەڕۆ، فەرمانی پێ کرد، کاتێ بانگ بدات کە خۆر لە نێوەڕاستی ئاسمان تۆزێك لایداوە، نوێژی نیوەڕۆ بوو بوو، ئەو کاتە فەرمانی پێدا بانگی دا و نوێژیان کرد.

دوایی لە کاتی نوێژی ئێوارە (عەسر)دا، فەرمانی پێکرد بانگ بدات لە کاتێکدا کە خۆر هەر بەرز بوو {واتە: کاتێ کە نوێژی عەسر بوو، یەکسەر فەرمانی پێکرد} بیلال بانگیدا و نوێژیان کرد.

دوایی فەرمانی پێکرد بۆ نوێژی شێوان کاتێك بانگ بدات کە خۆر ئاوابوو، {خۆر ئاوابووە، شێوان بوو، یەکسەر بانگیدا و} نوێژیان کرد، لە سەرەتای کاتەکەیەوە.

دوایی بۆ نوێژی خەوتنان فەرمانی پێکرد، کاتێ بانگ بدات کە سوورایی بنی ئاسمانێ نەما {واتە: پاشماوەکانیی تیشکی خۆر نەمان، لە سەرەتای کاتەکەیەوە، ئەمە لە ڕۆژی یەکەم}.

دوایی بۆ بەیانی فەرمانی بە بیلال کرد: کاتێ بانگی بەیانیی بڵێ، کە بەرەبەیان ڕووناك داهات {واتە: لە کۆتایی یاخود لە نێوەڕاستی کاتی نوێژی بەیانیدا بانگی دا}.

دوایی بۆ کاتی نوێژی نیوەڕۆ، فەرمانی پێکرد، کاتێ بانگ بدات کە نیوەڕۆ، چرقەی نیوەڕۆ بەسەر چووبوو و دنیا بەرەو فێنکی چوو بوو {یانی: لە سەرەتای کاتەکەیەوە بانگی نەدا، بۆ ئەوەی بزانرێ، سەرەتای کاتی کەنگێیە و کۆتایی کاتی نیوەڕۆش کەنگێیە؟ هەروەها بۆ نوێژەکانی دیکەش}.

دوایی بۆ نوێژی عەسر فەرمانی پێکرد بانگ بدات، کاتێ کە خۆر سپی و پاك بوو {واتە: جارێ زەردایی تێکەڵ نەبوو بوو، زەردایی کە بەرەو نوێژی شێوان بچێ، تێکەڵی نەبوو} بوو.

دوایی بۆ کاتی نوێژی شێوان فەرمانی پێکرد، کاتێ بانگ بدات کە سوورایی نەمابوو، یان سوورایی خەریك بوو کە کۆتایی بێ، {واتە: دوا کاتی نوێژی شێوان}.

دوایی بۆ نوێژی خەوتنان کاتێ فەرمانی پێکرد بانگ بدات، کە سێیەکی شەوێ ڕۆیبوو، یاخود هەندێکی ڕۆیبوو {حەڕەمیی کە یەکێکە لە ڕاوییەکان گومانی هەیە و لەوەدا دوو دڵ بووە، لەوەدا کە فەرموویەتی: هەندێکی ڕۆیبوو، یاخود یەك لەسەر سێی ڕۆیبوو} کاتێك کە بەیانی کردەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: پرسیارکەرەکە لە کوێیە؟ {بۆیان هێنا} ئەویش فەرمووی: لە نێوان ئەو دوو کاتانەدا کە بینیتن، ئەوە کاتی پێنج نوێژە فەڕزەکانە.

لە ڕۆژی یەکەم دا لە سەرەتای کاتەکاندا بە بیلالی فەرمووە: بانگ بدە و، لە سەرەتای کاتەکاندا نوێژەکانی کردن، لە ڕۆژی دووەم دا لە کۆتایی کاتەکاندا، ئەو پێنج نوێژانەی کردن، تاکو بزانرێ کە سەرەتا و کۆتایی ئەو کاتانەی پێنج فەڕزەکانی تێدا دەکرێن، کەنگێیە؟

## بابەتی سێیەم: گرنگیی و گەورەیی نوێژی بەیانیی و شەو نوێژ:

### أ- نوێژی بەیانیی:

دەربارەی نوێـژی بەیانیـی خـوا ﷻ کـە دەفەرمـوێ: ﴿وَقُرْءَانَ ٱلْفَجْرِۖ إِنَّ قُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ كَانَ مَشْهُودًا﴾، هەروەهـا قورئـان خوێندنـی نوێـژی بەیانیـی، گرنگیـی و، بایـەخ پێبـدە، یاخـود: قورئـان خوێندنـی نوێـژی بەیانییـش بەرپـا بکـە، {زۆربـەی نوێـژ بریتیـە لـە قورئـان خوێنـدن} بـە دڵنیایـی قورئـان خوێندنـی نوێـژی بەیانییـش لـەلا ئامادەبوویـە.

(مَشْهُودًا)، وەك پێشـتر باسـمان کـردوە، یـانی: لـەلا ئامادەبـوو، هەروەهـا بـە مانـای (بینراو) یـش دێ، کـە لـەلا ئامادەبـوو، یـانی: فریشـتەکان لـە لای ئامادەدەبـن، هەڵبەتـە ئەمـە ئـەوەی لـێ وەردەگیـرێ، کـە نوێـژ بـە بـێ قورئـان خوێنـدن نابـێ، چونکـە لێـرەدا خـوا ﷻ نـاوی لـە نوێـژی بەیانیـی نـاوە: قورئـان خوێنـدن ﴿وَقُرْءَانَ ٱلْفَجْرِۖ إِنَّ قُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ كَانَ مَشْهُودًا﴾، کەواتـە جەوهـەر و کاکڵ و زۆربـەی نوێـژ، بریتیـە لـە قورئـان خوێنـدن.

هەروەهـا ڕای زۆربـەی زانایانـە کـە لەسـەر هـەر کام لـە پێـش نوێـژ خوێـن (إمـام) و ئـەوەی کـە نوێـژ لـە دوای پێـش نوێژەکـەوە دەکات (مأمـوم) و لـە هـەر ڕکاتێکـدا فـەرزە کـە قورئـان بخوێنـن {واتـە: سـوورەتی (**الفاتحـة**)} دیـارە بـە نسـبەت نوێژ خوێنانـەوە، ئەگـەر نا بە نسـبەت پێشـەواوە لـە دوو ڕکاتـی یەکەمـی هـەر پێنـج نوێـژە فەرزەکانـدا وێـڕای سـوورەتی (**الفاتحـة**)، چەنـد ئایەتێـك، یـان سـوورەتێك لـە دوای سـوورەتی (**الفاتحـة**)، دەخوێنـێ، هەڵبەتە ڕای دیکـەش هـەن لـەو بـارەوە، بـەڵام ئـەوە ڕای زۆرینەیـە و ئـەم ڕایـەش زیاتـر ڕاسـتە، وەك لـە سـەرەتای، لـە بەرگـی یەکەمـی ئـەم تەفسـیرەدا تەفسـیری قورئانـی بـەرز و بـە پێـز، لـە کاتی تەفسـیرکردنی سـوورەتی (**الفاتحـة**)دا، باسـی ئەوەمـان کـردوە.

لـەو بـارەوەش کـە نوێـژی بەیانیـی فریشـتەکان لـە لای ئامـادە دەبـن، ئـەم سـێ فەرموودەیـە دێنیـن:

١)- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِي ﷺ فـي هَذِهِ الآيَة: ﴿وَقُرْءَانَ ٱلْفَجْرِۖ إِنَّ قُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ كَانَ مَشْهُودًا﴾، قَالَ: تَشْهَدُهُ مَلَائِكَةُ اللَّيْلِ وَمَلَائِكَةُ النَّهَارِ} (**أَخْرَجَهُ الترمذي: ٣١٣٥، وإبن ماجه: ٦٧٠، وصحَّحه الألباني**).

واتـە: ئەبـوو هورەیـرە ، دەڵـێ: پێغەمبـەر ﷺ لـە بـارەی ئـەم ڕسـتە قورئانییـەوە کـە فەرموویـەتی: قورئـان خوێندنـی نوێـژی بەیانیـی، بـە دڵنیایـی قورئـان خوێندنـی نوێـژی بەیانیـی لـەلا ئامادەبوویـە، پێغەمبـەر ﷺ فەرمـووی: فریشـتەکانی شـەو و فریشـتەکانی ڕۆژ، {فریشـتەکانی شـەوگار و فریشـتەکانی ڕۆژگار} لـە لای ئامـادە دەبـن.

واتـە: فریشـتەکانی شـەو، کـە کۆتا کاتیانـە و فریشـتەکانی ڕۆژگار، کـە سـەرەتای کاتیانە دێن، یەکـدی بـەدل دەکـەن، هـەردوو کۆمەڵـە فریشـتەکان، لە کاتـی نوێـژی بەیانییـدا کۆدەبنەوە.

**٢)-** هەر لەو بارەوە ئەم فەرمایشتەش هاتوە: {**عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ** ، **قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ** ﷺ: «**فَضْلُ صَلَاةِ الْجَمِيعِ عَلَى صَلَاةِ الْوَاحِدِ: خَمْسٌ وَعِشْرُونَ، وَتَجْتَمِعُ مَلَائِكَةُ اللَّيْلِ وَمَلَائِكَةُ النَّهَارِ فِي صَلَاةِ الصُّبْحِ**» **قَالَ: ثُمَّ يَقُولُ أَبُو هُرَيْرَةَ:** « **وَاقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ:** ﴿ وَقُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ إِنَّ قُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ كَانَ مَشْهُودًا ﴾ الإسراء} (**أَخْرَجَهُ البخاري: ٦٤٨، ومسلم: ٦٤٩**).

واتـە: ئەبـوو هورەیـرە ، دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویـەتی: پەسـندیی و گەورەیـی پلـەی نوێـژی بـە کۆمـەڵ بەسـەر نوێـژی تاکـدا، (پەسندییەکەی) بـە بیسـت و پێنـج پلەیـە، واتـە: بیسـت و پێنـج پلـە، چاکـتر و پەسـندترە، فریشـتەکانی شـەوگار و فریشـتەکانی ڕۆژگاریـش لـە نوێـژی بەیانییـدا پێکـەوە کۆدەبنـەوە و ئامـادەی نوێـژی بەیانیـی دەبـن.

**٣)-** {**يَتَعَاقَبُونَ فِيكُمْ مَلَائِكَةٌ بِاللَّيْلِ وَمَلَائِكَةٌ بِالنَّهَارِ، وَيَجْتَمِعُونَ فِي صَلَاةِ الْعَصْرِ وَصَلَاةِ الْفَجْرِ**} (**أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ: ٥٥٥، وَمُسْلِمٌ: ٦٣٢**).

واتـە: فریشـتەکانی شـەو و فریشـتەکانی ڕۆژ یەکدی دەگـۆڕن، (یاخود لەگەڵتانـدا بەردەوامن بـە دواتـان دەکـەون) لـە کاتـی نوێژی ئێـوارە (**عـصر**) و نوێـژی بەیانییـدا کۆدەبنەوە.

## ب - شــەو نوێــژ:

بـە نسـبەت شـەونوێژەوە، خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَمِنَ ٱلَّيْلِ فَتَهَجَّدْ بِهِۦ نَافِلَةً لَّكَ عَسَىٰٓ أَن يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَّحْمُودًا ﴾، هەروەهـا لـە شـەوگاردا شـەونوێژ بکـە، زیادەیـە بـۆ تـۆ، نیزیکـە پـەروەردگارت زینـدووت بکاتـەوە و پلـە و پایـەی ستایشـکراوت پـێ ببەخشـێ.

ئەمـە بـە ئاشـکرا دیـارە کـە شـەونوێژی پێغەمبـەر ﷺ هۆکارێکـە لـەو هۆکارانـەی، خـوا ئـەو پلـەو پایـە بـەرزەی پێببەخشـێ، کـە بریتیـە لـە پلـەو پایـەی تێـدا سـتایش کـراو، کـە بێگومـان ستایشـەکە بـۆ پێغەمبـەر ﷺ دەچێتـەوە.

کە دەفەرموێ: ( وَمِنَ ٱلَّيۡلِ )، دیارە (مِنْ)، بۆ بەشێکە (لِلتَّبْعِيضِ)، کە دەفەرموێ: (فَتَهَجَّدۡ بِهِۦ)، ئەمە ئاوایە (قُمْ فَتَهَجَّدْ بِهِ)، (بِهِۦ)، ڕاناوەکەی دەچێتەوە بۆ قورئان، (أَيْ: بِالقُرْآنِ)، واتە: لە شەوگاردا هەڵسەوە و بە هۆی قورئان خوێندنەوە، شەونوێژ بکە، واتە: شەونوێژ بکە و قورئانی تێدا بخوێنە.

(وَالتَهَجُّدُ مِنَ الهُجُودِ وَهُوَ مِنَ الأَضْدَادِ، هَجَدَ: نَامَ، وهَجَدَ: سَهَرَ) (تَهَجُّدْ) لە (هُجُودْ)ەوە هاتوە، (هُجُود)یش لەو کردارانەیە کە مانای پێچەوانەیان هەیە، دوو مانای دژ بە یەکیان هەیە، (هَجَدَ)، واتە: خەوت، هەروەها (هَجَدَ)، واتە: بێدار بووەوە، هەروەك (عَسْعَسَ) یانی: (أقبل): هات، هەروەها یانی: (أدبر): ڕۆیشت، ﴿ وَٱلَّيۡلِ إِذَا عَسۡعَسَ ١٧ ﴾التكوير، واتە: شەوگار کە هات، یان شەوگار کە ڕۆیشت.

(هَجَدْتُهُ)، واتە: نواندم، خەواندم، یاخود هەڵم ستاند، بێدارم کردەوە.

هەندێکیش دەڵێن: (التهَجُّدُ: تَرْكُ الهُجُودِ مِثْلُ التَأَثُّمِ والتَحَرُّجِ، أَي: تَرْكُ الإِثْمِ وَتَرْكُ الحَرجِ)، (تَهَجُّدْ)، واتە: وازهێنان لە خەو، وەك (تَأَثُّمْ) وازهێنان لە گوناح و (تَحَرُّج)، وازهێنان لە سەغڵەتیی، هەر چۆن بێ (فَتَهَجَّدۡ بِهِۦ)، یانی: شەونوێژ بکە بە هۆی قورئانەوە، بەهۆی قورئان خوێندنەوەوە، شەو بێداربە.

(نَافِلَةً لَّكَ)، واتە: زیادەیە بۆ تۆ.

ئنجا ئەو زیادەیە، وەك فەرز زیادەیە، یان وەك پەسند (مندوب)؟ هەردووك واتایەکان هەڵدەگرێ.

١ - هەندێك لە زانایان وەك (القرطبي) هێناویەتی[١] گوتوویانە: کە شەونوێژ لەسەر پێغەمبەر ﷺ فەرز بووە، واتە: (نَافِلَةً لَّكَ: أَيْ فَرِيْضَةً زَائِدَةً لَكَ عَلَى الفَرِيْضَةِ المُوَظَّفَةِ عَلَى الأُمَّةِ)، واتە: فەرزێکی زێدەیە لەسەر ئەو فەرزەی کە لەسەر ئۆممەتەکەت دانراوە، کە پێنج نوێژەکانن.

٢ - هێندێکیش گوتوویانە: (كَانَتِ صَلَاةُ اللَّيْلِ فِي الإِبْتِدَاءِ واجِبة عَلَى الكُلِّ، ثُمَّ نُسِخَ الوُجُوبُ فَصَارَ قِيَامُ اللَّيْلِ تَطَوُّعَاً) واتە: گوتراوە: شەونوێژ لە سەرەتاوە لەسەر هەمووان پێویست بوو، بەڵام دوایی حوکمی فەرزبوونەکەی لابرا و، شەونوێژ بوو بە کارێکی خۆبەخشانە، {بوو بە کارێکی پەسند و باش و فەرز بوونی تێدا نەما}.

---

(١) الجامع لأحكام القرآن: ج١٠، ص ٢٠٢ -٢٥٤.

هەڵبەتە خوا ﷻ لە زۆر شوێنی قورئاندا باسی گرنگیی شەونوێژی کردوە، هەروەها لە سوننەتی پێغەمبەریش دا ﷺ زۆر هاتوە، کە ئێمە چەند نموونەیەکیان دێنینەوە:

١)- یەکێ لەو شوێنانە لە قورئاندا ئەوەیە کە خوا دەفەرموێ لە سوورەتی (الإنسان) (٢٦)دا: ﴿وَمِنَ ٱلَّيۡلِ فَٱسۡجُدۡ لَهُۥ وَسَبِّحۡهُ لَيۡلٗا طَوِيلًا ٢٦﴾، لە شەوگاردا کڕنووش بۆ خوا ببە و شەوگارێکی درێژ خوا بە پاك بگرە، کڕنووش بۆ خوا ببە، واتە: نوێژ بکە، چونکە کڕنووش، بەڵێ سەجدەی قورئان خوێندن هەیە، کە هەر لە نوێژ دایە، مەگەر بە دەگمەن، هەروەها کڕنووشی سوپاسگوزاریی (سَجْدَةُ الشُّكْرِ)یش هەیە، بەلام سەجدە بردن، کە خوا فەرمانی پێدەکات بە پێغەمبەر ﷺ، زیاتر مەبەست پێی نوێژکردنە، ئەو سەجدەیەی کە لە نێو نوێژدایە.

٢)- لە سوورەتی (السجدة)شدا خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا يُؤۡمِنُ بِـَٔايَٰتِنَا ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُواْ بِهَا خَرُّواْ سُجَّدٗاۤ وَسَبَّحُواْ بِحَمۡدِ رَبِّهِمۡ وَهُمۡ لَا يَسۡتَكۡبِرُونَ ۩ ١٥ تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمۡ عَنِ ٱلۡمَضَاجِعِ يَدۡعُونَ رَبَّهُمۡ خَوۡفٗا وَطَمَعٗا وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ١٦﴾.

واتە: بێگومان تەنیا ئەوانە بڕوا بە ئایەتەکانی ئێمە دێنن، کە هەر کاتێك ئایەتەکانی ئێمەیان بیرخرانەوە و بەسەریاندا خوێنرایەوە، (خَرُّواْ سُجَّدٗا)، بە سەجدەدا دەکەون، بە کڕنووشدا دەکەون {(خَرُّواْ)، یانی: (سَقَطُوا)، واتە: وەك بە ویستی خۆیان نەبێ، بکەون، ئاوا بۆ خوا دەکەونە سەجدە} هەروەها پەروەردگاریان بە ستایشکردنەوە بە پاك دەگرن و، خۆیان بە زل ناگرن، تەنیشتەکانیان لەسەر جێیەکانیان بەرز دەبنەوە.[1]

{واتە: بۆ شەونوێژ هەڵدەستن}.[2]

﴿يَدۡعُونَ رَبَّهُمۡ خَوۡفٗا وَطَمَعٗا﴾، کە شەونوێژیش دەکەن لە پەروەردگاریان دەپاڕێنەوە، بە لێترسانەوە و بە ئومێداربوونەوە، ﴿وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ﴾، لەوەش کە پێمان داون دەبەخشن.

خوا دەفەرموێ: تەنیا ئەوانە بڕوا بە ئایەتەکانی ئێمە دێنن، کە ئەوانە حاڵ و سیفەتیانن.

---

(١) (تَتَجَافَىٰ)، یانی: (تَتَبَاعَدُ)، (جُنُوبُ) کۆی (جَنْب)، واتە: لا تەنیشتتان، (عَنِ ٱلۡمَضَاجِعِ)، کۆی (مَضْجِعَ)ە، (مَضْجِع)یش ئەو شوێنەیە کە ئینسان تێیدا خەوتوە .

(٢) وشەی (تَتَجَافَىٰ)، وەك بڵێی: جارێك نەفس و شەیتان دەڵێ: هەڵمەستن، جارێك پاڵنەری ئیمان دەڵێ: هەڵسن، ئەم وشەیە (تَتَجَافَىٰ)، ئەوەی لێ وەردەگیرێ.

٣)- لە سوورەتی (الزمر)یشدا، خوا دەفەرمویّ: ﴿ أَمَّنْ هُوَ قَٰنِتٌ ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ سَاجِدًا وَقَآئِمًا يَحْذَرُ ٱلْءَاخِرَةَ وَيَرْجُوا۟ رَحْمَةَ رَبِّهِۦ ۗ قُلْ هَلْ يَسْتَوِى ٱلَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ۗ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ  ﴾.

واتە: ئایا کەسێك کە لە کاتەکانی شەوگاردا، بە کڕنووش بردوویی و، بە ڕاوەستاویی دەمێنێتەوە، واتە: نوێژ دەکات، شەونوێژ دەکات، مەترسیی ڕۆژی دوایی هەیە و بە ئومێدی بەزەیی پەروەردگاریەتی {ئایا ئەو کەسەی کە ئاوایە، وەك ئەو کەسە وایە، کە هەموو شەوگار بەخەوتن دەباتە سەر، و مەترسیی ڕۆژی دوایشی نیە و ئومێدی بەزەیی پەروەردگاریشی نیە؟} بڵێ: ئایا ئەوانەی دەزانن و، ئەوانەی نازانن یەکسانن؟ بە دڵنیایی بەس خاوەن عەقڵان پەند وەردەگرن.

کەواتە: لێرەدا خوا ﷻ ئەوانەی کە شەو بێدار دەبن، شەو زیندوو دەکەنەوە بە کڕنووش بردوویی و، بە ڕاوەستایی و، ترسی ڕۆژی دواییان هەیە و بە ئومێدی بەزەیی پەروەردگاریانن، ئەوانە بە خاوەن زانست و بە خاوەن عەقڵ ناوزەد دەکات.

٤)- لە سوورەتی (الإسراء) (٧٩)یشدا کە باسمان کرد: ﴿ وَمِنَ ٱلَّيْلِ فَتَهَجَّدْ بِهِۦ نَافِلَةً لَّكَ عَسَىٰٓ أَن يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَّحْمُودًا ﴾.

واتە: لە بەشێکی شەوگاردا بە هۆی خوێندنی قورئانەوە شەو نوێژ بکە، ئەوە زیادەیە بۆ تۆ، نیزیکە پەروەردگارت زیندووت بکاتەوە و، ئەو پلەیەت پێ ببەخشێ، کە تێیدا ستایش دەکرێی.

٥)- با فەرمایشتێکێش وەك نموونە بێنین، پێغەمبەر ﷺ، دەفەرمویّ: {إِنَّ اللَّهَ يُمْهِلُ حَتَّى إِذَا ذَهَبَ ثُلُثُ اللَّيْلِ الأَوَّلُ، نَزَلَ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا، فَيَقُولُ: هَلْ مِنْ مُسْتَغْفِرٍ؟ هَلْ مِنْ تَائِبٍ؟ هَلْ مِنْ سَائِلٍ؟ هَلْ مِنْ دَاعٍ؟ حَتَّى يَنْفَجِرَ الْفَجْرُ} (أخرجه مسلم: ١٧٧٤).

واتە: خوا لێدەگەڕێ (يُمْهِلُ) {واتە: لێدەگەڕێ کات بڕوا} هەتا کاتێك کە سێیەکی یەکەمی شەو تێپەڕی، {کە گەیشتە سێیەکی دووەم و گەیشتە نیوەڕاستی شەو} خوا دادەبەزێ بۆ ئاسمانی نیزیك و، دەفەرمویّ: ئایا کەس هەیە داوای لێبوردن بکات؟ ئایا کەس هەیە بگەڕێتەوە و پەشێمان بێتەوە؟ ئایا کەس هەیە داوا بکات؟ ئایا کەس هەیە بپاڕێتەوە؟ تاکو شەبەقی بەرەبەیان دەدات.

خـوا ﷻ بـەو شـێوەیە چاوەڕێـی بەندەکانـی دەکات، کـە داوای لێبوردنـی لـێ بکـەن و بـۆ لای بگەڕێنـەوە و، داوای لـێ بکـەن و، لێـی بپاڕێنـەوە، بێگومـان ئەمـە وێناکردنـی پێغەمبـەرە ﷺ، بـۆ نیزیکـی خـوا ﷻ لـەو کاتـەدا لـە بەندەکانـی، ئـەوە زیاتـر دێتـە زەینـەوە.

دەشـگونجێ بڵێیـن: خـوا ﷻ دێتـە ئاسـمانی نیزیـك، بـەو شـێوەیە کـە بـۆ خـوا شایسـتەیە، هـەردووك لێکدانـەوەکان زانایـان بوویانـن، هـەم هـی پێشـین، هـەم هـی پاشـین، ئەوەشـم بۆیـە بـاس کـرد، بـۆ ئـەوەی هیـچ کـەس وانەزانێ، کـە ئەگـەر زانایەکیـش بڵێ: ئەمە مەبەسـت پێـی نیزیکـی خوایـە لـە بەندەکانـی، نـەك خـوا ﷻ بـەو شـێوەیە کـە دێتـە زەینـەوە: خوا سـەر عەرشـی بەجـێ بهێڵـێ و بێتـە ئاسـمانی نزیـك لە ئێمـە، حەوت ئاسـمانان ببـڕێ و بێتە ئاسـمانی نیزیـك لـە ئێمـەوە، ئەگـەر کەسێکیش وای لێـك دایـەوە، وا نەزانـرێ: بـە پێچەوانـەی عـادەت و ڕێبـازی پێشـینی چـاك قسـەی کـردوە، چونکـە ئەوانیـش لـەو بـارەوە هـەر قسـەیان کـردوون، نـەك هـەر لێـرە، لـە بـارەی گەلێـك لـە سـیفەتەکانەوە، کـە پێیـان دەگوتـرێ: (**الصِّفَاتُ الخَبَرِيَّةُ**)، هەندێکیـان جـۆرێ لـە تەئویلیـان کـردوون، کـە لەگـەڵ زمانـی عەرەبییـدا دەگونجـێ، لەگـەڵ پایـە و مەقامـی بـەرزی خـوای پـەروەردگاردا دەگونجـێ و، لەگـەڵ عەقڵـی خەڵکـدا دێتـەوە، هەندێکیشـیان وەك مانـا ڕواڵەتییەکەیـان مانایـان کـردوە، بـەڵام لەگـەڵ بـە پاککرتنـی خـوادا، کـە سـیفەتەکانی وەك سیفاتی بەنـدەکان بـن، واتـە: (**إِثْبَاتٌ مَعَ تَنْزِيه**)، واتـە: سـیفەتەکەیان بـۆ خـوا چەسـپاندوە لەگـەڵ بـە پاکگرتنـی خـوادا، واتـە: هیـچ کـەس نەیگوتـوە: خـوا سـەر عـەرش بەجـێ دێڵـێ و دێتـە ئاسـمانی یەکـەم، کـە ئەمـە مانایەکـی ڕواڵەتـی و ڕووکەشـییە، ڕەنگـە هەنـدێ لـە خەڵکـی عـەوام، یـان هەندێـك لەوانـەی تێیـان پەڕانـدوە، لـە ئیسـپاتی سـیفەتە خەبەرییەکانـدا، وەك هەنـدێ لـە حەنبەلییـەکان، ئـەو جـۆرە بیرۆکانەیـان بـۆ هاتـبن، بـەڵام هیـچ زانایـەکی قووڵـی سـاغکەرەوە (محقـق) شـتی وای نەگوتـوە.

## بابەتی چوارەم: پێگەی ستایشکراو (المَقَامُ المَحْمُود):

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَمِنَ ٱلَّيْلِ فَتَهَجَّدْ بِهِۦ نَافِلَةً لَّكَ عَسَىٰٓ أَن يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَّحْمُودًا ﴾، واتـە: لـە شـەوگاردا شـەونویژ بکـە، بـە هـۆی خوێندنـی قورئانـەوە، نیزیکـە پـەروەردگارت زینـدووت بکاتـەوە و، ئـەو پێگەیـەی کـە تێیـدا سـتایش دەکرێـی، پێـت ببەخشـێ.

ئنجا ئایا مەبەسـت (المَقَـامُ المَحْمُـود) چییـە؟ زانایـان بـە گشـتی لـەو بـارەوە، چوار قسـەیان کـردوون، چـوار ڕایـان هێنـاون کـە (القرطبـي)، هـەر چواریانـی هێنـاوە[1]، کـە لـە ڕاسـتییدا چـوار ڕایەکـەش، هـەر دەبنـەوە بـە یـەك، وەك لـە دوايیـدا باسـی دەکەیـن:

ڕای یەکـەم: دەڵێـن: مەبەسـت پێـی ئـەو تکاکردنـەی پێغەمبـەری خوایـە ﷺ، کـە لـە ڕۆژی دوايیـدا تـکا لـە خـوای پـەروەردگار دەکات و لـە خـوای بـە بەزەیـی دەپاڕێتـەوە، کـە لێپرسـینەوە و سـزا و پاداشـت دانـەوەی خەڵـك دەسـت پێبکـرێ و، خەڵـك لـەو کۆکردنـەوەی گۆڕەپانـی مەحشـەر، کـە زۆر دەکەونـە سـەغڵەتیی، ئـەوە کۆتایـی پـێ بـێ و دەسـت بکـرێ بـە لێپرسـینەوە، لـەو بـارەوە، ئـەم دوو فەرموودەیـە دێنیـن:

أ)- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَة رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: ﴿ عَسَىٰٓ أَن يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَّحْمُودًا ﴾، سُئِلَ عَنْهُا قَالَ: هِيَ الشَّفَاعَةُ} (أَخْرَجَهُ الترمذي: ٣١٣٧، وصححه الألباني).

واتـە: ئەبـوو هورەیـرە دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ کـە فەرمـووی: ﴿ عَسَىٰٓ أَن يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَّحْمُودًا ﴾، پێغەمبـەری خـوا ﷺ ئـەوەی خوێنـدەوە، لێـی پـرسرا لـەو بـارەوە، فەرمـووی: مەبەسـت پێـی تکاکردنـە.

ب)- {قال رسول اللّه ﷺ: إِذَا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ، مَاجَ النَّاسُ بَعْضُهُمْ فِي بَعْضٍ، فَيَأْتُونَ آدَمَ، فَيَقُولُونَ: اشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ، فَيَقُولُ: لَسْتُ لَهَا، وَلَكِنْ عَلَيْكُمْ بِإِبْرَاهِيمَ، فَإِنَّهُ خَلِيلُ الرَّحْمَنِ، فَيَأْتُونَ إِبْرَاهِيم، فَيَقُولُ: لَسْتُ لَهَا، وَلَكِنْ عَلَيْكُمْ بِمُوسَى فَإِنَّهُ كَلِيمُ اللَّهِ، فَيَأْتُونَ مُوسَى، فَيَقُولُ: لَسْتُ لَهَا، وَلَكِنْ عَلَيْكُمْ بِعِيسَى، فَإِنَّهُ رُوحُ اللَّهِ وَكَلِمَتُهُ، فَيَأْتُونَ عِيسَى، فَيَقُولُ: لَسْتُ لَهَا، وَلَكِنْ عَلَيْكُمْ بِمُحَمَّدٍ ﷺ، فَيَأْتُونِي، فَأَقُولُ: أَنَا لَهَا...} (أخرجه البخاري: ٧٥١٠، ومسلم: ٤٧٨).

---

(١) الجامع لأحكام القرآن: ج١٠، ص٢٥٤ تا ٢٥٧.

واتـە: پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرمـووی: کاتـێ ڕۆژی هەڵسـانەوە هـات، خەڵـك تێکـەڵ دەبـن و پێکـدا دێـن و دەچـن، دەچـن بـۆ لای ئـادەم دەڵێـن: تـکا لـە پـەروەردگات بکـە! دەڵـێ: مـن شایسـتەی ئـەوە نیـم، بـەڵام بچـن بـۆ لای ئیبراهیـم دۆسـت و خۆشەویسـتی تایبەتیـی خـوا بوو، دەچـن بـۆ لای ئیبراهیـم، ئەویـش دەڵـێ: ئـەوە کاری مـن نیـە و، منیـش شایسـتەی ئـەوە نیـم، بـەڵام بچـن بـۆ لای مووسـا، چونکـە ئـەو دوێنـەری خـوا بـووە، (خـوای پـەروەردگاری ڕاسـتەوخۆ دوانـدوە)، دەچـن بـۆ لای مووسـا، ئەویـش دەڵـێ: مـن شایسـتەی ئـەوە نیـم، بـەڵام بچـن بـۆ لای عیسـا، عیسـا ڕووحـی خـوا و وشـەی خوایـە، {واتـە: خـوا ﷻ یەکسـەر ڕووحەکـەی خسـتۆتە نێـو منداڵدانـی دایکـی، بـە وشـەی خـۆی، بـێ ئـەوەی پێویسـت بـەوە بـێ دایـك و بـاب پێکەوە جـووت بـن} دەچـن بـۆ لای عیسـا، ئەویـش دەڵـێ: مـن شایسـتەی ئـەوە نیـم، کاری مـن نیـە، بـەڵام بچـن بـۆ لای موحەممـەد ﷺ، دەفەرمـوێ: کـە دێـن بـۆ لام، دەڵێـم: ئـەوە کاری منـە و مـن شایسـتەی ئـەو پێگەیـەم {دوایـی فەرمایشـتەکە هەمـووی بـاس دەکات کـە دەپاڕێتـەوە}.

ئێمـە لـە تەفسـیری سـوورەتی (یونـس)دا، بـە درێژیـی قسـەمان لەبـارەی شـەفاعەتەوە کـرد، بۆیـە لێـرە ناچینـە نێـو وردەکارییەکانـەوە.

ڕای دووەم: دەڵـێ: ئـاڵای ستایشـکردنی لـە ڕۆژی دوایـی دا، پـێ دەدرێ، (**إِعْطَـاءُهُ لِـوَاءُ الحَمْـدِ يَـوْمَ القِيَامَـة**):

کـە لـەم فەرمایشـتەدا ئامـاژەی پێکـراوە، پێغەمبـەر ﷺ دەفەرمـوێ: {**أَنَـا سَـيِّدُ وَلَـدِ آدَمَ يَـوْمَ القِيَامَـةِ، وَلَا فَخْـرَ، وَبِيَـدِي لِـوَاءُ الحَمْـدِ، وَلاَ فَخْـرَ، وَمَـا مِـنْ نَبِـيٍّ يَوْمَئِـذٍ آدَمُ فَمَـنْ سِـوَاهُ إِلاَّ تَحْـتَ لِـوَائِي**} (**أَخْرَجَـهُ أَحْمَـد: ١١٠٠٠، وَالتِّرمِـذِيُّ: ٣٦١٥، وَابْـنُ مَاجَـهْ: ٤٣٠٨**).

واتــە: دەفەرمــوێ: مــن ســەروەری ڕۆڵەکانــی ئادەمــم لــە ڕۆژی هەڵســانەوەدا و، بــە شانازییکردنیشــەوە واناڵێــم، ئــاڵای ستایشــکردن بــە دەســت مــن دەبــێ، بــە شــانازیی کردنـەوەش واناڵێـم، هیـچ کام لـە پێغەمبـەران (**عَلَيْهِـم الصَّـلاَةُ وَالسَّـلاَمُ**) نیـە لـە ئادەمـەوە و جگە لـە ئادەمیـش، مەگـەر لـە ژێـر ئـاڵا و بەیداغـی منـدا دەبـێ لـە ڕۆژی دوایـی دا.

ڕای سێیەم: دەڵـێ: ئەوەیـە کـە خـوای بـەرز موحەممـەد ﷺ، لەگـەڵ خـۆی لەسـەر عەرش، یان لەسـەر کـورسی دادەنیشـێنێ:

١)- {**عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَلامٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: إِنَّ مُحَمَّدًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى كُرْسِيِّ الرَّبِّ، بَيْنَ يَدَيِ الرَّبِّ تَبَارَكَ وَتَعَالَى**}[١].

---

(١) جامع البيان ج١٥، ص١٤٨، رقم: ٢٢٥٧٨.

واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی سـەلام (کـە یەکێکـە لـە زانایانـی خـاوەن کتێبـەکان و مسـوڵمان بـووە، خـوا لێـی ڕازی بـێ)، دەڵـێ: موحەممـەد ﷺ لـە ڕۆژی قیامەتـدا، لەسـەر کورسـیی پـەروەردگار لـە پێـش دەسـتی پـەروەردگاری **تَبَـارَكَ وَتَعَـالَى** دەبـێ.

٢)- {**عَنْ مُجَاهِد: قَالَ: يُجْلِسُهُ مَعَهُ عَلَى عَرْشِه**}[1].

واتە: خوا موحەممەد ﷺ لەگەڵ خۆی لەسەر عەرشی خۆی دادەنیشێنێ.

دوایی لەو بارەوە، قسەی خۆمان دەکەین.

ڕای چـوارەم: دەڵـێ: پێگـەی تێـدا سـتایش کـراو، بریتیـە لـە تکاکـردنی و دەرهێنـانی ئەوانەی لـە ئاگـری دۆزەخ دان، دەڵـێ: {**إِخْرَاجُـهُ مِـنَ النَّـارِ بِشَـفَاعَتِهِ مَـنْ يَخْـرُجُ**} (**كـما في صحيـح مسـلم: ١٩١، وأحمـد في المسـند عـن جابـر بـن عبداللّـه**).

واتـە: بریتیـە لـە تـکا کردنـی پێغەمبـەر ﷺ، کـە بەهۆیـەوە کەسـانێك لـە ئاگـری دۆزەخ دەربـاز دەبن.

هەڵوێسـتی مـن دەربـارەی ئـەو سـێ ڕایـە: دەڵێـم: ڕای یەکـەم کـە بریتیـە لـە تکاکردنـی پێغەمبـەر ﷺ و، ڕای دووەم کـە بریتیـە لـەوە کـە پێغەمبـەر بەیداغـی ستایشـکردنی بـە دەسـتەوە دەبـێ و، ڕای چـوارەم کـە بریتیـە لـە دەربازکردنـی خەڵکێـك لـە ئۆممەتـی، بـە هـۆی تکاکردنیـەوە، هـەر سـێکیان دەبنـەوە بـە یـەك!

بـە نسـبەت ڕای سـێیەمەوە، کـە دەڵـێ: دانیشـتاندنی خـوا بـۆ پێغەمبـەر ﷺ، لەسـەر کورسـیی، یـان لەسـەر عەرشـی خـۆی، دەڵێیـن:

خـوا ﷻ پێـش دروسـتکردنی گـەردوون، چـۆن بـووە، دواییـش هـەر وایـە، کـە بێگومـان خـوا ﷻ پێویسـتیی بـە عـەرش و بـارەگا نیـە هەڵیگـرێ، بەڵکـو عـەرش و هەرچـی دروسـتکراوەکانن، خـوای پـەروەردگار ڕایگرتـوون، ئـەوە دەبـێ لـە شـتە ئاشـکرا و بەڵگـە نەویسـتەکان بـێ، بـۆ هەر ئیمانداریێـك: کـە خـوا پێویسـتیی بـە جگـە لـە خـۆی نیـە و، خـوا ﷻ گۆڕانـی بـە سـەردا نایـەت، پێـش ئـەوەی دروسـتکراوەکانی بێنێتـە دی، چـۆن بـووە بـە عـەرش و کورسییشـەوە و، حـەوت ئاسـمانەکان و زەوی و هەرچـی کـە خـوا دروسـتی کـردوە، پێشـێ خـوا چـۆن بـووە، دواییـش هەر وایـە، خـوا گۆڕانـی بـە سـەردا نایـەت و سـیفەتێك لـە خـوادا زیـاد نابـێ، کـە پێشـتر نەیبووبـێ.

---

(١) جامع البيان: ٢٢٥٧٨.

ئنجا ئەگەر ئەو شوێنەوارانەش بگرین، کە دیارە هەموویان شوێنەوارن، ئەوە نیە پێغەمبەر ﷺ، فەرموونی، ئەگەر ئەو شوێنەوارانەش ڕواڵەتەکەشیان بگرین، دەبێ بزانین کە: بە تەئکید مەبەست لە دانیشتاندنی موحەممەد ﷺ، لە سەر عەرش، ڕێزگرتنی خوایە بۆ پێغەمبەر (محمد) ﷺ، ئەگەر لەسەر عەرشی دابنێ، یان لە هەر شوێنێکی دایبنێ، مانای وایە خوای پەروەردگار ڕێزی زیادەی لێ دەنێ، بەڵام ئەوە نیە کە مەبەست ئەوە بێ، پێغەمبەر ﷺ لە سیفەتی بەندایەتیی و دروستکراوێتیی، بەرزتر بکرێتەوە بۆ مەقامی خوا! پاکیی و بێ خەوشیی و بێ وێنەیی بۆ خوا.

(القرطبي) لەو بارەوە لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1] دەڵێ: **(وَلَيْسَ إِقْعَادُهُ مُحَمَداً عَلَى عَرْشِه مُوجِبَاً لَهُ صِفَةَ الرّبُوبيّةِ، أو مُخْرِجَاً لَهُ عَنْ صِفَةِ العبُودِيةِ، بَلْ هُوَ رَفْعٌ لِمَحَلِّهِ، وَتَشْرِيفٌ لَهُ عَلَى خَلْقِهِ).**

واتە: خوا عز وجل کە موحەممەد ﷺ لەسەر عەرش دادەنیشێنێ، ئەوە پێویستکەری سیفەتی پەروەردگارێتیی نیە بۆ موحەممەد ﷺ، هەروەها ئەوە پاساوی ئەوە نیە بڵێی: لە سیفەتی بەندایەتیی براوەتە دەر، بەڵکو مەبەست پێی ئەوەیە، کە خوا پێگەی پێغەمبەر ﷺ بەرز دەکاتەوە و ڕێزی لێ دەنێ، بەسەر دروستکراوەکانی دا.

بەڵام من ئەو شوێنەوارانم ناچنە عەقڵ و دڵەوە:

أ - عەبدوڵڵای کوڕی سەلام، یەکێك بووە لە زانایانی خاوەن کتێبەکان.

ب - موجاهیدیش یەکێکە لە زانایانی تابیعین، واتە: هیچ کامیان وانین کە قسەکەیان پاڵ بدەنە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، تاکو حوکمی فەرمایشتی هەبێ، ئنجا عەبدوڵڵای کوڕی سەلامیش (خوا لەویش و لە هەموو هاوەڵان ڕازی بێ)، وەك گوتمان: زانایەکی خاوەن کتێبەکان بووە و، هەر تەعبیری شوێنەوارەکەش کە هێناویەتی: {**إِنَّ مُحَمَّدًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ، عَلَى كُرْسِيِّ الرَّبِّ، بَيْنَ يَدَيِ الرَّبِّ تَبَارَكَ وَتَعَالَى**}، ئەمە بۆ خۆی تەعبیری پەیمانی کۆن و نوێیە، واتە: ئەو کارتێکراو بووە بەو کلتوورەی پێشتر هەیبووە، هەر بۆیەش گەلێك لە زانایان، ئەوشتانەی کە زانایانی خاوەن کتێبان گوتوویانن، وەك ئەو فەرموودانەی دیکەیان تەماشای ناکەن، کە هاوەڵانی دیکەی پێغەمبەر ﷺ گوتوویانن، چونکە زانیویانە: کەم و زۆر ئەوانە کارتێکراو بوون، بە کلتوور و بەو بیر و بۆچوونە پێشووانەی کە هەیان بوون، پێش مسوڵمان بوونیان.

---

(١) جامع البيان لأحكام القرآن. ج١٠، ص ٥٦.

لە كۆتایی ئەم كورتە باسەدا، ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ دێنین: كە دەفەرمویَ: {مَنْ قَالَ حِينَ يَسْمَعُ اَلنِّدَاءَ : أَللَّهُمَّ رَبَّ هَـٰذِهِ اَلدَّعْوَةِ اَلتَّامَّةِ ، وَالصَّلَاةِ اَلْقَائِمَةِ ، آتِ مُحَمَّدًا اَلْوَسِيلَةَ وَالْفَضِيلَةَ ، وَابْعَثْهُ مَقَامًا مَحْمُودًا اَلَّذِي وَعَدْتَهُ ، حَلَّتْ لَهُ شَفَاعَتِي يَوْمَ اَلْقِيَامَةِ } (**أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ: ٦١٤، وأَبُو دَاوُدَ: ٥٢٩، وَالتِّرمِذِيُّ: ٢١١، وَابْنُ مَاجَه: ٧٢٢**).

واتە: هەر كەسێك كاتێك كە گوێی لە بانگ دەبێ، بڵێ: ئەی خوایە! پەروەردگاری ئەم بانگەوازە تێر و تەواوەو، ئەم نوێژە بەرپاكراوە، وەسیلە و فەزیلە بە موحەممەد ﷺ ببەخشە، {(**وسيلة**)، وەك لە فەرمایشتی دیكەدا هاتوە، تەنیا بۆ یەكێك لە بەندەكانی خوا دەشێ، كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئومێد دەكەم كە من ئەو كەسەبەم و ئێوەش بۆم داوا بكەن، (**فضيلة**)ش پلەو پایەی بەرز، پەسندە}، هەروەها ئەو پێگە تێدا ستایشكراوەی كە بەڵێنت پێداوە، پێی بدە، {هەر كەسێك ئەو دوعایەم بۆ بكات} تكاكردنی من بۆ وی، لە ڕۆژی دواییدا پێویست دەبێ.

پێشتریش باسمان كرد، كە هاتنی ئەم ڕستەیە: ﴿ عَسَىٰٓ أَن يَبۡعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامٗا مَّحۡمُودٗا ﴿٧٩﴾ ﴾، دوای باسی پێنج فەرزەی نوێژەكان و شەونوێژ، گرنگیی و بایەخیی هەر كام لە پێنج نوێژە فەرزەكان و شەونوێژیش دەردەخات، كە ئاماژەیەكمان دا بە گرنكیی شەونوێژ و، پێنج فەرزەكانیش لە گەلێك شوێنی ئەم تەفسیرەدا، كەم و زۆر باسمان كردوون، لە داهاتووشدا بە پێی پێویستی باسیان لێوە دەكەین[1].



(١) لە تەفسیری سوورەتی (العنكبوت)دا، باسێكی تێرو تەسەلمان كردوە لە بارەی بەرپاكردنی نوێژەوە بە گشتی.

## مەسەلەی چــوارەم:

**خـوا ﷻ بـە پێغەمبـەر ﷺ دەفەرمـوێ: هەروەهـا بڵـێ: پـەروەردگارم! بـە چوونـە نێوێکی پەسـند بمخـە نێـو (هـەر کار و چالاکییەکـەوە) و بـە چوونـە دەرێکـی باشـیش، بمهێنـە دەرێ و، لـە لایـەن خۆتـەوە دەسـەڵاتێکی وەسـەرخەرم بـۆ بڕەخسـێنە و بڵـێ: هـەق هـات و بەتـاڵ نەمـا، بێگومـان ناهـەق پووچـەڵ و فەوتـاوە:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَقُل رَّبِّ أَدْخِلْنِي مُدْخَلَ صِدْقٍ وَأَخْرِجْنِي مُخْرَجَ صِدْقٍ وَاجْعَل لِّي مِن لَّدُنكَ سُلْطَانًا نَّصِيرًا (٨٠) وَقُلْ جَاءَ الْحَقُّ وَزَهَقَ الْبَاطِلُ ۚ إِنَّ الْبَاطِلَ كَانَ زَهُوقًا (٨١) ﴾:

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿ وَقُل رَّبِّ أَدْخِلْنِي مُدْخَلَ صِدْقٍ ﴾، هەروەها بڵێ: پەروەردگارم! بە چوونە نێوێکی باش بمخە نێو، یانی: بمخە نێو هەر کار و بارێکەوە کە ئەنجامی دەدەم، هەر کار و پڕۆژەیەکەوە کە ئەنجامی دەدەم، هەر هەنگاوێك کە هەڵیدەهێنم، هەر هەڵوێستێك کە دەینوێنم، هەمووی دەگرێتەوە، (**المُدْخَلُ وَالمُخْرَجْ: اسْمُ مَكَان الإدْخَال وَالإِخْرَاج**)، وشەی (**مُدْخَلْ، مُخْرَجْ**)، هەردووکیان ناوی شوێنن، ناوی شوێنی بردنە نێو و هێنانە دەر.

٢)- ﴿ وَأَخْرِجْنِي مُخْرَجَ صِدْقٍ ﴾، واتە: بمهێنە دەر بە هێنانە دەرێکی پەسند.

بمخە نێو بە چوونە نێوێکی باش و، بمهێنەدەر، بە هاتنە دەرێکی باش.

(**الصِّدْق أي: المَحْمُود مِنْ نَوْعِهِ**)، (**صدق**) هـەر شـتێك لـە جـۆری خـۆی شـتێکی پەسـند و بـاش بێ.

کەواتـە: ﴿ أَدْخِلْنِي مُدْخَلَ صِدْقٍ ﴾، بـە بردنـە نێوێکـی بـاش، بمخـە نێـو هـەر کارێکـەوە کـە دەسـتی پـێ دەکـەم، ﴿ وَأَخْرِجْنِي مُخْرَجَ صِدْقٍ ﴾، هەروەهـا بـە هێنانـە دەرێکـی بـاش، بمهێنـە دەر، لـە هـەر کارێـك کـە تـەواوی دەکـەم.

٣)- ﴿ وَاجْعَل لِّي مِن لَّدُنكَ سُلْطَانًا نَّصِيرًا ﴾، لەلایەن خۆتەوەش دەستەڵاتێکی وەسەرخەرم، دەستەڵاتێکی پشتگیرییکەرم بۆ بڕەخسێنە، پێشتر گوتمان: (**نصیر**)، زێدەڕۆییە لە (**نَاصِرْ**)، (**ناصِرْ**)، واتە: سەرخەر، پشتگیر، پشتگیرییکەر، بەڵام (**نَصِیر**)، زێدەڕۆیی لە ماناکەی دا زیاترە.

(**سُـلْطَان**)، (**سُـلْطَان: إسْـمُ مَصْـدَرٍ يُطْلَـقُ عَـلَى السُـلْطَةِ، وَعَـلَى الحُجَّـةِ، وَعَـلَى المُلْـكِ**)، (**سُلْطَان**)، نـاوی چاوگـە بەکاردەهێـنرێ بـۆ دەسـتەڵات، هـەم بـۆ بەڵگـە، هـەم بـۆ حوکمڕانیـی و دەستڕۆیشـتوویەتی.

**٤)**- ئنجا دوای ئەوەی ئەو پاڕانەوەیەت کردو ئەو سێ داوایەت لە خوا کردن:

١- ﴿ وَقُل رَّبِّ أَدْخِلْنِي مُدْخَلَ صِدْقٍ ﴾، ٢- ﴿ وَأَخْرِجْنِي مُخْرَجَ صِدْقٍ ﴾، ٣- ﴿ وَٱجْعَل لِّي مِن لَّدُنكَ سُلْطَـٰنًا نَّصِيرًا ﴾، دوای ئەوەی بەو سێ شێوەیە، پاڕایەوە لە پەروەردگارت، ئنجا ئەو هەواڵەش بدە، بڵێ: ﴿ وَقُلْ جَآءَ ٱلْحَقُّ ﴾. هەق هات، چەسپا.

**٥)**- ﴿ وَزَهَقَ ٱلْبَـٰطِلُ ﴾، باتیڵ نەما، پووچایەوە، لە بەینچوو.

**٦)**- ﴿ إِنَّ ٱلْبَـٰطِلَ كَانَ زَهُوقًا ﴾، بە دڵنیایی باتیڵ فەوتاوە، پووچەڵە، بێ نێوەڕۆکە.

وشـەی (**حـق**)، بـە شـتی چەسـپاوو، لەگـەڵ واقیعـدا پـڕ بـە پێسـت دەگوتـرێ و، (**باطـل**) یـش پێچەوانـەی (**حـق**)ە، بـە شـتێکی بـۆش و بـێ نێـوەڕۆك و نەچەسـپاو دەگوتـرێ، شـتێك کـە حەقیقەتـی نەبـێ، وەك جـاری دیکـەش گوتوومانـە: هـەر کام لـە جەرەسـی بێـژەی هـەق و، جەرەسـی بێـژەی باتیڵیـش، واتاکەیـان دەگەیەنـن، وەك سـەیید قوتـب (ڕەحمەتـی خـوای لێبـی) گوتوویەتـی و، زانایانـی دیکـەی شـارەزای ڕەوانبێژییـش گوتوویانـە، چونکـە وشـەی (ٱلْحَقُّ)، لـە دوو پیتـان پێـك دێـت: (ح) و (ق)، کـە (ق) گیـرەدار (**مُشَـدَّد**)ەو، ئـەو دوو پیتـەش هەردووکیـان پێیـان دەگوتـرێ: پیتـی گـەروو (**حـرف الحَلْق**) و بـە قووڵایـی گـەروو دەگوتـرێ: (**حـقّ**)، بەڵـێ، ئەگـەر دیقـەت بدەیـە جەرەسـی بێـژەی (**حـق**) دەلالـەت لەسـەر چەسـپاویی دەکات، بـەڵام (**باطـل**)، لـە چـوار پیتـان پێکهاتـوە: (**ب**) و (**ط**) لەگـەڵ (ا) و (**ل**)، بێـژە (**لفـظ**)ی (**باطل**)یـش بـە بۆشـایی (**جـوف**)ی زار دەگوتـرێ و، دەلالـەت لەسـەر بۆشـیی و بـێ نێوەڕۆکیـی دەکات.

(**زَهَـقَ: إضْمَحَـلَّ بَعْـدَ وجُـودٍ، وَمَصْـدَرُهُ: الزُّهُـوُق وَالزَّهْـقُ**)، (**زَهَـقَ**) واتـە: دوای ئـەوەی کـە هەبـوو، لـە بەینچـوو، چاوگەکەشـی (**زُهُـوُق وزَهْـق**)ە.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّ ٱلْبَـٰطِلَ كَانَ زَهُوقًا ﴾، ئەمـە: (**تذييـلٌ لِلجُمْلَـةِ السَّـابِقَة، لِـمَا فِيـه مِـنْ عُمُـوم يَشْـمُلُ كُلَّ بَاطِـلٍ فِي كُلِّ زَمَـانٍ**) تەواوکـەری ڕسـتەی پێشـوویە، کـە مانایەکـی گشـتی تێدایـە، هەمـوو جـۆرە باتیـڵ و ناهەقێـك دەگرێتـەوە، لـە هەمـوو کات و شـوێنەکاندا.

دوای ئەوەی خوا ﷻ فەرمانی بە پێغەمبەر ﷺ کردوە، بە ئەنجامدانی ئەو پێنج کردەوە گەورانەی کە پێنج نوێژە فەڕزەکانن، هەروەها شەو نوێژیش، ئنجا فەرمانی پێکردوە بە: کردنی چەند قسەیەکی هەرەباش: هەم لە خوا بپاڕێتەوە کە داواکردنی سێ شتی گەورە و گرنگە لە خوای بەخشەر، هەم ئەو هەواڵەش بدات، کە هەق چەسپاو و باتیڵ پووچە.

**ئنجا لەو بارەوەش ئەم فەرموودەیە هەیە:**

**٢)- {عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، قَالَ: دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَكَّةَ عَامَ الفتحِ، وَحَوْلَ الْكَعْبَةِ ثَلاثُمِائَةٍ وَسِتُّونَ نَصْباً، (وَفِي رِوَايَةٍ لِمُسْلِمٍ صَنَمَاً) فَجَعَلَ النَّبِيّ ﷺ يَطْعُنُهَا بِمِخْصَرَةٍ فِي يَدِهِ، ورُبَّمَا قَالَ بِعُودٍ، يَقُولُ: ﴿ جَآءَ ٱلْحَقُّ وَزَهَقَ ٱلْبَـٰطِلُ ﴾} (أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ: ٢٦٧٨، وَمُسْلِمُ: ١٧٨١، وَالتِّرمِذِيُّ: ٣١٣٨).**

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە ساڵی ئازادکردنی مەککەدا چووە نێو مەککە و، لە دەوری کەعبە سێسەدو شەست (٣٦٠) پەیکەر، (لە گێڕانەوەیەکی موسلیم دا: (٣٦٠) صەنەم) دانرابوون، پێغەمبەر ﷺ بە گۆچانێك، یان بە دارێك[1] کە بە دەستیەوە بوو، لە بتەکانیەوە دەژەنی و، تێی دەکوتان و، دەیفەرموو: ﴿ جَآءَ ٱلْحَقُّ وَزَهَقَ ٱلْبَـٰطِلُ ۚ إِنَّ ٱلْبَـٰطِلَ كَانَ زَهُوقًا ﴾، لەسیرەدا هاتوە: هەر کاتێ ئاماژەی بۆ یەکێ لە بتەکان دەکرد، کە هەبووە بە ئاسن داکوتراوە، زۆر بە مەحکەمیی، هەر ئاماژەی بۆ دەکرد، یاخود بە ئاستەم گۆچانەکەی دەگەیاندێ، لەپەو ڕوو دەکەوت.

بەڵگە هێنانەوەی (**قرطبي**) بەم ئایەتە لەسەر ڕەوایی شکاندنی ئامێرەکانی مۆسیقا و بەرپەرچدانەوەی: (**القُرْطُبِي**)[2] دەڵێ:

**(فِي هَـذِهِ الآيَـةِ دَلِيـلٌ عَـلَى كَـسْرِ نُصُـبِ المُشْرِكِـينَ، وَجَمِيـعِ الأَوْثَـانِ، إِذَا غُلِـبَ عَلَيْهِـم، وَيَدْخُـلُ بِالمَعْنَـى: كَسْرُ آلَـةِ البَاطِـلِ كُلِّـهِ، وَمَـا لاَ يَصْلُـحُ إلاَّ لِمَعْصِيـةِ اللَّـهِ، كالطَنَابِـيرِ وَالعِيْـدَانِ والمَزَامِـيرِ الَّتِـي لا مَعْنَـى لَهَـا إِلاَّ اللَّهْـوَ بِهَـا عَـنْ ذِكْـرِ اللَّـهِ تَعَـالى.. وَقَـدْ هَـمَّ النَّبِـيُّ ﷺ بتَحْرِيـق دُور مَـنْ تَخَلَّـفَ عَـنْ صَـلاَةِ الجَمَاعَـةِ، وَهَـذَا أَصْـل فِي العقوبـة فـي المـال مـع قولـه ﷺ في النَاقـة التـي لعنتهـا صَاحِبتُهَـا «دَعُوهَـا**

---

(١) دەڵێ: (المِخْـصَرَةَ مـا يُتَـوَكَّأُ عَلَيْهَـا كَالْعَصَـا ونَحْوِهـا)، (مِخْـصَرَةٌ)، هـەر شـتێکە کـە سـەنگی بدرێتـە سـەر، وەك گۆچـان و شـێوەی وی، المعجـم الوسـيط، ص٢٣٧.

(٢) ج١٠ ص٢٥٩.

**فَإِنَّهَا مَلْعُونَـةٌ»**[١]، **فَـأَزَالَ مُلْكَهَـا عَنْهَـا تَأْدِيبـاً لصاحبتهـا وعقوبـةً لهـا، بِمـا دَعَـتْ بـهِ، وَقَـدْ أَرَاقَ عُمَـرُ بْـنُ خَطَّـابِ لَبَنَـاً شِـيبَ بِمَـاءٍ عَـلَى صَاحِبـهِ»**[٢]).

واتـه: لـەم ئایەتـەدا بەڵگـە هەیـە لەسـەر (ڕەوایـی) شـکاندنی پەیکـەر و تێکـڕای ئـەو بـت و صەنەمانـەی هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرەکان، هـەر کاتێـك مسـوڵمانان دەسـتەڵاتیان بـە سـەریاندا شـکا، ئنجـا بـە قیـاس بـۆ سـەر بـت و صەنەمـەکان، هەمـوو ئەوانـەی کـە ئامـڕازی شـتی خافـڵان و گۆرانییـن، دەچنـە نێـوی، هەروەهـا هـەر شـتێك کـە تەنیـا بـۆ سـەرپێچیی خـوا بەکاردەهێـنرێ، وەك (**طَنَابِـيرِ وعِيْـدانِ ومزامِيرِ**)[٣]، {(**طنبـير**) و (**عُـوُدَ**) و (**مِزْمَـار**)، هەموويـان ئامێـری مۆسـیقایین}، کـە هیـچ واتایەکیـان نیـە، جگـە لـە خافـڵان لـە یـادی خـوای بـەرز... پێغەمبەریـش ﷺ ویسـتی ماڵـی ئەوانـە بسـووتێنێ، کـە لـە نوێـژی بـە کۆمـەڵ دواکەوتبـوون، کـە ئەمـەش بنچینەیـە، لـە سـزادان لـە مـاڵ و سـاماندا، لەگـەڵ فەرمـوودەی پێغەمبـەر ﷺ، دەربـارەی ئـەو حوشـترەی کـە ئافرەتـە خاوەنەکـەی نەفرینـی لێکـرد، پێغەمبەریـش ﷺ فەرمـووی: {وازی لـێ بێنـن، (سـوود لـەو حوشـترە مەبینـن)، چونکـە نەفرینـی لـێ کـراوە} پێغەمبـەر ﷺ ئـەو حوشـترەی لـە ژێـر خاوەندارێتیـی ئـەو ئافرەتـەدا نەهێشـت، هـەم بـۆ ئـەوەی خاوەنەکـەی تەمبـێ بـکات و، هـەم جۆرێـك لـە سزاشـی بـدات، بـە هـۆی تـووك کردنیـەوە لـەو حوشـترە، بەڵگەیەکـی دیکـەش لەوبـارەوە: ئەوەیـە کـە عومـەری کـوڕی خەتتـاب ﷺ، شـیرێك کـە ئـاوی تێکـەڵ کرابـوو، لـە خاوەنەکـەی ڕشـت و بـە گۆڕێـی وەرکـرد.

## وەڵام و هەڵوەشاندنەوەی ئەو بەڵگە هێنانەوەیە:

دەڵێـم: ئـەوەی کـە (**قرطبـي**) هێناویەتـی (ڕەحمەتـی خـوای لێی بـێ)، دیـارە ڕای ژمارەیەك لـە زانایانـی دیکەشـە، بـە تایبەتی حەنبەلییـەکان، بـەڵام بێگومـان ئایەتەکـەش و فەرموودەکەش کـە عەبدوڵـڵای کـوڕی مەسـعوود گێڕاویەتـەوە، دەربـارەی ئـەو بـت و صەنەمانـەی لـە دەوری کەعبـە دانـراون، ئنجـا پەیوەسـتکردنەوەیان بـە هەرچـی ئامێـری مۆسـیقا و گۆرانیـی هەیـە، بـە بیانـووی ئـەوەی کـە ئەوانـە مایـەی خافڵانـی خەڵکـن! ئـەوە وێـڕای عەقـڵ و لۆژیـك و ڕێـرەوی گشـتی ئیسـلام، لەگـەڵ سـوننەتی کردەیـی پێغەمبەریشـدا ﷺ تێکدەگیـرێ، چونکـە:

---

(١) أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ: ٢٥٩٥، وَأَبُو دَاوُدَ: ٢٥٦١، عَنْ عِمْرَان بْنِ حُصَيْنٍ.

(٢) أخرجه والبخاري: ٦٤٤، ومسلم: ٦٥١.

(٣) (الطَنَابِـيرِ)، کـۆی (طُنْبُر)ە، (العِيْـدانِ)، کـۆی (عُـوُدَ)ە، (المزامِيرِ)، کـۆی (مِزْمَـار)ە، هەمووشـیان لـە ئامێـر و ئامـڕازەکانی موسـیقا و گـۆرانی و سروودن.

وەك لە كتێبی: (چەند بابەتێكی هونەریی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەت دا) كە بە تەفصیل هەموو ئەو شوێنەوارانە و ئەو فەرمایشتانەم هێناون، كە زانایان لەوبارەوە پشتیان پێ بەستوون، چ بۆ:

أ - بەناڕەوا دانانی بەكارهێنانی ئامێرەكانی مۆسیقا و سروود و گۆرانیی.

ب - بەڕەوا دانانی بەكارهێنانی ئامێرەكانی مۆسیقا و سروود و گۆرانیی، بەچەند مەرجێك و بەتایبەتی لە بۆنەكان دا.

ئەمەش ئاماژەیەك بە سێ لەو دەقانەی سوننەت كە زۆر بەڕوون و ڕاشكاویی ڕەوایی بەكارهێنانی ئەو ئامێرانە - بە گشتی - دەگەیەنن:

١) - پێغەمبەر ﷺ لە ماڵی خۆیدا، لە كاتێك دا دایكمان عائیشە دانیشتوە، ئافرەتێك هاتوە، ئەویش فەرموویەتی: ئەی عائیشە! ئەمە دەناسی؟ گوتی نەخێر، ئەی پێغەمبەری خوا، ئەوە گۆرانیی بێژی فلان هۆزەیە، پێت خۆشە گۆرانییت بۆ بڵێ؟ گوتی: بەڵێ، ئنجا گۆرانیی بۆ گوت، پێغەمبەر ﷺ سینییەك، یان تەشتێكی وێدا [كە لە جیاتی دەف و تەپڵ بە كاری بێنێ، چونكە دەف و تەپڵیان پێ نەبووە] ئەمەش دەقی ئەو ڕووداوەیە كە بەچەند گێڕراوەیەك هاتوە: (**عن السائب بن يزيد أن آمرأة جاءت إلى رسول اللّه ﷺ، فقال: يا عائشة! أتعرفين هذا؟ قالت: لا يا نبيَّ اللّه، فقال: هذه قَيْنَة بني فلان، تحبين أن تُغنِّيك؟ قالت: نعم، قال: فأعطاها طبقاً فَغَنَّتْها،...) رواه أحمد والنسائي والطبراني وهو صحيح.**

٢)- هەروەها كاتێك ئافرەتێكیان گواستۆتەوە بۆ هاوسەرەكەی، دایكمان عائیشە لەگەڵی دا چووە، دوایی پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {**يَا عَائِشَةُ! مَا كَانَ مَعَكُمْ لَهْوٌ! فَإِنَّ الْأَنْصَارَ يُعْجِبُهُمْ اللَّهْوُ**} (**أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ**: ٤٨٦٨). واتە: ئەی عائیشە! ئایا (**لَهُو**)[١]تان پێ نەبوو! ئەنصارییەكان حەزیان لە (**لَهُو**) یە.

كەواتە: ئەوەی (**قُرْطُبِي**) و، هەندێك لە زانایان لە تەفسیرەكانی دیكەش دا هێناویانە، ئەم ئایەتە بە هیچ جۆرێك نایگرێتەوە و لەگەڵ سوننەتی كردەیی پێغەمبەریش دا ﷺ ناكۆكەدا، بەڵێ، مسوڵمانان دەبێ ئاگایان لێبێ، لە فەرزەكان نەخافڵێن و، لە بەكارهێنانی ئامێرەكانی گۆرانی و مۆسیقا و سروودا، زێدەڕۆیی نەكەن و لەسەر حیسابی ئەركە شەرعییەكانیان نەبێ و، بۆ مەبەستی خراپ بەكاریان نەهێنن، وەك: جووڵاندنی غەریزە خراپەكان، بۆ

---

(١) (لَهُو)، ئامێری گۆرانیی و سروود پێ گوتن، واتە: ئامێرە مۆسیقاییەكان وەك: تەپڵ و دەف و... هتد.

وێنە: غەریزەی شەڕەنگێزیی، غەریزەی جینسیی، بەڵام ئەگەر بە شێوەیەکی ئاسایی بێ و لە بۆنەکاندا بێ، ئنجا ژن هێنانە، مەڕە منداڵەیە، کەسێك کە لە سەفەر دێتەوە، کەسێك لە نەخۆشییەك چاك دەبێتەوە، لەو بۆنانەدا لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ ئەوانە بوون.

**٣)**- جارێکیان پێغەمبەر ﷺ لە غەزایەك، لە سەفەرێك، گەڕایەوە: {فَجَاءَتْ جَارِيَةٌ سَوْدَاءُ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! إِنِّي كُنْتُ نَذَرْتُ إِنْ رَدَّكَ اللَّهُ تَعَالَى سَالِمًا أَنْ أَضْرِبَ عَلَى رَأْسِكَ بِالدُّفِّ، فَقَالَ: إِنْ كُنْتِ نَذَرْتِ فَافْعَلِي، وَإِلاَّ فَلَا، قَالَتْ: إِنِّي كُنْتُ نَذَرْتُ، قَالَ: فَقَعَدَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَضَرَبَتْ بِالدُّفِّ} (**أخرجه أحمد: ٢٣٠٦١، وابن حبان: ٤٣٨٦، قال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح رجال ثقات رجال الصحيح، وأخرجه أيضا وأبو داود: ٣٣١٤**).

واتە: کەنیزەکێکی ڕەش پێست هات، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! لەسەر خۆمم پێویست کردبوو (نەزرم کردبوو) کە ئەگەر خوای بەرز بە سەلامەتیی تۆی گەڕاندەوە، دەف لەسەر سەرت لێبدەم، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: ئەگەر نەزرت کردوە لەسەر خۆت، بیکە و ئەگەر نەتکردوە، مەیکە، گوتی: نەزرم کردوە، پێغەمبەری خواش ﷺ دانیشت، ئەویش دەفی لێدا.

دیارە نەزریش - مادام پێغەمبەر ﷺ بفەرموێ: ئەگەر نەزرت کردوە - یان لە شتی پێویست دا، یان لە شتی سوننەت و پەسند دا، یان لە ڕەوا و موباح دا، دەبێ، لە شتی حەرام دا نابێ و، ئەگەر دەف لێدان و گۆرانیی گوتن حەرام و قەدەغە بووایە، پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: نەزر لە شتی حەرام و قەدەغەدا نابێ و، ئەو شتەش قەدەغەیە و نابێ بیکەی!

کەواتە: هەندێك لە زانایان (ڕەزا و ڕەحمەتی خوایان لێبێ)، هەر چاویان لەسەر ئەو هەل و مەرج و ژینگەیە بووە، کە لە مێشکی خۆیان دا بووە و، لە بەرچاویان بووە زۆریش لە هەستیارییان بەرانبەر بە ئامێرەکانی مۆسیقا و گۆرانیی و سروود دا، کاردانەوە بووە، لە ئەنجامی ئەوەدا کە بە زۆریی ئەو ئامێرانە لە لایەن خەڵکی گوناهبار و سەرپێچییکار و تاوانبارەوە بەکارهاتوون، کە لە ڕۆژگاری ئێمەش دا هەر وایە، بەڵام بێگومان شتی ڕەوا، حەرام نابێ، لەبەر ئەوەی خەڵکێکی خراپ بەکاری دێنێ، چونکە دەگونجێ خەڵکی باش بۆ مەبەستێکی باش و ڕەوا بەکاری بێنێ، وەك تفەنگ و دەمانچە: کەسێك خەڵکی پێ بکوژێ و، زوڵمی پێ بکات: حەرامە، بەڵام لە خودی خۆی دا بێ

لایەنە و، ئەگەر کەسێك لەڕێی خواو چەوساوان دا، جەنگی پێ بکات، یان بەرگریی پێ لە خۆی بکات و، مەبەستێکی باشی پێ بێنێتە دی، ئەو کاتە هەبوون و بەکارهێنانی، نەك هەر ڕەوا، بگرە پەسند و پێویستیش دەبێ، ئنجا ئەو مەسەلەیە بەگشتی دەکەوێتە بەر حوکمی ئەو بنچینە شەرعییە کە دەڵێ: (**للوسائل حكم المقاصد**) ئامڕازەکان هەمان حوکمی ئامانجەکانیان هەیە.

سُبْحَانَك اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان پـازدە (١٥) ئایـەت دەگرێتـە خـۆی، ئایەتەکانـی (٨٢- ٩٦)، ئنجـا هەرچەنـدە لەمیانـی ئـەو پـازدە (١٥) ئایەتـەدا، چەنـد بابەتێکـی جـۆراو جـۆر باسـکراون، بـەڵام تـەوەری سـەرەکیی ئـەو پـازدە (١٥) ئایەتـە، باسـی قورئانـە، لـەو ڕووەوە کـە دابەزێـنراوی خوایـە و، ئەگـەر مـرۆڤ و جنـد، کۆببنـەوە و هاوکاریـی یەکـدی بکـەن، ناتوانن وێنـەی قورئان بێنـن، پاشـان باسـی ژمارەیـەك لـە داواکارییەکانـی کافـرەکان دەکات، کـە وەك بیانووگرتـن دەیانکردنـە مەرجـی بڕواهێنانیـان، کـە حـەوت (٧) داواکارییـن:

پاشـان بیانـووی سـەرەکیی کافـران بـۆ بڕوانەهێنانیـان بـە وەحیـی پێغەمبـەران (علَیهِـم الصَّـلاةُ وَالسَّـلام)، ڕوون دەکاتـەوە بـە درێژایـی مێـژوو، کـە بریتیـە لـە مرۆڤبوونـی پێغەمبـەران (علَیهِـم الصَّـلاةُ وَالسَّـلام)!

لـە کۆتاییشـدا خـوای کارزان، وەڵامـی ئـەو بیانووەیـان دەداتـەوە و، بـە پێغەمبەریـش ﷺ دەفەرمـوێ: کـە پێیـان بڵـێ: خـوا بەسـە شـایەد بـێ لـە نێوانمـان دا، چونکـە شـارەزا و بینـەری کـردەوە و هەسـت و خوسـتی بەندەکانیەتـی.

﴿ وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ۙ وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارًا ﴿٨٢﴾ وَإِذَآ أَنْعَمْنَا عَلَى ٱلْإِنسَٰنِ أَعْرَضَ وَنَـَٔا بِجَانِبِهِۦ ۖ وَإِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ كَانَ يَـُٔوسًا ﴿٨٣﴾ قُلْ كُلٌّ يَعْمَلُ عَلَىٰ شَاكِلَتِهِۦ فَرَبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَنْ هُوَ أَهْدَىٰ سَبِيلًا ﴿٨٤﴾ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِ ۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّى وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٨٥﴾ وَلَئِن شِئْنَا لَنَذْهَبَنَّ بِٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ ثُمَّ لَا تَجِدُ لَكَ بِهِۦ عَلَيْنَا وَكِيلًا ﴿٨٦﴾ إِلَّا رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ ۚ إِنَّ فَضْلَهُۥ كَانَ عَلَيْكَ كَبِيرًا ﴿٨٧﴾ قُل لَّئِنِ ٱجْتَمَعَتِ ٱلْإِنسُ وَٱلْجِنُّ عَلَىٰٓ أَن يَأْتُوا۟ بِمِثْلِ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ لَا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِۦ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا ﴿٨٨﴾ وَلَقَدْ صَرَّفْنَا لِلنَّاسِ فِى هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ مِن كُلِّ مَثَلٍ فَأَبَىٰٓ أَكْثَرُ ٱلنَّاسِ إِلَّا كُفُورًا ﴿٨٩﴾ وَقَالُوا۟ لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّىٰ تَفْجُرَ لَنَا مِنَ ٱلْأَرْضِ يَنۢبُوعًا ﴿٩٠﴾ أَوْ تَكُونَ لَكَ جَنَّةٌ مِّن نَّخِيلٍ وَعِنَبٍ فَتُفَجِّرَ ٱلْأَنْهَٰرَ خِلَٰلَهَا تَفْجِيرًا ﴿٩١﴾ أَوْ تُسْقِطَ ٱلسَّمَآءَ كَمَا

زَعَمْتَ عَلَيْنَا كِسَفًا أَوْ تَأْتِيَ بِاللَّهِ وَالْمَلَائِكَةِ قَبِيلًا (٩٢) أَوْ يَكُونَ لَكَ بَيْتٌ مِّن زُخْرُفٍ أَوْ تَرْقَىٰ فِي السَّمَاءِ وَلَن نُّؤْمِنَ لِرُقِيِّكَ حَتَّىٰ تُنَزِّلَ عَلَيْنَا كِتَابًا نَّقْرَؤُهُ قُلْ سُبْحَانَ رَبِّي هَلْ كُنتُ إِلَّا بَشَرًا رَّسُولًا (٩٣) وَمَا مَنَعَ النَّاسَ أَن يُؤْمِنُوا إِذْ جَاءَهُمُ الْهُدَىٰ إِلَّا أَن قَالُوا أَبَعَثَ اللَّهُ بَشَرًا رَّسُولًا (٩٤) قُل لَّوْ كَانَ فِي الْأَرْضِ مَلَائِكَةٌ يَمْشُونَ مُطْمَئِنِّينَ لَنَزَّلْنَا عَلَيْهِم مِّنَ السَّمَاءِ مَلَكًا رَّسُولًا (٩٥) قُلْ كَفَىٰ بِاللَّهِ شَهِيدًا بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ إِنَّهُ كَانَ بِعِبَادِهِ خَبِيرًا بَصِيرًا (٩٦)

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

{لە قورئانیش ئەوە دادەبەزێنین کە چارەسەر و بەزەییە بۆ بڕواداران و، هەر زیانبارییش، بۆ ستەمکاران زێدە دەکات (٨٢) هەر کاتێکیش چاکەمان لەگەڵ مرۆڤ (ی بێبڕوادا کرد) ڕوو وەردەگێڕێ و لاتەنیشتی وەدوور دەخات و، هەر کات زیان و خراپەشی تووش بوو، زۆر نائومێد دەبێ (٨٣) بڵێ: هەر کام (لە مرۆڤەکان) بە پێی سروشت و پێکهاتەی خۆی کار دەکات، ئنجا پەروەردگارتان بەو کەسە زاناترە، کە ڕێی ڕاستتری گرتوە (٨٤) لە بارەی گیانیشەوە پرسیارت لێدەکەن، بڵێ: گیان (ڕووح) لە فەرمان (وکار) ی پەروەردگارمە و، کەمێکیش نەبێ زانیارییتان پێ نەدراوە (بەو کەمە زانیارییەش چییەتی ڕووح نازانن) (٨٥) ئەگەر بشمانەوێ ئەو قورئانەی بۆمان سروش کردووی (لە عەقڵ و دڵتدا) لایدەبەین، دوایی هیچ بریکار و سەرپەشتیکارێکت لە بەرانبەرمان دا بۆ (پاراستنی) وی، چنگ ناکەوێ (٨٦) بەڵام لە سۆنگەی بەزەییەك لە پەروەردگارتەوە (ئەوە ناکەین) بە دڵنیایی چاکە و بەخششی وی، بە سەرتەوە گەورەیە (٨٧) بڵێ: ئەگەر مرۆڤ و جند لەسەر ئەوە کۆببنەوە، کە وێنەی ئەم قورئانە بێنن، وێنەی ویان پێ نایەت، هەرچەندە هەندێکیشیان پشتیوانی هەندێکیان بن (٨٨) بە دڵنیاییش ئێمە لە قورئاندا، هەموو پەندێکی جۆرا و جۆرمان بۆ خەڵکی باسکردوە، کەچی زۆربەی خەڵکی ناسپاسیی نەبێ، نەیانویست (٨٩) گوتیشیان: بڕوات بۆ ناهێنین، هەتا لە زەوی کانیاومان بۆ دەرنەقوڵێنی (٩٠) یان باغێکت هەبێ لە دارخورما و ترێ و، ڕووبارگەلیان بە نێودا بەفڕکە هەڵقوڵێنی (٩١) یان وەك لاف لێدەدەی: ئاسمانمان پارچە پارچە بە سەردا بخەیە خوارێ، یان خوا و فریشتان بە کۆمەڵ (یان بەرەو ڕوومان) بێنی (٩٢)

یـان ماڵێکـت لـە زێـڕ هەبـێ، یـان بـەرەو ئاسـمانێ بەرزبیـەوە و سـەربکەوی و، هەرگیزیـش بـڕوا بـە بەرزبوونەوەکـەت ناکەیـن، هەتـا نووسراوێکـمان بـۆ دانەبەزێنـی، بیخوێنینـەوە! بڵـێ: پاکیـی (بـێ خەوشـیی) بـۆ پـەروەردگارم، ئایـا مـن تەنیـا پێغەمبەرێکـی مـرۆڤ نیـم؟! ﴿٩٣﴾ هیـچ شـتێکیش ڕێـی لـە خەڵـك (ی بێبـڕوا) نەگـرت، کاتێـك ڕێنماییـان بـۆ هـات لـە خـواوە، کـە بـڕوا بێنـن، مەگـەر ئـەوە کـە گوتیـان، ئایـا خـوا مرۆڤێکـی بـە پێغەمبـەر ناردووە؟ ﴿٩٤﴾ بڵـێ: ئەگـەر هاتبـا و لەسـەر زەوی فریشـتەی لێبوونایـە بـە ئاراميـی ڕۆیشـتبانایە (بەسـەر زەویـی دا)، ئـەوە لـە ئاسـمانەوە فریشـتەمان بـە پێغەمبـەر دادەبەزانـدە سـەریان (بـەڵام چونکـە ئـەوان مرۆڤـن، ڕەوانەکـراوی مرۆڤیشـمان بـۆ ناردووون) ﴿٩٥﴾ بڵـێ: خـوا بەسـە لـە نێـوان مـن و ئێـوەدا شـایەد و چاودێـر بـێ، بـە دڵنیایـی ئـەو شـارەزا و بینـەری بەندەکانیەتـی (ئـاگاداری هەمـوو هەسـت و خوسـتێکیان و ئاشـکرا و پەنهانیانـە) ﴿٩٦﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(شِفَآءٌ): (الشِّفَاءُ: البُرْءُ مِنَ المَرَضِ، دَواءُ النَفْسِ)، (شفاء) واتە: چارەسەر، لێرەدا دەڵێ: چاکبوونەوە لە نەخۆشیی، یاخود دەرمانی دەروون، چارەسەری دەروون.

(خَسَارًا ): (خَسَرَ التاجِرُ: يَخْسَرُ خَسْراً، وخُسْراً، وخَسارةً، وخُسْراناً)، (غُبِنَ فِي تِجارَتِهِ، ونَقَصَ مالُهُ فِيها)، (وخَسِرَ فُلانٌ: هَلَكَ وَضَلَّ، وخَسِرَ الشَّيءَ: أضاعَهُ)، وشەی (خَسَارًا )، چاوگە لە (خَسَرَ التاجِرُ يَخْسَرُ خَسْراً وخُسْراً وخَسارةً وخُسْراناً)، بازرگانەکە زیانی کرد، زیان دەکا بە زیان لێکەوتن، واتە: لە بازرگانییەکەی دا زیانی لێ کەوت و زەرەری کرد، یاخود ماڵ و سامانەکەی لە بازرگانییەکەی دا کەمی کرد، بەڵام (خَسِرَ فُلَانٌ: أي هَلَكَ وَضَلَّ) واتە: فەوتا و و گومڕا بوو، هەروەها (وخَسِرَ الشَّيءَ)، واتە: ئەو شتەی لێ زایە بوو، لە دەستی فەوتا، کەواتە: (خَسَرَ التاجِرُ)، (خَسَر) (لازم)ە، بەڵام (خَسِرَ)، هەم بە لازم دێ، (خَسِرَ فُلانٌ)، واتە: فەوتاو گومڕا بوو، هەم بە (متعدّي)یش دێ، وەك: (خَسِرَ فُلانٌ الشَّيء)، واتە: ئەو شتەی لە دەستچوو.

(وَنَـَٔا ): (نأى عَنْهُ نأياً: بَعُدَ فَهُوَ نَاءٍ)، (نأى بِجانِبِه: تَكَبَّرَ)، (نأى عَنْهُ نأياً) واتە: لێی دوور کەوتەوە، لێ دوور کەوتنەوە، (فَهُوَ نَاءٍ) ئەو دوورە، (نأى بِجانِبِه)، واتە: تەنیشتی خۆی وەدوور خست، کە مەبەست پێی خۆ بەزل گرییە.

(بِجَانِبِهِۦ)، (الجَانِبُ: شِقُّ الإنْسَانِ وغَيْرِهِ)، تەنیشتی مرۆڤ و کەلەکەی مرۆڤ و جگە لە مرۆڤیش، وەك لە پەند دا هاتوە: (إن جانِبٌ أعْيَاكَ، فَالْحَقْ بِجَانِبٍ)، گەر لایەك تۆی ماندوو و، دەستە پاچە کرد، لایەکی دیکە بگرە، هەروەها لە پەند دا هاتوە: (إنْهُ مُنْتَفِخُ الجَوانِبِ: أي مُتَكَبِّرٌ)، واتە: ئەو لاتەنیشتەکانی فوو دراون، واتە: خۆ بە زلگرە.

(يَـُٔوسًا)، (يَئِسَ مِنْهُ: إنْقَطَعَ أَمَلُهُ مِنْهُ، فَهُوَ يائِسٌ ويَئُوسٌ ويَئِسٌ)، (يَئِسَ مِنْهُ) واتە: هیوای پێی نەما، (فَهُوَ يائِسٌ)، ئەو بێ هیوایە، بێ ئومێدە، (ويَئُوسٌ)، ڕێژگە (صيغة)ی زێدەڕۆییە بۆ (يائِسٌ)، واتە: زۆر نائومێد، هەروەها (يَئِس)، بە هەمان شێوە، یانی: زۆر نائومێد.

(شَاكِلَتِهِۦ)، (الشَاكِلَةُ: السَّجِيَّةُ والطَّبْعُ)، (الشَاكِلَة)، بە مانای سروشت و پێکهاتە دێ.

(ظَهِيرًا )، (الظَهِير)، واتە: یارمەتییدەرو هاوکار، بۆ تاك و بۆ کۆش، دێ،

(يَنۢبُوعٗا )، (يَنْبُـوع) واتـە: کانیـی و سـەرچاوە، (عَـيْنُ المَـاءِ، والجَمْـعُ يَنابِيـع، نَبَعَ المَـاءُ نَبْعـاً ونُبُوعَاً: خَـرَجَ، وأَنْبَـعَ المَـاءَ: أَخْرَجَـهُ)، (نَبَـعَ المَـاءُ نَبْعـاً ونُبُوعَـاً)، واتـە: ئاوەکـە هەڵقوڵـی بـە هەڵقوڵیـن، هاتـە دەر لـە سـەرچاوەکە، (أَنْبَـعَ)، واتـە: ئاوەکـەی هەڵقوڵانـد، هێنایـە دەر.

( تَفۡجُرَ )، (فَجَرَ المَاَءَ: شَقَّ لَهُ طَرِيْقَاً)، واتە: ڕێی بۆ ئاوەکە کردەوە، ئاوەکەی دەرقوڵاند.

(قَبِيلًا )، (القَبِيـلُ: الجِيـلُ، الجَمَاعَـةُ الأتبـاع)، واتـە: پشـتێك (وەچەیـەك) کۆمەڵـە خەڵکێـك، شـوێن کەوتـووان، هەروەهـا (قَبِيـلٌ) بـە مانـای (ضَامِـنٌ أَوِ كَفِيـلٌ)، ئۆباڵـدار و بریکاریـش، دێ.

(زُخۡرُفٖ )، (الزُخْـرُف: الذَّهَـب، الزِّينَـةُ، وكَـمالُ حُسْـنُ الـشَّيء، وزُخْـرُفُ الأَرْضِ: أَلْـوانُ نَبَاتِهـا وزَخْـرَفَ الـشَّيءَ: زَيَّنَـهُ)، (زخـرُف)، بـە مانـای زێـڕ دێ، هەروەهـا بـە مانـای جوانیـی و ڕازاوەیـی دێ، دەگوتـرێ: (زَخْـرَفَ الـشَّيءَ)، ئـەو شـتەی زۆر ڕازاندۆتـەوە و جوانـی کـردوە، نەخـش و نیـگاری تێـدا کـردوە (زُخْـرفُ الأَرْضِ)، ئـەو ڕووەکـە ڕەنـگاو ڕەنگانـەن کـە تێیـدا دەڕوێـن.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

١)- هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە، کە دەفەرموێ: ﴿ وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنۡ أَمۡرِ رَبِّي وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلۡعِلۡمِ إِلَّا قَلِيلٗا ﴿٨٥﴾ ﴾

لەوبارەوە ئەم دوو گێڕراوەیە دێنین:

أ)- {عَنْ عَبْدِاللَّهِ ابْنِ عبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قالَ: قَالَتْ قُرَيْشُ لِلِيَهُود: أَعْطُونَا شَيْئَاً نَسْأَلُ عنهُ هَذَا الرَّجُلَ، فَقَالَوا: سَلُوهُ عَنِ الرُّوحِ، فَسَأَلُوهُ عَنِ الرُّوحِ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تعالى: ﴿ وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِ ﴿٨٥﴾ ﴾ قَالُوا: أُوتِيْنَا عِلْمَاً كَثِيراً: أَوتِيْنَا التَّورَاةَ، وَمَنْ أُوتِيَ التَّوراةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْرَاً كثيراً، فأُنزلَت: ﴿ قُل لَّوۡ كَانَ ٱلۡبَحۡرُ مِدَادٗا لِّكَلِمَٰتِ رَبِّي لَنَفِدَ ٱلۡبَحۡرُ قَبۡلَ أَن تَنفَدَ كَلِمَٰتُ رَبِّي وَلَوۡ جِئۡنَا بِمِثۡلِهِۦ مَدَدٗا ﴿١٠٩﴾ ﴾الكهف} (أَخْرَجَهُ أَحْمَد فِي المسند ج١، ص٢٥٥، وَالتِّرمِذِيُّ: ٣١٤٠، وَالنَّسَائِيُّ فِي الكُبْرَى:: ٦٠٨٣، ١١٣١٤، وَابْنُ حِبَّانَ فِي: ٩٩، وَالحَاكِمُ ج ٥، ص٥٣١، وَالبَيْهَقِي فِي دلائل النبوة: ج٢، ص٤٦، وَأَبُو يَعْلَى فِي المسند: ٢٥٠١، الإِستِيعَاب ج٢، ص٤٥٤، قُلْنَا: وَهَذَا إِسْنَاد صَحِيح عَلَى شَرْطِ الشَّيْخَيْنِ وَلَم يخرجاه).

واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی عەببـاس (خـوا لـە خـۆی و بـابی ڕازی بـێ) دەڵـێ: قورەیشـییەکان بـە جوولەکەکانیـان گـوت: شـتێکمان پـێ بڵێـن، لـە بارەیـەوە لـەو پیـاوە بپرسـین، جوولەکەکان

گوتیان: لە بارەی ڕووحەوە لێی بپرسن، پرسیاریان لێکرد دەربارەی ڕووح، خوای پەروەردگار ئەم ئایەتەی نارده خوار: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّى وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٨٥﴾ ﴾، جوولەکەکان گوتیان: ئێمە زانیارییەکی زۆرمان پێدراوە، تەوراتمان پێدراوە، کەسێکیش تەوراتی پێدرابێ، زانیاریی و خێر و چاکەی زۆری پێدراوە، ئنجا ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿ قُل لَّوْ كَانَ ٱلْبَحْرُ مِدَادًا لِّكَلِمَٰتِ رَبِّى لَنَفِدَ ٱلْبَحْرُ قَبْلَ أَن تَنفَدَ كَلِمَٰتُ رَبِّى وَلَوْ جِئْنَا بِمِثْلِهِۦ مَدَدًا ﴿١٠٩﴾ ﴾ **الكهف**، واتە: بڵێ: ئەگەر دەریا مەرەکەبی وشەکانی پەروەردگارم بووایە، دەریا تەواو دەبوو، بەر لەوەی وشەکانی پەروەردگارم تەواوبن، هەرچەندە ئەوەندەی دیکەشمان خستبایە سەری.

ب)- {**عَن عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: بَيْنَا أَنَا أَمْشِي مَعَ النَّبِيِّ ﷺ، فِي خَرِبِ الْمَدِينَةِ، وَهُوَ يَتَوَكَّأُ عَلَى عَسِيبٍ مَعَهُ، فَمَرَّ بِنَفَرٍ مِنَ الْيَهُودِ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ: سَلُوهُ عَنِ الرُّوحِ، فَسَأَلُوهُ، فأنزل اللّه تعالى:** ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّى وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٨٥﴾ ﴾}
**(أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ: ٧٤٦٢، وَمُسْلِمٌ: ٢٧٩٤).**

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: من لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ دەڕۆیشتم، لە نێو هەندێك لە کەلاوەکانی مەدینەدا (لە ڕیوایەتێکی دیکەدا دەڵێ: لە هەندێك لە کێڵگە کشتوکاڵییەکانی مەدینەدا) گۆچانێکی بە دەستەوە بوو، لە لقی دارخورما دروست کرابوو، کۆمەڵێك لە جوولەکەکان بە لایدا تێپەڕین، هەندێکیان گوتیان: لە بارەی ڕووحەوە پرسیاری لێ بکەن، ئەوانیش لەو بارەوە پرسیاریان کرد و، خواش ئەو ئایەتەی دابەزاند...

بە پێی ئەوەی دووەمیان بێ، دەبێ لە مەدینە ئەو پرسیار و وەڵامە بووبێ، بەڵام بە پێی گێڕراوەکەی عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس، دەبێ لە مەککە بووبێ، چونکە قوڕەیشییەکان لە جوولەکەکانیان پرسیوە، واتە: چوون بۆ مەدینە و لە جوولەکەکانیان پرسیوە: شتێکمان پێ بڵێن، لەو پیاوەی بپرسین.

هەڵبەتە ئەو سوورەتەی (**الإسراء**) مادام سوورەتێکی مەککەییە، دەبێ ئەو پرسیار و وەڵامەش هەر لە مەککە بووبێ، بەڵام دەشگونجێ ئەو پرسیار و وەڵامە لە مەدینەش لە لایەن جوولەکەکانەوە بووبێ، هەروەك چۆن لەلایەن قوڕەیشییەکانیشەوە بووە، پێغەمبەریش ﷺ هەر هەمان وەڵامی دابێتەوە، وەك لە سەرەتای سوورەتی (**الكهف**)دا خوا پشتیوان بێ، کە بیگەینێ، لە هۆی هاتنە خوارەوەکەیدا باسی دەکەین.

## مانای گشتی ئایەتەکان

خـوا ﷻ لـەم پـازدە ئایەتـەدا ئایەتـەکانی: (٨٢ - ٩٦) کۆمەڵێـك ڕاسـتیی گـەورەو گرنـگ دەخاتـە ڕوو، ڕاسـتیی جـۆراو جـۆر، کـە هەموویـان پەیوەسـتن بـە دەسـتەڵات و، سـیفەتە ڕەهـاو بـێ سـنوورەکانی خـواوە ﷻ، وەك بەدیهێنەرێتیـی و پەروەردگارێتیـی خـوا، کـە خـوا ﷻ لەمیـانی خسـتنەڕووی ئـەو ڕاسـتییانەدا، زیاتـر خـۆی بـە بەنـدەکانی دەناسـێنێ و دەسـتەڵات و، زانیاریـی و، میهرەبانیـی و، حیکمـەت و، ویسـتی ڕەهـای خـۆی، دەخاتـە ڕوو، تاکـو واداریـان بـکات کـە خوایـەك ﷻ بـەو شـێوەیە بـێ، شایسـتەی ئەوەیـە کـە تەنیـا بەندایەتیـی بـۆ ئـەو بکـرێ و تەنیـا ئـەو بپەرسـترێ، بەمانـای گشـتگیر و فـراوانی پەرسـتن و بەندایەتیـی.

یەکەمیـن ڕاسـتیی کـە خـوا ﷻ دەیخاتـە ڕوو لـەم پـازدە ئایەتـەدا، بـاسی چارەسـەربوونی قوڕئانـە، دەفەرمـوێ: ﴿ وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴾، ئـەوەی لـە قوڕئـان دایدەبەزێنیـن، یـان قوڕئانێـك کـە دایدەبەزێنیـن، چارەسـەرو، بەزەییـە بـۆ بـڕواداران، ﴿ وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارًا ﴾، بـەڵام ستەمکاران، تەنیـا زیانبارییـان بـۆ زێـدە دەکات، واتـە: سـتەمکاران لێـی بەهرەمەنـد نابـن، بەڵکـو دەبێتـە هـۆکاری زیانباربـوونی زیاتریـان، دواتـر ئـەوە زیاتـر شـی دەکەینـەوە، کـە جـاری وایـە: یـەك هـۆکار، بـەڵام بـە جیاوازیـی ئـەو کەسـانەی ئـەو هـۆکارە ڕوویـان تێـدەکات، بـە جیاوازیـی سروشـت، جیاوازیـی ئامادەییـان و هەڵکەوتەیـان، کاریگەریـی جیاوازیـان لەسـەر دادەنـێ، بەڵکـو جـاری وایـە کاریگەریـی دژ یـەك (**متناقض**)یـان لەسـەر دادەنـێ، وەك لێـرەدا خـوای تـاك وپـاك بـاسی دەکات کـە: ئـەوەی لـە قوڕئـان دایدەبەزێنـێ، چارەسـەرو ڕەحمەتـە بـۆ بـڕواداران، کەچـی سـتەمکاران هـەر زیاتر پێـی زیانبـار دەبن!

ئنجـا دێتـە سـەر خسـتنەڕووی ڕاسـتییەکی دیکـە، کـە وەك پێشـتریش گوتمـان: ئـەوەی هەمـوو ئـەو ڕاسـتییانە پێکـەوە کۆدەکاتـەوە: خسـتنەڕووی دەسـتەڵات و توانایـی و سـیفەتە بـەرزو بـێ وێنـەکانی خوایـە و لەمیـانی ئەوەشـدا خۆناسـاندنی زیاتـری خـوای بـەرز و مەزنـە بـە بەنـدەکانی، وەك تاکـە بەدیهێنـەر، تاکـە پـەروەردگار، تاکـە خـاوەن، تاکـە سـەرچاوەی هەرچـی چاکـە و نیعمەتـە لـە ژیـانی مرۆڤـدا، کـە دوایـی ئەنجامگیرییـەکی ژیربێژانـە کـە لـەوە دەکـرێ، ئەوەیـە کـە: مرۆڤەکانیـش دەبـێ تەنیـا ئـەو تاکـە بەدیهێنـەرو، تاکـە پـەروەردگارو، تاکـە خـاوەن و، تاکـە خـاوەن چاکەیـە لـە ژیـانی مرۆڤـدا، بپەرسـتن.

دەفەرمـوێ: ﴿ وَإِذَآ أَنْعَمْنَا عَلَى ٱلْإِنسَٰنِ أَعْرَضَ وَنَـَٔا بِجَانِبِهِۦ ﴾، هـەر کاتیـش چاکەمـان لەگـەڵ مرۆڤـدا کـرد، ڕوو وەردەگیـرێ، ڕوو وەردەچەرخێنـێ و پشـت هەڵـدەکات، ﴿ وَنَـَٔا بِجَانِبِهِۦ ﴾، تەنیشـتی خۆیـشی دووردەخاتـەوە، کەلەکـەی خـۆی قـووڵ دەکات دەسـووڕێتەوە، یاخـود: تەنیشـتی تێـدەکات نـەك ڕووی تێبـکات.

یاخـود مەبەسـت لـە: ﴿ وَنَـَٔا بِجَانِبِهِۦ ﴾، یـانی: خـۆی بـە زلگـرت، چونکـە ئـەم تەعبیـرە لـە زمـانی عەرەبییـدا بـۆ خۆبەزلگرتنیـش بەکاردەهێنـدرێ، وەك چـۆن بـۆ دوورکەتنـەوە لـە شـتێك بەکاردێ.

ئنجا بـە دڵنیایـی لێرەدا مەبەسـت لـە (**الإنسـان**) کـە (الــ)ی ناسـاندنی لەسـەرە، ئـەم (الــ)ە، بـۆ جینسـی ئینسـان نیـە، چونکـە ئینسـانە بـڕوادارەکان وانیـن، بەڵکـو بـۆ (**عهـد**)ە، یـانی: ئـەو ئینسـانانەی کـە پێشتر قسـە لـە بارەیانـەوە کـراوە، ئـەو ئینسـانانەی کـە ڕوو لـە هیدایەتیـی خـوا ناکـەن، مەبەسـت پێـی ئەوانـە، یانـی: ئینسـانی بێبـڕوا، ﴿ وَإِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ كَانَ يَـُٔوسًا ﴾، هـەر کاتێـك خراپـەو زیانێـکی تـووش بـوو، زۆر نائومێـدە، ﴿ يَـُٔوسًا ﴾، ڕێژگـەی زێدەڕۆییـە لـە (**یائِـس**) نائومێـد، بـەڵام (**یئـوس**) واتـە: زۆر نائومێـد و تەمابـڕاوو بـێ هیـوا، ﴿ قُلْ كُلٌّ يَعْمَلُ عَلَىٰ شَاكِلَتِهِۦ ﴾، بڵـێ: هـەر کەسـە لـە مرۆڤـەکان بـە پێـی سروشـتی خـۆی، بـە پێـی پێکهاتـە و ئامادەیـی خـۆی کاردەکات، وشـەی: {**شَـاكِلَة**} بـە: (**طریقـة**) ڕێبـاز و، بـە: (**سـجیة**)، سروشـت و پێکهاتـە، مانـا کـراوە، واتـە: هەرکەسـە مەعدەنەکـەی و سروشـتەکەی چـۆن بـێ، بـەو شـێوەیە کاردەکات، وەك پێشـینان گوتوویانـە: (گـۆزە چـی تێدابـێ، ئـەوەی لـێ دەڕژێ)، هەروەهـا عـەرەب گوتوویانـە: (**وَكُلُّ إِنَـاءٍ بِالَّـذِي فِيـهِ يَنْضَـحُ**)، هـەر دەفـرە چـی تێدایـە، ئـەوەی لـێ دەچـۆڕێ، ئـەوەی لـێ دەڕژێ، ﴿ فَرَبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَنْ هُوَ أَهْدَىٰ سَبِيلًا ﴾، بـە دڵنیایـی پەروەردگارتـان زاناتـرە، بـەو کەسـەی کـە ڕێیەکـەی ڕاسـترە یـان: کـێ ڕاسـتەڕێ تـرە و ڕێیـی ڕاسـترو بەرنامـەی چاکـتری گرتـوە، پەروەردگارتـان پێـی زاناتـرە.

ئنجـا دێتـە سـەر بـاسی بابەتێـکی دیکـە، دەفەرمـوێ: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّى ﴾، هەروەهـا لـە بـارەی ڕووحـەوە، پرسـیارت لێدەکـەن، بڵـێ: ڕووح لـە فەرمـانی، لـە کاری تایبەتیـی پەروەردگارمـە، ﴿ وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ﴾، ئەندازەیەکی کەمیـش نەبـێ لـە زانیاریـی، پێتـان نـەدراوە، واتـە: بـەو ئەنـدازە کەمـە زانیارییـەی کـە پێتـان دراوە، ناتوانـن و نەتانتوانیـوە: چییـەت و نێـوەڕۆکی ڕووح و حەقیقەتیـی ڕووح دەرك بکـەن، یـانی: لەبـەر کـەم تفاقیـی و کـەم توانایـی ئێوەیـە لـە بـواری زانسـتدا، کـە دەرکی چییـەت و حەقیقـەتی ڕووحتـان نەکـردوە.

ئێمە دوایی {کورتە باسێکی تایبەت دەربارەی ڕووح} دەکەین، هەروەها باسی هۆی هاتنە خواری ئەو ئایەتەش دەکەین، هەڵبەتە ئێمە پێشتریش باسمان کرد و لەو بارەوە دوو ڕیوایەتمان هێنان، بەڵام دوایی دووبارە قسەی زیاتری لەسەر دەکەینەوە، لە مەسەلە گرنگەکاندا.

ئنجا خوا ﷻ دێتە سەر باسێکی دیکە و دەفەرموێ: ﴿ وَلَئِن شِئْنَا لَنَذْهَبَنَّ بِٱلَّذِيٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ ﴾، هەر بە بۆنەی ئەوەوە کە مرۆڤەکان زانیاریی کەمیان پێدراوە، بێگومان لە چاو زانیاریی خواو، لە چاو زانیاریی ڕەها کە لە گەردووندا هەیە، مرۆڤ پشك و بەشێکی کەمی پێبڕاوە، لە دەرککردنی نهێنییەکانیی گەردوون، ئنجا بەشێك لەو زانیارییە - کە گرنگترین بەشە - ئەوەیە کە لە ڕێی وەحییەوە بۆ پێغەمبەران هاتوە (**علیهم الصلاة والسلام**)، بە تایبەت بۆ پێغەمبەری خاتەم و کۆتایی ﷺ، ئنجا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَئِن شِئْنَا لَنَذْهَبَنَّ بِٱلَّذِيٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ ﴾، ئەگەر ویستباشمان ئەوەی کە بۆ تۆمان سروش کردوە {بە شێوەی پەنهان بۆمان ناردوی، کە قورئانە} لامان دەبرد، لە عەقڵ و دڵی تۆ دەمانسڕیەوە، ﴿ ثُمَّ لَا تَجِدُ لَكَ بِهِۦ عَلَيْنَا وَكِيلًا ﴾، دوایی تۆ بۆ هێشتنەوەو پاراستنی ئەو وەحییە لە عەقڵ و دڵی خۆتدا، یاخود بۆ گێڕانەوەی، هیچ بریکارو سەرپەرشتیارو پشتیوانێکت لە دژی ئێمە چنگ ناکەوێ، کە نەهێڵی ئەو زانیارییەت لە دەست بڕوا، یاخود دوای ئەوەی کە ڕۆیشتوە بیگێڕیەوە، ﴿ إِلَّا رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ ﴾، ئەو زانیارییەی کە لە ڕێی وەحییەوە بۆ تۆ نێردراوە، بۆت سروش کراوە تەنیا بە هۆی بەزەیی پەروەردگارتەوەیە، کە لە عەقڵ و دڵتدا دەپارێزرێ و، ئەگەر شتێکیشت لە بیر چوو، دێتەوە یادت، خوا دەیهێنێتەوە یادت، ﴿ إِنَّ فَضْلَهُۥ كَانَ عَلَيْكَ كَبِيرًا ﴾، بە دڵنیایی بەخششی خوا لەسەر تۆ گەورەیە، چاکەی خوا و بەخششی خوا لەسەر تۆ زۆر گەورەیە ئەی پێغەمبەری خاتەم! ﷺ ئەویش لەو وەحیی و پەیامەی خوادا بەرجەستەیە، کە خوا وەك دوا فەرمایشتی خۆی و دوا پەیام و بەرنامەی خۆی، بۆ تۆی ناردوە، کە تۆش بیگەیەنی بە تێکڕای مرۆڤایەتیی.

ئنجا دێتە سەر خستنەڕووی ڕاستییەکی دیکە و دەفەرموێ: ﴿ قُل لَّئِنِ ٱجْتَمَعَتِ ٱلْإِنسُ وَٱلْجِنُّ عَلَىٰٓ أَن يَأْتُوا۟ بِمِثْلِ هَـٰذَا ٱلْقُرْءَانِ لَا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِۦ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا ﴾، بڵێ: ئەگەر تێکڕای مرۆڤ و جینن کۆببنەوە، خڕبنەوە سەریەك، کە وێنەی ئەم قورئانە بێنن، ناتوانن وێنەی بێنن، هەر چەندە هەندێکیشیان پشتگیری هەندێکیان بن، واتە: ئەگەر ئەوانە هەموویان کۆببنەوە و هاوکارو پشتیوانی یەکدیش بن، بۆ ئەوەی وێنەی قورئان بێنن، هەر ناتوانن وێنەی قورئان بێنن.

ئێمە لە تەفسیری سوورەتی (**هود**)دا، باسی ئەو بابەتەمان کردوە، لە کورتە باسێکدا.

دوایی دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ صَرَّفْنَا لِلنَّاسِ فِي هَٰذَا الْقُرْآنِ مِن كُلِّ مَثَلٍ ﴾، ئێمە لەم قورئانەدا لە هەموو وێنەیەکمان بۆ خەڵکی هێناوەتەوە، بە جۆراوجۆریی، واتە: لە هەر پەندێك، لە هەر وێنەیەك، کە دەبێتە دەرس و پەندو عیبرەت بۆ خەڵك و، دەبێتە هۆی زیاتر ڕوونبوونەوەی مەبەستەکان بۆیان، بە شێوەی جۆراوجۆر بۆ خەڵکمان خستۆتە ڕوو، ﴿ فَأَبَىٰ أَكْثَرُ النَّاسِ إِلَّا كُفُورًا ﴾، بەڵام زۆربەی خەڵکی هەر سپڵەیی و ناسوپاسییان ویست، بە جگە لە ناسوپاسیی، ڕازیی نەبوون، قبووڵیان نەبوو ڕوو لە سوپاگوزاریی خوا بکەن و، شوکرانە بژێریی هەڵبژێرن، بەڵکو هەر ملیان بۆ ناسوپاسیی و سپڵەییدا.

ئنجا خوا ﷻ دێتە سەر خستنەڕووی بڕ وبیانووەکانی کافرەکانی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ، کە بەو شێوەیە ڕوویان لە پێغەمبەری خاتەم ﷺ کردوە و ئەو بەهانانەیان بۆ هێناوەتەوە و، ئەو داواکارییانەیان لێکردوون و دوایی گوتوویانە: ئەگەر ئەو داواکارییانەمان بۆ جێبەجێ بکەی، ئنجا بڕوات پێ دێنین، کە دەتوانین بڵێین: سەرجەم حەوت داواکاریی سەرەکیین، دەشگونجێ وردتریش بکرێنەوەو ژمارەکەیان زیاتریش بکرێ، بۆ نۆ و دە (٩ - ١٠)ش، بەڵام حەوتی سەرەکیین:

بیانووی یەکەم: ﴿ وَقَالُوا لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّىٰ تَفْجُرَ لَنَا مِنَ الْأَرْضِ يَنبُوعًا ﴾، گوتیان: هەرگیز بۆ تۆ بڕوا ناهێنین، تاکو کانیی و سەرچاوەمان لە زەویدا بۆ دەرنەقوڵێنی، هەڵیقوڵێنی و ئاوەکەی بەفڕکە بڕوات.

ئەوانەی گوتوویانە، بێگومان بێبڕواو هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ، بوون، کە ئەوان بە زمانی وتار گوتوویانە، بەڵام بە زمانی حاڵ: بە پانایی زەمین و بە درێژایی زەمان، ئەو بڕوبیانووانە لە عەقڵ و دڵی هەموو ئەوانەدا هەن، کە هیدایەتی خوا قبووڵ ناکەن، ئەوانەی کە لە بەهانە دەگەڕێن، وەك گوتراوە: (ئەگەر دز دزبێ، تاریکە شەو زۆرن)، یان گوتوویانە: {کەسێك بە تۆبزیی بینێری بۆ مازووان «بۆ مازوو چنین» لە دارێ هەڵناڕوانێ)، واتە: دێتەوە دەڵێ: درەختەکان هیچ مازوویان پێوە نەبوون، بە دەستی خاڵی دەگەڕێتەوە! یانی: کەسێك لە بیانووگرتنێ بێ، پەکی ناکەوێ.

بیانووی دووەم: ﴿ أَوْ تَكُونَ لَكَ جَنَّةٌ مِّن نَّخِيلٍ وَعِنَبٍ ﴾، یاخود باخ و بێستانێکت هەبێ لە درەختی خورماو لە درەختیترێ.

بیانووی سێیەم: ﴿ فَتُفَجِّرَ ٱلْأَنْهَـٰرَ خِلَـٰلَهَا تَفْجِيرًا ﴾، کە ڕووبارگەل بە نێو ئەو باخ و بێستان و بە ژێر داروودرەختەکانیدا فڕکە بکەن، بە خوڕ بڕۆن، نەك بە سستیی لەبەر ئەوەی کە ئاوەکەیان کەمە، بەڵکو ئاوەکەیان ئەوەندە زۆر بێ، هەر فڕکە فڕکی بێ، بە نێو دارو درەختەکاندا!

بیانووی چوارەم: ﴿ أَوْ تُسْقِطَ ٱلسَّمَآءَ كَمَا زَعَمْتَ عَلَيْنَا كِسَفًا ﴾، یان وەك بەهەڵە گوتووتە و خەیاڵت کردوە، یان گومانت بردوە، یان وەك لافت لێداوە[1]، ئاسمانمان بەسەردا ببارێنی، پارچە پارچە.

بیانووی پێنجەم: ﴿ أَوْ تَأْتِىَ بِٱللَّهِ وَٱلْمَلَـٰٓئِكَةِ قَبِيلًا ﴾، یان: خوا و فریشتەکانیش بە کۆمەڵ کۆمەڵ بێنی، یاخود: ڕووبەڕوومان بیانهێنی.

بیانووی شەشەم: ﴿ أَوْ يَكُونَ لَكَ بَيْتٌ مِّن زُخْرُفٍ ﴾، یان ماڵ و خانوویەکت هەبێ لە زێڕ، یاخود: ماڵ و خانوویەکی بە نەخش و نیگارت، هەبێ چونکە: (زخرف) هەم بە مانای زێڕ دێ، هەم بە مانای جوانیی و ڕازێنراوەییش دێ.

بیانووی حەوتەم: ﴿ أَوْ تَرْقَىٰ فِى ٱلسَّمَآءِ ﴾، یاخود بۆ ئاسمانێ، بۆ سەرێ بەرز ببەوە و هەڵکشێی، بەرەو سەرێ بڕۆی.

﴿ وَلَن نُّؤْمِنَ لِرُقِيِّكَ ﴾، بڕواش بە بەرزبوونەوەکەت ناهێنین، ﴿ حَتَّىٰ تُنَزِّلَ عَلَيْنَا كِتَـٰبًا نَّقْرَؤُهُۥ ﴾، تاکو نووسراوێکمان بۆ دانەبەزێنی، بیخوێنینەوە!

دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا تیشکی زیاتر دەخەینە سەر ئەو مەسەلەیە و لەو بارەوە بەسەرهاتێکی درێژ دەگێڕینەوە، کە لە تەفسیرەکاندا هاتوە، هەرچەندە سەنەدەکەشی بەهێز نیە، بەڵام تیشکی زۆر دەخاتە سەر نێوەڕۆکی ئەم ئایەتانەو ئەو داواکارییانە، کە لە چ حاڵەتێك دا بووە و چۆن بووە، ئەو داواکارییانەیان ئاراستەی پێغەمبەر کردوون؟

خوا ﷻ فەرمان بە پێغەمبەر ﷺ دەکات: ﴿ قُلْ ﴾، تۆ بڵێ: لە وەڵامی هەموو ئەو داواکارییانەدا، هەموو بیانووگرتنانەدا ﴿ سُبْحَانَ رَبِّى ﴾، پاکیی بۆ پەروەردگارم، پەروەردگارم بە پاك دەگرم، پەروەردگارم دوورە لە هەر هەڵەو پەڵەیەك، دوورە لە هەر لەکەو کەم و کوڕییەك، واتە: ئەو شتانەی ئێوە ئاراستەی منیان دەکەن، بیانکەمە

---

(١) (زعم) بە کوردیی دەبێتەوە بە لاف لێدان، کەسێك قسەیەك بکات زیاتر ئەگەری درۆی هەبێ تاکو ئەگەری ڕاستیی.

داواکاریی و بۆ لای خوا و بەرزیان بکەمەوە، بۆ ئەوەی ئیسپاتی پێغەمبەرایەتییم و بڕوام پێ بێنن! پاکیی بۆ خوا، کە ئەو جۆرە داوایانەی لێبکەم، یاخود: پاکیی بۆ خوا کە هەر کەسێك داوایەکی لە خوا کرد، داوایەکەی بۆ جێبەجێ بکات! پایەی خوا زۆر لەوە بەرزترە.

یاخود: لێرەدا ﴿ سُبۡحَانَ رَبِّي ﴾، بۆ سەرسوڕمانە، واتە: ئەوەی ئێوە دەیڵێن، زۆر جێگای سەرسوڕمانە و شتێکی بێ جێیە، ﴿ هَلۡ كُنتُ إِلَّا بَشَرٗا رَّسُولٗا ﴾، مەگەر من جگە لە مرۆڤێکی ڕەوانەکراو، هیچی دیکە هەم؟ واتە: تەنیا مرۆڤێکم خوا وەك نوێنەری خۆی، ڕەوانی کردووم و ئەوشتانە لە توانای من دا نین، نەك لە توانامدا نین، بگرە ئامادەش نیم ئەو داوایانە لە خوای پەروەردگارم بکەم، چونکە خوا خۆی خاوەنی، ئەوپەڕی زانیاریی و، ئەوپەڕی کاربەجێیی و، ئەوپەڕی میهرەبانییە، ئەگەر بە پێویستیی زانیبایە، ئەوانەی پێدەدان، بێ ئەوەی ئێوە داوای بکەن، هەروەك چۆن قورئانی پێداوم وەك تاکە موعجیزەو بەڵگەی سەلماندنی پێغەمبەرایەتییم، بێ ئەوەی من داوای بکەم، یاخود ئێوە داوای بکەن.

ئنجا خوا ﷻ دوای ئەو حەوت داواکاریی و، حەوت بیانوو گرتنانەی کافرەکان، باسی بیانووگرتنێك و بەهانەیەکی دیکەی لەمێژینەی کافرەکان دەکات، کە بە درێژایی مێژوو ئەو بڕوبیانووەیان هەر بووە و، ئەوە بیانووە ڕاستەقینەکەیانە: ﴿ وَمَا مَنَعَ ٱلنَّاسَ أَن يُؤۡمِنُوٓاْ إِذۡ جَآءَهُمُ ٱلۡهُدَىٰٓ ﴾، هیچ شتێك ڕێگریی لە خەڵك نەکرد، هیچ شتێك پێشگیریی لە خەڵك نەکرد، بڕوابێنن، دوای ئەوەی ڕێنماییان بۆ هات، ڕێنمایی بەرجەستە لە پەیام و وەحیی خوادا، ﴿ إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ أَبَعَثَ ٱللَّهُ بَشَرٗا رَّسُولٗا ﴾، تەنیا ئەوە پێشگیریان بوو، تەنیا ئەوە ڕێگریان بوو کە گوتیان: ئایا خوا تەنیا مرۆڤێکی بە پێغەمبەر و ڕەوانەکراوی خۆی ناردوە؟ چۆن دەبێ مرۆڤ نوێنەری خواو ڕەوانەکراوی خوا بێ! ئا ئەوە پەرچ و ئاستەنگی ڕاستەقینەی بەردەمی ئەهلی کوفرە بۆ بڕواهێنان بە پێغەمبەران ﷺ، بە درێژایی مێژوو هەر لە ئادەمەوە تاکو خاتەم (**علیهم الصلاة والسلام**).

ئنجا وەڵامی ئەو بیانووەشیان دەداتەوە و دەفەرموێ: ﴿ قُل لَّوۡ كَانَ فِي ٱلۡأَرۡضِ مَلَٰٓئِكَةٞ يَمۡشُونَ مُطۡمَئِنِّينَ ﴾، بڵێ: ئەگەر لەسەر زەوی فریشتەی لێ بوونایە، بە ئارامیی ڕۆیشتبان: واتە: فریشتە ژیانیان لەسەر زەوی بووایە، ﴿ لَنَزَّلۡنَا عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَلَكٗا رَّسُولٗا ﴾، لە ئاسمانەوە فریشتەیەکی پێغەمبەرمان بۆ دادەبەزاندن،

چونکە خوا ﷻ نوێنەر هەر لە سروشتی بۆ لا نێردراوان، ڕەوانە دەکات، لە جۆری خۆیان، بەڵام سەر زەوی مرۆڤی لێن، بۆیە خوا ﷻ پێغەمبەری مرۆڤی بۆ ناردوون، ئەگەر فریشتەی لێبوونایە، بە تەئکید ئەو کاتە پێغەمبەرێکی فریشتەی بۆ دەناردن.

کەواتە: ئەوەی خوا کردوویەتی، ئەوە بەجێیە و، ئەوەی ئێوە داوای دەکەن، شتێکی زۆر بێ جێیە، زۆر نامەنتیقییە، دوایش وردتر باسی دەکەین لە مەسەلە گرنکەکاندا.

لە کۆتاییدا خوا دەفەرموێ: ﴿ قُلْ كَفَىٰ بِاللَّهِ شَهِيدًا بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ ﴾، بڵێ: خوا بەسە شایەد و چاودێر بێ، لە نێوان من و ئێوەدا، شایەد بێ کە: من پێغەمبەر و ڕەوانەکراوی ویم و نوێنەری ویم، ﴿ إِنَّهُ كَانَ بِعِبَادِهِ خَبِيرًا بَصِيرًا ﴾، بە دڵنیایی ئەو شارەزاو بینەری بەندەکانیەتی، واتە: شارەزا و بینەری دەرو دەروونیان، ڕواڵەت و پەنهانیان، هەموو هەست و خوست و کارو کردەوەکانییانە.

ئنجا خوای شارەزای بینەر، ئەم قوڕئانەی بە بەس (**کافی**) زانیوە، کە سەلمێنەری پێغەمبەرایەتیی من بێ، ئەو خوایەی کە شارەزاو بینەری هەموو کاروباری مرۆڤەکانە، ئەو قوڕئانەی بە کافی زانیوە، بۆیەش من ئیکتیفا دەکەم بەوەی کە خوا بە کافی زانیوە و ناچم داواکاریی دیکەی، کە ئێوە وەك بیانوو دەیانگرن، ئاڕاستەی خوا بکەم!

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**خوا فەرموویەتی: ئەوەی کە لە قورئان دایدەبەزێنین، چارەسەرو بەزەییە بۆ بڕواداران و، ستەمکارانیش هەر پتر پێی زیانبار دەبن:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿ وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارًا ﴿٨٢﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿ وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ ﴾، لە قورئانێ دادەبەزێنین.

ئەم (مِن)ی سەر: ﴿ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ ﴾، (**بَيَانِيَّةٌ وَلَيْسَت تبعيضيَةً ولاَ آبتدائيةً**)، واتە: (**مِن**) بۆ ڕوونکردنەوەیە، بۆ بەشێك نیە و، بۆ دەست پێکردنیش نیە، ﴿ وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ ﴾، واتە: ئەو قورئانەی کە دایدەبەزێنین.

کە دەفەرمووێ: ﴿ وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ .... ﴾، ئەمە ڕوونکردنەوەیە بۆ ئەو (مَا )یەی کە لە دوایی دێت، (مَا هُوَ ) چونکە (**ما**) یانی: (ئەو شتەی) کە ئەوە جۆرێك لە ئیبهام و نەزانراویی تێدایە هەیە، ئنجا ئەم (مِنَ ٱلْقُرْءَانِ ) تیشك دەخاتە سەر ئەو (مَا)یە، کە نەزانراویی و لێڵییەك لە واتاکەی دا هەیە.

ئەمە وەك ئەو ئایەتەی سووڕەتی (**الحج**) وایە، کە دەفەرمووێ: ﴿ فَٱجْتَنِبُوا۟ ٱلرِّجْسَ مِنَ ٱلْأَوْثَٰنِ ﴿٣٠﴾ ﴾، واتە: خۆتان لە پیسیی بپارێزن لە بتەکان، واتە: لەو پیسییەی کە لە بت و صەنەمەکاندا هەیە، کە ماناکەی ئاوای لێدێتەوە، (**أي: فاجتَنِبوا الرِّجسَ الَّذِي هُوَ الأَوْثَان**)، خۆتان لەو پیسییە بپارێزن، کە بریتییە لە بتەکان.

٢)- ﴿ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴾، (ئەو قورئانەی کە دایدەبەزێنین)، بریتیە لە چارەسەر و بەزەیی بۆ بڕواداران.

(الشِّفاء: هو زَوَالُ الداءِ وَمَجَازاً: زَوَالُ مَا هُوَ نَقصٌ مَعْنَوِي)، (شفاء) بریتیه له لاچوونی دەرد و نەخۆشیی، به مەجازیش به مانای لابردنی حاڵەتێکه که ناتەواوییه، له ڕووی مەعنەوییەوە.

٣)- ﴿ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴾، (قورئان هەم شیفایه) هەم ڕەحمەتیشه بۆ بڕواداران، واته: مایەی دابەزینی ڕەحمەتی خوایه بۆیان.

٤)- ﴿ وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارًا ﴾، بەڵام بۆ ستەمکاران تەنیا زیانباریی، زێده دەکات، ماناکەی ئاوای لێدێتەوە: (نُنَزِّلُ الشِّفاءَ والرَّحْمَةَ وَهُوَ القُرْآنُ، أَي: القُرْآنُ كُلُّهُ شِفَاءٌ وَرحْمَةٌ للمؤمنين، ولا يَزِيدُ الظَّالِمينَ إلاَّ خَساراً)، ئەو چارەسەرو بەزەییەی که بریتیه له قورئان، دایدەبەزێنین، که هەمووی چارەسەر و بەزەییه بۆ بڕواداران، بەڵام بێبڕوایانێ که ستەمیان له خۆیان کردوە، هەر زیاتر بۆیان دەبێته مایەی زیانباریی.

ئنجا لێرەدا که خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ ﴾، دوایی دەفەرموێ: ﴿ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴾، ئەمه: (لِتحصيلِ غَرَضِ اهْتِمَامِ ذِكرِ القُرْآنِ، مَعَ غَرَضِ الثنَاءِ عليه، بطريقِ الموصوليةِ، بقولِه: مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ)، خوا دەیتوانی هەر یەکسەر بفەرموێ: ( وَنُنَزِّلُ ٱلْقُرْءَانِ الـذِي هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ)، بەڵام پێشێ دەفەرموێ: ﴿ وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ ﴾، دوایش دەفەرموێ: (مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ) که ئەمه بۆ گرنگیی پێدانه به باسی قورئان، وێڕای مەدحکردن و ستایشکردنی قورئان، که بەهۆی (ما الموصولة)وەیه، که ئەو دوو ئامانجه بپێکرێن.

لێرەدا دەربارەی ئەم ئایەته موبارەکه قسەیەك له خوا لێخۆش بوو (محمد متولِّي الشعراوي) دێنینەوە له تەفسیرەکەی خۆی (تفسير الشعراوي) که به (خواطر) ناوی ناوە، هەندێ تەعبیری زۆر جوان دێنێ، دەڵێ: (فالآيةُ واحِدةٌ ولكن الطَّبْعَ المُستَقبِلَ، مُختَلِفٌ، فالمؤمِنُ يَستَقبِلُها بِمَلَكاتٍ سَلِيمةٍ، فيزدادُ بها إيماناً، والكافِرُ يَستَقبِلُها بِملَكاتٍ فاسِدةٍ فيزدادُ بها كُفراً، إذاً: المُشكِلَةُ في تَلَقِّي الحقائقِ واستقبالِها، أن تكونَ ملكاتُ التلقِّي فاسِدةً، مِنْ هُنَا نَقُولُ: إذا نَظَرْتَ إلى الحقِّ، فإيّاكَ أن تَنظُرَهُ، وَفِي جَوْفِكَ باطِلٌ تَحْرِصُ عَلَيْهِ، لابُدَّ أن تُخرِجَ مَا عِنْدَكَ مِنَ الباطلِ، ثُمَّ قَارِنْ وَفَاضِلْ بَيْنَ الأُمُور)[1].

---

(١) ج١٤، ص ٨٧١١.

دیاره بەبۆنەی تەفسیرکردنی ئەو ئایەتی ژماره (٨٢)ی سوورەتی (**الإسراء**)ەوە، دوو ئایەتی (**التوبة**) دێنێ، کە خوا دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا مَآ أُنزِلَتْ سُورَةٌ فَمِنْهُم مَّن يَقُولُ أَيُّكُمْ زَادَتْهُ هَٰذِهِۦٓ إِيمَٰنًا ۚ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فَزَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَهُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ﴿١٢٤﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَتْهُمْ رِجْسًا إِلَىٰ رِجْسِهِمْ وَمَاتُوا۟ وَهُمْ كَٰفِرُونَ ﴿١٢٥﴾﴾.

کە ئێمە پێشتر لە تەفسیری سوورەتی (**التوبة**)دا شیمان کردوونەوە، خوا دەفەرموێ: هەر کات سوورەتێك دابەزێنرا، هەیانە (واتە: لە دڵ نەخۆشە بێبڕوایەکان) دەڵێن: کامتان ئا ئەمە بڕوای زیاد کردن؟ (واتە: ئەم سوورەتە)، بەڵام ئەوانەی بڕوادارن، ئیمانی زیاد کردن، لە حاڵێك دا کە شادمان و دڵخۆشیشن، بەڵام ئەوانەی کە دڵیان نەخۆشیی تێدایە، هەر پیسیی زیاتری خستە گەڵ پیسییەکەیان و بە بێبڕواییش مردن.

(**الشعراوي**) دەڵێ: ئایەتەکە یەك ئایەتە، بەڵام سروشتە پێشوازییکەرەکە، سروشتە وەرگرەکە جۆراو جۆرە: بابای بڕوادار، بە چەند مەلەکەیەکی ساغ و باش، ئەو ئایەتانە وەردەگرێ، بۆیە بە هۆی ئایەتەکەوە ئیمانی زیاد دەکات، بەڵام بابای بێبڕوا، بە چەند مەلەکە و سیفەتێکی خراپ و تێکچووەوە پێشوازیی لە ئایەتەکان دەکات، بۆیە هەر بێبڕوایی تێدا زیاد دەکەن، کەواتە: گرفت لە وەرگرتنی ڕاستییەکان و پێشوازییکردنیان دایە، گرفت ئەوەیە کە بە سیفەت و بە حاڵەتی خراپەوە ئایەتەکان و ڕاستییەکانیان وەربگیرێن و پێشوازییان لێبکرێ، بۆیە لێرەوە دەڵێین: هەر کاتێك تەماشای هەقت کرد، وریا بە! لە کاتێکدا تەماشای ئەو هەقە دەکەی لە هەناوتدا لە دەروونت دا ناهەقیی (**باطل**)و نەبێ، سوور بی لەسەری، بەڵکو دەبێ پێشێ ناهەقییەکە لە دەروونی خۆت دەراوێی و خۆتی لێ پاك بکەیەوە، پاشان بەراورد بکە و کارەکان پێکەوە هەڵسەنگێنە.

## کورتە باسێک لە بارەی شیفابوونی قورئانەوە

**ئەم کورتە باسە لە سێ بڕگەدا دەخەینەڕوو:**

**١/** شیفا یانی چی؟

**٢/** شیفای مەعنەویی لە قورئان‌دا، یەکدەنگیی زانایانی لەسەرە.

**٣/** شیفای جەستەیی لە قورئان‌دا، مشت و مڕ و ڕاجیایی لەسەرە، واتە: ئەوە کە قورئان ببێتە هۆی چارەسەری جەستەیی و ماددیی، لە نێوان زانایاندا، ڕاجیایی و مشت و مڕی لەسەرە.

### یەك: مانای (شِفَاء):

(**راغب الأصفهاني**) کە ئێمە بە پلەی یەکەم، بۆ شیکردنەوەی وشەکانی قورئان و، خستنە ڕووی چەمك و واتایان، پشت بە کتێبەکەی وی: (**مفرداتُ ألفاظ القُرآن**) دەبەستین، هەڵبەتە هەندێ جاریش دەگەڕێینەوە بۆ (**مختار الصِّحاح**) و، هەندێك جاریش دەگەڕێینەوە بۆ (**المصباح المُنير**)ی (**الفيومي**)، و هەندێك جاریش بۆ (**المعجم الوسيط**) یاخود قامووسەکانی دیکەی زمان، بەڵام کەمتر.

ئنجا (**راغب الأصفهاني**) لە: (**مفرداتُ ألفاظ القرآن**)[1]دا دەڵێ:

(**شَفا البِئرِ والنَّهرِ وغيرهما: طَرَفُهُ، ويُضرَبُ به المَثَلُ في القُربِ مِنَ الهَلاَكِ، قَالَ تَعَالى:** ﴿عَلَىٰ شَفَا جُرُفٍ هَارٍ ١٠٩﴾ **التوبة،** ﴿وَكُنتُمْ عَلَىٰ شَفَا حُفْرَةٍ مِّنَ النَّارِ ١٠٣﴾ **آل عمران، وَأَشْفَى فَلاَنٌ على الهَلاَكِ، أَي: حَصَلَ عَلَى شَفَتِهِ، أَي: حَصَلَ عَلَى شَفَاهُ، وَالشِّفَاءُ مِنَ المَرَضِ: مَوافَاةُ شَفَى السَّلاَمَةِ وَصَارَ اسْمَاً للبُرءِ**).

واتە: بۆ بیرو بۆ ڕووبارو جگە لەوانیش، بە قەراغەکەیان دەگوترێ: (**شَفا**) واتە: قەراغ و کەنار، وێنەش دەهێنرێتەوە بۆ نزیکیی لە فەوتان، بە وشەی (**شفا**) وەك خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿عَلَىٰ شَفَا جُرُفٍ هَارٍ ١٠٩﴾، لەسەر قەراغی کەندەڵانێکی بن هەڵۆڵ کە خەریکی ڕووخان بێ، هەروەها لە سوورەتی (آل عمران)دا دەفەرموێ: ﴿وَكُنتُمْ عَلَىٰ شَفَا حُفْرَةٍ مِّنَ النَّارِ ١٠٣﴾، ئێوە لەسەر کەناری چاڵێکی ئاگر بوون، (**وأَشْفَى**

---

(١) ص ٤٥٩.

**فُلاَنٌ عَلَى الهَلاَكِ**)، واتـە: خەریـك بـوو بفەوتـێ، گەیشـتە كەنـاری مـەرگ، (**الشِّـفَاءُ مِـنَ المَـرَضِ**)، واتـە: شـیفا لـە نەخۆشـیی، یـانی: گەیشـتنە كەنـاری سـەلامەتیی، دواییـش وشـەی شـیفا كـراوە بـە نـاو بـۆ چاكبوونـەوە و چارەسـەر بـوون لـە نەخۆشـیی.

## دوو: شیفابوونی قورئان لە ڕووی مەعنەوییەوە:

یەكدەنگیـی زانایـانی لەسـەر ئەوەیـە كـە: قورئـان لـە ڕووی مەعنەوییـەوە چارەسـەرە، چارەسـەری ڕووحـی ئینسـانە، چارەسـەری دەروونی ئینسـانە و، لابـەری نەخۆشـییە دەروونیـی و مەعنەوییەكانیـەتی، زانایـان هەمـوو لەسـەر ئـەوە یەكدەنگـن، كـە جگـە لـەو ئایـەتی ژمـارە (٨٢)ی سـوورەتی (**الإسراء**) لەوبـارەوە ئامـاژە دەكەیـن بـە دوو ئایـەتی دیكـەش:

یەكەمیـان: لـە سـوورەتی (**یونس**)دا، خـوا دەفەرمـوێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدۡ جَآءَتۡكُم مَّوۡعِظَةٞ مِّن رَّبِّكُمۡ وَشِفَآءٞ لِّمَا فِي ٱلصُّدُورِ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٞ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ ٥٧﴾، واتـە: ئـەی خەڵكینـە! بـە دڵنیاییـەوە ئامۆژگارییتـان لـە پەروەردگارتانـەوە بـۆ هـات، هەروەهـا چارەسـەرە بـۆ ئـەوەی كـە لـە سینەكان دا هەیـە و، ڕێنمایـی و بەزەییـە بـۆ بـڕواداران.

كەواتـە: لێـرەدا خـوا ﷻ نوختـەی خسـتۆتە سـەر پیـت، كـە قورئـان چارەسـەرە، بـۆ ئەوەی كـە لـە سینەكاندا هەیـە، كـە بـە تەئكیـد: ئـەوەی كـە لـە سینەكاندا هەیـە - كـە جـاری وایـە (**صـدور**) بـە مانـای (**قلـوب**) بـەكاردێ - واتـە: قورئـان چارەسـەرە بـۆ نەخۆشـییە پەنهـان و شـێردراوەكانی مـرۆڤ، بـۆ حاڵـەتی مەعنەویـی مـرۆڤ.

دووەمیـان: لـە سـوورەتی (**فصلـت**)دا، خـوا دەفەرمـوێ: ﴿وَلَوۡ جَعَلۡنَٰهُ قُرۡءَانًا أَعۡجَمِيّٗا لَّقَالُواْ لَوۡلَا فُصِّلَتۡ ءَايَٰتُهُۥٓۖ ءَا۬عۡجَمِيّٞ وَعَرَبِيّٞۗ قُلۡ هُوَ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ هُدٗى وَشِفَآءٞۖ وَٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ فِيٓ ءَاذَانِهِمۡ وَقۡرٞ وَهُوَ عَلَيۡهِمۡ عَمًىۚ أُوْلَٰٓئِكَ يُنَادَوۡنَ مِن مَّكَانِۭ بَعِيدٖ ٤٤﴾، واتـە: ئەگـەر ئـەم قورئانەمـان كردبـا بـە قورئانێـكی ئەعجەمیـی {واتـە: قورئانێـك كە بـە غەیری زمـانی عـەرەبی بـۆ عەرەبـان هاتبایـە} دەیانگـوت: دەبووایـە ئایەتەكانـی ڕوون بكرێنـەوە، چـۆن دەبـێ ئەعجەمیـی بـێ، لـە حاڵێكـدا ئـەوەی بـۆ سـەری دابەزێنـدراوە عەرەبـە، (كـە موحەممـەدە ﷺ)، ئـەم قورئانـە بـۆ ئەوانـەی بڕوایـان هێنـاوە، ڕێنمایـی و چارەسـەرە و ئەوانـەش كـە بڕواناهێنـن: گوێیەكانیـان قورسـایی تێدایـە {گوێیـان ئاخـنراوە، واتـە: حاڵێكیـان بەسـەر خۆیـان هێنـاوە، وەك گوێیـان ئاخنرابـێ و قورقوشـمی تێكرابـێ بـۆ ئـەوەی نەبیسـتێ، چونكـە مـرۆڤ ئەگـەر شـتێكی سـووكی لـە گوێـدا بـێ، ڕەنگـە ببیسـتێ، وەك لۆكـە، بـەڵام

شتێکی قورسی وەك قورقوشم، یان ئاسن، یان شتێکی دیکەی قورسی تێخرابێ، ئەوە رێدەگرێ لەوەی کە ئینسان هیچ شتێك ببیستێ}.

﴿ وَهُوَ عَلَيْهِمْ عَمًى ﴾، هەروەها ئەو (قورئان) لە ئاستیاندا کوێرە، {واتە: وەك چۆن کوێر ناتوانێ بەرێ دا بڕوا، قورئانیش رێیان تێنابا، بە رێ نازانێ بچێتە نێو عەقڵ و دڵیانەوە، لەبەرئەوەی کە عەقڵ و دڵ و چاو و گوێی خۆیان لە کار خستوون}.

﴿ أُوْلَٰٓئِكَ يُنَادَوْنَ مِن مَّكَانِۭ بَعِيدٍ ﴾، ئەوانە وەك کەسێك وان کە لە شوێنێکی دوورەوە بانگ بکرێن.

کەسێك لە شوێنێکی دوورەوە بانگ بکرێ، هەر دەنگ دەبیستێ، بەڵام لێی تێناگات.

کەواتە: لێرەدا بە تەئکید مەبەست لە چارەسەر بوونی قورئان، بۆ ئەوەی لە دڵ و سینەکان دایە، چارەسەری مەعنەوییە، لە نەفامیی و نەزانیی، لە شیرك هاوبەش بۆ خوا دانان، لە کوفر لە ئیلحاد، لە دەغەڵیی و دووڕوویی، لە گومان و دوو دڵیی هەروەها لە سەرجەم ئەو سیفەتە نزم و پەست و خراپانەی، کە دەروونی ئینسان پێیانەوە گرفتار دەبێ، وەك خۆ بەزلگریی، ئێرەیی (حَسَد)، گومانی خراپ، دوو دڵیی و ... هتد، هەموو ئەو سیفەتانەی کە رووح پێیانەوە گرفتار دەبێ و دەبنە هۆی نەخۆش کەوتنی رووح و دەروونی مرۆڤ.

ئنجا ئەوە کە ئایەتەکان زۆر بە روونیی ڕاشکاویی دەیگەیەنن، زانایان هەموویان لەسەر ئەوە یەك دەنگن، کە بە پلەی یەکەم: قورئان شیفاو چارەسەری دەروونی مرۆڤە، شیفاو چارەسەری نەخۆشییە دەروونیی و رووحییەکانی مرۆڤە، کە بێگومان مرۆڤیش بە رووح و دەروونەکەیەوە مرۆڤە، ئەگەرنا وەك کەلەش و جەستە، کەلەش و جەستە خاڵی هاوبەشی نێوان مرۆڤ و سەرجەم دروستکراوانی دیکەی خوایە، بە ماددەی بێ ژیانیشەوە و بەر لەوەش: ئاژەڵ و پەڕەورو دڕندەو، زیندەوەران و، ...هتد، بەڵام ئەوەی مرۆڤی کردوە بە مرۆڤ و مرۆڤی جیاکردۆتەوە لە دروست کراوەکانی دیکە، ئەو فووە خواییەیە، ئەوە دروستکراوە تایبەتەی خوایە کە خراوەتە نێو جەستەی مرۆڤەوە، کە رووحەیەکەتی.

## سێ: شیفا بوونی قورئان بۆ نەخۆشییە جەستەییەکان:

ئەمە لە نێوان زانایان دا ڕاجیایی لەسەرە و، زانایان لەو بارەوە مشت ومڕیان هەیە، کە ئایا قورئان وەك چۆن چارەسەرە بۆ دەروونی مرۆڤ و، لابەرە بۆ نەخۆشییە دەروونیی و ڕووحییەکانی، ئایا بە هەمان شێوەش: چارەسەرە بۆ جەستەی مرۆڤ و، لابەرە بۆ نەخۆشیی و گرفتارییە جەستەیی و ماددیی و ڕواڵەتییەکانیی مرۆڤ؟

هەندێکیان ڕایان وایە کە قورئان تەنیا شیفای مەعنەویی تێدایە.

بەڵام زۆربەیان (کە منیش بۆ خۆم هەر ڕام وایە)، ڕایان وایە کە قورئان وێڕای شیفاو چارەسەری مەعنەویی، شیفاو چارەسەری ماددییشی تێدایە و، وەك چۆن ڕووحی مرۆڤ چارەسەر دەکات لە نەخۆشیی و تێکچوونەکان، جەستەی مرۆڤیش چارەسەر دەکات، لەو بارەشەوە دەگونجێ زۆر بەڵگان بێنینەوە، بەڵام پێش ئەوەی بەڵگەکان ڕیز بکەین، دەڵێم:

زێدەڕۆیی (**إفراط**) لەو بوارەدا، لە لایەن هەندی کەسەوە، کراوە و، دەکرێ کە بۆ هەموو نەخۆشییەك، ئایەتێك، یان چەند ئایەتێك بخوێنی و قورئان بکەی بە جێگرەوەو بەدیل بۆ چارەسەری جەستەیی، ئەوە بێگومان زێدەڕۆییە و، هەر ئەو حاڵەتەشە، کەلایەنگرانی ڕای یەکەمی وا لێکردوە، ئەو ڕایە هەڵبژێرن کە قورئان تەنیا چارەسەری دەروون و ڕووحی مرۆڤ دەکات، بەڵام چارەسەری جەستەی، چارەسەری نەخۆشیی و دەردە جەستەییەکانی ناکات، کە وەك گوتم: هەمیشە لە بەرانبەر زێدەڕۆییدا، کورتهێنان هەیە، هەمیشە کەسێك بە لایەکدا تێدەپەڕێنێ، ئەوی دیکە کورتی دێنێ، لە کاردانەوەدا.

بەڵێ، بەڵگە هەن لەو بارەوە کە قورئان دەگونجێ چارەسەر بێ بۆ هەندێ لە نەخۆشییەکان، هەڵبەتە هەندێك ئایەتی تایبەتی قورئان، بۆ هەندێك حاڵەتی نەخۆشیی جەستەیی، دەگونجێ چارەسەر بن، بەڵام ئەوە نیە کە ئێمە بێنین قورئان بکەینە بەدیل و جێگرەوەی زانستیی پزیشکیی و، هەموو ئەو لێکۆڵینەوە زانیستییانەی کە زانایان پێیان هەڵدەستن، دەربارەی چارەسەری نەخۆشییە جەستەییەکان، ئنجا مەرجیش نیە هەرچی نەخۆشیی جەستەییە، بە قورئان چارەسەر بکرێ، بەڵام ڕاستیش نیە کە بڵێی: قورئان هیچ کاریگەریی نیە بۆ چارەسەری نەخۆشییە جەستەییەکان.

## سێ بەڵگە لەسەر ئەوە کە قورئان چارەسەرە، بۆ نەخۆشیی جەستەیی:

١)- چەمکی گشتیی ئایەتەکان: هەم ئایەتەکەی سوورەتی (الإسراء) کە دەفەرموێ: ﴿ وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴾، کە لێرەدا خوا ﷻ بە گشتیی فەرموویەتی: قورئان چارەسەرەو بەزەییە بۆ بڕواداران، هەروەها لە شوێنەکانی دیکەی قورئانیشدا، کە باسی شیفا بوونی قورئان کراوە، دەگونجێ بڵێین: چەمکی (شفاء) لە ئایەتەکان دا، وێڕای لایەنی مەعنەویی و ڕووحیی، لایەنی جەستەییش دەگرێتەوە.

(**محمد الطاهر بن عاشور**) ڕەحمەتی خوای لێ بێ، لە تەفسیرەکەی خۆی (**التحرير والتنوير**)[1]، لە تەفسیری ئەم ئایەتەی سوورەتی (الإسراء): ﴿ وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴾دا، دەڵێ: (**وَفِي الآيةِ دَلِيلٌ عَلى أن فِي القُرآنِ آياتٍ يُشْتَفَى بِهَا مِن الأدْوَاءِ والآلامِ، ورَدَ تَعيينُها فِي الأَخْبَار الصَّحيحَةِ، فشَمَلتهَا الآيةُ بطريقَةِ استِعْمَالِ المُشْتَرَكِ فِي مَعْنَيَيهِ**).

واتە: لەم ئایەتەدا بەڵگە هەیە لەسەر ئەوە کە لە قورئان دا، هەندێك ئایەت هەن، بۆ چارەسەری دەردو ئازارەکان بەکار دەهێنرێن، ئەو ئایەتانەش کە بۆ چارەسەری ئەو دەردو نەخۆشییانە بەکاردەهێنرێن، لە هەواڵە ڕاستەکاندا دیاریی کراون {واتە: فەرموودە ڕاستەکانی پێغەمبەر ﷺ} هەروەها ئەم ئایەتەش ئەو چەمك و واتایە دەگرێتەوە {یانی: ئەوەی لە فەرمایشتەکاندا نوختەی تێدا خراوەتە سەر پیت، هەندێك ئایەت دیاریی کراون و، ئەم ئایەتەش ئەو چەمکە گشتییە دەگرێتە خۆی} بە هۆی بەکارهێنانی وشەیەك کە دوو مانای هاوبەشی هەن.

واتە: وشەی شیفا، هەم چارەسەری ماددیی، هەم چارەسەری مەعنەویی، دەگرێتەوە و خوای پەروەردگاریش لێرەدا ئەو وشەیەی بەکارهێناوە.

٢)- چەند ئایەتێکی دیارییکراو هەن، کە لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەردا ﷺ دیارییکراون، یاخود بە ئەزموون دەرکەوتوە، کە ئەو ئایەتانە بۆ ئەو جۆرە نەخۆشیی و دەردانە، شیفاو چارەسەرن، بۆ نموونە:

أ- {**عَن أَبِي سَعِيدٍ الخُدرِيِّ** ﷺ **قَال: بَعثَنَا رَسُولُ اللَّهِ** ﷺ **فِي سَرِيَّةٍ ثَلاَثِينَ رَاكِباً، قَالَ: فَنَزَلنَا عَلَى قَوْمٍ مِنَ العَرَبِ، فَسَأَلنَاهُم أَنْ يُضَيِّفُونَا، فَأَبَوا، قَالَ: فَلُدِغَ سَيدُ الحَيِّ، فأَتَونَا فَقَالُوا: فِيكُم أَحَدٌ يَرقِي مِنَ العَقْرَبِ؟ {وَفِي رِوايَةِ ابنِ قَتة: إِنَّ المَلِكَ يَمُوت}، قَالَ: قُلتُ: أَنَا نَعَم، وَلَكِنْ لاَ أَفعَلُ حَتَّى تُعْطُونَا، فَقَالُوا: فَإِنَّا نُعطِيكُم**

---

(١) ج١٥، ص١٩٠.

ثَلاثِينَ شَاةً، فَقَرَأْتُ عَلَيهِ: الحَمدُ للهِ رَبِّ العَالَمِين، أَربَعَ مَرَّاتٍ فَبَرَأَ، «وَفِي رِوَايَةِ سُليمانِ بنِ قَتة، عَن أَبِي سَعِيد» فَأَفَاقَ وَبَرَأَ، فَبَعَثَ إِلَينَا بِنُزُلٍ، وَبَعَثَ إِلَينَا بِشَّاءٍ، فَأَكَلنا الطَّعَامَ أَنَا وَأَصحَابِي، وَأَبَوا أَن يَأكُلوا مِنَ الغَنَمِ، حَتَّى أَتَينَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَأَخبَرتُهُ الخَبَرَ، قَالَ: ومَا يُدرِيكَ أَنَّهَا رُقية؟ قُلْتُ: يَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ شَيءٌ أُلْقِيَ فِي رُوعِي، قَالَ: كُلُوا وَأَطعِمُونَا مِنَ الغَنَم} (أخرجه أحمد: ١١٠٨٥، والبخاري: ٢٢٧٨، مسلم: ٢٢٠١، وأبو داود: ٣٤١٨، والترمذي: ٢٠٦٣، وإبن ماجه: ٢١٥٦، ودار القُطني: ٢٤٣).

واتــە: ئەبــوو ســەعیدی خودریــی ﷺ دەڵــێ: پێغەمبــەری خــوا ﷺ، لــە سریەیــەك دا كــە سی (٣٠) ســوار بوویــن، ئێمــەی نــارد بــۆ چالاكییەكــی ســەربازیی، ئنجــا لــەلای هۆزێــك لــە عەرەبــان دابەزیــن، {واتــە: لــە شــوێنێك ئایــا دێ بــووە، ئایــا ڕەوەنــد بــوون؟}، داوامــان لێكــردن كــە بمانكەنــە میــوان، بــەڵام ڕازی نەبــوون، {دەبــێ لــە دووری ئــەوان خۆیــان بارگــەو بنەیــان خســتبێ ئامــادە نەبــوون كــە خواردنیــان پــێ بــدەن و وەك میــوان مامەڵەیــان لەگــەڵ دا بكــەن} دەڵــێ: گــەورەی هۆزەكــە پێیــەوە درا {دووپشــك پێــوەی داوە} هاتــن بــۆ لامــان گوتیــان: كەســتان تێــدا هەیــە، كــە ڕوقیــە بــكات لــە دژی ژەهــری دووپشــك؟ {لــە ڕیوایــەتی ئیبــو قەتــەدا - كــە یەكێــك بــووە لــە ڕاوییــەكان - دەڵــێ: گوتیــان: پادشــامان خەریكــە بمــرێ} ئەبــوو ســەعید دەڵــێ: گوتــم: بەڵــێ مــن ئامــادەم، بــەڵام ئامادەنیــم دوعــای بــۆ بكــەم، تاكــو پێمان نــەدەن، (پاداشــت و بەرانبەرمــان پــێ نــەدەن)، گوتیــان: باشــە ئێمــە ســی (٣٠) ســەر مەڕتــان دەدەینــێ لــە بەرانبــەردا.

دەڵــێ: منیــش ســوورەتی ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝٢﴾م، چوارجــاران لەســەری خوێنــد، چــاك بــۆوە، {لــە ڕیوایــەتی ســولەیمان ئیبنــو قەتــەدا لــە ئەبــوو ســەعیدەوە دەڵــێ: هاتــەوە هــۆش و چــاك بــۆوە} ئیــدی پادشــایەكە هــەم خواردنێــك كــە بــۆ میــوان دادەنــرێ، بــۆی ناردیــن و هــەم مەڕەكانیــش {واتــە: سی (٣٠) ســەر مەڕەكــەشی بــۆ ناردیــن}، ئێمــەش مــن و هاوەڵەكانــم خواردنەكەمــان خــوارد، بــەڵام هاوەڵەكانــم ئامــادە نەبــوون لــە مــەڕەكان بخــۆن، تاكــو چووینــەوە بــۆ لای پێغەمبــەری خــوا ﷺ، هەواڵەكــەم بــۆ باســكرد، ئەویــش فەرمــووی: چۆنــت زانی ســوورەی فاتیحــە ڕوقیەیــە؟ {لــە دژی ژەهــری دووپشــك بــەكار دێ، بــۆ چاكبوونــەوەی كەسێك كــە دووپشــك پێــوەی داوە شــیفا بــێ؟} گوتــم: ئــەی پێغەمبــەری خوا! شــتێك بــوو خرایــە نێــو دڵمــەوە، واتــە: خورپــەم بــۆ كــرا، {(رُوْع) یــانی: (بــالْ) یــانی: شــتێك بــوو خرایــە دڵمــەوە، ئیلهامــم بــۆ كــرا}، پێغەمبــەر ﷺ فەرمــووی: بخــۆن و لــە مــەڕەكان بــەشی ئێمــەش بــدەن.

مەبەستی پێغەمبەری خوا ئەوە بووە کە دڵنیابن: ئەوەی کە وەریانگرتوە لە بەرانبەر چاك کردنەوەی سەرۆكی ئەو هۆزەدا، بە هۆی خوێندنی سوورەتی فاتیحەوە، شتێکی حەڵاڵە.

**ب)- {عَنْ مُعَمَّرٍ عَنْ الزُّهْرِيِّ عَنْ عُرْوَةَ عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنهَا أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَنْفُثُ عَلَى نَفْسِهِ فِي الْمَرَضِ الَّذِي مَاتَ فِيهِ بِالْمُعَوِّذَاتِ، فَلَمَّا ثَقُلَ، كُنْتُ أَنْفِثُ عَلَيْهِ بِهِنَّ، وَأَمْسَحُ بِيَدِ نَفْسِهِ لِبَرَكَتِهَا، فَسَأَلْتُ الزُّهْرِيَّ: كَيْفَ يَنْفِثُ؟ قَالَ: كَانَ يَنْفِثُ عَلَى يَدَيْهِ، ثُمَّ يَمْسَحُ بِهِمَا وَجْهَهُ} (أخرجه البخاري: ٥٧٣٥، مسلم: ٢١٩٢، وأبو داود: ٣٩٠٢، والترمذي: ٢٠٦٣، وإبن ماجه: ٣٥٢٩).**

واتە: موعەممەر لە زوهریی دەگێڕێتەوە، ئەویش لە عوروە، ئەویش لە دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەرمان ﷺ لەو نەخۆشییەیدا کە تێیدا وەفاتی کرد، (**مُعَوِّذات**)[1]ی بەسەر خۆیدا دەخوێندن و، فووی لە دەستی دەکرد و دەستی بەسەر خۆیدا دەهێنا، بەڵام کاتێك کە جەستەی قورس بوو {واتە: نەیدەتوانی بۆ خۆی ئەو سێ سوورەتە بخوێنێ و، فوو بکاتە دوو دەستەکەیەوەو، بە جەستەی خۆیدا بێنێ} من لە نێو هەردوو دەستەکەیدا سێ سوورەتەکەم دەخوێندن و دوایی دەستی خۆیم بە جەستەی دا دەهێنا، لەبەر بەرەکەتی دەستی پێغەمبەر ﷺ، {واتە: دایکمان عائیشە لە جیاتی ئەوەی سوورەتەکان لە دوو دەستی خۆی دا بخوێنێ و، بە جەستەی پێغەمبەریان دا بهێنێ، هەردووك دەستی پێغەمبەری ﷺ دەهێنان، سێ سوورەتەکەی تێدا دەخوێندن و دوایی دوو دەستی پێغەمبەریشی بە جەستەیدا دەهێنان، ئەوەندەی پێی بگەیشتبایە}، موعەممەر دەڵێ: لە زوهرییم پرسی!؟ چۆن پێغەمبەر ﷺ فووی دەکرد و دوایی دەستی بە جەستەی خۆی دا دەهێنا؟ گوتی: فووی دەکردە هەردوو دەستەکانی، دوایی سوورەتەکانی دەخوێندن، ئنجا دەستی بە دەم و چاوی خۆی دا دەهێنا.

لە ڕیوایەتی دیکەدا هاتوە: {**وما بَلَغَ مِنْ جَسَدِهِ**}، هەر شوێنێك کە دەستی پێی گەیشتبایە، لە جەستەی دەستی پێی دا دەهێنا.

ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە ئەو قورئان شیفای جەستەشە، چونکە پێغەمبەر ﷺ دوای ئەوەی ئەو سێ سوورەتەی خوێندوون، فووی لە دەستی کردوە و، بە دەم و

---

(١) (المُعَوِّذات)یش سوورەتی: (الإخلاص، الفلق، الناس)، ئەو سێ سوورەتەن کە پێغەمبەری خوا ﷺ عادەتی وابووە هەموو بەیانیان و ئێواران، ئەو سێ سوورەتەی خوێندوون، کە چۆتە سەر جێگای خەوتن، ئەو سێ سوورەتانەی خوێندوون لە دوو لەپە دەستی داو فووی کردوە و، دوایی ئەوەندەی دەستی گەیشتۆتێ لە جەستەی، پێیدا هێناوە.

چاوو جەستەی خۆیدا هێناون، ئنجا ئەگەر تەنیا حاڵەتە مەعنەوییەکە بووایە، پێویستی بەوە نەدەکرد، دەست بە جەستەی خۆیدا بهێنێ و فوو بکات.

**٣)** چەند فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوا دەربارەی سوود بەخش بوونی دوعا لە ڕووی ماددیی و مەعنەوییەوە:

**أ)-** پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: {**إِذَا فَزِعَ أَحَدُكُمْ فِي النَّوْمِ، فَلْيَقُلْ: أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّاتِ مِنْ غَضَبِهِ وَعِقَابِهِ وَشَرِّ عِبَادِهِ، وَمِنْ هَمَزَاتِ الشَّيَاطِينِ، وَأَنْ يَحْضُرُونِ، فَإِنَّهَا لَنْ تَضُرَّهُ**} (**أخرجه ابن أبي شيبة: ٢٩٦٢١، والترمذي: ٣٥٢٨، وَحَسَّنَه الألباني**).

واتە: ئەگەر یەکێك لە ئێوە لە خەویدا، ڕاچڵەکی و ترسا، با بڵێ: پەنا بە وشە تەواوەکانی خوا دەگرم، {ناوە تەواوەکانی خوا، زۆربەی زانایان دەڵێن: (**كلِمَات**) لێرەدا مەبەست پێی ناوەکان (**أسماء**)ە، چونکە هەر ناوێکی خوا وشەیەکە، دەشگونجێ مەبەست لە (**كلِمات اللّه**) وشەکانی خوا بێ کە قورئانە}، لە تووڕەیی خوا و لە خراپ سزادانی خوا و، لە خراپەو زیانی شەیتانەکان و، لە شەڕ و خراپەی ئەوە کە لە لام ئامادە بن [و، بتوانن زەفەرم پێ ببەن].

**ب)-** پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {**لاَ بَأْسَ بِالرُّقَى مَا لَمْ يَكُنْ فِيهِ شِرْكٌ**} (**أخرجه مسلم: ٢٢٠٠، وأبو داود: ٣٨٨٦، وابن حبان: ٦٠٩٤، والحاكم: ٧٤٨٥**).

واتە: هەر دوعایەك بخوێنرێ [بۆ چارەسەری نەخۆشییەك، چ جەستەیی چ ڕووحیی] ئاساییە، مادام هاوبەشدانانی تێدانەبێ.

**ج-** {**عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهمَا، يَقُولُ: لَدَغَتْ رَجُلاً مِنَّا عَقْرَبٌ، وَنَحْنُ جُلُوسٌ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: رَجُلٌ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَرْقِي؟ قَالَ: مَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمْ أَنْ يَنْفَعَ أَخَاهُ فَلْيَفْعَلْ**}(**أخرجه مسلم: ٢١٩٩**).

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵلا (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ) دەڵێ: دوو پشك بە پیاوێکی وەدا، ئێمەش لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبووین، پیاوێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ دوعای بۆ بکەم؟ فەرمووی: هەر کامێك لە ئێوە دەتوانێ سوود بە برایەکەی خۆی بگەیەنێ، با بیکات، {واتە: ئەگەر دوعایەکی خێر دەزانێ، یان بە هەر شێوەیەك لە شێوەکان}.

## چەمکی وشەی (رُقِيَّة):

دەگوترێ: (رَقَى المَرِيضَ وَنَحوَهُ يَرقِيهِ، رَقْيًا، وَرُقِيًّا، رُقيَةً، عَوَّذَهُ، يقَالُ: بِسْمِ اللَّهِ أَرقِيكَ وَاللَّهُ يَشفِيك، وَالرَّاقِي صَانِعُ الرُّقيَةِ، وَصَاحِبُ الرُّقَى، وَجَمعُ الرَّاقِي: رُقَاة، وَهِيَ رَاقِيَةٌ وَالجَمعُ رُوَاق، وَهِيَ رَاقِيَةٌ وَالتَّاءُ لِلمُبَالَغَة)[1].

واتە: (رَقَى المَرِيضَ وَنَحوَهُ)، واتە: شێوەی نەخۆشیی {بۆ نموونە: کەسێ کە فێدارە، یان کەسێك کە جند چۆتە نێو جەستەیەوە} (يَرقِيهِ، رَقيًا، وَرُقِيًّا، وَرُقيَةً، عَوَّذَهُ)، واتە: پەنای پێ بە خوا برد، پەنای پێ گرت بە خوا ﷻ، دەگوترێ: (بِسْمِ اللَّهِ أَرقِيكَ وَاللَّهُ يَشفِيك) بە ناوی خوا دوعات بۆ دەکەم و، خواش چاکت بکاتەوە، (راقي) کەسێکە کە (رُقية) دەکات، خاوەنی (رُقية) و (راقي) کۆیەکەی (رُقاة)ە، بەڵام ئەگەر ئەوەی دوعا دەکات ئافرەت بێ پێی دەگوترێ: (راقية) و بە (رواق) کۆدەکرێتەوە، دەشگوترێ: (هيَ راقيةٌ)، واتە: ئەو زۆر دوعا دەکات (ت)یەکە بوو زێدەڕۆییکردنە.

## ئیشکالێك و وەڵامەکەی:

لێرەدا ئیشکالێك دێتە پێش ئەویش ئەوەیە کە لە هەندێك فەرموودانەدا هاتوە، یان لە هەندێك شوێنەواردا کە حوکمی فەرموودەیان هەیە، کە دەبێ پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگریی کردبێ لە نوشتەو دوعا، بۆ وێنە:

أ - {رَأَى ابنُ مَسعُودٍ ﷺ، عَلَى أُمِّ وَلَدِهِ تَمِيمَةً مَربُوطَةً، فَجَبَذَهَا جَبذاً شَدِيْداً فَقَطَعَهَا، وَقَالَ: إِنَّ آلَ ابن مَسعُودٍ لَأَغنِيَاءُ عَنِ الشِّركِ، ثُمَّ قَالَ: سَمِعتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: إِنَّ التَّمَائِمَ وَالرُّقَى وَالتُّوَلَةَ مِنَ الشِّركِ، قِيلَ: وَمَا التُّوَلَة؟ قَالَ: مَا تَحَبَّبَتْ بِهِ لِزَوجِهَا} (أخرجه أبو داود: ٣٨٨٣، وابن ماجه: ٣٥٣٠، وابن حبان: ٦٠٩٠، وَصَحَّحَهُ الأَلبَانِي).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ نووشتەیەکی هەڵواسراوی بە کەنیزەکەکەی خۆیەوە بینی، {(أُمَّ وَلَدِهِ) دایکی ڕۆڵەکەی، دیارە کەنیزەکی بووە}، زۆر بە توندیی ڕایکێشا و پچڕاندی و گوتی: ماڵی ئیبنو مەسعوود بێ نیازن لە شیرك، دوایی گوتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا بووە ﷺ دەیفەرموو: تەمیمەکان و ڕوقیەکان و تیوەلەکان لە شیرکن.

(تمائم) کۆی (تميمة)یە، دوعایەکە کە بنووسرێتەوەو هەڵبواسرێ، (رُقى) کۆی (رقية)یە دوعایەکە بخوێندرێ، جیاوازییەکەیان ئەوەیە ئەگەر بخوێندرێ، پێی دەگوترێ: (رُقْية)،

---

[1] المُعجَمُ الوَسِيط، ص٣٦٧.

ئەگەر بنووسرێ و هەڵبواسرێ پێی دەگوترێ: (**تميمة**)}، گوترا: (**تِولة**) چییە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی[1]: ئەوەیە کە ئافرەت خۆی پێ لە لای مێردەکەی خۆشەویست بکات، واتە: ئەو دوعایەی ئافرت بیکات {کە بە زۆریی وایە لە لای جادووگەرەکان و فاڵچییەکان دەکرێ} بۆ ئەوەی لە لای مێردی خۆشەویست بێ.

**ب** - هەروەها لەو بارەوە ئەم دەقەش هەیە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {**مَنْ عَلَّقَ تَمِيمَةً، فَلاَ أَتَمَّ اللَّه لَهُ، وَمَنْ عَلَّقَ وَدَعَةً، فَلاَ وَدَعَ اللَّه لَهُ**} (**أخرجه أحمد: ١٧٤٤٠، والحاكم: ٧٥٠١، وقال: صحيح الإسناد**).

(**قَالَ: الخَلِيلُ بنُ أَحمَد: التَمِيمَةُ: قِلَادَةٌ فِيهَا عُوذٌ، وَالوَدَعَةُ: خَرْزٌ**).

واتە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك نوشتەیەك هەڵواسێ {کە بە حیساب بۆ تەواو کردنە} خوا کارەکەی تەواو نەکات و، هەر کەسێك (**وَدَعة**) یەك هەڵواسێ، خوا سەلامەتی نەکات.

خەلیلی کوڕی ئەحمەدی فەراهیدیی گوتوویەتی: (**تميمة**) ملوانکەیەکە دوعای تێدا نووسرابێ، بۆ ئەوەی ئینسان بپارێزرێ، (**وَدَعَة**)ش بریتیە: لە ملوانکەیەك کە مورووەکان بە حیساب لە دژی چاو وزار حەسەد بەکاردێن.

ئنجا یەکێك بۆی هەیە، بڵێ: ئەم فەرمایشتانەو، ئەو شوێنەوارانە پێچەوانەی ئەوەن، کە ئێمە گوتمان!!

وەڵامەکە ئەوەیە: وەك (**القرطبي**) لە تەفسیرەکەیدا[2] دەڵێ: (**هَـذَا كُلُّـه تَحذِيـرٌ مِـمَّا كَانَ أَهـلُ الجَاهِلِيَّـةِ يَصنَعُونَـهُ، مِـن تَعلِيـقِ التَّمَائِـمِ وَالقَلَائِـدِ، وَيَظنُّـونَ أَنَّهَـا تَقِيهِـم وَتَـصرِفَ عَنهُـم البَـلاءَ، وَذَلِـكَ لا يَصرِفُـهُ إلاَّ اللَّـهُ تَعـالى**).

واتە: ئەوە هەمووی ورياکردنەوەیە لەوە کە خەڵکی سەردەمی نەفامیی دەیانکرد، کە نووشتەکانیان بە خۆیانەوە هەڵدەواسی و، ملوانکەکانیان هەڵدەواسی و، پێیان وابوو: ئەو نوشتەو ملوانکانە دەیانپارێزن و، بەڵایان لێ لادەدەن، لە حاڵێك دا کە بەڵا تەنیا خوای بەرز لایدەدات.

---

(١) دەشگونجێ ئەو پرسیار و وەڵامە لەگەڵ (عبدالله بن مسعود)دا کرابێ.

(٢) ج١٠، ص ٢٦٥.

واتـە: لەبەرئـەوە پێغەمبـەری خـوا ﷺ ئەوشـتانەی قەدەغـە كـردوون، چونكـە خەڵكەكـە پێیـان وابـووە: ئـەو نووشـتە و ملوانكەیـە، یاخـود ئـەو شـتە كـە بـە خۆیـانی هەڵدەواسـن، بەڵایەكـە لادەدات، نـەك خـوا ﷻ ئەوشـتە بـكات بـە هۆكارێـك و بەڵایەكـە لابـدات.

بـەڵام مـن پێـم وایـە كـە لەسـەردەمی نەفامییـدا و ئێسـتاش هـەر كەسـێك نوشـتەیەك، یـان ملوانكەیـەك، یـان شـتێك كـە بەڵگەیـەكی شـەرعیی لەسـەر نەبـێ بـۆ فـڵان شـتە بـاش بـێ بەكاربهێنـێ، بێگومـان ئەوەیـە كـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ قەدەغـەی كـردوە، بـە تایبـەت:

**یەك:** ئەوانەی كە هەندێ جار شت دەنووسن، كە مەفهووم نیە و ماناكەی دیار نیە، یاخود هەندێك ژمارە و ئاماژەو هێڵ دەنووسن.

**دوو:** یاخود هەندێك ناو و وشە دەنووسن، كە نازاندرێ چین؟! یان وشەی عەرەبی نین، یان بە پیتی عەرەبی دەنووسرێن، بەڵام ماناكەیان بە عەرەبی زانراو نیە، یاخود بە كوردیی زانراو نیە.

**سێ:** یاخود شتانێك كەپشت ئەستوور نین بە هیچ بەڵگەیەكی شەرعیی و عەقڵیی و هەندێك كەس  بەكاریان دەهێنێ: وەك مت و مورو و، ناڵی گوێدرێژ، یان ناڵی ئەسپ، قۆچی ئاژەڵ، یاخود جۆرە دەزوویەك كە لە دەستیانی دەئاڵێنن، یاخود لەسەر گۆڕی پیاو چاكێك، پەڕۆیەك، یان بەردووچكەیەك دێنن.

ئەوانـە بـە تەئكیـد قەدەغـە كـراون و ڕێ لێگیـراون و، ئەمـە جیایـە، لـەوە كـە ئایەتێـكی خـوای پـەروەردگار، یاخـود فەرمایشـتێكی پێغەمبـەر ﷺ، بـۆ چارەسـەری نەخۆشـییەكی دیارییكـراو، بەكاربهێـنرێ، ئـەوە شـتێكی ڕەوایـە.

هەڵبەتـە لێـرەدا دەبـێ ئـەوەش بزانـرێ: ئایـا دروسـتە ئـەو دوعایـەی كـە دەكـرێ بشـنووسرێ، پاشـان هەڵیـش بـواسرێ؟ لـەو بـارەوە ڕاجیایـی لـە نێـوان زانایانـدا هەیـە، بـۆ وێنـە: گێڕدراوەتـەوە لـە عەبدوڵـڵای كـوڕی عەمـڕی كـوڕی عـاص (خـوا لـە خـۆی و بـابی ڕازی بـێ)، كـە منداڵـەكانی، ئـەوەی زانیبـای فێـری دەكـرد، ئـەم دوعایـە بڵـێ:

**{أَعـوذُ بِكَلِـمَاتِ اللَّـهِ التَّامَّـةِ، مِـنْ كُلِّ شَـيْطَانٍ وَهَامَّـةٍ، وَمِـنْ كُلِّ عَـيْنٍ لاَمَّـةٍ} (أخرجـه البخـاري: ٣١٩١، والترمـذي: ٢٠٦٠، وإبـن ماجـه: ٢٥٣٥)**، ئـەوەی نەشـیزانیبایە فێـر بـێ، بـۆی دەنـووسی و پێـی هەڵـدەواسی.

ئنجـا هەندێـك لـە زانایـان ئـەوە دەكەنـە بەڵگـە لەسـەر ئـەوە كـە دروسـتە دوعا بنـووسرێ و هەڵبـواسرێ، كـە بـە كوردیـی پێـی دەڵێـن: نووشـتە و، بـە عـەرەبی پێـی دەڵێـن: (**تميمة**) واتـە:

کاتێك كە نووسراو هەڵواسرا، ئەوجار پێی دەڵێن: (**تميمة**)، ئەگەرنا، ئەگەر هەر دوعا بێ بخوێندرێ، پێی دەگوترێ: (**رقية**).

بۆ خۆم پێم وایە: لای دووربینیی و، سەلامەتیی زیاتر لەوەدایە كە ئینسان دوعا نەنووسێ و، تەنیا ئیكتیفا بكات بە خوێندن، بە تایبەتی لە سەر ئاو، یان لەسەر خودی نەخۆشەكە و، دەستی پێدا بێنێ.

هەڵبەتە ئەویش بۆ هەموو نەخۆشێك نا، بەڵكو بۆ هەندێك نەخۆشی تایبەت، هەروەها هەموو ئایەتێكیش نا، بەڵكو هەندێك ئایەتی تایبەت، یاخود هەندێك وشەی تایبەت، كە پێغەمبەری خوا ﷺ لێی گێڕدراونەوە، كە بۆ حاڵەتێكی تایبەت بەكاری هێناون، لەو سنوورەدا پێویستە ئەوە بەكار بێ، نەك بە ڕەهایی هەموو قورئان بۆ هەر نەخۆشییەك بەكاربێنی و، هیچ نەخۆشییەكت لەبەر عاسێ نەبێ!! بە تەئكید ئەوە ڕاست نیە، چونكە پێغەمبەر ﷺ دەیتوانی بفەرمویێ: قورئان بخوێنن بۆ هەموو نەخۆشییەكان، بەڵام نەخێر هەم بۆ خۆشی و هەم هاوەڵانی، هەم كەسێك كە نەخۆشیی و گرفتێكی تەندروستی هەبووە و هاتوە بۆ لای، ڕێنمایی كردوە بۆ چارەسەرێكی گونجا و، بۆ وێنە: وەك پێشتر باسمان كرد لە تەفسیری سوورەتی (**النحل**)دا كەسێك دێ بۆ لای و دەڵێ: برایەكەم سكی دەچێ، (ڕەوانە) پێی دەفەرموێ: {**اسْقِهِ عَسَلاً**}[1]، تاكو چوار جاران، واتە: نەیفەرموو: بچۆ فلان سوورەتە یان فلان ئایەتەی لە سەر بخوێنن.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ بۆ خۆشی خۆی چارەسەر كردوە لە هەندێك نەخۆشییان و پزیشكیان بۆ هێناوە، دیسان بۆ خۆی فەرموویەتی:

**{إِنَّ اللَّـهَ لَـمْ يُنْـزِلْ دَاءً، إِلاَّ أَنْـزَلَ لَـهُ شِـفَاءً، فإذا أصاب الدواءُ الداءَ بريء بإذن اللّـه} (أَخْرَجَـهُ الْبُخَـارِيُّ: ٥٣٥٤، عَـنْ أَبِي هُرَيْـرَةَ ﷺ).**

واتە: خوا هیچ دەردێكی دانەبەزاندوە، مەگەر چارەسەرێكی بۆ دابەزاندوە، ئنجا هەركات ئەو چارەسەرە، گەیشتە ئەو نەخۆشییە، بە مۆڵەتی خوا چاك دەبێ.

كەواتە: پێویستە هەر حاڵەتە بە شێوەی خۆی چارەسەر بكرێ، كەسێك برینی لە شوێنێك دەبێ، پێغەمبەر ﷺ كە لە جەنگی ئوحوددا كوڵمەی موبارەكی برینداربوو

---

(١) {عَـن أَبِي سَـعِيدٍ ﷺ، أَنَّ رَجُـلاً أَتَى النَّبِـيَّ ﷺ، فَقَـالَ: أَخِـي يَشْـتَكِي بَطْنَـهُ، فَقَـالَ: اسْـقِهِ عَسَـلاً، ثُـمَّ أَتَى الثَّانِيَـةَ، فَقَـالَ: اسْـقِهِ عَسَـلاً، ثُـمَّ أَتَـاهُ الثَّالِثَـةَ، فَقَـالَ: اسْـقِهِ عَسَـلاً، ثُـمَّ أَتَـاهُ، فَقَـالَ: فَعَلْـتُ، فَقَـالَ: صَـدَقَ اللَّـهُ وَكَـذَبَ بَطْـنُ أَخِيـكَ، اسْـقِهِ عَسَـلاً فَسَـقَاهُ، فَبَـرَأَ} أخرجـه أحمـد: ١١٨٨٩، والبخـاري برقـم ٥٣٦٠.

بـوو، ددانی شـکاوە، خوێنـی لەبـەر ڕۆیشـتوە، فاتیمـەی کچـی و عـەلی ئامـۆزای (خـوا لێیـان ڕازی بـێ) حەسـیریان سـووتاندوە و خۆڵەمێشـەکەیان خسـتۆتە سـەر برینەکـەی، بـۆ ئـەوەی خوێنەکـەی بوەسـتێ[1]، نەیفەرمـووە: فـلان ئایـەتی بەسـەردا بخوێنـن، هەروەهـا زۆر حاڵـەتی دیکـەی نەخۆشـیی کـە پێغەمبـەر ﷺ بەسـەری هاتـوون، بۆیـان باسـکردوە کـە فـلان شـتە چارەسـەرە، بـەکاری هێنـاوە.

**(إبـن القيـم)** کتێبێـکی هەیـە بـە نـاوی **(الطِّـبُّ النَّبـوي)** تێیـدا هاتـوە کـە لـەوێ دا پێغەمبـەر ﷺ زۆر شـتی پێشـنیار کـردوە لـە جـۆرەکانی خـواردن، لـە جـۆرەکانی میـوە، لـەو شـتانەی کـە خـوای شـیفا بەخـش، دروسـتی کـردوون، فەرموویـەتی: ئـەو شـتە بـۆ فـلان نەخۆشـییە، باشـە، ئـەو چارەسـەرە بـۆ فـلان دەردە بەکاربێنـن.



---

(١) وەك لە (صحيح البخاري)دا هاتوە: ٥٣٩٠ .

## مەسەلەی دووەم:

**خـوا فەرموویـەتی: هـەر کاتێـك چاکەمـان لەگـەڵ مرۆڤـی بێبـڕوادا کـرد، پشـت هەڵـدەکات و لاتەنیشـتی دووردەخاتـەوە و، هەرکاتیـش خراپـەو زیـانی تـووش بـوو، زۆر نائومێـدو بـێ هیوایـە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَآ أَنۡعَمۡنَا عَلَى ٱلۡإِنسَٰنِ أَعۡرَضَ وَنَـَٔا بِجَانِبِهِۦ وَإِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ كَانَ يَـُٔوسٗا ﴿٨٣﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿ وَإِذَآ أَنۡعَمۡنَا عَلَى ٱلۡإِنسَٰنِ ﴾، هەر کاتێك چاکەمان لەگەڵ مرۆڤدا کرد.

(**الإِنعَامُ: إِعْطَاءُ النِّعمَةِ**)، (**إنعام**) بریتیە لە پێبەخشینی چاکە.

﴿ ٱلۡإِنسَٰنِ ﴾، (**التَّعرِيـفُ فِي الإِنسَـانِ تَعرِيـفُ الجِنـسِ، وَهُـوَ يُفِيـدُ الإِسـتِغرَاقَ، لكنَّـه اسـتِغرَاقٌ عُـرفِي**)، (الـ)ی سـەر (**الإنسـان**) بـۆ ناسـاندنە، مەبەسـتیش لێـرەدا (**جِنـس**)ە، واتـە: تێکـڕای مرۆڤ، هەمـووی دەگرێتـەوە، بـەڵام دەزانیـن کـە لێـرەدا مەبەسـت هەمـوو پێگرتنـەوەی بـاوە، واتـە: ئـەو ئینسـانانەی کـە بـاون بـەو شـێوەیە بـن، کـە ئینسـانە بێبڕوایـەکانی ڕۆژگاری پێغەمبـەر ﷺ، بـوون و، هـی ئێسـتاش هـەر وان و، لـە کاتی (هـات)دا لـە خۆبایـی دەبـن و، لـە کەوڵـی خۆیـان دەردەچن.

٢)- ﴿ أَعۡرَضَ وَنَـَٔا بِجَانِبِهِۦ ﴾، پشت هەڵدەکاو تەنیشتی خۆی دوور دەخاتەوە.

﴿ وَنَـَٔا ﴾، خوێنراویشـتەوە: (**وَنَـاءَ**)، (**نَـاءَ**)، واتـە: (**بَعُـدَ**) یـان (**أَبْعَـدَ**)، (**نَـَـا بِجَانِبِـهِ**)، (**النـأي: البُعـدُ، وَالجَانِـبُ: الجَنْـبُ، وَهُـوَ الجِهَـةُ مِـن الجَسَـدِ الَّتِـي فِيهَـا اليَـدُ**)، (**جانِـب**) یـانی: تەنیشـت، کەلەکـە، ئـەو لایەیـە لـە جەسـتە، کـە دەسـتی دەکەوێتـێ، ئینسـان ڕاسـت و چـەپ (**يَمـين و يسـار**)ی هـەن، هـەروەك پێـش و دوا (**أمـام و وراء**)یـشی هـەن.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ أَعۡرَضَ ﴾، واتـە: پشـتی هەڵکـرد، ﴿ وَنَـَٔا بِجَانِبِهِۦ ﴾، تەنیشـتی خـۆی دوورخسـتەوە: ﴿ أَعۡرَضَ وَنَـَٔا بِجَانِبِهِۦ ﴾، (**أَي: بَعُـدَ مُصَاحِبـاً لِجَانِبِـهِ، أَي: مُبعِـداً جَانِبَـهُ، وَالبُعـدُ بِالجَانِـبِ تَمْثِيـلُ الإِجفَـالِ عَـنِ الـشَّيء**)، واتـە: ڕووی وەچەرخانـد و، پشـتی هەڵکـرد، تەنیشـتی

خۆشی وە دوورخست، واتە: دوورکەوتەوە لەگەڵ تەنیشتەکەی دا، یاخود تەنیشتی خۆشی وە دوورخست، کە ئەمە وێناکردنە بۆ سڵەمینەوەی مرۆڤ و دوورکەوتنەوەی لە شتێك.

پسپۆڕانی زمان گوتوویانە: (**وَحُذِفَ مُتَعَلَّقُ** ﴿أَعْرَضَ وَنَـَٔا﴾، **لِدَلالَةِ المَقَامِ عَلَيْهِ، أَي: أَعرَضَ عَنَّا، وَأَجفَلَ مِنَّا، أَي: مِن عِبَادَتِنَا وَأَمرِنَا وَنَهيِنَا**)، واتە: ئەوەی کە وشەی ﴿أَعْرَضَ﴾ و ﴿وَنَـَٔا﴾، پێوەی پەیوەستن، قرتێنراوە، چونکە مەقام و سیاق دەیگەیەنێ، واتە: پشتی لە ئێمە کرد و لە ئێمە سڵەمیەوە، یانی: لە بەندایەتیی کردن بۆ ئێمەو، لە فەرمانی ئێمەو، لە قەدەغەکردنی ئێمە.

٣)- ﴿وَإِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ كَانَ يَـُٔوسًا﴾، ئەگەر زیان و خراپەیەکیشی تووش بوو، زۆر نائومێدە، واتە: وا چاوەڕێ مەکە کە ئەگەر چاکەمان لەگەڵدا کرد، لەخۆبایی ببێ، پێت وابێ ئەگەر دوایی تووشی زیان و ناڕەحەتیی ببێ، عیبرەتی لێوەربگرێ و بگەڕێتەوە بۆ لای خوا، بەڵکو ئەوکاتەش زۆر نائومێد دەبێ، هەم بە (هات) لەخۆبایی دەبێ، هەم بە (نەهات) دەستی هەم لە پچکان دەبڕێ و، تووشی نائومێدیی و بێ هیوایی دەبێ، بە پێچەوانەی ئینسانی ئیماندارەوە، ئینسانی ئیماندار لە حاڵەتی هاتدا، لە حاڵەتی خۆشییدا، سوپاسگوزاریی دەکات و، لە حاڵەتی ناڕەحەتیی دا، خۆڕاگریی دەکات.

## مەسەلەی سێیەم:

**خوا فەرموویەتی: بڵێ: هەر کەسە بە پێی سروشت و هەڵکەوتەو پێکهاتەی خۆی کاردەکات و، پەروەردگاریشتان زاناترە بەو کەسەی ڕێی ڕاسترە:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿ قُلْ كُلٌّ يَعْمَلُ عَلَىٰ شَاكِلَتِهِۦ فَرَبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَنْ هُوَ أَهْدَىٰ سَبِيلًا ﴿٨٤﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿ قُلْ كُلٌّ ﴾، بڵێ: هەر کامێکیان.

{(التنوين) في ﴿ كُلٌّ ﴾، (**عِوَضٌ عَنِ المُضَافِ إِلَيهِ، أَي: كُلُّ أَحَدٍ مِمَّن شَمَلَهُ عُمُومُ قَولِهِ:** ﴿ وَمَن كَانَ فِى هَٰذِهِۦٓ أَعْمَىٰ فَهُوَ فِى ٱلْءَاخِرَةِ أَعْمَىٰ ﴾، **وَعُمُوم قَولِهِ:** ﴿ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارًا ﴾، **وَعُمُومُ قَولِهِ:** ﴿ وَإِذَآ أَنْعَمْنَا عَلَى ٱلْإِنسَٰنِ أَعْرَضَ وَنَـَٔا بِجَانِبِهِۦ ﴾}، تەنوینی سەر ﴿ كُلٌّ ﴾، قەرەبووی پاڵ وەلادراوە، واتە: (**كُلُّ أَحَدٍ**)، واتە: هەر کامێك، کە چەمکی گشتی ئەو فەرمایشتانەی خوا کە لە ئایەتەکانی پێشێ دا فەرمووی: دەیگرێتەوە: هەر کەسێك لەم دنیایەدا کوێر بێ، لە دواڕۆژیشدا هەر کوێرە.

یان کە دەفەرمووێ: ئەم قورئانە شیفاو بەزەییە بۆ بڕواداران، بەڵام بۆ ستەمکاران هەر زیانبارییان زیاد دەکات.

یان کە دەفەرمووێ: ئەگەر چاکەمان لەگەڵ مرۆڤدا کرد، پشت هەڵدەکاو تەنیشتی خۆی وە دووردەخات.

هەر کامێك لەوانە: لە بڕواداران و بێبڕوایان ﴿ قُلْ كُلٌّ ﴾، واتە: (**كُلُّ أَحَدٍ مِمَّا ذُكِرَ**)، هەرکامێك لەوانەی کە باسکران.

٢)- ﴿ يَعْمَلُ عَلَىٰ شَاكِلَتِهِۦ ﴾، بە پێی سروشت و ڕێبازو هەڵکەوتەی خۆی ڕەفتار دەکات.

(**الشَّاكِلَةُ: الطَّرِيقَةُ وَالسِّيرَةُ الَّتِي اعتَادَهَا صَاحِبُهَا، وَنَشَأَ عَلَيهَا، وَأَصلُ الشَاكِلَة: الطرِيقُ، وَهِيَ شُعْبُتُه الَّتِي تَتَشَعَّبُ مِنهُ**)، (**شَاكِلَة**)، بەو ڕێبازو ڕێ و شوێنە دەگوترێ: کە خاوەنەکەی خووی پێوە گرتووەو لەسەری پێگەیشتووە، ئەصڵی وشەی (**شاكِلة**)ش، بەو لقە ڕێیە دەگوترێ، کە لە شەقامە ڕێ جیادەبێتەوە.

٣)- ﴿ فَرَبُّكُمۡ أَعۡلَمُ بِمَنۡ هُوَ أَهۡدَىٰ سَبِيلٗا ﴾، پەروەردگارتان زاناترە بەوە کە کێ ڕێ ڕاسترە، کێ ڕێی ڕاستری گرتوە.

ئەمە قسەیەکی کۆکەرەوەیە، کە خوا ﷻ فەرموویەتی، تاکو خەڵك بە گشتی فێربکات، بە تایبەت بڕواداران فێر بکات و، هانیان بدات کە هەوڵبدەن: خاوەن سروشتێکی باش بن، بۆ ئەوەی کردەوەی باشیشیان هەبێ، هەوڵبدە مەعدەنەکەت پاك بێ، کردەوەکەت چاك دەبێ، ئنجا ئەمە ترساندن و وریا کردنەوەشە، بۆ هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، کە ئێوە بۆیە بیرکردنەوەی وا سەقەتتان هەیە، چونکە سروشتەکەتان خراپە، چونکە بارە دەروونییەکەتان خراپە، {گۆزە چی تێدابێ ئەوەی لێ دەڕژێ}، وەك پێشتریش باسمان کرد، کەواتە: بەڵێ مرۆڤ مەعدەنی چۆن بێ، هەر بەو شێوەش کاردەکات، هەر بۆیە پێویستە ئینسان زۆر کار لەسەر جەوهەرو کەسایەتیی و مەعدەن و دیوی پەنهانیی خۆی بکات، ئەگەر بیەوێ ڕواڵەتی جوان بێ، دەبێ هەوڵ بدات: نێوەڕۆکی ئاوەدان بێ، لە ڕاستییدا ئەوە ڕووحی پاك و چاکی مرۆڤە، کە کردەوە ڕواڵەتییەکانی چاك دەکات.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی ئێمە لەو کەسانە بگێڕێ کە سەرکەوتوو دەبن، ناخی خۆیان پاك و چاك بکەن، چونکە ناخی ئێمە جێگای سەرنجی خوایە، نەك ڕواڵەتمان.

وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **{إِنَّ اللَّـهَ لاَ يَنْظُـرُ إِلَى صُوَرِكُـمْ وَأَمْوَالِكُـمْ، وَلَكِـنْ يَنْظُـرُ إِلَى قُلُوبِكُـمْ وَأَعْمَالِكُـمْ} (أَخْرَجَـهُ مُسْـلِم: ٢٥٦٤).**

واتە: بە دڵنیایی خوا تەماشای دیمەن و ماڵ و سامانەکانتان ناکات، بەڵکو تەماشای دڵەکان و کردەوەکانتان دەکات.

جێی سەرنجی خوا: دڵە، دڵیش سەرچاوەی کردەوەکانە، ئەگەر دڵەکە پاك و چاك بێ، بە تەئکید کردەوەکانیش ڕێك و ڕاست و شەرعیی دەبن.

## مەسەلەی چوارەم:

**خوا بە پێغەمبەری فەرمووە ﷺ: لە بارەی ڕووحەوە پرسیارت لێدەکەن، بڵێ: ڕووح لە کارو فەرمانی پەروەردگارمەو، کەمێکیش نەبێ زانیارییتان پێنەدراوە:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّى وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٨٥﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِ ﴾، لە بارەی ڕووح (گیان)ەوە پرسیارت لێدەکەن.

بێگومان پرسیاریان لێکردوە دەربارەی: چییەت و جەوهەری ڕووح کە چییە؟! ناخی مرۆڤ؟ هەموو مرۆڤێك هەست دەکات کە جەستەیەکی هەیە و شتێکی دیکەی پەنهانیشیی هەیە، جگە لەو جەستەیە.

٢)- ﴿ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّى ﴾، بڵێ: ڕووح لە کاری پەروەردگارمە.

وشەی (أَمر) لێرەدا: (**الأَمر: إمَّا مُرَادِفٌ لِلشَّيءِ، أَي: الشَّيءُ العَظِيمُ الَّذِي هُوَ لِلّه، أَوِ المُرَادُ الأَمرُ التَّكوِيني**)، وشەی (**أمر**): یان مەبەست پێی شتە، واتە: ئەو شتە مەزنەی کە تەنیا هی خوایە، یاخود مەبەست لە وشەی (**أمر**)، فەرمانی هێنانەدێ (**تكويني**)یە، واتە: ڕووح بە فەرمانی ڕاستەوخۆی خوا ﷻ هاتۆتە دی، عالەمی (**خَلْق**) ئەو شتانەن کە خوا پلە پلە دروستیان دەکات، بەڵام عالەمی (**أمر**) ئەو شتانەن کە خوا ڕاستەوخۆ دروستیان دەکات.

٣)- ﴿ وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ﴾، کەمێکیش نەبێ زانیارییتان پێنەدراوە.

ئایا لێرەدا دوێندراوەکان کێن؟ ﴿ وَمَآ أُوتِيتُم ﴾، ئەم (م)ی سەر (**أُوتِيتُم**)، کە ڕاناوی کۆی دوێنراوە، مەبەست پێی کێن؟ زانایان زۆریان قسە لەوبارەوە کردوە، بەڵام پێم وایە مەبەست تێکڕای مرۆڤانە، چونکە: دەگونجێ لەوبارەوە چوار ڕاو بۆچوون هەبن:

أ/ دەگونجێ هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان بن.

**ب/** دەگونجێ جوولەکەکان بن، وەك لە هۆی هاتنە خوارەوەکەی دا باسمان کرد.

**ج/** دەگونجێ بڕواداران بن.

**د/** دەشگونجێ هەموو مرۆڤەکان بن.

کە من ئەوەی چوارەمم پێ ڕاسترە، بە تەئکید هەم هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان و، هەم جوولەکەو نەصرانییەکان و، خاوەن کتێبەکان بە گشتی و، هەم بڕواداران و، تێکڕای مرۆڤەکانیش، کەمێك نەبێ زانیارییان پێ نەدراوە، واتە: زانیارییەکی کەمیان پێدراوە، لە چاو ئەو هەموو نهێنییانەی لە گەردوون دا هەن، گەردوونی بینراو و نەبینراو، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ فَلَآ أُقۡسِمُ بِمَا تُبۡصِرُونَ ﴿٣٨﴾ وَمَا لَا تُبۡصِرُونَ ﴿٣٩﴾ ﴾الحاقة، وانیە (وەك دەڵێن ئەی بێبڕوواینە!) سوێند دەخۆم بەوەی کە دەیبینن و بەوەش کە نایبینن، یان وەك دەفەرموێ: ﴿ عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ﴿٧٣﴾ ﴾الأنعام، زانای پەنهان و ئاشکرا.

ئنجا بە نسبەت زانیاریی خواوە و، بە بەراورد لەگەڵ زانیاریی خوادا، بە تەئکید ئێمە زانیارییەکی کەممان پێدراوە و، ئەمەش ئاماژەیە بەوە کە: ئێوە بەو زانیارییە کەمە، ئەگەر دەرکی چییەت و جەوهەری ڕووحتان نەکرد، مەچن نکووڵیی لە بوونی ڕووح بکەن، چونکە زانیارییەکەتان هێندە نیە، هەموو شتێکی پێ بزانن، هەموو نهێنییەکانی پێ بزانن و، هەموو مەتەڵەکانی گەردوونی پێ حەل بکەن، ئنجا یاسایەکی لۆژیکیی و (منطقي)یە: (**إنَّ عَدَمَ العِلمِ لا يَستلزِمُ عِلمَ العَدَمِ**)، واتە: زانیاریی نەبوون بە شتێك، بەڵگە نیە لەسەر نەبوونی ئەو شتە، نەبوونی زانیاریی بە شتێك، نابێ بکرێتە بەڵگەی، یان بکرێتە زانیاریی، لەسەر ئەوەی کە ئەو شتە نیە، زۆرشت هەیە تۆ نایزانی، بەڵام هەشە.

## کورتە باسێک لە بارەی ڕووحەوە

**ئەم کورتە باسە لە پێنج بڕگەدا دەخەینە ڕوو:**

**یەکەم:** مانای وشەی ڕووح لە قورئانیٰ دا؟

**دووەم:** ڕووح چییەو چۆنە؟

**سێیەم:** ئایا لێکۆڵینەوە لە بارەی ڕووحەوە، ڕێپێدراوە، یاخود ڕێی لێگیراوە؟

**چوارەم** : بەڵگەکانی ڕەوایی لێکۆڵینەوە لەبارەی ڕووحەوە.

**پێنجەم:** پێنج هەڵوەستەی ڕۆشنکەرەوە لەبارەی ڕووحەوە.

### بڕگەی یەکەم: وشـەی ڕووح، بە لای کەمەوە، بە پێنج واتایان هـاتوە، بە پێی سەرنجدانی من:

**١)**- ڕووحی مرۆڤ، وەك لە سوورەتی (**الحجر**) ئایەتی (٢٩)دا هاتوە، خوا دەفەرمویٚ: ﴿ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي ﴾، واتە: لەو ڕووحە (کە دروستکراوی تایبەتی خۆمە) فووم بە بەردا کرد، کە مەبەست پێی جەستەی ئادەمە ؛، کەواتە: ڕووح مەبەست پێی ئەو شتە مەعنەوییەیە کە لە مرۆڤدا هەیە، جگە لە جەستەکەی، جەستەکەی ئەوە بەرهەستە، بەڵام ڕووحەکەی، شتێکی نابەرهەستەو، بە پێنج هەستەکان دەرك ناکرێ.

**٢)**- وشەی ڕووح، وەك ناو بۆ جیبریل، یان وەك سیفەت بەکارهاتوە، وەك لە سوورەتی (**النبأ**) ئایەتی (٣٨)دا، دەفەرمویٚ: ﴿ يَوْمَ يَقُومُ الرُّوحُ وَالْمَلَائِكَةُ صَفًّا ﴾، واتە: ئەو ڕۆژەی کە ڕووح و فریشتەکان بە ڕیز دەوەستن، کە بە تەئکید مەبەست لە ڕووح: جبریلە، چونکە لە سوورەتی (**الشعراء**)دا، خوا دەفەرمویٚ: ﴿ نَزَلَ بِهِ الرُّوحُ الْأَمِينُ ﴿١٩٣﴾ ﴾، واتە: ڕووحی ئەمین دایبەزاندۆتە سەر دڵی تۆ، هەروەها (**روحُ القدس**)یش هەر کراوە بە ناو، یان نازناو بۆ جبریل: ﴿ قُلْ نَزَّلَهُ رُوحُ الْقُدُسِ مِن رَّبِّكَ ﴾ **النحل** - ١٠٢ - کەواتە: مانای دووەمی وشەی ڕووح لە قورئاندا، بریتیە لە جبریل.

**٣)**- وشەی ڕووح، بەکارهێنراوە بۆ عیسا ؛، وەك خوا لە سوورەتی (**النساء**) ئایەتی (١٧١) دا، دەفەرمویٚ: ﴿ إِنَّمَا الْمَسِيحُ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ رَسُولُ اللَّهِ وَكَلِمَتُهُ أَلْقَاهَا إِلَىٰ مَرْيَمَ

﴿ وَرُوحٌ مِّنْهُ ﴾، واتە: بێگومان مەسیح، عیسای کوڕی مەریەم، ڕەوانەکراوی خوایەو وشەی خوایە فڕێی داوە بۆ مەریەم و ڕووحێك بووە لە لایەن خۆیەوە {یانی: ڕووحێکی تایبەت بووە لە لایەن خوای پەروەردگارەوە، کە خراوەتە نێو منداڵدانی مەریەم}.

٤)- وشەی ڕووح بەکارهاتوە بۆ قورئان، لە سوورەتی (**الشورى**) ئایەتی (٥٢)دا، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا ﴾، واتە: ئاوا بەو شێوەیە {کە پێشتر وەحیمان بۆ پێغەمبەران ناردوە} ڕووحێکیشمان بە فەرمانی خۆمان بۆ لای تۆ سروش کردوە {کە بە تەئکید مەبەست لە ڕووح، لێرەدا: قورئانە}.

٥)- وشەی ڕووح، بریتیە لە پشتگیریی کردنی تایبەتی خوای بەرز، بۆ بڕواداران، وەك لە سوورەتی (**المجادلة**) ئایەتی (٢٢)دا هاتوە، خوا دەفەرموێ: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلْإِيمَٰنَ وَأَيَّدَهُم بِرُوحٍ مِّنْهُ ﴾، واتە: ئەوانە کەسانێکن، خوا ئیمانی لە دڵیان دا چەسپاندوە، [(كَتَبَ) یانی: تۆماری کردوە و چەسپاندوویەتی، ئەسڵی واتای: (كَتَبَ): نووسی، بەڵام شتێك کە بنووسرێ، تۆمار دەکرێ و دەچەسپێنرێ] ﴿ وَأَيَّدَهُم بِرُوحٍ مِّنْهُ ﴾، بە ڕووحێکی تایبەت لە لایەن خۆیەوەش، پشتگیریی کردوون، کەواتە: (بِرُوحٍ مِّنْهُ) یانی: (**تأييدٍ منهُ**)، کەواتە: پشتگیریی کردنی تایبەتی خوا، بۆ ئیماندارانیش، بە ڕووح ناوبراوە.

## بڕگەی دووەم: ڕووح چییەو چۆنە؟

لەم بڕگەیەدا ئێمە مەبەستمان ئەوەیە کە زانایان لەو بارەوە چۆنیان قسە کردوە؟!

١ - (المُعجَم الوَسيط)[1] لەوبارەوە گوتوویەتی:

(**الرُّوح: مَا بِهِ حيَاة النَّفْسِ يُذَكَّرُ وَيُؤَنَّثُ، والنَّفْسُ، وَالنَّفَسُ، والجَمْعُ أَروَاح، والقُرآن، والوَحِي، وَفِي الفَلسَفَةِ: الرُّوحُ مَا يُقَابِلُ المَادَّة**)، واتە: ڕووح شتێکە کە ژیانی نەفسی پێوە بەندە و لە ڕووی زمانی عەرەبییەوە: هەم بە (**مُذَكَّر**) دێ {(**هذا روحٌ**)} و هەم بە (**مؤنث**)یش دێ {(**هذه روحٌ**)}، وشەی ڕووح بە مانای نەفس بەکاردێ، بە مانای هەناسەدانیش بەکاردێ {بە مانای ژیان و هەناسەدان} و کۆی ڕووح (**أرواح**)ە، هەروەها ڕووح بە مانای قورئان بەکارهاتوە و، بە مانای وەحییش بەکارهاتوە، لە فەلسەفەش دا ڕووح شتێکە لە بەرانبەر ماددە دایە.

---

(١) ص ٣٨٠.

مادده ئەو شتەیە کە بە پێنج هەستەکان دەرك دەکرێ، بەڵام ڕووح لە دەرەوەی بازنەی پێنج هەستەکانە.

٢ - (إبن القيم) له کتێبی (**الروح**)دا هێناویەتی: (**إِنَّ الرُّوح جَوهَرٌ بَسِيطٌ مُجَرَّدٌ، وَجِسمٌ نُورَانِيٌّ، مُخَالِفٌ بِطَبِعِهِ لِلجِسْمِ المَحسُوسِ، سَارَ فِيهِ سَرَيَانَ المَاءِ فِي الوَرِدِ، لا يَحدُثُ إلاَّ بِمُحدِثٍ، وهو قولُهُ تَعَالَى:** ﴿كُن فَيَكُونُ ﴿١١٧﴾﴾البقرة)[1].

واتە: ڕووح بریتیە لە جەوهەرێکی سادەی ڕووت و، جیسمێکی نوورانییە، بە سروشت لە ماددەی بەرهەست جیایە، ڕووح دەچێتە نێو جەستەوە، وەك چۆن ئاو دەچێتە نێو گوڵ {ئەو تەڕاییەی کە لە نێو گوڵێکدا هەیە، بۆنەکەی لەگەڵی تێکەڵ و ئاوێتەیە} ڕووح تەنیا بە پەیدا کەرێك پەیدا دەبێ، ئەویش قسەی خوای بەرزە کە دەفەرموێ: ﴿كُن فَيَكُونُ ﴿١١٧﴾﴾البقرة، واتە: ببە یەکسەر دەبێ.

٣)و٤) - (**الغزالي**) و (**راغب الأصفهاني**) یش ئاوا پێناسەی ڕووح دەکەن، دەڵێن: (**الرُّوحُ: لَيسَ بِجِسمٍ وَلا جِسمَانِيٌّ، مُتَعَلِّقٌ بِالبَدَنِ، تَعَلُّق التدبير وَالتَّصَرُّف**)[2].

واتە: ڕووح نەجیسمەو نەجیسمانییشە، بەڵکو پەیوەستە بە بەدەنەوە، وەك پەیوەست بوونی سەرپەرشتییکردن و، هەڵسووڕاندنی جەستە.

لێرەدا پێویستە ئەوە بزانرێ کە زانا پێشووەکان کە باسی (**جِسم**)یان کردوە، مەبەستیان پێی مادده بووە، (**جِسم**) واتە: مادده، شتی بەرهەست، (**جسماني**) واتە: شتێکە لە مادده دروست دەبێ، ئەوان لە جیاتی وشەی مادده، وشەی (**جِسم**)یان بەکارهێناوە، دەبێ ئەوە بزانرێ، (**ابن القيم**) کە دەڵێ: (**جِسْمٌ نُورانِيٌّ**) واتە: ڕووحیش حاڵەتێکی ماددییە، بەڵام ماددەیەکی نوورانیی، واتە: جگە لەو ماددەیەی کە بە پێنج هەستەکان دەزانرێ، ئەو ماددەیە جۆرە ماددەیەکی دیکەیە، کە بە پێنج هەستەکان دەرك ناکرێ.

٥ - (**محمد الطاهر بن عاشور**) له تەفسیرەکەی[3] خۆیدا دەڵێ: (**الرُّوحُ: يُطْلَقُ عَلَى الْمَوْجُودِ الْخَفِيِّ الْمُنْتَشِرِ فِي سَائِرِ الْجَسَدِ الْإِنْسَانِيِّ، الَّذِي دَلَّتْ عَلَيْهِ آثَارُهُ مِنَ الْإِدْرَاكِ وَالتَّفْكِيرِ، وَهُوَ الَّذِي يَتَقَوَّمُ فِي الْجَسَدِ الْإِنْسَانِيِّ حِينَ يَكُونُ جَنِيناً، بَعْدَ أَنْ يَمْضِيَ عَلَى نُزُولِ النُّطْفَةِ فِي الرَّحِمِ مِائَةٌ وَعِشْرُونَ يَوْماً**).

---

(١) الروح، ابن قيم الجوزية، تحقيق، عصام الدين الصبابطي، دار الحديث ٢٠٠٣م، ص٢٢٧ .

(٢) تفسير المنير: ج٨، ص١٦٨.

(٣) التحرير والتنوير: ج١٥، ص١٩٦.

واتـە: ڕووح بەکاردەهێـنرێ، بـۆ ئـەو دروسـتکراوە پەنهانـەی، کـە بـە نێـو هەمـوو جەسـتەی مرۆڤـدا بڵاوبۆتـەوە، کـە شـوێنەوارەکانی بەڵگـەن لەسـەری، شـوێنەوارەکانی وەك شـت زانیـن و بیرکردنـەوە، ڕووح لـە جەسـتەی مرۆڤـدا پەیدادەبـێ، لـە کاتێـکدا کـە کۆرپەلەیـە، دوای ئـەوەی کـە (**نُطفـة**) دەچێتـە نێـو منداڵـدانی دایکـەوە و سـەدو بیسـت (١٢٠) ڕۆژی بەسـەردا تێدەپـەڕن، دوای ئـەوە ڕووحـی بـە بـەردا دەکـرێ.

وەك لـە سـوورەتی (**الحجر**) ئایـەتی (٢٩)دا، خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِى ﴾، واتـە: کاتێـك جەسـتەکەیم ڕێکخسـت و لـە ڕووحـی خـۆم فـووم بـە بـەردا کـرد، واتـە: ئـەو ڕووحـەم بـە بـەردا کـرد کـە وەك فوویـەك چەنـد بـە خێرایـی پەیـدا دەبـێ و ئەنجـام دەدرێ، ئـاوا بـەو شـێوەیە، ئـەو ڕووحـە بـە خێرایـی دەچێتـە نێـو جەسـتەیەوە، نـەك وەك دروسـتکراوە ماددییـەکان، پلـە پلـە دروسـت بـێ.

لـە سـوورەتی (**الفجـر**)دا، خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفْسُ ٱلْمُطْمَئِنَّةُ ﴿٢٧﴾ ٱرْجِعِىٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةً مَّرْضِيَّةً ﴿٢٨﴾ فَٱدْخُلِى فِى عِبَٰدِى ﴿٢٩﴾ وَٱدْخُلِى جَنَّتِى ﴿٣٠﴾ ﴾، واتـە: ئـەی نەفـسی ئارامگرتـوو! بچـۆوە نێـو بەندەکانمـەوە، تـۆ لـە خـوا ڕازیـی و خـواش لـە تـۆ ڕازییـە. بچـۆ نێـو بەندەکانـم و بچـۆ نێـو بەهەشـتەکەمەوە.

٦)- دوا قسە لە بارەی ڕووحەوە کە ئایا ڕووح چییەو چۆنە؟! ئەم قسەیە لە (**الشوكاني**)ەوە دێنین، ئەویش لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1] دەڵێ:

**(وَقَدْ حَكَى بَعْضُ الْمُحَقِّقِينَ: أَنَّ أَقْوَالَ الْمُخْتَلِفِينَ فِي الرُّوحِ بَلَغَتْ إِلَى ثَمَانِيَةَ عَشَرَ وَمِائَةَ (١١٨) قَوْلٍ، فَانْظُرْ إِلَى هَذَا الْفُضُولِ الْفَارِغِ، وَالتَّعَبِ الْعَاطِلِ عَنِ النَّفْعِ، بَعْدَ أَنْ عَلِمُوا أَنَّ اللَّهَ سُبْحَانَهُ قَدِ اسْتَأْثَرَ بِعِلْمِهِ، وَلَمْ يُطْلِعْ عَلَيْهِ أَنْبِيَاءَهُ، وَلاَ أَذِنَ لَهُمْ بِالسُّؤَالِ عَنْهُ، وَلاَ الْبَحْثِ عَنْ حَقِيقَتِهِ، فَضْلاً عَنْ أُمَمِهِمُ المُقْتَدِينَ بِهِم).**

واتـە: هەندێـك لـە لێکۆڵـەرەوان گوتوویانـە: قسـەی ئەوانـە کـە لـە بـارەی ڕووحـەوە، پێکـەوە ناکـۆك بـوون و ڕاجیاییـان هەبووە، ژمارەی قسـەکانیان گەیشـتۆتە (١١٨) قسـە، {واتە: (١١٨) ڕایـان لـە بـارەی ناسـاندنی ڕووحـەوە، خسـتوونە ڕوو، ئنجـا شـەوکانیی دەڵێ:} تەماشـای ئـەو هەمـوو قسـە زیـادە بۆشـانە بکـە و، ئـەو هەمـوو ماندووبوونـە بـێ سـوودە و خاڵیـی لـە سـوودە، بکـە، دوای ئـەوەی کـە زانیویانـە خـوا زانیاریی ڕووحـی، تەنیا لای خـۆی گلداوەتـەوە و، هیچ

---

(١) فتح القدير ج٣، ص٣٠٧.

کام لە پێغەمبەرانیشی لە حەقیقەتی ڕووح ئاگادار نەکردۆتەوە و مۆڵەتیشی پێنەداون کە لە بارەیەوە بپرسن، یاخود لە جەوهەرو حەقیقەتەکەی بکۆڵنەوە، چ جای ئوممەتەکانیان کە شوێن ئەو پێغەمبەرانە (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ والسَّلاَم) دەکەون.

هەڵبەتە ئەوە ڕای (**الشوكاني**)ە لە تەفسیرەکەی خۆی دا [1]، ئەو ڕای وایە کە هیچ بواری تێدا نیە حەقیقەتی ڕووح بزانرێ، بەڵام ڕای دیکە هەیە کە لە بڕگەی سێیەم و کۆتایی ئەم کورتە لێکۆڵینەوەیەدا، دەربارەی ڕووح، دەیخەینە ڕوو.

## بڕگەی سێیەم: ئایا لێکۆڵینەوە لە بارەی ڕووحەوە، ڕێ پێدراوە؟ یان ڕێ لێگیراوە؟

**١)**- بەشێك لە زانایان واتە: کەمینەیەك، وا لەو ئایەتە موبارەکە تێگەیشتوون، واتە: ئایەتی ژمارە (٨٥)ی سوورەتی (الإسراء)، کە دەفەرموێ: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّى وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ﴾.

کە ڕێگرە لە بەردەم لێکۆڵینەوە لە بارەی ڕووحەوە، بۆچی؟ دەڵێن: چونکە خوا فەرموویەتی: ﴿ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّى ﴾، بڵێ: ڕووح لە کاری {یاخود: لە فەرمانی} پەروەردگارمە، واتە: شتێکی تایبەتە بە خواوە ﷻ، ئەوان وای لێ تێگەیشتوون، کەواتە: ئێوە ئومێدی ئەوەتان نەبێ پەی پێ ببەن!

هەروەها دواییش کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ﴾، ئەندازەیەکی کەمیش نەبێ زانیاریتان پێ نەدراوە، دەڵێن: بەو ئەندازە کەمە زانیارییەش، مرۆڤ ناتوانێ دەرکی چییەت و حەقیقەتیی ڕووح بکات، کەمینەیەك ئەوە ڕایانە.

**٢)** - بەڵام ڕای زۆرینە - کە ئەوانیش پێکاویانە بە بۆچوونی من و، ڕای ئەوان ڕای ڕاست و بێ گرێ و گۆڵە - ئەوەیە کە ئەو ئایەتە موبارەکە ئەوە ناگەیەنێ، کە لێکۆڵینەوە، ڕێ لێگیراو بێ لە بارەی ڕووحەوە، بەڵکو تەنیا ئەوە دەگەیەنێ، کە ڕووح لە کارو فەرمانی تایبەتی خوایە، واتە: جیایە لە مادده، جیایە لە جەستە.

دواییش کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ﴾، ئەوەش باسی واقیعی حاڵی مرۆڤ دەکات، کە هەم لە بارەی ڕووحەوە، هەم لە بارەی غەیری ڕووحیشەوە،

---

(١) فتح القدير: ج٣، ص٣٠٧.

مرۆڤ زانیارییەکەی کەمە، لە چاو نهێنییەکانی گەردوون و، لە بەرانبەر زانیاریی بێ سنووری خوادا، زانیاریی مرۆڤ زۆر کەم و گچکەیە، بەڵام مانای وانیە کە بەو زانیارییە کەم و گچکەیە، نەتوانێ هیچ شتێك بزانێ، یا نەتوانێ ماهیەت و چییەتی شتەکان بزانێ، بەڵام دەتوانێ کاڵە[1] ڕووشێنیان بکا و، دەتوانێ سەرەدەرێکیان لێبکا.

ئەوەش کە ڕووح لە کاری تایبەتی خوایە، یاخود لە فەرمانی تایبەتی خوایە، لە سێ ئایەت لە قورئاندا، خوا ﷻ ئەو ڕاستییەی فەرمووە:

**یەکەم:** لە سوورەتی (**الحجر**)، کە دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُواْ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾، (خوا ڕوو بە فریشتەکان دەفەرموێ:) واتە: هەر کاتێ ڕێکم خست، (واتە: جەستەکەیم ڕێکخست) و لە ڕووحی خۆم فووم بە بەردا کرد، {واتە: لەو ڕووحەی کە تایبەتە بە خۆمەوە، واتە: لە جینسی ماددە نیە، ئەو ڕووحەم بەشێوەی فووێك بە بەردا کرد} بۆی بە کڕنووشدا بکەون.

**دووەم:** هەروەها هەمان ئایەت و بە هەمان بێژە لە سوورەتی (**ص**) ئایەتی (٧٢)شدا، هاتوە.

**سێیەم:** هەروەها لە سوورەتی (**السجدة**)شدا هاتوە، بەڵام بەم سیاقە کە دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِىٓ أَحْسَنَ كُلَّ شَىْءٍ خَلَقَهُۥ ۖ وَبَدَأَ خَلْقَ ٱلْإِنسَٰنِ مِن طِينٍ ﴿٧﴾ ثُمَّ جَعَلَ نَسْلَهُۥ مِن سُلَٰلَةٍ مِّن مَّآءٍ مَّهِينٍ ﴿٨﴾ ثُمَّ سَوَّىٰهُ وَنَفَخَ فِيهِ مِن رُّوحِهِۦ ۖ وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ ۚ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴿٩﴾ ﴾.

خوا ﷻ پێناسەی خۆی دەکات دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِىٓ أَحْسَنَ كُلَّ شَىْءٍ خَلَقَهُۥ ﴾، خوا ئەو زاتەیە، ئەو کەسەیە، کە هەر شتێکی دروستی کردوە، بە باشترین شێوە دروستی کردوە و دەستپێکی دروستکردنی مرۆڤیشی لە قوڕەوە بووە {واتە: جەستەکەی لە قوڕ بووە (ئاو + گڵ)}، دوایی وەچەکەی لە پوختەیەك (ڕاپازنەراوێك)، لە ئاوێکی بە کەم دانراو، گێڕاوە، دوایی ڕێکیخستوە، {جەستەکەی ڕێکخستوە و ئامادەی کردوە، بە کەڵکی ئەوە بێ ڕووحی بە بەردا بکرێ} دوایی لە ڕووحی خۆی {دروستکراوی تایبەتیی خۆی} فووی بە بەردا کردوە و بیستن و چاوەکان و عەقڵەکانی بۆ داناون، ئێوە کەمێك نەبێ سوپاسگوزاریی (خوا) ناکەن {یاخود: کەمێکیش سوپاسگوزاریی خوا ناکەن}.

---

(١) کاڵە ڕووشێن: ئەنجامدانی شتێك بە نیوە چڵیی، بەشێوەیەکی سەرکێڵ و لە قەدەرحاڵ.

لێرەدا دوێندراو بە مانای دووەمیان، دەبێ هاوبەش بۆ خوا دانەر و کافرەکان بن، بەڵام بە مانای یەکەم: {کەمێك نەبێ سوپاسگوزاریی خوا ناکەن} مەبەست پێی کۆی مرۆڤەکانە و کەمەکەیان کە سوپاسگوزاریی خوا دەکەن، بڕوادارانن و زۆرینەکەیان کە سوپاسگوزاریی ناکەن، بێبڕوایان و هاوبەش بۆ خوا دانەرانن.

بە پێی زانیاریی من ئەم ئایەتە (**السجدة - ٩ -**)، تاکە شوێنە لە هەموو قورئاندا، خوا ﷻ باسی ئەوە بکات کە دوای ئەوەی جەستەی مرۆڤان بەگشتی ڕێك دەخات و ئامادە و سازیان دەکات، کە بەکەڵکی ئەوە بێن، ڕووحیان بە بەردا بکا، ئنجا ڕووحیان بە بەردا دەکات.

شوێنەکانی دیکە، تەنیا باسی دروستکردنی ئادەمن، کە باسی ڕێکخستنی جەستەکەی و ڕووح بە بەردا کردنی دەکەن، بەڵام ئێرە تاکە شوێنێکە باسی ئەوە بکات، چۆن خوا ﷻ جەستەی مرۆڤاتی بەگشتی لە پوختەیەکی قوڕێ ڕێکخستوە و، دواییش لەو ڕووحە کە دروستکراوی تایبەتی خۆیەتی، فووی بە بەردا کردوون.

## بڕگەی چوارەم: بەڵگەكانی ڕەوایی لێكۆڵینەوە لە بارەی ڕووحەوە:

لە تەفسیرەكاندا نەمبینیوە، بەڵگە لەو بارەوە بهێنرێتەوە، ڕەنگە هەشبێ و من نەمبینی بێ، لەو تەفسیرانەدا كە پەرژاومە تەماشایان بكەم و سەرەنجیان بدەم، نەمبینی.

ئنجا ئێمە چوار بەڵگان لەوبارەوە، وەك نموونە دێنینەوە:

دەگونجێ ئەو ئایەتانە، لەو بارەوە بە بەڵگە بهێنرێنەوە، كە سەرەنجدانی ڕووح و تێوەڕامانی و لێكۆڵینەوە لە بارەیەوە، شتێكی - بەلای كەمەوە - ڕێپێدراوە، ئەگەر فەرمان پێكراویش نەبێ:

١)- لە سوورەتی (**الذاريات**)دا، كە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَفِي ٱلۡأَرۡضِ ءَايَٰتٞ لِّلۡمُوقِنِينَ ۝٢٠ وَفِيٓ أَنفُسِكُمۡۚ أَفَلَا تُبۡصِرُونَ ۝٢١ ﴾، هەروەها لە زەویی دا نیشانە هەن، بۆ بڕوا پتەوان {یاخود: بۆ زانیاریی تەواوان، (**موقنين**) كۆی (**مُوقِن**)ە، كەسێك زانیارییەكی هەیە، لە عەقڵ و دڵیی دا چەسپاوە، لەرەلەری تێدا نیە و گومان و دوو دڵیی نەماوە، دەشگونجێ مەبەست ئیمانێكی بەو شێوەیە بێ، گرنگ ئەوەیە خوا دەفەرموێ: لە زەویی دا نیشانە هەن، بۆ ئەوانەی ئەهلی یەقینن} ﴿ وَفِيٓ أَنفُسِكُمۡۚ أَفَلَا تُبۡصِرُونَ ﴾، هەروەها لە خودی خۆشتان دا ئایا نابینن؟

ئنجا كە بە تەئكید (ئایا نابینن؟)، مەبەست پێی بینینی، عەقڵ و دڵ، واتە: ئایا سەرەنج نادەن و تێوەڕانامێنن؟ یانی: وەك چۆن پێویستە لە نیشانەكانی پەروەردیگارێتیی خوا، لە زەویی دا، ڕامێنین و، سەرنجیان لێ بدەین و، لێیان بكۆڵینەوە، بە هەمان شێوەش خوا فەرمانمان پێ دەكات، بە پرسیاركردنی نكوولیلێكەرانە، یاخود سەرزەنشتكەرانە و دەفەرموێ: هەروەها لە خۆشتاندا نیشانە هەن، بۆچی سەرنج نادەن و ڕانامێنن؟ بۆچی لێ ناكۆڵنەوە؟ ئاشكراشە: ﴿ وَفِيٓ أَنفُسِكُمۡۚ ﴾، لە خۆتاندا، هەم جەستە دەگرێتەوە، هەم ڕووحییش دەگرێتەوە، چونكە خودی ئێمە هەردووك پێكهاتە سەرەكییەكەمان دەگرێتەوە، كە جەستەیەكی خاكییە، لەگەڵ ڕووحێكی خوایی، بەو واتایە كە خوا ﷻ ڕووحی بە شێوەی تایبەت دروستكردوە.

٢)- لە سوورەتی (**فصلت**)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ سَنُرِيهِمۡ ءَايَٰتِنَا فِي ٱلۡأٓفَاقِ وَفِيٓ أَنفُسِهِمۡ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمۡ أَنَّهُ ٱلۡحَقُّۗ أَوَلَمۡ يَكۡفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٌ ۝٥٣ ﴾، واتە: لەمەو

دوا نیشانەکانی خۆمانیان لە ئاسۆیەکان و، لە خودی خۆشیاندا پێشان دەدەین، هەتا بۆیان دەرکەوێ کە هەقە، {خوا هەقە، یان قورئان هەقە} ئایا بەس نیە بۆ خوا کە چاودێر و ئاگادارە بەسەر هەموو شتێکەوە؟

**٣)**- لە سووڕەتی (**الطارق**)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ فَلْيَنظُرِ ٱلْإِنسَٰنُ مِمَّ خُلِقَ ﴿٥﴾ خُلِقَ مِن مَّآءٍ دَافِقٍ ﴿٦﴾ يَخْرُجُ مِنۢ بَيْنِ ٱلصُّلْبِ وَٱلتَّرَآئِبِ ﴿٧﴾ ﴾، واتە: با ئینسان سەرنج بدات، لە چی دروستکراوە! لە ئاوێکی دەرقوڵیو دروستکراوە، کە لە نێوان (ئێسقانی) پشت و سینگ دێتە دەرێ.

کە دەفەرموێ: ﴿ فَلْيَنظُرِ ٱلْإِنسَٰنُ مِمَّ خُلِقَ ﴾، با ئینسان سەرنج بدات، لەچی دروستکراوە؟ دوایی کە دەفەرموێ: ﴿ خُلِقَ مِن مَّآءٍ دَافِقٍ ﴾، لە ئاوێکی دەرقوڵاو، کە بە تەکان دێتە دەرێ، مەبەست پێی ئاوی پیاوو ئافرەتە، کاتێ ژن و مێرد پێکەوە جووت دەبن، ئنجا هەر چەندە لێرە تەنیا باسی جەستەیە، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە مرۆڤ بیر لە ڕووحیشی نەکاتەوە.

**٤)**- لە سووڕەتی (الأعراف)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ أَوَلَمْ يَنظُرُوا۟ فِى مَلَكُوتِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا خَلَقَ ٱللَّهُ مِن شَىْءٍ وَأَنْ عَسَىٰٓ أَن يَكُونَ قَدِ ٱقْتَرَبَ أَجَلُهُمْ ۖ فَبِأَىِّ حَدِيثٍۭ بَعْدَهُۥ يُؤْمِنُونَ ﴿١٨٥﴾ ﴾الأعراف، واتە: ئایا سەرنجیان نەداوەتە موڵکی فراوانی ئاسمانەکان و زەوی و، هەر شتێك کە خوا دروستی کردوە؟... ئنجا لە نێو ئەو شتانەدا کە خوا دروستیکردوون، خودی مرۆڤە، کە لە جەستەیەکی خاکیی بەرهەست و، لە ڕووحێکی خوایی، نابەرهەست، دروستکراوە.

کەواتە: خوا ﷻ بە سەرزەنشتکردن و نکووڵییلێکردنەوە دەفەرموێ: بۆچی سەرنجیان نەداوەتە موڵکی ئاسمانەکان و زەوی و هەر شتێك کە خوا دروستیکردوە؟ ئەو ئایەتە موبارەکانە بە لای کەمەوە ڕێ پێدان دەگەیەنن، بەوە کە مرۆڤ لە بارەی ڕووحەوە بکۆڵێتەوە، بەڵکو دەتوانین بڵێین: پێویست بوونیش دەگەیەنن.

## بڕگەی پێنجەم : پێنج هەڵوەستەی ڕۆشنکەرەوە لەبارەی ڕووحەوە:

### یەك: چۆنیەتی دروستکرانی ڕووح؟

زانایـان لـەو بـارەوە زۆر قسـەیان کـردوە، بـەڵام هـەر بـە کـورتی دەڵێـم: وا پێدەچـێ چۆنیـەتی دروسـتکرانی ڕووح، لـە چۆنیـەتی دروسـتکرانی جەسـتە، کـە پلـە پلـە دروسـت دەبـێ، جیابـێ و، ڕووح، خـوا یەکسـەر دروسـتیکردبێ، ئایـا بەڵگەمـان لـەو بـارەوە چییـە؟ بەڵگەمـان لـەو بارەیـەوە ئـەو ڕسـتەیە قورئانییەیـە کـە لـە هـەرکام لـە سـوورەتەکانی: ١ - (**الحجـر**) و، ٢ - (ص) و، ٣ - (**السجدة**)شـدا هاتـوە، لـە سـوورەتی (ص) و (**الحجـر**)دا، دەفەرمـوێ: ﴿ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُوا۟ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾، ئنجـا هـەرکات ڕێکـم خسـت (جەسـتەکەی) و لـە ڕووحـی خـۆم فـووم بەبـەردا کـرد.

بـەڵام لـە سـوورەتی (**السـجدة**)دا دەفەرمـوێ: ﴿ وَنَفَخَ فِيهِ مِن رُّوحِهِۦ ﴾ لـە ڕووحـی خـۆی فـووی بەبـەردا کـرد، هەڵبەتـە: فـوو کردنـە شـتێك، یان فـوو کردنـە نێو شـتێك، زۆر خێرایـە، ئنجا ئـەم تەعبیـرە موبارەکـەی قورئـان، ئـەوەی لـێ دەفامرێتـەوە: کـە ڕووح ڕاسـتەوخۆ و یەکسـەر دروسـت ببـێ، نـەك وەك شـتێکی ماددیـی پلـە پلـە دروسـت بـێ، بـۆ وێنـە: جەسـتەی مـرۆڤ لـە منداڵـدانی دایکـی دا: پێشـێ (**نُطفة**)یـە، دوایـی دەبێتـە (**علقـة**)، دوایـی دەبێتـە (**مُضغـة**) و.... قۆناغـەکانی دیکـە، وەك خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن سُلَٰلَةٍ مِّن طِينٍ ﴿١٢﴾ ثُمَّ جَعَلْنَٰهُ نُطْفَةً فِى قَرَارٍ مَّكِينٍ ﴿١٣﴾ ثُمَّ خَلَقْنَا ٱلنُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا ٱلْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا ٱلْمُضْغَةَ عِظَٰمًا فَكَسَوْنَا ٱلْعِظَٰمَ لَحْمًا ثُمَّ أَنشَأْنَٰهُ خَلْقًا ءَاخَرَ ۚ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحْسَنُ ٱلْخَٰلِقِينَ ﴿١٤﴾ ﴾المؤمنـون.

واتـە: بـە دڵنیاییـەوە ئێمـە مرۆڤـمان لـە پوختەیـەك لـە قـوڕێ دروسـتکردوە، (پوختەیـەکی وەرگیـراو لـە قـوڕ)، دوایـی ئـەو پوختەیـەی کـە لـە قـوڕ وەرمانگرتـوە، کردمـان بـە نوطفـە، لە نشـینگەیەکی سـەقامگیردا {کـە مەبەسـت پێـی منداڵـدانی دایکـە}، دوایـی ئـەو نوطفەیەمـان کـردە خوێنپـارە (**علقـة**)، دوایـی ئـەو خوێنپارەیەمـان کـردە زارجـوو (**مُضغَـة**)، {پارچـە گۆشـتێك بـە قـەدەر زارجووێـك} دوایـی ئـەو پارچـە گۆشـتە کـە هێنـدەی زارجووێکـە، گێڕامـان بـە ئێسـقان، دوایـی ئێسقانەکانیشـمان بـە گۆشـت داپـۆشی، دوایـی کردمانـە دروسـتکراوێکی دیکـە، [کـە ئەمـە دوای چـوار مانـگ و دە شـەوەو، بـە ڕای زۆربـەی زانایـان مەبەسـت پێـی

ڕووح بە بەردا کردنیەتی، بۆیە دەفەرموێ: ﴿خَلْقًا ءَاخَرَ﴾، پێشێ تاکو لە حاڵەتەکانی: (**نُطفَة**)و (**عَلَقَة**) و (**مُضغَة**) و (**عظام**) و... هتد دابووە، بەر لەوەی ڕووحی بە بەردا بکرێ، جۆرە دروستکراوێکی دیکە بووە: زیندوو (**حي**) بووە، بەڵام ڕووحی لەبەردا نەبوە، ژیانی لەبەردا بووە، بەڵام ڕووحی بە بەردا نەکراوە، بەڵام دوایی کە دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ أَنشَأْنَٰهُ خَلْقًا ءَاخَرَ﴾، لە دوای چوار مانگ و دە شەو، دوای ئەوەی لە ڕووە جەستەییەکەوە، ڕێك و پێك و تەواو دەبێ و بە کەڵکی ئەوە دێ، کە ڕووحی بە بەردا بکرێ، خوا ڕووحی بە بەردا دەکات، کە خوا دەفەرموێ: بە شێوەی دروستکراوێکی دیکە دروستمان کرد] ﴿فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحْسَنُ ٱلْخَٰلِقِينَ﴾، بەرزیی و پێز بۆ خوای باشترینی بەدیهێنەران.

ئەمەش وەك گوتمان: ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە ڕووح دەبێ ڕاستەوخۆ دروست بووبێ، بە بێ ئەوەی کاتی پێ چووبێ و بە پلە پلە دروست نەبووبێ، وەك جەستە.

## دوو: کاتی دروستکرانی ڕووح:

ئەوەش دیسان تەنیا خوای پەنهانزان و بەدیهێنەر و پەروەردگار دەیزانێ، بەڵام لەو بارەوە زانایان دوو ڕایان هەن:

أ - هەندێکیان دەڵێن: ڕووح پێشتر، واتە: بەر لەوەی جەستە کە بخوڵقێ، بە شێوەی (**نُطفَة**) و (**عَلَقَة**) و (**مُضغَة**)، لە منداڵدانی دایك دا، ڕووحەکە پێشتر هەر بووە.

ب - هەندێکیش دەڵێن: کاتێ ئەو جەستەیە دەگاتە ئەو حاڵەتەی، بە کەڵك بێ ڕووحی بە بەردا بکرێ، واتە: دوای چوار مانگ و دە شەو، لەو کاتەدا خوا ڕووحەکەی دەهێنێتە دی.

بەڵام پێم وایە هیچ کام لەو دوو ڕایە، بەڵگەیەکی وایان بە دەستەوە نیە، کە جێی دڵنیایی بێ و لێی مسۆگەرو پێی پشت ئەستوور بین.

لێرەدا بە پێویستی دەزانم: ئاماژە بکەم بە هەڵەیەکی زەقی زانای ناودار (**محمد الطاهر بن عاشور**)، کە لە تەفسیرەکەی خۆی دا[1]، گوتوویەتی: (**فَقِيلَ: الْأَرْوَاحُ مَخْلُوقَةٌ قَبْلَ خَلْقِ الْأَبْدَانِ الَّتِي تُنْفَخُ فِيهَا، وَهُوَ الْأَصَحُّ الْجَارِي عَلَى ظَوَاهِرِ كَلَامِ النَّبِيِّ ﷺ فَهِيَ مَوْجُودَةٌ مِنَ الْأَزَلِ كَوُجُودِ الْمَلَائِكَةِ وَالشَّيَاطِينِ**).

---

(١) التحرير والتنوير: ج١٥، ص٢٠٠.

لەوبارەوە کە ئایا ڕووحەکان کەی دروست بوون؟ ڕایەك دێنێ کە دەڵێ: لە کاتی دروست بوونی جەستەدا، هەر ڕووحە، خوا دروستی دەکات و بە بەر جەستەکەیدا دەکات، بە بەر ئەو کۆرپەلەیەی کە لە منداڵدانی دایکی دا، گەیشتۆتە قۆناغێکی دیارییکراو، دوایی دەڵێ:

{گوتراویشە: ڕووحەکان پێش هێنانە دی جەستەکان، دروستکراون {واتە: پێش هێنانەدی ئەو جەستانەی کە ڕووحەکانیان بەبەردا دەکرێن} هەر ئەو قسەیەش ڕاسترە و ئەو قسەیەش بە پێی ڕواڵەتی فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ ڕێك دێتەوە، کە ڕووحەکان لە ئەزەلەوە، {واتە: بە بێ دەستپێکردن، هەر بوو ون} وەك بوونی فریشتەکان و شەیتانەکان!!

ئنجا وشەی ئەزەل، یانی: هەر بوو و بێ سەرەتا، کە بە تەئکید ئەوە هەڵەیەکی زەقە، ئەو زانا بەرزە تێی کەوتوە، چونکە نە ڕووحەکان ئەزەلیین و نە فریشتەو شەیتانەکانیش ئەزەلیین، کە ئەو ڕووحەکان، دەشوبهێنێ بە فریشتەو شەیتانەکانەوە و دەڵێ: وەك چۆن فریشتەو شەیتانەکان هەربوو و ئەزەلیین، یانی: بێ سەرەتان، ڕووحەکانیش هەر وان!! بەڵام لە ڕاستیی دا، جگە لە خوا ﷻ هیچ کام لە دروستکراوانی خوا ئەزەلیی و بێ سەرەتا نین، بەڵکو هەموویان سەرەتایەکیان هەیە و لە کاتێکی دیارییکراودا کە خوا ویستوویەتی، دروستی کردوون، ئنجا ئایا ڕووح لەو کاتەدا کە جەستەکە تەواو دەبێ، لە منداڵدانی دایکی دا، خوا ڕووحەکەی بۆ دێنێتە دی، یاخود پێشتر هێناویەتەدی؟ گرنگ ئەوەیە ڕووح دروستکراوێکی خوایە و هێنراوەتە دی، هەروەها فریشتەکان و شەیتانەکانیش دروستکراوانی خوان و، خوای پەروەردگار هێناونیە دی، لە کاتێکدا کە بۆ خۆی دەزانێ، بەڵام بە تەئکید جگە لە خوا، هیچ شتێك بوونەکەی بێ سەرەتا نیە، هەمووی سەرەتایەکی هەبووە، لێیەوە دەستپێکردوە، چونکە خوا تەنیا خۆی بە یەکەمین (**أول**) ناو دەبا: ﴿ هُوَ ٱلْأَوَّلُ وَٱلْآخِرُ ﴿٣﴾ ﴾الحديد، واتە: هەر خوا یەکەمین و دوایەمینە.

ئەگەر یەکێك بپرسێ: ئەدی چۆن هەم ئەهلی ئیمان لە بەهەشتی خوادا بە هەمیشەیی دەمێننەوەو، ئەبەدیی دەبن و، هەم ئەهلی کوفریش لە دۆزەخ دا ئەبەدیی و هەرماو دەبن؟ دەڵێین: ئەوە ڕاستە و خوای پەروەردگار لە چەندان ئایەتاندا وایفەرمووە، بەڵام ئەو کاتە: هەم ئەهلی ئیمان لە بەهەشتدا و، هەم ئەهلی کوفر لە دۆزەخدا، کە هەرماو (**أبدي**) دەبن، بە هێشتنەوەی خوا، هەر ماو دەبن، هەروەك چۆن کە دروستیشکراون، بە دەستەڵات و ویستی بێ سنووری خوا دروستکراون، کەواتە: لە دواڕۆژدا بوونەکەیان بەردەوام دەبێ، بەڵام بەهۆی ئەوەوە کە خوا دەیانهێڵێتەوە.

کەواتــە: مانەوەکەیــان (هەرمــاو بوونەکەیــان)، شــتێکی زاتیــی نیــە و بوونێــکی خــوازرا و (**مســتعار**)ە.

## سێ: تێکڕای زانایان لەسەر ئەوە یەك دەنگن، کە ڕووحەکان پاش لە بەین چوونی جەستەکان، دەمێنن و لە بەین ناچن:

هەمــوو زانایــان لەســەر ئــەوە یــەك دەنگــن، هەڵبەتــە هەندێــك لــە موعتەزیلــەکان گوتوویانــە: دوای ئــەوەی جەســتەکان لــە بەیــن دەچــن، ڕووحەکانیــش لــە بەیــن دەچــن، بــەڵام ئــەوە ڕایــەکی بــێ هێــزە و هیــچ بەڵگەیــەکی لەســەر نیــە، بەڵکــو ئایەتــەکان زۆر بــە ڕوونیــی ئــەوە دەگەیەنــن، کــە ڕووحــەکان دەمێننــەوە، بــۆ وێنــە: ئــەو ئایەتــەی لــە ســوورەتی (**الأنعام**) دایــە، کــە خــوا ﷻ بــاسی حاڵــەتی گیانــەڵای کافــرەکان دەکات، دەفەرمــوێ: ﴿...وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّٰلِمُونَ فِى غَمَرَٰتِ ٱلْمَوْتِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ بَاسِطُوٓا۟ أَيْدِيهِمْ أَخْرِجُوٓا۟ أَنفُسَكُمُ ٱلْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ ٱلْهُونِ بِمَا كُنتُمْ تَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ غَيْرَ ٱلْحَقِّ وَكُنتُمْ عَنْ ءَايَٰتِهِۦ تَسْتَكْبِرُونَ ﴿٩٣﴾﴾.

واتــە: ئەگــەر تــۆ ببینــی کاتــێ ستەمکارەکان لــە بــێ هۆشییەکانی مەرگدان و فریشــتەکان دەســتیان درێــژ کــردوە، پێیــان دەڵێــن: ڕووحەکانتــان (نەفســەکانتان) دەرێنــن، ئەمــڕۆ ســزای ڕیســوایی دەچێــژن، بــە هــۆی ئــەوەوە کەشــتی ناهەقتــان بــۆ خــوا هەڵدەبەســت و، بەهــۆی ئەوەشــەوە کــە خۆتــان لــە بەرامبــەر ئایەتــەکانی خــوادا، بــە زلدەگــرت.

کەواتە: ڕووح دوای جیابوونەوەی لە جەستە، دەمێنێ و، ئەمەش ڕای زۆربەی زانایانە.

شــایانی باسیشــە: ڕووح و نەفــس: هەردووکیــان تەعبیریــان پــێ دەکــرێ لــە جەوهــەری مــرۆڤ و، دیــوی مەعنەویــی و پەنهــانی، جیاوازیــی نەفــس و ڕووحیــش ئەوەیــە، کــە ڕووح وەك خــودی خــۆی، واتــە: ئــەو دیــوی مەعنەویــی و جەوهــەری مــرۆڤ، پێــی دەگوتــرێ: ڕووح، بــەڵام وەك ئاوێتــە لەگــەڵ جەســتەدا، پێــی دەگوتــرێ: نەفــس، هــەر بۆیــەش هەرچــی مــەدح و زەممــە، ئاڕاســتەی نەفــس کــراوە لــە قورئــان دا، بــەڵام ڕووح نــە زەممــی ئاڕاســتە کــراوە و نــە مــەدح، چونکــە: ڕووح هەتــا نەچێتــە نێــو جەســتەوە، نــە چاکــەی لــە دەســت دێ، تاکــو ســتایش و مــەدح بکــرێ و، نــە خراپــەی لــە دەســت دێ، تاکــو سەرزەنشــت و زەم بکــرێ، بــەڵام دوای ئــەوەی کــە دەچێتــە نێــو جەســتەوە، خێــر و شــەڕی لــە دەســت دێ، باســەرنج بدەیــن:

١ - لە سوورەتی (**یوسف**)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلنَّفْسَ لَأَمَّارَةٌۢ بِٱلسُّوٓءِ ﴿٥٣﴾﴾، واتە: بە دڵنیایی نەفس زۆر فەرمان بە خراپە دەکات.

٢ - لە سوورەتی (القيامة)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَآ أُقْسِمُ بِٱلنَّفْسِ ٱللَّوَّامَةِ ﴿٢﴾ ﴾، واتە: نەخێر {ڕاست ناکەن} سوێند دەخۆم بە نەفسێك کە زۆر ڕەخنە دەگرێ، واتە: ڕەخنە لە خاوەنەکەی دەگرێ.

٣ - لە سوورەتی (الفجر)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفْسُ ٱلْمُطْمَئِنَّةُ ﴿٢٧﴾ ٱرْجِعِىٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةً مَّرْضِيَّةً ﴿٢٨﴾ ﴾، واتە: ئەی ئەو نەفسەی ئارامت گرتوە! {سەقامگیر بووی لەسەر جادەی شەرع} بگەڕێوە بۆ لای پەروەردگارت، تۆش لەو ڕازیی و ئەویش لە تۆ ڕازییە.

بەڵێ جیاوازیی بەینی نەفس و ڕووح، هەر ئەوەیە کە: ڕووح پێش ئەوەی بچێتە نێو جەستەوە، پێی دەگوترێ: ڕووح و، دوایی کە لە جەستەش دێتە دەرێ، پێی دەگوترێ: ڕووح، بەڵام هەتا لە نێو جەستە دایە، پێی دەگوترێ: نەفس، بۆیەش لە ئایەتەکەی سوورەتی (الأنعام)دا کە خوێندمانەوە، هاتوە: ﴿ أَخْرِجُوٓاْ أَنفُسَكُمُ ﴾، نەفسەکانتان بێننە دەرێ، نەیفەرموە: (أَرْوَاحَكُم)، چونکە ڕووح هەتا لە نێو جەستە دایە، پێی دەگوترێ: نەفس، هەتا لەگەڵ جەستەدا ئاوێتە بێ، کە لێی هاتە دەر، ئنجا پێی دەگوترێ: ڕووح، وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە فەرموویەتی: {إِنَّ الرُّوحَ إِذَا قُبِضَ تَبِعَهُ الْبَصَرُ} (**أخرجه أحمد: ٢٦٥٨٥، ومسلم: ٩٢٠**)، واتە: هەر کاتێ ڕووح کێشرا، چاو دوای دەکەوێ.

یانی: چاو کە ئەبڵەق دەبێ، بابای مردوو چاوی ئەبڵەق دەبێ، ئەوە سەرنج دەداتە ڕووحەکەی، وەك دەبینین: کاتێ ڕووح لە جەستە دێتە دەر، پێی دەگوترێ: ڕووح و، پێش ئەوەی بە نێو جەستەشدا بکرێ، هەر پێی دەگوترێ: ڕووح.

ئنجا دوو وشەی دیکەش هەن: (**عقل**) و (**قلب**)، ئەوانیش پەیوەندییان بە ڕووحەوە هەیە، یەکەمیان: (عەقڵ)، کە بە شێوەی ناو (**اسم**) لە قورئاندا نەهاتوە، بەڵام بە شێوەی کردار هاتوە: (**عَقَلُوهُ، يَعقِلُون، تَعقِلُون**)، حیکمەتەکەشی ئەوەیە کە عەقڵ ئەگەر بەکارنەهێنرێ، ئینسان شتی پێ نەفامێ و بەکاری نەهێنێ، بیری پێ نەکاتەوە، مانای وایە بوون و نەبوونی وەك یەکە، کەواتە: عەقڵ بریتییە لە تەعبیر کردن لە ڕووح، بەو ئیعتیبارەی کە شت دەزانێ.

(**قلب**)یش بریتییە لە تەعبیر کردن لە ڕووح، لەو ڕووەوە کە شتی پێ دەوێ، یاخود پێ ڕەفز دەکات، شتی پێ خۆش دەوێ، یاخود دەبوغزێنێ، شتی پێ قبووڵ دەکات، یاخود ڕەت دەکاتەوە، واتە: وشەی (**قَلْب**)، تەعبیر دەکات لە ڕووح، لە ڕووە ئیرادەییەکەیەوە و، (**عقل**) تەعبیر دەکا لە ڕووح لە ڕووە دەرککردن و شت زانینەکەیەوە، هەروەها نەفس تەعبیر دەکات لە ڕووح، لەو ڕووەوە، کە لە نێو جەستە دایە و لەگەڵی ئاوێتەیە، بەڵام ڕووح، ناوە بۆ حەقیقەت و خودی خۆی، بێ ئەوەی ئەوەی تێدا ڕەچاو بکرێ، کە لە نێو جەستە دایە، یاخود شت دەزانێ، یاخود شت قبووڵ دەکات، یاخود ڕەفز دەکات!

## چوار: قسەکردن و لێکۆلینەوەی زۆری زانایان دەربارەی ڕووح:

زانایـانی ئیسـلام زۆر قسـەیان لـە بـارەی ڕووحـەوە کـردوە، کـە ئەمـەش هـەر بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوە، کـە دروسـتە ئێمـە لـە ڕووح بکۆڵینـەوە، بـە تایبـەت ئەهـلی تەزکیـە، کـە بـە (ئەهـلی تەصەووف)یـش، ناوبـراون، بـۆ نموونـە: (إبـنُ القَيِّـم)، (ڕەحمـەتی خـوای لـێ بـێ)، کتێبێکـی هەیـە، هـەر بـە نـاوی (الـروح)، زۆر بـە درێژیـی لـە بـارەی ڕووحـەوە دواوە، لـە بـارەی سـیفەتەکانی ڕووحـەوە و، لـە بـارەی ئـەوەوە، کـە سـزای دوای مـەرگ چۆنـە و، نیعمەتی دوای مـەرگ چۆنـە؟ هەروەهـا لـە حاڵـەتی نووسـتن و خـەون دا، ڕووح چـۆن دەسـتی کـراوە دەبـێ؟ ئنجـا لـە قۆناغـی بـەرزەخ دا، پەیوەندیـی ڕووح لەگـەڵ جەسـتەدا چۆنـە؟ لـەو بـارەوە، زۆر بـە تەفصیـڵ قسـەی کـردوە، هەروەهـا زانایـانی تەصـەووف و زانسـتی تەزکیـە بـە تەفصیـڵ لـە بـارەی ڕووحـەوە، دواون.

## پێنج: دەگونجێ لە ئەنجامی بەرەوپێشچوونی زیاتری زانستدا، زیاتر بە ڕووح ئاشنابین:

لـە کۆتایـی دا دەڵێیـن: دەگونجـێ بـە هـۆی بـەرەو پێـش چـوونی زانسـتەوە، زۆر لـە نهێنییـەکانی ڕووح ئاشـکرا بـبن، وەك خـوا فەرموویـەتی: ﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ۗ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿٥٣﴾ ﴾ فصلـت، ئـەم ئایەتـە بەپێـزە بـە ڕوونیـی ئامـاژەی بـەو بابەتـەداوە، چونکـە وشـەی (س)، (سـوف) کـە دەچنـە سـەر کـرداری (المضـارع)، بەزۆریـی داهاتـوو دەگەیەنـن، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا ﴾، یـانی: لەمـەو دوا، نیشـانەکانی خۆمانیـان پێشـان دەدەین، لـە ئاسـۆیەکان و لـە خـودی خۆشـیاندا، تاکـو بۆیـان دەربکـەوێ کـە هەقـە، خـوا ﷻ هەقـە، {یـان: قورئـان هەقـە، یـان پێغەمبـەر ﷺ هەقـە و ئـەوەی کـە لـە خـواوە هێناویـەتی ڕاسـتە} کەواتـە: بـە نسـبەت کاتی خـۆی، (سـنريهم) دوای ئـەوانی گەیانـدوە، لەمـەو دوا پێشـانیان دەدەیـن و، بـە نسـبەت ئێسـتای ئێمەشـەوە، دوای ئێمـە دەگەیەنـێ، ئنجـا ئەمـە بـە ڕوونیـی لیـی وەردەگیـرێ، کـە بـەردەوام زانسـت بـەرەو پێشـەوە دەچـێ و بـەردەوام خـوا ﷻ مـرۆڤ شـارەزاتر دەکات و ئاگادارتـری دەکاتـەوە لـە نهێنییـەکانی گـەردوون و خۆیـشی: ﴿ ٱلْءَافَاقِ ﴾، ئاسـۆیەکان، ﴿ أَنفُسِهِمْ ﴾، لـە خـودی خۆشـیان (خـودی خۆشـیان)یش هـەم جەسـتە دەگرێتـەوە و هـەم ڕووح دەگرێتـەوە.

## مەسەلەی پێنجەم:

**خوا فەرموویەتی: ئەگەر ویستباشمان ئەوەی بۆ لای تۆمان سروش کردوە، لە عەقڵ و دڵت دا لامان دەبرد، دەمانسڕیەوە، پاشان هیچ بریکار و هاوکارت لە بەرانبەرمان دا {بۆ پاراستن و هێشتنەوەی قورئان، لە عەقڵ و دڵتدا} چنگ نەدەکەوت، بەڵام لە سۆنگەی بەزەییەکی تایبەتەوە، لە پەروەردگارتەوە، ئەوە ناکەین و، بە دڵنیایی پەروەردگارت بەخشش و چاکەیەکی گەورەی لەسەرتە:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿ وَلَئِن شِئْنَا لَنَذْهَبَنَّ بِٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ ثُمَّ لَا تَجِدُ لَكَ بِهِۦ عَلَيْنَا وَكِيلًا ﴿٨٦﴾ إِلَّا رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ ۚ إِنَّ فَضْلَهُۥ كَانَ عَلَيْكَ كَبِيرًا ﴿٨٧﴾ ﴾

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿ وَلَئِن شِئْنَا لَنَذْهَبَنَّ بِٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ ﴾، بە دڵنیایی ئەگەر ویستبامان، ئەوەی بۆ تۆمان سروش کردوە، لامان دەبرد، واتە: لە عەقڵ و دڵتدا نەمان دەهێشت.

**(اللاَّمُ فِي (لئِن) مُوَطِّئَةٌ لِلقَسَمِ، وَ ﴿ لَنَذْهَبَنَّ ﴾، جَوَابُ القَسَم).**

کە دەفەرمووێ: ﴿ وَلَئِن شِئْنَا ﴾، ئەو (ل)ە، زەمینە خۆشکەرە بۆ سوێند خواردن، ﴿ وَلَئِن شِئْنَا ﴾، واتە: بە جەختکردنەوە، ئەگەر ویستبامان {ئەوەی بۆ تۆمان سروش کردوە، لایبەرین} ﴿ لَنَذْهَبَنَّ ﴾، بە تەئکید لامان دەبرد، ﴿ بِٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ ﴾، ئەوەی کە بۆ تۆمان سروش کردوە، واتە: لە عەقڵ و دڵت دا نەماندەهێشت.

٢)- ﴿ ثُمَّ لَا تَجِدُ لَكَ بِهِۦ عَلَيْنَا وَكِيلًا ﴾، دوایی تۆ بۆ هێشتنەوەی قورئان، یان پارێزگاریی لێکردنی لە عەقڵ و دڵتدا، لە بەرانبەر ئێمەدا، هیچ بریکارو ئۆباڵدارو، سەرپەرشتیارێکت، دەست نەدەکەوت.

**(ثُمَّ: لِلترتِيبِ الرُّتبِيِّ، لأَنَّ نَفيَ الطَّمَعِ فِي استرجَاعِ المَسلُوبِ أَشَدُّ عَلَى النَّفس مِن سَلْبِه)،** دەفەرمووێ: ﴿ ثُمَّ لَا تَجِدُ لَكَ بِهِۦ عَلَيْنَا وَكِيلًا ﴾، ئەم ﴿ ثُمَّ ﴾، بۆ ڕیزبەندیی پلە پلەییە، چونکە ئومێد نەبوون بە گێڕانەوەی شتێك کە لێت ستێنراوە، لەسەر دڵت قورسترە لە خودی لابردنی ئەو شتەو لێستێنرانی، واتە: شتێکت کە لێ دەستێنرێ،

ناخۆشە، بەڵام ئەگەر ئومێدت نەبێ، کە دەتوانی بیگێڕیەوە، یان بۆت بگێرنەوە، ئەوە لەسەر دڵ قورسترە، بۆیە خوا ﷻ وشەی: ﴿ثُمَّ﴾ی بەکارهێناوە، چونکە ﴿ثُمَّ﴾، جاری وا هەیە تەنیا بۆ بادانەوەو گێڕانەوە (**عطف**)ی شتێکە بۆ سەر شتێ، بەڵام لێرەدا بۆ گێڕانەوەشەو بۆ پلە بەندییشە.

٣)- ﴿إِلَّا رَحۡمَةٗ مِّن رَّبِّكَ﴾، دیارە: ﴿إِلَّا﴾، ئامرازی هەڵاواردن، (أَدَاة **الإستثناء**)ە، بەڵام لێرەدا بە مانای (**لكِنَّ**)، واتە: بەڵام، بەڵام بەزەییەك لە پەروەردگارتەوە، ڕێگرمان بوو کە ئەوەت لەگەڵ بکەین، کە ئەوەی بۆمان سروش کردووی، لە عەقڵ و دڵت دا لایبەرین و بیسڕینەوەو نەیهێڵین، یاخود بەزەییەك لە پەروەردگارتەوە وایکرد: ئێمە ئەوەی کە لە عەقڵ و دڵتدایە، بیپارێزین نەهێڵین لابچێ.

دەڵێ: (**مَعنى (لكِنَّ): لِلإستِدرَاك، فالإستِثنَاءُ مُنقَطِعٌ بِمَعنَى الإستِدرَاك**)، هەڵاواردنەکە لێرەدا بە هەڵاواردنی پچڕێندراو لە قەڵەم دەدرێ و، بە مانای (بەڵام)ە.

(**لكِنَّ رَحمَةً مِن رَبِكَ، نَفَتْ مَشِيئَةَ الذَّهابِ بِالَّذي أَوحَينَا إِلَيكَ فَهُوَ بَاقٍ غَيرُ مَذهُوبٍ بِه**)، واتە: بەڵام بەزەییەك لە پەروەردگارتەوە، ویستی نەهێشتنی ئەوەی کە بۆ تۆمان سروش کردوە، ئەو ویستەی لابرد، بۆیە ئەوەی کە بۆمان سروش کردووی، دەمێنێتەوەو لانابردرێ.

٤)- ﴿إِنَّ فَضۡلَهُۥ كَانَ عَلَيۡكَ كَبِيرٗا﴾، بە دڵنیایی بەخششی وی، (بەخششی خوا)، لەسەر تۆ گەورەیە، خوا بەخششێکی گەورەی بە تۆ داوە، کە لەو وەحیی و پەیامەی خوادا بەرجەستەیە، کە دوا فەرمایشتی خوایەو، دوا پەیامی خوایە بۆ مرۆڤایەتیی.

**زانایان ئاوا تەعبیریان لە کۆی واتای ئەم ئایەتە کردوە:**

(**لكِنَّ رَحمَةً مِن رَبِّكَ: مَنَعَت تَعَلُّقَ المَشِيئَة بِإذَهَابِ الَّذي** ﴿أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ﴾ **لأن فضله كان عليك كبيراً، فلا يَحْرِمُك فَضْلَ الذي أوحاه إليك**).

واتە: بەڵام بەزەیی لە پەروەردگارتەوە، ڕێگربوو لەوەی کە (ویست)مان پەیوەست بێ، بە لابرنی ئەوەی کە بۆمان سروش کردووی، چونکە بەخششی خوا لەسەر تۆ گەورەیە، بۆیە (خوا) ئەوەی کە بەتۆی خەڵات کردوە (ئەو بەخششەی کە بە تۆی داوە)، بێبەشت ناکات لێی، کە بریتیە لە وەحییەك کە بۆ تۆی ڕەوان کردوە.

زانایـان لـەو بـارەوە کـە ئایـا: ئـەم دوو ئایەتـە موبارەکـەی (٨٦ و٨٧)، لەگـەڵ ئایـەتی پێشـوویان، ژمـارە (٨٥)دا، کـە دەربـارەی ڕووحـە، چـۆن پەیوەسـت دەبنـەوە بـە کـۆی ئایەتەکانـەوە؟ زۆر قسـەیان کـردوە.

بـەڵام مـن بـەڕای خـۆم دەڵێـم: خـوای پـەروەردگار جـاری وایـە لـە سـیاقێك دا کۆمەڵێـك ڕاسـتیی مـەزن مـەزن دەخاتـە ڕوو، کـە هەموویـان ئەگـەر لێیـان وردبیـەوە لـە یـەك تـەوەردا کۆدەبنـەوە، ئنجـا جـاری وا هەیـە: هەمـوو ئـەو ڕاسـتییانە لەوبـارەوەن کـە: خـوا بـاسی نـاوو سـیفەتەکانی، نیعمـەت و کارەکانی، پێگـەو پایـەی بـەرزی خـۆی دەکات، تاکـو پێـمان بفەرمـوێ: خوایـەك کـە ئـەوە حاڵیـەتی و، ئـەوە سـیفەتیەتی و، ئـەوە کاریـەتی و، ئـەوە ناویـەتی، شایسـتەی ئەوەیـە تەنیـا ئـەو بەندایەتیـی بـۆ بکـرێ.

لێـرەدا هەندێـك زانایـان لـە بـارەی چۆنیـەتی پێکـەوە پەیوەسـت بـوونی ئایەتـەکانی: (٨٥ و٨٦ و٨٧) و، بـە ئایەتـەکانی پێشـوویانەوە، ڕایـان ئاوایـە: ئێـوە ئـەی خەڵکینـە! زانیارییـەکی کەمتـان پێـدراوە لـە چـاو زانیاریـی خـوا، بگـرە لـە چـاو نهێنییـەکانی گـەردوون و، باشـترین جـۆری زانیارییـش بریتیـە لـە وەحیـی، ئەویـش پێـی لـە خـۆ بایـی مەبـن، چونکـە ئەگـەر خـوا بیـەوێ لایدەبـات و لـە عەقـڵ و دڵتانـدا نایهێڵـێ.

## مەسەلەی شەشەم:

**خوا دەفەرموێ: بڵێ: بە دڵنیایی ئەگەر مرۆڤ و جند كۆ ببنەوە ! ناتوانن وێنەی ئەو قورئانە بێنن، هەرچەندە هەندێكیان پشتگیری هەندێكیان بن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ قُل لَّئِنِ ٱجۡتَمَعَتِ ٱلۡإِنسُ وَٱلۡجِنُّ عَلَىٰٓ أَن يَأۡتُواْ بِمِثۡلِ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ لَا يَأۡتُونَ بِمِثۡلِهِۦ وَلَوۡ كَانَ بَعۡضُهُمۡ لِبَعۡضٖ ظَهِيرٗا ﴿٨٨﴾ ﴾.

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿ قُل لَّئِنِ ٱجۡتَمَعَتِ ٱلۡإِنسُ وَٱلۡجِنُّ ﴾، بڵێ: ئەگەر مرۆڤ و جند پێكەوە كۆببنەوە.

وشەی (**الإنس**) ناوی كۆیە بۆ (**إنسان**) و، (**جنّ**)یش كۆی (**جنّي**)یە، كەواتە: دەتوانین بڵێین: یانی: ئەگەر مرۆڤەكان و جندەكان، یان: ئەگەر مرۆڤ و جند، خڕببنەوە سەریەك و پێكەوە هاوكار و دەستبارگربن...

ئنجا لێرە كە دەفەرموێ: ﴿ قُل لَّئِنِ ٱجۡتَمَعَتِ ٱلۡإِنسُ وَٱلۡجِنُّ ﴾، پسپۆڕانی زمان گوتوویانە: (**إستِئنَافٌ للزِّيَادَةِ فِي الإمتِنَانِ، وَاللاَّمُ مُوَطِّئَةٌ لِلقَسَمِ**)، یانی: ئەمە ڕستەیەكی لە نوێ دەستپێكەرە {بانەدراوەتەوە و نەگێڕدراوەتەوە بۆ ڕستەكانی پێش خۆی} بۆ دەرخستنی زیادە چاكەو منەتی خوایە و، (ل)كەش زەمینە خۆشكەرە بۆ سوێند.

بەڵام بە سوێند لە قەڵەم نادرێ، هەرچەندە هەندێك لە تەفسیرە كوردییەكان، ئەو (ل)یان، بە سوێند لە قەڵەم داوە، لە هەرجێیەك هاتبێ و بە: (سوێند دەخۆم)، لێكیان داوەتەوە! بەڵام وانیە، چونكە زانایان نەیانگوتوە: (ل)ی سوێندە دەڵێن: (**اللامُ المُوَطِّئَةُ لِلقَسَمِ**)، واتە: لامی زەمینە خۆشكەر بۆ سوێند، بەڵام سوێندەكە نەهاتوە، ماناكەشی بریتیە لە: جەخت لەسەر كردنەوە و داكۆكیی لەسەر كردن.

٢)- ﴿عَلَىٰٓ أَن يَأۡتُواْ بِمِثۡلِ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ ﴾، كە وێنەی ئەم قورئانە بێنن، بێگومان ئەوەی كە دەیهێنن، هەر دەبێ وێنەی قورئان بێ و خودی قورئان نیە، ئنجا لێرەدا مەبەست لە وێنەی قورئان بوون، واتە: وێنەیەتی لە كۆی تایبەتمەندییەكانی دا، وەك: ڕەوانبێژیی و زمانپاراویی و ڕاستییە مەزنەكان و، ئەدەبە بەرزەكان و، حوكم و یاسایەكان، كە قورئان گرتوونیە خۆی.

٣)- ﴿لَا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِۦ﴾، واتە: بە جەختکردنەوەوەش ئەگەر تێکڕای مرۆڤ و جند خڕ ببنەوە سەریەك، كە وێنەی ئەم قورئانە بێنن، ناتوانن وێنەی بێنن، ئەمە وەڵامی ئەو سوێندە قرتێنراوەیە، كە وەك گوتم: (ل)ەكە دەلالەتی لەسەر دەكات، ئەگەرنا خودی سوێندەكە باس نەكراوە.

٤)- ﴿وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا﴾، هەرچەندە هەندێكیشیان هاوكار و پشتگیری هەندێكیان بن، (**الظَهِيرُ: المُعِينُ، وَيَستَوِي فِيهِ المُفرَدُ وَالجَمعُ**)، وشەی (**ظَهِير**)، بە مانای یارمەتیدەر و هاوكار دێ و تاك و كۆی تێدا یەكسانن، وشەی (**ظَهِير**)، بۆ كۆمەڵە خەڵكێكیش بەكاردێ، بۆ تاكێكیش بەكاردێ.

لە كۆتایی ئەم مەسەلەی شەشەمەدا دەڵێین: ئێمە سوپاس بۆ خوا لە سەرەتای سوورەتی (هود)دا، لە بارەی ئیعجازی قورئانەوە قسەمان كردوە و، باسێكی سەربەخۆمان لەو بارەوە كردوە.

هەروەها لە كتێبی شەشەمی مەوسووعەی: (**الإِسلامُ كَمَا يَتَجَلَّى فِي كِتَابِ اللَّه**)، لە چاپی دووەمی، ئەو مەوسووعەیەدا، كە دابەشمان كردوە بۆ دوازدە (١٢) كتێب، لە كتێبی شەشەمیدا كە لە بارەی كتێبەكانی خواو قورئانەوەیە[١]، بە درێژیی قسەمان لە بارەی ئیعجازی قورئانەوە كردوە و، خستوومانەتە ڕوو، كە ڕووەكانی دەسەوسانكەرێتیی قورئان (**وجوه إعجاز القرآن**)، ناگونجێ دیاریی بكرێن، هەرچەندە من لەوێ وەك نموونە، لە دە (١٠) ڕووەوە دەسەوسانكردنی قورئانم بۆ مرۆڤ و جند، خستوونە ڕوو، بەڵام گوتوومە: ڕووەكانی ئیعجازی قورئان، ناگونجێ: نە بە دە (١٠) نە بە سەد (١٠٠)یش، دیاریی بكرێن، بەڵكو قورئان بە بێ سنوور، ڕووی ئیعجازی هەیە، لە هەر كات و سەردەمەدا و، هەتا مرۆڤەكان زیاتر بەرەو پێشەوە بچن، ڕووی زیاتری لێ دەردەكەون و، هەموو چین و توێژەكانی كۆمەڵگا، ئەگەر بە چاوی عەقڵ و دڵ تەماشای قورئان بكەن، دەزانن كە قورئان دەستەوستانكەر (**معجز**)و، سەلمێنەری ئەوەیە كە موحەممەد ﷺ پێغەمبەری خوایەو، قورئان فەرمایشتی خوایە بۆی هاتوە، نەك وەك كافرەكانی كاتی خۆی و ئەوانی دوایی و، ئەوانەی ئێستاش گومان دەبەن: كە موحەممەد خۆی قورئانی دانابێ! یان كەسێكی دیكە فێری كردبێ! كە ئێمە ئەو تۆمەتەشمان لە كتێبی حەوتەمی مەوسووعەی: (**الإِسلامُ كَمَا يَتَجَلَّى فِي كِتَابِ اللَّه**)، كە دەربارەی ژیانی پێغەمبەری خاتەمە ﷺ بە تەفصیل پووچەڵ كردۆتەوە[٢]، هەروەها لە تەفسیری سوورەتی (النحل)یشدا، لەو بارەوە كورتە باسێكمان كردوە.

---

(١) موسوعة: الإسلام كما يتجلى في كتاب اللّه، الكتاب السادس: الإيمان بكتب اللّه تعالى. الطبعة الثانية/ ٢٠١٨ م.

(٢) هەمان سەرچاوە: الكتاب السابع: محمد خاتم النبيين: موجز سيرته، وبراهين نبوّته...، الطبعة الثانية / ٢٠١٨م.

**مەسەلەی حەوتەم:**

خوا دەفەرموێ: بە دڵنیاییش لەم قورئانەدا، لە هەموو پەند و وێنەیەکی جۆراوجۆرمان بۆ خەڵکی هێناوەتەوە، کەچی زۆربەیان هەر ناسوپاسییان ویست و گوتیان: بڕوات بۆ ناهێنین، هەتا: کانیاومان لە زەوی بۆ دەرنەقوڵێنی، یان باغێکی خورماو ترێت هەبێت، ڕووبارانی بە نێودا فڕکە پێبکەی، یان وەك لافت لێداوە: پارچە پارچە ئاسمانمان بەسەردا بخەی، یان خواو فریشتەکان بە کۆمەڵ و ڕووبەڕوومان بێنی، یانماڵێکی زێڕینت هەبێت، یان بە ئاسمانێدا سەربکەوی و بەرزبیەوە، بڕواش بە پێهەڵاچوون و بەرز بوونەوەکەت، ناهێنین، تاکو نامەیەکمان دانەبەزێنیە سەر بیخوێنینەوە! بڵێ: پاکیی بۆ خوا، ئایا من تەنیا مرۆڤێکی ڕەوانەکراو نیم؟

خوا فەرموویەتی: ﴿ وَلَقَدْ صَرَّفْنَا لِلنَّاسِ فِي هَٰذَا الْقُرْآنِ مِن كُلِّ مَثَلٍ فَأَبَىٰ أَكْثَرُ النَّاسِ إِلَّا كُفُورًا ﴿٨٩﴾ وَقَالُوا لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّىٰ تَفْجُرَ لَنَا مِنَ الْأَرْضِ يَنبُوعًا ﴿٩٠﴾ أَوْ تَكُونَ لَكَ جَنَّةٌ مِّن نَّخِيلٍ وَعِنَبٍ فَتُفَجِّرَ الْأَنْهَارَ خِلَالَهَا تَفْجِيرًا ﴿٩١﴾ أَوْ تُسْقِطَ السَّمَاءَ كَمَا زَعَمْتَ عَلَيْنَا كِسَفًا أَوْ تَأْتِيَ بِاللَّهِ وَالْمَلَائِكَةِ قَبِيلًا ﴿٩٢﴾ أَوْ يَكُونَ لَكَ بَيْتٌ مِّن زُخْرُفٍ أَوْ تَرْقَىٰ فِي السَّمَاءِ وَلَن نُّؤْمِنَ لِرُقِيِّكَ حَتَّىٰ تُنَزِّلَ عَلَيْنَا كِتَابًا نَّقْرَؤُهُ ۗ قُلْ سُبْحَانَ رَبِّي هَلْ كُنتُ إِلَّا بَشَرًا رَّسُولًا ﴿٩٣﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە سێزدە بڕگەدا:

سەرەتاش دەڵێین: ئەو داواکاریی و بیانووانەی کافرەکان بۆ بڕواهێنانیان بە موحەممەد ﷺ وەك کۆتا پێغەمبەری خوا ﷺ و، بڕواهێنانیان بە قورئان، وەك پەیام و کۆتا کتێبی خوا، سەرجەم ئەو داواکاریی و بیانووانە، حەوتن، کە دوایی بەڕیز باسیان دەکەین.

١)- ﴿ وَلَقَدْ صَرَّفْنَا لِلنَّاسِ فِي هَٰذَا الْقُرْآنِ مِن كُلِّ مَثَلٍ ﴾، بەدڵنیاییەوە ئێمە بۆ خەڵك لەم قورئانەدا هەموو وێنەیەکمان، یان هەموو پەندێکمان بە جۆراوجۆریی هێناوەتەوە.

﴿ صَرَّفْنَا ﴾، پێشتریش زۆرجار باسی ئەو وشەیەمان کردوە: (**التَّصرِيف**)، یانی: (**التَّنوِيعُ**)، ﴿ وَتَصْرِيفِ الرِّيَاحِ ﴿٥﴾ ﴾الجاثیة، یانی: جۆراو جۆر کردنی بایەکان، جارێك لە باکوورەوە دێ، جارێك لە باشوورەوە، هەروەها: لای ڕاست و چەپ، یاخود جۆراوجۆر کردنیان: شەماڵەو، ڕەشەبایەو، بای دەریایەو... هتد.

کەواتە: کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ صَرَّفْنَا ﴾، بەدڵنیایی لە قورئاندا بۆ خەڵك لە هەموو وێنەیەكمان بە جۆراوجۆریی، هێناوە، یاخود لە هەموو جۆرە پەندێك هێناومانەتەوە، مەبەست ئەوەیە كە ئەم قورئانە چارەسەری مەسەلەكان بە شێوازێكی دۆگمایی و وشك و قاڵب بەستوویی ناكات، بەڵكو شێوازی جۆراو جۆر بەكاردێنێ، بۆ ئەوەی لە هەموو دەرگایانەوە لە عەقڵ و دڵی مرۆڤ بچێتە ژووری، هەروەها چونكە مرۆڤەكان ئاستی جیاواز جیاوازیان هەن، خوای كارزانیش شێوازی جۆراو جۆر بەكاردێنێ، بۆ ئەوەی بە كەڵكی هەموو ئاستەكان بێت، پاشان مرۆڤەكان سروشتیان جۆراو جۆرە و، خاوەنی كەسایەتیی و بیر و بۆچوونیی جۆراو جۆرن، بۆیە هەر كامێكیان شێوازێك و جۆرێكی لەگەڵدا پڕ بەپێستەو بۆ گونجاوەو، دەبێتە مایەی قەناعەت پێهێنانی.

كە دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ صَرَّفْنَا لِلنَّاسِ فِى هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ مِن كُلِّ مَثَلٍ ﴾، هەر ئەم تەعبیرە لە ئایەتی ژمارە (٤١)ی ئەم سوورەتەشدا، هاتوە، بەڵام لەوێ دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ صَرَّفْنَا فِى هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ لِيَذَّكَّرُوا۟ ﴿٤١﴾ ﴾الإسراء، لەم قورئانەدا جۆراو جۆرمان كردوە، تاكو بیر بكەنەوەو بیریان بێتەوە، بەڵام لەگەڵ دوو جیاوازیی دا:

أ) - لێرەدا وشەی ﴿ لِلنَّاسِ ﴾ی بۆ زیاد كردوە، بۆچی؟

چونكە لێرەدا ئەم ئایەتە لە مەقامی دەستەوسان كردن و تەحەددا كردنی ئینس و جندا هاتوە، بۆیە خەڵك مەبەست بوون، كە باس بكرێن و لێرە خوای بەرز و مەزن وشەی: ﴿ لِلنَّاسِ ﴾ی بۆ زیاد كردوە، بەڵام لەوێ مەقام و سیاقەكە بە جۆرێكی دیكەیە و، مەقام و سیاقی تەحەدداو دەستەوسان كردنی بەرامبەرەكان نیە، بەڵكو لەوێ دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ صَرَّفْنَا فِى هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ لِيَذَّكَّرُوا۟ وَمَا يَزِيدُهُمْ إِلَّا نُفُورًا ﴿٤١﴾ ﴾الإسراء، لەم قورئانەدا شێوازی جۆراو جۆرامان بەكارهێناوە، تاكو پەند وەربگرن، بەڵام هەر سڵەمینەوەیان زیاد دەكات.

ب) - لێرەدا وشەی: ﴿ مِن كُلِّ مَثَلٍ ﴾، لە هەموو وێنەیەك، زیاد كراوە، بەڵام لە ئایەتی پێشێ دا، نیە و تەنیا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ صَرَّفْنَا لِلنَّاسِ فِى هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ ﴾، چونكە - وەك گوتمان - ئێرە مەقامی دەستەوسانكردنەو، بێگومان هێنانەوەی وێنە و پەندی جیاواز و جۆرا وجۆر، زیاتر دەستەوسان كردن و ئیعجاز دەگەیەنێ.

كە دەفەرموێ: ﴿ مِن كُلِّ مَثَلٍ ﴾، ﴿ مِن ﴾ **(لِلتبعِيضِ فَالقُرآنُ مَشتَمِلٌ عَلَى أَبعَاضٍ مِنْ جَمِيعِ أَنوَاعِ المَثَلِ)**، ﴿ مِن ﴾ بۆ هەندێكە، چونكە قورئان چەند بەشێكی تێكڕای پەندو

وێنەکان دەگرێتە خۆی، واتە: لە هەموو پەندێك و لە هەموو وێنە هێنانەوەیەك بەشێك هەیە لە قورئاندا.

٢)- ﴿ فَأَبَىٰٓ أَكۡثَرُ ٱلنَّاسِ إِلَّا كُفُورٗا ﴾، کەچی زۆربەی خەڵکی ملیان نەدا، مەگەر بۆ زیاتر ناسپاسیی، (**كُفُور**) یانی: (**جحُود**)، نکووڵییلێکردن، یاخود (**كُفُور**) یانی: ناسپاسیی، سپڵەیی و بێ نمەکیی، ﴿ فَأَبَىٰٓ ﴾، یانی: (**فَمَنَعَ**) یان (**فَامتَنَعَ النَّاسِ إلاّ كُفُورًا**)، خەڵك ڕازیی نەبوون مەگەر بەوە کە ناسپاس و سپڵە بن، لە زمانی عەرەبییدا، ئەم شێوازە پێی دەگوترێ: (**تَأكِيدُ الشَّيء بِمَا يُشبِهُ ضِدَّهُ**)، جەختکردنەوە بە شتێك کە دەشوبهێتە پێچەوانەکەی، واتە: لە جیاتی ئەوەی ملکەچ بکەن، ئامادە نەبوون مەگەر بۆ ناسپاسیی و، بۆ نکووڵییلێکردن.

٣)- ئنجا دێتە سەر داواکارییەکانیان، دەفەرموێ: ﴿ وَقَالُواْ لَن نُّؤۡمِنَ لَكَ ﴾: گوتیان: هەرگیز بۆ تۆ بڕواناهێنین، ﴿ لَن نُّؤۡمِنَ لَكَ ﴾، وەك بڕوا هێنانەکەیان بۆ پێغەمبەر ﷺ، بێ! بێخەبەر لەوەی کە ئەگەر بڕوابێنن، خۆیان لێی بەهرەمەندن و، ئەگەر بێبڕواش بن، خۆیان لێی زەرەرمەندن، بەڵام منەت لەسەر پێغەمبەر ﷺ دەکەن و دەڵێن: بڕوا بۆ تۆ ناهێنین، واتە: بڕوا بۆ تۆ ناهێنین بە قورئان، یان بە خوا ﷻ.

## ٤)- ﴿ حَتَّىٰ تَفۡجُرَ لَنَا مِنَ ٱلۡأَرۡضِ يَنۢبُوعًا ﴾:

داواکاریی و بیانووی یەکەم: تاکو لە زەوی کانیاومان بۆ دەرنەقوڵێنی.

وشەی (**أَرض**)، ﴿ تَفۡجُرَ لَنَا مِنَ ٱلۡأَرۡضِ ﴾، (أل)ی ناساندنی لەسەرە، کە مەبەست پێی (**عهد**)ە، واتە: ئەو سەر زەمینە زانراوە، کە دیارە و باوە و بریتییە لە سەر زەمینی مەککە، تاکو لەسەر زەمینی مەککە، کانیاومان بۆ دەرنەقوڵێنی، ئێمە بۆ تۆ بڕوا ناهێنین.

(**التَّفجِيرُ مَصْدَرُ فَجَّرَ، مُبَالَغَةٌ فِي الفَجْرِ، وَهُوَ الشقُّ بِاتِسَاعٍ**)، (**تَفجِير**): چاوگی (**فَجَّرَ**)یە، (**فَجَّرَ، يُفَجِّرُ، تَفجِيرًا**)، کە زێدەڕۆیی کردنە لە (**فَجْر**)، یانی: لەتکردن، بەڵام لەتکردنێکی وا کە دوو شتەکان لێك جیابنەوەو، کەلێنەکەیان فراوان بێ.

(**اليَنْبوع: إسمٌ لِلعَيْنِ الكَثِيرَةِ النَّبعِ الَّتِي لا يَنضُبُ مَاؤهَا، وَصِيغَةُ «يَفعُول» صِيغَةُ مُبَالَغَةٍ غَيرِ قِيَاسِيَّةٍ**)، وشەی (**يَنبُوع**)، ناوی کانییە، بەڵام کانییەك کە ئاوی زۆری لێ هەڵبقوڵێ و ئاوەکەی نەبڕێ، وشەی (**يَنبُوع**)، لەسەر کێشی (**يَفعُول**)، ئەمەش یەکێکە لە شێوازەکانی زێدەڕۆیی کردن، بەڵام بێ ئەوەی کە قیاس بێ و، شێوازێکی دەگمەنە.

٥)- ﴿ أَوْ تَكُونَ لَكَ جَنَّةٌ مِّن نَّخِيلٍ وَعِنَبٍ ﴾:

داواکاریی و بیانووی دووەم: یاخود باغێکت هەبێت لە دار خورما و لە ترێ. واتە: (دار مێو)، بە زۆریی لە قورئاندا خوای پەروەردگار باسی دار خورما دار مێو، پێکەوە دەکات، - بە بۆچوونی من - لەبەر ئەوەی دارخورما بەرزترین جۆرە درەختی بەردار و میوەدارە و، مێویش نزمترینیەتی، بەزەویی دا پان دەبێتەوە، بە تایبەتی ئەوەی کە لە دێمەکار دەکرێ، مێوەکە بە زەوییدا پان دەبێتەوە، کەواتە: لە بەرزترین درەختی میوەوە بگرە تاکو نزمترینی، دەبێ تێیدابێ لەو باغەدا.

ئنجا هەر ئەوەندەش نا، کە باغەکە لە بەرزترین جۆری میوەوە، کە دار خورمایە، تاکو نزمترینی، کە دار مێوە، تێیدابێ، بەڵکو:

٦)- ﴿ فَتُفَجِّرَ ٱلْأَنْهَٰرَ خِلَٰلَهَا تَفْجِيرًا ﴾، ئنجا ڕووبارەکانی بە فرکە تێدا دەرقوڵێنی، واتە: لە خوا بپاڕێوە کە باغەکە ڕووبار و سەرچاوەی زۆری تێدابن و، سەرچاوەکان ئاوەکەیان کۆبێتەوە و ببێتە چەند ڕووبارێك و بە نێو درەختەکانی دا بڕۆن.

(**خِلاَلُ: جَمْعُ خَلَلْ: مُنفَرِجُ مَا بَينَ كُلِّ شَيْئَينِ**)، هەر بۆشاییەك کە دەکەوێتە نێوان دوو شتەوە پێی دەگوترێ: (**خَلَل**) کە بە (**خِلاَل**) واتە: کەلێنەکان کۆدەکرێتەوە.

٧)- ﴿ أَوْ تُسْقِطَ ٱلسَّمَآءَ كَمَا زَعَمْتَ عَلَيْنَا كِسَفًا ﴾

داواکاریی و بیانووی سێیەم: یاخود وەك لافت لێداوە، ئاسمانمان پارچە پارچە بە سەردا بخەیە خوارێ.

﴿ كِسَفًا ﴾، خوێنراویشەتەوە: (**كِسْفًا**)، هەردووکیان (**كِسَف**) یان (**كِسْف**) کۆی (**كِسفَة**)ن، کە بریتیە لە پارچە، هەروەك (**سِدْر**) و (**سِدَر**)، کۆی (**سِدْرَة**)ن.

کە دەفەرموێ: ﴿ كَمَا زَعَمْتَ ﴾، (**الزَّعْمُ: القَوْلُ المسْتَبْعَدُ أَوِ المَحالُ**)، (**زَعم**) بریتیە لە قسەیەکی بە دوور زانراو، یان قسەیەك کە مەحاڵ بێ، بۆیە من بە (لاف لێدان) مانام کردوە، ﴿ كَمَا زَعَمْتَ ﴾، وەك لافت لێداوە، خەیاڵت کردوە.

٨)- ﴿ أَوْ تَأْتِيَ بِٱللَّهِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ قَبِيلًا ﴾

داواکاریی و بیانووی چوارەم: یاخود خواو فریشتەکان بە کۆمەڵ بێنی، دەڵێ: (**القَبيل: الجَمَاعَةُ مِن جِنْسٍ وَاحِدٍ، وهُوَ مَنصُوبٌ عَلى الحال مِنَ المَلائِكَةِ**)، (**قَبِيل**) بریتیە لە

کۆمەڵە شتێك کە لە یەك جینس بن، یەك ڕەگەز بن، لێرەش: ﴿ قَبِيلًا ﴾، حاڵەتە ڕێزمانییەکەی ئەوەیە کە حاڵە و حاڵیش مەنصووبە، کە دەگەڕێتەوە بۆ (مَلَائِكَة)، واتە: فریشتەکان بە کۆمەڵ بێن، ئەگەرنا خوای بێ وێنە تاکە، یانی: خوای بەرز و مەزن بێت و فریشتەکانیش بە کۆمەڵ لە خزمەتی دابن و بێن، بۆمانیان بێنی، دوایی بەسەرهاتێك دێنین لەو بارەوە، زیاتر تیشك دەخاتە سەر ماناو چەمکی ئەو ئایەتانەو ئەو داواکارییانەی کە کردوویانن.

٩)- ﴿ أَوْ يَكُونَ لَكَ بَيْتٌ مِّن زُخْرُفٍ ﴾

داواکاریی و بیانووی پێنجەم: یانماڵێکت لە زێڕ هەبێ، یاخود ماڵێکی ڕەنگین و ڕازاوەت هەبێ، ﴿ زُخْرُفٍ ﴾، هەم بە مانای زێڕ و، هەم بە مانای نەخش و نیگار و ڕازێنرانەوەو جوانیی، دێ.

١٠)- ﴿ أَوْ تَرْقَىٰ فِي السَّمَاءِ ﴾

داواکاریی و بیانووی شەشەم: یاخود بە ئاسمانێ دا بەرز بیەوە، سەرکەوی، (**الرُّقِيُّ: الصُّعُودُ، رَقَى الطَّيرُ، يَرْقَى رَقواً: سَمَا وَارتَفَعَ**)، (**رَقَى الطَّيرُ، يَرْقَى**) باڵندەکە بەرز بووەوە، بەرز دەبێتەوە بە بەرز بوونەوە، واتە: هەڵفڕی، چووە سەرێ.

١١)- ﴿ وَلَن نُّؤْمِنَ لِرُقِيِّكَ حَتَّىٰ تُنَزِّلَ عَلَيْنَا كِتَابًا نَّقْرَؤُهُ ﴾

بیانوو و داواکاریی حەوتەم: هەرگیز بڕواناهێنین بە بەرز بوونەوەکەی تۆ بەرەو ئاسمان، ﴿ حَتَّىٰ تُنَزِّلَ عَلَيْنَا كِتَابًا نَّقْرَؤُهُ ﴾، هەتا نووسراوێکمان دانەبەزێنیە سەرێ، بیخوێنینەوە.

لە هەندێك لە تەفسیرەکاندا هاتوە کە هەر کامێکیان داوای کردوە، کە دەبێ نامەیەکی تایبەتیی بێ، بەمجۆرە:

لە خوای پەروەردگارەوە: بۆ فلان کەسی کوڕی فلان کەس! دوای سڵاوو ڕێز، بۆ ئاگادارییت! موحەممەد پێغەمبەری منە، بڕوای پێ بێنە و، قورئان کتێبی منە، دامبەزاندوە، بڕوای پێ بێنە!!

گوتوویانە: دەبێ نامە و نووسراوی تایبەتییمان بۆ بێ، بیخوێنینەوە، ئنجا بڕوات بۆ دێنین! ئەوە حەوت داواکاریی و بیانووەکەی بێبڕوایان.

خوا لە وەڵام دا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویٚ:

١٢)- ﴿ قُلْ سُبْحَانَ رَبِّي ﴾:

واتە: بڵێ: پاکیی بۆ پەروەردگارم، ئەمە مەبەست پێی سەرسوڕمانە! یانی: چەند شتێکی سەیرو عەجایب و بێ مانا داوا دەکەن؟

١٣)- ﴿ هَلْ كُنتُ إِلَّا بَشَرًا رَّسُولًا ﴾: ئایا من جگە لە مرۆڤێکی ڕەوانەکراو، هیچی دیکە هەم؟ واتە: من بەس مرۆڤێکم وەك ئێوە، خوا ڕەوانی کردووم و کردوومی بە نوێنەری خۆی، بەڵام ئەو شتانە بە من ناکرێن.

ئەمە پرسیار کردنی نکووڵیلێکەرانەیە، یاخود پرسیار کردنی سەرزەنشتکارانەیە، واتە: ئێوە عەقڵتان لە کوێیە؟ ئایا من جگە لە مرۆڤێك هیچی دیکە هەم؟ جگە لەوەی خوا منی ڕەوانە کردوە؟ لێرەدا بۆ زیاتر تیشك خستنە سەر نێوەڕۆکی ئەو حەوت بیانووە و، ئەو پێنج ئایەتە موبارەکە، کە ئێمە لەم مەسەلەی حەوتەم دا هێنامانن، با سەرنجی ئەو بەسەرهاتە بدەین، کە لە هۆی هاتنە خوارەوەکەی دا، نەمهێنا لەبەر ئەوەی سەنەدەکەی بێهێزە، بەڵام لەگەڵ نێوەڕۆکی ئایەتەکاندا، زۆر دەگونجێ و تیشکی زیاتر دەخاتە سەر نێوەڕۆکی ئایەتەکان، با لە ڕووی سەنەدیشەوە بەهێز نەبێ، ئەمەش دەقی ئەو بەسەرهاتەیە بەعەرەبیی بەر لەوەی وەری بگێڕینە سەر کوردیی:

{عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي اللَّه عنهما أَنَّ عُتْبَةَ وَشَيْبَةَ ابْنَيْ رَبِيعَةَ، وَأَبَا سُفْيَانَ بْنَ حَرْبٍ، وَرَجُلًا مِنْ بَنِي عَبْدِ الدَّارِ، وَأَبَا الْبَخْتَرِيِّ أَخَا بَنِي أَسَدٍ، وَالْأَسْوَدَ بْنَ الْمُطَّلِبِ، وَزَمْعَةَ بْنَ الْأَسْوَدِ، وَالْوَلِيدَ بْنَ الْمُغِيرَةِ، وَأَبَا جَهْلِ بْنَ هِشَامٍ، وَعَبْدَ اللَّهِ بْنَ أَبِي أُمَيَّةَ، وَأُمَيَّةَ بْنَ خَلَفٍ، وَالْعَاصَ بْنَ وَائِلٍ، وَنُبَيْهًا وَمُنَبِّهًا ابْنَي الْحَجَّاجِ السَّهْمِيَّيْنِ اجْتَمَعُوا، أَوْ مَنِ اجْتَمَعَ مِنْهُمْ، بَعْدَ غُرُوبِ الشَّمْسِ عِنْدَ ظَهْرِ الْكَعْبَةِ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ: ابْعَثُوا إِلَى مُحَمَّدٍ فَكَلِّمُوهُ وَخَاصِمُوهُ حَتَّى تُعْذِرُوا فِيهِ، فَبَعَثُوا إِلَيْهِ: إِنَّ أَشْرَافَ قَوْمِكَ قَدِ اجْتَمَعُوا إِلَيْكَ لِيُكَلِّمُوكَ.

فَجَاءَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ سَرِيعًا، وَهُوَ يَظُنُّ أَنَّهُ بَدَا لَهُمْ فِي أَمْرِهِ بَدَاءٌ، وَكَانَ عَلَيْهِمْ حَرِيصًا، يُحِبُّ رُشْدَهُمْ، وَيَعِزُّ عَلَيْهِ عَنَتُهُمْ، حَتَّى جَلَسَ إِلَيْهِمْ.

فَقَالُوا: يَا مُحَمَّدُ! إِنَّا قَدْ بَعَثْنَا إِلَيْكَ لِنُعْذِرَ فِيكَ، وَإِنَّا وَاللَّهِ مَا نَعْلَمُ رَجُلًا مِنَ الْعَرَبِ أَدْخَلَ عَلَى قَوْمِهِ مَا أَدْخَلْتَ عَلَى قَوْمِكَ، لَقَدْ شَتَمْتَ الْآبَاءَ، وَعِبْتَ الدِّينَ، وَسَفَّهْتَ الْأَحْلَامَ، وَشَتَمْتَ

الْآلِهَةَ، وَفَرَّقْتَ الْجَمَاعَةَ، فَمَا بَقِيَ أَمْرٌ قَبِيحٌ إِلَّا وَقَدْ جِئْتَهُ، فِيمَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكَ، فَإِنْ كُنْتَ إِنَّمَا جِئْتَ بِهَذَا الْحَدِيثِ تَطْلُبُ مَالًا، جَمَعْنَا لَكَ مِنْ أَمْوَالِنَا، حَتَّى تَكُونَ أَكْثَرَنَا مَالًا، وَإِنْ كُنْتَ إِنَّمَا تَطْلُبُ الشُّرَفَ فِينَا، سَوَّدْنَاكَ عَلَيْنَا، وَإِنْ كُنْتَ تُرِيدُ بِهِ مُلْكًا، مَلَّكْنَاكَ عَلَيْنَا، وَإِنْ كَانَ هَذَا الَّذِي يَأْتِيكَ بِمَا يَأْتِيكَ بِهِ رِئْيًا تَرَاهُ، قَدْ غَلَبَ عَلَيْكَ، وَكَانُوا يُسَمُّونَ التَّابِعَ مِنَ الْجِنِّ: الرِّئْيَ فَرُبَّمَا كَانَ ذَلِكَ، بَذَلْنَا أَمْوَالَنَا فِي طَلَبِ الطِّبِّ لَكَ، حَتَّى نُبَرِّئَكَ مِنْهُ، أَوْ نُعْذِرَ.

فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا بِي مَا تَقُولُونَ، مَا جِئْتُكُمْ بِمَا جِئْتُكُمْ بِهِ، أَطْلُبُ أَمْوَالَكُمْ، وَلَا الشَّرَفِ فِيكُمْ، وَلَا الْمُلْكَ عَلَيْكُمْ، وَلَكِنَّ اللَّهَ بَعَثَنِي إِلَيْكُمْ رَسُولًا، وَأَنْزَلَ عَلَيَّ كِتَابًا، وَأَمَرَنِي أَنْ أَكُونَ لَكُمْ بَشِيرًا وَنَذِيرًا، فَبَلَّغْتُكُمْ رِسَالَةَ رَبِّي، وَنَصَحْتُ لَكُمْ، فَإِنْ تَقْبَلُوا مِنِّي مَا جِئْتُكُمْ بِهِ، فَهُوَ حَظُّكُمْ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ، وَإِنْ تَرُدُّوهُ عَلَيَّ، أَصْبِرُ لِأَمْرِ اللَّهِ حَتَّى يَحْكُمَ اللَّهُ بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ» أَوْ كَمَا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ.

فَقَالُوا: يَا مُحَمَّدُ! فَإِنْ كُنْتَ غَيْرَ قَابِلٍ مِنَّا مَا عَرَضْنَا عَلَيْكَ، فَقَدْ عَلِمْتَ أَنَّهُ لَيْسَ أَحَدٌ مِنَ النَّاسِ أَضْيَقَ بِلَادًا، وَلَا أَقَلَّ مَالًا، وَلَا أَشَدَّ عَيْشًا مِنَّا، فَسَلْ رَبَّكَ الَّذِي بَعَثَكَ بِمَا بَعَثَكَ بِهِ، فَلْيُسَيِّرْ عَنَّا هَذِهِ الْجِبَالَ الَّتِي قَدْ ضَيَّقَتْ عَلَيْنَا، وَيَبْسُطْ لَنَا بِلَادِنَا، وَلْيُفَجِّرْ لَنَا فِيهَا أَنْهَارًا كَأَنْهَارِ الشَّامِ وَالْعِرَاقِ، وَلْيَبْعَثْ لَنَا مَنْ مَضَى مِنْ آبَائِنَا، وَلْيَكُنْ فِيمَنْ يَبْعَثُ لَنَا مِنْهُمْ: قُصَيُّ بْنُ كِلَابٍ، فَإِنَّهُ كَانَ شَيْخًا صَدُوقًا، فَنَسْأَلُهُمْ عَمَّا تَقُولُ، حَقٌّ هُوَ أَمْ بَاطِلٌ؟ فَإِنْ صَنَعْتَ مَا سَأَلْنَاكَ، وَصَدَّقُوكَ صَدَّقْنَاكَ، وَعَرَفْنَا بِهِ مَنْزِلَتَكَ عِنْدَ اللَّهِ، وَأَنَّهُ بَعَثَكَ بِالْحَقِّ رَسُولًا، كَمَا تقول.

فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وَمَا بِهَذَا بُعِثْتُ، إِنَّمَا جِئْتُكُمْ مِنَ اللَّهِ بِمَا بَعَثَنِي بِهِ، فَقَدْ بَلَّغْتُكُمْ مَا أُرْسِلْتُ بِهِ إِلَيْكُمْ، فَإِنْ تَقْبَلُوهُ فَهُوَ حَظُّكُمْ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ، وَإِنْ تَرُدُّوهُ عَلَيَّ، أَصْبِرُ لِأَمْرِ اللَّهِ حَتَّى يَحْكُمَ اللَّهُ بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ».

قَالُوا: فَإِنْ لَمْ تَفْعَلْ لَنَا هَذَا، فَخُذْ لِنَفْسِكَ، فَسَلْ رَبَّكَ أَنْ يَبْعَثَ مَلَكًا يُصَدِّقُكَ بِمَا تَقُولُ، وَيُرَاجِعُنَا عَنْكَ، وَاسْأَلْهُ، فَلْيَجْعَلْ لَكَ جِنَانًا وَكُنُوزًا وَقُصُورًا مِنْ ذَهَبٍ وَفِضَّةٍ، وَيُغْنِيكَ بِهَا عَمَّا نَرَاكَ تَبْتَغِي، فَإِنَّكَ تَقُومُ بِالْأَسْوَاقِ، وَتَلْتَمِسُ الْمَعَاشَ، كَمَا نَلْتَمِسُهُ، حَتَّى نَعْرِفَ فَضْلَ مَنْزِلَتِكَ مِنْ رَبِّكَ إِنْ كُنْتَ رَسُولًا كَمَا تَزْعُمُ.

فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا أَنَا بِفَاعِلٍ، مَا أَنَا بِالَّذِي يَسْأَلُ رَبَّهُ هَذَا، وَمَا بُعِثْتُ إِلَيْكُمْ بِهَذَا، وَلَكِنَّ اللَّهَ بَعَثَنِي بَشِيرًا وَنَذِيرًا، فَإِنْ تَقْبَلُوا مَا جِئْتُكُمْ بِهِ، فَهُوَ حَظُّكُمْ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ، وَإِنْ

تَـرُدُّوهُ عَـلَيَّ، أَصْـبِرُ لِأَمْـرِ اللَّـهِ حَتَّـى يَحْكُـمَ اللَّـهُ بَيْنِـي وَبَيْنَكُـمْ».

قَالُـوا: فَأَسْـقِطِ السَّـمَاءَ عَلَيْنَـا كِسَـفًا كَـمَا زَعَمْـتَ، أَنَّ رَبَّـكَ إِنْ شَـاءَ فَعَـلَ، فَإِنَّـا لَا نُؤْمِـنُ لَـكَ إِلَّا أَنْ تَفْعَـلَ.

فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «ذَلِكَ إِلَى اللَّهِ إِنْ شَاءَ فَعَلَ بِكُمْ ذَلِكَ».

فَقَالُـوا: يَـا مُحَمَّـدُ! فَـمَا عِلْـمُ رَبُّـكَ أَنَّـا سَـنَجْلِسُ مَعَـكَ، وَنَسْـأَلُكَ عَـمَّا سَـأَلْنَاكَ عَنْـهُ، وَنَطْلُـبُ مِنْـكَ مَـا نَطْلُـبُ، فَيَتَقَـدَّمُ إِلَيْـكَ، وَيُعَلِّمُـكَ مَـا تُرَاجِعُنَـا بِـهِ، وَيُخْـبِرُكَ مَـا هُـوَ صَانِـعٌ فِي ذَلِـكَ بِنَـا، إِذْ لَـمْ نَقْبَـلْ مِنْـكَ مَـا جِئْتَنَـا بِـهِ، فَقَـدْ بَلَغَنَـا أَنَّـهُ إِنَّمَـا يُعَلِّمُـكَ هَـذَا رَجُـلٌ بِالْيَمَامَـةِ يُقَـالُ لَـهُ: الرَّحْمَـنُ، وَإِنَّـا وَاللَّـهِ مَـا نُؤْمِـنُ بِالرَّحْمَـنِ أَبَـدًا، أَعْذَرْنَـا إِلَيْـكَ يَـا مُحَمَّـدُ، أَمَـا وَاللَّـهِ لَا نَـتْرُكُكَ وَمَـا بَلَغْـتَ مِنَّـا حَتَّـى نُهْلِـكَكَ أَوْ تُهْلِكَنَـا.

وَقَـالَ قَائِلُهُـمْ: نَحْـنُ نَعْبُـدُ الْمَلَائِكَـةَ، وَهُـنَّ بَنَـاتُ اللَّـهِ، وَقَـالَ قَائِلُهُـمْ: لَـنْ نُؤْمِـنَ لَـكَ حَتَّـى تَأْتِيَنَـا بِاللَّـهِ وَالْمَلَائِكَـةِ قَبِيـلًا.

فَلَـمَّا قَالُـوا ذَلِـكَ، قَـامَ رَسُـولُ اللَّـهِ ﷺ عَنْهُـمْ، وَقَـامَ مَعَـهُ، عَبْـدُ اللَّـهِ بْـنُ أَبِي أُمَيَّـةَ بْـنِ الْمُغِـيرَةِ بْـنِ عَبْـدِ اللَّـهِ بْـنِ عَمْـرِو بْـنِ مَخْـزُومٍ، وَهُـوَ ابْـنُ عَمَّتِـهِ هُـوَ لِعَاتِكَـةَ بِنْـتِ عَبْـدِ الْمُطَّلِـبِ، فَقَـالَ لَـهُ: يَـا مُحَمَّـدُ! عَـرَضَ عَلَيْـكَ قَوْمُـكَ مَـا عَرَضُـوا، فَلَـمْ تَقْبَلْـهُ مِنْهُـمْ، ثُـمَّ سَـأَلُوكَ لِأَنْفُسِـهِمْ أُمُـورًا، لِيَعْرِفُـوا مَنْزِلَتَـكَ مِـنَ اللَّـهِ، فَلَـمْ تَفْعَـلْ ذَلِـكَ، ثُـمَّ سَـأَلُوكَ أَنْ تُعَجِّـلَ مَـا تُخَوِّفُهُـمْ بِـهِ مِـنَ الْعَـذَابِ، فَوَاللَّـهِ لَا أُومِـنُ لَـكَ أَبَـدًا، حَتَّـى تَتَّخِـذَ إِلَى السَّـمَاءِ سُـلَّمًا تَرْقَـى فِيـهِ، وَأَنَـا أَنْظُـرُ حَتَّـى تَأْتِيَهَـا، وَتَـأْتِيَ مَعَـكَ بِنُسْـخَةٍ مَنْشُـورَةٍ، مَعَـكَ أَرْبَعَـةٌ مِـنَ الْمَلَائِكَـةِ يَشْـهَدُونَ لَـكَ أَنَّـكَ كَـمَا تَقُـولُ، وَأَيْـمُ اللَّـهِ لَـوْ فَعَلْـتَ ذَلِـكَ، لَظَنَنْـتُ أَلَّا أُصَدِّقُـكَ، ثُـمَّ انْـصَرَفَ عَـنْ رَسُـولِ اللَّـهِ ﷺ، وَانْـصَرَفَ رَسُـولُ اللَّـهِ ﷺ إِلَى أَهْلِـهِ حَزِينًـا أَسِـيفًا، لِـمَا فَاتَـهُ مِـمَّا كَانَ يَطْمَـعُ فِيـهِ مِـنْ قَوْمِـهِ حِـينَ دَعَـوْهُ، وَلِـمَا رَأَى مِـنْ مُبَاعَدَتِهِـمْ إِيَّـاهُ.

فَلَـمَّا قَـامَ عَنْهُـمْ رَسُـولُ اللَّـهِ ﷺ، قَـالَ أَبُـو جَهْـلٍ: يَـا مَعْـشَرَ قُرَيْـشٍ، إِنَّ مُحَمَّـدًا قَـدْ أَبَى إِلَّا مَـا تَـرَوْنَ مِـنْ عَيْـبِ دِينِنَـا، وَشَـتْمِ آبَائِنَـا، وَتَسْـفِيهِ أَحْلَامِنَـا، وَسَـبِّ آلِهَتِنَـا، وَإِنِّي أُعَاهِـدُ اللَّـهَ لَأَجْلِسَـنَّ لَـهُ غَـدًا بِحَجَـرٍ قَـدْرَ مَـا أُطِيـقُ حَمْلَـهُ، فَـإِذَا سَـجَدَ فِي صَلَاتِـهِ فَضَخْـتُ رَأْسَـهُ بِـهِ} (أَخرَجَـهُ الطَّبَرِي فِي جامِـع البَيـان: ج١٥، ص١١٠ و ١١١، وَذَكَـرَهُ السـيُوطِي فِي الـدُّرِ المَنثُـور، ج٥، ص٣٣٧)، وقـال مؤلِّفـا (الإسـتِيعاب فِي بَيـانِ الأسـبَاب[1]، وقلنـا: وَهَـذَا إِسـنَادٌ ضَعِيـفٌ).

---

(١) ج٢، ص٤٦١.

واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی عەببـاس (خـوا لـە خـۆی و بـابی ڕازی بـێ)، دەگێڕێتـەوە کـە: **(عُتْبَةَ وَشَيْبَةَ ابْنَيْ رَبِيعَةَ، وَأَبَا سُفْيَانَ بْنَ حَرْبٍ، وَرَجُلًا مِنْ بَنِي عَبْدِ الدَّارِ، وَأَبَا الْبَخْتَرِيِّ أَخَا بَنِي أَسَدٍ، وَالْأَسْوَدَ بْنَ الْمُطَّلِبِ، وَزَمْعَةَ بْنَ الْأَسْوَدِ، وَالْوَلِيدَ بْنَ الْمُغِيرَةِ، وَأَبَا جَهْلِ بْنَ هِشَامٍ، وَعَبْدَ اللَّهِ بْنَ أَبِي أُمَيَّةَ، وَأُمَيَّةَ بْنَ خَلَفٍ، وَالْعَاصَ بْنَ وَائِلٍ، وَنُبَيْهًا وَمُنَبِّهًا ابْنَيِ الْحَجَّاجِ السَّهْمِيَّيْنِ)** ئەمە چـوارده (١٤) کـەس، ئـەم چـوارده کەسـە، یاخـود لـەو چواردانـە ئەوەیـان کـە کۆبوونـەوە لـە دوای خـۆر ئاوابـوون، لـە پشـت کەعبـەوە، هەندێکیـان بـە هەندێکیـان گـوت: بنێـرن بـۆ لای موحەممـەد ﷺو، قسـەی لەگـەڵ بکـەن و، مشـت و مـڕی لەگەڵـدا بکـەن، تاکـو بیانـوو بـڕاوی دەکـەن، کۆمەڵێـك لـە زلەزلـەکانی وەڵامیـان بـۆ نـارد، کـە کۆمەڵێـك لـە گـەورە گـەورەکانی گەلەکـەت و قسـە بـە دەسـتانی کۆبوونەتـەوەو، دەیانـەوێ قسـەت لەگەڵـدا بکـەن، پێغەمبـەری خـوا ﷺ زۆر بـە خێرایـی هـات بـۆ لایـان، پێـی وابـوو کـە لـە بـارەی ویـەوە شـتێکیان بـۆ دەرکەوتـوە، ڕایـەکی باشـیان بـۆ پەیدابـووە و، ئـەو زۆر سـوور بـوو لەسـەر ئـەوە کـە ڕێـی ڕاسـت بگـرن و زۆر حـەزی دەکـرد کـە سـەر ڕاسـت بـن و ناڕەحەتیـی و، ڕۆژ ڕەشـییەك کـە چاوەڕێیـان دەکات، زۆر لەسـەر دڵـی قـورس بـوو، ئیـدی هـات هەتـا لـە لایـان دانیشـت.

گوتیـان: ئـەی موحەممـەد! ئێمـە بۆیـە بـە دوای تۆمـان دا ناردوە، تاکـو لـە بـارەی تـۆوە ئێمـە خـاوەن عـوزر بیـن {واتـە: تـۆ هیـچ بەهانـەو بیانـووت نەبـێ کـە گلەیـی لـە ئێمـە بکـەی} سـوێند بـە خـوا، هیـچ پیاوێـك لـە عەرەبـان پێـمان شـك نایـەت، ئـەوەی هێنابێتـە نێـو گەلەکـەی خـۆی، کـە تـۆ هێناوتـە، جنێـوت بـە بـاب و باپیرانمـان داوە و ئایینـی ئێمـەت ڕەخنـە لێگرتـوە و عاقڵـەکانی ئێمـەت {یاخـود پیـاوە ژیـرەکانی ئێمـەت} بـە نەفـام لـە قەڵـەم داون و جنێـوت بـە پەرسـتراوەکانمان داوە و، کۆمەڵـی ئێمـەت پەرتـەوازە کـردوە و، هیـچ شـتێکی خـراپ و ناقـۆڵا نەمـاوە، مەگـەر تـۆ کردووتـە لـە نێـوان ئێمـەو خۆتـدا، ئنجا ئەگـەر تـۆ ئـەوەی کـە هێناوتـە {ئـەو ئایینـەی هێناوتـە} مەبەسـتت پێـی سـامانە، بـا لـە مـاڵ و سامانی خۆمـان بـۆت کۆبکەینـەوە، تاکـو لـە هەمووومـان دەوڵەمەندتـر دەبی، هەروەهـا ئەگەر مەبەسـتت سـەرۆکایەتی و گەورەییـە بەسـەرماندا، دەتکەینـە سـەرۆك و گـەورەی خۆمـان و، ئەگـەر مەبەسـتت پادشـایەتییە دەتکەینـە پادشـای خۆمـان و، بـەڵام ئەگـەر ئـەو حاڵەتـەی بەسـەرتدا هاتـوە، شـەیتانێك دەسـتی لـێ وەشـاندووی و بەسـەرتدا زاڵ بـووە، {ئەوانـە کاتێـك شـەیتانێك دەچـووە نێـو بـەدەنی کەسـێکەوە و بـە سـەریدا زاڵ دەبـوو پێیـان دەگـوت: (رِئْيٌ)}، کـە ئـەو حاڵەتـەش جـاری وا هەیـە دەبـێ، مـاڵ و سـامانی خۆمـان خـەرج دەکەیـن بـۆ ئـەوەی

چارەسەرت بکەین، تاکو چارەسەرت دەکەین، یاخود کارێکت لەگەڵدا دەکەین کە ڕێی گلەییت نەمێنێ لە ئێمە، {یاخود: خزمەکانت نەتوانن گلەییمان لێ بکەن}

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەو شتانەی ئێوە دەیانڵێن: هیچ کام لەوانەم نیە، من نەهاتووم: ماڵ و سامانەکانتان داوا بکەم، هەروەها نەشهاتووم کە لە نێوتان دا گەورەیی بکەم، هەروەها نەشهاتووم کە ببمە سەرۆکتان، بەڵام خوا ﷻ منی بۆ لای ئێوە ڕەوانە کردوەو، کتێبێکی دابەزاندۆتە سەر من و، فەرمانی پێکردووم کە موژدەدەر بم بۆتان و، ترسێنەر بم بۆتان، منیش ئەوە پەیامی پەروەردگارم پێگەیاندن و دڵسۆزییم بۆ نواندن، ئنجا ئەگەر لێم وەربگرن {ئەو پەیامەی بۆم هێناون، لێم وەربگرن} ئەوە پشك و بەشی خۆتانە لە دنیاو دوارۆژدا و، ئەگەر ڕەتیشی بکەنەوە بەسەرمدا، خۆم ڕادەگرم تاکو خوا دادوەریی لە نێوان من و ئێوەدا دەکات، یان شێوە ئەوەی فەرموو.

گوتیان: ئەی موحەممەد! ئەگەر ئەوەی بۆ تۆمان پێشنیار کرد، هیچمان لێوەرناگری، تۆ خۆت دەزانی کە هیچ کەسێك لە خەڵك، نیشتمان و وڵاتەکەی لە ئێمە بەرتەسکتر نیە و، هیچ کەسێك لە ئێمە کەم سامانتر نیە و، هیچ کەسێك لە ئێمە گوزەرانی سەختتر نیە، بۆیە تۆ داوا لە پەروەردگارت بکە، ئەو پەروەردگارەی تۆی ڕەوانە کردوەو، ئەو پەیامەی پێدا ڕەوان کردووی، کە ئەم چیایانەی دەوری ئەم شارەمان بۆ لابەرێ، کە ژیانیان لێ وەتەنگ خستووین و، وڵاتەکەمان بۆ فراوان بکات، چیایەکان دووربخاتەوە، هەروەها با ڕووبارانمان بۆ دەرقوڵێنێ، وەك ئەو ڕووبارانەی کە لە شام و لە عێراق هەن، {مەبەستیان ڕووباری ئوردن و، دیجلەو فورات بووە} هەروەها با ئەو باب و باپیرانەمان کە لە پێش ئێمەدا مردوون، بۆمان زیندوو بکاتەوە، با لە نێو ئەوانەدا کە زیندوویان دەکاتەوە، قوصەی کوڕی کیلاب هەبێ، چونکە پیاوێکی بە تەمەنی ڕاستگۆ بووە، ئێمە لە بارەی ئەوەوە کە تۆ دەڵێی، پرسیاریان لێ دەکەین، ئایا هەقە یان ناهەقە؟ ئنجا ئەگەر ئەوەت کرد کە ئێمە داوامان لێکردووی و، ئەو باب و باپیرانەمان کە زیندوویان دەکەیەوە، تۆیان بە ڕاست دانا، ئەوە ئێمەش تۆ بە ڕاست دادەنێین و ئەو کاتەش دەزانین کە پێگەی تۆ لە لای خوای پەروەردگار چۆنە؟ دەشزانین کە ئەوەی تۆی پێ ڕەوانە کردوە، هەقە وەك تۆ دەڵێی!

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوەی ئێوە دەیڵێن: من بەوە ڕەوان نەکراووم، بەڵکو من ئەوەم بۆ هێناون لە خواوە، کە بۆم هێناون، ئەوەی کە پێی ڕەوانەش کراوم، پێم گەیاندوون،

ئنجا ئەگەر لێم وەربگرن، ئەوە پشك و بەشی خۆتانە لە دنیا و لە دوارۆژدا و، ئەگەر بەسەریشم دابدەنەوە، ئەوە خۆم ڕادەگرم، تاكو خوا دادوەریی لە نێوان من و ئێوەدا دەكات.

گوتیان: ئەگەر ئەوەشمان بۆ ناكەی، تۆ لە پەروەردگارت بپاڕێوە: كە فریشتەیەك بنێرێ تۆ بە ڕاست دابنێ، لەوەدا كە دەیڵێی {واتە: شایەدییت بۆ بدات و با لەگەڵ ئێمەدا وتووێژو قسە و دیالۆگمان لەگەڵدا بكات} و بەرگریی لە تۆ بكات، هەروەها داوای لێبكە كە باخ و بێستانت پێ بدات و، خەزێنەت پێ بدات و، كۆشكت پێ بدات لە زێڕو زیو و، بێنیازت بكات لەوەی كە ئێمە دەیبینین، كە تۆش بە دوای بژێودا دەگەڕێی، چونكە تۆش لە بازاڕان دا دەجووڵێی و كەسابەت و بازرگانیی دەكەی، {یانی: وەك چۆن ئێمە بە دوای بژێودا دەگەڕێین، تۆش بە دوای بژێودا دەچی، با پەروەردگارت بێنیازت بكات} تاكو ئێمە گەورەیی پێگەی تۆ لە لای پەروەردگارت بزانین، ئەگەر تۆ پێغەمبەری خوای وەك لاف لێدەدەی.

پێغەمبەر ﷺ {بۆ جاری سێیەم} فەرمووی: ئەوەی ئێوە دەیڵێن: من نایكەم و ئەوە نیم كە ئەو داوایە لە پەروەردگاری بكەم و، بەوەش كە ئێوە داوای دەكەن، بۆ لای ئێوە نەنێردراوم، بەڵكو خوا منی ناردوە كە دڵخۆشكەر و ترسێنەر بم، ئنجا ئەگەر ئەوەی هێناومە لێم وەربگرن، ئەوە پشك و بەشی خۆتانە لە دنیاو لە دوا ڕۆژدا و، ئەگەر بەسەریشم دابدەنەوە، خۆم ڕادەگرم بۆ فەرمانی خوا، تاكو دادوەریی لە نێوان من و ئێوەدا دەكات.

دیسان گوتیان: كەواتە: وەك لافت لێداوە: ئاسمانمان پارچە پارچە بەسەردا بخە خوارێ، كە تۆ دەڵێی: ئەگەر پەروەردگارم بیەوێ، وا دەكات، چونكە ئێمە بڕوا بەوە ناهێنین، تاكو وانەكەی، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوەش عایدی خوایە، ئەگەر بیەوێ وا دەكات و، ئەوەتان پێدەكات كە داوای دەكەن.

گوتیان: ئەی موحەممەد! ئایا پەروەردگارت ئاگادار نەبوو، كە ئێمە لەگەڵ تۆ دادەنیشین و ئەو شتانەت داوا لێ دەكەین و ئەو داواكارییانەت ئاراستە دەكەین؟ دەبووایە پەروەردگارت بێ، ئاگادارت بكاتەوەو، فێرت بكات كە تۆ وتووێژ لەگەڵ ئێمەدا بكەی و هەواڵیشت پێ بدات، ئایا ئەگەر ئەوەی هێناوتە قبووڵمان نەكرد، خوا چی دەكات؟ چیمان پێ دەكات و چۆن سزامان دەدا؟ بۆیەش ئەوەی هێناوتە قبووڵمان نەكرد، چونكە بیستوومانە: ئەوەی فێرت دەكات، پیاوێكە لە یەمامە، پێی دەگوترێ:

(**الرَّحمن**)، ئێمەش بە خوا هەرگیز بڕوا بە ڕەحمان ناهێنین، {واتە: ئەو ڕەحمانەی کە لە یەمامەیە}. ئەی موحەممەد! ئەوە ئێمە بیانوومان بە دەست تۆوە نەهێشت، سوێند بە خوا ئێمە واز لە تۆ ناهێنین و، ئەوەی تۆ بە ئێمەت کردوە، لێت ناگەڕێین تاکو یان نەتفەوتێنین، یان نەمان فەوتێنی!

ئنجا یەکێکیان گوتی: ئێمە فریشتان دەپەرستین و ئەوان کچانی خوان.

بێژەرێکی دیکەیان گوتی: ئێمە بڕوا بە تۆ ناهێنین، تاکو خواو ﷻ فریشتەکان بە کۆمەڵ بۆ لای ئێمە نەهێنی، کاتێك ئەوەیان پێگوت: پێغەمبەری خوا لە کۆڕەکەیان هەڵسا، عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوو ئومەییەی کوڕی موغیرەی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی مەخزووم کە دەبێتە کوڕە پووری: عاتیکەی کچی عەبدول موتتەڵیب دەبێتە کوڕی خوشکی بابی {عاتیکە کچی عەبدول موتتەڵیب بووە، وەك چۆن عەبدوڵڵای بابی پێغەمبەر ﷺ کوڕی عەبدولموتتەڵیب بووە} لەگەڵی هەڵسا گوتی: ئەی موحەممەد! ئەوە گەلەکەت کۆمەڵێ شتیان بۆ پێشنیار کردی، هیچت لێوەرنەگرتن، پاشان چەند شتێکیان داوا لێکردی بۆ خۆیان، تاکو ئەوان پێگەی تۆ لە لای خوا بزانن، ئەوەشت بۆ جێبەجێ نەکردن، دوایی داوایان لێکردی کە ئەوەی تۆ ئەوانی پێ دەترسێنی لە سزا، پەلە بکەی و بۆیان بێنی، ئەوەشت نەکرد، دەجا سوێند بە خوا، هەرگیز بڕوا بە تۆ ناهێنم تاکو نەچیە ئاسمانێ و بە پەیژەیەك پێهەڵانەچی و منیش تەماشات بکەم، کە تۆ بەو پەیژەیەدا سەر دەکەوی و دەچیە سەرێ و، لەوێوەش نوسخەیەك نامەی کراوەم بۆ بێنی و چوار فریشتەشت لەگەڵدا بن، شایەدی بدەن کە ئەوەی تۆ دەیڵێی: ڕاستە، بە خوا، ئەگەر ئەوەش بکەی، پێم وایە هەر بە ڕاستت نازانم، {واتە: لە پێش چاوی من بە پەیژەیەك دا سەرکەوی بۆ ئاسمانێ و، نامەیەکیش بێنی، چوار فریشتەش شایەد بن کە تۆ پێغەمبەری خوای، ئنجا پێم وایە هەر بڕواشت پێ ناهێنم} دوایی ئەو کابرایە وازی لە پێغەمبەر ﷺ هێنا و ڕۆیی، پێغەمبەریش ﷺ چوە لای خێزانی زۆر بە خەفەتباریی و بە دڵتەنگیی، بە هۆی لە دەستچوونی ئەوەوە کە ئومێدی پێ بوو و چاوەڕوانیی دەکرد لە گەلەکەی، کاتێ بانگیان کرد {وایدەزانی: بۆیە بانگیان کردوە، تاکو بڕوای بێنن} ئنجا کاتێك کە بینی ئاوا خۆیانی لێ دوور دەگرن، زۆر دڵتەنگ بوو.

ئنجا کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسا لە لایان و بەجێیهێشتن، ئەبوو جەهل هەڵسا، گوتی: ئەی کۆمەڵی قوڕەیش! خۆتان بینیتان موحەممەد، ئەوەی کە ئێوە داواتان لێکرد،

هەمووی ڕەفز کرد و، هەر لەسەر ئەوە بەردەوام بوو، کە خۆتان بینیتان، کە ڕەخنە لە ئایینەکەمان بگریّ و جنێو بە باب و باپیرمان بلّێ و، عەقلّمان بە کەم تەماشا بکات (بە نەفام و کەودەنمان لە قەلّەم بدات) و قسە بە پەرستراوەکانمان بلّێ، منیش پەیمان بە خوا دەدەم کە بەیانیی چاوەڕێ دەکەم و خۆی لێ مەلّاس دەدەم، بەردێك هێندە گەورە بێ، بە عاستەم بۆم هەلّبگیریّ، دەستی دەدەمێ، هەر کاتێك کڕنووشی برد لە نوێژەکەی دا، سەری پێ دەقەپێنم. {ئاوا هەڕەشەی کردوە، بەلّام بێگومان خوای پارێزەری توانا پێغەمبەری خۆی پاراستوە ﷺ].

بێگومان ئەو بەسەرهاتەی گێڕامانەوە: زیاتر تیشکی دەخاتە سەر نێوەڕۆکی ئەم ئایەتە موبارەکانە، با سەنەدەکەشی بەهێز نەبێ، ئێمە وەك بەرچاو ڕوونییەك هێنامان.

## مەسەلەی هەشتەم:

**خوا دەفەرمووێ: هیچ شتێکیش ڕێی لە خەڵك نەگرت، کاتێك ڕێنماییان لە خواوە بۆ هات، بڕوای پێ بێنن، ئەوە نەبێ کە گوتیان: ئایا خوا بەشەرێکی بە پێغەمبەر ناردوە؟ بڵێ: ئەگەر فریشتە لەسەر زەوی بوونایەو، بە ئارامیی پێیدا ڕۆیشتبانایە، لە ئاسمانەوە فریشتەیەکمان بە پێغەمبەر دادەبەزاندە سەریان، بڵێ: خوا بەسە لە نێوان من و ئێوەدا شایەد بێ، بێگومان ئەو شارەزاو بینەری بەندەکانیەتی:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿ وَمَا مَنَعَ ٱلنَّاسَ أَن يُؤْمِنُوٓاْ إِذْ جَآءَهُمُ ٱلْهُدَىٰٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ أَبَعَثَ ٱللَّهُ بَشَرًا رَّسُولًا ﴿٩٤﴾ قُل لَّوْ كَانَ فِى ٱلْأَرْضِ مَلَٰٓئِكَةٌ يَمْشُونَ مُطْمَئِنِّينَ لَنَزَّلْنَا عَلَيْهِم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَلَكًا رَّسُولًا ﴿٩٥﴾ قُلْ كَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًۢا بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرًۢا بَصِيرًا ﴿٩٦﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ وَمَا مَنَعَ ٱلنَّاسَ أَن يُؤْمِنُوٓاْ إِذْ جَآءَهُمُ ٱلْهُدَىٰٓ ﴾، هیچ شتێك پێشگیریی و ڕێگریی لە خەڵك نەكرد، بڕوا بێنن، کاتێك کە ڕێنماییان بۆ هات.

٢)- ﴿ إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ أَبَعَثَ ٱللَّهُ بَشَرًا رَّسُولًا ﴾، مەگەر ئەوە کە بەسەر سووڕمان و بە نکووڵییلێکردنەوە، گوتیان: ئایا خوا مرۆڤێکی بە ڕەوانەکراو ناردوە؟ واتە: هەموو خەڵك بە گشتی ئا ئەوە ڕێگریان بوو، ئیمان بێنن بە پێغەمبەران ﷸ، ئیمان بێنن بە پەیام و کتێبەکانی خوا، کە خوا مرۆڤێکی بە ڕەوانەکراو، بە پێغەمبەر، ناردوە؟!

خوا ﷻ لە وەڵامیان دا دەفەرمووێ:

٣)- ﴿ قُل لَّوْ كَانَ فِى ٱلْأَرْضِ مَلَٰٓئِكَةٌ يَمْشُونَ مُطْمَئِنِّينَ لَنَزَّلْنَا عَلَيْهِم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَلَكًا رَّسُولًا ﴾، بڵێ: ئەگەر لەسەر زەوی فریشتەی لێبوونایە! بە ئارامیی بە زەوی دا ڕۆیبانایە، لە ئاسمانێوە فریشتەیەکمان وەك پێغەمبەر دادەبەزاندە سەریان، واتە: ئەگەر فریشتەکان لەسەر زەوی نیشتەجێ بوونایە و بە ئارامیی بەسەر زەویدا ڕۆیشتبانایە، ئەو کاتە لە شێوەی خۆیان و لە ڕەگەزی خۆیان، پێغەمبەرمان بۆ دەناردن، پێغەمبەرێکی فریشتەمان

دەنارده لای ئەو فریشتانەی کە دانیشتووی سەر زەویین، بەڵام ئێستا ئێوە مرۆڤن لەسەر زەوی و فریشتە نین، بۆیەش لە شێوەی خۆتان پێغەمبەر و ڕەوانەکراوتان بۆ دەنێرین، کە مرۆڤێك بێ، ئەویش موحەممەدە ﷺ وەك چۆن هەموو پێغەمبەرانی دیکەی خوا، مرۆڤ بوون.

لە کۆتایی دا خوا دەفەرموێ:

٤)- ﴿ قُلْ كَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًۢا بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ ﴾، بڵێ: خواش بەسە شایەد بێ لە نێوان من و ئێوەدا.

٥)- ﴿ إِنَّهُۥ كَانَ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرًۢا بَصِيرًا ﴾، بە دڵنیایی ئەو شارەزاو بینەری بەندەکانیەتی.

**ئێستاش با سەرنجی چەند وردەکارییەکی ڕێزمانیی و ڕەوانبێژیی بدەین:**

﴿ كَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًۢا ﴾،

أ - (الباء (ب) في (باللّه) لِتَأكِيد لُصُوقِ فِعلِ كَفَى بِفَاعِلِه: ﴿ كَفَىٰ بِٱللَّهِ ﴾)، یانی: (ب)ی سەر (كَفَىٰ بِٱللَّهِ) بۆ تەئکید کردنەوەوی پەیوەست بوونی کرداری ﴿ كَفَىٰ ﴾یە، بەبکەرەکەیە، کە خوایە ﷻ: ﴿ كَفَىٰ بِٱللَّهِ ﴾، خوا بەسە، (**مَفعُولُ كَفَى مَحذُوفٌ**)، بەرکاری ﴿ كَفَىٰ ﴾، قرتێندراوە، (**أَي: كَفَانِي**)، واتە: بۆ من بەسە خوا شایەد بێ.

ب - (**الشَّهِيدُ: الشَّاهِدُ، وَهُوَ مُخبِرُ بِأَمرٍ وَاقِعٍ كَمَا وَقَعَ**)، (**شَهِيد**) لێرەدا بە مانای شایەدە، کە هەواڵدەرە بەشتێك کە لە واقیع دا هەیە.

ج - ﴿ بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ ﴾ لە نێوان من و ئێوەدا، واتە: خوا بەسە شایەد بێ، کە من ڕاست دەکەم و پێغەمبەری خوام، شایەدیی خوا بۆ من بەسە، ئایا شایەدیی خوا، لە چیدا بەرجەستە دەبێ؟ لەوەدا کە موحەممەدی ﷺ بە شێوەیەك هەڵخستوە، هەر کەسێك تەماشای بکات: دەزانێ ڕاستگۆیە، هەروەها قورئانێکیشی بۆ ناردوە، هەر کەسێ گوێی لێبگرێ، دەزانێ کە فەرمایشتی خوایە، شایەدیی دانی خوا لەوەدا بەرجەستە دەبێ، خوا ئاوا شایەدیی بۆ دەدا: هەم موحەممەدی ﷺ وا هەڵخستوە: سروشتەکەی، ڕەوشتەکەی، کەسایەتییەکەی، هەر کەسێك تەماشای بکات، وەك زۆرجار کافرەکان تەماشایان کردوە، کەسێك کە نەیناسیوە، گوتوویەتی: (**لَيسَ هَذَ الوَجهُ بِوَجهِ كَذَّابٍ**)، ئەم دەم و چاوە، ئەم ڕووە ڕووی مرۆڤی درۆزن نیە! دیسان هەر کەسێکیش تەماشای قورئانی کردبێ و، گوێی لە قورئان گرتبێ، زانیویەتی کە ئەوە نەك قسەی موحەممەد ﷺ نیە، کە ڕەوانبێژترینی عەرەبان بووە، بەڵکو قسەی هیچ کەسێك نیە، جگە لە خوا ﷻ.

د - کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّهُۥ كَانَ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرًۢا بَصِيرًا ﴾، ئەمە تەعلیلی ئەوەیە، کە بۆچی خوا بەسە؟ چونکە خوا شارەزاو بینەری کردەوەی بەندەکانیەتی، ئنجا بۆیەش هەم موحەممەدی ﷺ والێکردوە، هەر کەسێك تێی بفکرێ و، تێوەی ڕامێنێ، دەزانێ کە پێغەمبەری خوایە ﷺ، هەروەها قورئانیشی وا ناردۆتە خوارو دابەزاندوە، هەر کەسێ تێبفکرێ و بیخوێنێتەوە، دەزانێ کە فەرمایشتی خوایە.

بێگومان هەر کەسێ بڵێ: من پێغەمبەرم، یان دەبێ باشترین کەس بێ، یان دەبێ خراپترین کەس بێت، بۆچی؟ چونکە: ئەگەر باشترین کەس نەبێ و لە داوای پێغەمبەرایەتییەکەی دا ڕاست نەکات و درۆ بکات، بێگومان خراپترین کەسە، چونکە خراپترین کەس نەبێ درۆ بەناوی خواوە ناکات، هەڵبەتە هەر پێغەمبەرێك لە ڕۆژگاری خۆیدا، باشترینی خەڵکی ڕۆژگاری خۆی بووە و پێغەمبەران بە گشتی هەڵبژێردراوی نێو مرۆڤایەتیین، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَسَلَٰمٌ عَلَىٰ عِبَادِهِ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَىٰٓ ﴿٥٩﴾ ﴾ النمل، سەلامی خوا لەسەر ئەو بەندانەی کە هەڵیبژاردوون، (پێغەمبەران) گوڵبژێری نێو باغی مرۆڤایەتیین، بەڵێ هەر کەسێك داوای پێغەمبەرایەتیی کردبێ، ئەگەر باشترین کەس نەبووبێ و، ڕاستی نەکردبێ و، لە لایەن خواوە ڕەوان نەکرابێ، دیارە خراپترین کەس بووە، چونکە خراپترین کەس کەسێکە کە بە ناوی خواوە درۆ دەکات: ﴿ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا ...﴿٢١﴾ ﴾ الأنعام، واتە: کێ ستەمکارترە لە کەسێك کە بەناوی خواوە درۆ هەڵبەستێ { و بڵێ: من پێغەمبەرم و هەویش نەبێت، بڵێ: وەحییم بۆ دێ و، بۆشیی نەیەت؟!}

## کورته باسێک دەربارەی مرۆڤ بوونی پێغەمبەران

ئێمـە لـە کۆتایـی تەفسـیری ئـەم ئایەتانـەدا، واتـە: ئـەم پـازدە (١٥) ئایەتـە، کورتـە باسـێك لـە دوو بڕگـەدا دەربـارەی مـرۆڤ بـوونی پێغەمبـەران، دەکەیـن:

### بڕگەی یەکەم:

مـرۆڤ بـوونی پێغەمبـەران، گەورەتریـن کۆسـپی بڕواهێنـانی بێبڕوایـان بـە پێغەمبـەران بـووە: بەڵـێ کافـران کـە بڕوایـان بـە پێغەمبـەران نەهێنـاوە، مـرۆڤ بـوونی پێغەمبەرانیـان بـە گەورەتریـن کۆسـپی بەردەمـی خۆیـان دانـاوە، لـە زۆر شـوێنی قورئـان دا، خـوای پـەروەردگار ئەمـەی خسـتۆتە ڕوو، بـۆ وێنـە:

١)- لە سووڕەتی (**الأعراف**)دا نووح ﷺ بە گەلەکەی خۆی دەفەرموێ: ﴿ أَوَعَجِبْتُمْ أَن جَآءَكُمْ ذِكْرٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنكُمْ لِيُنذِرَكُمْ وَلِتَتَّقُوا۟ وَلَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٦٣﴾ ﴾الأعراف.

واتـە: ئایـا سـەرتان سـوڕما کـە لـە پەروەردگارتانـەوە بیرخـەرەوەو بەرنامەتـان بـۆ هـات، بـە پیاوێـك دا لـە خۆتـان، تاکـو بتانترسـێنێ و، تاکـو پارێـز بکـەن و، بەڵکـو بەزەییتـان لەگـەڵ بنوێـنرێ؟ دیـارە پێیـان سـەیر بـووە، بۆیـە فەرمویـەتی: ئایـا پێتـان سـەیر بـوو؟!

٢)- هەروەها هەمان ڕستە هەر لە سووڕەتی (**الأعراف**)دا، لەسەر زمانی پێغەمبەر هوود بەرانبەر بە گەلەکەی (عاد) هاتوە: ﴿ أَوَعَجِبْتُمْ أَن جَآءَكُمْ ذِكْرٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنكُمْ لِيُنذِرَكُمْ ... ﴿٦٩﴾ ﴾الأعراف.

واتـە: ئایـا پێتـان سـەیر بـوو، سـەرتان سـوڕما کـە لـە پەروەردگارتانـەوە بیرخەرەوەتـان بـۆ بـێ، بـە پیاوێـك دا لـە خۆتـان، تاکـو بتانترسـێنێ؟

٣)- هەروەها لە سووڕەتی (**یونس**)دا، دەفەرموێ: ﴿ أَكَانَ لِلنَّاسِ عَجَبًا أَنْ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰ رَجُلٍ مِّنْهُمْ أَنْ أَنذِرِ ٱلنَّاسَ وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَنَّ لَهُمْ قَدَمَ صِدْقٍ عِندَ رَبِّهِمْ ۗ قَالَ ٱلْكَٰفِرُونَ إِنَّ هَٰذَا لَسَٰحِرٌ مُّبِينٌ ﴿٢﴾ ﴾یونس.

واتـە: ئایـا بـۆ خەڵـك جێـی سەرسـوڕمان بـوو، کـە سروشـمان کـرد بـۆ پیاوێـك لـە خۆیـان، کـە خەڵـك بترسـێنە و، مـژدە بـدە بەوانـەی بڕوایـان هێنـاوە، کـە لـە لای پەروەردگاریـان

پێشدەستییەکی باشیان هەیە، {پلەو پایەیەکی باشیان بۆ خۆیان پێشخستوە، یاخود: پێگەیەکی باش و پڕ ڕێزو حورمەتیان هەیە}، بێبڕوایەکان گوتیان: ئا ئەوە جادووگەرێکی ئاشکرایە.

٤)- لە سوورەتی (هود)دا دیسان نووح ﷺ، کە بۆ لای گەلەکەی ڕەوان دەکرێ، زلەزلانی گەلەکەی بەمجۆرە دەیدوێنن: ﴿ فَقَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ مَا نَرَىٰكَ إِلَّا بَشَرًا مِّثْلَنَا ...﴿٢٧﴾ ﴾، واتە: دەسترۆیشتووانی بێبڕوا لە گەلەکەی گوتیان: تۆ تەنیا مرۆڤێکی وەك خۆمانی {یانی: لەبەرئەوەی مرۆڤێکی وەك خۆمانی، بڕوات پێ ناهێنین}.

٥)- هەروەها لە سوورەتی (إبراهیم)دا، دەفەرموێ: ﴿ ...قَالُوٓا۟ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا تُرِيدُونَ أَن تَصُدُّونَا عَمَّا كَانَ يَعْبُدُ ءَابَآؤُنَا فَأْتُونَا بِسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ﴿١٠﴾ ﴾.

واتە: بێبڕوایەکان بە پێغەمبەرانیان گوت: ئێوە تەنیا مرۆڤێکن، وەك خۆمان، دەتانەوێ ئەوەی باب و باپیرانمان پەرستوویانە، ئێمەی لێ لابدەن، بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرامان بۆ بێنن.

٦)- هەروەها لە سوورەتی (المؤمنون)، لە بەسەرهاتی (نوح)دا، دەفەرموێ: ﴿ فَقَالَ ٱلْمَلَؤُا۟ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ مَا هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُرِيدُ أَن يَتَفَضَّلَ عَلَيْكُمْ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَأَنزَلَ مَلَٰٓئِكَةً مَّا سَمِعْنَا بِهَٰذَا فِىٓ ءَابَآئِنَا ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٢٤﴾ ﴾.

واتە: بڕیار بەدەستانی بێبڕوا لە گەلەکەی، (واتە: گەلی نووح) گوتیان: ئەمە تەنیا مرۆڤێکی وەك خۆتانە، دەیەوێ خۆیتان بەسەردا پەسند بکات، هەڵبژێرێ، (خۆیتان بەسەردا هەڵکێشێ)، ئەگەر خوا ویستبای: فریشتەی دەناردنە خوار، ئێمە لە نێو باب و باپیرانی پێشوومان دا، شتی وامان نەبیستوە.

هەڵبەتە ڕاستیان نەکردوە، چونکە خوا لە هەموو نێو گەل و نەتەوان دا، پێغەمبەرانی ناردوون، بەڵام ئەوانە نکوولییان لە هەق کردوەو، وەك چۆن بڕوایان بە نووح نەهێناوە، بڕوایان بە پێغەمبەرانی پێشووش هەر نەهێناوە.

٧)- هەروەها هەر لەو بارەوە، لە سوورەتی (المؤمنون)دا، لەسەر زمانی مووساو هاروون دەفەرموێ: ﴿ فَقَالُوٓا۟ أَنُؤْمِنُ لِبَشَرَيْنِ مِثْلِنَا وَقَوْمُهُمَا لَنَا عَٰبِدُونَ ﴿٤٧﴾ ﴾.

واتە: {فیرعەون و دارو دەستەکەی} گوتیان: ئایا بڕوا بێنین بە دوو مرۆڤی وەك خۆمان، کە گەلەکەشیان ملکەچی ئێمەن؟

٨)- هەروەها لە سوورەتی (**الفرقان**)دا دەفەرمویّ: ﴿وَقَالُواْ مَالِ هَٰذَا ٱلرَّسُولِ يَأۡكُلُ ٱلطَّعَامَ وَيَمۡشِي فِي ٱلۡأَسۡوَاقِ لَوۡلَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مَلَكٌ فَيَكُونَ مَعَهُۥ نَذِيرًا ۝٧ أَوۡ يُلۡقَىٰٓ إِلَيۡهِ كَنزٌ أَوۡ تَكُونُ لَهُۥ جَنَّةٌ يَأۡكُلُ مِنۡهَاۚ وَقَالَ ٱلظَّٰلِمُونَ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا رَجُلًا مَّسۡحُورًا ۝٨﴾.

{لێرەدا مەبەست کافرەکانی ڕۆژگاری پێغەمبەری خاتەمە ﷺ} گوتیان: ئەو پێغەمبەرە چییەتی! خواردن دەخواو بە بازاڕاندا دەڕوا، دەبووایە فریشتەیەك لەگەڵی دابەزیبایە کە خەڵکی ترساندبایە، یاخود خەزنەیەکی بۆ دابەزێنرابایە، یاخود باغێکی هەبووایە لێی خواردبایە، هەروەها ستەمکاران گوتیان: ئێوە بەس بە دوای پیاوێکی جادوو لێکراو دەکەون.

کەواتە: ڕاستە گەورەترین کۆسپی بەردەمی بێبڕوایان، بۆ بڕواهێنان بە پێغەمبەران (عَلَيهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام) هەر لە ئادەمەوە تاکو خاتەم، ئەوە بووە کە پێغەمبەران مرۆڤ بوون.

ئنجا بابزانین خوا چۆن وەڵامی ئەوە دەداتەوە؟

## بڕگەی دووەم: وەڵامی خوای زانا وشارەزا بۆ ئەو گرفت و ئیشکالە:

١)- لە سوورەتی (**الأنعام**)دا، خوا دەفەرمویّ: ﴿وَقَالُواْ لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡهِ مَلَكٌۖ وَلَوۡ أَنزَلۡنَا مَلَكًا لَّقُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ ثُمَّ لَا يُنظَرُونَ ۝٨ وَلَوۡ جَعَلۡنَٰهُ مَلَكًا لَّجَعَلۡنَٰهُ رَجُلًا وَلَلَبَسۡنَا عَلَيۡهِم مَّا يَلۡبِسُونَ ۝٩﴾.

واتە: (کافرەکان)، گوتیان: دەبووایە فریشتەیەك دابەزێتە سەری، (بەڵام) ئەگەر فریشتەمان دابەزاندبایە کاریان تێکدەپەڕی و چاوەڕێیان نەدەکرا، {واتە: خوا عادەتی وایە ئەگەر فریشتە دابەزێنێ، بۆ سزادانی ئەو کۆمەڵگایانە دایاندەبەزێنی، بۆیە ئەگەر فریشتەمان بۆ دابەزاندبان، سزامان دەدان و کۆتاییان پێ دەهات و چاوەڕێشیان نەدەکرا} ئەگەر {ئەو پێغەمبەرەی دەینێرین}، کردبامان بە فریشتە، دەبوو ئەو فریشتەیەشمان هێنابا سەر شێوەی پیاوێك، ئەو کاتە ئەوەی کە لە خۆیانی تێکەڵ دەکەن، هەر لێمان تێکەڵ دەکردن.

واتە: ئەوەی ئێستا لە خۆیانی تێکەڵ دەکەن و دەڵێن: ئەی موحەممەد! ﷺ تۆ پێغەمبەری خوا نی، چونکە مرۆڤی، ئەگەر فریشتەیەکیشمان ناردبایە، چونکە فریشتە لەسەر شێوەی خۆیان نابینرێن و لە ماددەییەك دروستکراون، کە بۆ ئێمە نەبینراو و

نابەرهەستە، دەبـوو خـوای بـەرز ومـەزن ئـەو فریشـتەیە بەرێتـە سـەر شـێوەی پیاوێـك، ئنجـا ئـەو پیـاوە فریشـتەییە کـە دەهـات، ئەگـەر گوتبـای: مـن فریشـتەم، دەیانگـوت: ڕاسـت ناکـەی، ئـەوە نیـە تـۆ لەسـەر شـێوەی پیاوێـکی؟ دیسـان لێیـان تێکـەڵ دەبـۆو.

﴿ وَلَلَبَسْنَا عَلَيْهِم مَّا يَلْبِسُونَ ۝٩ ﴾الأنعـام، یـانی: (وَلَخَلَطنَـا عَلَیهـم مَـا یَخلِطُـون)، لێمان تێکـەڵ دەکـردن، ئـەوەی لـە خۆیـانی تێکـەڵ دەکـەن، لـە تەفسـیری سـوورەتی (الأنعـام) دا بـە درێژیـی لـەو بـارەوە باسـمان کـردوە و، لێـرەدا هەڵەیـەکی (هـەژار) مـان[1] لـە تەرجەمـە کوردییەکـەی دا بـۆ قورئـان خسـتۆتە ڕوو، کـە وایزانیـوە: (لَلَبَسْـنَا) بـە مانـای: (أَلْبَسْـنَا)یە، بـەڵام (لَبَـسَ، یَلبِـسُ) یـانی: (خَلَـطَ یَخلِـطُ)، تێکەڵـی کـرد، تێکەڵـی دەکات، بـەڵام (لَبِـسَ، یَلبَـسُ)، واتـە: پـۆشی، دەیپۆشـێ، ئنجـا هـەژار وایزانیـوە: کـە ئـەم (لَبَسَ)یـە بریتیـە لـە (لَبِـسَ)، بۆیـە گوتوویـەتی: پۆشـاکمان پـێ دەپـۆشی، لـەوەی کـە بـۆ خۆیـان دەیپۆشـن! کـە لـە ڕاسـتییدا هـەر بـە لای دا نەچـووە، بەڵکـو (لَبَـس) بـە مانـای (خَلَطَ)یـە، یـانی: لێـمان تێکـەڵ دەکـردن ئـەوەی کـە لـە خۆیـانی تێکـەڵ دەکـەن، وەك چـۆن ئێسـتا هـەق و باتیڵیـان لـە خۆیـان تێکـەڵ کـردوون، ئـەو کاتـەش فریشـتەو مرۆڤیـان لـێ تێکـەڵ دەبـوون، چونکـە ئـەو فریشـتەیە، دەبووایـە چووبایـە سـەر شـێوەی پیاوێـك و، ئـەو کاتـەش ئەگـەر پیاوەکـە گوتبـای: مـن فریشـتەم، دەیانگـوت: نـا، ئـەوە نیـە تـۆش هـەر مرۆڤێـکی وەك ئێمـە!

٢)- وەڵامی دووەمی خوای پەروەردگار لە سوورەتی (الفرقان)دا، دەفەرموێ:

﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ إِلَّآ إِنَّهُمْ لَيَأْكُلُونَ ٱلطَّعَامَ وَيَمْشُونَ فِى ٱلْأَسْوَاقِ ۗ وَجَعَلْنَا بَعْضَكُمْ لِبَعْضٍ فِتْنَةً أَتَصْبِرُونَ ۗ وَكَانَ رَبُّكَ بَصِيرًا ۝٢٠ ﴾

لەوەڵامـی ئـەو قسـەیان دا کـە ئـەوان گوتوویانـە: ئـەو پێغەمبـەرە چییـەتی؟ خـواردن دەخـوات و بـە بـازاڕدا دەڕوات؟ واتـە: کار و کەسابەت دەکا! خـوا دەفەرمـوێ: لـە پێـش تـۆدا هیـچ کام لـە پێغەمبەرانمـان نەنـاردوە، مەگـەر خواردنیـان خـواردوە {واتـە: مرۆڤـی ئاسـایی بـوون} و بـە بازاڕانـدا ڕۆیشـتوون و، هەندێکتـان بـە هەندێکتـان تاقـی دەکەینـەوە، تاکـو بزانیـن ئایـا خۆڕاگـر دەبـن؟ بێگومـان پەروەردگاریشـت بینـەرە.

واتـە: بینـەری حـاڵ و بـاس و خـواسی مرۆڤەکانـە، ئەگەرنـا پێغەمبـەران (عَلَیهِـمُ الصَّـلاةُ

---

(١) هەژار موکریانیی، کە بە (مام هەژار) و (مامۆستا هەژار) ناسراوە.

وَالسَّلام)، مرۆڤ بوون و، کە مرۆڤیش بوون، دەبێ بخۆن و بخۆنەوە و، کارو کەسابەت بکەن و، دەبێ ساغ بن و نەخۆش بن و، دەبێ هەموو ئەو شتانەی بەسەر مرۆڤەکان دێن، بەسەر وانیش بێن.

٣)- وەڵامێکی دیکە، لە سوورەتی (الإسراء)دا، هاتوە: ﴿ قُل لَّوْ كَانَ فِي الْأَرْضِ مَلَائِكَةٌ يَمْشُونَ مُطْمَئِنِّينَ لَنَزَّلْنَا عَلَيْهِم مِّنَ السَّمَاءِ مَلَكًا رَّسُولًا ﴿٩٥﴾ ﴾، واتە: بڵێ: ئەگەر لەسەر زەوی فریشتەی لێبوونایە، بە ئارامیی بەسەر زەوییدا ڕۆیبانایە، ئەو کاتە لە ئاسمانێوە پێغەمبەرێکی فریشتەمان دادەبەزاندە سەریان.

بەڵام مادام سەر زەوی مرۆڤی لێن، دەبێ مرۆڤێکی وەك خۆشیان خوا بیکاتە نوێنەر و پێغەمبەری خۆی و، پەیام و بەرنامەی خۆی پێدا بنێرێ.

کەواتە: دەبێ پێغەمبەر ﷺ لە جۆری بۆ لا ڕەوانەکراوان بێ، تاکو لە یەکدی تێبگەن، هەروەها هەمان سروشتیان هەبێ و، بیانوویان نەبێ، چونکە ئەگەر خوای پەروەردگار فریشتەیەکی کردبایە پێغەمبەر، هەر کەس گوتبای: خوا بپەرستن، بەڕۆژو و بن، چاکە بکەن، وا بکەن، وا مەکەن، دەیانگوت: تۆ بۆیە بۆت دەکرێ، چونکە فریشتەی، تۆش با وەك ئێمە مرۆڤ بای، ئەو کاتە تۆش وەك ئێمە بۆت نەدەکرا! یانی: بیانوویان دەبوو، بەڵام ئێستا خوای کارزان و میهرەبان پێغەمبەرانێکی ناردوە، کە وەك خۆیان: خوێن و گۆشتن، ڕووح و جەستەن، سەرمایان دەبێ، گەرمایان دەبێ، بە خۆشیی دڵخۆشن، بە ناخۆشیی دڵناخۆشن، هەست بە ئازار دەکەن، هەست بە خۆشیی دەکەن، وەك سەرجەم مرۆڤەکانن.

کەواتە: کاتێ دەبنە پێشڕەو وسەرمەشقیان لە چاکەدا و، لە واز هێنان لە خراپەدا، بیانوویان نیە بڵێن: ئێمە وەك ئێوەمان بۆ ناکرێ، چونکە پێغەمبەرانیش وەك ئەوان مرۆڤن، صەڵات و سەلامی خوا لەسەر هەموو پێغەمبەران بێ.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# پێناسەی ئەم دەرسە

لەم دەرسەدا ماناو مەبەستی هەشت (٨) ئایەت ڕوون دەکەینەوە، ئایەتەکانی: (٩٧ - ١٠٤) ئەو هەشت (٨) ئایەتەش دوو تەوەری سەرەکییان هەن:

**تەوەری یەکەم:** لە چوار ئایەتی پێشەوەدا، چەند ڕاستییەکی مەزن باسکراون:

١ - خستنە سەر ڕاستە ڕێ و گومڕا کردنی خوا بۆ خەڵك، هەر کەسە بەپێی شایستەیی خۆی.

٢ - هەروەها سەرەنجامی شوومی بێبڕوایان.

٣ - ئنجا توانایی بێ سنووری خوا، بۆ زیندوو کردنەوەی مردووان.

٤ - دەوڵەمەندیی و بێ نیازیی خوا.

٥ - هەروەها خاوەنداریێتیی ڕەهای خوا بۆ عەمبارەکانی و، بە پێچەوانەشەوە: چرووکیی و ڕژدیی بێبڕوایان بە تایبەت و، مرۆڤەکان بە گشتی لە ئاست بەخشیندا.

**تەوەری دووەم:** کە چوار ئایەتی دووەم پێك دێنن، لەو هەشت ئایەتە، چوار مەسەلە باسکراون:

١ - نێردرانی مووسا سەلامی خوای لێبێ بە نۆ (٩) بەڵگەو نیشانەوە بۆ لای فیرعەون و گەلەکەی.

٢ - تۆمەتبار کردنی فیرعەون بۆ مووسا، بەوە کە جادوو لێکراوە و، وەڵامدانەوەی مووسا بۆ فیرعەون و ترساندنی.

٣ - پاشان ناچار کردنی فیرعەن بۆ بەنی ئیسرائیل - گەلە چەوسێنراوەکەی مووسا، لەو کاتەدا - کە سەرزەمینی میسر جێبێڵن و، سەرەنجام نغرۆکرانی فیرعەون و، دارو دەستەکەی لە دەریای سووردا.

٤ - نیشتەجێ کرانی گەلی بەنو ئیسرائیل لە سەرزەمینی شامدا و، پێڕاگەیاندنیان کە لە کاتی هاتنی بەڵێنی دواجار، یان ڕۆژی دواییدا، هەموویان ڕەپێچەك دەدرێن و دەبرێنە گۆڕەپانی لێپرسینەوەو سزاو پاداشت.

﴿ وَمَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلْمُهْتَدِ ۖ وَمَن يُضْلِلْ فَلَن تَجِدَ لَهُمْ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِهِۦ ۖ وَنَحْشُرُهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ عُمْيًا وَبُكْمًا وَصُمًّا ۖ مَّأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ كُلَّمَا خَبَتْ زِدْنَـٰهُمْ سَعِيرًا ﴿٩٧﴾

ذَٰلِكَ جَزَآؤُهُم بِأَنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا وَقَالُوٓا۟ أَءِذَا كُنَّا عِظَٰمًا وَرُفَٰتًا أَءِنَّا لَمَبْعُوثُونَ خَلْقًا جَدِيدًا ﴿٩٨﴾ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّ ٱللَّهَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ قَادِرٌ عَلَىٰٓ أَن يَخْلُقَ مِثْلَهُمْ وَجَعَلَ لَهُمْ أَجَلًا لَّا رَيْبَ فِيهِ فَأَبَى ٱلظَّٰلِمُونَ إِلَّا كُفُورًا ﴿٩٩﴾ قُل لَّوْ أَنتُمْ تَمْلِكُونَ خَزَآئِنَ رَحْمَةِ رَبِّىٓ إِذًا لَّأَمْسَكْتُمْ خَشْيَةَ ٱلْإِنفَاقِ ۚ وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ قَتُورًا ﴿١٠٠﴾ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَىٰ تِسْعَ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ ۖ فَسْـَٔلْ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِذْ جَآءَهُمْ فَقَالَ لَهُۥ فِرْعَوْنُ إِنِّى لَأَظُنُّكَ يَٰمُوسَىٰ مَسْحُورًا ﴿١٠١﴾ قَالَ لَقَدْ عَلِمْتَ مَآ أَنزَلَ هَٰٓؤُلَآءِ إِلَّا رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ بَصَآئِرَ وَإِنِّى لَأَظُنُّكَ يَٰفِرْعَوْنُ مَثْبُورًا ﴿١٠٢﴾ فَأَرَادَ أَن يَسْتَفِزَّهُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ فَأَغْرَقْنَٰهُ وَمَن مَّعَهُۥ جَمِيعًا ﴿١٠٣﴾ وَقُلْنَا مِنۢ بَعْدِهِۦ لِبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱسْكُنُوا۟ ٱلْأَرْضَ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ ٱلْـَٔاخِرَةِ جِئْنَا بِكُمْ لَفِيفًا ﴿١٠٤﴾ ﴾.

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

{هەر کەسێکیش خوا ڕاستەڕێی بکات، هەر ئەو ڕێی ڕاستگرتوویەو، هەرکەسێکیش گومڕای بکات، هیچ دۆست و پشتیوانت بۆیان جگە لەوی، چنگ ناکەون و، ڕۆژی قیامەتیش بە کوێریی و لاڵیی و کەڕیی لەسەر ڕوویان دەیانڕۆینین و، کۆیان دەکەینەوەو، ڕاپێچیان دەکەین، جێی حەوانەوەیان دۆزەخە، هەر کە ئاگرەکە دامرکا، بڵێسەیان بۆ زیاد دەکەین ﴿٩٧﴾ ئەو سزایەشیان لە سۆنگەی ئەوەوەیە کە بڕوایان بە ئایەتەکانمان نەکردو گوتیان: ئایا ئەگەر بووینە ئێسك و پڕووسك و وردو خاش بووین، لەشێوەی دروستکراوێکی تازەدا، زیندوو دەکرێینەوە؟! ﴿٩٨﴾ ئایا (بە چاوی عەقڵ و دڵ) نەیاندیوە کە ئەو خوایەی ئاسمانەکان و زەوی هێناونەدی، لەسەر دروستکردنی وێنەی وان توانایەو، کاتێکی دیاریی کراویشی (بۆ ژیاندنەوەیان) داناوە، هیچ گومانی تێدانیە! کەچی ستەمکاران هەر سپڵەییان ویست ﴿٩٩﴾ بڵێ: ئەگەر ئێوە خاوەنی عەمبارەکانی بەزەیی پەروەردگاریشم بوونایە، لە ترسی (تەواو بوون و بڕان) دەستتان دەگرتەوەو، ڕژدییتان دەکردو، مرۆڤی (بێبڕواش) زۆر چرووکە ﴿١٠٠﴾ هەروەها بە دڵنیایی نۆ نیشانە و بەڵگەی ئاشکرامان بە مووسا دابوون (بۆ سەلماندنی ڕاستیی خۆی) لەو بارەوە لەوەچەی ئیسرائیل بپرسە، کاتێك کە (مووسا) چووە لایان، یەکسەر فیرعەون پێی گوت: ئەی مووسا! پێم وایە جادوو لێکراوی! ﴿١٠١﴾ (مووسا) گوتی: تۆ دەزانی کە ئەو (نیشانەو بەڵگ)انە

تەنیا پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی، بەڕوونکەرەوەو بەرچاوڕوونیی دایبەزاندوون و، ئەی فیرعەون! من بە فەوتاوت دەزانم (١٠٢) ئنجا (فیرعەون) ویستی هەڵیانپێچێ و لە زەوی (میسر) وەدەریان بنێ، ئێمەش یەکسەر خۆی و تێکڕای ئەوانەی لەگەڵی بوون، نغرۆمان کردن (لە دەریای سووردا) (١٠٣) دوای ویش بە وەچەی ئیسرائیلمان فەرموو: لە زەوی شامدا نیشتەجێ بن، ئنجا هەر کات (کاتی) بەڵێنی دواجار (یان دواڕۆژ) هات، بەڕێکدراویی دەتانهێنین (بۆ گۆڕەپانی قیامەت) (١٠٤) }.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(عُمْيًا وَبُكْمًا وَصُمًّا): (**عُمِي جَمْعُ أَعْمَى، وَبُكْم جَمْعُ أَبْكَم، وَصُمّ جَمْعُ أَصَم**)، وشەی (**عُمِي**) واتە: کوێرەکان، کۆی (**أَعْمَى**)یە یانی: کوێر، (**بُكْم**) واتە: لاڵەکان، کۆی (**أَبْكَم**)ە، یانی: لاڵ، (**صُم**) واتە: کەڕەکان، کۆی (**أَصَم**)ە، یانی: کەڕ.

(خَبَتْ): (**خَبَتِ النَّار تَخْبُو: سَكَنَ لَهَبُهَا وَصَارَ عَلَيْهَا خِبَاءٌ مِنْ رَمَاد أَي: غِشَاء**)، (**خَبَتِ النَّار تَخْبُو**) واتە: ئاگرەکە دامرکا، بڵێسەکەی نیشتەوە، لەوەوە هاتوە وەك: چادرێك خۆڵەمێشی بەسەردا دەدرێ، پەردەیەکی دەکەوێتە سەر لە شوێنەواری ئەو ماددەیەی کە سووتێنراوە و دەبێتە خۆڵەمێش و دایدەپۆشێ.

(سَعِيرًا): (**سعير**) واتە: بڵێسە، کڵپە، (**السَّعْرُ: إِلتِهَابُ النَّارِ، سَعَرْتُهَا وَسَعَّرْتُها وَأَسْعَرْتُهَا**)، واتە: بڵێسەم دایە، یان کڵپەم پێ سەند، (**والمِسْعَر: الخَشْبُ الَّذي يُسْعَرُ بِهِ**)، (**مِسْعَر**) ئەو بزووتەیە، یان ئەو دارەی کە ئاگرەکەی پێ خۆش دەکرێ و پێی، تێی وەردەدرێ، بۆ ئەوەی بجووڵێ و زیاتر بڵێسەی بەرز بێتەوە، (**فَهُوَ فِعِيلٌ بِمَعْنَى مَفْعُول**) واتە: بڵێسەدار، (**سعير**) لەسەر کێشی (**فعيل**)ە، بەڵام بە مانای (**مفعول**)ە، واتە: بڵێسەدار کراو.

(وَرُفَاتًا): (**رَفَتُّ الشَّيءَ، أَرْفَتُهُ رَفْتاً: أي فَتَتُّهُ، وَالرُّفَاتُ والفُتَاتُ: مَا تَكَسَّرَ وَتَفَرَّقَ مِنَ التِّبْنِ وَغَيْرِه**)، (**رَفَتُّ الشَّيءَ، أَرْفَتُهُ رَفْتاً**) واتە: ئەو شتەم وردو خاش کرد، تێکمگوشی، هەر شتێك کە تێك بشکێنرێ و پارچە پارچە بکرێ، ئنجا کاو کۆتە، گیاو گۆڵە، هەر شتێك بێ کە پارچە پارچە بکرێ بەبەشەکانی دەگوترێ: (**فُتات**) یاخود (**رُفات**).

(قَتُورًا ): (القَتْرُ: تَقْلِيلُ النَّفَقَةِ، وَهُوَ بِإِزَاءِ الإِسْرَافِ، قَتَرْتُ الشَّيءَ، وَأَقْتَرْتُهُ وَقَتَّرْتُهُ، أَي: قَلَّلْتُهُ، وَمُقْتِر، أَي: فَقِير)، (قَتْر) بریتیە لە کەمکردنەوەی بەخشین، یان کەمکردنەوەی ماڵ خەرج کردن، کە لە بەرانبەری (**إسراف**) دایە، (**إسراف**) واتە: زێدەڕۆیی، (**تقتير**) بە مانای دەستگرتنەوە، (**قَتَرْتُ الشَّيءَ، وَأَقْتَرْتُهُ وَقَتَّرْتُهُ**) هەر سێکیان بە مانای کەمم کردەوە، دێن (**مُقْتِر**)یش واتە: بابای هەژار، کە کەمی هەیە.

(بَصَآئِرَ ): (**جمع بصيرة، وَهِيَ قُوَّة الإِدْرَاكِ وَالفِطْنَةِ، وَالبَصِيْرَةُ: العِلْمُ، وَالخُبْرَةُ، وَالبَصِيْرَةُ: الحُجَّة، والبَصِيْرَةُ: الرَّقِيبُ، والبَصِيْرَةُ: العِبْرَةُ**) وشەی (**بصيرة**) بە چەند واتایەك هاتوە و لە ئەصڵدا بەمانای هێزی زانین و پەیپێبردنە، (**بصر**) واتە: بینین، بەڵام (**بصيرة**) واتە: شت زانین و دەرککردنی شت، بەڵام دوایی دەخوازرێتەوە و بە بەمانای زانست بەکاردێ، هەروەها بە مانای شارەزایی و، چاودێر و، پەندو عیبرەتیش بەکار دێ.

(مَثْبُورًا ): (**ثَبَرَ ثَبْراً وَثُبوراً: هَلَكَ**) (**ثَبَرَ**) چاوگەکەی هەم بە (**ثَبْر**) هاتوە، هەم بە (**ثُبور**) هاتوە، بە مانای فەوتاو.

(لَفِيفًا ): (**اللَّفِيفُ: مَا اجْتَمَعَ مِنَ النَّاسِ مِنْ قَبَائِل شَتَّى، أَو مِنْ أَخْلاَطٍ شتّى** (جئنا بكم لفيفاً) **أي: مُجْتَمِعِيْن، مُخْتَلِطِين**)، (**لَفِيف**) هەر کۆمەڵە خەڵکێکە کە لە هۆزانی جیا جیا، یاخود لە شتی تێکەڵی جیاجیا کۆبنەوە، کەواتە: (جئنا بكم لفيفاً) واتە: خڕتان دەکەینەوە، بە ئاوێتەو بە تێکەڵیی دەتانهێنین.

## مانای گشتی ئایەتەکان

وەك لە پێناسەی ئەم دەرسەدا گوتمان: ئەم هەشت (٨) ئایەتە دوو تەوەر پێك دێنن:

**تەوەری یەکەمیان:** خوا چەند ڕاستییەك دەخاتە ڕوو، لە چوار (٤) ئایەتی یەکەمدا، سەرەتا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلْمُهْتَدِ ﴾، هەر کەسێکیش خوا ڕاستە ڕێی بکات، هەر ئەو ڕێی ڕاستگرتوویە، بە دڵنیاییەوە لێرەدا مەبەست لە (يَهْدِ) واتە: بیخاتە سەر ڕاستە ڕێ، ڕاستە ڕێی بکات، نەك بە مانای: ڕێی پیشان بدات، چونکە خوا ڕێگای پیشانی هەموو کەس داوە، وەك دواتریش باسی دەکەین، بۆیە دەبێ ورد بین لە سەرنجدانی وشەکانی قورئان، جاری وایە وشەیەك بەچەند واتایەك دێ، بەڵام بەپێی سیاقەکە، یەکێ لە واتاکانی دیاریی دەکرێ، لێرەدا: ﴿ وَمَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلْمُهْتَدِ ﴾، بە مانای ئەوە نیە، هەر کەسێ خوا ڕێنمایی بکات، ئەو کەسە ڕێنمایی کراوە! نا، بەڵکو یانی: هەر کەسێك خوا ڕاستە ڕێی بکات و بیخاتە سەر ڕێی ڕاست، ئەو کەسە ڕێی ڕاستی گرتوە، ﴿ وَمَن يُضْلِلْ فَلَن تَجِدَ لَهُمْ أَوْلِيَآءَ ﴾، هەر کەسێکیش خوا گومڕای بکات، ئەوە تۆ جگە لە خوا، بۆ وی، هیچ سەرپەرشتیارو دۆست و نیزیکت چنگ ناکەون، کە لە گومڕایی دەربازی بکەن، خواش ﷻ وەك زۆر جاران گوتوومانە: نە لە گۆترە کەس دەخاتە سەر ڕاستە ڕێ، نە لە گۆترەش کەس سەرلێدەشێوێنێ و گومڕا دەکات، بۆیە لێرەش گوتمان: لە ڕستەی: ﴿ وَمَن يَهْدِ ٱللَّهُ ﴾دا، مەبەست لە ﴿ يَهْدِ ﴾، ڕێپێشاندان نیە، بەڵکو بە مانای: خستنە سەر ڕێیە، هەروەك ﴿ يُضْلِلْ ﴾یش، واتە: ڕێ لێ تێکدان و گومڕا کردن، خواش لە گۆترە کەس ناخاتە سەر ڕاستە ڕێ، هەروەها لە گۆترەش سەر لە کەس ناشێوێنێ، بەڵکو کەسێ شایستەی ئەوەبێ خوا بیخاتە سەر ڕاستە ڕێ و، هیدایەتێك کە خوا ناردوویەتی، قبووڵی بکات، خواش دڵی وەردەچەرخێنێ بەرەو گوێڕایەڵیی خۆی و، دەستی دەگرێ و لوتفی لەگەڵ دەنوێنێ، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ ٱهْتَدَوْا۟ زَادَهُمْ هُدًى وَءَاتَىٰهُمْ تَقْوَىٰهُمْ ﴿١٧﴾ ﴾محمد، واتە: ئەوانەی کە هیدایەتی خۆیان وەرگرتوە، خوا هیدایەتیان بۆ زیاد دەکات و، پارێزکارییان پێ دەبەخشێ.

بەڵام بە نسبەت گومڕا کردنەوە، خوای دادگەر دەفەرموێ: ﴿ وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيْنَٰهُمْ فَٱسْتَحَبُّوا۟ ٱلْعَمَىٰ عَلَى ٱلْهُدَىٰ ﴿١٧﴾ ﴾فصلت، واتە: بەڵام گەلی سەموود، ئێمە ڕێنماییمان کردن (هديناهم) لێرەدا بەمانای: {ڕێنماییمان کردن} دێ، بەڵام ئەوان کوێرییان هەڵبژارد

بەسەر بەرپێی خۆ بینین و، ڕێنمایی خوادا، یان وەك دەفەرمووێ: ﴿وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّٰلِمِينَ ۝٢٧﴾ إبراهیم، خوا ستەمکاران گومڕا دەکات.

ئنجا دەفەرمووێ: ﴿وَنَحۡشُرُهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمۡ عُمۡيٗا وَبُكۡمٗا وَصُمّٗا﴾ الإسراء، لەڕۆژی هەڵسانەوەدا (لەڕۆژی قیامەتدا) کۆیان دەکەینەوە لەسەر ڕوویان {واتە: لەسەر ڕوویان دەیانڕۆێنین} کۆیان دەکەینەوە بە کوێریی و بەلاڵیی و بە کەڕیی.

واتە: ئەوانە کە کۆیان دەکەینەوە، هەم کوێرن، هەم لاڵن، هەم کەڕن، ﴿مَّأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُۖ﴾، جێی حەوانەوەیان دۆزەخە ﴿كُلَّمَا خَبَتۡ زِدۡنَٰهُمۡ سَعِيرٗا﴾، واتە: هەر کاتێك ئاگرەکەی دامرکا، خامۆش بوو، ئێمە بڵێسەیان بۆ زیاد دەکەین، یانی: بۆ ئەوان بڵێسەی زیاد دەکەین، دواتر لە مەسەلە گرنگەکان دا زیاتر تیشك دەخەینە سەر ئەو تەعبیرە، بۆچی خوا نافەرمووێ: (**زدناها سعیراً**) ئاگرەکەمان کڵپە بۆ زیاد کرد؟ چونکە ئاگرەکە کڵپەی هەر هەیە، بەڵام بە نسبەت ئەوانەوە کە پێی سزا دەدرێن، بڵێسە و کڵپەکەی زیاد دەکرێ.

﴿ذَٰلِكَ جَزَآؤُهُم﴾ ئا ئەوە سزایانە، (**جزاء**) بە مانای قەرەبوو دێ، کە بەپێی سیاقەکە دەزانین، لێرەدا (**جَزَآؤُهُم**) بە مانای سزایە، ئەگەرنا بە نسبەت ئەهلی ئیمانەوە (**جزاؤهم**) یانی: پاداشتیان، ئێمە لە کوردییدا وشەیەکمان نیە پڕ بە پێستی (**جزاء**) بێ، مەگەر بڵێین: قەرەبوو، یان بەرانبەر، ئەگەرنا بۆ خراپەکاران دەڵێین: سزا و، بۆ چاکەکاران دەڵێین: پاداشت.

ئا ئەوە سزایانە، لەبەرچی؟ ﴿بِأَنَّهُمۡ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِنَا﴾، لە سۆنگەی ئەوەوە کە بێبڕوا بوون بە نیشانەکان و ئایەتەکانی ئێمە، ﴿وَقَالُوٓاْ أَءِذَا كُنَّا عِظَٰمٗا وَرُفَٰتًا﴾، هەروەها گوتیان: ئایا ئەگەر ئێمە بووینەوە ئێسك و پرووسکی وردو خاش، ﴿أَءِنَّا لَمَبۡعُوثُونَ خَلۡقٗا جَدِيدٗا﴾، ئایا ئێمە لە شێوەی دروستکراوێکی نوێدا، زیندوو دەکرێینەوە!! بەسەر سوڕمانەوە وایان گوت، کە ئەو پرسیارە، پرسیار کردنی نکووڵییلێکەرانەیە.

خوا وەڵامیان دەداتەوە، دەفەرمووێ: ﴿أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّ ٱللَّهَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ قَادِرٌ عَلَىٰٓ أَن يَخۡلُقَ مِثۡلَهُمۡ﴾، ئایا سەرنجیان نەداوە، نەیانبینیوە {واتە: بە چاوی عەقڵ و دڵ} ئەو خوایەی ئاسمانەکان و زەوی هێناونە دی، توانایە کە وێنەی ئەوانیش بێنێتە دی؟ ﴿وَجَعَلَ لَهُمۡ أَجَلٗا لَّا رَيۡبَ فِيهِ﴾، هەروەها کاتێکی دیاریی کراوی بۆ داناون، کە هیچ گومان و دوو دڵیی تێدانیە ﴿فَأَبَى ٱلظَّٰلِمُونَ إِلَّا كُفُورٗا﴾، کەچی ستەمکاران ملیان نەدا، مەگەر بۆ سپڵەیی و ناسپاسیی، واتە: هیچیان قبووڵ نەکرد، جگە لە ناسپاسیی.

﴿ قُل لَّوۡ أَنتُمۡ تَمۡلِكُونَ خَزَآئِنَ رَحۡمَةِ رَبِّيٓ ﴾، بڵێ: ئەگەر ئێوە عەمبارەکانی بەزەیی پەروەردگاریشمتان هەبن.

﴿ إِذٗا لَّأَمۡسَكۡتُمۡ خَشۡيَةَ ٱلۡإِنفَاقِۚ وَكَانَ ٱلۡإِنسَٰنُ قَتُورٗا ﴾، ئەو کاتەش لەترسی بڕان، لە ترسی تەواو بوون، دەستتان دەگرتەوە لە بەخشین، (وَكَانَ ٱلۡإِنسَٰنُ قَتُورٗا) مرۆڤیش بە گشتی {بە تایبەت مرۆڤی بێبڕوا} چرووك و ڕژدە، مرۆڤ بە گشتی لە بەرانبەر خوادا و لە چاو خوا، ڕژدو چرووکە، مرۆڤی بێبڕواش، ڕژدو چرووکە لە چاو مرۆڤە بڕوادارو دڵفراوان و بەخشندەکان.

**تەوەری دووەم:** کە چوار ئایەتی کۆتایی ئەم دەرسەی بۆ تەرخانکراون، باسی بەسەرهاتی مووسایە عليه السلام بە کورتیی و پوختیی، چونکە وەك جاری دیکەش باسمان کردوە: هەموو ئەو مەبەستانەی کە خوا جل جلاله لە سوورەتەکانی پێشوودا {واتە: ئەو سوورەتانەی پێش ئەم سوورەتە، لە ڕیزبەندیی دابەزیندا} باسی کردوون، دوایی بەکورتیی و ئاماژە ئاسا باسیان دەکات، بەسەرهاتی مووساش عليه السلام کە لە چەند شوێنی دیکەدا باسکراوە، لێرەدا تەنیا ئاماژەیەکی کورتی پێ دەکاتەوە و، دەفەرمووێ: ﴿ وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَىٰ تِسۡعَ ءَايَٰتِۭ بَيِّنَٰتٖۖ ﴾، واتە: بە دڵنیاییەوە نۆ نیشانەی ڕوون و ئاشکرامان، بە مووسا دان، کە هەر کام لەو نیشانانە بەڵگە بوو لەسەر ڕاستیی مووسا عليه السلام، ﴿ فَسۡـَٔلۡ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ﴾، لێرەدا: ڕووی دواندن لە پێغەمبەرە ﷺ، هەروەها هەر کەسێکیش کە قورئان دەخوێنێ:

لە وەچەی ئیسرائیل بپرسە، لە گەلی جوولەکە بپرسە، چونکە ئەوە لە کتێبەکانی ئەوانیشدا هەیە، وەك دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا باسی دەکەین و پێشتریش بە دوورو درێژیی باسمان کردوە، ﴿ إِذۡ جَآءَهُمۡ ﴾، کاتێ (مووسا) چوو بۆ لایان، بە نۆ نیشانەکەوە، ﴿ فَقَالَ لَهُۥ فِرۡعَوۡنُ إِنِّي لَأَظُنُّكَ يَٰمُوسَىٰ مَسۡحُورٗا ﴾، فیرعەون پێی گوت: ئەی مووسا! من پێم وایە جادوولێکراوی، واتە: جادوویان لێکردووی و تێك چووی.

مووسا عليه السلام وەڵام دەداتەوە و دەفەرمووێ: ﴿ قَالَ لَقَدۡ عَلِمۡتَ مَآ أَنزَلَ هَٰٓؤُلَآءِ إِلَّا رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ بَصَآئِرَ ﴾، گوتی: تۆ دڵنیای و دەزانی کە ئا ئەوانە {ئەو نۆ نیشانانە} جگە لە پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی، هیچ کەس داینەبەزاندوون، کە هەر کامێك لەوانە: ڕێگا نیشاندەرە، زانستە، عیبرەتە، ﴿ وَإِنِّي لَأَظُنُّكَ يَٰفِرۡعَوۡنُ مَثۡبُورٗا ﴾، ئەی فیرعەون! من بە لەبەینچوو و فەوتاوت تێدەگەم.

(**ظن**) لێرەدا دەبێ بە مانای دڵنیایی بێ، یان بە مانای زانیاریی بێ، واتە: من دەزانم کە تۆ فەوتاویی و سەر بە فەتارەت چووی، خوای پەنهانزان مووسای دڵنیا کردۆتەوە، کە ئەگەر فیرعەون هەر ملی نەدا، خۆی و سوپا سەرکەشەکەی دەفەوتێن.

﴿ فَأَرَادَ أَن يَسْتَفِزَّهُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ ﴾، فیرعەون ویستی لە زەویدا هەڵیانپێچێ، هەڵیانبقەنێ، ناچار و، بێزاریان بکات، بۆ ئەوەی خۆیان بڕۆن، ﴿ فَأَغْرَقْنَٰهُ وَمَن مَّعَهُۥ جَمِيعًا ﴾، [کە دوایی گەلی ئیسرائیل ناچار بوون سەرزەمینی میسر بەجێ بهێڵن و شەبەیخوونێك ڕۆیشتن و فیرعەون و دارو دەستەکەشی کەوتنە شوێنیان، وەك لە تەفسیری سوورەتی (الأعراف)دا، بە تەفصیل باسمان کردوە] سەرەنجام هەموو ئەوانەی لەگەڵی دابوون و خۆیشیمان نغرۆ کردو خنکاندمانن {لە دەریای سووردا} ﴿ وَقُلْنَا مِنۢ بَعْدِهِۦ لِبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱسْكُنُوا۟ ٱلْأَرْضَ ﴾، دوای ویش بە گەلی ئیسرائیلمان گوت: (ٱسْكُنُوا۟ ٱلْأَرْضَ) لەسەر زەوی نیشتەجێ بن.

(ٱلْأَرْضَ) ئەو (ال)ەی کە لەسەریەتی، بۆ ناساندنە و مەبەست پێی (**عَهْد**)ە یانی: ئەو سەرزەمینەی کە دەزانین، سەرزەمینی شام، نەك مەبەستی پێ ڕەگەزی زەوی بێ، بەڵکو مەبەست زەوییەکی دیاریی کراوە، کە سەر زەمینی شامە و، پێشتر بۆیان دیاریی کراوە، ﴿ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ ٱلْءَاخِرَةِ جِئْنَا بِكُمْ لَفِيفًا ﴾،

ئەمە دوو واتای هەن:

أ - ئنجا هەر کاتێ بەڵێنی ڕۆژی دوایی هات، هەمووتان خڕدەکەینەوە و ڕەپێچەکتان دەدەین بەرەو گۆڕەپانی مەحشەر.

ب - یاخود: هەر کاتێك بەڵێنی دواجار، هات، بەڵێنی یەکەمجار و دواجاریش پێشتر لە سەرەتای تەفسیری ئەم سوورەتەدا باسمان کردن، بە تەفصیل، لە تەفسیری ئەو ئایەتەدا کە دەفەرموێ: ﴿ لَتُفْسِدُنَّ فِى ٱلْأَرْضِ مَرَّتَيْنِ وَلَتَعْلُنَّ عُلُوًّا كَبِيرًا ﴿٤﴾ ﴾الإسراء، دووجاران خراپەکاریی و تێکدان و خۆ بەرز کردنەوە و ستەم دەکەن، لە زەویدا.

ئنجا بەڕای بەشێك لە زانایان، جارێك لەو دوو تێکدانانە، تێپەڕیوە و جاری دووەمی ماوە، خواش دەفەرموێ: ئنجا ئەگەر بەڵێنی جاری دووەم هات: ﴿ جِئْنَا بِكُمْ لَفِيفًا ﴾، هەمووتان ڕەپێچەك دەدەین و، کۆتان دەکەینەوە و دەتانبەینە سەر زەمینی شام، بۆ ئەوەی لەوێش قەوارەیەکی ستەمکارانە بنیات بنێن و، سەرەنجام شایستەی ئەوەبن: خوا سزاتان بدات و، بەڵێنی سزادانی جاری دووەمیشتان بەسەردا بچەسپێنێ، ئەو ئایەتە ئەم دوو واتایەی هەن، لە مەسەلە گرنگەکانیشدا زیاتر تیشکی دەخەینە سەر.

# مەسەلە گرنگەكان

## مەسەلەی یەكـــەم:

هـەر كەسێكیش خـوا ڕاسـتەڕێی بـكات، هـەر ئـەو ڕێـی ڕاسـتگرتوویە هـەر كەسێكیش گومـڕای بـكات، جگـە لـەوی هیـچ دۆسـتت بۆیـان چنـگ ناكـەون، ڕۆژی قیامەتیـش لەسـەر ڕوویـان دەیانڕۆێنیـن: كوێرانـەو، لاڵانـەو، كەڕانـە، خڕیـان دەكەینـەوە، جێگایـان دۆزەخـە، هەركـە ئاگرەكـە دامـركا، نێڵـی دەدەیـن و، كڵپەیـان بـۆ زیـاد دەكەیـن، ئـەو سزایەشـیان لـە سـۆنگەی ئەوەوەیـە كـە بـە نیشـانەكانمان بێبـڕوا بـوون، {یـان بـە ئایەتـە خوێـنراوەكان}، گوتیـان: ئایـا ئەگـەر بووینـە ئێسـك و پروسـك و ورد و خـاش بوویـن، بـە دروسـتكراوێكی تـازە دەژیەینـەوە؟ ئایـا نەیاندیـوەو نازانـن: خوایـەك كـە ئاسـمانەكان و زەوی هێناونـە دی، توانایـە كـە وێنـەی ئەوانیـش دروسـت بـكات و، كاتێكـی گومـان لێنەكراویشـی بـۆ دانـاون كەچـی ستەمكاران هـەر ناسپاسییان ویسـت:

خــوا فەرموویــەتی: ﴿ وَمَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلْمُهْتَدِ ۖ وَمَن يُضْلِلْ فَلَن تَجِدَ لَهُمْ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِهِۦ ۖ وَنَحْشُرُهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ عُمْيًا وَبُكْمًا وَصُمًّا ۖ مَّأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ كُلَّمَا خَبَتْ زِدْنَـٰهُمْ سَعِيرًا ﴿٩٧﴾ ذَٰلِكَ جَزَآؤُهُم بِأَنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا وَقَالُوٓا۟ أَءِذَا كُنَّا عِظَـٰمًا وَرُفَـٰتًا أَءِنَّا لَمَبْعُوثُونَ خَلْقًا جَدِيدًا ﴿٩٨﴾ ۞ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّ ٱللَّهَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ قَادِرٌ عَلَىٰٓ أَن يَخْلُقَ مِثْلَهُمْ وَجَعَلَ لَهُمْ أَجَلًا لَّا رَيْبَ فِيهِ فَأَبَى ٱلظَّـٰلِمُونَ إِلَّا كُفُورًا ﴿٩٩﴾ ﴾.

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە یازدە بڕگەدا:

١)- ﴿ وَمَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلْمُهْتَدِ ﴾ هەر كەسێك خوا ڕاستە ڕێی بكات، هەر ئەو ڕێی ڕاستگرتوویە، (فَهُوَ ٱلْمُهْتَدِ) كورتهەڵێنان، دەگەیەنێ، هەر كەسێك خوا ڕاستە ڕێی بكات، تەنیا ئەو ڕێی ڕاستی گرتوە، كەواتە: هەر كەسێ خوا ڕاستەڕێی نەكات، ناتوانێ ڕێی ڕاست بگرێ، ڕێی ڕاست واتە: لە ڕووی: بوونناسییەوە، ئیمان و عەقیدەوە، پەرستشەكانەوە، حەڵاڵ و حەڕامەوە، ... هتد، بە دڵنیایی لێرەدا مەبەست لە (هداية) - وەك پێشتریش لە مانا گشتییەكەیدا باسمان كرد - ڕێنمایی نیە،

بەڵکو مەبەست پێی: خستنە سەر ڕێی ڕاستە، واتە: مانای دووەم و تایبەتیی هیدایەت لەبەر چاو گیراوە، نەك مانای یەکەمی کە بریتیە لە ڕێنمایی کردن، بۆچی؟ چونکە خوا ڕێنمایی هەموو کەسی کردوە، کەواتە: ﴿ وَمَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلْمُهْتَدِ ﴾ ئەگەر مەبەست ڕێنمایی کردن بێ، خوا ڕێنمایی هەموو خەڵکی کردوە، ئنجا ئایا هەموویان ڕێی ڕاستگرتوون؟ نا، کەواتە: مەبەست ئەوەیە هەر کەسێك خوا ڕاستە ڕێی بکات، هەر ئەو ڕێی ڕاستی گرتوە، نەك کەسێ خوا ڕێنمایی بکات، چونکە خوا هەموو خەڵکی ڕێنمایی کردوە، بەڵام هەموو ئەوانەی خوا ڕێنمایی کردوون، ڕێی ڕاست گرتوو نین.

٢)- ﴿ وَمَن يُضْلِلْ فَلَن تَجِدَ لَهُمْ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِهِۦ ﴾، هەر کەسێك خوا گومڕای بکات، تۆ لەجیاتی خوا، دۆست و پشتیوانت بۆیان چنگ ناکەون، کە سەرپەرشتییان بکەن و ئاگایان لێیان بێ و، بیانخەنەوە سەر ڕاستە ڕێ.

(**أولياء**) کۆی (**وليّ**)ە، (**ولي**) لە ئەصڵدا لە (**وَلْي**)وە هاتوە، (**الوَلْي: القُرْب**) نیزیکیی، ئنجا (**وليّ**) بە مانای: دۆست، پشتیوان، یارمەتیدەر، نیزیك، بەو مانایانە هەموویان، دێ.

کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يُضْلِلْ فَلَن تَجِدَ لَهُمْ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِهِۦ ﴾، بۆچی (أَوْلِيَآءَ )ی بەکۆ هێناوە؟ (**جمع الأولياء، باعتبار مقابلة الجمع بالجمع**)، وشەی (**مَن**) هەم بۆ تاك، هەم بۆ کۆ، بەکار دێ، ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ فَلَن تَجِدَ لَهُمْ ﴾ بۆ ئەوان چنگت ناکەوێ، ئەوان مادام کۆ (**جمع**)ن، (أَوْلِيَآءَ )یشی بە کۆ هێناوە و نەیفەرموە: (**فلن تجد لهم ولياً**) فەرموویەتی: (أَوْلِيَآءَ ) کۆی لە بەرانبەری کۆدا بەکارهێناوە.

٣)- ﴿ وَنَحْشُرُهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ ﴾، لە ڕۆژی هەڵسانەوەشەدا لەسەر ڕوویان کۆیان دەکەینەوە، کە لێرەدا مەبەست ئەوەیە: لەسەر ڕوویان دەیانڕۆێنین و، کۆشیان دەکەینەوەو، خڕیشیان دەکەینەوە (**الحَشْرُ: جَمْعُ النَّاسِ مِنْ مَوَاضِع مُتَفَرِّقَة إِلى مَكَانٍ وَاحِدٍ، عُدِّي الحَشْرُ بـ «على» لتضمين معنى «يَمْشون»**) واتە: (**حشر**) (کۆ کردنەوە) بریتیە لە کۆکردنەوەی خەڵك لە چەند شوێنێکی جۆراو جۆرەوە، بەرەو یەك شوێنی دیارییکراو، وشەی (**حَشْر**) بە پێی (**على**) پەڕێنراوەتەوە بۆ بەرکار (**مفعول به**) تاکو مانای دەڕۆن (**يمشون**)ی بخرێتە نێو، ئەگەرنا (**حَشَرَهُ**) یانی: کۆی کردەوە و، پێویست بە (**على**) ناکات، وەك: (**حشر اللّهُ الناسَ**)، بەڵام کە بە پیتی (**على**) بەرکار (**مفعول به**) دەخوازێ، ئەوە مانای (**أَمْشى**)ی خراوەتە نێو، یانی: (**نَحْشُرُهُم وَنُمَشِّيهم**) کۆشیان دەکەینەوە و دەشیانڕۆێنین.

لەو بارەوەش ئەم فەرموودەیە هەیە: {عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَجُلًا قَالَ يَا نَبِيَّ اللَّهِ {يُحْشَرُ الْكَافِرُ عَلَى وَجْهِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ؟ قَالَ أَلَيْسَ الَّذِي أَمْشَاهُ عَلَى الرِّجْلَيْنِ فِي الدُّنْيَا، قَادِرًا عَلَى أَنْ يُمْشِيَهُ عَلَى وَجْهِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ؟} (أخرجه البخاري: ٤٤٨٢).

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پیاوێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ {خوا کە دەفەرموێ: لەسەر ڕوویان، لەسەر دەم و چاویان کۆ دەکرێنەوە} ئایا کافر لەسەر دەم و چاوی کۆ دەکرێتەوە، دەڕۆێنرێ؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا ئەو زاتەی کە لەسەر پێیەکانی ڕۆیاندوویەتی، ناتوانێ لەسەر دەم و چاویشی بیڕۆێنێ، لەڕۆژی قیامەت دا؟

٤)- ﴿ عُمْيًا وَبُكْمًا وَصُمًّا ﴾ ئەمانە، هەرسێکیان کۆ (**جمع**)ن، واتە: کۆی کوێرو لاڵ و کەڕ، ئنجا جێی سەرنج ئەوەیە، کە لە هەموو قورئاندا، خوای پەنهانزان هەمیشە (**صم**)ی پێش (**بكم**) خستوە، بەڵام لێرەدا (**عُمي**)ی پێش خستوە، دەفەرموێ: کوێرن، لاڵن، کەڕن؟!

حیکمەتەکەشی ئەوەیە کە لە شوێنەکانی دیکە، خوای کاربەجێ ڕیزبەندیی مەنتیقیی و زانستیی ڕەچاو کردوە، چونکە بێگومان: هەر کەسێك کەڕ بوو، لاڵیش دەبێ، بۆیە لە شوێنەکانی دیکە لە سوورەتی (**البقرة**) لە دوو شوێن دا (١٨ و ١٧١)، هەروەها لە شوێنەکانی دیکەدا (**صم**) واتە: کەڕان، خراوەتە پێش (**بكم**) واتە: لاڵان، چونکە کەسێك لاڵ دەبێ، کە کەڕ بێ، بەڵام لێرەدا:

﴿ عُمْيًا وَبُكْمًا وَصُمًّا ﴾، کوێرن و لاڵن و کەڕن، لەبەر ئەوەی لێرەدا مەبەست ڕیزبەندیی بوونیی، (**الترتيب الوجودي**) نیە، بەڵکو مەبەست ڕیزبەندیی لە گرنگترەوە بۆ گرەنگ چوونە (**الأهم فالمهم**) ئنجا بەر لە هەموو شتێك ئەوانە کوێرن و هیچ نابینن، ناخۆشترین شتیش ئەوەیە کە ئینسان نابینا بێ، پاشان ئەوانە لاڵن قسەیان بۆ ناکرێ، ئنجا کەڕیشن و هیچ نابیستن، واتە: لە ڕۆژی دواییدا: بەلای کوێریی، گەورەترە لە لاڵیی و، لاڵیی گەورترە لە کەڕیی، بەڵام لە ژیانی دنیادا: کەڕیی دەبێتە هۆی لاڵیی، بۆیە تەنیا لەم شوێنەدا کە باسی قیامەت دەکات، لاڵێتیی پێش کەڕێتیی خراوە.

٥)- ﴿ مَّأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ﴾ (**المأوى محل الأوىٰ، أوى يأوي أُوياً**) واتە: پەنا پێ بردن و تێدا حەوانەوە:

شوێنی حەوانەوەیان، شوێنی تێدا سرەوتنیان دۆزەخە.

٦)- ﴿ كُلَّمَا خَبَتْ زِدْنَٰهُمْ سَعِيرًا ﴾ (**خبتْ أي سكنت وانطفأت**) هەرکات ئاگرەکە خامۆش بوو، دامرکا، بڵێسەیان بۆ زیاد دەکەین، لێرەدا خوا ﷻ نافەرموێ: (**كلما خبت زدناها سعيراً**) هەر

کە ئاگرەکە دامرکا زیاتر بڵێسەی دەدەینێ، واتە: نێڵی دەدەین و ئاگرەکە خۆش دەکەین، بەڵکو دەفەرموێ: (**زدناهم**)! چونکە ئاگری دۆزەخ ناکوژێتەوە، بەڵام بەنسبەت ئەوانەوە کە ماوەیەك بەو جۆرە ئاگرەوە ڕادێن و خووی پێوە دەگرن، بۆیە خوا دەفەرموێ: {**زدناهم**} بۆ ئەوان بڵێسە زیاد دەکەین، ئەگەرنا لەخودی خۆیدا ئاگرەکە، نە خەفە دەبێ و، نە خامۆش دەبێ و، نە دادەمرکێ، بۆیە نافەرموێ: (**زدناها سعیراً**) ئەگەر وای فەرمووبا، مانای وابوو، ئاگرەکە خامۆش بووەو دامرکاوە، بەڵام، یانی: بەنسبەت ئەوانەوە ئەوان پێیان وایە، کە ئاگرەکە خامۆش بووەو دامرکاوە، ﴿ زِدْنَٰهُمْ سَعِيرًا ﴾، هەر کاتێك بە نسبەت ئەوانەوە، کە پێی سزا دەدرێن، ئاگرەکە دامرکا و خەفە بوو، بڵێسەدارتر دەکرێ بۆ ئەوان، ئەگەرنا لە خودی خۆیدا هەروەك خۆیەتی.

وشەی (**سعیر**)یش یانی: بڵێسە سەندن و کڵپە سەندن.

٧) - ﴿ ذَٰلِكَ جَزَآؤُهُم بِأَنَّهُمْ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِنَا ﴾، خوا ﷻ دەفەرموێ: ئا ئەوە سزایانە بەهۆی ئەوەوە کە بێبڕوابوون بە ئایەتەکانی ئێمە، (**آیات**) کۆی (**آیة**)ە، واتە: نیشانە، بەڵام هەم بە مانای ڕستەکانی فەرمایشتی خوا، دێ، هەم بە مانای موعجیزەی پێغەمبەران سەلامی خوایان لێبێ، دێ، هەم بەمانای دیاردە سروشتییەکانیش دێ، هەروەها بەمانای ئەو بەڵایانەش دێ، کە خوا بەسەر گەل و نەتەوە یاخییەکانی هێناون، بەچوار واتا دێ، کە لێرەدا دەگونجێ: مەبەست پێی ئایەتە خوێنراوەکان بن و، دەشگونجێ مەبەست موعجیزەی پێغەمبەران، یان دیاردە سروشتییەکانیش بێ، بەهۆی ئەوەوە کە بێبڕوا بوون بە نیشانەکانی ئێمە، بۆیە سزامان دان.

٨) - (وَقَالُوٓاْ أَءِذَا كُنَّا عِظَٰمًا وَرُفَٰتًا أَءِنَّا لَمَبْعُوثُونَ خَلْقًا جَدِيدًا ؟!)، گوتیان: ئایا ئەگەر بووینەوە ئێسك و پرووسکی وردو خاش و پرتووکاو، ئایا ئێمە بە دروستکراوێکی تازە زیندوو دەکرێینەوە، (**رُفات**) بەشەکانی شتێکی تێك شکاون، شتێ کە وردو خاش کرابێ، کە لێرەدا: ئێسقانە، ئەگەرنا هەر شتێکی ڕەقی تێکشکاو و وردو خاش (**رُفات**) و (**فُتات**)ی پێدەگوترێ.

ئنجا خوا ﷻ لە وەڵامیان دەفەرموێ:

٩) - ﴿ أَوَلَمْ يَرَوْاْ أَنَّ ٱللَّهَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ قَادِرٌ عَلَىٰٓ أَن يَخْلُقَ مِثْلَهُمْ ؟ ﴾

بە دڵنیایی لێرە مەبەست لە (**أو لم یروا**) بینینی چاو نیە و، مەبەست بینینی عەقڵ و دڵە:

ئایا بەچاوی عەقڵ و دڵ نەیانبینیوە، کە ئەو خوایەی ئاسمانەکان و زەوی هێناونە دی، توانایە: وێنەی ئەوانیش دروست بکات، نەیفەرمووە: ئەوان، بەڵکو فەرموویەتی: (**مثلهم**) وێنەی ئەوان، چونکە ئەوەی لە ڕۆژی دواییدا، خوا دروستی دەکاتەوە، خودی ئەو جەستەیە نیە، بەڵکو شێوەی ئەوەیە و لە ماددەیەکی دیکەیە، بەڵام هەمان مرۆڤەو لە هەمان شێوەدا.

بەڵێ ئەم ڕستەیە: ﴿ قَادِرٌ عَلَىٰٓ أَن يَخۡلُقَ مِثۡلَهُمۡ ﴾ بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە زیندوو کرانەوە، بریتیە لە هێنانەوەی جەستەی مردووان لە نەبوونەوە، بەڵام بۆ هەر مردوویەك جەستەیەکی تازە، لەسەر شێوەی جەستەی پێشووەکەی دروست دەکرێتەوە، بەڵام مەرج نیە بە هەمان قەبارە و لە هەمان ماددە بێ، کە کاتی خۆی لە دنیادا بووە، بۆچی؟ چونکە:

**یەکەم:** هەمان قەبارە نابێ، لەبەر ئەوەی لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە، کە ئەهلی بەهەشت لەسەر شێوەی بابیان ئادەمن کە شەست (٦٠) باسك کەڵەگەت بووە و[1]، دیارە چەندەش بەرز بێ، دەبێ لە قەدەر ئەوە، ئەوەندەش ئەستوور بێ! شایانی باسە: لە سوورەتی (**الواقعة**)دا، خوا ﷻ ئاماژەیەك بەو ڕاستییە مەزنە دەکات، کە من پێم وایە: لە هەموو قورئان دا لەوبارەوە: بەس لێرە لە سوورەتی (**الإسراء**)دا، ئەو ئاماژەیە هەیە و لە سوورەتی (**الواقعة**)شدا، کە دەفەرموێ: ﴿ نَحۡنُ قَدَّرۡنَا بَيۡنَكُمُ ٱلۡمَوۡتَ وَمَا نَحۡنُ بِمَسۡبُوقِينَ ٦٠ عَلَىٰٓ أَن نُّبَدِّلَ أَمۡثَٰلَكُمۡ وَنُنشِئَكُمۡ فِي مَا لَا تَعۡلَمُونَ ٦١ ﴾، واتە: ئێمە مردنمان لە نێو ئێوەدا ئەندازەگیریی کردوە، دامانناوە، بڕیارمان داوە و، ئێمە (دەستە وسان و) لێوەپێشکەوتووەوە نین {کەسێك کە پێشبڕکە دەکات، کەسێ پێشی بکەوێتەوە، واتە: دەربازی بێ و دەستەڵاتی بەسەریدا نەبێ} کە وێنەی ئێوە بێنین و بە جۆرێك دروستتان بکەینەوە، کە نایزانن، یانی: ئێستا نایزانن.

**دووەم:** ماددەکەشی دەگۆڕێ، چونکە جەستەیەك بەرگەی ژیانێکی هەتا هەتایی بگرێ لە بەهەشتدا، یاخود لە دۆزەخدا، دیارە دەبێ ماددەکەی و قەبارەکەی جیا بێ، وەك لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خوادا ﷺ هاتوە.

١٠)- ﴿ وَجَعَلَ لَهُمۡ أَجَلٗا لَّا رَيۡبَ ﴾، کاتێکی دیاریی کراوی بۆ داناون، کە هیچ دوودڵیی تێدانیە.

١١)- ﴿ فَأَبَى ٱلظَّٰلِمُونَ إِلَّا كُفُورٗا ﴾، کەچی ستەمکاران ڕازی نەبوون بە جگە لە ناسپاسیی و سپڵەیی، ئامادە نەبوون بۆ ملکەچیی بەڵکو هەر سپڵەیی و ناسپاسییان هەڵبژارد، ستەمکاران سەرپێچییان کرد و لاملییان کرد لە ئیمان و فەرمانبەریی و، تەنیا ناسپاسیی و سپڵەییان هەڵبژارد.

---

(١) {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ خَلَقَ اللَّهُ آدَمَ عَلَى صُورَتِهِ طُولُهُ سِتُّونَ ذِرَاعًا فَلَمَّا خَلَقَهُ، قَالَ: اذْهَبْ فَسَلِّمْ عَلَى أُولَئِكَ النَّفَرِ مِنَ الْمَلَائِكَةِ جُلُوسٌ فَاسْتَمِعْ مَا يُحَيُّونَكَ فَإِنَّهَا تَحِيَّتُكَ وَتَحِيَّةُ ذُرِّيَّتِكَ فَقَالَ: السَّلَامُ عَلَيْكُمْ فَقَالُوا: السَّلَامُ عَلَيْكَ وَرَحْمَةُ اللَّهِ، فَزَادُوهُ وَرَحْمَةُ اللَّهِ فَكُلُّ مَنْ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ عَلَى صُورَةِ آدَمَ فَلَمْ يَزَلْ الْخَلْقُ يَنْقُصُ بَعْدُ حَتَّى الْآنَ} صحيح البخاري: ٥٨٧٣.

## مەسەلەی دووەم:

**خوا دەفەرموێ: بڵێ: ئەگەر ئێوە عەمبارەکانی بەزەیی و بەخششی پەروەردگارمتان هەبووایە، ئەو کاتەش لە ترسی بڕانیان، لە خەرج کردنیدا، هەر چرووکییتان دەکردو، دەستتان دەگرتەوە، مرۆڤیش ڕژد و بەرچاو تەنگە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ قُل لَّوۡ أَنتُمۡ تَمۡلِكُونَ خَزَآئِنَ رَحۡمَةِ رَبِّيٓ إِذٗا لَّأَمۡسَكۡتُمۡ خَشۡيَةَ ٱلۡإِنفَاقِۚ وَكَانَ ٱلۡإِنسَٰنُ قَتُورٗا ﴿١٠٠﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿ قُل لَّوۡ أَنتُمۡ تَمۡلِكُونَ خَزَآئِنَ رَحۡمَةِ رَبِّيٓ ﴾، بڵێ: ئەگەر ئێوە عەمبارەکانی بەزەیی و بەخششی پەروەردگارمتان هەبووایە.

دەگوترێ: (**أَنْفَقَ الرَّجُلُ: أَي افْتَقَرَ وَذَهَبَ مَالُه**} (**إنفاق**) بەمانای هەژار کەوتن دێ، (**نَفَقَ يَنْفِقُ نَفْقاً، أي: نَفِد**)، واتە: بڕا، نەما.

٢)-﴿ إِذٗا لَّأَمۡسَكۡتُمۡ خَشۡيَةَ ٱلۡإِنفَاقِ ﴾، یانی: ئەگەر عەمبارەکانی بەزەیی پەروەردگاریشمتان لەبەر دەست دا بووایە، لە ترسی هەژارکەوتن، چرووکییتان دەکردو دەستتان دەگرتەوە، یاخود لەترسی بڕانی ئەوەی کە لە عەمبارەکان دا هەیە، چرووکیی و ڕژدییتان دەکرد.

٣)-﴿ وَكَانَ ٱلۡإِنسَٰنُ قَتُورٗا ﴾، واتە: مرۆڤیش بەرچاو تەنگەو، چنگ قووچاوە.

(**قتور**) واتە: زۆر چرووك و ڕژد، کە لە (**قَتْر**)ەوە وەرگیراوە، ئەویش کە مکردنەوەی خەرجکردن و دەستگرتنەوە و تەنگکردنەوەیەو، (**الإنفاق**) هەم بە مانای هەژار کەوتن دێ و، هەم بە مانای بڕاندنی ئەو ماڵ و سامانە دێ، کە لەبەردەستدایە.

## مەسەلەی سێیەم و کۆتایی:

بەدڵنیاییی نۆ (٩) نیشانەی ڕۆشنمان بە مووسا دابوون، لەو بارەوە لە گەلی ئیسرائیل بپرسە: کە چووە لایان و فیرعەون پێی گوت: ئەی مووسا! پێم وایە جادووت لێ کراوە، مووساش گوتی: دەزانی کە ئەو نۆ نیشانەیە تەنیا پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی دایبەزاندوون و ڕوونکەرەوەن و، ئەی فیرعەون! من بە فەوتاوت دەزانم، ئەویش کارێکی کرد کە ناچاری بەجێهێشتنی سەرزەمینی میسریان بکات و، ئێمەش خۆی و هەموو ئەوانەی لەگەڵیدا بوون خنکاندمانن و، دوای ویش بەبەنی ئیسرائیلمان فەرموو: لەسەر زەمینی شام نیشتەجێ بن، ئنجا کە کاتی بەڵێنی جاری دوایی {یان: ڕۆژی دوایی} هات هەمووتان ڕادەپێچین و دەتانهێنین:

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَىٰ تِسْعَ ءَايَٰتٍ بَيِّنَٰتٍ ۖ فَسْـَٔلْ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِذْ جَآءَهُمْ فَقَالَ لَهُۥ فِرْعَوْنُ إِنِّى لَأَظُنُّكَ يَٰمُوسَىٰ مَسْحُورًا ﴿١٠١﴾ قَالَ لَقَدْ عَلِمْتَ مَآ أَنزَلَ هَٰٓؤُلَآءِ إِلَّا رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ بَصَآئِرَ وَإِنِّى لَأَظُنُّكَ يَٰفِرْعَوْنُ مَثْبُورًا ﴿١٠٢﴾ فَأَرَادَ أَن يَسْتَفِزَّهُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ فَأَغْرَقْنَٰهُ وَمَن مَّعَهُۥ جَمِيعًا ﴿١٠٣﴾ وَقُلْنَا مِنۢ بَعْدِهِۦ لِبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱسْكُنُوا۟ ٱلْأَرْضَ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ ٱلْـَٔاخِرَةِ جِئْنَا بِكُمْ لَفِيفًا ﴿١٠٤﴾ ﴾.

بەڕێزان! ئێمە بەخێرایی و لە دە (١٠) بڕگەدا، بەسەر ئەم چوار ئایەتەدا ڕەت دەبین، لەبەر ئەوەی لە تەفسیری سوورەتی (**الأعراف**) و، لە تەفسیری سوورەتی (**يونس**)یشدا، باسی بەسەرهاتی مووسامان کردوە:

١)- ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَىٰ تِسْعَ ءَايَٰتٍ بَيِّنَٰتٍ ﴾، واتە: بە دڵنیایی نۆ (٩) نیشانەی ڕوون و ئاشکرامان بە مووسا دابوون.

(**بيّنات**) دەگونجێ بە مانای (**واضحات**) ڕوون و ئاشکراکان بێ، یانی: نیشانە ڕوون و ئاشکرایەکان، دەشگونجێ (**بيّنات**) کۆی (**بيّنة**) بێ، یانی: ئەو نیشانانەی کە بەڵگە بوون لە خودی خۆیاندا.

ئێمە لە سوورەتی (**الأعراف**)دا بە درێژیی باسی ئەو نۆ (٩) نیشانانەمان کردوە کە بریتین لە:

(١- گۆچانەکەی، ٢ - دەستی، ٣ - ساڵانی گرانیی، ٤ - کەمیی لە بەروبوومدا، ٥ - تۆفان و ئاو هەڵسان، ٦ - کوللە، ٧ - ئەسپێ، ٨ - بۆق، ٩ - خوێن).

٢)- ﴿ فَسْئَلْ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِذْ جَآءَهُمْ ﴾، لە بەنی ئیسرائیل بپرسە کاتێك هاتە لایان.

شایانی باسە لە: (**التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، سفر الخروج، الإصحاح: ٧ و ٨ و ٩ و ١٠ و ١١**)، (ص ١٤٤ - ١٥٢)دا، بە درێژیی باسی ئەو نیشانانە کراوە، بەڵام لەوێدا یازدە (١١) دانە لەو بەڵایانەی بەسەریان هاتوون، باسکراون، بەڵام خوا باسی نۆیان دەکات، کە ئەو دووانەی دیکەشیان هەر گرتوونە خۆیان، کە بەدڵنیاییەوە کتێبەکانی ئەوان دەستکاریی و کەم و زیادییان تێدا کراوە، بەڵام ئەوەی کە لە سەدا سەد (١٠٠/ ١٠٠) هەق و ڕاستە، هەر ئەوەیە کە لە دوا کتێبی خوای زانا و توانادا هاتوە.

٣)-﴿ فَقَالَ لَهُۥ فِرْعَوْنُ إِنِّى لَأَظُنُّكَ يَٰمُوسَىٰ مَسْحُورًا ﴾، فیرعەون پێی گوت: ئەی مووسا! من بە جادوو لێکراوت تێدەگەم.

هەندێکیش گوتوویانە: وشەی (**مسحور**) وەك (**ميمون**) و (**مشئوم**) وایە، کە هی یەکەمیان: بەمانای پیرۆزو بەرەکەتدار و، هی دووەمیان بە مانای نەگبەت، دێن و، هەردووکیان لە بنچینەدا بەمانای (**مائن**) و (**شائم**)ن، (**مسحور**) یش (**ساحر**)ە، فیرعەون پێی دەڵێ: ئەی مووسا! من بە جادووگەرت تێدەگەم.

بەڵام پێم وایە هەر مانای یەکەمیان ڕاستە، واتە: بەجادوو لێکراوت تێدەگەم، یانی: پێم وایە: تۆ شێتی و عەقڵت تێکچووە!

٤)- ﴿ قَالَ لَقَدْ عَلِمْتَ مَآ أَنزَلَ هَٰٓؤُلَآءِ إِلَّا رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، (مووسا ﷺ) فەرمووی: تۆ دەزانی کە ئەمانە {(هَٰٓؤُلَآءِ ) ناوی ئاماژەیە بۆ عاقڵان، بەڵام بۆیە خوای تاك و پاك، لێرەدا بەکاری هێناوە، یانی: هەریەك لەو بەڵگانە، وەك مرۆڤێکی عاقڵ وایە، ڕێ پێشانی خەڵك دەداو بۆیان ڕوون دەکاتەوە} تەنیا پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی دایبەزاندوون.

٥)- ﴿ بَصَآئِرَ ﴾ کۆی (بصيرة)یە، یانی: (**الحجج المفيدة للبصيرة، أي: العلم، فكأنَّها نَفْسُ البصيرة**) واتە: ئەو بەڵگانەی کە سوود بەخشن بۆ بەصیرەت و عەقڵی مرۆڤ، یاخود بۆ زانیاریی و بەرچاو ڕوونیی، وەك خودی خۆیان زانیاریی و بەرچاو ڕوونییەکە بن.

٦)- ﴿ وَإِنِّى لَأَظُنُّكَ يَٰفِرْعَوْنُ مَثْبُورًا ﴾ ئەی فیرعەون! من بە فەوتاویشت دەزانم، یان: من بە فەوتاوت تێدەگەم و وا گومان دەبەم: تۆ فەوتاوی، لەبەر ئەوەی دڵنیا نەبووە ئایا فیرعەون ئیمان دێنێ، یان ئیمان ناهێنێ و، دڵنیا نەبووە سەرەنجامەکەی چۆن دەبێ، بۆیە فەرموویەتی: ﴿ وَإِنِّى لَأَظُنُّكَ ﴾، چونکە وشەی (**ظن**) هەم بەمانای (گومان) دێ، واتە: پێوابوونی شتێك،

ئنجا پێوابوونەکە، بەباری بوون، یان بەباری نەبوون دا، هەم بە مانای زانیاریی و دڵنیاییش، دێ، دوایی بەپێی سیاقەکە، ماناکەی دەگۆڕێ.

أ - ئنجا ئەگەر مەبەست لە (**ظن**) گومان بێ، ناگونجێ مووسا گومانی هەبێ و خواش ئاگاداری کردبێتەوە! بەڵام لەبەر ئەوەی دڵنیا نەبووە، فیرعەون ئیمان دێنێ، یان نا؟ لەبەر ئەوە گوتوویەتی: گومانم وایە تۆ فەوتاوی.

ب - ئەگەر (**ظن**)یش بە مانای دڵنیایی (**یقین**) بێ، یانی: دڵنیام و دەزانم تۆ فەوتاوی، لەبەر ئەوەی خوا ئاگاداری کردۆتەوە کە فیرعەون هەر ئیمان ناهێنێ.

(**مثبور**) کەسێکە کە (**ثبور**)ی تووش دێ، (**ثبور**)یش بە مانای لە بەین چوون و نەمانە.

٧)- ﴿ فَأَرَادَ أَن يَسْتَفِزَّهُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ ﴾، (فیرعەون) ویستی لەسەر زەوی هەڵیانسێنێ، بیانورووژێنێ، (**الإِسْتِفْزَازُ: الإِستِخْفَافُ، كِنَايَةٌ عَنِ الإِبعَاد**) (**إستخفاف**) بە مانای: بێزارکردن و جووڵاندنە، یانی: ناچاریان بکات هەڵسن و، سەر زەوی میسر بەجێ بهێڵن.

٨)- ﴿ فَأَغْرَقْنَٰهُ وَمَن مَّعَهُۥ جَمِيعًا ﴾، ئێمەش خۆی و تێکڕای ئەوانەی لەگەڵیدا بوون، خنکاندمانن، نغرۆمان کردن، فیرعەون ویستوویەتی ناچاریان بکات: سەرزەمینی میسر بەجێهێڵن و دواییش بەجێیان هێشت، ئنجا کە بەجێشیان هێشتوە، خوای دادگەریش فیرعەون و سوپایەکەی سزا داوەو هەموویانی نغرۆ کردوە، لە دەریای سووردا.

٩)- ﴿ وَقُلْنَا مِنۢ بَعْدِهِۦ لِبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱسْكُنُوا۟ ٱلْأَرْضَ ﴾، لە دوای وی، [لە دوای فیرعەون، کە فەوتا] بە گەلی بەنی ئیسرائیلمان فەرموو: لەسەر زەوی نیشتەجێ بن.

یانی: سەرزەمینی شام، کە ئەمە هەم بەسیاق دەزانرێ، بە شوێنەکانی دیکە، کە بەسەرهاتەکانی فیرعەون و مووساو گەلەکەی، تێیاندا باس کراون، بەوە دەزانرێ کە مەبەست لەو سەر زەمینە، ئەو (ال)ی کە لەسەر (**الأرض**)ە (ال)ی جینس نیە، کۆی سەر زەوی، بەڵکو مەبەست سەرزەمینێکی دیاریی کراوە، کە شامە.

هەندێ لە زانایانیش گوتوویانە: (**الأرض**) لێرەدا (ال)ەکەی کە هی ناساندنە بۆ (جنس)ە، لەکۆی سەرزەمین دا نیشتەجێ بن، چونکە گەلی جوولەکە دوایی بە هەموو دنیادا بڵاو بوونەوە!

بەڵام پێم وایە: ڕای یەکەم ڕاستە، چونکە: پەڕاگەندە بوونی جوولەکە بە دنیادا، سزایەکی خوا بووە، نەك چاکە و نیعمەت، کە سیاقی ئەم ئایەتانە دەگەنێ!

١٠)- ﴿ فَإِذَا جَآءَ وَعۡدُ ٱلۡأٓخِرَةِ جِئۡنَا بِكُمۡ لَفِيفٗا ﴾، ئنجا هەر کاتێ بەڵێنی ڕۆژی دوایی هات {ئەو ڕۆژی دواییەی، کە خوا لەسەر زمانی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) هەواڵی پێداوە، کە بریتیە لە کۆ کردنەوەو زیندوو کردنەوەی خەڵك} ئێوەش هەمووتان ڕەپێچك دەکەین و کۆتان دەکەینەوە و، دەتانهێنین بۆ مەیدان و گۆڕەپانی سزاو پاداشت.

یاخود: ﴿ فَإِذَا جَآءَ وَعۡدُ ٱلۡأٓخِرَةِ جِئۡنَا بِكُمۡ لَفِيفٗا ﴾، واتە: هەرکات بەڵێنی جاری دووەم هات، لەو دوو تێکدانەی کە گەلی ئیسرائیل ئەنجامی دەدەن و خوای دادگەریش لەبەرامبەر هەر تێکدانێکدا، سزایەکیان دەدا، (**لفيفاً: الجَماعَاتِ المُخْتَلِطينَ مِنْ أصْنَافٍ شَتَّى**) کۆمەڵە خەڵکێکی تێکەڵ و ئاوێتە لە جۆرە جیا جیاکان.

کەواتە: دەگونجێ مەبەست لە: (ٱلۡأٓخِرَةِ) ڕۆژی دوایی بێ، دەشگونجێ مەبەست پێی جاری دووەم بێ، لەو دوو جارانەی کە وەچەی ئیسرائیل تێکدان و خراپەکاریی دەکەن لە زەویدا و، خوای تۆڵەستێنیش سزایان دەدات، لەسەر ئەو دوو تێکدانە.

ئنجا ئەگەر بەم واتایە بێ، دەبێ:

أ - جاری یەکەم تێپەڕی بێ و گوزەرانێ.

ب - جاری دووەم، تاکو ئێستا نەهاتبێ، ئنجا جێی هەڵوەستەشە کە: ئێستا لە هەموو شوێنەکانەوە گەلی جوولەکە، لە قەوارەکەیان خڕدەبنەوە، ئەو قەوارەیەی کە لە ساڵی (١٩٤٨ز)ەوە، لەسەر بەشێکی خاکی داگیرکراوی فەلەستین دامەزراوە و، بەقەدەری خوا لە هەموو شوێنانەوە هاتوون و، لەوێ خڕکراونەوە، کە نیزیکە بۆ ئەوەبێ، خوا بە تێکڕایی سزایان بدات وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەری خوادا ﷺ ئاماژەی پێ کراوە، کە مسوڵمانان لە دژی جوولەکە جەنگ دەکەن، ئنجا وا پێ دەچێ کە ئەوە جاری دووەم بێ، ئەو قەوارەیەی کە بە ستەم و خۆ فەرزکردن بنیاتیان ناوە، خوای دادگەر تێکی بدات، بە تەئکیدیش ئەوەی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ فەرموویانە، هەر دێتە دی، درەنگ یان زوو.

بەڵام ئەوەش پەیوەستە بەوەوە کە ئایا: ئەوان تا چ ڕادەیەك تێدەپەڕێنن لە ستەم و خراپەدا و، شایستەی سزای خوا دەبن، هەروەها مسوڵمانانیش، تا چ ڕادەیەك پابەند دەبن بە شەریعەتی خواوە و، شایستەی ئەوە دەبن کە یەکێك لە دوژمنە هەرە

سەرسەختەکانیان، کە خەڵکی ستەمکاری جوولەکەن، نەك گەلی جوولەکە بە تێکڕا، بەڵکو ئەوانەیان کە ستەم دەکەن، سەرزەمینی خەڵکی دیکە داگیر دەکەن، یەکەمین ڕووگەی مسوڵمانان و، شوێنێ شەوڕۆیی پێغەمبەری خوا ﷺ و، سێیەمین حەڕەم.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# پێناسەی ئەم دەرسە

بەڕێزان! ئەم دەرسەمان حەوت (٧) ئایەتی کۆتایی سوورەتی (**الإسراء**)دا، دەگرێتە خۆی، ئایەتەکانی: (١٠٥ - ١١١)، کە سێ بابەتی سەرەکییان تێداخراونەڕوو:

١- باسی قورئانە، کە بە شێوازێکی هەق و بە هەقیشەوە دابەزێنراوە، تاکو بە شێنەیی بەسەر خەڵکدا بخوێنرێتەوە، لە لایەن پێغەمبەری خاتەمەوە ﷺ، پاشان باسی هەڵوێستی ئەرێنییانەی بەشێك لە زانایانی خاوەن کتێب کراوە، کە چۆن کارلێکی لەگەڵدا دەکەن و پێی کارتێکراو (**متأثر**) دەبن!

٢- باسی پاڕانەوە کراوە، کە مسوڵمانان: چ بە ناوی: خوا (**اللّه**)، چ بە ناوی: بە بەزەیی (**الرحمن**) لێی بپاڕێنەوە، خوا ناوە هەر بەرزو پەسندەکانی هەن و، پێویستیشە پاڕانەوەو نوێژ، بە دەنگێکی میانجی ئەنجام بدرێ، نە زۆر بەرز، نە زۆر کپ.

٣- فەرمان بە پێغەمبەر ﷺ کراوە، کە ستایشی خوا بکات و بە گەورەی بگرێ، خوایەك کە نە ڕۆڵەو هاوبەشی هەن و، نە بە هۆی بێ دەستەڵاتییشەوە، حەوجێی سەرپەرشتیارو پشتیوانە.

﴿وَبِٱلْحَقِّ أَنزَلْنَٰهُ وَبِٱلْحَقِّ نَزَلَ ۗ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا مُبَشِّرًا وَنَذِيرًا ﴿١٠٥﴾ وَقُرْءَانًا فَرَقْنَٰهُ لِتَقْرَأَهُۥ عَلَى ٱلنَّاسِ عَلَىٰ مُكْثٍ وَنَزَّلْنَٰهُ تَنزِيلًا ﴿١٠٦﴾ قُلْ ءَامِنُوا۟ بِهِۦٓ أَوْ لَا تُؤْمِنُوٓا۟ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ مِن قَبْلِهِۦٓ إِذَا يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ يَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ سُجَّدًا ﴿١٠٧﴾ وَيَقُولُونَ سُبْحَٰنَ رَبِّنَآ إِن كَانَ وَعْدُ رَبِّنَا لَمَفْعُولًا ﴿١٠٨﴾ وَيَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ يَبْكُونَ وَيَزِيدُهُمْ خُشُوعًا ۩ ﴿١٠٩﴾ قُلِ ٱدْعُوا۟ ٱللَّهَ أَوِ ٱدْعُوا۟ ٱلرَّحْمَٰنَ ۖ أَيًّا مَّا تَدْعُوا۟ فَلَهُ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ ۚ وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا وَٱبْتَغِ بَيْنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا ﴿١١٠﴾ وَقُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى لَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ شَرِيكٌ فِى ٱلْمُلْكِ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ وَلِىٌّ مِّنَ ٱلذُّلِّ ۖ وَكَبِّرْهُ تَكْبِيرًا ﴿١١١﴾﴾.

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

{هەروەها ئەم (قورئان)ەمان بە شێوازێکی هەق دابەزاندوەو، بە هەقیشەوە دابەزیوەو، تۆشمان تەنیا بە موژدەدەرو ترسێنەر ڕەوانەکردوە ﴿١٠٥﴾ ئەو خوێندراوەیەمان جیاجیاکردوە (لە دابەزاندن دا) تاکو بە شێنەیی بەسەر خەڵکی دا بخوێنیەوەو، بە دابەزاندنی بەش بەش دامانبەزاندوە ﴿١٠٦﴾ بڵێ: بڕوای پێ بێنن، یان بڕوای نەهێنن، بە دڵنیایی ئەوانەی لە پێش ویدا زانیارییان پێدراوە (و شارەزای کتێبە پێشووەکانی خوان) کاتێك بەسەریاندا بخوێنرێتەوە، لەپەوڕوو بەسەر چەنەگەکانیاندا بە کڕنووشدا دەکەون ﴿١٠٧﴾ دەشڵێن: پاکیی بۆ پەروەردگارمان، بە دڵنیایی بەڵێنی پەروەردگارمان جێبەجێکراوە ﴿١٠٨﴾ لەسەر چەناگەکانیان لەپەوڕوو دەکەون و دەگریەن و (قورئان خوێندن) گەردنکەچییان بۆ زیاد دەکات ﴿١٠٩﴾ بڵێ: بە ناوی خوا بپاڕێنەوە، یان بە ناوی بە بەزەیی، بە هەر کامیان بپاڕێنەوە، خوا ناوە هەرە چاکەکانی هەن، هەروەها (دەنگ بە) نوێژو پاڕانەوەت بەرزمەکەوەو، پەنهانیشیی مەکەو، حاڵەتێکی میانە لەو نێوانەدا ڕەچاو بکە ﴿١١٠﴾ بشڵێ: ستایش بۆ ئەو خوایەی کە هیچ ڕۆڵەی بۆ خۆی دانەناوە و، پەنای بۆ هیچ پشتیوانێك نەبردوە و، بە گەورە گرتنێکی شایستە، بە گەورەی بگرە ﴿١١١﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(فَرَقْنَهُ): (أي: بَيَّنَا فِيْهِ الأَحكَامَ وَفَصَّلنَاهُ، وَقِيْلَ: فَرَّقْنَاهُ أَي: أَنْزَلْنَاهُ مُفَرَّقَاً)، (فَرَّقْنَاهُ) واتە: یاساکانمان تێدا ڕوونکردوونەوەو خستوونە ڕوو، گوتراویشە: (فَرَّقْنَاهُ) بەش بەش دامانبەزاندوە.

(عَلَىٰ مُكْثٍ)، (المُكْثُ: ثَبَاتٌ مَعَ انْتِظَارٍ، يُقَالُ: مَكَثَ مُكْثَا وَمَكْثَاً، أي: لَبِثَ وَانْتَظَرَ)، (مُكْث) بریتیە لە چەسپان لەگەڵ چاوەڕێ کردندا، (مَكَثَ مُكْثَاً وَمَكْثَاً) واتە: مایەوەو چاوەڕێی کرد.

(يَخِرُّونَ): (الخَرِيرُ: صَوْتُ المَاءِ، وَخَرَّ يَخِرُّ خَرِيْرَاً، وَخَرَّ سَاجِدَاً: سَقَطَ)، (خریر) بە مانای دەنگی ئاو دێ، {دەڵێم: بە مانای دەنگی ((با))ش دێ} دەگوترێ: (خَرَّ يَخِرُّ خَرِيْرَاً) واتە: دەنگی هات، (خَرَّ سَاجِدَاً) واتە: لەپەوڕوو بە کڕنووشدا کەوت.

(لِلْأَذْقَانِ): (جَمْعُ ذَقَن: وَهُوَ مَجْمَعُ اللَّحيين)، (أذقان) کۆی (ذَقَن)ە یانی: چەناگە، شوێنی کۆبوونەوەی دوو شەویلاگەکە، (يَخِرُّون للأَذْقَان) مرۆڤ کە کڕنووش دەبات، وەك بەسەر چەناگەدا بکەوێ، وایە بۆیە ئەو تەعبیرەی بەکارهێناوە.

(خُشُوعًا): (الخُشُوعُ: الضَّرَاعَةُ، وَأَكْثَرُ مَا يُسْتَعْمَلُ الخُشُوعُ فِيمَا يُوجَدُ عَلَى الجَوَارِحِ، وَالضَّرَاعَةُ أَكْثَرَ مَا تُسْتَعْمَلُ فِيمَا يُوجَدُ فِي القَلْبِ)، (خشوع) بریتیە لە کزیی و زەبوونیی دەربڕین، بەڵام بە زۆریی وشەی (خشوع) بۆ ئەوە بەکاردەهێنرێ کە لەسەر ئەندامەکان دەردەکەوێ، {حاڵەتی داماویی و کزیی و بچووکیی دەربڕین لەبەرانبەر خوادا} بەڵام (ضراعة) بە مانای کڕووزانەوەو لاڵانەویە، کە لە دڵدا هەیە، زیاتر بۆ ئەوە بە کادەهێنرێ.

(وَلَا تَجْهَرْ): واتە: دەنگ بەرز مەکەوە، دەنگ هەڵمەهێنە، (الجَهْرُ: يقَالُ لظهُورِ الشَّيءِ بِإِفْرَاطٍ، لحَاسَةِ البَصَرِ أو حَاسَةِ السَّمْعِ)، (جهر) بۆ دەرکەوتنی شتێك بە کاردێ، کە بە تێپەڕاندنەوە بۆ هەستی بینین، یان هەستی بیستن دەربکەوێ، وەك: وێنەیەکی زەق، ڕۆشناییەك، یان دەنگێکی بەرز.

( بِصَلَاتِكَ ): (الصَّلَاةُ: قَالَ كَثِيرٌ مِنْ أَهْلِ اللُّغَةِ: هِيَ الدُّعَاءُ وَالتَّبْرِيكُ وَالتَّمْجِيدُ)، وشـەی (صلاة) زۆر لـە زانایـانی شـارەزای زمـان گوتوویانـە: واتـە: پاڕانـەوەو، بـە پیـز دانـان و، بـە پایەبـەرز دانـان، هەروەهـا (صلاة) بـە مانـای نوێژیـش هاتـوە.

(وَلَا تُخَافِتْ بِهَا ): دەنـگ بـە نوێـژو پاڕانەوەکـەت کـپ مەکـە، (المُخَافَتَةُ وَالخَفْتُ: إِسْرَارُ النُّطْقِ)، ئەوەیـە کـە ئینسـان شـتێك بـە دەنگـی کـپ و نـزم بڵێـژێ.

(ٱلذُّلِّ): (الذُّلُّ: مَا كَانَ عَنْ قَهْرٍ، يُقَالُ: ذَلَّ يَذِلُّ ذُلًّا، وَالذِّلُّ: مَا كَانَ بَعْدَ تَصَعُّبٍ)، (ذُلّ) ئەوەیـە کـە بـە هـۆی دەسـتەڵاتەوە کەسـێك مـلی پێکـەچ کرابـێ، دەگوتـرێ: (ذَلَّ يَذِلُّ ذُلًّا) بـەڵام (ذِلّ) ئەوەیـە کـە لـە دوای قورسـیی و زەحمەتیـی بـێ، دەگوتـرێ: (ذَلَّ يَذِلُّ فَهُوَ ذَلُولٌ) ئـەوە بـۆ ئاژەڵێـك بـە کاردێ کـە چەمـووش بـێ، ملکـەچ نەبـێ، بـەڵام دوایـی دەسـتەمۆ بـێ.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

هـۆی هاتنـە خـوارەوەی ئـەو ئایەتـەی کـە دەفەرمـوێ: ﴿ قُلِ ٱدْعُوا۟ ٱللَّهَ أَوِ ٱدْعُوا۟ ٱلرَّحْمَٰنَ أَيًّا مَّا تَدْعُوا۟ فَلَهُ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا وَٱبْتَغِ بَيْنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا (١١٠) ﴾.

لەوبارەوە، سێ بەسەرهات گێڕدراونەوە:

١)- {عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿ وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا ﴾، قَالَ: نَزَلَتْ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ مُخْتَفٍ بِمَكَّةَ، فَكَانَ إِذَا صَلَّى بِأَصْحَابِهِ، رَفَعَ صَوْتَهُ بِالْقُرْآنِ، فَإِذَا سَمِعَهُ الْمُشْرِكُونَ، سَبُّوا الْقُرْآنَ، وَمَنْ أَنْزَلَهُ وَمَنْ جَاءَ بِهِ، فَقَالَ اللَّهُ لِنَبِيِّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: ﴿ وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ ﴾، أَيْ: بِقِرَاءَتِكَ، فَيَسْمَعَ الْمُشْرِكُونَ، فَيَسُبُّوا الْقُرْآنَ، وَلَا تُخَافِتْ بِهَا عَنْ أَصْحَابِكَ، فَلَا تُسْمِعُهُمْ وَابْتَغِ بَيْنَ ذَلِكَ سَبِيلًا} (أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ: ٤٧٢٢، ومسلم: ٤٤٦، والترمذي: ٣١٤٦، وَالنَّسَائِي فِي الكُبرى: ٣٢٠).

واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی عەبـاس (خـوا لـە خـۆی و بـابی ڕازی بـێ)، دەڵـێ: ئـەم ئایەتـە: ﴿ وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا ﴾، کاتێـك هاتـە خـوار کـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە حاڵـەتی خـۆ پەنهـان کـردن و خـۆ حەشـاردان دابـوو، ئنجـا کاتێـك نوێـژی بـە هـاوەڵانی دەکرد، دەنگـی بـە قورئـان بـەرز دەکـردەوە، هاوبـەش دانەرەکانیـش کـە دەیانبیسـت، جنێویـان بـە قورئـان دەدا و، بـەو کەسـەی کـە دایبەزانـدوەو، بـەو کەسـەش کـە هێناویـەتی، خـواش بـە

پێغەمبەری خۆی فەرموو: دەنگ بە نوێژەکەت (قورئان خوێندنەکەت) بەرز مەکەوە، نەوەك هاوبەشدانەرەکان بیبیستن و، جنێو بە قورئان بدەن، هەروەها دەنگیشتی پێ کپ مەکەوە، وا بکەی هاوەڵەکانت نەیبیستن، لەو نێوانە دابە {نە دەنگت هەڵهێنەو نە دەنگت زۆر نزم بکەوە و میانجیی بە}.

٢)- {عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: أُنْزِلَ ذَلِكَ فِي الدُّعَاءِ} (أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ: ٤٧٢٢، ومسلم: ١٠٣٠).

واتە: دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) گوتوویەتی: ئەم ئایەتە کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا وَابْتَغِ بَيْنَ ذَلِكَ سَبِيلًا ﴿١١٠﴾ ﴾، دەربارەی پاڕانەوە دابەزێنراوە، {یانی: پاڕانەوەکە، نە زۆر بە دەنگی بەرزبێ و، نە زۆریش کپ بێ، کەس نەیبیستێ}.

٣)- {عَنْ دَرَّاجٍ، أَنَّ شَيْخًا مِنَ الأَنْصَارِ، مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ حَدَّثَهُ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: ﴿ وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ ﴾، ذَلِكَ فِي الدُّعاءِ: لاَ تَرفَعْ صَوتَكَ فِي الدُّعاءِ، فَتَذكُرَ ذُنُوبَكَ، فَيُسمَعَ مِنكَ، فَتُعَيَّرَ بِها} (أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ فِي التأريخ الكبير: ٨٨٢، وسنده حسن، كما قال مؤلِّفا الإستيعاب).

واتە: دەڕڕاج دەڵێ: پیاوێکی بە تەمەنی ئەنصاریی لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بۆی باسکردوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووە: ئەم ئایەتە: ﴿ وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ ﴾، مەبەست پێی پاڕانەوەیە، واتە: لە کاتی پاڕانەوەدا، دەنگ هەڵمەهێنە، گوناهەکانت باس بکەی، دوایی بەهۆی ئەوەوە خەڵك ڕەخنەت لێبگرێ { و بڵێن: بۆ خۆت دانت پێداهێنا، لە کاتی پاڕانەوەتدا!}.

## مانای گشتی ئایەتەکان

خوا سبحانە و تعالى لەم حەوت ئایەتەدا، سێ بابەت باس دەکات:

بابەتی یەکەم: باسی قورئانە، لە ئایەتەکانی (١٠٥ و ١٠٦ و ١٠٧ و ١٠٨ و ١٠٩)دا، خوا دەفەرموێ:

﴿ وَبِالْحَقِّ أَنزَلْنَاهُ وَبِالْحَقِّ نَزَلَ ﴾، ئەم قورئانەمان بە شێوازێکی هەق دابەزاندوە و بە هەقیشەوە دابەزیوە، واتە: شێوازی دابەزاندنەکەی، لە کات و شوێنی خۆیدا بووە، هەر ئایەتەو هەر سوورەتە، کاتێکیش دابەزیوە، هەقی لە نێو خۆی گرتوە.

﴿ وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا مُبَشِّرًا وَنَذِيرًا ﴾، ئەی موحەممەد! تۆشمان تەنیا بە مژدەدەرو ترسێنەر ڕەوانە کردوە، واتە: ئەرکێکی دیکەت نیە، کە تۆ بە تۆبزیی، مل بەوانە بسوورێنی و بیانخەیە سەر ڕێگای ڕاست، ئەوە کارێکە ئیشی تۆ نیە، ئەوە کارێکە تەنیا بە خوا دەکرێ.

﴿ وَقُرْآنًا فَرَقْنَاهُ ﴾، ئەم خوێندراوەیەشمان بەش بەش کردوە، ئەم قورئانەمان لەیەك جیاکردۆتەوە: سوورەت سوورەت، ئایەت ئایەت، ئنجا ئایا حیکمەتی ئەوە چییە؟ ﴿ لِتَقْرَأَهُ عَلَى النَّاسِ عَلَىٰ مُكْثٍ وَنَزَّلْنَاهُ تَنزِيلًا ﴾، تاکو بەشێنەیی و بەکاوەخۆ بەسەر خەڵکیدا بخوێنیەوە، بۆیە: بە شێوەی بەش بەش دامانبەزاندوە، نەك هەمووی بە یەکجار، کە وەك دوایی باسی دەکەین، کافرەکان ڕەخنەیان لەوە دەگرت و دەیانگوت: ﴿ لَوْلَا نُزِّلَ عَلَيْهِ الْقُرْآنُ جُمْلَةً وَاحِدَةً كَذَٰلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِ فُؤَادَكَ وَرَتَّلْنَاهُ تَرْتِيلًا ﴿٣٢﴾ ﴾ الفرقان، واتە: دەبوایە ئەم قورئانەی بە یەکجار دابەزیبایە سەر، {خوا دەفەرموێ: حیکمەتەکەی ئەوەیە:} کە عەقڵ و دڵتی پێ بچەسپێنین {یانی: بۆت وەربگیرێ و تێی بگەی و کارلێکی لەگەڵ بکەی} بە هێمنیی و جوانیش خوێندوومانەتەوە.

﴿ قُلْ آمِنُوا بِهِ أَوْ لَا تُؤْمِنُوا ﴾، بڵێ: یەکسانە ئێوە {ئەی کافرو بێبڕواو هاوبەشدانەرەکان!} بڕوای پێ بێنن، یاخود بڕوای پێ نەهێنن، ﴿ إِنَّ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ مِن قَبْلِهِ ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی کە پێش ئەم قورئانە زانیارییان پێدراوە، {لە کتێبەکانی خوا شارەزا کراون} ﴿ إِذَا يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ يَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ سُجَّدًا ﴾، کاتێك بەسەریاندا بخوێنرێتەوە، بەسەر چەناگەکانیان دا بە کڕنووشدا دەکەون،

﴿ وَيَقُولُونَ سُبْحَٰنَ رَبِّنَآ إِن كَانَ وَعْدُ رَبِّنَا لَمَفْعُولًا ﴾، دەشڵێن: پاکیی بۆ پەروەردگارمان، کە بێ خەوشە! {ئەمە بۆ سەرسوڕمانە} بە دڵنیایی بەڵێنی پەروەردگارمان، هاتە دی، ئەو بەڵێنانی لە کتێبە پێشووەکاندا دابووی، کە کۆتا پێغەمبەری خۆی، بە کۆتا کتێبی خۆی، ڕەوانە دەکات، ئەوە ئەو بەڵێنە هاتە دی، زانیویانە کە ئەو پێغەمبەری کۆتاییە، ئەو بەڵێنەیە کە خوا لە کتێبە پێشووەکاندا، بەڵێنی داوە، ڕەوانەی بکات.

﴿ وَيَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ يَبْكُونَ وَيَزِيدُهُمْ خُشُوعًا ﴾، واتە: بە سەرچەناگەکانیان دا لەپەوڕوو دەکەون و دەگرین و {ئەم قورئانەش کە دەیخوێنن، یان بەسەریاندا دەخوێنرێتەوە} ملکەچییان تێدا زیاد دەکات.

ئنجا دێتە سەر بابەتی دووەم: کە یەك ئایەتی بۆ تەرخان کراوە، دەفەرمووێ: ﴿ قُلِ ٱدْعُوا۟ ٱللَّهَ أَوِ ٱدْعُوا۟ ٱلرَّحْمَٰنَ أَيًّا مَّا تَدْعُوا۟ ﴾ بڵێ: لە خوا بپاڕێنەوە، یاخود لە (**الرحمن**) بپاڕێنەوە، واتە: بڵێن: (**یا اللّه**)، یان (یا رحمان)، یاخود بە جگە لەو دوو ناوانەش بپاڕێنەوە، ﴿ فَلَهُ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ ﴾، خوا ناوە هەرە چاك و پەسندەکانی هەن، ﴿ وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا وَٱبْتَغِ بَيْنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا ﴾، لە نوێژەکەت دا، یان: لە پاڕانەوەکەت دا دەنگ هەڵمەهێنە و دەنگیش کپ مەکە، لەو نێوانەدا، {واتە: لە نێوان دەنگ هەڵهێنان و، دەنگ کپ کردندا} ڕێیەکی میانجیی بدۆزەوە و حاڵەتێکی میانجیی ڕەچاو بکە.

ئنجا دێتە سەر بابەتی سێیەم: دەفەرمووێ: ﴿ وَقُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى لَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا ﴾، هەروەها بڵێ: ستایش بۆ ئەو خوایەی کە ڕۆڵەی نیە {ڕۆڵەی بۆ خۆی نەگرتوە}

وشەی (**وَلَد**) هەم بۆ تاك، هەم بۆ کۆ، بۆ کوڕو کچ، بەکاردەهێنرێ، ﴿ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ شَرِيكٌ فِى ٱلْمُلْكِ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ وَلِىٌّ مِّنَ ٱلذُّلِّ ﴾، هەروەها خوا لە موڵك و دەستڕۆیشتوویی و خاوەندارێتیی دا، هیچ هاوبەشی نین و، بە هۆی ملکەچیی و بێ دەستەڵاتییەوە، هیچ سەرپەرشتیارو پشتیوانی نین {چونکە پێویستی پێیان نیە} ﴿ وَكَبِّرْهُ تَكْبِيرًۢا ﴾ بە گەورە گرتنێکی شایستەش پەروەردگارت بە گەورە بگرە.

# مەسەلە گرنگەکان

## مەسەلەی یەکەم:

**قورئانمان بە شێوازێکی هەق دابەزاندوە و هەقیشی گرتۆتە خۆی و، تۆشمان تەنیا بە مژدەدەرو ترسێنەر ڕەوانە کردوە و، قورئانیشمان ڕوونکردۆتەوە، تاکو بە شێنەیی بەسەر خەڵکیدا بیخوێنیەوەو، هێدی هێدی دامانبەزاندوە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَبِالْحَقِّ أَنزَلْنَاهُ وَبِالْحَقِّ نَزَلَ وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا مُبَشِّرًا وَنَذِيرًا ﴿١٠٥﴾ وَقُرْآنًا فَرَقْنَاهُ لِتَقْرَأَهُ عَلَى النَّاسِ عَلَىٰ مُكْثٍ وَنَزَّلْنَاهُ تَنزِيلًا ﴿١٠٦﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿ وَبِالْحَقِّ أَنزَلْنَاهُ ﴾، ئەو ڕاناوە (أنزلْناه) بۆ قورئان دەچێتەوە، بە پێی سیاق و سەلیقە دەزانرێ، واتە: بە شێوازێکی هەق دامانبەزاندوە، واتە: هەر سوورەتە و هەر ئایەتە، لە کات و شوێنی خۆیدا، قەبارەی سوورەتەکان و قەبارەی ئایەتەکان، پاشان نێوەڕۆکی ئایەتەکان و، ئەو بابەتانەی کە قورئان باسی کردوون، هەموو ئەوانە: هەق و ڕاست و ئەندازەگیریی کراون، بۆ وێنە: زۆرترین پانتایی بۆ باسی خواو، باسی خوا بەیەکگرتن، تەرخان کراوە، هەروەها هەر بابەت و مەسەلەیەك، بە ئەندازەی خۆی گرنگیی پێدراوە، قورئان بەو شێوەیە، بە هەق دابەزێنراوە.

٢)- ﴿ وَبِالْحَقِّ نَزَلَ ﴾، ئنجا کە داشبەزیوە: هەقی گرتۆتە خۆی، لە هەموو ڕووەکانەوە:

١ - لە ڕووی بووناسییەوە.

٢ - لە ڕووی ئیمان و عەقیدەوە.

٣ - لە ڕووی پەرستنەکانەوە.

٤ - لە ڕووی ڕەوشت و ئاکارەوە.

٥ - لە ڕووی باری کەسێتیی و هەڵسوکەوتەکانی خێزان و کۆمەڵگەوە.

٦ - لە ڕووی حەڵاڵ و حەڕامەوە.

٧ - لە ڕووی جەنگ و ئاشتییەوە.

٨ - لە ڕووی حوکم وسیاسەتەوە، لە هەموو ڕوویێکەوە قورئان هەقی گرۆتە خۆی.

٣)- ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا مُبَشِّرٗا وَنَذِيرٗا ﴾، تۆشمان تەنیا بە موژدەدەرو ترسێنەر، بە دڵخۆشکەر و وریاکەرەوە، ڕەوانە کردوە، واتە: ئەرکی تۆ کورت هەڵهەلاتوە، لە: دڵخۆشکردنی ئەوانەدا کە بە دەم بانگی خواوە دێن، کە دڵیان خۆش بکەی و هەواڵیان پێ بدەی بە بەهەشت و بە ڕەزامەندیی خوا، لە دواڕۆژداوو، بە سەرکەوتن و بەختەوەریی لە دنیادا، ئەوانەش کە بە دەم بانگەوازی خواوە نایەن، بیانترسێنی و وریایان بکەیەوە کە: سەرەنجامی دنیاو دواڕۆژیان، خراپ دەبێ.

٤)- ﴿ وَقُرۡءَانٗا فَرَقۡنَٰهُ ﴾، ئەمەش قورئانێکە، ڕوونمان کردۆتەوە، یان بەش بەشمان کردوە، لە کاتی دابەزێنرانی دا، (**فرقناه**) خوێنراویشەتەوە: (**فَرَّقْنَاه**)، (**فَرَقَ يَفْرُقُ، أي: بَيَّنَ يُبَيِّنُ**) ڕوونی کردەوە، ڕوونی دەکاتەوە، بەڵام: (**فَرَّقْناه: فَصَّلْنَاه، مُفَرَّقاً فِي أَيَّامٍ**) لە چەندان ڕۆژدا بە جیاجیا دامانبەزاندوە.

کە هەردوو واتاکەش ڕاستن، دیارە (**فَرَق وفرَّق**)ش، هەردووك واتاکانیان هەن، بەڵێ قورئان هەم ڕوونکراوەتەوە، کە دابەزێنراوە، هەم بەش بەش و جیاجیاش دابەزێنراوە.

٥)- ﴿ فَرَقۡنَٰهُ لِتَقۡرَأَهُۥ عَلَى ٱلنَّاسِ عَلَىٰ مُكۡثٖ ﴾، بۆ ئەوەی بەشێنەیی بەسەر خەڵکی دابخوێنیەوە، (**على مكث: أي: على مُهْلٍ وتَأَنٍّ، وهي عِلَّةٌ لتفريقه**) بۆچی خوا قورئانی بەش بەش دابەزاندوە؟ تاکو بە شێنەیی، بێ پەلەپەل بەسەر خەڵکیدا بخوێنیەوە، ئەگەر هەمووی پێکەوە بووایە، دەبووایە هەمووی پێکەوە بخوێننەوە.

٦)- ﴿ وَنَزَّلۡنَٰهُ تَنزِيلٗا ﴾، بەش بەشیش دامانبەزاندوە، (**نزَّلَهُ، أي: أنزلَهُ، مُنَجَّماً مُفَرَّقاً**) واتە: بەش بەش و بڕبڕ، دامانبەزاندوە، نەك بە لێك بەستراویی، وەك لە سوورەتی (**الفرقان**)دا هاتوە، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوۡلَا نُزِّلَ عَلَيۡهِ ٱلۡقُرۡءَانُ جُمۡلَةٗ وَٰحِدَةٗۚ كَذَٰلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِۦ فُؤَادَكَۖ وَرَتَّلۡنَٰهُ تَرۡتِيلٗا ٣٢ ﴾، واتە: ئەوانەی بێبڕوان، گوتیان: دەبووایە قورئانی بە یەکجار دابەزێنرابایە سەر، (خوا دەفەرموێ:) بۆیە ئاوا دامانبەزاندوە {سوورەت سوورەت، ئایەت ئایەت، یان هەر کۆمەڵە ئایەتێك پێکەوە} تاکو دڵی تۆی پێ بچەسپێنین، لە عەقڵتدا بیچەسپێنین و بە شێنەیی و بە ڕێکیی بە سەرت دا خوێندوومانەتەوە.

**مەسەلەی دووەم:**

**بڵێ: بڕوای پێ بێنن، یان بڕوای پێ نەهێنن، بێگومان ئەوانەی لە پێش ویدا زانیاریی خواییان پێدراوە، هەر کات بەسەریاندا بخوێنرێتەوە، لەپەوڕوو بەسەر چەناگەکانیاندا دەکەونە کڕنووش و دەڵێن: پاکیی بۆ پەروەردگارمان، بە دڵنیایی بەڵێنی پەروەردگارمان جێبەجێ کراوەو، لەسەر چەناگەکانیان دەکەونە کڕنووش و دەگرین و، ملکەچییان بۆ زێدە دەکات، یانی: قورئان خوێندنەکە، یان قورئان بەسەردا خوێندرانەوەکە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ قُلْ ءَامِنُوا۟ بِهِۦٓ أَوْ لَا تُؤْمِنُوٓا۟ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ مِن قَبْلِهِۦٓ إِذَا يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ يَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ سُجَّدًا ﴿١٠٧﴾ وَيَقُولُونَ سُبْحَـٰنَ رَبِّنَآ إِن كَانَ وَعْدُ رَبِّنَا لَمَفْعُولًا ﴿١٠٨﴾ وَيَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ يَبْكُونَ وَيَزِيدُهُمْ خُشُوعًا ﴿١٠٩﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە هەشت بڕگەدا:

١)- ﴿ قُلْ ءَامِنُوا۟ بِهِۦٓ أَوْ لَا تُؤْمِنُوٓا۟ ﴾، بڵێ: یەکسانە، بڕوای پێ بێنن، یان بڕوای پێ نەهێنن، واتە: بە قورئان کە پێشتر باسکراوە، (**حرفُ (لا) حرف النَّفي، وليس حرف النَّهي**) ئەم (لا)یە بۆ لابردنە، نەك نەهێشتن، کاتێك کارێك هەردوو لای یەکسان بن، ئەم (لا)یە بەکاردێ، بۆ وێنە: خوا دەفەرموێ: ﴿ فَٱصْبِرُوٓا۟ أَوْ لَا تَصْبِرُوا۟ سَوَآءٌ عَلَيْكُمْ ﴿١٦﴾ ﴾ الطور، واتە: خۆڕابگرن، یان خۆڕانەگرن، یەکسانە.

لێرەدا مەبەست کەم بایەخیی و گرنگیی پێنەدانیانە، واتە: یەکسانە ئەوانە بڕوا بێنن، یان بڕوای پێ نەهێنن، بۆچی؟

٢)- ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ مِن قَبْلِهِۦٓ ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی کە زانیارییان پێدراوە، پێش ئەو، پێش قورئان، ئەوانەی لە کتێبەکانی خۆیان شارەزان، کە پێش قورئان دابەزیون.

٣)- ﴿ إِذَا يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ يَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ ﴾، کاتێك بەسەریاندا بخوێنرێتەوە، (قورئانیان بەسەردا بخوێنرێتەوە) بەسەر چەناگەکانیاندا بە کڕنووش دا دەکەون.

٤)- ﴿ سُجَّدًا ﴾، کڕنووش بردووان، کۆی (ساجد)ە.

یانی: پێغەمبەر ﷺ بێ نیازە لەوەی ئێوە بڕوا بە قورئان بێنن، چونکە ئەوانەی کە زانیارییان پێدراوە، پێش دابەزێنرانی قورئان، ئەوانە کە لە ئێوە عاقڵتر و شارەزاترن و پێگەیان باشترە، قەدری زێڕیش لەلای زێڕنگەرە.

٥)- ﴿ وَيَقُولُونَ سُبْحَٰنَ رَبِّنَآ ﴾، دەشڵێن: پاکیی بۆ پەروەردگارمان، کە گفت و بەڵێنی خۆی نەباتەسەر.

٦)- ﴿ إِن كَانَ وَعْدُ رَبِّنَا لَمَفْعُولًا ﴾، بە دڵنیایی بەڵێنی پەروەردگارمان جێبەجێ کراوە، ئەو گفت و بەڵێنەی خوا لە کتێبە پێشووەکاندا باسی کردوە، کە قورئانێك دادەبەزێنێ و، پێغەمبەری کۆتایی دەنێرێ، ئەوە هەمووی جێبەجێ کراو هاتە دی.

٧)- ﴿ وَيَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ يَبْكُونَ ﴾، بەسەر چەناگەکانیاندا دەکەون و دەگرین، بێگومان مرۆڤ بەسەر چەناگەو دەم و چاویدا کڕنووش دەبات، ئەم تەعبیرەش بەجوانترین شێوە حاڵەتی کڕنووش بردن وێناو بەرجەستە دەکات.

٨)- ﴿ وَيَزِيدُهُمْ خُشُوعًا ﴾، هەروەها ملکەچییان بۆ زێدە دەکات، یانی: ئەو قورئان خوێندنە، یان: قورئان بەسەردا خوێنرانەوەیە، ملکەچیی و، خۆ بە کەمزانینیان لە بەرانبەر خوادا، بۆ زیاد دەکات.

گریانیش لە ئەنجامی هەڵچوونێکی دەروونیی دا دەبێ، چ بە هۆی دڵتەنگیی، یان ترس و بیم، یان بەزەیی و پەرۆش، جاریش هەیە بە هۆی تامەزرۆیی و شەوقەوە، بۆ ئینسان پەیدادەبێ،

ئێرەش یەکێکە لەو دە پازدە (١٠ - ١٥) شوێنانەی قورئان کە دەبێ سەجدەیان تێدا ببردرێ، کە ئێمە لە کۆتایی سوورەتی (**الأعراف**)دا، بە درێژیی باسمان لەو شوێنانە کرد، کە سەجدەی قورئان خوێندنیان تێدایە.

لێرەدا دوو جاران باسی: کەوتن (**خرور**) کراوە، مەبەستیش پێی ئەوەیە، کە ئەوانە هێندە بە قورئان، کارتێکراو (**متأثر**) دەبن: کە وەك ویستیان نەمێنێ، یەکسەر دەکەون.

وشەی (**وعد**) لەسەر ئەصڵی واتای خۆی ماوەتەوە، کە مانای چاوگی (**مصدر**)ی هەیە: (**وعد يعد وعداً**) بەڵێنی دا، بەڵێن دەدا، بەڵێن دان.

دەشگونجێ (**وَعْد**) بە مانای (**موعود**) بێ، واتە: ئەوەی کە خوای، پەروەردگارمان بەڵێنی داوە، هاتە دی.

## با لەوبارەوە، ئەم دوو دەقە بێنین:

**١ -{عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُكْثِرُ أَنْ يَقُولَ فِي رُكُوعِهِ وَسُجُودِهِ: «سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَبِحَمْدِكَ، اَللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي»} (أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ: ٧٩٤، ومسلم: ٤٨٤، وغيرهما).**

واتە: عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە کڕنووش بردن و ڕکووع بردنیدا، زۆر دەیگوت: پاکیی بۆ تۆ ئەی خوایە و، پەروەردگارمان ستایش بۆ تۆ، ئەی خوایە! لێم ببوورە.

**٢ -{عَنْ مُطَرِّفٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: «يُصَلِّي وَفِي صَدْرِهِ أَزِيزٌ كَأَزِيزِ الْمِرْجَلِ مِنَ الْبُكَاءِ»} (أَخْرَجَهُ الحاكم: ٩٧١، وَقَالَ: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ مُسْلِمٍ، وَلَمْ يُخَرِّجَاهُ، وقال الذهبي: صحيح على شرط مسلم).**

واتە: موتەڕڕیف لە باوکی ﷺ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: چووم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ نوێژی دەکرد، سنیەو هەناوی، وەك چۆن مەنجەڵ قوڵپ دەدا، ئەویش بە هۆی گریانەوە، بەوشێوەیە قوڵپی دەدا.

(**الأَزِيزُ: صَوْتُ الرَّعْد، وَصَوْتُ غَلَيَانِ القِدْر**)[1]، (أزیز) بە دەنگی هەورە برووسکەو، بە دەنگی کوڵینی مەنجەڵیش دەگوترێ.

ئنجا لەوبارەوە کە خاوەن کتێبە پێشووەکان کە خاوەن زانیاریین، کاتێك قورئانیان بەسەردا دەخوێنرێتەوە، چۆن کارلێکی لەگەڵ دەکەن و کڕنووش دەبەن، ئەم بەسەرهاتە هاتوە، کە ئێمە تەنیا جێی مەبەستی لێدێنین:

باسی عەبدوڵڵای کوڕی سەلام دەکات، کە یەکێك بوو لە زانایانی جوولەکەو، مسوڵمان بوو: **{...قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! إِنَّ الْيَهُودَ قَوْمٌ بُهْتٌ، فَاسْأَلْهُمْ عَنِّي قَبْلَ أَنْ يَعْلَمُوا بِإِسْلاَمِي، فَجَاءَتِ الْيَهُودُ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَيُّ رَجُلٍ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَلاَمٍ فِيكُمْ ؟»، قَالُوا: خَيْرُنَا وَابْنُ خَيْرِنَا وَأَفْضَلُنَا وَابْنُ أَفْضَلِنَا، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَرَأَيْتُمْ إِنْ أَسْلَمَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَلاَمٍ؟»، قَالُوا: أَعَاذَهُ اللَّهُ مِنْ ذَلِكَ، فَأَعَادَ عَلَيْهِمْ، فَقَالُوا مِثْلَ ذَلِكَ، فَخَرَجَ إِلَيْهِمْ عَبْدُ اللَّهِ، فَقَالَ: أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، قَالُوا: شَرُّنَا وَابْنُ شَرِّنَا، وَتَنَقَّصُوهُ، قَالَ: هَذَا كُنْتُ أَخَافُ يَا رَسُولَ اللَّهِ} (أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ: ٣٩٣٨، عَنْ أَنَسٍ ﷺ).**

---

(١) مختار الصحاح، ص١٥.

{عەبدوڵڵای کوڕی سەلام دێ چەند پرسیارێك لە پێغەمبەر ﷺ دەکات، کە وەڵامەکانیان لە ڕێی وەحییەوە نەبێ نازانرێن، پێغەمبەر وەڵامیان دەداتەوەو ئەویش ئیمان دێنێ} گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! جوولەکەکان کۆمەڵێکی بوختانکەرن، بۆیە لەبارەی منەوە پرسیاریان لێبکە پێش ئەوەی مسوڵمان ببم، جوولەکەکان هاتن {دیارە پێغەمبەری خوا ﷺ لە دوای ناردوون}، فەرمووی: ئایا عەبدوڵڵای کوڕی سەلام چ جۆرە پیاوێکە لە نێوتاندا؟ گوتیان: باشترینمانە و، کوڕی باشترینمانە، پایەدارترینمانە و، کوڕی پایەدارترینیشمانە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەدی ئەگەر عەبدوڵڵای کوڕی سەلام مسوڵمان بێ، هەڵوێستتان چی دەبێ؟ گوتیان: خوا لەوە بیپارێزێ، پێغەمبەر ﷺ دووبارەی کردەوە، ئەوانیش وایان گوتەوە، ئیدی عەبدوڵڵا هاتە دەر بۆ لایان و گوتی: (**أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ**) ئەوانیش گوتیان: خراپترینمانەو کوڕی خراپترینیشمانەو، کەم و کوڕییان پاڵدایەلا، عەبدوڵڵاش گوتی: ئا ئەوە بوو لێی دەترسام، ئەی پێغەمبەری خوا!

**مەسەلەی سێیەم:**

**بڵێ: لە خوا بپاڕێنەوە، یان لە بە بەزەیی (الرحمن) یەکسانە، هەر کام لە ناوەکانی بێنن، ناوە هەرە چاکەکان هەر هی وین و، دەنگ بە نوێژو پاڕانەوەکەت بەرز مەکەوەو پەنهانیشی مەکەو، لەو نێوانەدا حاڵەتێکی میانە ڕەچاو بکە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ قُلِ ٱدۡعُواْ ٱللَّهَ أَوِ ٱدۡعُواْ ٱلرَّحۡمَٰنَۖ أَيّٗا مَّا تَدۡعُواْ فَلَهُ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰۚ وَلَا تَجۡهَرۡ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتۡ بِهَا وَٱبۡتَغِ بَيۡنَ ذَٰلِكَ سَبِيلٗا ١١٠ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە حەت بڕگەدا:

١)- ﴿ قُلِ ٱدۡعُواْ ٱللَّهَ أَوِ ٱدۡعُواْ ٱلرَّحۡمَٰنَ ﴾، بڵێ: لە خوا بپاڕێنەوە، یان: لە بە بەزەیی، یان: ناوی (خوا) بێنن، یان ناوی (**الرحمن**)، یان: باسی خوا بکەن، یاخود باسی (**الرحمن**) بکەن، ئەو واتایانە هەموویان دەگرێتەوە، واتە: کام ناو بێنن، نێوەڕۆکیان هەر یەکە.

٢)- ﴿ أَيّٗا مَّا تَدۡعُواْ ﴾، هەرکام لە ناوەکانی بێنن، (**أيّ: اسم الإِسْتِفْهَامِ فِي الأَصْلِ، فَإِذَا اقْتَرَنَت بها «ما» الزَّائِدَة، أفادَت الشَّرط، مثلها فِي ذلك مثل «كيفما» ولذلك جُزِمَ الفِعْل بعدها**)، (**أيّ**) لە ئەسڵدا ناوی پرسیارکردنە، بەڵام کە (**ما الزائدة**)ی دەچێتە سەر، مانای مەرج (**شرط**) دەگەیەنێ، وەك: (**كيفما**)، هەرچۆنێك تۆ بیکەی، بۆیەش (**فعل**)ی دوای وی مەجزووم دەبێ.

٣)- ﴿ فَلَهُ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰ ﴾، ئەو (خوا) ناوە هەرە چاکەکانی هەن، لە ڕووی زمانەوانییەوە، ئەم ڕستەیە: (**عِلَّةُ الجوابِ، والتقدير: أي اسمٍ مِنْ أَسمائه تعالى تدعون، فلا حَرَجَ فِي دعائه بعدّة أسماء، إذ له الأسماء الحُسْنَى**)، ئەمە هۆکاری قسەکەی پێشێیە، یانی: هەرکام لە ناوەکانی خوای بەرز بێنن، هیچ سەغڵەتییتان لەسەر نیە، لە کاتێك دا کە لە خوا دەپاڕێنەوە {بە هەر ناوێك لێی بپاڕێنەوە هەر یەکە} چونکە خوا ناوە هەرە پەسند و باشەکانی هەن.

٥)- ﴿ وَلَا تَجۡهَرۡ بِصَلَاتِكَ ﴾، نوێژەکەت، یان: پاڕانەوەکەت، دەنگی پێ هەڵمەهێنە، (**صلاة**) بە مانای: نوێژە، یان: بە مانای پاڕانەوەیە، بەڵام بە تەئکید لێرەدا مەبەست پێی ئەو قوڕئانەیە، کە لە نوێژدا دەخوێنرێ.

٦)- ﴿ وَلَا تُخَافِتۡ بِهَا ﴾، هەروەها دەنگیشتی پێ کپ مەکە، بەدەنگی زۆر نزمیش قوڕئان مەخوێنە، (**الخَفْت والمخافتة: خَفْضُ الصَّوت**) دەنگ نزم کردن، دەنگ کپ کردن.

٧)- ﴿ وَٱبْتَغِ بَيْنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا ﴾، لەو نێوانەدا ڕێیەك ڕەچاو بكە، یانی: ڕێ و حاڵەتێكی میانجیی ڕەچاو بكە، نە دەنگ زۆر هەڵبڕە و، نە دەنگ زۆر كپ بكە.

لەوبارەوەش ئەم شوێنەوارە هاتوە:

**{عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ سَاجِدًا يَدْعُو: «يَا رَحْمَنُ يَا رَحِيمُ» فَقَالَ: الْمُشْرِكُونَ: هَذَا يَزْعُمُ أَنَّهُ يَدْعُو وَاحِدًا، وَهُوَ يَدْعُو مَثْنَى مَثْنَى، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: {قُلِ ادْعُوا اللَّهَ أَوِ ادْعُوا الرَّحْمَنَ أَيًّا مَا تَدْعُوا فَلَهُ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَى} (أخرجه الطبري: ٢٢٧٣٩).**

واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە كڕنووشدا بوو دەپاڕایەوە دەیگوت: ئەی بە بەزەیی! ئەی بەخشندە! هاوبەش بۆ خوادانەرەكان گوتیان: ئەو پێی وایە لە یەك (خوا) دەپاڕێتەوە، كەچی ناوی دووان دێنێ! خوای بەرزیش ئەم ئایەتەی دابەزاند.

شایانی گوتنە: ئێمە لە تەفسیری سوورەتی (**الأعراف**)داو، لە كتێبی سێیەمی مەوسووعەی: (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی) داو، لە كتێبی سێیەمی مەوسووعەی: (**الإسلام كما يتجلى في كتاب اللّه**)دا، چەند باسێكی تێرو تەسەلمان كردوون، دەربارەی ناووسیفەتەكانی خوای بەرز و مەزن و تاك و پاك.

## مەسەلەی چــوارەم:

**هەروەهـا بڵـێ: سـتایش بۆ ئـەو خوایەی ڕۆڵـەی نیەو، هاوبـەشی نیە لە موڵك و دەسـتەڵات داو، لەبـەر بـێ دەسـتەڵاتیی پەنـای بـۆ هیـچ پشـتیوانێك نەبـردوەو، بـە گەورەگرتنێکی شایسـتە بـە گـەورەی بگرە:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَقُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى لَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ شَرِيكٌ فِى ٱلْمُلْكِ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ وَلِىٌّ مِّنَ ٱلذُّلِّ وَكَبِّرْهُ تَكْبِيرًا ﴿١١١﴾ ﴾.

## شکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ وَقُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ﴾، هەروەها بڵێ: ستایش هەمووی بۆ خوایە.

ئێمـە چەمـك و واتـای وشـەی (**حمد**)مـان لـە سـەرەتای تەفسـیری سـوورەتی (**الفاتحة**) و (**الأنعـام**) و (**سـبأ**) و (**فاطر**)یـش دا، بەدرێژیـی ڕوون کردۆتـەوە، کـە پوختەکـەی بریتیـە لـە: مـەدح و سـەنای خـوا و باسـکردنی نـاوو سـیفەتە بـەرز و بـێ وێنـەکانی.

٢)- ﴿ ٱلَّذِى لَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا ﴾، ئەو خوایەی کە هیچ ڕۆڵەی نیە، ڕۆڵەی بۆ خۆی دانەناوە، (**اتخذه: أي: صَيَّرَهُ، والإتخاذ افتعال من الأخذ**) (**أخذ**) یانی گرتن، (**إتخاذ**)یش (**إفتعال**)ە، لە (**أخذ**)ەوە یانی: هەڵبژاردن.

٣)- ﴿ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ شَرِيكٌ فِى ٱلْمُلْكِ ﴾، هەروەها لە موڵك و دەستەڵاتیشیدا هاوبەشی نین.

هاوبەشـدانەران دەیانگـوت: خـوا ڕۆڵـەی هەیـە، کـە هەندێکیـان دەیانگـوت: شـەیتانەکان کـوڕانی خـوان و، فریشـتەکان کچـانی خـوان، بۆیـە خـوا لێـرەدا: وشـەی (**ولـد**)ی بەکارهێنـاوە، کـە بـۆ کـوڕ (**ابـن**) و کـچ (**بنت**)یـش دەبـێ، واتـە: خـوا هیـچ ڕۆڵـەی نیـە.

هەروەها هاوبەشیشی نیە لە موڵك و دەستەڵات و خاوەنداریێتیی دا.

٤)- ﴿ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ وَلِىٌّ مِّنَ ٱلذُّلِّ ﴾، بە هۆی بێ دەستەڵاتییشیەوە، پەنای نەبردۆتە بەر هیچ پشتیوان و هاوکارو سەرخەرێك.

وشـەی (**مِـن**)، لـە (**مـن الـذل**)دا، (**بِمَعْنَـى لام التَّعْلِيـلِ**)، یـانی: بـە هـۆی ملکەچیـی و بـێ دەسـتەڵاتییەوە، پێویسـتیی بـە سەرپەرشـتیارو دۆسـت و پشـتیوان نەبـووە.

(الـذلّ): العَجْـزُ وَالإفْتِقَـار، وَهُـوَ ضِـدُّ العِـزِّ أي: لَيْـسَ لَـهُ نَـاصِرٌ مِـنْ أَجْـلِ الـذُّلِّ، وَالمُـرَادُ نَفِـي النَّـاصِرِ لَـهُ عَـلَى وَجْـه مُؤَكَّـدٍ، فَـإِنَّ الحَاجَّـة إِلى النَّـاصِرِ، لاَ تُكُـونُ إلاَّ مِـنَ العَجْـزِ عَـنِ انْتِصَـارِ للنَّفْـسِ)، واتـە: مانـای (ذلّ) دەسـتەپاچەیی و ئاتاجیـی یـە و، پێچەوانـەی (عِـزّ)ە، واتـە: باڵادەسـتیی، زاڵیـی، واتـە: خـوا پێویسـتیی بـە هیـچ یارمەتییـدەرو هاوكارێـك نەبـووە، بـە هـۆی بـێ دەستەڵاتییەوە، یـانی: خـوا هیـچ هاوكارێـكی نەبـووە، چونكـە پێویسـتیی بـە هـاوكارو پشـتیوان بـۆ كەسێكە، دەستەپاچە بـێ و بەرگریـی پـێ لـە خـۆی نەكـرێ، بـەڵام خـوا دەسـتەڵاتیی بـێ سـنوورو ڕەهـای هەیـە.

٥)- ﴿ وَكَبِّرْهُ تَكْبِيرًا ﴾، بە گەورەی بگرە (خوای بەرزی مەزن) بە گەورەگرتنێكی شایستە.

(تكبـيراً: مَفْعُـولٌ مُطْلَـقٌ للتأكِيـدِ، إعْتَقِـد أَنَّـهُ كَبِـيرٌ، أي: عَظِيـمٌ العِظَـمَ المَعْنَـويّ الشَّـامِل لوجُـوبِ الوجُـودِ، والغِنَـى المُطْلَـقِ)، واتـە: (تكبـيراً) بـەركاری ڕەهـا (مفعـولٌ مطلق)یـە بـۆ جەختكردنـەوە، بـڕوات وا بـێ كـە خـوا مەزنـە، گەورەییـەكی مەعنەویـی گشـتگیر، كـە خـاوەنی بوونێـكی پێویسـتە و، خـاوەنی بـێ نیازیـی دەوڵەمەندییـەكی ڕەهـاو بـێ سـنوورە.

خـوا بـە لوتـف و كەڕەمـی خـۆی، ئێمـە لـەو كەسـانە بگێـڕێ كـە خـوا بـە یەكگرتنـی تـەواو (التوحیـد الكامـل) لـە عەقـڵ و دڵیانـدا دەچەسـپێ و، لـە ژیـانی ڕۆژانەیانـدا: خـوا بـە تەنیـا پەرسـتن و خوابەیەكگرتـن، بەباشـترین شـێوە تێگەیشـتنی بەرجەسـتە دەبـێ و، خـوا بـە كەڕەمـی خـۆی زیاتـر بەهرەمەندمـان بـكات بـە هـۆی ئیـمانی باشـترەوە، لـە فەرمایشـتی بـەرز و مـەزن و بـێ وێنـەی خـۆی: قورئـانی بـەرز و بەپێـز.

لێـرەدا كۆتایـی بـە شـیكردنەوەو ڕوونكردنـەوەی مانـاو مەبەسـتەكانی سـوورەتی (الإسراء)ە دێنیـن.

سُبْحَانَك اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

٥/ ذو القعدة/ ١٤٣٨ ك

٢٠١٧/٧/٢٨ ز

# نێـوەڕۆک